مانیفستۆی شارستانێتی دیموکراتیک

پەرتووکی چوارەم

# چارەسەری شارستانێتی دیموکراتی

## قەیرانی شارستانی لەخۆرهەڵاتی ناوین و



عەبدوڵڵا ئۆج ئالان

و: لوقمان عەبدوڵڵا

مانیفستۆی شارستانێتی دیموکراتی
پەرتووکی چوارەم

# قەیرانی شارستانی لەخۆرهەڵاتی ناوین
# و
# چارەسەری شارستانێتی دیموکراتی

عەبدوڵڵا ئۆج ئالان
وەرگێڕانی: لوقمان عەبدوڵڵا

ناوی کتێب: **قەیرانی شارستانی لەخۆرهەڵاتی ناوین و چارەسەری شارستانێتی دیموکراتی**
نووسینی: **عەبدوڵلا ئۆج ئالان**
وەرگێڕان: **لوقمان عەبدوڵلا**
چاپ: **یەکەم** تەمموزی/ ٢٠١١
**تیراژ:** ٣٥٠٠ دانە
**نرخ:** ٤٥٠٠ دینار
**چاپخانە: ڕەنج**

**لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی (٢٣٥٣) ساڵی (٢٠٠٩) پێدراوە**

# ناوەڕۆک

## پێشەکی

لەم بەشەی بەرگرینامەکەمدا چاوێک بە کلتووری خۆرهەڵاتی ناویندا دەخشێنم و هەوڵی لە بێژنگدانی دەدەم. چونکە ئەگەر دەرک بەو کلتوورە نەکرێت کە بەردەوام رۆڵی ناوەندی لە مێژووی مرۆڤایەتیدا بینیوە ئەوا هەروەکو چۆن پێناسەی تاک لەبارەی خۆیەوە زۆر رووکەشانە دەمێنێتەوە، لە هەمان کاتدا لە بێمانایيش رزگاری نابێت. هەروەها پێویستە ئاگاداری ئەو خاڵەش بین؛ تەنانەت خودی کلتووری هەژموونگەرایی هاوچەرخی ئەورووپاش لقێکی کلتووری خۆرهەڵاتی ناوینە. سەرەڕای ئەوەی خۆی قۆناخێکی گرنگی زانستیبوون پێکدێنێت، بەڵام تا ئێستاش کلتووری خۆرهەڵاتی ناوین رۆڵێکی چارەنووسساز دەبینێت. هەر بۆیەش کاتێک لەرۆژگاری ئەمڕۆمان باس لە پێکدادان و رێککەوتنی نێوان کلتوور یاخود شارستانییەکان دەکرێت لە خۆڕا نییە کە یەکسەر ئەو دوو کلتوورە بەبیری مرۆڤدا دێت. لە راستیدا بەواتایەک لە واتاکان ئەم چەسپاندنە بەمانای ئەرێکردنی زاراوەی شارستانی ناوەندی دێت.

بەشەکانی پێشووتری بەرگرینامەکەم هەوڵی پێناسەکردنی گەردوون یان جیهانی دەدا. خۆرهەڵاتی ناوین یش تەنیا لەناو مژاری جیهاندا بە گوزارشتی خۆی دەگەیشت؛ چونکە خۆی شادەماری جیهانە.

کلتوورو مێژووی تاکیش تەنیا لەناو جیهان یان گەردووندا مانا بەخش دەبێت. کاتێک ئاماژە بەتاک دەکەم، لەکەسێکەوە تا دەگاتە نەتەوەیەک مەبەستم ئەو بەشانەیە کە جێگای خۆیان لەناو هەمەڕەنگیەکی بەرفراواندا دەگرن. وەک تاکێک هەوڵێکی زۆرو مەزنم دەرهەق مژاری پێناسەکردنی خۆم داوە. چەندە لەو بارەیەوە قاڵبوومەوە زیاتر دەرکم بەو راستییە کرد کە راکردن لە گەردوونی یان جیهانی جێگای باس نابێت. هیچ گومانێکم لەو بارەیەوە نییە کە تاکە پووچەکەی لیبڕالیزم شتێکی هێندە بێ نرخو پووچە تەنانەت بە قەدەر میتۆلۆژییە

کۆنــەکانیش مانابــەخش نییــە. هــەروەها بانگەشــەکانی قووتــدانی تــاک لەلایــەن وشکترین هەرەوەزیــەکانی کۆمــەڵگاوەش دیســان لــە روانگەیــەکی جیاوازەوە پووچو بێ نرخە. لەم بارەیەوە ناچارم کۆنە گوتەیەکم دووبارە بکەمەوە؛ هەرکاتێک شیکارکردنی مێژوو لەتاکدا جێگای باسە؛ چونکە تاک بەرهــەمی مێــژووە، واتــە دۆخــی بەرجەســتەو کــۆنکرێتی مێــژووە. ئەگــەر لەژیاندا بێت ئەوا دۆخی رۆژانــەیی و هەنووکــەیی مێــژووە. کاتێــک دەڵــێم مێژوو هەڵبەتە بە مانای کۆمەڵگای مێژوویی بەکاریدێنم.

یەکەمین و گرنگترین ئــەو دەرەنجامــەی لــەو مێــژووەم هــەڵێنجاوە کــە هەوڵی پێناسەکردنی دەدەم، تەنانەت ئەگەر لەئاستی تیرەی بــەرایی(کلان) یشدا بێــت تــا بــەواتا تەسک و بەفراوانەکەیــەوە ئــەو کۆمەڵگایــە شــیکار نەکەیت و دەرکــی پێنەکــەیت کــە ئەنــدامیت تێیــدا، ئــەوا نابیــت بــە مــرۆڤ. چونکە لەرۆژگاری ئەمڕۆمان نکوڵی و ئاسیمیلاسیۆنی زۆرەملێیانــە لــەناو کۆمــەڵگادا بــەردەوام دەســت بــەکارە. ئەمــەش کۆڵەکــەو ســەرچاوەی لەدەستدانی مانایە. ئەو تاکو جڤاتانەی بەو قۆناخەدا گوزەریان کــردووە مەگەر بەتاک و جڤاتی نێگەتیف ناو ببرێن؛ بە بڕوای من ناشێت بە مــرۆڤ ناوببرێن.

چەندەی دەچێت ئەو بڕوایەم بەهێزتر دەبێت کە راستی کۆمەڵایەتییــە. تــەنیا لەمیانــەی واتاپێدانی ســەرچاوەی کۆمەڵایــەتی راستییەوە دەشێت کەسێک بە بەرزترین ئاستی زانین بگــات. هــەر بۆیــە راکــردن لــە کۆمــەڵگا راکردنە لە ماناو دانایی. بەسووربوونەوە راکردنــی لیبڕالیــزم لەکۆمــەڵگا لەلایەکەوە وابەستەی هەڵوێستە رووکەشیەکەیەتی ســەبارەت بــە راســتی، لەلایەکی دیکەشەوە گرێدراوی واقیعی سروشــتی ســەرمایەدارییە کــە خــۆی گوزارشتە ئایدیۆلۆژیەکەیەتی. هەروەها بەپێی بەسەرچوونی کــات زیــاتر هانابردنی سەرمایەداری و ئەو کۆمەڵگایەی لەژێر هەژموونیدایە بۆ ریکلام و درۆ جەخت لەسەر ئەو لایەنەی واقیعەکەی دەکاتەوە.

هــەم پەرەســەندنە تیۆرییەکــەم، هــەم رۆڵــم لەپەرەســەندنی کــرداری - سیاسیدا بــەپێی تێپــەڕبوونی کــات بەشێوەیکی زیــاتر راستی بەرگرینامــە رۆشــنتر دەکاتــەوە. چــاک دەزانرێــت یــاخود پێویســتە بزانرێــت کــە

هەلومەرجەکانی زیندانم یان مەحکومیەتم ئاسان نییە و بە ئاسانیش تێپەڕ نابێت. یەکەمین وەڵامی کە بدرێتەوە پرسیاری چۆن بەرگەی ئەم هەلومەرجە دەگریت، دیسان ئەو گوتەیە دەبێت؛ تەنیا لە دۆخی مەحکوم بە واقیعی کۆمەڵگای خۆمدا دەژیم. زۆر ئاگادارم ئەگەر باخەکانی بەهەشتیشم لەپێش بێت، ئەگەر خوازیاریش بم ناتوانم لەناو سیستەمدا ناتوانم ئازادانە لەناو ئەم واقیعەدا بژیم. هەرچی ئەوانەن کە جێگای خۆیان لەناو هەمان واقیعدا دەگرن و بانگەشەی ژیان دەکەن، بەسووکترین گوتە پێویستە بزانن خۆیان خەڵەتاندووە. هەڵبەتە هۆکارە مێژوویی و هەنووکەییەکانی مەحکومیەتی کۆمەڵایەتی پێویستی بە باسێکی درێژی دیالیکتیکی هەیە. ئەوەی گرنگە گەیشتنە بەو مانایە. تەنیا دوای گەیشتن بەم مانایە دەشێت لەناو کات و شوێندا هەنگاو بۆ کاروانی ئازادی بنێن. ئەو کاروانە بەو رادەیەی ناوەکییە دەرەکیشە، بەو رادەیەی تاک پەیوەندیدار دەکات، کۆمەڵایەتیشە.

بەردەوام کاتێک لێپرسینەوە سەبارەت بەژیانی خۆم دەکەم هەوڵدەدەم واتای پێبدەم کە زیاتر بە ئاراستەی چ جۆرە بەرخودان، راکردن یاخود پەسەندکردنێک ئاراستەم گرتووە. ئاشکرایە کە جگە لە چیرۆکی ئەم ژیانەم بەرگرینامەکەم هیچ واتایەکی دیکەی نابێت. لەو بڕوایەدام کە ئەو چیرۆکە تابڵێی سەیرو ئەزموونبەخشە. گرنگتریش لە بواری کرداریدا لەگەڵ کۆمەڵگاکەم پەرە دەسەنێت. لەو بڕوایەدام کە بەجۆرێکی دیکە دەرفەتی بەرگریکردن لە ئازادی نییە، ئەگەر دەرفەتیش هەبێت ئەوا بەهاکەی لە بەرگرینامەی ئازادی جیاوازتر دەبێت.

وەک تاک منو کۆمەڵگاکەشم لە میزۆبۆتامیا هاتووینەتە دونیا کە لانکەی خۆرهەڵاتی ناوین و شارستانی ناوەندییە. ئەم کاروانەی شارستانی کە وەک رووباری فورات بە لێشاوە بەردەوام بەزیادکردنی سەرنجەکانم بەلای خۆیەوە کەمەندکێشم دەکات. لەئاراستەکردن و کەمەندەکێشکردن بێزارو تەنگەتاو نابم. مرۆڤ و کۆمەڵگاکەی کە بەشێوەیەکی نائاساییو نەوازە لەگەڵ زەوی، رووەک و ئاژەڵەکەی ئاوێتە بووە، ئاشکرایە کە سەرچاوەی گشت راستییەکانە. لەمیانەی ئەم واقیعو

ڕاستیانەوە تەنیا خۆم مانادار ناکەم؛ بەڵکو لەلێهاتووترین پێگەو کاتدا تەواوی مرۆڤ واتە مرۆڤی گەردوونی پێناسە دەکەمو دەرکی پێدەکەم. ئەم بەشەی بەرگرینامەکەم زیاتر خزمەت بەم لایەنەی ڕاستی دەکات. پێویستە نزیکبوونەوە لە موساو هەڤاڵەکانی، عیساو هەڤاڵەکانی و محەمەدییەکانو تێگەیشتنی ناوەڕۆکی پەیامەکانیان و گەیاندنیان چیرۆکی کەمبایەخو بێجۆشو خرۆش نەبن کەلای فیرعەونو نەمرودەکان ڕایانکرد و بەرخودانیان بەرزکردەوە.

تائێستاش لەژێر بەدواداچوونە گەورەکەی هەمان شارستانی ناوەندیدام و بەندکراوی ئەم شارستانییەم. هەم لێی ڕادەکەم، هەم لەبەرامبەری بەرخودان دەکەم. ڕۆژانەییو هەنووکەییکردنی چیرۆکی حەزرەتی ئیبراهیمی هاوشاریم لەگەڵ نەمرود گرنگە. بەرخودان بەرامبەر فیرعەونو نەمرود گرنگترین تایبەتمەندێتی ئایینە کە پێویستە ڕێزی لێبگیرێت. جینۆسایدو شەڕیش لایەنێکی دیکەی ڕاستییە کە سەرچاوەی خۆی لە سەردەمی شارستانی ئەوروپا وەردەگرێت. دەوڵەت ـ نەتەوە، ئیندوستریالیزم و سەرمایەداری وەک بڵێی سروشت و کۆمەڵگای خۆرهەڵاتی ناوینی لەلێواری خۆکوژیدا ڕاگرتووە و بەمجۆرە دەیچەوسێنێتەوە. پێویستە بەرگرینامە وەڵامی ئەم واقیعەش بداتەوە. لەکاتێکدا ئەمە ناوەڕۆکی واقیع و ڕاستیەکەیە، ئەوا ئەو چیرۆکانەی باسی ڕووداو، دۆخی سیاسیو بوویەری تاکەکان دەکات دەشێت بەهارات و مەزەی ڕازاندنەوەی لایەنە ویژەییەکەی بێت.

بەردەوام گومانم لە ئامادەکردنی بەرگرینامەکەم کرد لەمیانەی پشتبەستن بە دیاردەکانی تورکێتی. تێگەیشتنی ئەو ڕاستییە گرنگ بوو کە سەرجەم نەتەوەکانی خۆرهەڵاتی ناوین لەناوەڕۆکدا تا دواڕادە بەشێوازێکی دابڕاو لەپێوانەکانی حەقیقەتو بنەما مێژووییەکان ئاواکراون. جگە لەوەی شێوەگرتنەکانی دەوڵەت ـ نەتەوە لەخۆرهەڵاتی ناوین بەرهەمی هەژمونگەرایی سەرمایەداری (ئەوروپا)یە، چەواشەکاریو شێواندنی مێژووی کۆمەڵگاشە؛ لەم سۆنگەیەوە بەواتای نکوڵیکردن لە بەشێکی زۆری ڕاستیش دێت.

قۆناخی ئیمڕالی لەسەرەتاوە تا کۆتایی لەژێر چاودێری نوێنەری فەرمی شارستانی رۆژی ئەمڕۆمان ئەمریکا و یەکێتی ئەورووپا وەک پەردەیەکی شانۆگەرییەکە ئامادەو پێشکەشکراوە. ئەگەر لەم چوارچێوەیەدا رۆڵی تەرخانکراو بۆ دیاردەکانی تورکێتی هەڵسەنگێنرێت مانایەکی دەبێت؛ هەوڵی ئەمە دەدەم. لەکاتێکدا دادگای مافی مرۆڤی ئەورووپا بە بڕیاری سەرلەنوێ دادگاییکردنەوە گەیشتووە، ئەوا لەناوەڕۆکدا ئەو راستییەی پەسەند کردووە کە هەوڵی پێناسەکردنی دەدەم. کاتێک دیاردەی دادی تورک بوێری سەرلەنوێ دادگاییکردنەوەی نیشاننەدا و دۆسیەکەی بۆ کۆنسەی وەزیرانی یەکێتی ئەورووپا رەوانەکردەوە، هەڵوێستێکی هاوشێوەی نیشاندا و لەناواخندا دانی بەم راستییە داناوە. لەم سۆنگەوە دۆزەکەم کەوتۆتە بۆشەوە یان بۆشاییەوە. ئەم دۆخەش لەدادگای مافی مرۆڤی ئەورووپا بۆتە مۆزاری دۆزێکی نوێ. نزیکەی دە ساڵە نە وەک لەسەرەتا قسەی لەبارەوە کرابوو لەدادگای پێداچوونەوە یاخود سزای رۆما نە لەدادگای ستراسبۆرگی دادگای مافی مرۆڤی ئەورووپا بەشێوەیەکی راست و دروست دادگایی ناکرێم. لەوەش مەترسیدارتر سەرباری ئەوەی لەئاکامی پێشێلکردنی یاسای نیشتیمانی و یاسای یەکێتی ئەورووپا لەلایەن حکومەتی یۆنان (حکومەتی سمیتس)و رفاندنم بۆ ئەفریقیا - کینیا قۆناخێکی سەرەتایی گوانتانامۆ[1] زاڵە، بەڵام تا ئێستاش ئەو دۆزە ئاشکرا نەکراوە کە درێژە بە هەوڵەکانی خۆی دەدات. دادگای پێداچوونەوەی ئەسینا بڕیاریداوە کە تێپەڕبوونم بۆ ناو سنوورەکانی یۆنان تاوان نییە، بەڵکو ئەمە مافێکە سەرچاوەکەی بۆ داواکردنی مافی پەنابەرێتی دەگەڕێتەوە. بەگوێرەی ئەم بڕیارە تا ئێستاش من لە چوارچێوەی سنوورو یاساکانی یۆنانیدام. ئەو واقیعەی کە روویداوە؛ دوای بەدواداچوونێکی

[1] گرتووخانەی گوانتانامۆ: دەکەوێتە کەنداوی گوانتانامۆ، زیندانێکی بەدناوە.لە ساڵی ٢٠٠٢ وە ئەمریکا بەکاریدێنێتو ئەو کەسانەی تێدا بەند کردووە کە بە "تیرۆریست" ناویان دەبات.چونکە دەکەوێتە دەرەوەی سنوورەکانی ئەمریکاو ئەوپەڕی خوارووی رۆژهەڵاتی کوبا، هیچ یاسایەکی مافەکانی مرۆڤی لەسەر پەیڕەو ناکرێت، بەڕێوەبەرایەتی زیندان خاوەن دەسەڵاتێکی رەهایە. هۆڤانەترین کردەوەو رەفتاری تێدا ئەنجام دەدرێت.

سەیرو سەمەرەی ڕێکخستنی گلادیۆ[٢]ی ناتۆ کە بە دیلبوونم ئەنجامگیربوو ژووری ئینفرادی زیندانی دورگەی ئیمڕالی یەک کەسی بوو کە نموونەیەکی زۆر تایبەتی سەرەتایی گوانتانامۆیە. بە ڕژێمێکی تایبەتی بەڕێوە دەبرێم کە لە دەرەوەی تەواوی ئەو پەیڕەو، یاسا و دەستوورەوەیە کە سەبارەت بە سەرجەم زیندانیانی تورکیا پەیڕەو دەکرێت.

هەر بۆیە پێویستە و ناچارم ڕاستییە سیاسی ـ کۆمەڵایەتییەکانی پشت ئەم سەمەرە یاساییەی سەردەم ئاشکرا بکەم، لەم سۆنگەوە ڕاستییە مێژوویی و ئابوورییەکان ڕوون بکەمەوە. بەمجۆرەش جارێکی دیکە دەبینرێت ئەوەی لەکەسایەتی مندا دادگایی دەکرێت بەو ئەندازەیەی گەلێکە، لەهەمانکاتدا مێژووی جیهانییە. شارستانی فەرمی ئەورووپا کە هێزی بەڕێوەبەری مێژووی جیهانییە پێویستە لەچوارچێوی بە بنەماگرتنی ڕاستیەکان بوێری دادگاییکردنی من پیشانبدات. پێویستە دادگای مافی مرۆڤی ئەورووپا خاوەنداریێتی لەئەرکی خۆی بکات و بڕیارەکەی لەبارەی منەوە درەنگتر نەخات.

---

[٢] تۆڕی گلادیۆ: دوای دووەمین جەنگی جیهانی دامەزراوە، بە شێوەیەکی ناراستەوخۆ ڕێککەوتنامەکانی بوستدامو یالتای لێکەوتەوە. دەزگای هەواڵگری ناوەندی ئەمریکاو هەواڵگری بریتانیا بەڕێوەیان دەبردو خوازیاربوون لە تەواوی ئەورووپای ڕۆژئاوا جێگیری بکەن، دواتر بە پەیمانی ناتۆوە لکێنرا. لەو قۆناخەدا سنووری ئەرکە سەرەکیەکانی خۆی تێپەڕ کرد؛ هەوڵیدا نفوزی کۆمۆنیستەکان لە دیموکراسی ئەورووپا کەمبکاتەوە، بە تایبەتیش لەبواری ساختەکاری لە هەڵبژاردنەکانو تیرۆری سیاسیو هێرشکردن دەستبەکار بوو. دوای هەرەسهێنانی یەکێتی سۆڤێت بە فەرمی هەڵوەشایەوە، بەڵام تا ڕۆژی ئەمڕۆش بەردەوامی بە چالاکیەکانی دەداتو فراوانبوونەکەشی بە قەدەر فراوانبوونی ناتۆیە و بووە بە گەورەترین تۆڕی سیخوڕی جیهان. بە هاوکاری هاوپەیمانەکانی سەر بە ڕێکخراوی ئەنگلۆساکسۆنی پرۆتستانی ئەمریکا لە دەرەوەی ناتۆ بەڕێوەی دەبات.

بەشی یەکەم

## دەروازە

وەک ئاگادارین کارل مارکس خواستوویەتی لەڕێگای پەرتووکی سەرمایەوە فەلسەفەی هیگل لەسەراوژێربوون رزگار بکات و لەڕێگای راستکردنەوەیدا شاکارێکی نموونەیی ئامادە بکات. لەمپێناوەشدا لەدوو لایەنەوە سوودی لەهزری ئەو قۆناخە وەرگرتووە. بەر لەهەموو شتێک ویستوویەتی لەمیانەی رێسای پەرەسەندنی داروینەوە، رێسایەکی پەرەسەندنی راستەهێڵی پێشبخات. ئەمەشیان یەکێک لەشادەمارە سەرەکییەکانی کۆڵەکەی لقی ماتریالیستی فەلسەفەی پۆزیتیڤیستە. هەروەها لەژێر ناوی دەستەواژەی "ناسین"ەوە دیالیکتیکی لە هیگل ەوە وەرگرتووە کە لەمێژوودا رێگای لەپێش سەرهەڵدانی بیردۆزەی دەوڵەتی لێهاتوو و هۆمۆژەنی "پیاوی بەهێزو فێڵباز" کردۆتەوە. لەمیانەی بەخشینی رۆڵی سەردار بە کۆیلە "کارکەر" گوایە فەلسەفەکەی ــ کە لەدوانەی سەردار - کۆیلەدا دەبینی ــ لەسەر پێچکەکانی خۆی داناوە؛ بەمجۆرەش پڕ بەدڵ لەو بڕوایەدابوو کە لەڕێگای هیگلگەرایی چەپڕەوانەوە، لەژێر ناوی "ماتریالیزمی دیالیکتیکی"یەوە حەقیقەت کەوتۆتە سەر راستەڕێی خۆیەوە، پێی وایە، زانستی کۆمەڵایەتی بونیادناوە یاخود هەنگاوێکی گرنگ و جددی لەم بارەیەوە هاوێشتووە. هەرچی سوودوەرگرتنە لە سۆسیالیزمی فەرەنسی و ئابووری - سیاسی ئینگلیزی رۆڵەکەی لەپلەی دووەمدا بووە. زۆر دواتر لەلایەن پەرەسەندنی دیالیکتیکیەوە روون کرایەوە کە سۆسیالیزمی فەرەنسی زۆرترین کۆمارگەرایی عەلمانی، ئابووری - سیاسی ئینگلیزیش بە واتای تاکڕەوێتی لیبرالی سەرمایەداری دێت.

فەلسەفەی هیگل گرنگە و تا ئێستاش دۆخی هەنووکەیی خۆی دەپارێزێت. بەو خەسڵەتەی فەلسەفەی شێوەی هێزو توانستی سەرمایەدارییە لە راستیدا لەلوتکەی خۆیدایە. ئەمە دواگوتەی سیستەمە.

هەرچی ئەو کارانەیە کە دواتر لەژێر ناوی فەلسەفەی راستڕەو و چەپڕەو ئەنجامدراون جگە لەداتاکانی کار و خەباتی بەرنامە و پروپاگەندەکانیان مانایەکی دیکەیان نییە. هەر جۆرە ئایدیۆلۆژیایەکی مارکسیزم، لیبرالیزم، کۆنسەرڤاتیزم[1] لەو چوارچێوەیەدان. بەڵام نیچەی فەیلەسوف قوتابخانەیەکی زۆر جیاوازترە. بە بڕوای شەخسی خۆم نیچە سەرهەڵدان "هاوار"ێکی راستەقینەیە بەرامبەر دێوەزمە شوومەکەی سیستەمی سەرمایەداری، وەک سیستەمێکی ئازادی ئەنجامگیرنەبووە، لەدۆخێکی بەمجۆرە دوورە. دوای دووەمین جەنگی جیهانیش قوتابخانەی فەلسەفەی فەرەنسی ئەم ئەرکەی تاقیکردۆتەوە، بەڵام سەرکەوتنەکەی سنوورداربووە.

تێگەیشتنی فەلسەفەی هیگل و لێپرسینەوە لەگەڵ هیگلگەرایی تا ئێستاش ئەرکێکی هەنووکەیی و سەرەکی ئایدیۆلۆژییە. لەم پێناوەشدا شانبەشانی سوود وەرگرتن لە نیچە و قوتابخانەی فەرەنسی، بەڵام پێویستی بەکارو خەباتی فەلسەفی خوڵقکارانەتر هەیە. هیگل هەوڵیداوە لە کەسایەتی ناپلیۆندا شێوەی دەوڵەت ـ نەتەوەی دەسەڵات وەک کۆتایی مێژووی سیاسی مانادار بکات. لەمیانەی گوزارشت و دەستەواژەی داخراو و شاراوە هەوڵدەدات روونی بکاتەوە لەڕێگای ناسنامەی ناپلیۆنەوە بە سیفەتی دەوڵەت ـ نەتەوەوە خوداوەند دابەزیوەتە سەر رووی زەوی، بەمجۆرەش (خوداوەند) هەم بووە بە مرۆڤ یاخود خۆی بریتییە لە مرۆڤ، هەم مردووە (لە ڕێگای بە مرۆڤبوون)، ئەم بابەتانە بانگەشەی

[1] کۆنسەرڤاتیزم: سیاسەتی محافەزەکاری یان ڕەوتی محافەزەکاری؛زاراوەیەکە بۆ ئەو بیرمەندە سیاسیانە بەکاردەهێنرێت کە پەیڕەوکردنی دابونەریت بە بنەما دەگرن. بۆ یەکەمجار لە کۆتاییەکانی سەدەی هەژدەهەم وەک پەرچەکردارێک دژی سەردەمی ڕۆشنگەری لە فەرەنسا سەریهەڵدا. ڕەوتێکە ئاماژە بەو فەلسەفە سیاسیو کۆمەڵایەتیانە دەکات کە نەریت بە بنەما دەگرن. لایەنگری دۆخی ئاواکراونو نەفرەت لە گۆڕانکاری خێراو داهێنان دەکەن.لەجیاتی ئەقڵ بانگەشە بۆ باوەڕی، نەریت لەجیاتی لێکەڕینی ئازاد، ڕیزبەندی پلەداری لەجیاتی یەکسانیو بەها دەستە جەمعیەکان لەجیاتی تاکەکەسو یاسای سروشتی لەجیاتی یاسای عەلمانی بە بنەما دەگرن.

زۆر گرنگن، هەر بۆیە سەرلەنوێ بە بایەخەوە پێویستی بە روونکردنەوە هەیە.

ئەوەی هیگل ئەنجامیداوە، واتە کارە سەرەکییەکەی بریتی بووە لەکۆکردنەوەی گوتە و گوزارشتەکانی کلتووری ماددی و مەعنەوی سەردەمی خۆی. دیرۆکی ١٨٠٠ی زایینی گوزارشت لەتەواوکردنی ئەم کولییاتە دەکات کە فەلسەفەی دەوڵەت - نەتەوە بەردی بناخەکەی پێکدێنێت. ئەو دیرۆکە لەهەمانکاتدا مێژووی مسۆگەربوونی هەژموونی رۆژئاوای سەرمایەدارییە. دیاردەی شۆڕشی پیشەسازیش مۆرکی ئەم دیرۆکەی پێوەیە. نزیکەی دوو سەد ساڵ بەسەر ئەو قۆناخەدا تێپەڕیوە. لەرۆژگاری ئەمرۆشماندا هەژموونگەرایی شارستانی ئەوروپا ئامادەکاری دەکات لەمیانەی قەیرانێکی قورسی ئابوورییەوە سەردەمی فینانس تێپەڕ بکات کە سێیەمین گەورە شەپۆلی جیهانگیرییە. هەژموونگەرایی سەرمایەداری کە بەسەرمایەداری بازرگانی و داگیرکەری (سەدەی ١٥ ـ ١٨)، سەرمایەداری پیشەسازی و ئیمپریالیزم (سەدەی ١٩)، سەرمایەداری فینانس و جیهانگیری (سەدەی ٢٠) ناو دەبرێت و لەناوخۆیشیدا بۆ قۆناخی جیاواز دابەش دەکرێت ئیتر لە گۆڕەپان و بواری گوزارشتی کلتووری ماددی و مەعنەوی هیگل (ئایین، هونەر، فەلسەفە و زانست) پێویستی بە دەربازکردن هەیە. دواترین قەیرانەکانیشی کە سەرچاوەی خۆی لە فینانسەوە وەردەگرێت (ساڵانی ٢٠٠٠) ئیفلاسکردنی سەرمایەدارییە لەبواری بونیادیدا. بۆ گەیشتن بەم رەوشە ئەوەی کەمە خەباتی فەلسەفی ئانتی هیگلیستی و تێکۆشانی سیاسی کردارییە.

هەرگیز ئەو رەخنە و کردارانە کەم و بچووک نابینم کە لە مێژووی ئەم دوو سەد ساڵەی دوایی سەبارەت بە کلتووری ماددی و مەعنەوی شارستانی ناوەندی پێنج هەزار ساڵە پێشخراون. هەر جۆرە بەرخودانێکی کلتووری، ئەنارشیزم و سۆسیالیزمیش دەکەوێتە ناو ئەم چوارچێوەیەوە. هەروەها زەوتە فێمینیستی و ئیکۆلۆژییەکانی قۆناخی دوایش کرانەوەیەکی شایانی باسکردنن. بەڵام ئەو رژێمەی تالان کە لەمیانەی پارچە کاخەزەوە بەدیدێت، بەجۆرێک سەرجەم رووەک، ئاژەڵ، مرۆڤ و

ئاتمۆسفەریشی خستۆتە ژێر مەترسییەوە کە لە هیچ قۆناخێکی مێژوودا نەبینراوە، ئەگەر ئەمڕۆ بێ سڵەمینەوە و بەخۆباوەڕ وەک دێوەزمەیەک حوکمڕانی بەسەر ژیانەوە دەکات، ئەم دۆخە دەیسەلمێنێت کە کەموکوڕی و هەڵەی جددی لەبەرەی بەرامبەردا جێگای باسە. لە هیچ قۆناخێکی مێژوویدا مرۆڤایەتی وەک ئەم قۆناخە بۆ ستەم و چەوسانەوەیەکی وەها ئامادە نەکراوە.

کلتووری خۆرهەڵاتی ناوین کە هەنگاو بەهەنگاو کەوتۆتە ژێر هەژموونگەرایی ئەم دوو سەد ساڵەی دوایی شارستانی ئەوروپا ئیفلاسکردنیشی تێپەڕکردووە و بەئاراستەی رێبازی خۆکوژیدا دەڕوات. ئەمە زێدەڕۆیی نییە. راستییەکی حاشا هەڵنەگرە کە لەهیندستان، چین و ئەفغانستانەوە تا دەگاتە کەنارەکانی زەریای ئەتڵەسی لەگۆڕەپان و مەیدانەکانی ژێر کاریگەری ئەم کلتوورە رۆژانە چالاکی و کردەوەکانی خۆکوژی ئەنجامدەدرێت. لەجیاتی تاوتوێکردنی کەمی یان زۆری چالاکییەکان تەنیا شیکارکردنی ئەو کلتوورەی بناخەکەیان پێکدێنێت، دەشێت رووداوەکان روون بکاتەوە. روونکردنەوەکانی کلتووری نەریتی باو (ئایینە ئیبراهیمییە یەکتا پەرستییەکان) و روونکردنەوەی رۆژهەڵاتناسانی شارستانی رۆژئاوا هێز و توانای روونکردنەوەی ئەم دیاردەی خۆکوژی و قەیرانی نییە، چونکە خۆیان هەم هۆکار هەم ئەنجامێکی ئەم قەیران و خۆکوژییانەن.

ئەو جیهانەی وەک دەستەواژە و گوتەیەکی پڕوپاگەندەیی بە ئیسلام ناودەبرێت بەبڕوای من لە سەردەمی غەزالی[٢]ی ەوە (لە ١١١١دا کۆچی دوایی کردووە) دەستبەرداری فەلسەفە بووە. لەبەرامبەر ئەمەشدا تا رۆژگاری

[٢] ئیمام ئەبو حامد غەزالی: سۆفیگەرایی شافیعییە، یەکێک لە عەلامە گەورەکانی سەردەمی خۆیەتی، بەناوبانگترین زانای ئایینی مێژووی ئیسلامییە(١٠٥٨- ١١١١). فیقەو زانستی کەلامو مەنتقی خوێندووە. سەبارەت بە هەستەکانو ئەقڵ لە ژیانی خۆیدا بە قۆناخێکی گومانی مەعریفیدا تێپەڕیوەو تواناکانیانی لەبارەی تەواوکردنی زانستی یەقین خستوتە ژێر لێکۆڵینەوە.بە ئامانجی پاککردنەوەی دڵو دەروونو تەربیەکردنی ئەخلاق کەوتە خەڵوەتگاو نزیکەی دە ساڵ بەردەوام بوو. گرنگترین بەرهەمەکانی: تهافت الفلاسفە، الاقتصاد فی الاعتقاد، بدایەالهدایە، الاربعین فی اصول الدین.

ئــەمرۆمان لەدەولــەتی دەســپۆتدا قالبۆتــەوە و لەمیانــەی شــەرەكانی زەوتكردنی زێدە ـ بەهاكانی كۆمەڵگا بە ئامانجی دەستەمۆكردن، قڕكردن و بەڕێوەبردنی كۆمەڵگاكان دیاردەگەلێكی لەژمار نەهاتوو بووە.

كاتێک هیگل پەرە بە فەلسەفەی دەولەت دەدات ئـەو هـزر و بونیـادەی دەسەلات ـ سیاسەت بەبنەما دەگرێت كە لەسەردەمی دەولەتشاری گریكەوە تـا دەولـەت ـ نەتـەوەی نـاپلیۆن لـەئارادا بـووە. بـەلام بـۆ پەرەپێـدانی فەلسـەفەی دەولـەت لەخۆرهـەلاتی نـاوین، لـەبواری پـەیڕەو و میتـۆدەوە وەها راسترە كە لەجیاتی دەولەتشاری گریک، لە دەولەتشاری ئوروكەوە دەسـت پێبكرێت. بەشێكی زۆر سنووورداری داسـتانی مێخوداوەنـد ئینانـاو یەكەمین خوداوەنـدی پیـاوی دەولەتشـاری ئـوروک بـەس بـوو بـۆ ئـەوەی بكەومە ژێر تەلیسمە ئەفسوونیەكەیەوە. فەلسەفەكانی سوقرات و ئەرسـتۆ بــۆ قوتــاركردنی دەولەتشــاری ئەســینا لەروونكردنــەوەی دیاردەكــانی دەسەلات و پلەداریدا كورتیان هێنـا و ناتـەواو بـوون. هـەرچی فەلسـەفەی هیگڵە سەرباری كولیاتە تەلیسماوییەكەی بەلام تەنیا توانیویەتی دەولەت ـــ نەتــەوە بەرهــەم بهێنێــت. ئەگــەر لــەرۆژگاری ئەمڕۆمانــدا خــودی ســـەرمایەدارەكانیش (كـــە هـــەم رۆڵـــەی خۆیـــەتی هـــەم ســـەردارە سـەرەكیەكەیەتی) دەولـەت ـ نەتـەوە وەک كۆسـپێک دەبیـنن و لـەبواری كـرداری هـەولی بـەلاوەنانی دەدەن ئـەوا ناتـەواوی و كـورت هێنانەكـەی دەسەلمێنێت.

بێگومان هەر لەسەرەتاوە بینینی كەموكوڕییەكانی فەلسەفەی دەولەت و یاسـای (دەولـەت) هیگـل هـەنگاوێكی گرنـگ و ئەرێنییـە. بـەلام ئـەوەی جێگـای تێڕامـان و وانـە وەرگـرتن بـوو؛ وەلامەكـەی بەشـێوەی ناتـەواوی ناتەواوەكان بوو. چونكـە وەلامەكـەی لەسـەر بنـەمای دەربـازكردنی هیگـل نەبوو، بەلكو مانای درێژەپێدانی هیگل بوو. چونكە لەدیالیكتیكی سـەردار ـــ كۆیلــە دا، بەســەرداركردنی كۆیلــە و نەهێشــتنی ســەردارەكەی وەک سۆسیالیزم و كۆمۆنیزم هەلدەسەنگێنرێت. لەرووخساردا وەها دیاردەبێت كە ئەم بژارەی چارەسەری ئامانجی كۆمەڵگای بێچینو بێ چەوسانەوەیە. بـەلام كاتێـک بپرسـین لەمیانــەی كامــە ئــامرازەوە بەدیـدێت: وەلامەكـە

لەسەرمایەدارییەکی دەوڵەتی بەپلان و راسیۆنالتر تێپەڕ ناکات. ئەمەش سەرمایەدارییەکی دەستە جەمعییە کە زۆر لەسۆسیالیزمی فیرعەون کۆنەپەرست و تاقەت پرووکێنتره. ئەگەر داکۆکیکارانی مارکسیزم بن یاخود رەخنەگرانی سەرەڕای ئەوەی خۆیان بە بیریار و رێزانی مەزن لە قەڵەم دەدەن، بەڵام تا ئێستا بەبێ شەرم و رووسووربوونەوە درێژە بە ورێنەکانیان دەدەن.

لەسەررووی هەموویانەوە ئەزموونەکانی ریال سۆسیالیزمی سۆڤێت و چین لەبواری کردارییەوە دەیسەلمێنن کە لەبەر دوو هۆکاری گرنگ ئەم ئەنجامانە هاتۆتە ئاراوە. یەکەمیان بونیادنانی پۆزیتیڤیستانەی تیۆری رەنج ـ بەهایە. ماوەی کارکردنی رۆژانەی کارکەرێک وەک پێوەری بەهای راستەقینەی رەنجەکەی دەبینرێت. لەبواری مێژوویی و کۆمەڵایەتییەوە کارکەرێکی بەمجۆرە جێگای باس نییە و نەبووە. مرۆڤێکی بەمجۆرە جێگای باس نییە کە بەدیاردەی " کرێکار" ناودەبرێت. وردتر بڵێین بەمجۆرە نییە کە (پێناسەکەی لەسەرمایە دا) باسکراوە. پێکهاتنی مرۆڤ ـ تاکێکی بەمجۆرە لەئارادا نییە. چونکە ئەگەر تاک کۆمەڵایەتی بێت، ئەوا هەرگیز کارکەر بەمجۆرە نابێت وەک لەسەرمایەداریدا هاتووە. بۆ ئەوەی تیۆری رەنج ـ بەهای مارکسی گوزارشت لەراستی بکات، بەر لەهەموو شتێک پێویستە تاک لەدۆخی کۆمەڵایەتی خۆی دەربکەوێت. سەرجەم ئەو لێتوێژینەوە سۆسیۆلۆژیانەی تا رۆژی ئەمڕۆمان ئەنجامدراون سەلماندوویانە کە هەرگیز تاک بەبێ کۆمەڵگا ئاوا نابێت. تەنانەت بە زیادیشەوە ئەم راستییەیان سەلماندووە.

رقێکی زۆرم لەدووبارەکردنەوەی ئەو راستییە سادەیە هەڵدەستێ. ئەگەر تاک کۆمەڵایەتی بێت، بەهۆی کۆمەڵایەتیبوونەکەشی مێژوویی بێت، ئەو کاتە مەحاڵە رەنج ـ بەها بپێورێت (کرێ، قازانج، هەراج، سوود .. هتد). چونکە ئەو راستییە پێودانگ ناکرێت کە کۆمەڵایەتیبوون لەکامە دیرۆک و لەمیانەی کەڵەکەبوونی رەنجی کێ بونیادنراوە. لەبەر ئەم هۆکارەیە کە زانین یاخود پێودانگکردنی چەندایەتی و چۆنایەتی ئەو رەنجە بونیادنەرانە مەحاڵە کە دەرخواردی کۆمەڵگا دراوە. بێگومان

لەکاتێکدا کۆمەڵگا لەمیانەی کۆمەڵایەتبوونی بەردەوامی رەنجی ئەو تاکانە بەدیدێت کە لەبواری چەندایەتی و چۆنایەتییەوە پێودانگ ناکرێت، خۆشی بەشێکی ئەو رەنجە قاڵبۆوە و بەدامەزراوە بووە دەدات بەتاکێکی خۆی، بۆ نموونە بەکارکەرێکی خۆی دەبەخشێت و دەیکات بە مرۆڤ. لەسەرووی یانەوە دامەزراوەی خێزان تەنانەت قۆناخی مێژووی نووسراویش ناتوانێت نرخ بۆ ئەو رەنجە تەزیوە دابنێت ـ نەک تەنیا رەنجی هەڵگرتنی منداڵ لەناو سکی دایکیدا یاخود بەخێوکردن و گەورەکردنی منداڵ ـ. ئەگەر خوازیاری پێوانەیەکی دادوەرانەی رەنجین، ئەوا پێویستە سەرتاپای سەرگوزەشتەی کۆمەڵایەتی بەکۆمەڵگابوونی جۆری مرۆڤ بخەینە ناو چوارچێوەی بەهاوە.

ئەمەیە ئەو خاڵەی واقی ورماوم دەکات: ئەو هەموو فەیلەسوف و میلیتانانەی خۆیان بەلایەنگری رەنج دادەنێن، لەسەرووی هەمووشیانەوە مارکس، چۆن ئەو راستییە سادەیان نەکرد بە بابەتی تێرامان و هزراندن؛ ئەگەر هەندێک جار ئەو هەوڵەشیان دابێت، بەڵام ئەنجامێکی بنچینەیی و عادیلانەیان بەدەست نەهێناوە. لەتوانادا هەیە بسەلمێنرێت کە تەنیا رەنجی دایک لەرەنجی چل ساڵەی کرێکارێک بەنرخ و بەهادارترە. ئەی چۆن حیسابی بەشە کرێی ئەو زانست، هونەر، ئایین، فەلسەفە و مێژووە دەدەین کە ئەو تاکە "کرێکار"ەی هێناوەتە دونیا ؟. هەڵبەتە ناتوانین بەگوتەی خاوەنەکانیان مردوون خۆمان لەمەسەلەکە قوتار بکەین یاخود خۆمانی لێ بدزینەوە. بەهەر حاڵ ئەمە یەکێک لەپرەنسیپەکانی سۆسیالیزمە کە خاوەن رەنج نەمرە. لەدۆخێکی بەمجۆرەدا لەژێر رۆشنایی ئەم کورتە پێناسەیە گرفتی کارکەر و کرێکاران لەباسێکی میتۆلۆژی بەولاوە تێپەڕ ناکات.

هەر بۆیە بەدۆخی دیاردەی ماتریالیستی هەرە قەبەوە شرۆڤەکردنی فەلسەفەی پۆزیتیڤیست وەک پووچترین میتافیزیا، گوتەیەکی نزیک بەراستی یە. لەمیانەی ئەم پۆلێنبەندییەوە پێویستە "زانستی کۆمەڵایەتی" مارکسی پۆزیتیڤیست رەخنە و رەخنەدانی خۆی بدات. لەم بوارەدا رۆڵی سەرەکی ئەخلاقی کۆمەڵایەتی (کۆمەڵگا) دەردەکەوێتە پێش. چونکە

هەرکاتێک ئەخلاق نوێنەرایەتی قەپانی عەدالەتی ئەو رەنجە کۆمەڵایەتییە دەکات کە هەرجار ناکەوێتە ناو پێوانەکانی باش و خراپی کۆمەڵگاوە. ئەمەش راستەکەیانە: پێگە سنووردارەکەی مارکسیزمیش لەتیۆری ئەخلاقدا لەنزیکەوە وابەستەی چەمکی کرێ و رەنج ـ بەهایە. لەبەر ئەم هۆکارە هەم زیاتر دەرکی پێدەکرێت کە بێبەریبوونی لەبنەمای ئەخلاقی رۆڵێکی یەکلاییکەرەوەی لە هەرەسهێنانە ئاسانەکەی سۆسیالیزمی بونیادنراودا بینی هەم لەسەرووی فاکتەرە گرنگەکانی رەخنەکردنەوە دێت. گرنگترین خاڵی کە پێویستی بە ئاماژەپێکردنە ئەوەیە کە رێگای رزگارکردنی کۆمەڵگا لەچەنگ سەرمایەداری سەندیکاگەرایی و پارتیگەرایی دەوڵەت نییە، بەڵکو بەکۆمەڵگای سیاسی و ئەخلاقیدا تێدەپەڕێت. ئەگەر وەک پەرتووک لەسەرمایەدا بێت یاخود لەسیستەم دووەمین چەوتی و گەورە بەهەڵەداچوونی سەبارەت بەپێناسەکانی سەرمایەداریدا کراوە دەرهەق بەهەڵە دارشتنی پەیوەندی نێوان توندوتیژی ـ دەسەڵات، پلەداری ـ کەڵەکەبوونی زێدەبەهایە. سەرجەم تێڕوانینەکانی لەبارەی کۆمەڵگای مێژووییەوە ئەنجامدراون پیشانیدەدەن کە جگە لەپێویستییە ژیانییەکان لەکەڵەکەکردنی سەرجەم زێدە (بەها، بەرهەم)ەکاندا توندوتیژی رۆڵی دیاریکەری بینیوە. هیچ کەڵەکەکردنێکی زێدە (بەها، بەرهەم)کانی کۆمەڵگا بوونی نییە کە توندوتیژی لەخۆوە نەگرتبێت. زەوتکردنی کەڵەکەبوونەکانی کۆمەڵگا لەژێر سەرجەم بیانووەکانی بونیادنانی پلەداری و دەسەڵاتەکاندا شاراوەیە. گشت شێوەکانی بونیادنانی دەسەڵات بەشێوەیەکی راستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ گرێدراوی کەڵەکەکردنن. ئەگەر ئەبستراکت "دەرهەست"تری بکەین، زۆربەی زۆری پلەداری و دەسەڵاتەکان رەنجی قاڵبۆوەی کۆمەڵگان. ناکرێ و ناشێت دەسەڵات لەرەنجی کۆمەڵایەتی"کۆمەڵگا" قاڵبۆوە و دامەزراوە بوو ئەبستراکت بکرێت. هەر لەسەردەمی راوکردن و کۆکردنەوەی خۆراکەوە کە " پیاوی بەهێزو فێڵباز" چاوی بڕیبووە بەهای هەوڵو کۆششی جفاتەکانەوە ــ لەسەرووی هەمووشیانەوە هی ژنان ــ تا دەگاتە دەستبەسەرداگرتنی بەها پێشکەوتووە کۆمەڵایەتییەکان لەمیانەی پشتبەستن بە شێوەی دەوڵەت ـ

نەتەوە کە ڕێکخستنی توندوتیژی سەرمایەدارییە، هیچ کەڵەکەبوونێک ئەو هێز و توانایەی نییە کە بەشێوەیەکی ئەبستراکت لە دەسەڵات بەدیبێت. خودی قۆناخی پێنج هەزار ساڵەی شارستانی ناوەندی کەڵەکەبوونێکی قاڵبۆوە و دامەزراوەبووی کۆمەڵایەتییە. ئەوەی زۆربەی زۆری لەمیانەی شەڕی سامناک، دامەزراوەکانی هێز و دەوڵەت بەڕێوە دەبرێت کەڵەکەبوونی کۆمەڵایەتییە.

گوزارشتی "یەکەمین شێوازی بەرهەمهێنانە کە لەدەرەوەی دامەزراوەی دەوڵەت لەمیانەی یەکێتی ئارەزوومەندانەی خاوەنکار - کارکەر بە پشتبەستن بە بازاڕ بەدیدێت "کە هەندێک سۆسیالیستی ئەکادیمی وەک پشکێک بەسەرمایەداری دەبەخشن پڕوپاگەندەی درۆیەکی شاخدارە. شێوازێکی بەمجۆرەی بەرهەمهێنان بوونی نییە. بەپێچەوانەوە لە مێژوودا ئەو سیستەمەی لەسەر بنەمای تۆکمەترین و دامەزراوەترین توندوتیژی شێوازێکی کەڵەکەکردن و زێدە - بەهای پێکهێناوە سەرمایەدارییە. سەرتاپای مێژوو بەوردی چاوی پێدا بخشێنرێت و لەبێژنگ بدرێت: دەبینرێت کە زێدە "بەرهەم - بەها" کۆمەڵایەتییەکانی سەردەمی سۆمەرییەکان و میسرییەکانی پشتبەستوو بەکشتوکاڵ تا دەگاتە ئەو کەڵەکەبوونە کۆمەڵایەتیانەی پشت بەبازرگانی و پیشەسازی دەبەستێت بەردەوام چاودێری توند و بەڕێوەبەرایەتی جێبەجێکاری پلەداری و دەسەڵاتەکان جێگای باس بووە. ڕاستیەکی کۆمەڵایەتییە و زۆر بەئاسانی هەستی پێدەکرێت کە لەو زەمینە و هەلومەرجانەی ئامێر و دامەزراوەکانی توند و تیژی دەستبەکارنین، سوودیش بەدینایەت کە بریتییە لەبەدەستهێنانی قازانج لەڕێگای پارەوە. لەم مژارەدا دەتوانرێت مێژوو وەک ڕاستی و واقیعێکی نەپچڕاو و کەڵەکەبوو پێناسە بکرێت کە پابەند بەزنجیرکردنی هەر بوارێکی کۆمەڵایەتییە. سەرباری ئەوەی مێژووی سەرمایەداری لەم بارەیەوە گوزارشت لەواقیعێکی زۆر ناسراو دەکات، بەڵام زۆربەی زۆری گوتەکانی سەرمایە لەپڕوپاگەندە و باسێکی میتۆلۆژی بەولاوە تێپەڕ ناکات کە بەتەونەکانی ش[illegible] و چەواشەکاری هۆنراونەتەوە.

هەڵبەتە گومان لە نیازپاکی مارکس و مارکسیستەکان ناکرێت. بەڵام پەرەپێدان و بونیادنانی دەسەڵات - دەوڵەت و رەنج - بەها وەک سەرمایەداری دەوڵەت لەسەرمایەداری لیبراڵ زیاتر خزمەتی بەسیستەم کردووە. تەنیا ئەزموونەکانی چین و روسیای سۆڤێتی بۆ سەلماندنی ئەو راستییە بەسن. لەکاتێکدا هیگلگەرایی راسترەو نەتەوە - دەوڵەتی ئەڵمانی و ئەوروپای لێکەوتەوە، هیگلگەرایی چەپڕەویش دەوڵەت - نەتەوەکانی دەوروبەر (کەنار)ی لێکەوتەوە، لەسەرووی هەمووشیانەوە روسیای سۆڤێتی و چین. ئەگەر لەسەرەنجامدا هەردووکیان لەگەڵ نەتەوە - دەوڵەتی سەرمایەداریدا بوونەتە یەک و ئاوێتەبوون، هەڵبەتە لەدۆخێکی بەمجۆرەدا پەیوەندییە ریشەییەکەیان بەفەلسەفەی هیگلەوە نکوڵی لێناکرێت. هەرچەندە شڵەژانێکی زۆریشی بەخۆوە دیبێت، بەڵام ئەوەی تا ئێستاش بەشێوەیەکی رۆژانە لەبارەی دەوڵەتەوە پەیڕەو دەکرێت فەلسەفەی هیگلە.

ئەو رەخنانەی لەلایەن فێمینیست و ئیکۆلۆژیکەکان لەسەرووشیانەوە لەلایەن ئەنارشیستەکانەوە سەبارەت بەو سیستەمە — کە وەک مۆدێرنێتەی سەرمایەداری پێناسە دەکرێت — پێشدەخرێت گرنگ و بایەخدارن. بەڵام پێویستە دەرک بەو راستییەش بکرێت، هێشتا ئەو رەخنانە چینی ناوینی شارنشینی تێپەڕ نەکردووە کە لەتەنگەژەدان.

کاتێک قەیرانی کۆمەڵگا و دەوڵەت لە خۆرهەڵاتی ناوین تاوتوێ دەکەین گرنگی و بایەخێکی زۆر بەم لایەنەوە دەدەم کە نەخلیسکێمە ناو هەمان هەڵەکانی بەرخودان و رەخنەکانی بەگشتی پێنج هەزار ساڵە بەتایبەتیش ئەم پێنج سەد یان دوو سەد ساڵەی دوایی. ناچارین ئەو گرنگییەی پێبدەین. لەم بارەیەوە لەجیاتی داهاتوو زیاتر گرنگی بەژیان لەپێناو نەریتی رابردوو دەدەم و بەهاداری دەبینم. زیاتر لەبەر ئەم هۆکارەیە کە مێژوو زانست و فەلسەفەیەکی پێویستە. مێژوو چیرۆک و سەرگوزەشتەی مردووان دەگێڕێتەوە، بەڵام لەپێناو ژیانێکی مرۆییانە باسی دەکات. پێویستە باش بزانرێت ئەوانەی مەعریفەی مێژووییان نییە ژیانیان هیچ مانایەکی نابێت. پێویستە ئەوەش لەبیر نەکرێت کە چەندە

مەعریفەی مێژووییان هەبێت تا ئەو رادەیە دەبنە خاوەن ژیانێکی کۆمەڵایەتی مانادار. هەر تەنیا ئەوەندەش نا؛ بەقەدەر مانا کاتێک بەخەسڵەتی بونیادی ماددی و کلتوورەکان مێژوو ژیانداربکرێت ئەوا گوزارشت لەنرخ و بەهای ژیانی کۆمەڵایەتی دەکرێت.

هەڵبەتە شیکارکردنی کلتووری خۆرهەڵاتی ناوین، قەیرانە هەنووکەییەکەی دەوڵەت و کۆمەڵگاکەی لەمیانەی دەربازکردنی هیگل و کارل مارکس کارێکی بەزەحمەتە. لەدەرەوە و ناوەوە رەخنە و بەرخودانێکی زۆر بەرامبەر ئەزموونی ئەم دوو سەد ساڵەی دوایی هەژموونگەرایی سەرمایەداری لەسەر ناوچەکە و بونیادنانی سیستەم لەلایەن هێزە هەمەجۆرەکانی وەک ئیسلامیە رادیکاڵەکان تا میانڕەوەکانیان، لەکۆمۆنیستەکان تا میللیگەراکانی، لەلیبراڵەکانەوە بگرە تا دەگاتە محافەزەکانرەکان لەسەرکەوتنەوە دوورە. لەم سۆنگەیەوە ئەو گواستنەوەیەی کار و خەباتی رۆژهەڵاتناسە نێردراوەکانی شارستانی ئەورووپا کە مێژوو بەگوێرەی داخوازی و بەرژەوەندی هەر توێژ و جڤاتێک دەگوازنەوە نەیانتوانیوە سەنتێزێکی فەلسەفی یان دەزگا و پێشکەوتنێکی سیاسی ئازاد دەستەبەر بکەن.

پەرەپێدانی سیستەمی شارستانی دیموکراتی لەچوارچێوەی مانای ئەو رەخنە و بەرخودانە، وەک رێگای راستی حەقیقەتی کۆمەڵایەتی خۆی دەسەپێنێت. لەو بڕوایەدام کە هەر سێ بەرگی یەکەمینی بەرگرینامەکەم ئاراستە و راستەڕێی پێویستی پیشانداوە. ئەو کار و خەباتەی لەم بەشەدا ئەنجامی بدەم، قاڵبوونەوەی زیاترە لەسەر دۆخی بەرجەستە و کۆنکرێتی خۆرهەڵاتی ناوین، بەتایبەتیش قورسایی دەخەمە سەر رەهەندی چارەسەری مێژوویی. لەبەر ئەم هۆکارەش پێویستیم بە جەختکردنەوە سەر ناچاری کارەکتەری گەردوون(جیهان)ی مێژوو کردەوە. لەپێناو تێگەیشتنی ناوچەکە چارەسەری گەردوونی "جیهانی" دەست لێبەرنەدراوە. چونکە بەو ئەندازەیەی مێژووی جیهان"گەردوونی"خۆراکی خۆی لە مێژووی پێنج هەزار ساڵەی شارستانی ناوەندی وەرگرتووە، بەڵام تێرخۆراککردنی لەلایەن ١٠٠٠٠ دە هەزار ساڵی سەردەمی نیولیتیکەوە کە

بەلانی کەم هێندەی ئەو گرنگە، بایەخ و پێگەی ناوچەکە بەکاریگەر و سەرنجراکێشتر دەکات. لەچارەسەرکردنی کێشە جیهانییەکان و سەنتێزە نوێیەکانی شارستانێتیدا خۆرهەلاتی ناوین بەلانی کەم بەقەدەر ئەوروپا خاوەن پێگە و قورساییە. پرۆژەی خۆرهەلاتی ناوینی مەزن کە هەژموونگەرایی ئەمریکا لەسالانی ٢٠٠٠ەکاندا خێرایی پێدا بەپێی پێویست روون بۆتەوە کە بەشێوەیەکی یەکلایەنە کاراو چالاک نابێت. لەوانەیە رۆژهەلات و باشووری رۆژهەلاتی ئاسیا و ئەمریکای باشوور لەگەل سیستەمدا ئاوێتەبن، بەلام ناشێت چاوەروانی ئاوێتەبوونی ناوچەیەک لەگەل سیستەمدا بکرێت کە رۆلی مێژوویی شارستانێتی ناوەندی بینیوە. ئەگەری دابرانی تەواو لەسیستەمیش جێگای باس نییە. چونکە لەبنەرەتدا تایبەتمەندێتی دابران یان ئاوێتەبوونی سەرتاسەری شارستانییەکان سنووردارە. هەولەکانی سەرلەنوێ بونیادنانەوەی سیستەم لەودیو بونیادنانەوەکەی دوورگەی گرینلاند بەولاوە زیاتر رۆل نابینێت.

شارستانێتی دیموکراتی بژارێکە هەم وەک نەریتی مێژوویی هەم لەهەلومەرجەکانی قوولبوونەوەی قەیرانی رۆژانەییدا گرنگی خۆی دەنوێنێت. سەرلەنوێ بونیادنانەوەکانی دەکەونە چوارچێوە و تەوەری دەولەت ـ نەتەوە وە، بەردەوام کارەکتەری قوولکردنەوەی قەیرانیان هەیە. واقیعی کلتووری ناوچەکە هەم لەبواری ماددی هەم لەبواری مەعنەوی لەگەل دەولەت ـ نەتەوە لەناو ناکۆکی دیالیکتیکیدایە، هاوشێوەی تەقینەوەی گرکانەکان ئەم ناکۆکییە قوولبووەوەش کارا دەبێت. ئەگەر کۆمپانیا سەرمایەدارییەکان بێت یاخود دەولەت ـ نەتەوەکان تەنانەت بەقەدەر میرنیشینییە خۆجێییەکانیش رۆلی چارەسەرکردن نابینن کە بەهەزارانیان لەمێژوودا ئاواکران و هەزاران سالیش بەردەوام بوون. وەلامدانەوەی کێشە کۆمەلایەتییەکان لەولاوە بمێنێت، بەلکو لەمیانەی رەفتارە ئایدیۆلۆژی و هەلوێستە کردارییەکانیان هەم کێشەکان زیاتر دەکەن هەم خەستتری دەکەنەوە. هەر سیستەمێک چانسی چارەسەرکردنی لەخۆرهەلاتی ناویندا بەرکەوت، بەر لەهەموو شتێک پێویستە بەشێوەیەکی سەرکەوتووانە لێپرسینەوەی ئایدیۆلۆژی لەگەل

میللیگەرایی، رەگەزگەرایی، ئاینگەرایی و زانستگەرایی پۆزیتیڤیست رایی بکات و بەڕێوەی ببات. لەبواری گۆڕەپان و سەکۆی سیاسەتی کرداریشدا بەگشت دەوڵەمەندییەکەیەوە ناچارە جێگا بە کار و خەباتی کۆمەڵگای دیموکراتی دەرەوەی تەوەرەی دەوڵەت بدات. باس لەو کۆمەڵە مەدەنییە ناکەم کە ناوەڕۆکەکەی پووچە. پێویستە کلتووری دیموکراسی خۆجێیی راستەقینە بەقەدەر نان، ئاوو هەوا وەک پێداویستییەک ببینرێت و پەرەی پێبدرێت. قوتاربوون لەو تاکەی لەفەلەکی کلتووری دەوڵەت و دەسەڵاتدایە کە وەک موگناتیس تاک بۆ خۆی رادەکێشێت، یەکەمین ئەرکە کە پێویستە سەرکەوتووانە جێبەجێ بکرێت، ئەم نەریتە هەزاران ساڵییە گرنگترین بەربەستی بەردەم کلتووری دیموکراسییە. پێویستە ئەمە دروشمی سەرەکیمان بێت: هیچ کار و خەباتێکی کۆمەڵایەتی هێندەی تێکۆشان و خەباتی کۆمەڵگای دیموکراتی بە سەلیقە و هێژا نییە.

لەبەشی دووەمی بەرگرینامەکەمدا کە دوای دەروازە دێت بەراوردکاری نێوان مێژووی جیهانی و خۆرهەلاتی ناوین ئەنجامدەدرێت. واقیع و راستینەی ژیۆلۆژی، بایۆلۆژی و کۆمەڵایەتی ناوچە بەیەکەوە تاوتوێ دەکرێت. مانای مێژووی جیهانی و کرانەوەی لەناوچەدا لەچوارچێوەی هێڵی گشتی باس دەکرێت. پەیوەندی نێوان سەردەمی نیولیتیک و گوزەرکردن بۆ شارستانی و رۆڵی هەژموونگەرایی شارستانی ناوەندی لەناوچەکەدا هەوڵی ماناداركردنی دەدرێت. هەروەها سروشتی دەسەڵات و شەڕیش پێناسە دەکرێت کە شارستانی بەبێ ئەوان هەڵناکات، لەم چوارچێوەیەشدا شێوەگرتنەکانی دەوڵەت هەڵدەسەنگێندرێت. هەڵوێستێکی بەراوردکارانە لەنێوان شارستانی ناوەندی و شارستانییەکانی دیکە دەخرێتە روو.

لەبەشی سێیەمدا باسی سەرچاوە و پەرەسەندنی کێشەکانی کۆمەڵگای خۆرهەلاتی ناوین دەکرێت. ئایدیۆلۆژیا و پراکتیکە شەڕانگێزییەکان کە بەردەوام لەسەر زێدە (بەرهەم، بەها) کۆمەڵایەتی قازانج بەدەست دێنێت و شکۆدار دەکرێت، وەک هۆکاری سەرەکی کێشەی کۆمەڵگا دەست نیشان دەکرێت، ئەو چەواشەکاریانە و قۆناخەکانی قوڵبوونەوەی قەیرانەکان

دەخرێتە ڕوو کە ڕێگایان لە پێش کردۆتەوە. هەروەها ئەو دەرەنجامانەش لەو بەشەدا هەڵدەسەنگێنرێت کە هەڵخلیسکانی دەسەڵاتی هەژموونگەرایی کات بەسەرچووی بناخە سواوەکە لە ناوچەکەدا خولقاندوویەتی.

لەبەشی چوارەمدا ڕۆڵی هێزەکانی بەرخودان و ئایدیۆلۆژیەکانی رزگاری و چارەسەری گفتوگۆی لەبارەوە دەکرێت. ڕۆڵی سیستەمەکانی - هۆز - تیرە و ئایینە تاکخوداییەکان هەڵدەسەنگێنرێت، لێپرسینەوەو لێپێچینەوە لەبارەی توانای ئاسیمیلاسیۆنی سیستەمەکانی شارستانی دەکات. هۆکارەکانی سەرنەکەوتنی ئایدیۆلۆژیەکانی رزگاری و هێزەکانی بەرخودان مژاری سەرەکی سەرجەم هەڵسەنگاندن، گفتوگۆ و لێپرسینەوەکان پێکدێنێت. لەو چوارچێوەیەدا شێوەکانی بە ئایینبوون و پێکهاتەی خێڵەکان دەخرێتەڕوو. بابەتێکی دیکەی گرنگ کە هەوڵی ماناداركردنی دەدرێت، ئەو سیستەمەی لەناوەخۆیدا پەرە بە چارەسەری نەدات لەمیانەی گورزی جەرگبڕەوە هەڵدەوەشێنرێتەوە و مەیدانی نوێی هەژموون دێتە ئاراوە.

لەبەشی پێنجەمدا چاوخشاندنێک سەبارەت بە ڕۆڵی مێژوویی توانستی سەرمایەداری دەکرێت کە لەکەنارەکانی ڕۆژئاوای ئەوروپا وەک هێزێکی نوێی هەژموونگەرایی سەرکەوتوو سەریهەڵداوە. دۆخی دواکەوتوویی شارستانی خۆرهەڵاتی ناوین و بەردەوامکردن و ژیانداركردنی کێشەی کۆمەڵایەتی لەئاستی قەیراندا گفتوگۆی لەبارەوە دەکرێت. هەڵکشانی هەژموونگەرایی ئەوروپا ئەو کۆمەڵگایانەیان شۆک کردووە کە خۆیان بە ئیسلام یان موسڵمان دادەنێن. هەروەها ئەو خاڵەش هەڵدەسەنگێنرێت؛ سەرمایەداریش کە سیستەمی تەنگەژە و قازانجە لەجیاتی ئەوەی سەرچاوەی چارەسەری بێت بۆتە کانگای کێشەکان؛ لەناوچەدا ڕێگای لەپێش تێکەڵبوونی کێشەکانی کۆمەڵگا و دەوڵەت کردۆتەوە. خۆکوژییە ئایدیۆلۆژی و کردەییەکانیش لەو چوارچێوەیەدا تاوتوێ دەکرێت.

لەبەشی شەشەمدا وەک بژارێکی چارەسەری ڕۆڵی شارستانێتی دیموکراتی لەمێژوو و ڕۆژی ئەمڕۆماندا گفتوگۆی لەبارەوە دەکرێت.

دەستکەوتە دیموکراتییەکانی شارستانی ئەورووپا و میراسی مێژوویی کلتووری لەسەرلەنوێ بونیادنانەوەی شارستانێتی دیموکراتی لەبواری ئایدیۆلۆژی و کرداریدا هەڵدەسەنگێنرێت. کۆنفیدرالیزمی دیموکراتی، کۆمەڵگای ئەخلاقی و سیاسی، سیستەمێکی تەوەرەی ژن و ژینگەپارێزی وەک دامەزراوە گرنگەکانی چارەسەری دەخرێتەڕوو.

بەشی ئەنجام؛ لەمیانەی پوختەیەکی کورت رۆڵی پرد و یەکتربەستنەوە لەگەڵ مژاری دواتردا دەبینێت.

بەشی دووەم

## مێژووی گەردوونی و خۆرهەڵاتی ناوین

سەرجەم زانستەکان لەبارەی ئەو حەقیقەتەوە هاوفیکرن حە میزوو نەک تەنیا بۆ کۆمەڵگای مرۆڤ بەڵکو رۆڵی ئافرێنەری بۆ تەواوی بوونەوەرەکانی جیهان "گەردوون" دەبینێت. زەمان پێکهێنەر یان ئافرێنەرە. رۆڵی ئافرێنەری کە بۆ خوداوەندەکان دانراوە و زیادکراوە، کاتێک خودی زەمان ئەم رۆڵە دەبینێت وەک پەنهانی و لوغزێک وایە. چونکە خێرایی پێکهاتن "دروستبوون" بە زەمان ناودێر دەکەین. پێکهاتن یان درووستبوون نەبێت ئەوا زەمانیش بوونی نابێت. خەسڵەتی پەنهانی یان نهێنی بەمجۆرە لەفیکری مرۆڤدا رەنگ دەداتەوە. بەستنەوەی پیربوون و بەساڵاچوون بە کاریگەری بکوژانەی زەمەنەوە وەک پێناسەیەکی راست جێگای باس نابێت. کاتێک زەمەن کاریگەری بکوژانەی نەبێت ئەوا ئەم پێناسەیەش هیچ نرخ و بەهایەکی نییە. لەم سۆنگەیەوە مردن بوونی نییە. مردن بیرەوەرییەکی مرۆڤە کە لەبواری سۆسیۆلۆژییەوە بونیادنراوە. سۆز و هەستێکی دروستکراوە. بەڵام ئانێکی زۆر هێژا و بەهادارە بۆ ژیان. راستتر بڵێین کاریگەریەکی ئاگادارکەرەوەیە. وەک هیگل پێویستی بە ئەنجامدانی "کاروانی تین(رۆح)" نابینم. بەڵام ئاگادارم لەم رێگایەوە هیگل خوازیاری ئەنجامدانی چی بووە. هەرچەندە لەمیانەی تیۆری "بینگ بانگ"ەوە هەوڵدرابێت تەمەنی گەردوون "نزیکەی ١٣،٨ ملیار ساڵ" و مێژوویک دیار بکرێت، بەڵام ئەگەر و شیمانەیەکی بەهێزە ئەمەش باسێکی میتۆلۆژی نوێی شارستانی رۆژئاوایە. سەرباری تەواوی ئەو زانستیبوونەی تێیدا بەدی دەکرێت، رۆڵێکی کۆمەڵایەتی هاوشێوەی چیرۆکەکانی ئافراندنی پەرتووکە پیرۆزەکان دەبینێت، بەڵام کاتێک

دەگوترێت ئەمە بەمجۆرەیە نکوڵی لەزەمان ناکرێت. تەنها بانگەشەی پاراستنی تایبەتمەندێتییە پەنهانی و نهێنییەکەی دەکرێت. هەبوونی توانا و دەرفەتی پشکنین "کشف"ی ڕێژەیی لەکۆمەڵگای مرۆڤدا بۆ خۆم وەک چانسێکی گەورەی هەڵدەسەنگێنم.

ڕۆڵی مێژووی کۆمەڵگا لە دروستکردن و پێکهێنانی مرۆڤدا تا دوارادە گرنگ و بایەخدارە. ئەگەر نهێنی و لوغزی زەمان ئاشکرا بکرێت، تەنها دەتوانین لەم ماوە کورتانەی دروستکردندا بیدۆزینەوە. هێزی دروستکردنی تاک لەلایەن کۆمەڵگاوە زۆر لە زەمەنەکان کەمتر مانادار بووە. ئەگەر کار و خەباتێکی زۆری لەسەر بکرێت، دەشێت قووڵایی مانا بەدەستبهێنرێت. چونکە لەهیچ دیاردەیەکی دیکەدا ناتوانین هێزی زەمان کەشف بکەین. هەر لەبەر ئەمەشە کە زانستی کۆمەڵایەتی وەک شاژنی بنەڕەتی یاخود وەک مێخوداوەندی سەرجەم زانستەکانی هەڵدەسەنگێنم. هەروەها پێویستە ئاماژە بەم دەستنیشانکردنە گرنگەش بکەم: گومان لەسەرجەم ئەو زانستانە دەکەم کە زانستی کۆمەڵایەتی بەبنەما ناگرن. ئەو ڕێگایەی بەرەو تەواوی ڕێگاکانی دیکە دەڕۆن؛ بە بونیادنان و پەرەپێدانی زانستی کۆمەڵایەتیدا تێپەڕ دەبێت. تەنها بەڕادەی پێشکەوتنی زانستی کۆمەڵایەتی دەتوانین بەزانیاری وردە گەردیلەکانی تەنۆلکەی ئەتۆمی ماددە و زانیارییەکانی گەردوونی کۆزمۆس بگەین کە تا ئێستاش بانگەشەی فراوانبوونی بەردەوامی دەکرێت.

نەک تەنیا هیگڵ بەڵکو لە پەرتووکی پیرۆزیش دا کاتێک سەرگوزەشتەی ئافرێنەری خواوەند بە ویست و ئارەزووی "پەی پێبردنی" خوداوەند دەبەستنەوە، واتا کاتێک بەدەست پێکردنی هزراندنی فیکر لەبارەی خۆیەوە دەبەسترێتەوە ئەمە دەستنیشانکردنێکی گرنگە. بەو ئەندازەیەی مەعریفەی مرۆڤ بڕی کردووە ئەمە دۆخێکە تا ئێستا لەدەرەوەی کۆمەڵی مرۆڤەوە رووی نەداوە. دەستپێکردنی لەخۆ هزراندنی مرۆڤ بناخەی تەواوی بوونەوەر(کائینات)ەکانە. پرسیاری "ئایا بەقەدەر ئەتۆم فیکر لەناو جیهانی کۆزمۆسیشدا هەیە ؟" هێژایە و تابلێی بەکاریگەرە. پێویستە ئاماژە بەم خاڵەش بکەم؛ جەسارەت ناکەم بڵێم

گەردوونــە ورد و درشــتەکان بــەبێ هــزر "هزرانــدن" پێکهــاتوون. بــەپێی پێویســت روون بۆتــەوە کــە زاراوەی "مــاددەی بــێ رۆح" کــە لەســەری راهاتووین زاراوەیـەکی سۆسیۆلۆژی زۆر پووچـە. پێویسـتە بـەم هۆیـەوە نەڵێن هیگلگەراییت کردووە. پەیوەنـدی هـزر لەگـەڵ شـەپۆڵەکانی مێشکدا دەستنیشـان کـراوە؛ تەنانـەت تـا رادەیـەک سـەلمێنراوە کـە شـتێکی وەک وزەیە. تەواوی کێشەکە لەوەدایە کە تـا چ رادەیـەک بـوێری رەنگدانـەوەی ئەم راستییە سەلمێنراوە لەسروشتی دەرەوەی مرۆڤدا دەکەین.

خوازیارم بەو خاڵـە بگـەم: ناچـارنین "خـاکی مـردوو" لـەکۆڵ خۆمـان بکەین کە کۆمەڵگاگەرایی نێگەتیف بە چاومانیدا پرژانـدووە. کۆمەڵگـەرایی پۆزێتیڤ بە گوتەیەکی دیکە ئەو کۆمەڵگایەی بەردەوام ئازاد دەبێـت، تاکـە زەمینەمانـە بـۆ حەقیقـەت. سـادەترین پێناسـەی مێـژووی گـەردوونی؛ بـە سیفەتی زەمینەی حەقیقـەت پەرەسـەندنی کۆمەڵایەتییـە. لـەم چوارچێوەو مانایـەدا کۆمـەڵگای مـرۆڤ تـەنیا مێـژووی مـرۆڤ نییـە. بـەڵکو لـە واتـا واقیعییەکەیدا مێژووی گەردوونە. ئەو ماوەیەی بەشێوەیەکی سـاکار وەک ١٣،٨ ملیار ساڵ گوزارشت دەکرێت، ئەویش مێـژووی گەردوونـە. هەربۆیـە پێویستە گرنگی و بایـەخێکی زۆر بـە مـرۆڤ، کۆمەڵگاکـەی و مێژووەکـەی بدرێت.

أ ـ ئاماژەکردن بەو خاڵـەی کـە دواتـرین قۆنـاخی سـەهۆڵبەندان ٢٠٠٠٠ بیست هەزار ساڵ بەر لەئێستا کۆتایی پێهاتووە، بەردێکی گرنگی بناخـەی مێـژووی کۆمەڵگایــە. لــەقۆناخی بــەرایی ئــەم مێــژووەدا کــە دیرۆکــی خۆرهەڵاتی ناوینیش دەست پێدەکات بناری زنجیرە شاخەکـانی زاگـرۆس ـ تۆرۆس و نـاوچە چۆڵەوانییـەکانی دراوسێی ئاسـانکاری و هەلومـەرجێکی نائاسـایی خـۆراک، ئاسـایش و زۆربـوونی بـۆ جـۆری مـرۆڤ پێشـکەش کردووە. هەرچی بەیەککەیشتنی ئەو سێ فاکتەرەیە بۆ هەر جۆرێکی زیندوو بەچانسێکی نائاسایی ژیان دادەنرێت. بەسەرهات و سەرگوزەشتەی جۆری مـرۆڤ کـە نزیکـەی ٧ حـەوت ملیـۆن سـاڵ دەخـەمڵێنرێت کـە سەرتاسـەری رۆژهەلاتی ئەفریقیا تێپەڕ دەکات و لەبناری کێوەکانی رۆژهـەڵاتی دەریـای سـپی تـا ریف(ئـەو کەلێنـەی هەنـدێ کیشـوەر درووسـتیان کـردووە) و

زنجیرەشاخی تۆرۆس هێڵێکی سروشتی پەلهاوێشتن دەکێشرێت. بەگوێرەی ئەو پێدراوانەی دەستنیشان کراون بەلانی کەم نزیکەی ملیۆنێک ساڵ دەبێت لێشاوی مرۆڤ لەو ڕێگایانە بۆ ئاسیا و ئەورووپا جێگای باس بووە. کەوانەی زاگرۆس - تۆرۆسیش بەردەوام ڕۆڵی وێستگەی بنەڕەتی ئەو هاتوچۆو کاروانانەی بینیوە. بەمجۆرەش زیاتر دەرک بە گرنگی جیۆلۆجیا دەکەین. بیابانە دراوسێکانیش کە لەسەردەمی خۆیدا زۆر بەپیت بوون بەلانی کەم ڕۆڵێکی هاوشێوەی بناری شاخەکان دەبینن. لەگەڵ کۆتایی هاتنی دواترین قۆناخی سەهۆڵبەندان و گەیشتنی ئەو وێستگانە بە هەلومەرجێک کە دەرفەتی ژیانی هەمیشەیی یان جێگیری تێدا ڕەخسا، لە مێژووی جۆری مرۆڤدا ڕێگای لەپێش تەقینەوە کردەوە. لە ڕۆژی ئەوڕۆماندا ئەم جوگرافیایە بەخۆرهەڵاتی ناوین ناودێر دەکەین. ناوچەکە گرنگی جیۆلۆجی، بایۆلۆژی و کۆمەڵایەتی خۆی لەو واقیعە مێژووییە نزیکەوە وەردەگرێت. چیتر خۆرهەڵاتی ناوین بەشە جوگرافیایەکی ئاسایی نییە، ئەو شوێنەیە کە دەبێتە شانۆی مێژووی جیهانی.

هاوڕابوونێکی زانستی جێگای باسە کە تا پاش دواین قۆناخی سەهۆڵبەندانیش جۆری مرۆڤ ڕێکخستنی شێوە کلان (تیرەی بەرایی)ی تێپەڕ نەکردبوو کە لە نزیکەی ٢٥ - ٥٠ کەس پێکهاتوون. بچووککردنەوە و بە کەمدانانی کۆمەڵگای کلان بەناوی یەکینەکانی کۆمۆنەی سەرەتایی "شۆڤینیزمی شارستانی"یە کە دواتر سەریهەڵداوە. مرۆڤایەتی لەسەدا نەوەدو هەشت ٩٨% ی تەمەنی خۆی لەمیانەی ئەمجۆرە کۆمەڵگایەوە بەسەر بردووە. لەپێکهاتنی کۆمەڵگادا کلان ڕۆڵی خانەی ڕەسەن و بنەڕەتی دەبینێ. هەروەکو چۆن لەپێکهاتنی زیندەوەراندا لەمیانەی هەوڵی زیاتر لەملیار ساڵی خانەی بنەڕەتییەوە هەنگاو بۆ پێکهاتنی جۆرەکانی رووەک و ئاژەڵ هاوێشتراوە، سەرگوزەشتەی ملیۆنان ساڵەی کۆمەڵگای کلانیش گواستنەوەی هایدرۆجین ی بۆ کۆمەڵگا دەستەبەر کردووە. "شۆڕشی کۆمەڵگای هەمە ڕەنگ" یەکێک لەسەرەکیترن قۆناخەکانی

مێژووی گەردوون (جیهانی)یە. لە بنەڕەتدا لەگەڵ دانانی "زمانی هێمایی" لەجێگای زمانی ئیشارەت ئەو قۆناخە دەستی پێکردووە.

بەهۆی پێکهاتەی جەستە و قورگ زمانی هێمایی پۆتانسێلێکی گەورەی پەرەسەندنی هەیە. هەر توانستی زمانی هێماییشە کە زەمینەی شۆڕشی هزری دەڕەخسێنێت.

هەرچەندە مێژوونووسەکان باس لەوە دەکەن کە پێویست بوو لە دەوروبەری سالانی ١٠٠٠٠٠ سەد هەزاری پێش زایین، واتا بەر لەدوایین قۆناخی سەهۆڵبەندان زمانی هێمایی لەپێکهاتەی جیۆبایۆلۆجی ئەفریقیا پێکبهاتایە، بەلام لەو خاڵەدا هاوفیکرن کە پاش دواترین قۆناخی سەهۆڵبەندان (٢٠٠٠ پ.ز) شۆڕشی راستەقینەی زمانی هێمایی گرێدراو بەبونیادی جیۆبایۆلۆجی خۆرهەلاتی ناوین تەقییەوە. دیدی مێژوویی، زانیاری ئەتنیکی و ئەنترۆپۆلۆژی زەلالو روون لەئاراداان کە لەچۆڵەوانی بیابانی مەزنەوە تا دەگاتە چۆڵەوانییەکانی عەرەبستانی سعودیەو ئێران کە تاوەکو شەش هەزار ساڵ بەر لەئێستاش خاوەن سروشتێکی رووەکییانەی دەوڵەمەند بوون. ئەو جڤاتانەی بەسیمیتیک ناودەبران لەدەوروبەری بنەچەی زمانی سامی بەشێوەیەکی بەرفراوان "سیستەمی تیرەیان" پێکهێناوە. لەزمانە دەوڵەمەندەکانی ئیشارەت لەئەفریقیا گوزەرکردن بۆ سیستەمی ئەو قەبیلانەی خاوەن بونیادی زمانی هێمایی سیمیتیکن، یەکێک لەبەردەکانی بناخەی مێژووی گەردوونییە. ئەم گروپەی زمان و کلتوور رۆڵێکی گەورە لە شۆڕشی ئاژەڵداری و کشتوکاڵی نیولیتیک و شۆڕشی شار "مەدەنییەت"دا دەبینێت.

هەروەها دیسان لەمیانەی توێژینەوە مێژووییەکان، کار و خەباتی ئەنترۆپۆلۆژی و ئەتنیکییەوە بەشێوەیەکی روون و زەلال سەلمێنراوە کە دووەمین شۆڕشی زمانی هێمایی بەپشت بەستن بەبونیاد و پێکهاتە جیۆبایۆلۆجییەکەی زنجیرە شاخەکانی زاگرۆس - تۆرۆس لەلایەن گروپەکانی سیستەمی هۆز - تیرە ئاریانییەکان ئەنجامدراوە کە بەگروپی هیندۆ - ئەوروپی ناودەبرێن. تایبەتمەندییەکی گرنگی راستی سەلمێنراو ئەوەیە کە ئەم گروپە رۆڵی سەرەکی لەشۆڕشەکانی کشتوکاڵ و شاردا

بینیـــوە. لەبنەڕەتـــدا گرێـــدراو بەپێکهاتـــەی جیۆبـــایۆلۆژی شـــوێنی جێنشینبوون ئەو ڕۆڵەی بینیوە.

سیستەمی ئەو قەبیلانەی لەباشووری سیبریا پشت بە دارستانەکان دەژیـان و بەگروپـە زمـانی ئـۆراڵ ـ ئاڵتـای نـاودەبرێن، سێیەمین گـەورە گروپی زمانی هێمایی پێکدێنن. ئەو گرووپانەی دوای قۆناخی سەهۆڵبەندان تـــا چـــین، مـــەغۆلیا، تورکســـتان و فینلەنـــدای ڕۆژی ئـــەمرۆمان بڵاوبوونەتەوە، ئەگەر هێنـدەی هـەردوو گروپـی یەکـەمیش نـەبێت، بـەڵام کۆمەکیان بۆ هەردوو شۆڕشی نیولیتیک و شار گرنگ بووە.

بـــەگوێرەی توێژینـــەوە مێژوویـــی و زانیارییـــە ئـــەتنیکی و ئەنترۆپۆلۆژییەکان ئەگەر لەئاستێکی مارژیناڵیشدا بێت هەنـدێک گروپـی گۆشـەگیری هاوشـێوەی قەفقاسـیا و ئـەمریکا ڕۆڵیـان لەشۆڕشـی زمـانی هێمایی و شۆڕشەکانی کشتوکاڵ و شاردا هەبووە.

لەمیانـەی سـەرجەم توێژینـەوە و کاروخەباتـە زانستییە جیۆلـۆجی، ئارکۆلۆژی، ئـەنترۆپۆلۆجی، ئـەتنیکی و زمانەوانییەکانـەوە سـەلمێنراوە کـە شۆڕشـی گونـد ـ کشـتوکاڵ لەبنەڕەتـدا گرێـدراو بـەجۆرو بونیـادی جیۆبایۆلۆجی بنارەکانی کەوانەی ناوەوەی زنجیرە شـاخەکانی تـۆرۆس ـ زاگرۆسەوە پێشکەوتووە کە بە"هیلالی بەپیت"یش ناو دەبرێت. لـەمێژووی گەردوونی مرۆڤایەتیـدا ئـەم قۆنـاخـەی شـۆڕش بنچینەییـە. جـارێکی دیکـە پەنجـەی دەخەمـە سـەر؛ کاتێـک دەڵـێم شـۆڕش مەبەسـتم پرۆسـەکانی وەرچـەرخانی نەوعییـە. گرنگـی ئـەو شۆڕشـە هەمەلایەنەیـە. یەکـەمیان؛ کۆمـەڵگا لـەقۆناخی کۆمـەڵگای کلانـی درێژخایەنـەوە (گروپـە بچووکـە چوونییەکـەکانی بەیـەکتر دەچـن) بـۆ قۆنـاخـی "سیسـتەمەکانی قەبیلـە"ی هەمەڕەنگو جیاوازەکانەوە گوزەری کـردووە. سیسـتەمی قەبیلـە کـە پشت بەڕیشەکانی زمانی هاوبەش دەبەستێت، لەناوچە نیمچە ڕەوەنـد ـ نیمچـە جێنشینەکاندا گیرساونەتەوە، ئـاڵوگۆڕێکی هاوشێوەی دیـاری گۆڕینـەوە لـەنێوان خۆیانـدا ئـەنجام دەدەن، پەرستگای هاوبـەشو شوێنی ناشتنی مردووانیـان دروسـت کـردووە. شـێوەگرتنێکی کۆمەڵایـەتی درێژخایەنـە. پەرستگای بەردە چەقێنراوە داتاشراوەکانی لەهەڵکۆڵینە ئارکۆلۆژییەکانی

گۆبەکلی تەبەی نزیک شاری ئورفا دەرکەوتوونو بەبەڵگە سەلمێنراوە کە لەسالآنی ١٠ دەهەزاری پێش زایین بونیادنراوە و لەبواری رۆشنکردنەوەی مێژووی مرۆڤایەتیشدا وەک "سوپەر - نەوا"[1] دەبینرێت، وەک دۆزینەوەیەکی مێژوویی گرنگ و بایەخدار لەبەرامبەرمان قووتبۆتەوە کە هەروەکو تا ئێستا مەزەندە کراوە سیستەمی قەبیلەکانی بەر لەشۆڕشی کشتوکاڵ لەدۆخێکی سەرەتاییدا نەبوون، بەڵکو بونیادی کۆمەلایەتی زۆر پێشکەوتووبوون. پەرستگای بەردە چەقێنراو و داتاشراوەکانی بەشێوەیەکی بازنەیی لەتەنیشت یەکتر ئاواکراون پیشانی دەدەن کە جیهانێکی مەزنی هزرو سۆز جێگای باس بووە. پێویستە بەبایەخەوە ئاماژە بەو خاڵە بکرێت کە جیۆبایۆلۆژیای ئورفا (بەرفراوانییەکەی میزۆبۆتامیای سەروو) بۆ پەرەسەندن گەشەکردنی سیستەمی ئەو قەبیلانە شوێنگەیەکی نموونەیی بووە. هیچ گومانێکی تێدا نییە کە چەندە ئەم سیستەمەی قەبیلە و کلتوورەکەی شیکار بکرێت کە مسۆگەر پێویستە توێژینەوە مێژووییەکان لە بارەیەوە قاڵ ببنەوە، ئەوا بەشێوەیەکی زەلاتر مێژووی گەردوونیش رۆشن دەکرێتەوە.

دووەمیان، تا ئێستا بونیادەکانی گوند وابەستە بەشۆڕشی کشتوکاڵ هەڵسەنگێندرابوو. راستییەکی دیکەی کۆمەلایەتی گرنگ کە پەرستگای گۆبەکلی تەپەی - ئۆرفا سەلماندوویەتی؛ لەسیستەمی قەبیلە نیمچە رەوەندەکانەوە بۆ بونیادی گوند گوزەریان کردووە. پێشتر سەرهەڵدان و لەدایکبوونی شار و دەوڵەتم بەپەرستگای راهیبی سۆمەر بەستبوویەوە. بەڕێوەبەرایەتی گوندیشم بەم شێوەیە تاووتوێ کردبوو، بەلآم ئەمجارە بەبایەخەوە ئاماژەی پێدەکەم کە یەکەمین دیموکراسی سەرەتایی (بە مانا

---

[1] جۆرێک لەو ئەستێرانەیە کە دەتەقێتەوە، زاراوەکەش مانای تەقینەوەکەلێکی گەورەی مەزنی ئەستێرەکان دەبەخشێت، لەکۆتایی تەمەنیدا ئەستێرەکە قاوخی خۆی دادەماڵێت، ئەمەش دووکەلێکی پلازمایی بریقەدار لەدەوروبەری ئەستێرەکە دروست دەکات. بەمجۆرەش وزەی تەقینەوەکە لەفەزا بلاو دەبێتەوە، لەماوەی چەند هەفتەیەک یان چەند مانگێکدا بۆ تەنی نەبینراو دەگۆڕێت. بەلآم دڵی ئەستێرەکە بەرەو ناوەند شۆر دەبێتەوە و بۆ ئەستێرەیەکی نیۆترۆنی دەگۆڕێت. ئەستێرەکە لەناکاو دەدرەوشێتەوە، نموونەیەکە بۆ ئەو شتانە دەهێنرێتەوە کە لەناکاو دەدرەوشێتەوە.

ئۆرژینەکەی) لەدەورووبەری سیستەمی پەرستگای هاوبەشی قەبیلەکان پێکهاتوون. هەر شوێنگەیەکی پەرستگای هاوبەش بناخەی کڕین و فرۆشتنی بەرایی و شۆڕشی هزر (هونەر) و هەستی هاوبەشە.

لەدۆخێکی بەم جۆرەدا دەتوانرێت ئاڵوگۆڕکردنی دیاری وەک بابەتی سێیەم دەستنیشان بکەین کە شێوەی رەسەن و پریمیتیفی بازرگانییە و لەکاتی بەیەکگەیشتنیان لەپەرستگای هاوبەشدا ئەنجامیان داوە. چوارەمیان، هەروەها سروتەکانی پەرستگا لەسەرچاوەی سەرهەڵدانی ئایین و هونەر (ئەم دوو پۆلێنە لەسەرەتادا بەیەکەوەن و فاکتەری سەرەکی کلتووری مەعنەوییە)یشدا جێگای باسە. وێنەکانی پەرستگا (گۆبەکلی تەپە)ش کە زۆر لە نووسین نزیک بۆتەوە پەرەسەندنی سیستەمی سۆز و هزر دەسەلمێنێت. هونەرێک جێگای باسە وەک بڵێی پێشتر هەواڵی لەدایکبوونی نووسینی سۆمەرو میسر دەدات. لەم بارەوە دەشێت خوێندنەوەی هاوشێوەی زیاتر سەبارەت بەو بابەتانە بکرێت.

خاڵێکی دیکەی گرنگ کە پێویستی بەئاماژەپێکردن هەیە، بەهۆی تایبەتمەندێتی نیمچە رەوەندی ئەم کلتووورە خەسڵەتی نەرمی و پەلهاوێشتنی خێرای هەیە. کاتێک دەڵێن ئەم کلتووورە لەنێوان ساڵانی ١٥٠٠٠ ـ ١٠٠٠٠ پ.ز لەسەرەتاوە لەخۆرهەڵاتی ناوین لەئاستی گەردوونیدا پەلوپۆی هاوێشتووە، رۆڵێکی رۆشنکەرەوە سەبارەت بەباسەکانی مێژوو دەبینێت. بەبڕوای شەخسی خۆم ئەو کلتووورە تەواوی ئاسیا، ئەفریقیا، ئەوروپا، ئەمریکا و تەنانەت ئوستورالیاشی فەتح کردووە (بە مانای بڵاوبوونەوەی کلتووریدا).

ب ـ داوەرییەکی هاوبەشی مێژووناسان و خودی ژیانیشە کە شۆڕشی کشتوکاڵ لەمیانەی پشتبەستن بە سیستەمی قەبیلەی نیمچە نیشتەجێ پەرەیسەندووەو مانای شۆڕش دەبەخشێت. هەڵسەنگاندنی ناوچەی جیۆبایۆلۆجی ئورفا ـ بەو سیفەتەی یەکێکە لەبەپیتترین ناوچەی هیلالی بە پیت ـ وەک شوێنگەی ناوەندی درێژخایەنی شۆڕشی کشتوکاڵ (شیمانەی قۆناخی ١٠٠٠٠ ـ ٥٠٠٠ پ.ز) نزیکترین باسی مێژووییە لەراستییەوە. لەبواری بەکارهێنانی دەغڵ و رووەک بۆ کشتوکاڵ،

هەروەها ماڵیکردنی بزن و مەڕ و چێل لەلایەنی بەپیتی و هەمەڕەنگییەوە ئەم ناوچانە نموونەیین. پێکهاتەی زەوییەکەی، بەپیتی خاکەکەی و هەلومەرجەکانی کەش و هەواکەی بەگوێرەی هەبوونی رووەکی و ئاژەڵی قۆناخی خۆیەوە نموونەییترین ناوچە بووە. وەک بڵێی خاوەنی هەلومەرجەکانی ئاودێری سروشتییە. هەروەها لەدەوروبەری دیجلە ـ فورات و لقەکانیشی بەردەوام شوێنێکی بەرفراوان بۆ ئاودێری دەستکرد هەر هەبووە. ئەو لێکۆڵینەوە و لێتوێژنەوانەی لەناوچەکە دەکرێت رۆژ بەدوای رۆژ زیاتر ئەم رۆڵەی ناوچەکە ئاشکرا دەکەن و روونی دەکەنەوە.

دەتوانرێت هەمان شت سەبارەت بەم قۆناخەش بگوترێت کە یەکێک لەقۆناخە بنەڕەتییەکانی مێژووی گەردوونییە. یەکەمیان لەبواری بونیادنانی پەرستگاو ئاواکردنی گوند پەرەسەندنی چەندایەتی و چۆنایەتی بەدیهاتووە. کلتووری کۆرتیک تەپە ـ بیسمیل، چەمێ خەلان، چایئۆنو، ئەرگانی و نەوالا چۆری ـ سیڤەرەک هێزی جێگیربوون و پەلهاوێشتنی کلتووری گۆبەکلی تەپەی ـ ئورفا پیشان دەدات. ساڵانی ١٠٠٠٠ ـ ٧٠٠٠ پ.ز کە بە قۆناخی بێ دەفرو دییزە وەسف دەکرێت لەو سەردەمە لەتەواوی بوارە ئاماژەپێکراوەکاندا پەرەسەندنی بەخۆیەوە دیوە. پێویستە ئاماژە بەو لایەنەش بکرێت کە ئەو قۆناخە لەبواری کارەکتەری پەلهاوێشتنی گەردوونیدا ــ لەسەررووی هەمووشیانەوە بۆ جوگرافیای خۆرهەڵاتی ناوین ـ پەرەیسەندووە.

دووەمین خاڵی گرنگ چاخی نیولیتیکی بە دەفرو دییزەیە کە لەدوای ساڵانی ٧٠٠٠ پ.ز پەرەیسەندو لەقۆناخێکی باڵاتردا پێشکەوتنێکی لەگەڵ خۆیدا هێنا کە لەئاستی دەروازەی ئاواکردنی شار نزیکبوویەوە. سەرجەم هەڵکۆڵینە ئارکۆلۆژییەکانیش ئەم راستییە دەسەلمێنن. هەروەها دەتوانرێت بگوترێت لەمیانەی پەلهاوێشتنێکی کلتوورییەوە کە لە ساڵانی ٥٠٠٠ پ.ز بەدواوە خێراتر بوو لەسەررووی هەموویانەوە لە میسر، سۆمەری میزۆپۆتامیای خواروو، پەنجابی سنوورەکانی نێوان هیندستان ـ

پاکستان و دۆڵەکانی ئاموودەریا[٢] و سیری دەریا[٣] لە تورکستان لە ناوچەیەکی بەرفراوانی جیۆبایۆلۆجیدا ڕێگای لەپێش پەرەسەندنێک کردەوە کە بەئاستی شاری بەرایی گەیشتووە. بەگوێرەی سەردەمی خۆی بۆ یەکەمین جارە سیستەمی ناوەند ـ کەنار سیستەمێکی جیهانگیری تێبینی کراو پێکدێنێت. ئاماژەکردن بەو ڕاستیەی کە لە قۆناخی دووەمین نەوەی پەلهاوێشتن ٤٠٠٠ ـ ٢٠٠٠ پ.ز دا ئەو کلتووره ڕۆڵی پێشەنگایەتی بینیوە لەچینەوە تادەگاتە ئەورووپا واتە لەنێوان هەردوو ئۆقیانووسدا، سەبارەت بەمێژووی گەردوونی گرنگی و بایەخێکی زۆری هەیە. جیهانیبوون "جیهانگیری" دیاردەیەک نییە تەنیا لە ڕۆژگاری ئەمڕۆماندا لە ئارادابێت. لەوانەیە گرنگترین و درێژخایەنترین جیهانیبوونی دوور لە فشار و چەوسانەوە ـ ئیستیسنا ڕێسا تێکنادات ـ لەو قۆناخەدا ڕوویداوە. ئەمە ئەو خاڵەیە کە پێویستە لەمێژووی گەردوونی "جیهانی"یەوە دەرکی پێبکرێت. پێکهاتە و بونیادێکی هاوبەش و پەلهاوێشتنەکەی بۆ باسێکی واتاداری مێژوو بنچینەییە. ئەوەی پێویستە لەمێژووی گەردوونی "جیهانی"یەوە دەرکی پێبکرێت: هەمان ئەڵقە هاوشێوەکانی سۆبژە ـ ئۆبژەیە کە سەرجەم کۆمەڵگاکان بیری لێدەکەنەوە و لەبواری کرداریدا جێبەجێی دەکەن. سەرجەم باس و گێڕانەوەی میکرۆ "وردە" مێژووەکان لەسەرووشیانەوە مێژووی نەتەوەکان، ئەگەر لەناو دیرۆکی گەردوونیدا جێگیر نەکرێن، ئەوا تەنیا لەچوارچێوەی چیرۆکدا مانایەکیان دەبێت.

لەڕاستیدا جۆرێکی گێڕانەوە بەناوی مێژووی میکرۆ بوونی نییە، چونکە پێویستی پاوانەکانی سەرمایەداری بۆ پڕوپاگەندە وردە مێژووی هێناوەتە ئاراوە. لەپێناو تێگەیشتنی مێژوو دەرککردن بەم مەسەلە زۆر گرنگە. جۆری مرۆڤ تەنیا خۆی نییە، بەڵکو مێژووی تەواوی گەردوونە.

---

[٢] دۆڵی ئاموودریا: بە دۆڵی جەیحون Ceyhun یش ناودەبرێت کە دەکەوێتە سەر ڕووباری جەیحون؛ ئەو ڕووبارە ئاسیاییەی کۆن بە ناوی ئۆکسۆس ناسرابوو. ئەو ڕووبارە وەک هێڵی جیاکردنەوەی نێوان ئەفغانستان ـ تاجیکستان ـ ئۆزبەکستان ناسراوە.

[٣] دۆڵی سیرداریا: بە دۆڵی سەیهون Seyhunیش ناودەبرێت کە دەکەوێتە سەر ڕووباری سەیهون کە یەکێکە لە ڕووبارەکانی ناوەڕاستی ئاسیاو دوو ڕووبارە گەورەکەی ئۆزبەکستان.

ئەوەی سەرلەنوێ لەمرۆڤدا پێکدێت یەکگرتوویی تەزووی سەرجەم مـاددە ـ وزەکانە. هیچ بەشێکی گـەردوون، یەکێتیـەکی وزە و مـاددە جێگـای بـاس نییە کە لەدەرەوەی مرۆڤـدا بێـت بـەڵام سـەرلەنوێ بەشێوەی هـزرو سۆز لەمرۆڤـدا نـەبن بەیـەکو ئـاوا نـەبن. یەکـەمیان کاتێـک دەڵێـین مێـژووی گـەردوونی "جیهـانی" مەبەسـت ئـەم واقیعەیـە. هـەر ئـەم راسـتیەیە کـە پانتـاییزم هـەوڵی پـەی پێبردنـی دەدات. کاتێـک دەڵێـین مێـژووی جیهـانی دووەمـین جـۆری باسـکردنە کـە پێویسـتە دەرکـی پێبکرێـت پەرەسـەندنی کلتووری ماددیو مەعنەوی سروشتی کۆمەڵگایە کـە بەسروشـتی دووەمـیش ناو دەبرێت. هەروەها دەشێت ئەم مێژووە وەک تەوژمی رووباری سـەرەکی ئەو کۆمەڵگایانە هەڵسەنگێنرێت کە لەکڵانەکان ـــ بـەجۆرێک لـەجۆرەکان خانـەی بنـەڕەتی کۆمەڵگاکانـە ـــ دەسـت پێـدەکات و تـا رۆژی ئـەمڕۆمان هاتوون. لەباسکردنی ئـەم مێـژووەدا دەسـتەواژەی رووبـاری سـەرەکی زۆر گرنگـە. هـەروەکو چـۆن بـۆ باسـکردنی مێـژووی گـەردوونی ـ جیهـانی ـ "دەرەوەی مرۆڤ" پێویستی بەکۆی سەرجەم مادە ـ وزەکـان نـەبێت، تـەنیا پێویسـتی بەباسـکردن یـاخود دەرککـردن بەهـەنگاوەکانی گـوزەری میکانیزمەکان (لای هیگل لۆژیک)و ئەڵقـە سـەرەکییەکانی "فیزیـا، کیمیـا، بـایۆلۆژی" بـەس بێـت، ئـەوا سـەبارەت بـەمێژووی کۆمەڵگاکـەش ـــ بـەو سیفەتەی سروشتی دووەمـە ـــ پێویسـتی بەباسـکردنێکی هاوشـێوە هەیـە. بێگومـان ئـەوەی لەگووتـەی مێـژووی کۆمـەڵگادا جێگـای مەبەسـتە سۆسیۆلۆژیایە. سۆسـیۆلۆژیا و باسـی مێژوویـی جیـاواز پێویسـتیەکی هەژموونگەرایی ئایدیۆلۆژی پاوانخوازی سەرمایەدارییە کە هەموویتی یان یەکگرتوویی مانا پارچە دەکات.

لەدۆخێکی بەمجۆرەدا لەهەردوو ماناشـدا مێـژووی گـەردوون "جیهـان" یەکپارچەیـە. بێگومـان ئەمـەش بـەم واتایـە نایـەت کـە تـاک، دیـاردە و رووداوەکان جێگایان لـەناو ئـەم باسـکردنەدا نییـە، بەپێچەوانـەوە تـەنیا کاتێک تاک، رووداو و دیاردەکان لەناو ئەم باسە گەردوونییەدا رۆڵ ببینن مانا بەخش دەبن. تەنیا لـەرێگای پەیوەنـدی دیالیکتیکییـەوە وردە مێـژوو دەتوانێت لەناو مێژووی گـەردوونی "مـاکرۆ" جێگـا بـۆ خـۆی بدۆزێتـەوە.

میکرۆ مێژووی جیا و سەربەخۆ بەمانای بێ فەلسەفەیی باسە مێژوویی و سۆسیۆلۆژییەکان دێت، کە لەکۆتاییدا بەقەبەترین دۆخی لوتکەی پۆزیتیڤیستی دەگات.

بڕوایەکی هاوبەشی مێژووناسە گرنگەکانە کە لەقۆناخی ٦٠٠٠ ـ ٤٠٠٠ پ.ز لەهیلالی بەپیت سەرجەم فاکتەرە سەرەکییەکانی کلتووری ماددی و مەعنەوی پێکهاتبوون کە بۆ دەربازبوون بەرەو شارستانی پێویست بوون. چەندین تێڕوانین و توێژینەوەی ئەتنیکی و ئارکۆلۆژی جێگای باسن کە پشتگیری لەم بڕوایە دەکەن. ئامرازەکانی کلتووری ماددی لەسەرووی هەمووشیانەوە بوارەکانی پۆشاک، خۆراک و حەوانەوە بوونەتە پیشەسازی و بەئاستی بەرهەمهێنان گەیشتوون. ئیتر بەئامانجی سوود لێوەرگرتن و بەکارهێنانیان لەکاتی وشکە سالیو کارەساتە هەمەجۆرەکان زێدە "بەرهەمە" کۆمەلایەتییەکانیان پاشەکەوت و کەلەکە کردووە. بناخەی بازرگانی دانراوە. لەجیاتی کلتووری دیاری پێشکەشکردن لەپێناو دابینکردنی پێداویستی دوولایەنە گۆڕینەوەی بەرهەمەکان ئەنجامدەدرێت. ئیتر زۆربەی فاکتەرەکانی کلتووری مەعنەویش فەراهەم کراون. پێشکەوتنی مەزن لەبواری یەکەمین دۆخی ڕەسەنی ئایین، خوداوەند، هونەر، زانست و تەکنیک بەدیهاتوون. هەنگاو بۆ تەکنیک "ئامراز"ی کانزایی هاوێشتراوە. ئیتر ڕەوڕەوە بەکاردەهێنرێت. سوود لەگۆڕینی وزە وەردەگیرێت. هیچ گومانی تێدا نییە لەمەزەندەکان زیاتر داهێنان و دۆزینەوە جێگای باسە. لەمانەش گرنگتر ژیانێک جێگای باسە کە ژن پێشەنگایەتی دەکات و لەگەل ژینگەدا کۆکە. کاتێک لەگەل ڕۆژگاری ئەمڕۆماندا بەراورد بکرێت، تەنیا ئەم خالە بەسە بۆ ڕوونکردنەوەی بالابوونی کۆمەلگای ئەو سەردەمە. هەرگیز کۆمەلگایەک بەبالا و پێشکەوتوو دانانرێت کە بەئەندازەی شارستانی ڕۆژگاری ئەمڕۆمان ژینگەو ژن سەرکوت بکات. ئەگەر باس لەتەندروستیو بالابوونی کۆمەلگایەک بکرێت، ئەوا پێویستە و ناچارییە کە پێوانەکانی ژینگەدۆستی و فێمینیستی "کە بە واتای بۆرژوازی نایەت" بەبنەما بگرێت، لەراستیدا لەم لایەنەوە کۆمەلگاکانی ڕۆژی ئەمڕۆمان کۆمەلگای نەخۆشن.

ج ـ ئاواکردنی شار و لەسەر ئەو بنەمایەش گوزەرکردن بۆ کۆمەڵگای شارستانی لەمیانەی قەڵەمبازی نەوعی بەهاکانی کلتووری ماددی و مەعنەوی نەریتەکانی کۆمەڵگای هیلالی بەپیت بەدیهات کە بەهەزاران ساڵ کەڵەکە ببوون. کاتێک ئەم فاکتەرە کلتوورییانەی لەئارادابوون لەگەڵ هەندێک فاکتەری دیکە ـ لەسەرووشیانەوە پێکهاتە بەپیتەکەی ــ لەلیتە دەشتەکانی دەلتاکانی دیجلە، فورات، نیل و پەنجاب (بەشسوو)سەنتێزێکیان پێکهێنا، ئەوا لەدایکبوونی شار دەست لێبەرنەدراو بوو. ئەم سەنتێزەش مانای زیادبوونێکی زۆری بەرهەم دەبەخشێت. پێویستە ئەم خاڵەش باش بزانرێت؛ سەرباری ئەوەی لەمیانەی هەمان ناوچە لیتەییەکانەوە بەسەدان هەزار ساڵ لێشاوی هاتووچۆی مرۆڤ بەردەوام بووە، بەڵام لەگەڵ ئەوەی ئەم جڤاتانە هیچ کاتێک ئەو بەهرە و توانستەیان نەبووە لەمیانەی دینامیزمی خۆیانەوە بەشارستانیبوون بگەن، بگرە نەیانتوانیوە کۆمەڵگای کلانیش ژیاندار بکەن. لەپێناو گوزەرکردن بۆ شارستانی شاریش کۆمەڵگایەکی نیولیتیکی پێشکەوتوو لەم گۆڕەپانە مەرجە کە پەیوەندییەکی دیالیکتیکیان لەگەڵدا هەبێت؛ تەنانەت مەرجی لەپێشینەیە. لەچین یش بونیادێکی هاوشێوە لەسەر ئەم بنەما دیالیکتیکییە پێکدێت. بەشی هەرە زۆری مێژوونووسان لەم بارەیەوە هاوفیکرن کە ئوروک یەکەمین شارە لەمێژوودا ئاواکراوە و دەکەوێتە ناوچەیەکی لیتەیی بەیەکگەیشتنی دیجلە ـ فورات لەگەڵ دەریاوە. لەبەر ئەوەی قۆناخی ئوروک (٣٥٠٠ ـ ٣٠٠٠ پ.ز) سەرەتای شارستانی پێکدێنێت سەبارەت بەمێژووی گەردوون "جیهان" ی گرنگ و بایەخدارە.

یەکەمین شتگەلی دەتوانرێت سەبارەت بەو داستانانە بگوترێت کە بەناوی مێخوداوەندی شار ئینانا و یەکەمین پادشا قارەمانەکەی شار گلگامێش ڕێکخراوە و کلتووری ئوروک دەخاتە روو: پوختەی باسی قۆناخی خۆیەتی. ئەم داستانە رەسەنانەی بەدۆخی نووسراویەوە تا رۆژی ئەمڕۆمان هاتووە هەر وەکو چۆن لەمیانەی هزر، باوەڕی و حەسرەتەکانیان مرۆڤایەتی بەر لەخۆیانیان پیشانداوە، ئەوا تامەزرۆیی ئەمرییان سەبارەت بە داهاتووش وەک بیرەوەرییەک پێشکەش دەکەن.

بەڵێ ئەمەیە مێژووی گەردوونی. لەداستانی ئینانا باس لە ١٠٤ ئامراز، ڕێسا و دامەزراوی کۆمەڵایەتی دەکرێت کە زادەی بەری ڕەنجی خولقکارانەی هەزار ساڵی ژنە. دەگێڕێتەوە کە بۆ زەوتکردنی ئەو داهێنانانە "نێرخوداوەندە" بەهێز و فێڵبازەکان چۆن پەنا دەبەنە بەر فێڵبازی و ستەمکارییەوە. جەربەزەیی و سەرکێشی گلگامێش دەگێڕێتەوە کە چۆن بەهۆی خەم و پەژارە گەورەکەی لەبارەی مردن و لەدەستدانی ئەنکیدۆی یاریدەدەری ژیانی پادشایەتییەکەی بەدوای رووەکی نەمریدا دەگەڕێت.

قووڵبوونەوەی کۆیلایەتی ژن و هەنگاو و پێهەڵگرتنە دەسەڵاتگەرایییەکانی پاشا - خوداوەندی بەدۆخی نەخۆشی گەیشتووە یەکەمین گەورە ناکۆکی دیالیکتیکی شارستانییە. ناکۆکی کۆیلە - سەرداریش سەرچاوەی خۆی لەم ناکۆکییە بنەڕەتییەوە وەردەگرێت. ئەم چیرۆکە لەمیانەی قووڵکردن و بەربڵاوکردنیەوە تا کارکەر، بێکارو کۆیلە نەدارکراوەکانی هەر ڕەچەڵەکێکی رۆژگاری ئەمڕۆمان بەردەوام دەبێت. پێناسەکردنی قۆناخی شارستانی مێژووی گەردوون "جیهان"ی و دەست نیشانکردنی خێراییە بنەڕەتییەکەی گرنگی و بایەخێکی مەزنی هەیە. ئەو شارانەی زۆر بە باشی پێویستی بازرگانی ناوچەکانی لادێ بەکاردێنن و لەسەر ئامراز و گەلاڵەی بەراوردی بەرهەمی بەپیتتر ئاواکراون لەسەرەتا ڕۆڵێکی نەرێنی نابینن. بەپێچەوانەوە لەمیانەی هەماهەنگی و هاوکاری لەگەڵ ناوچە لادێییەکان پەرەسەندنی کۆمەڵایەتی خێرا دەکەن. بەڵام لەمیانەی ئەو ململانێ و شەڕانەی لەسەر زێدە "بەرهەم، بەها" کۆمەڵایەتییەکان دێتە ئاراوە کە ڕێگا خۆشکەرەو کەڵەکەبوون و توانستێکی مەزنە ئیتر قۆناخەکانی جیابوونەوەی چینایەتی و دەوڵەتبوونی پشتبەستوو بەشار چەندەی دەچێت دەبێتە هەڕەشەیەک بۆ سەر ڕەنجدەرانی شار و دێ و سیستەمی سەرجەم قەبیلەکان. هیگل گوتەنی کۆمەڵگا وابەستەی ناکۆکی و پەیوەندییەکی گشتی نێوان سەردار - کۆیلەکراوە. قۆناخی شارستانی مێژووی جیهانی بەهۆی ئەم ناکۆکی و ململانێیانەوە پڕ لەشەڕ و ئەو شێوەگرتنانە دەوڵەت تێپەڕبووە کە

لەمیانەی ئەم شەڕانەوە ئاواکراون. لەم واتایەدا مێژوو "قەسابخانەی مرۆڤە".

ئەگەر بەشێوەیەکی راست شیکار بکرێت کە لەکۆمەڵگاکانی شارستانیدا بەردەوام پلەداری دەسەڵاتو بەوڵەتی لێدەکەوێتەوە، خاڵێکی دیکەی بایەخدارە بۆ گێڕانەوە و باسکردنی مێژوویێکی راست. قۆناخی کۆمەڵگای دەسەڵاتگەرا لەبواری چۆنایەتییەوە زۆر لەکۆمەڵگاکانی پێشوو جیاوازترە. بەدرێژایی مێژووی شارستانی دامەزراوەی دەسەڵات یاخود سەردارەکان خاوەن تایبەتمەندێتیەکە بەردەوام لەناو کۆمەڵگادا پەرە دەسەنێ، چڕو بڵاو دەبێتەوە. وەک نەخۆشی شێرپەنجە وایە؛ بەبێ قاڵبوونەوە و بڵاوبوونەوە لەسەر پێیان نامێنێت. دامەزراوەی دەسەڵات وەک نەخۆشی قازانج و کەڵەکەکردنی بەردەوامی پاوانەکانی سەرمایەدارییە. لەناوەڕۆکدا هەردووکیان لەمیانەی زێدە (بەها، بەرهەم)ە کۆمەڵایەتییە چڕ و قاڵبۆوەکان دەژین. دیاردەی چینایەتی (جیاوازی چینایەتی) لەرێگای پاشماوە کۆمەڵایەتییەکانەوە بەڕێوە دەچێت. بەو رادەیەی ئەم زێدە (بەرهەم، بەها) ببڕێت یاخود کەم بێتەوە قەیرانی کۆمەڵگای دەوڵەتی دەست لێبەرنەدراوە. ئەنجام لێگەڕانە لە پێناو بوون بەبەشێکی ئەو شەڕ و دەسەڵات و دەوڵەتە نوێیەی کە بەردەوام خۆی بەرهەم دێنێتەوە. دەستە بژێرو دامەزراوەکانی دەسەڵات وەک ئەو راوچییەن کە بەدوای نێچیرەوەیە. هەرچی دەوڵەتەکانن دەتوانرێت وەک شێوە مەشروعکراوەکانی ئەم کارە پێناسە بکرێن.

بێگومان پێویستی کۆمەڵگاکان بۆ بەڕێوەبەرایەتی گشتی تەواو وەک دەمامکێکی مەشروعیەت پێدانی دەوڵەتەکان بەکار دەهێنرێت. سەرجەم بەڕێوەبەرانی دەوڵەت بەدرێژایی مێژوو گرنگی و بایەخێکی زۆریان بەو خاڵە داوە؛ لەژێر ئەم دەمامکە خۆیان بناسێنن. دەشێت هەندێک بەڕێوەبەرایەتی کۆمەڵگا وەک پێویستیەکی رەوا ببینرێت؛ بۆ نموونە کارەکانی ئاسایش، ئاودێری مەزن، دەستپێشخەریەکانی پیشەسازیو کاروبارەکانی دادوەری. بەڵام بەڕێوەبەرانی دەوڵەتو دەسەڵات بەردەوام ئەو کاروبارە کۆمەڵایەتیانە لەپلەی دووەم دادەنێنو لەسەر بنەمای

ڕەواکردنــی خۆیــان بەکاریــدێنن. کۆمــەڵگا دەســەڵاتگەراکان کۆمــەڵگای پیاوسالارین. پەیوەندی "شوان ـ مێگەل" لەگەڵ بەڕێوەبراوەکان جێگای باسە کە زۆرجار لەپەرتووکە پیرۆزەکانیشدا باسکراوە. پەرەسەندنی ئەم پەیوەندییە لـەرۆژی ئەمڕۆماندا بەشـێوەی مـەیلی بـەژنکردنی گشـتی ڕەنجدەران و ژینگەیە. خەسڵەتی پیاوێتی دەسەڵات ئەمە فەراهەم دەکات. لەکاتێکـدا لەکۆمــەڵگای نیولیتیــک ئامــانج لەبەڕێوەبەرایــەتی ژنــان بەرهــەمهێنان، ئاسـایش و زۆربوونــە، بــەڵام لەکۆمــەڵگای شارسـتانیدا فـەرمانڕەوایی دەسـەڵاتەکان لـەناوەوە و دەرەوە بـەئامانجی شـەڕە. لـەم سۆنگەیەوە بەپلە یەک گرنگی بەتـەکنۆلۆژی (ئـامراز) ی شـەڕ و دەسـەڵات دەدەن. هــەروەها ژینگــەش وەک گۆڕەپــان و بــوارێکی چەوســانەوە و فەتحکردن دەبینن.

بینینــی ئـەم ئەبستراکت(دەرهەسـت) کردنانــە لــەکلتووری دەسـەڵاتی خۆرهەڵاتی ناوین، واتە بینینی هەمـەڕەنگترینیان لـە دۆخی بەرجەستەی دەسـەڵاتدا نـەک هـەر شیمانەیەکە بـەڵکو پێویسـتیەکی پێـوان و ڕێسـای کارەکەیە. پیشاندانی هەڵوێستێکی گونجاو بەگوێرەی خەسڵەتە ناوەندی و سەرتاپاگیرییەکەی سەبارەت بەتێگەیشتنێکی ڕاستی سیستەمی شارسـتانی مەرجە. پچڕان و بۆشاییە لێکدابڕاوەکان بۆ ماوەی درێژخایەن نابێت. لەم ڕوانگەوە گوتەی "دەسەڵات بۆشایی پەسەند ناکات" گوتەیەکی ڕاستە.

د ـ لێتوێژینـەوەی شارسـتانی ناوەنـدی کـە بڕبـڕەی پشـتی مێـژووی جیهان پێکدێنێت و سەرچاوە سەرەکیەکەی بـۆ میزۆپۆتامیـا دەگەڕێتـەوە و پێنج هەزار ساڵە بەبێ پچڕان لێشـاوەکەی بەردەوامـە گرنگـی و بایـەخێکی میتۆدۆلـۆژی بنـەڕەتی هەیـە. لـەم بارەیـەوە لەپـەیڕەوەکانی هەڵوێسـتی ئیکۆنۆمیستی چینایەتییەوە تا دەگاتە پەیڕەوەکانی هەڵوێستی سیستەمی بەرهـەمهێنانی تـەوەرەی دەوڵـەتی نەتـەوەییو دەوڵـەتی یاسـا هـەموویان لەخسـتنەڕووی یەکپارچـەیی مێـژوو دوورن. بەتایبـەتیش پـەیڕەوەکانی میکرۆ مێـژووی پۆزیتیڤیسـت کـە چەنـدەی دەشـێت بـەربڵاو دەبێتـەوە بـە تەواوی ڕۆڵی کۆمەڵکوژی مانا دەبیـنن. کاتێـک مێـژوو لەمیانـەی فاکتـەرە یەکانەییەکــەی میتــۆدی بچووکردنــەوە شــیکار بکرێــت؛ لەســەرووی

هەمووشیانەوە لەرێگای فاکتەرەکانی تاک، رووداو، خانەدان، نەتەوە، دەوڵەت،چین‌و ئابووری باسبکرێت بەرەو پارچەکردنی راستی و لەناوبردنی دەچێت. ئەم باسە پڕوپووچانەی لەژێر هەژموونگەرایی ئایدیۆلۆژی پاوانەکانی سەرمایەداریەوە هەڵبەستراون زۆربەی زۆریان رۆڵی پڕوپاگەندە دەبینن. بێگومان باسەکانی بەشێک یان پارچەیەک پێویست‌و بایەخداریشە. بەڵام تاوەکو لەگەڵ تەوژمی مێژووی جیهان"گەردوون"ی ئاوێزان نەبن خزمەت بە تێگەیشتنێکی سەرتاسەری راستی ناکەن. لەرۆژگاری ئەمڕۆماندا گێڕانەوە و باسکردنی مێژوو بابەتێکی زۆر بە گرفت و کێشەیە. گێڕانەوە و باسی راست پێویستی بەهەوڵ و هێزی مەزن هەیە. باس لەهەوڵی فیکری و هێزی چالاکی دەکەم. تاوەکو دەرک بەم خاڵە نەکرێت کە دەسەڵاتیش وەک سەرمایە تایبەتمەندێتی گەڕان بەدوای قازانجی هەیە، ئەوا کۆمەڵگاکانی شارستانی شیکار ناکرێن. لەبنەڕەتدا تاوەکو دەسەڵات وەک پاڵاوتەترین سەرمایەی رێکخراو نەبینرێت ئەوا بەتەواوی دەرکی پێناکرێت. ئەو هەڵوێستە راست نییە کە سەرمایە تەواو بەئابووری (مارکسیست و لیبڕاڵەکان بەمجۆرەن) دابنرێت یاخود تەواوی بەسیاسەت (هەڵوێستی نەتەوە ـ دەوڵەت) دابنرێت. بەزاراوەکردنیان وەک دوانەیەک کە یەکتری دەخولقێنن، یەکێکیان نەبێت ئەوەیتریان ناتوانێت بەردەوام بێت ئەنجامی نزیک بەراستی لێدەکەوێتەوە.

لەچوارچێوەی ئەم پێناسەیەدا دەتوانرێت سیستەمی شارستانی ناوەندی وەک سیستەمێکی مێژوویی ـ کۆمەڵایەتی نزیکەی پێنج هەزار ساڵە هەڵسەنگێندرێت. دەتوانین بەشێوەی سێ دەرهاوێشتە (نوسخە)ی سەرەکی و چەندین دەستەی ژێرین هێلکاری بکەین. یەکەمیان، سۆمەری پێهەڵگرتنی رەسەنە. پەلهاوێشتن و خۆزیادکردنی نموونەی ئوروک رێگای لەپێش مۆڵبوونی شار کردەوە کە هەرەسئاسا لەگەورەبووندا بوو. گۆڕەپانی ناوەندی میزۆبۆتامیای خوارووە. دەوڵەتشاری ئوروک هێزی هەژموونگەرایە. نزیکەی پێنج سەد ساڵ بەردەوام بووە، هەر شوێنێکی پێی گەیشتبێت ناوچە نیمچە کەنار و کۆڵۆنییەکانی ئاواکردووە. دەتوانین

بلێین سەرجەم هیلالی بەپیتی بەشێوەی ناوەند و کەنار رێکخستووە. لەئەنجامی ئەو تەنگەژە کۆنژەکتورەی سیستەم دووچاری هاتبوو لەسالانی ۳۰۰۰ پ.ز شاری ئور بۆتە هێزی هەژموونگەرا. سەردەمی ئور لەمیانەی تەنگەژەی هەمەلایەن و بەشێوەیەکی پچڕ پچڕ نزیکەی هەزار ساڵ بەردەوام بووە. دەتوانین قۆناخی ۳۰۰۰ ـ ۲۰۰۰ پ.ز وەک سەردەمی ئور هەلسەنگێنین. سەرجەمی رۆلی ناوەند و کەناری لەئوروک وەرگرتووە. بەلکو فراوانتری کردووە و ژمارەی شارەکانیشی زیاد کردووە. لەگۆڕەپانەکانی ناوەند و کەناردا ئاواکردنی شار و شارگەرایی لەقۆناخی ئوروک زۆر پێشکەوتووتر بووە. دەبینە شاهێدی ژمارەیەکی زۆر لەشارەکان. هەم لەبواری ئاسۆیی هەم هێشوویی رێکخستەبوون لەناو کۆمەلگادا زیادی کردووە. نووسین پەرەیسەندووە. زانستو پەروەردە بەدامەزراوە بوون. نیپوور جۆرێک لەشاری زانکۆیە. چەندین کۆلۆنی لەجۆری سووس ی ناوچەی ئیلامی دراوسێ نزیکەکەی رۆژهەلاتی، ئەلەپۆ و ئابلای رۆژئاوای و ماری و قەزازی باکوری لەکەناری فورات بونیادنراون.

شارگەرایی دۆلی نیل ـ میسرو پەنجاپ دەشێت وەک مۆلبوونی خواروی کەناری دوور هەلسەنگێنرێت. لەشاری ئۆتۆنۆم زیاتر دۆلەکانی نیلو پەنجاپ وەک بلێی لە کۆلۆنی دەچن. شارستانی میسر بەکۆمۆنێکی کۆیلە رۆبۆتکراوەکان دەچێت کە لەسێکوچکەی پەرستگا، گۆڕستان و کۆشکی فیرعەون پێکدێت. شارگەراییەکی ئۆتۆنۆمو رکابەری هاوشێوەی شارستانی سۆمەری دەستەبەر نەکردووە. گوندێکی گەورەی دەستەجەمعی دێنێتەوە بیری مرۆڤ. بەهۆی ئەم کارەکتەر و ناوەڕۆکەیەوە بەسۆسیالیزمی فیرعەونی ناودەبرێت. هەرچی وارگەکانی هەراپا و موهانجەدرۆی پەنجاپن زیاتر هەریەکەو کۆلۆنییەک دێننەوە بیری مرۆڤ. شیمانە دەکرێت کۆلۆنی سۆمەر بووبن. هەروەها شارستانی چینیش کە لەسالانی (۱۵۰۰ پ.ز) پەرە دەسەنێت و بەدەلتاکانی رووباری زەرد دا بالا دەکات زیاتر بەنموونەی میسر دەچێت.

شارگەرایی میزۆبۆتامیای باکوور "سەروو" بەشێوەیەکی جیاوازتر پەرەیسەندووە. وەک تێبینی دەکرێت جڤاتەکانی ئەو ناوچەیە لەساڵانی ٣٠٠٠ پ.ز بەدواوە لەمیانەی دینامیزمی خودی خۆیان هەنگاویان بۆ شارگەرایی هاوێشتووە و بەرامبەر بەکۆلۆنیزەکردنیان لەلایەن ئوروک و ئور (لە قۆناخی ٤٥٠٠ ـ ٣٥٠٠ پ.ز بەرامبەر بڵاوبوونەوەی کلتووری ئەلعوبێد) خۆیان پاراستووە، لەماوەیەکی کورتدا ئەم هێزە کۆلۆنیالیەیان لەناو خۆیاندا تواندۆتەوە. سیستەمی زۆر بەهێزی قەبیلە و بونیادی گوندی کشتیاری ناوچەکە ئەمەی فەراهەم کردووە. بەئەورووپای بەرامبەر وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەچێت. لەمۆلبوونێکی خوارو یاخود کەنار زیاتر پێگەکەی لەبینینی رۆڵی دووەمین ناوەند نزیکترە.

سیستەمە هەژموونگەراکانی ئوروک و ئور لە کۆتاییەکانی ساڵانی ٢٠٠٠ پ.ز لەناوەوە بەهۆی کێبڕکێی (لەسەرووی هەمووشیانەوە بابل و نەینەوا) نێوان شارەکان، لەدەرەوەش بەهۆی شەڕەکانی بەرگریکردن و هێرشی تیرەی ئامۆری بەڕیشە سەمیتیک و تیرە ئاریاییەکانی باکوری رۆژهەڵات (دیارەکان گۆتیو ئەکەدییەکان) هێزی خۆیانیان لەدەستداوە، ئیتر بابل‌و ئاشوور هێزە هەژموونگەرا نوێیەکانن. لەیەکەم‌-قۆناخی خۆیدا لەساڵانی ٢٩٥٠ ـ ١٦٠٠ پ.ز بابل پێهەڵگرتنێکی شکۆداری ئەنجامداوە. حامورابی بەناوبانگ سیمبۆلی ئەم قۆناخەیە. قۆناخی دووەمی ساڵانی ١٦٠٠ ـ ١٣٠٠ پ.ز کە بەشێوەیەکی هاوبەش لەگەڵ هۆزەکانی باکور و رۆژهەڵات (رێککەوتنیان لەگەڵ هیتیت و هۆرییەکان) تێپەڕ بووە. قۆناخی کۆتایی ماوەی ٦٠٠ ـ ٥٤٠ پ.ز کە لەئاکامی هاوپەیمانێتییان لەگەڵ میدییەکان هەژموونگەرایی ئاشوورییان رووخاند، نەبوخز ئەلنەسر سیمبۆلی ئەم قۆناخەیە کە یەکەمین نەفیکردنی دەرهەق بەیەهوودییەکان ئەنجامداوە. لەتەواوی قۆناخ‌و سەردەمەکانی خۆیدا بابل ناوەندی هەژموونگەراییە. لەندەن‌و نیویۆرکی هەژموونگەرایی سەرمایەداری دێنێتەوە بیری مرۆڤ. ناوەندی پیشەسازی ، بازرگانی، ئایین، هونەر و زانستە. چونکە بەناوبانگە. گوتەی "حەفتاو دوو میللەت" لەسەردەمی بابلەوە هاتووە. هیچ تیرە و هۆزێک نەماوە راکێشی نەکردبێت. بۆ

یۆنانیەکان (گریکەکان)ی ئەو سەردەمە پاریس و لەندەنە. یەکەمین فەیلەسوفەکانی بەقوتابخانەی بابلدا تێپەڕیوون. بەکورتی شاری هەژموونگەرایی جیهانی سەردەمی خۆیەتی.

دەشێت هەژموونگەرایی ئاشووریش بۆ سێ قۆناخ جیابکرێتەوە. قۆناخی کۆلۆنییە بازرگانییەکانی سالانی ٢٠٠٠ ـ ١٦٠٠ پ.ز کە گرێدراوی بابل بوو، سالانی ١٣٠٠ ـ ١٠٠٠ پ.ز قۆناخی هەژموونگەرایی تەواوە. دوا قۆناخیش سالانی ٩٠٠ ـ ٦٠٠ پ.ز لە زاگرۆسەوە تا دەریای سپی، لە ئەنادۆلی ناوینەوە تا دەگاتە میسر و عوممان لەجوگرافیایەکی زۆر فراواندا بووە بە هێزی هەژموونگەرایی. لەبواری بازرگانی و پیشەسازیدا پەرەسەندنی بەخۆوە دیوە. مولکی بارکراویان فرۆشتووە و کەرەستەی خاویان بۆ مەترەپۆلەکانیان گواستۆتەوە. چەندین تایبەتمەندێتی (ژمێریاری، کێشان، پێوان، قەرز، کاری وەک پارە) سەرمایەدارییان پەرە پێداوە. هەرچەندە لەقۆناخی دوایی خۆیدا وەک جددیترین رکابەر رووبەڕووی ئورارتووییەکان بوونەتەوە کە شاری وان ناوەندەکەیان بووە بەلام هەمان سەرکەوتنیان بەدەست نەهێناوە. جێگای بایەخە کە ئورارتووییەکان تاکە هێزن توانیویانە بەرامبەر ئاشوورییەکان لەسەر پێیان بمێننەوە. بەدرێژایی قۆناخەکانی هەژموونگەرایی خۆیان ئاشوورییەکان کۆلۆنی بەهێزیان ئاواکردووە. زاراوەکانی قازانج و کارگە لەریشەی قاروم (وەکالەت)ەوە هاتوون. لەرۆژهەلات مادو پارسەکان، رۆژئاواش میسر و ئیسرائیل و فینیقییەکان تا دەگاتە ئەنادۆلی ناوین چەندین میرنشینیان خستۆتە ژێر کۆنترۆلی خۆیان و کردوویانن بە کۆلۆنی.

هەروەکو چۆن بەرخودانێکی سەرکەوتووانەیان بەرامبەر هەژموونگەرایی قۆناخەکانی ئوروک، ئورو بابل پیشاندا، دیسان ئەوانەی هەمان شتیان بەرامبەر هەژموونگەرایی ئاشووریش دووبارە کردەوە هێزی هۆری و هیتییەکان بوو کە لەقەبیلە ئارییانیەکان پێکدەهاتن. وەک دەزانین یەکەمین مورشیلی پادشای هیتیت لەگەل هاوپەیمانە هۆرییەکانی لە سالی ١٩٥٦ پ.ز بابل یشی لەناودا تەواوی ناوەندی هەژموونگەرایی کۆنترۆلکرد.

باڵی میتانی هۆرییەکان لەقۆناخی ١٥٠٠ ـ ١٢٥٠ پ.ز لە کەرکوکەوە تا دەگاتە دەریای سپی لەناوچەیەکی بەرفراواندا هێزێکی هاوشێوەی ئیمپراتۆریەتیان پێکهێناوە. هەرچی ئورارتووو مادەکانن کە لەهەمان ڕەچەڵەکن، دوای ساڵانێکی درێژی بەرخودان لەساڵ ٦١٢ پ.ز ڕێگایان لەپێش شکستە ستراتیژییەکەی ئیمپراتۆریەتی ئاشوور کردەوە. بەڵام بەتەنیا بەستنەوەی ژێرکەوتنی ئاشوور بەشەڕە دەرەکییەکانەوە هەڵوێستێکی ناتەواوە. هۆکاری سەرەکی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە: چیتر شەڕ مایەی قازانج نییە. هەر وەکو چۆن مەیلی قازانجی سەرمایەداری — کە لەکەمبوونەوەدایە ـ هۆکاری تەنگەژە و قەیرانە، کەمبوونەوەی یاسای قازانجی شەڕەکانیش ئەنجامەکانی قەیران و دۆڕاندنە.

دوای ئیمپراتۆریەتی ئاشوور هێزە هەژموونگەرا نوێیەکەی خۆرهەڵاتی ناوین ئیمپراتۆریەتی پارسە کە لەسەر بنەمای ڕێککەوتنی پارس ـ مادد ئاواکراوە. ئیمپراتۆرەکانی پارس کە لەقۆناخی ٥٥٠ ـ ٣٣٠ پ.ز ڕۆڵی هەژموونگەرایی جیهانیان دەگێڕا بەرفراوانترین سیستەمی جیهانیان ئاواکردبوو. گۆڕەپان و ناوچەی قەڵەمڕەوییان لەکەنارەکانی ئیجەوە تا پەنجاب درێژببوویەوە، جگە لەچین سەرجەم ناوچەکانی شارستانی ئەو سەردەمەی دونیایان لەژێر هەژموونگەرایی هەمان هێزدا کردووە بەیەک. بەو سیفەتەی کلتووری مەعنەوییە زەردەشتایەتی ڕۆڵێکی دیاری لەم سەرکەوتنەدا هەبووە. سیستەم لەمیانەی یاخیبوونە بەردەوامەکانی هێزەکانی شارستانییە کۆنەکەی میسر و هێزەکانی شارستانی ئیۆن ـ ئیجە کە لەقۆناخی شارستانییەکی نوێدابوون خوێنی لێ چۆڕا و تیرەکانی ئیسکیت لەباکوور لەئەنجامی شەڕەکانی بەرگریکردن و هێرشی گەریلایی سەردەمی هێزگەلێک بوون سیستەمیان کونکرد. شارەزایی ئایدیۆلۆژیو تەکتیکی ئەسکەندەری پادشا لاوەکەی مەکەدۆنیا (قوتابی ئەرستۆ) لەژێر کاریگەری کلتووری گریک بەخێرایی پەرەیسەندو کۆتایی بەهەژموونگەرایی ئیمپراتۆریەتی پارس هێنا. بەمجۆرە شارستانییە نوێیەکەی گریک سەرکەوتووانە خۆی سەلماند.

٥ ـ هێزی هەژموونگەرایی نوێ دەکەوێتە دەست هێزەکانی گریک ـ رۆما کە نوێنەرایەتی شارستانی هێلینی دەکەن. ئەمەش یەکەمین گواستنەوەی جدی هێزە لەرۆژهەڵاتەوە بۆ دەست رۆژئاوا. شارستانی گریک ـ رۆما کە پشت بە کلتووری شارەکانی کەناری ئیجە دەبەستێت (٦٠٠ پ.ز ـ ٥٠٠ زایین) لەمێژووی جیهاندا ڕێگای لەپێش دووەمین گەورە شەپۆلی شارگەرایی کردۆتەوە. سەرچاوەی سەرەکی هێزی ئەم شارستانییەی شاریش توانست و کلتووری ماددی و مەعنەوی کەڵەکەبووی میسر، بابل، هیتیت، گریک و ماد ـ پارسەکانە کە بەدرێژایی سەدان ساڵ وەرگیراوە، هەرسکراوەو پەسەندکراوە. داناکانی ئیۆن (سۆلۆن، تالیس، پیساگۆرس) لەکۆشکەکانی میسر، بابل و پارس گەڕاون و توێژینەوەی وردیان لەبارەی کلتوورەکانیان کردووە. بێگومان گریک ـ رۆماش کۆمەکێکی هەمەلایەنیان پێشکەش بەشارستانی کردووە. ئەوەی گرنگە کاریگەری زنجیر ئاسایانەی شارستانیەکانە. شەڕەکانی دەسەڵات و بەدامەزراوەبوونەکانی زەوتکردنی زێدە (بەها، بەرهەم)ی کۆمەڵایەتی بناخەکەی پێکدێنێت وەک میراسێکی باوونەریتی بەردەوام بۆ یەکتریان گواستۆتەوە. ئەوەی لەبەرزترین ئاستدا دەسەڵاتی خۆی زیادکردووە، خۆی بەسەرکەوتووترینیان دادەنێت. ئەمەش وابەستەی گەورەکردنی زێدە ـ بەها و دەستبەسەرداگرتنیەتی.

هاوشێوەی گواستنەوەی کلتووری ماددی و مەعنەوی شارستانی رۆژهەڵات بۆ شارستانی ئەورووپا کە شارستانی گریک ـ رۆما ئەنجامیدا، بەر لەساڵانی ١٦٠٠ پ.ز لەمیانەی نموونەی میکان ـ هیلاس بۆ نیمچە دوورگەی یۆنان، لە ساڵانی ١٠٠٠ پ.ز دا لەڕێگای ئەتروسکەکانەوە بۆ نیمچە دوورگەی ئیتاڵیا گواستراوەتەوە. هەرچی گواستنەوەی کلتووری نیولیتیکە لەقۆناخەکانی ٧٠٠٠ ـ ٤٠٠٠ پ.ز بەردەوام بووە. گواستنەوەی کلتووری لەمێژووی جیهاندا یەکلایەن نەبووە بەڵکو لەسەر بنەمای یەکتر بەستنەوە بەردەوام بووە. پەلهاوێشتنەکانی قۆناخی شارستانی کە لەسەر بنەمای زەبرو زەنگ بوون زۆر لەمەزەندەکان سنووردارترن. مێژووش هەموو شتێک نییە؛ پڕوپاگەندەکانی مێژووی فەرمی بەدیرۆک دانانێین.

پەلهاوێشتنە دەسەڵاتگەراییەکانی شارستانی بەشێکی زۆر کەم و سنووورداری مێژووی جیهانی پێکدێنێت. ئەوەی لەژێرەوە رۆڵی راستەقینە دەبینێت مێژووی کۆمەڵگایە کە قەبیلە و گەلان تەونەکەیان هۆنیوەتەوە. تەنانەت ئاستەمە دیرۆکی دەسەڵاتەکان بەمێژووش ناوببرێت. دۆزینەوەی مێژووی بنەڕەتی لەرایەڵەی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگادا ناوەڕۆکی مێژووی جیهان (گەردوون)ی بەدەستەوە دەدات. جارێکی دیکە ئاماژەی پێدەکەمەوە کە تا ئێستا ئەم کێشانە بەهەموو قورساییەکەیەوە گفتوگۆی لەبارەوە دەکرێت.

ئەو شارگەراییەکەی لەهەردوو کەناری دەریای ئیجەوە گەشەیکرد، هەروەها ئەو بزاوتە کلتووری و شارستانییەی ئەم شارگەراییەی بەبنەما دەگرت سەبارەت بەمێژووی گەردوونی گوزارشت لەسەنتێز و قۆناخێکی مێژوویی نوێ دەکات. ئەم سەنتێز و قۆناخە مێژووییە وەک قەڵەمبازی راستەقینەو رەسەنی پێکهاتنی شارستانی ئەورووپای رۆژئاوا هەڵدەسەنگێنرێت. وەک سەرەتایەکی تەواوی روانگەکانی سەبارەت بە جیهان تاوتوێ دەکرێت. سەرباری بانگەشە زانستی و فەلسەفیەکانی شارستانی ناوەندی ئەورووپا لەم بارەیەوە، بەقورسی هەڵوێستێکی میتۆلۆژی پیشاندەدات، کاتێک ئەمەش ئەنجامدەدات چەواشەکاریەکی مەزن سەبارەت بەمێژووی جیهان "گەردوون"ی بەڕێوە دەبات.

لەتەواوی ئەم باسانە زۆر باش دەرکی پێدەکرێت کە ئەو کلتوورەی لەکەنارەکانی ئیجە پەرەیسەندووە، سەنتێزێکی گرنگە کە لەسەرەنجامی گواستنەوەی تەواوی کلتوورەکانی خۆرهەڵاتی ناوینەوە پێکهاتووە کە سەدان ساڵ تەنانەت هەزاران ساڵ بەردەوام بووە. پێویست ناکات بۆ ئەملاو ئەولا بڕۆین. تەنیا لەو سەنتێزانەی پەیوەندی پارس - هێلین لەساڵانی ٦٠٠ پ.ز پێکیان هێناوە تا رووخانی رومای رۆژئاوا واتە تاوەکو ساڵانی ٥٠٠ زایینی (ساسانییەکانیش بخەینە سەر) شاهێدی ئەم ئەنجامەیە و راستیەکەی دەسەلمێنێت. تەنیا سەیرکردنێکی پەنتائۆن (ئەنجوومەن)ی خوداوەندەکان لەشاخی نەمرود بۆ تێگەیشتنی ئەم راستییە بەسە.

بزاوتی شارگەرایی گریکەکان سەنتێزێکی سەرکەوتوو و قۆناخێکی سەرووترە. لەو زەمینە کلتوورییەی ڕێی بۆ خۆشکرد ئایدیۆلۆژیا ئایینیە خاوەن ریشە میتۆلۆژیەکەی شیکارکرد، ڕۆڵێکی جدی لەهاتنە پێشەوەی فەلسەفە و زانستدا هەبوو. ڕۆڵی ئەم کۆمەکە لەبناخەدانان و جێگیرکردنی زانست و فەلسەفە دیارکەر بوو. لەم سۆنگەیەوە تاودانێکی جددی داوەتە مێژووی جیهانی. زانستەکانی فیزیا، کیمیا و زیندەوەرزانی ڕێگایان لەپێشدا کراوەتەوە، بنەماکانی فەلسەفەی کۆمەڵگا و مێژوو بە پێودانگی زانستیتر گەیەنراون. هەروەها نموونەی شکۆداری هونەری پێشکەشکراون بەتایبەتیش لەبوارەکانی بیناسازی شار، پەیکەرتاشی، شانۆ و گێڕانەوەی داستاندا. بێگومان ئەم بالأبوونە کلتوورییە لەپشت سەرکەوتنە گەورەکانی ئەسکەندەردا شاراوەیە. ئەگەر لەقۆناخی کۆماری یان ئیمپراتۆریەتدا بێت ڕۆما گوزارشت لەگواستنەوەی کلتووری گریک دەکات بۆ گۆڕەپانی سیاسی و سەربازی. سەرگوزەشتەی هەژموونگەرایی هەزار ساڵەی (٥٠٨ پ.ز - ٤٩٥ زایین) ڕۆما هەم سەلماندن هەم جێبەجێکردنی نیازەکانی ئەسینایە. لەم سۆنگەیەوە ناتوانرێت بەسەنتێزێکی جیاواز یاخود بەرەسەن دابنرێت. بێگومان لەبواری چەندایەتیەوە زۆر گەورەتر بووە، لەبواری چۆنایەتیشەوە (هەژموونگەرایی سیاسی و سەربازی) هەوڵیداوە نزیکی کامڵبوون بێتەوە. لەبوارەکانی یاسا، بیناسازی و ڕەوانبێژیدا نموونەکانی خۆی پیشانداوە.

هەژموونگەرایی ڕۆما تا بڵێی گەردوونیبوون و مێژووی جیهانی تەنگەتاو کردووە. لەم لایەنەوە کۆمەکەی گرنگە. بەلأم پێویستە لەبیر نەکرێت زیاتر لە بواری کلتووری خۆرهەلاتی ناوین ئەم ڕۆڵەی بینیوە. نموونەی ڕۆمای ڕۆژهەلات (ئیمپراتۆریەتی بێزەنتی) بەشێوەیەکی ڕوون و ئاشکرا گوزارشت لەم ڕاستییە دەکات. هەوڵێکی زۆریداوە تاکو ببێتە ڕۆژئاوایی و بەشارستانی ئەورووپاش بکات. لەچوارچێوەی ئەم هەوڵەیدا بۆ ئەنجامدانی هێرش و پەلامار بەرامبەر گۆتەکان (قەبیلە جێرمەنەکان) لەدروستکردنی هەندێک ڕێگا، قەلأ و دیوارەکانی پاراستن بەولاوە نەڕۆیشتوون. مسۆگەرە لەناو جیهانیبوونێکدا ژیاوە کە لایەنی

ڕۆژهەڵاتییان (بۆ ماوەیەکی درێژ دیجلە و فورات سنووری ڕۆژهەڵاتیان پێکهێناوە) باڵاترە. لەنموونەکانی گریک زیاتر ڕۆژهەڵاتی بووە. هەروەکو چۆن لەبوارەکانی کلتووری ماددی و مەعنەوی بەمجۆرە بووە، لەبواری چەندایەتی و چۆنایەتیش گوزارە لەسەنتێزێکی بەمجۆرە دەکات. بێگومان سەبارەت بەئاواکردنی شارستانی ئەورووپاش ئەزموونێکی بەرایی و هەنگاوێکی دیرۆکییە.

لەسەردەمی هەژموونگەرایی ڕۆما لە جیاتی پارسەکان (خانەدانی هاخامنشینی ) خانەدانی پارتو ساسانی هەوڵی نوێنەرایەتیکردنی کلتووری ڕۆژهەڵاتیان داوە (نزیکەی ساڵانی ٢٥٠ پ.ز - ٦٥٠ زایینی). کاتێک دەڵێم نوێنەرایەتیکردن مەبەستم دەمارە سیاسیو سەربازییەکانی کلتووری دەسەڵاتە. هەر وەکو چۆن جیهانی کلتووری هێلینی ڕۆڵی سەرەکی لەهەژموونگەرایی گریک - ڕۆمای دوای ئەسکەندەر بینیوە، کلتووری زەردەشتیش کە لەبناری زنجیرە شاخی زاگرۆسو لەدەوروبەری کڵپەی ئاگری ئاتێشگای موغەکان پێکهات ڕۆڵێکی دیاریکەری لەدەسەڵاتە هەژموونگەراکانی ماد - پارسدا هەبووە. هاوتەریبی شەڕە سیاسی و سەربازییە هەزار ساڵییەکەی نێوان هەردوو هێزی هەژموونگەرایی، شەڕێکی ئایدیۆلۆژی هاوشێوەش لەنێوان هەر دوو کلتوور بەڕێوەچووە. ڕۆڵی ئەم ململانێ و پێکدادانە لە سەنتێزی کلتووری ڕۆژئاوادا دیاریکەرە.

بەگرنگییەوە ئاماژە بەو خاڵە دەکەم؛ کلتووری کۆمەڵایەتی کۆمەڵگای پشتبەستوو بەبناری زنجیرە شاخەکانی زاگرۆس - تۆرۆس لەهیچ قۆناخێکدا بەتەواوەتی ڕەسەنایەتی خۆی لەدەست نەداوە. تەنانەت رادەستبوونی بۆ هەژموونگەرا سیاسی، سەربازی و هەژموونگەرا ئایینیەکانی راهیبیەکانی زادەی ناوچەی خۆشیان پەسەند نەکردووە. بەدرێژایی مێژوو توانیویەتی بەرامبەر شەپۆلە داگیرکەدارییەکانی هەر چوار لا بەردەوامی بەهەبوونی کۆمەڵایەتی خۆی بدات. سیستەمی قەبیلە، ئابووری کشتوکاڵ و ئاژەڵداری کە خاوەن ڕەگ و ڕیشەیەکی قووڵە (لە ١٥٠٠٠ پ.ز تا ڕۆژی ئەمڕۆمان) ڕۆڵێکی دیاریکەری لەمەدا بینیوە. وەک بڵێی دوو جیهان لەم کلتوورەدا جێگای باسە. یەکەمیان، جیهانی

کۆمەلایەتی کۆمەلگای قەبیلە و گەلان کە لەقوولایی میژوو و خاکدایە. دووەمیان؛ جیهانی دەولەت، شەر و پیکدادانی دەسەلاتی هەژموونگەرایی هیزە داگیرکەر، کۆلۆنی، چەوسینەرو قرکەرە لەژمار نەهاتووەکان. ئەوەی هەولی باسکردنیمدا هیلی سووری پەرەسەندنی دیالیکتیکی نیوان هەردوو جیهانە کە سەبارەت بە میژووی جیهانییەوە تا رۆژی ئەمرۆمان بەردەوامە. بەلانی کەم لەچوارچیوەی سۆبژەکتیڤیتییەوە هیچ کاتیک کلتووری ناوچە بەکەناربوونی پەسەند نەکردووە، تەنانەت نەیویستووە بەخەیالیشیدا بیت، هەر چەندە لەبواری بەناوەندبوون هەندیکجار چیرۆکی کۆمیدیو تراژیدیشی هەبووبیت، بەلام بەردەوام لەسەر بەناوەندبوون سووربووە. کاتیک لەمیانەی ئەم روانگە جیهان (گەردوون) ییەوە سەیری میکرۆ"وردە"میژوومان بکەین ئەوا لەبینین و تیگەیشتنی هەزار و یەک نموونەی سەرفرازی ـ نامەردی، ئازار ـ جۆش و کۆمیدی ـ تراژیدی زەحمەتی نابینین. ئەو کاتە باشترو زیاتر دەرک بەسروشتی کۆمەلایەتی (سروشتی فیزیا، کیمیاو زیندەوەرزانیش کەلیی جیانابیتەوە) کۆمەلگای خۆمان دەکەین و لەپیناو پیشاندانی ئیرادەو چالاکی بۆ کەمکردنەوەو نەهیشتنی خراپییەکان هەول و کۆششیکی زیاتر دەدەین.

و- دوا هەلمەتی جیهانی شارستانی ناوەندی خۆرهەلاتی ناوین لەقۆناغ و سەنتیزی شارستانی ئیسلامدا ئەنجامدراوە. بەپیچەوانەی مەزەندەکانەوە ئەوەی بەئیسلام ناودەبریت ئایدیۆلۆژیایەکی ئایینی پالاوتە نییە، بەلکو سەنتیزی تەواوی ڤیرسیۆنە ئایدیۆلۆژییەکانە کە تا ئەو قۆناخە جیگای باسە. ئیسلام ئۆرژینال یان رەسەن نییە، بەلکو قۆناخیکی شارستانی و لیشاوی گەردوونی کلتووری خۆرهەلاتی ناوینە. لەهەمانکاتدا سەنتیزیکی ئایدیۆلۆژی زۆر ئالۆزە. بێ بەختی لیرەدایە؛ ئەوروپای رۆژئاوا سەرلەنوێ سەنتیزی کرستیانی شیکارکردو لەبواری فەلسەفەو زانست ریگای لەپیش هەلمەتیکی گەردوونی و میژوویی کردەوە، بەلام ریگەچارە فەلسەفیو زانستییەکانی لەسەنتیزی ئیسلامدا دەستی پیکردبوو بەر لەئەنجامگیربوون سەرکوتکران، ئەمەش یەکیک لەهۆکارە

گرنگەکانی گواستنەوەی شارستانی ناوەندی خۆرهەڵاتی ناوین بوو بۆ ئەوروپا.

سەرباری سەرجەم باس و پەیامە رزگاریخوازییەکانی سەرەتای بەڵام لەماوەیەکی زۆر کورتدا (بنەماڵەی ئەمەوی ٧٥٠ ـ ٦٥٠) شارستانی ئیسلام بۆ شارستانییەکی هەژموونگەرا وەرچەرخاوە. لەبنەڕەتدا ئیسلام لەبەرامبەر بێچارەیی و بنبەستبوونی سەدان ساڵەی ململانێی نێوان بێزەنتی و ساسانییەکان هاتە مەیدان کە لەدوا قۆناخی خۆیان سوابوون، لەجیاتی سوود گەلانی ناوچەو تۆڕە کۆمەڵایەتییەکانی پڕوکاندبوو. هەر وەکو لەناوەکەشیەوە دەرکی پێدەکرێت ئەو پەیامە ئاینی ئاشتییە (سەلام، چاوگی زاراوەی ئیسلامە). بەڵام بنەماڵەی ئەمەوی شەڕی شارستانیەکانی خۆرهەڵاتی ناوینیان چڕ و قاڵتر کردۆتەوە (پەیمانی مەدینەی حەزرەتی محەمەد تا ساڵی ٦٥٠ زایینی بەردەوام بووە.) چەندین جار ساسانی و بێزەنتییەکان دووچاری شکست هاتوون، قوستەنتین پۆلیس گەمارۆ دراوە، شارە ساسانیەکانیش بەتەواوی دەستیان بەسەردا گیراوە. تەنیا لەسنوورەکانی چیندا بەربەستکراون (لە ساڵی ٧٥٠). لەنیمچە دوورگەی ئیبەری هیندستانەوە تا دەگاتە دەوروبەری ئەفریقیا جێگیر کراوە. لەگەڵ ئیسلامبوونی تیرە تورکەکان یش پەلهاوێشتن لەنیوەی باکوری گۆی زەوی، واتە لەئەوروپای ناوینەوە تا تەواوی باشووری سیبریا و ئاسیای ناوین دا جێگیر بوو. بەرفراوانبوونێکی مەزن لەبواری دەسەڵات ـ دەوڵەت ـ شارستانی بەدیهاتووە.

لەسەردەمی بنەماڵەی عەباسیدا (٧٥٠ ـ ١٢٥٠) هەژموون بەلوتکە گەیشتووە. ئیتر بەردەوام دەستەواژەی ئیمپراتۆریەتی جیهان دەگوترێتەوە. بەخێرایی کلتووری گریک، هیند و تەنانەت کلتووری چین یش وەردەگێڕدرێتو دەگونجێندرێت، ویستوویانە باڵابوونێکی کلتووری بۆ ئیسلام بئافرێنن. سەرمایەداری بازرگانی بەپێگەیشتووین قۆناخی مێژوویی خۆی گەیشتووە. ئەگەر بیویستایە لەراستیدا ئەو هێزەی هەبوو کە ئەوروپا کۆنترۆڵ و تەنانەت داگیریش بکات کە دواتر لەبەرامبەریدا دووچاری دۆرانی، هەژموونگەرایی دەبێت. لەبەر ئەوەی مایەی قازانج

نــەبوو فــەتحکردنی ئــەورووپای ســنووردارکرد. بەپێچەوانــەی مەزەنــدەکان بەهۆی خۆڕاگری و بەرخودانی بەرامبــەر داگیرکردنــی ئــەورووپا بــەنیوەچڵی نەهێشترایەوە، بەڵکو هەر وەکو لــەداگیرکاری رۆماشدا بینــرا بــەهۆی بــێ بەرهەمییەکەی بووە. هەروەها دەستبەسەرداگرتنەکانی هون و جەنگیزخان یــش لەبــەر هۆکــاری هاوشــێوەوە بــەنیوەچڵی ماوەتــەوە. تــاوەکو ســەدەی یازدەهەم چانسی ئەورووپا لەوەدایە کە هێشتا نەبووە بەناوچەیەکی هێندە بەپیت و جێگای قازانج کە ئارەزووی هێزە مەزنــەکان (خۆرهــەڵاتی نــاوین) گــەورە و کەمەندکێشــی بکــات. کاتێــک بــەم دۆخــەش گەیشــت (لــە ســەدەی نۆزدەوە) زانیویەتی چۆن لەمیانەی دژە هەڵمەتەوە هەژموونگــەرایی خــۆی ئاوابکات و هەمیشەییشی بکات.

کاتێــک هەرەســـهێنانی هەژموونگـــەرایی ئیســـلام لـــەچوارچێوەی شارستانیدا شیکار دەکرێت لەدەرەوە داگیرکاری و دەستبەســەرداگرتنەکانی بنەماڵەی جەنگیزخانی مەغۆلی، لــەناوەوەش ململانــێ و پێکدادانی نێوان مەزهەبەکان وەک هۆکاری سەرەکی پیشاندەدرێت. ئەمە باسێکی ناتــەواوە. وەک ئامــاژەی پێکــرا، هۆکــاری بنــەڕەتی ئەنجامنــەدانی رێنسانســی کلتوورییە. بەڕێوەبەرایەتی سەردەمی عەباسی پەی بــەم راستییە بــردووە. زۆر باش ئاگادارن کە تەنیا لەمیانەی رۆڵی ئایینی ئیسلام بــەو سیفەتەی ــ پــەیامی ئاشــتیو رزگارییــە ــ نــاتوانن ئیمپراتۆرییــەت لەســەر پێیــان بهێڵنەوە. لەراستیدا لە قۆناخی سالانی نێوان ١٢٠٠-٨٠٠ هەوڵ و کۆششێکی نزیک بەرێنسانی ئیسلامی جێگــای بــاس بــووە. کرانــەوەی جدی و بڕشت لــەبواری زانســت و فەلســەفەدا ئەنجامــدراوە. لەزانســتەکانی پزیشــکی، بایۆلۆژی، بیرکاری، کیمیا و مێــژوو کۆمــەڵگا لەپێشــەوەی ئەورووپادایــە. لــەمژارەکانی حیکمـــەت، تەســـەوف، مـــەنتق، ئیلاهیـــات و عەدالـــەتی فەلســـەفەدا کرانـــەوەی زۆر بڕشـــت و بەکاریگـــەر لـــە ئارادایـــە. بـــەڵام لەسەرەنجامدا کاتێک قورسایی بەلای دۆگماتیزمی ئایینیدا شکایەوە، ئــەو کــار و خەباتــە دووچــاری دارمــان هــات، تەنانــەت بــوو بــە نــەفرەتی و بەلاوەنراوە.

هەرچی ئەوروپایە بەپێچەوانەوە لەکاتێکدا هەوڵیدەدا راستەوخۆ ب سەرچاوەکانی گریک - رۆما بگات، لەلایەکی تریشەوە سەرجەم ئەو سەرچاوانەی وڵاتانی ئیسلامی بۆخۆی گواستۆتەوە کە زانیویەتی سوودبەخشن و بەکەڵکی دێن. ئەو رێنسانسەی لەخۆرهەڵاتی ناوین دووچاری وەستان هات لەئەوروپا قەڵەمبازی ئەنجامداوە. سەدەکانی ١٤ - ١٥ سەردەمی رێنسانسی ئەوروپایە. چانسی ئەوروپا لەوەدایە کە سەرباری دژایەتی دۆگماتیزمی کرستیانیش درێژەی بەرێنسانسی خۆیداوە و توانیویەتی لەتەواوی ئەوروپادا بڵاوبێتەوە. لەسەدەکانی ١٦ و ١٧ و ١٨ دا لەمیانەی ریفۆرم (ریفۆرمی ریشەیی لەئاییندا) و شۆڕشی فەلسەفی و زانستییەوە رۆشنگەری خۆی فەراهەم کرد و بەشێوەیەکی سەرکەوتووانە پرۆسەکەی تەواو کردووە. لەسەرەنجامدا کاتێک بەسەرەتاکانی سەدەی نۆزدەهەم گەیشتوون سەرکەوتنی شۆڕشی کلتووری (زهنی) مسۆگەر بووە. سەرکەوتنی ئەو شۆڕشە کلتوورییە رۆڵێکی دیاریکەری لە لەدەستدانی هەژموونگەرایی شارستانی ئیسلامی و گواستنەوەی هەژموونگەرایی بۆ ئەوروپا هەبوو.

ئەو هۆکارەی پێویستە لەریزی دووەمی فاکتەرەکانی گواستنەوە یان خزانی هەژموونگەرایی دابنرێت. بەهەمان شێوە سەرکەوتووانە گواستنەوەی سەرمایەداری بازرگانییە بۆ ئەوروپا. ئەو هەڵمەتە بازرگانییە مەزنەی شارەکانی ئیتاڵیا — لەسەرووشیانەوە ڤێنسیا، جەنەوا، فلۆرەنسا - لەسەدەی یانزدەهەمەوە لەگەڵ هێرشی کریستیانی (خاچپەرستە)کان ئەنجامیاندا تەنیا بەئامانجی قازانج نەبووە. بەڵکو شانبەشانی قازانج بەسیفەتی کلتوور سەرجەم ئەو پەرەسەندنە سەرمایەداری "کشتوکاڵ، بازرگانی، دراو، پیشەسازی)یانەی گواستۆتەوە کە بەهەزاران ساڵ لەجیهانی خۆرهەڵاتی ناوین پێکهاتبوو. لەگەڵ کاڵاکان سەرجەم ئەو رێسا و ئامرازانەشی گواستبوویەوە کە ئەو کاڵایانەی بەرهەمهێنابوو. پێویستە ئەو گواستنەوانەش بژمێرین کە لەشارستانی چینەوە (کاغەز، باروت، چاپخانە، گوللە تۆپ و تەکنیکەکانی) هێنرابوون. بەتایبەتیش "لەرێگای مەغۆلەوە" لەریزی سێیەمدا

گواستنەوەی هزر و ئامرازی سەربازی و سیاسی جێگای باسە. ئەوروپا هەر لەخۆیەوە ئامرازەکانی دەولەت و دەسەلات و هزرەکەیانی نە ئافراندووە؛ تا رادەیەکی زۆر وەک میراس وەریگرتووە. تەنیا لەسەدەی شازدە بەدواوە کۆمەکی خۆی تێکەلکردووە. پێویستە گواستنەوەی هونەر و ئەدەبیات لەریز و پلەی سێیەم دابنرێت. دەولەتشارەکانی ئیتالیا و دەولەتی ئیسلامی ئەندەلوس رۆلی سەرەکییان لەم گواستنەوانەدا بینیوە.

وەک خالی دوایی دەشێت ئایینی کریستیانیش وەک ئامرازی سەرەکی گواستنەوەی ئەخلاقی و مورال هەلسەنگێنرێت. ئەوەی دوای رووخانی رۆما لەبواری مورالەوە ئەوروپای هەلساندەوە سەر پێیان کرستیانی بوو. لەوەش گرنگتر، هەلمەتە نوێکەی شار زیاتر لەدەوروبەری دێری کرستیانەکان پەرەیسەندووە. بزاوتە نوێکانی شارگەرایی کەنارەکانی ئیتالیا و ئەوروپای رۆژئاوا کە لەسەدەی یانزە بەدواوە خێرابوو لەبواری جیهانییەوە دوای هەلمەتەکانی سۆمەرو ئیۆن سێیەمین هەلمەتی بنەرەتییە. هەلبەتە چەندین مۆلبوونی خوارووی ئەم هەلمەتە مێژووییەش جێگای باسە کە هەم کلتوورەکەی پشتیان هەم شێوەی بونیادنانیان جیاوازە بەلام لایەنی لێکچووشیان زۆرە.

چیرۆکی پێنج هەزار سالەی شارستانی لە هەمانکاتدا سەرگوزەشتەی پەرەسەندنی ڤەرسیۆنەکانی شارە. شارەکان لەمێژوودا رۆلی جێگیر و هەمیشەیی قایمترین جومگەکانی کلتووری ماددیو مەعنەوییان بینیوە. بەهۆی تەنگەژەی قورسو نەخۆشییەکانی گەورەبوونی شێرپەنجەییانەی قۆناخی شارگەرایی ئەوروپا کە تا ئێستاش بەردەوامە چۆنیەتی ئەنجامگیربوونی مژاری گفتوگۆی مەزن و لێکەرینە نوێیەکانی چارەسەرییە. لەمیانەی ئەم لایەنانەیەوە کریستیانی رۆلی رێبەرایەتی ستراتیژیو تەکتیکی گواستنەوەی فاکتەرەکانی کلتووری ماددی و مەعنەوی دەبینێت. کاتێک رەگ و ریشەی خۆرهەلاتی ناوینی کریستیانی رەچاو بکرێت ئەوا باشتر دەرکی پێدەکرێت ئەو ئەوروپایەی لەسەدەی شانزدەهەمینەوە هەنگاوی بۆ شارستانییەکی نوێ هاوێشت، چۆن لەدایکبوو. شارستانی ئەوروپا کە میراسی شارستانی گریک - رۆمای

وەرگرت لەسەر بنەمای ئەو گواستنەوە نوێیانەوە، نوژەن بۆتەوە و بەسەنتێزێکی کلتووری بەهێز گەیشتووە، لەمیانەی ئەنجامدانی وەرچەرخانی رادیکاڵانەی شێوازی بەرهەمهێنان - کەڵەکە کردن هەژموونگەرایی خۆی ئاواکردووە.

کێبڕکێی فەرەنسا و ئەڵمانیا لەگەڵ دەوڵەتشارەکانی ئیتاڵیا، بزاوتە نوێکانی فەتحکاری پادشایەتی ئیسپانیا و ئاقیکردنەوەکانی بوون بەئیمپراتۆریەت و هەڵکشانی هۆڵەندا و ئینگلتەرا رۆڵیان لەبونیادنانی هەژموونگەرایی دا لاوەکییە. بەبایەخەوە پێویستی ئاماژەکردن بەم خاڵە دەبینم؛ فاکتەرە ماددی و مەعنەوییەکانی کلتووری یەهوودی بەلانی کەم رۆڵە ستراتیژییەکەیان بەڕادەی کریستیانی بەکاریگەر بووە. مسۆگەرە لەگواستنەوەی تەواوی فاکتەرە کلتوورییەکانی جیهانی ئیسلامیدا یەهوودیەکان رۆڵی پێشەنگایەتییان گێڕاوە. لەبواری فێرکردن و ئاشناکردنی ئەوروپا بە بازرگانی و دراو بەردەوام رۆڵی پێشەنگایەتییان بینیوە. یەهوودییەکان شوێن پەنجەیەکی هەمیشەییان لەهەر بزاوتێکی فیکر، زانست و فەلسەفەدا هەبووە. لەڕێبەرایەتی تیۆریو تەکتیکی سەرجەم شۆڕشەکاندا بەردەوام هەبوون وشوێنپەنجەکەیان دیار بووە. هەروەها ناتوانرێت نکوڵی لەوە بکرێت کە رۆڵی مێشک و خوێنی شارستانی نوێ دەبینن، یان بەلانی کەم رۆڵی سەرەکی لەپەرەسەندنیدا دەبینن.

لەئەنجامدا زۆر ئاشکرایە ئەو مێژووە گەردوونیەی هیگل دەوڵەتشاری گریک بەسەرەتاکەیو دەوڵەت - نەتەوەی ناپلیۆن یش بەکۆتاییەکەی دادەنێت لەجێگای خۆیدا نییە. فەلسەفەی لیبرالیش کە دژایەتی هیگڵ دەکات، لەگەڵ هەڵوەشانەوەی یەکێتی سۆڤیەت ئەویش بانگەشەی کەهانەتێکی "کۆتایی مێژوو"ی هاوشێوەی کربوو. بەڵێ لێرەدا "کۆتایی"یەک جێگای باسە، بەڵام ئەمە کۆتایی مێژووی جیهانی نییە، بەڵکو کۆتایی مێژووی شارستانی ناوەندییە، کۆتایی شێوەگرتنی دەوڵەتو دەسەڵاتەکانێتی. دەوڵەت - نەتەوە دزەی کردۆتە ناو نهێنیترین شتەکانی کۆمەڵگە، لەم ڕێگایەشەوە کۆتایی بەکێشەی گەلی دەسەڵات و

دەوڵەت هێناوە. لەم سۆنگەیەوە ئەگەر فەلسەفەی هیگڵ لەسەر پێکانی دابنرێت (نەک وەک ئەوەی مارکس ئەنجامی دا) ئەوا زۆر فێرکەر و ئەزموون بەخشتر دەبێت. بەردەوام لەخۆم دەپرسم؛ کاتێک ئەمریکا دوایی ساڵانی ۲۰۰۰کان لەمیانەی شاڵاوەکەی بۆ خۆرهەڵاتی ناوین لەکەللەی سەددام حوسێنی دا ئایا ئاگادار بوو کۆتایی دەوڵەت - نەتەوەیی ڕاگەیاندووە. وەڵامەکە هێندە گرنگ نییە، بەڵکو خودی ڕاستی بابەخدارە. هەروەها ئەو لێکچواندنەشم کردبوو؛ لەکەللەدانی لویسی شازدەیەم لەمیانەی شۆڕشی فەڕەنسا بۆ ئاواکردنی دەوڵەت - نەتەوە چەندە گرنگە، ئەوا لەکەللەدانی سەددام حوسێن یش بەلایەنی کەم بۆ کۆتاییهاتنی دەوڵەت - نەتەوەی خۆرهەڵاتی ناوین هەمان گرنگی هەیە. ئەوانەی بەشێوەیەکی ڕاست و لەقوڵاییدا سەیری مێژووی جیهان (گەردوون)ی بکەن، ئەوا لەشکاندنەوەی ئەڵقەکانی دەوڵەت - نەتەوە کانەوە کە هەر ئێستا لەئەفغانستانەوە دەستی پێکردووە و تا تونس درێژ بۆتەوە چەندین سەرەداوی ئەم کۆتایی پێهاتنە دەبینین.

کۆتایی پێهاتنی دیاردەکانی دەسەڵات - دەوڵەتشارستانی شێوازی هیگڵ کۆتایی مێژووی جیهان نییە، بەڵکو مانای سەرەتایەکی نوێیە لەڕێگەی پارادایمێکی دیکەوە. مێژووی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگا کە بەردەوام لەپەراوێزی مێژووی جیهاندایە بەڵام بەردەوام شادەمارەکانی لەلێداندایە، دوایی ماوەیەکی درێژ سەر لەنوێ دێتەوە بەر ڕۆژی ڕووناک و ئامادەکاری ڕۆڵی مێژووی خۆی دەکات. لەتێزەکانی شارستانێتی دیموکراتیدا هێندە بانگەشە سەبارەت بەبونیادنان و ڕووخانی دەوڵەتەکان ناکرێت. شارستانێتی دیموکراتی بەردەوام هەوڵدەدات هەڵە ستراتیژی و تەکتیکیەکانی نێوان خۆی و شارستانیەتی دەوڵەتی و پلەداری زەلال و یەکلابکاتەوە. ئەم دوو شارستانیەتە بەردەوام لەمێژووی جیهاندا هەبوونیان هەبووە، ئێستاش هەن. ئەرکمان پێشخستنی سەرجەم پرەنسیپ و ئامرازە تەکنیکی و ستراتیژیەکان و ئایدۆلۆژیا و بەرنامەی شارستانێتی دیموکراتییە، بەڵام نەک وەک مارکس لەڕێگای هیگڵگەرایی

چەپڕەوەوە، بەڵکو لەمیانەی ڕەخنەکردنی تەواوی فەلسەفەکەی و دەربازکردنیەوە فەلسەفەی شارستانێتی دیموکراتی خۆمان پەرە پێبدەین.

بەشی سێیەم

## کێشەو تەنگەژە لە کۆمەڵگای خۆرهەڵاتی ناویندا

تەنگەژەی کۆمەڵایەتی گوزارە لەو قۆناخانە دەکات کە سیستەم ناتوانێت درێژە بە هەبوونی خۆی بدات. بەبەراورد لەگەڵ دەستەواژەی کێشە مانایەکی گشتگیرتری هەیە. لەکاتێکدا تەنگەژە زیاتر خەسڵەتێکی خولی هەیە، بەڵام کێشە بەشێوەیەکی رۆژانە لەڕووداو، دیاردەو پەیوەندی دامو دەزگاکاندا دەژیت. تەنگەژەکانی ناو هەمان سیستەم بە "کۆنژەکتوەل" ناودەبرێت، هەرچی تەنگەژەی خودی سیستەمە بەزاراوەی 'بونیادی' ناودێر دەکرێت. تەنگەژە کۆمەڵایەتیەکان هۆکاری زۆر هەمەلایەنیان هەیە. هەروەکو ئەو تەنگەژانەی سەرچاوەیان بۆ گۆڕەپانو بوارە سیاسی، ئابووری و دیموگرافیەکان دەگەڕێتەوە، ئەو تەنگەژانەش جێگای باسن کە جیوبایۆلۆژیا سەرچاوەکەیانە. ئەو کۆمەڵگایانەی پلەداریو دەوڵەت (بەگشتی دامودەزگاکانی دەسەڵات)ی تێدا پێشنەکەوتووە، تەنگەژەکانیان زیاتر جیۆبایۆلۆژیکە. بوومەلەرزە یان وشکە ساڵیەکی سروشتی دەشێت تەنگەژەی کۆمەڵاتی جدی بخولقێنێت. تێکچوونێکی چاوەڕواننەکراوی ژینگەو دەوروبەر دەرەنجامێکی هاوشێوەی لێدەکەوێتەوە. بەئەندازەی بێخۆراکی یان کەمخۆراکی ژمارەیەکی زۆری دانیشتوان، کەمبوونەوەیەکی زۆری ژمارەی دانیشتوانیش دەشێت هۆکاری تەنگەژەبن.

هەرچی ئەو تەنگەژانەشن کە دەسەڵات سەرچاوەکەیەتی، لەمیانەی کەمبوونەوە و نزمبوونەوەی بەردەوامی ڕێژەی قازانج ڕوودەدات کە لەمیانەی تەکنۆلۆژیای شەڕ یان ئامرازەکانی پیشەسازی، بازرگانی و داراییەوە بەدیدێت. کاتێک خەرجیەکانی شەڕ لەقازانجەکانی زیاتر بێت و لەڕێگای ئامرازەکانی دیکەشەوە قەرەبوو و پڕنەکرێتەوە ئەو کاتە

تەنگەژەی کۆمەڵایەتی دەست لێبەرنەدراوە. کاتێک بەردەوام ئاست و ڕێژەی قازانجی پاوانە پیشەسازی، بازرگانی و داراییەکانی سەر بازاڕ لەدابەزیندا بێت و لەمیانەی شەڕ و پێکدادانی نوێوە ئەو ڕێژانەی قازانج پڕتەکرێتەوە، ئەوا قەیرانی ناو خودی سیستەم ناچارییە. ئەو تەنگەژانەی سەرچاوەی خۆی لەهەلومەرجە کۆنژەکتورەکان وەردەگرێت ئەگەر درێژتر بێتەوە (لەسیستەمە سەرمایەداریەکاندا ماوەی تەنگەژە بەگشتی لەنێوان ٥ ـ ١٠٠ ساڵدا دەگۆڕێت)ئەوا بۆ تەنگەژەی سیستەماتیک دەگۆڕێت. ئیتر کۆمەڵگا ناتوانێت لەژێر سایەی سیستەمدا بەردەوام بێت. لەپێناو سەرهەڵدان و دەرکەوتنی بونیادی سیستەمی نوێ، بونیادی سیستەم پەرتەوازە دەبێت و کەشوهەوایەکی کائۆسیانە دێتە ئاراوە. لەناو هێزە کۆمەڵایەتیەکاندا کامەیان بەگوێرەی ئامادەکاری ئایدیۆلۆژی و بونیادی خۆی وەڵامی بەهێزو پێگەیشتووتریان هەبێت، ئەوا لە ئاواکردنی سیستەمی نوێدا چانسی پێگە یاخود ڕۆڵی پێشەنگایەتی بەدەست دێنن.

کێشەی پەرتەوازەبوونی سیستەمێک و ئاواکردنی سیستەمێکی نوێ، لەچەمکی زانستی پۆزیتیڤیستدا ڕێگای لەپێش ناودێرکردنی شێواو و چەواشەکراو کردۆتەوە. بەتایبەتیش کاتێک چەمکە ڕاستەهێڵیەکانی مێژوو لەمیانەی چەمکێکی نوێی قەدەرگەراییەوە هەوڵیانداوە شێوەکانی کۆمەڵگا دەستنیشان بکەن دەرەنجامی زۆر خراپی لێکەوتۆتەوە. لەڕێگای کارەکانی ئەندازیارێتیەوە پێشخستنی پرۆژە لەبارەی سروشتێکی ئاڵۆزی وەک کۆمەڵگا، لەجیاتی چارەسەرکردنی تەنگەژەکان، بەدرێژایی مێژوو تەنگەژەکانی قووڵتر کردۆتەوە. ئەگەر هەڵوێستە میتافیزیکەکان (ئیسلامی، کرستیانی، هیندۆسی و ...هتد)بێت یان پۆزیتیڤیستەکان (نەتەوەیی، ئابووری، یاسایی) هەموویان دەچنەوە سەر هەمان ڕێگا. تەنانەت میتۆدە پۆزیتیڤستەکان هەروەکو چۆن زادەی دیاردەی فاشیزمن، لەولاتری تەنگەژە دەرەنجامێکیان لەگەڵ خۆیاندا هێنا کە بەئاستی جینۆسایدی کۆمەڵایەتی (کۆمەڵگاکان)گەیشت. دەتوانێت بگوترێت لەئاکامی ئەو شۆڕشە فەلسەفی و زانستیانەی دوای دووەمین جەنگی جیهانی هاتنە ئاراوە گفتوگۆی قووڵتر لەبارەی بابەتی سروشتی کۆمەڵگا

پەرەیسەند. پەیڤەکانی ئیکۆلۆژی، فێمینیزم، کلتوور و دیموکراسی سروشتی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگا ڕۆشنتر دەکاتەوە، بە شێوەیەکی ڕاست دەرفەتەکانی چارەسەری دەستیشان دەکات و چانسەکەی زیاتر دەکات.

هەرچەندە تیۆری مارکسیزم لەبارەی تەنگەژەی سەرمایەداری دیاردەکە بنەخشێنێت بەڵام لەجیاتی نزیکبوونەوە لەچارەسەری چاوەڕوانکراو ـ سۆسیالیزم یاخود کۆمۆنیزم ــ ڕۆژ دوای ڕۆژ لێی دوور کەوتۆتەوە. ئەم بارو دۆخە بەو ڕادەیەی پەیوەستی پێناسەی چەوت و ناتەواوی سروشتی کۆمەڵگایە، لەهەمانکاتدا مۆدیلەکانی چارەسەریش لە خەیاڵ و یۆتۆپیا بەولاوە گوزارشت لەهیچ شتێکی دیکە ناکەن. لەویش کارەساتبارتر ئەوەیە؛ چالاکی پێشنیار کراو، هەروەها پەیڕەوو ئامرازەکانیشی هەرچەندە نەخوازراویش بێت بەڵام لەدۆخی خزمەتکردن بەبەهێزکردنی سەرمایەداری ڕزگاری نەبووە. لەم بارەیەوە مێژوو پڕ لە ڕێگەچارەی خەیاڵی و پەلەقاژەی نائومێدی بێکۆتاییە. گرنگترین دەرەنجامی مەسەلەی تەنگەژە کۆمەڵایەتی و ڕێگەچارەکانی کە بەدرێژایی مێژوو لەئارادا بووە، زیاتر قوڵبوونەوەی چالاکی و ویستی زانینە؛ هەستکردنە بەپێویستی زانین. لەم چوارچێوەیەدا زانست و فەلسەفە، تەنانەت ئایین و هونەریش لەنزیکەوە پەیوەست بەوەڵامدانەوە و چارەسەرکردنی تەنگەژە کۆمەڵایەتیەکانەوە سەریانهەڵداوە.

کارەکتەری کێشە کۆمەڵایەتیەکان جیاوازترە. بێگومان لەبەر ئەوەی دەسەڵات و چەوسانەوە سەرچاوەی هەردووکیان پێکدێنێت ئەو کێشانە لایەنی هاوبەشیان هەیە. بەڵام لایەنێکی جیاوازیشیان هەیە کە بەشێوەیەکی ڕۆژانە لەئارادایە. هەروەها ئەوەی بۆ هەندێک تاک و گروپ کێشەیە، بۆ هەندێکی دیکە ڕێگە چارەیە. بەڵام ئەم خاسیەتە سەبارەت بەتەنگەژەکان زیاتر گشتییە. لەتەنگەژەکاندا سەرجەم توێژە کۆمەڵایەتیەکان بەشێوەیەکی نەرێنی کاریگەر دەبن. بەڵام لەقۆناخی تەنگەژەدا دەشێت هەندێک لەدوژمنە مارژینالەکانی کۆمەڵگا سوودمەندبن. ئەگەر سەرچاوەکەی دەرەکی نەبێت، ئەوا کێشە کۆمەڵایەتیەکان لەبنەڕەتدا سەرچاوەی خۆی لەفشار و چەوسانەوەی ناوەندەکانی

دەسەڵات وەردەگرێت. تەواوی کۆمەڵگا لەئامێر و دەزگاکانی سەرکوتکردنو چەوسانەوەی پاوانەکانی دەسەڵات بەشێوەیەکی نەرێنی کاریگەر دەبێت، واتە ژن بەناوەندی و پلەداری پیاو کاریگەر دەبێت، کۆیلە بەسەردارەکەی، لادێیی بەئاغاکەی، فەرمانبەر بەفەرمانڕەواکەی و کارکەریش بەخاوەن کارەکەی زیانی بەردەکەوێت و دەچەوسێنرێتەوە؛ دووچاری سەرکوتکردن و ئەشکەنجە دەبێت. لەئاکامدا هەر هەمووی دووچاری کێشەی کۆمەڵایەتی دەبێت. هەرچی ئەوەی پاوانەکانی دەسەڵات و چەوسانەوە لەژێر ناوی ڕێگەچارە پێشکەشی دەکەن، شێوەکانی دەسەڵات و ڕێبازە قاڵبۆوەکانی چەوسانەوەن. لەبەر ئەم هۆکارەیە کە شێوەکانی دەوڵەت و چەوسانەوە بەردەوام پەرە دەسەنن. هەڵبەتە وەڵامی ئەوەش بەرخودان و ڕاپەڕینی بەردەوامە، شەڕی بەرامبەرە. بەهۆی کەوتنە ژێر کاریگەری لۆژیکی دەسەڵات و سەرنجڕاکێشی چەوسانەوە وەک قەدەرێک ئەنجام ژیان بەسەر بردنێکی نامەردانەیە لەژێر سایەی چەوسانەوە و فشاری کێشەکان کە پاوانەکانی دەسەڵات سەرچاوەکەی پێکدێنێت. مێژووی شارستانی دەوڵەتی دیرۆکی نوێبوونەوە و پەرەپێدانی بەردەوامی ڕێبازو بەیرەوەکانی سەرکوتکردنو چەوسانەوەیە، لەبەرامبەر ئەمەشدا دیرۆکی پەرەسەندنی چالاکی و فەلسەفەی ئازادی و یەکسانی بەرخودانکارەکانە.

بەدرێژایی مێژوو کۆمەڵگاکانی خۆرهەڵاتی ناوین ئەو بەشەی مرۆڤایەتی بووە کە زۆرتر لەناو تەنگەژەو کێشەکاندا ژیاوە. بێگومان هۆکاری سەرەکی ئەمەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە بەدرێژایی پێنج هەزار ساڵ ناچار کراون لەژێر فشار و چەوسانەوەی شارستانی ناوەندیدا بژین. لەهیچ ناوچەیەکی دیکەی جیهان ئاشنای ئەم شێوە درێژخایەن و کەڵەکە بووەی فشار و چەوسانەوە نابیت.

## ١. کێشەی ژن لەکۆمەڵگای خۆرهەڵاتی ناوین

ئەو کێشانەی ژن لەناو کۆمەڵگادا بەدەستیەوە دەناڵێنێت بەر لەهەموو شتێک هەڵسەنگاندنی لەچوارچێوەی ڕەهەندەکانی کۆمەکۆمەڵگای مێژوویی گرنگ و بایەخدارە. کێشەی ژن کێشەیەکە

سەرچاوەی سەرجەم کێشەکانی دیکەیە. بەر لەگوزەرکردن بەرەو کۆمەڵگای دەوڵەتی و چینایەتی دامەزراوە بوونی پلەداریەکی توندی بالادەستی پیاو(باوکسالاری) لەسەر ژن دەبینرێت. بۆ پاساوهێنانەوەی بالادەستی پیاو پەنا براوەتە بەر چەندین چیرۆکی میتۆلۆژی و ئایینی. داستانی ئینانای مێخوداوەندی ئوروکیش ڕەنگدانەوەی ئەم پرۆسە و قۆناخەیە. لەداستانی ئاماژە پێکراودا تامەزرۆییەکی زۆر بۆ دایکە خوداوەندی پیرۆزی جاران و سروشت جێگای باسە. هەروەکو لە داستانەکەشدا دەبینرێت ژن بەدەست فێڵبازی، تەڵەکەبازی و ستەمکاری پیاوسالاری سیستەمی دەوڵەت و پلەداری باوکسالارییەوە دەناڵێنێت کە گیرۆدەی بووە. لەداستانی بابلدا ئەمجۆرە واقیع و ڕاستینەیە(پێکدادانەکانی نێوان نێرخوداوەندە بەهێزەکەی بابل ماردۆک و مێخوداوەند تیامات) زۆر ڕوون و بەکاریگەرترە. لەمیتۆلۆژیای سۆمەردا باس لەوە دەکرێت کە ژن لەپەراسووی پیاوەوە دروست کراوە. ئەمە گوزارشتێکی هێمایی و سیمبۆلییە. لەئایینە تاکخوداییەکاندا درێژە بەم هەڵوێستە دەدرێت. ئەو ژنەی وەک مێخوداوەند دەکەوێتە ناو زەقورەکانی سۆمەر وەک سۆزانی پەرستگا دەردەکەوێت. یەکەمین سۆزانیخانە لەشارەکانی سۆمەر دەکرێتەوە. لەسۆزانی پەرستگاوە پایەی ژن بۆ کەنیزەکی کۆشکەکان بەرز دەکرێتەوە. ئۆبژە(کۆیلە) دەست لێبەرنەدراوەکەی بازاڕەکانی بازرگانییە. لەشارستانی گریک - ڕۆمادا تەنیا کۆیلەی ئیش و کارەکانی ماڵە. لەسیاسەتدا جێگای نییە. لەشارستانی ئەوروپاشدا ئۆبژەیەکی زایەندییە کە لەمیانەی پەیمانێکەوە بەپیاو بەستراوەتەوە. لەشارستانی سەرمایەداریشدا سۆزانیەکی گشتی جیهانییە. لەرێگای بالادەستی پیاوەوە مێژوو بەتەواوی بونیاد و مانایەکی ڕەگەزپەرستی بەدەست هێناوە. چیتر مێژوو بە سیفەتی پیاو بەردەوام دەبێت.

بەژنێتیکردنی ئافرەت(بەواتای کۆیلایەتی ژن دێت) یەک بەدوای یەک ڕەنگدانەوەی خۆی لەسەر ئۆبژەکانی پیاویش دەبێت کە لەناو کۆمەڵگا دەچەوسێنرێنەوە؛ ئەوانیش دەخرێنە ژێر فشارەوەو سەرکوت دەکرێن.

لەکاتێکدا بەشی ڕاهیب، سەربازی و سیاسی چینی سەرووی کۆمەڵگا بەپێگەی ڕەگەزی باڵادەست دەگەیەنرێت، توێژە بەڕێوەبراوەکەی خوارەوەش چەندەی دەچێت دەکرێت بەژن. لەکۆمەڵگای گریک ـ ڕۆما مرۆڤی نێر هەر لەلاوێتیەوە لەمیانەی هەڵوێستێکی تۆخی ڕەگەزگەراییەوە پەروەردە دەکرێت. بەدرێژایی سەرجەم سەردەمەکانی شارستانی گومڕایی و لادانە زایەندییەکان وەک دەرەنجامێکی هەڵوێستی ڕەگەزگەرایی بەرامبەر بە ژن بەشێوەیەکی بەربلاو لەئارادا دەبێت. ئیتر بەو ڕادەیەی ژن کۆیلەیە، بەو ئەندازەیەش پیاوی کۆیلەش ئافرەتە یاخود کراوە بە ژن.

کاتێک ئەو کێشانەی سەرچاوەی خۆی لەئامێر و دەزگاکانی چەوسانەوە و سەرکوتکردنی سەرمایەدارییەوە دەگرێت لەسەر ئەم کێشە بنچینەییانەی خۆرهەلاتی ناوین زیاد بێت، لەڕاستیدا ژیانێکی مۆتەک و کارەساتاوی بۆ ژن دەست لێبەرنەدراو دەبێت. ژن ئەو مرۆڤەیە کە لەدژوارترین دۆخدا دەژیت، واتە بەژن بوون مانای بوونە بەو مرۆڤەی کە لەخراپترین و قورسترین ڕەوشدا دەژیت. ئەو چەوسانەوە و سەرکوتکردن و فشارە قەبەیەی لەسەر کۆمەڵگا بەڕێوە دەبرێت چەندین قاتی لەسەر جەستە و ڕەنجی ژن پەیڕەو دەکرێت. تازە بەتازە هەست بەمرۆڤبوونی ژن دەکرێت. ئیتر هەڵوێستی بێ شەرەفانەی ڕەگەزگەرایی ڕەها بەدۆخێک گەیشتووە جێگای خۆی بۆ ئەو لێگەڕینە بەجێ بهێڵێت کە وەک دۆست و هاوڕێیەک پێویستی بەهەبوونی ژن دەبینێت. بەلانی کەم گفتوگۆکردن لەم بارەیەوە جێگای باسە. تاوەکو لەناو کۆمەڵگا ژیانێکی ڕاست لەگەڵ ژن بەدینەیەت ئەوا ژیانێکی مانادار جێگای باس نابێت. لەمیانەی دەرککردن بەو ڕاستییەی کە ماناداترین و جوانترین ڕۆڵی ژیان لەگەڵ ئەو ژنە بەدیدێت کە بەتەواوی سەرفرازی و کەرامەتی خۆی بەدەست هێناوە پێویستە پەرە بە گوتە و کردوەکانمان بدەین.

## ٢. کێشەکانی قەبیلە، ئەتنیک و قەوم

کێشەکانی قەبیلە(خێڵ)، ئەتنیک و نەتەوە لەپێشینەی ئەو کێشانەوە دێن کە لەدێرزەمانەوە تا ڕۆژی ئەمڕۆمان بەشێوەیەکی چڕ و بەردەوام

لەکۆمەڵگای خۆرهەڵاتی ناوین لەئارادا بووە. چەندەی شارستانی دەوڵەتی پەرەیسەندووە ئەمجۆرە کێشانەش هەم بەربڵاو بوون هەم چڕبوونەتەوە. بەرلەوەی شارستانی سەرهەڵبدات و پەرەبسێنێت هەروەکو لەژندا جێگای باس بوو لەتیرەکانیشدا ژیانێکی ئازادی سروشتیانە لەئارادابوو. ئەخلاقی تیرە زۆر باڵا بوو. تاک لەپێناوی تیرە تیرەش لەپێناو تاکدا هەمەجۆرە فیداکاریەکی دەکرد. تاک و کۆمەڵگابوونێکی ڕاستەقینە جێگای باس بوو. بەڵام کاتێک بونیادەکانی شارستانی دەستیان خستە ناو تیرەکان و خوازیار بوون بیانکەن بە کۆیلە، درێژترین و دژوارترین قۆناخی بەرخودانیش دەستی پێکرد. ناکۆکی سەرەکی پەیوەندی تیرە ـ دەوڵەتە کە بەرامبەر بە کۆیلایەتی بەرخودان دەکات. شاخ و بیابانەکان ببوون بە مەیدانی بەرخودان. خۆپاراستن مەرجی دەست لیبەرنەدراوی بەخێوکردن و زۆربوونە. پێویستە باش بزانرێت کە دوای بە کۆیلەکردنی ژن دڕندانەترین ڕووخساری بینراوی مێژوو کۆکردنەوەی کۆیلە بووە لە تیرەکان. تیرەکان بوون بەخێڵ و لەمیانەی پەرەپێدانی زیاتری بەرخودانەکەیان خواستوویانە لەم کێشەیە ڕزگاریان بێت. بەڵام تەکنۆلۆژیای چەک و ڕێکخستنی هێزەکانی شارستانی لەزۆربەی حاڵەتەکاندا لەپێشتربوون.

لەچاخی ناوین لەئاستی میللەت ـ قەومدا ڕێکخستە بوونێک هاوشانی ئۆرگانیزاسیۆنەکانی تیرە و خێڵ جێگای باس دەبێت. واتە هەنگاوێکی دیکە بەرەو نەتەوەبوون هاوێشتراوە. ڕێکخستن و ئایدیۆلۆژیای قەوم لەسەر ڕێکخستن و ئایدیۆلۆژیای تیرە و خێڵ زیاد بووە. ئایینە تاکخوداییەکانی چین، هیندستان و خۆرهەڵاتی ناوین بەجۆرێک لەجۆرەکان مانای ئایینی قەومیان بەدەست دەهێنا. شەڕەکانی ئایین و قەوم لەناو یەکتردا بەڕێوە دەچوون. قەومەکانی گریک، ئەرمەنی، ئاشوری، عەرەب، فارس و کورد بەگوێرەی بەرژەوەندی قەومەکانیان ئایینی خۆیان هەڵبژارد. هەندێکیان بوون بەموسڵمان و هەندێکی تریش کریستیان. هەڵبەتە قەومی یەهوودی هەر لەسەرەتاوە وەک سەنتێزێکی قەوم و ئایین شێوەی گرتبوو. بەڵام نە ئایدیۆلۆژیای تیرە و خێڵ، نە

ئایینەکانی قەوم توانـاو بـەهرەی چارەسـەرکردنی کێشـەکانیان نـەبوو. یەهوودیەتیش هەر لەسەرەتاوە کێشەیەکی زیندوو بوو. گەلی ئاشووری، ئەرمەنی و هێلینی کـە یەکـەمین گـەل بـوون دەسـتبەرداری بتپەرسـتی بـن، تەواو نەیانتوانیوە ئـەو ئاشـتی، برایـەتی و یەکێتییـە فەراهـەم بکـەن کـە لـەئایینی کریسـتیانی بەدوایـدا دەگـەڕان. ئـەم دۆخـەش ڕێگـای لـەپێش بێبەختی و بوویەری کارەساتاوی کردەوە.

ئایینی ئیسلامیش کە لەسەر بنەمای دژایەتیکردنی بتپەرستی هەڵکشـا هەرچەنـدە ئاشـتی، یـەکێتیی و باڵادەسـتی بـۆ تیـرە و خێڵـە عەرەبـەکان بەدەست هێنا، بەڵام لەماوەیەکی کورتدا خۆی لەناو شەڕو پێکدادان لەگەڵ یەهوودی و کریستیانەکاندا دۆزیەوە. لەکاتێکدا ئاینی ئیسلام هەوڵیـدەدا ببێتە ڕێگەچارەی هەندێک کێشـە بـەڵام گلۆلەیـەکی گـەورەی کێشەکانیشـی لەگەڵ خۆیدا هێنا. بەتایبەتیش قەومەکانی ئەرمەنی، هێلینـی، ئاشـووری و یەهوودی کە لەئەنادۆڵ گیریـان خواردبـوو تاڕادەیـەکیش وەک قوربـانی پەرەسـەندنە پێشـوەختەکەیان بەرامبـەر بـە عـەرەب، تـورک، فـارس و کوردەکان (کە ئاشـنای موسـڵمانێتی بـوون) دەکەوتنـە نـاو قۆنـاخێکی زۆر دژوارەوە. کاتێک شەڕە مەزهەبیە بەردەوام و نەپساوەکانی نێوانیان هاتـە سەر ئەو کێشانەی تێیدا دەژیـان، ئیتـر کێشـەکان ڕێگـای لـەناوچوونیانی ئـاوالا دەکـرد. هاوشـێوەی ئـەو قڕکـردن و لەناوبردنـەی موسـڵمانەکان لەنیمچـە دوورگـەی ئیسـپانیا دووچـاری هـاتن لەهـەمان قۆنـاخـدا کریستیانەکانیش لەئەنادۆڵ تووشی بوون.

### ٣. کێشەکانی ئایین و مەزهەب

کێشە مەزهەبیـە ناوخۆییـەکانیش هاتـە سـەر ئـەو کێشـە ئایینیانـەی قەومـەکان تێیـدا دەژیـان. بەرامبـەر بەبەرژەوەندییـە ماددیـەکان بـەڵێنی ئایینەکان لەبارەی برایەتی، یـەکێتی و ئاشـتی کاریگەریـەکی سنووورداری هـەبوو. ئـەو جیاوازییـە جینایەتیـەی لـەناو کۆمـەڵگادا سـەریهەڵداو پەرەیسەند لەمێژبوو هەمان قـەومی کردبـوو بەگلۆڵـەی کێشـە و پێکـدادان. تەنانـەت لـەناو تیرەیـەکی بچـووک و بەیەکـەوە گرێـدراوی وەک

یەهوودیەکانیش، هێشتا هەر لەسەردەمی حەزرەتی موسا ململانێی دژوار لەنێوان هەوالان و خزمانیدا روویداوە. ململانێ و بێنە و بەردەی موسا لەگەڵ هارون و مەریەمی خوشکو برای سەیر و سەرنج ڕاکێشە. بەتایبەتیش ئەو ئەنجامەی لەئاکامی ململانێی لەگەڵ مەریەمی خوشکی هاتۆتە ئاراوە پیشانیدەدات کە شکاندنەوەیەکی دژی ژن جێگای باسە. حەزرەتی عیساش لەسەرووی هەمووانەوە بانگەوازی بۆ موسەویە هەژارەکان دەکرد. هێشتا حەزرەتی محەمەد کۆچی دوایی نەکردبوو کە مەعاویە بەرامبەر بەئەهلی بەیت دەستی کرد بەشەڕی بنەماڵەگەریێتی و بەدەست هێنانی بالادەستی. لەئیسلامدا لەپێناو ڕزگارکردنی خەلافەتی دووسەرە تەنانەت سێ سەرە ـ ئیمام عەلی، مەعاویە و عەمری کوڕی عاس ـ خەواریجەکان بڕیاری مردن(کوشتن)یان وەرگرت. یەزیدی کوڕی مەعاویەش هەروەکو چۆن بەرخ سەردەبڕێ لەبیابانی کەربەلا ڕۆڵە هەڵبژاردەکانی ئەهلی بەیتی سەربڕی. هەرگەلێکی دەبوو بەموسڵمان هەم لەناوەخۆیدا هەم لەگەڵ گەلانی دیکە کێشەی نوێی ئەوتۆی لەگەڵ خۆیدا دەهێنا کە هەرەس ئاسا گەورە دەبوون. شارستانییە ڕیشەدارەکەی ئێران لەمیانەی دامەزراندنی مەزهەبی شیعەوە هەوڵی دەدا وەلامی ئەو شکستە بداتەوە کە بەرامبەر عەرەبە موسڵمانەکان دووچاری هاتبوو. بەگەکانی تیرەی سەلجوقی و عوسمانی تورک نەژادیش بەرژەوەندی خۆیان لەنەریتی سونیگەرایی بالادەستی ئیسلامدا دەبینیەوە. هەرچی تورکمانەکانن کە زیاتر توێژە هەژارەکانیان پێک دەهێنا شیعە گەریێتی و عەلەوی بوونیان هەڵبژارد، کوردەکانیش دابەش بوونێکی هاوشێوەیان بەخۆیانەوە بینی. لەکاتێکدا بەگە دەسەلاتدارەکان بوون بەسوننی و هاوکاری کردنی سوڵتانە عەرەب و تورکەکانیان بۆ خۆیان هەڵبژارد، توێژە هەژار و سەرفرازەکانیش بەردەوامییان بەئایینی عەلەوی و زەردەشتی دەدا.

یەکەمین سێ سەدەی تەمەنی ئایینی کریستیانی پڕ لەدابەش بوون و پارچەبوونی مەزهەبی گوزەری کرد. چین و قەومەکان ناچار بوون لەژێر دەمامکی مەزهەب درێژە بەبەرژەوەندیەکانی خۆیان بدەن. هەرقەومێک

ببوو بە خاوەن مەزهەبێک. لەمیانەی مەزهەبە بەشکراوەکانەوە بەدوای ڕزگاریدا دەگەڕان؛ لاتینەکان لەڕێگەی مەزهەبی کاسۆلیکی، گریک و سلاڤەکانیش ئۆرتۆدۆکسی، ئەرمەنیەکان گریگۆریان و ئاشوریەکانیش لەڕێگەی مەزهەبی نەستووریەوە. هەروەها پارچەبوون و دابەش بوونێکی جدی ئەو قەومانەش سەبارەت بەبژاری بوون یان نەبوونی ئایینەکەیان بەئایینی ئیمپراتۆریەت هاتە ئاراوە. یەهوودیەت تەنیا بەدەرهاوێشتەکردنی ئایینی کریستیانی و ئیسلامی لەناوخۆیدا نەوەستا، تەنانەت لەناوەخۆشیدا بۆ تیرەی جیاواز دابەش بوو. هەر وەک بڵێی دابەش بوونیان بۆ یەهوودی و ئیسرائیلی بەس نەبێت، ئەمجارە وەک لایەنگرانی فارس و گریکەکان پارچەبوون. هەروەها دواتر بەسیفەتی یەهوودیەکانی ڕۆژهەلات و ڕۆژئاوا(ئەشکەناز و سفارت) دووچاری دابەشبوونێکی دیکە هاتن. لەسەردەمی شارستانی سەرمایەداریشدا شان بەشانی عەلمانیەکان ڕۆشنبیرە سیکۆلارەکانیشی لەناواخنی خۆیەوە دەرخست.

لەو قۆناخەدا ئایینی کریستیانی بەڕیفۆرمێکی گرنگ و بەرفراواندا تێپەڕی. مەزهەبی پرۆتستانی لەدایک بوو، کڵیسا نەتەوەییەکان دامەزرێنران. لەشارستانیەکانی ڕۆژهەلاتی دوور، لەسەرووی هەمووشیانەوە چین و هیندستان دابەش بوونی ئایینی و مەزهەبی هاوشێوە ڕوویدا و ئەمەش کێشەی نوێی لەگەڵ خۆیدا هێنا. کاتێک لێکۆڵینەوە سەبارەت بەبنەمای ماددی تەواوی ئەو کێشە ئایینی و مەزهەبیانە بکرێت، ئەوا هیچ زەحمەتیەک لە بینینی ئەو ڕاستیەدا نابینین کە ئامێر و دەزگا بەربڵاو و قاڵبۆوەکانی فشار و چەوساندنەوە ڕۆڵی سەرەکی تێدا دەبینرێت. شەڕەکانی چەوسانەوە و سەرکوتکردنی جێگای باسە کە پاوانە ماددی و ئایدۆلۆژییە بەناویەکداچووەکان بەرامبەر کۆمەڵگا بەڕێوەیان بردووە. لە بنەڕەتدا هەر لەسەردەمی دەوڵەتی ڕاهیبەکانی سۆمەر و میسر ئەم کێشانە ئافرێنراون و لەمیانەی شەڕەکانیشەوە گەورەتر کراون. کاتێک دوای ئەزموونە گەورە و بایەخدارەکەی بوودا دەیگووت "ناتوانن ئاگر بە ئاگر بکوژێننەوە"

ڕاستیەکی مەزنی دەدرکاند. چونکە دەسەڵات بە مانای شەڕ دەهات. هەرچی شەڕیشە بریتی بوو لەچەوساندنەوە. لەم ڕووەوە دەسـەڵات تـەنیا لـەگـەڵ دەسەڵاتدا دەکەوتە شەڕەوە. چونکە ڕێگایەکی دیکەی گەیشتن بـە قـازانجی شیرین جێگای باس نەبوو.

لـەم چوارچێوەیـەدا ئەگـەر مێژووی زیـاتر لـە پێنج هـەزار سـاڵەی شارسـتانی دیرۆکـی ئافرانـدنی کێشـەی ڕۆژانەیـە، ئـەوا ئـەو ڕێگـەچارە خەیاڵیانەی لەژێر ناوی ئامرازەکانی چارەسەرکردن خراونەتـە ڕوو تـەنیا کێشـەکانیان بـەربلاوو چڕترکردۆتـەوە. نـە میتۆلۆژیـای خوداوەنـدە شـکۆدارەکانی سـۆمەر، نـە پێغەمبـەرو خوداوەنـدەکانی ئایینـە تاکخوداییەکانی لەهەمان سەرچاوەوە هاتوون، هـەروەها نـە دابەشبوونە فرە سەریەکانی مەزهەب هیچ یـەکێکیان نەیانـدەتوانی ببنـە ڕێگـە چـارەی ئەو کۆیلایەتیەی لەقوڵبوونەوەدا بوو. ڕێگـە چـارە خەیاڵیـەکان بـۆ ڕێگـە چـارەی مـاددی و کـۆنکرێتی وەرنەدەچـەرخا. پاوانـەکانی دەسـەڵات و چەوسانەوە تەنیا بەتەشەنە کردن بۆ ناو سەرجەم قەومـەکان نەوەسـتان، بەڵکو ئەو تابلۆیەی لەکاتی دزەکردنیـان بـۆ نـاو سـەرەکیترین خانـەکانی کۆمـەڵگا لەسـەر بنـەمای دەوڵـەت ـ نەتـەوە پێـک هـات، بڵاوبوونـەوەی کێشەکان بوو لەناو تەواوی کۆمەڵگا. بـەگوێرەی ئـەوەی هـیچ شـانەیەکی کۆمـەڵگا نـەماوە کـە پاوانـەکانی چەوسـاندنەوە و زۆرداری دزەی بکەنـە ناوی، بەمانایەکی دیکە خانەیەکی دیکەی کۆمـەڵگا نـەماوە قازانجەکـەیان زیاد بکات، ئیتر لەڕاستیدا کۆتاییان هاتووە یاخود کۆتاییەکەیان بـەدیار کەوتووە، لەم مانایەدا کاتێک دەگووترێت ئیتر کۆتایی مێژووە، لەوانەیە لەهەموو کاتێک زیاتر نزیکی ڕاستین.

## ٤. کێشەی شارو ژینگە

هەر لەسەرەتای شارستانیەوە کێشـەکانی شـار و ژینگـە لەکۆمـەڵگای خۆرهـەڵاتی نـاوین لـەئارادا بـووە. کاتێـک تەماشـای یەکـەمین سەرگوزەشـتەکانی ئـاواکردنی شـارەکانی سـۆمەر بکرێـت، ئـەوا دەرکـی پێدەکرێت کە لەناو خودی شـار و نێوان شـارەکاندا لـەچۆن زەمینـەیەکدا

پەرەیان سەندووە؛ بێگومان هەلومەرج و زەمینەیەکی پڕ لەکێشە. ئەمانە کێشەیەکن سەرچاوەی خۆیان لەکۆیلایەتیەوە وەردەگرن. شارگەرایی بەکۆیلە بوون لەناواخنی خۆیدا هەڵدەگرێت، لەم سۆنگەیەوە بەدەوڵەتبوونیش لەخۆدەگرێت. هەروەها ئاواکردنی بازاڕیش کێشەی ئابووری لەگەڵ خۆیدا دێنێت. کێ بڕیار سەبارەت بەرێژەکانی گۆڕان دەدات، واتە کێ بڕیار سەبارەت بە نرخ دەدات؟ لەم لایەنەوە ڕێکەوتنەکان بە ئاسانی بەدی نەدەهاتن. خۆراکپێدان و بەرگریکردن لەشار خۆی لەخۆیدا کێشە بوو. بەردەوام بەشە پێکهاتووەکانی دەسەڵات(ڕاهیب، بەڕێوەبەر و فەرماندە) لەناو ململانێدا بوون، ئەمەش ڕێگای لەبەردەم شۆڕش و دژە شۆڕشیش دەکردەوە. هەروەها کێشەی گەورەبوونی شارەکانیش لە ئارادا بوو.

دەوڵەت و بەڕێوەبەرایەتی شار کە لەگەڵ ئاواکردنی شار دەرکەوتن و پەرەیان سەند بوون بە دیاردەیەکی دەست لێبەرنەدراوی تەواوی سەردەمەکانی شارستانیەت. دەوڵەتشار کۆنترین و بەربلاوترین شێوەی دەسەڵاتە. ئیمپراتۆریەت و دەوڵەت ـ نەتەوەکان دواتر سەریانهەڵداوە. شێوەی سەرەکیەکەی لەمێژوودا قورسایی هەرە زۆری هەبووە شار یاخود دەوڵەتو بەڕێوەبەرایەتییە سنووردارەکەی دەوروبەری بووە. کێبڕکێی بەردەوامی نێوان شارەکان بەردەوام ڕێگای لەپێش شەڕ و پێکدادان کردۆتەوە. ئەو پێکدادانەش توانای شاری لەناو دەبرد. ڕێگە چارەی دۆزراوەش دەستەواژەی شاری مەترۆپۆڵ و هەژموون بوو. ئوروک، ئور، بابل، ئاشوور، پەرسەپۆلیس، ئەسیناو ڕۆما ئەم جۆرە شارانەی هەژموون بوون. دواتر وەک ناوەندەکانی ئیمپراتۆریەت ڕۆڵیان بینیوە.

سەرجۆنی دامەزرێنەری خانەوادەی ئەکەدی بە سیفەتی یەکەمین ئیمپراتۆری مێژوو دەکەوێتە بەرچاو. سەرجۆنی ئەکەدی تەنیا بە ڕاکێشانی شارەکانی سۆمەر بۆ ژێر هەژموونگەرایی خۆی و لەگادا ناوەستێت، بەڵکو بەگوێرەی سەردەمی خۆی ئەو هەژموونگەراییەی بۆ تەواوی ناوچەکانی شارستانی گواستۆتەوە. لەدۆخێکی بەم جۆرەدا ئیمپراتۆریەت بەو مانایە دێت کە شاری هەژموونگەرا (مەترەپۆڵ)

کۆنترۆلی خۆی لەسەر شارەکانی دیکە و دەوروبەری فەراهەم دەکات و پشکی خۆی لەزێدە (بەها، بەرهەم) کۆمەلایەتیەکان وەردەگرێت. لەبەر ئەوەی بازرگانی، کشتوکاڵ و پیشەسازی لەمیانەی توانایەکی مادديو بازاڕێکی بەرفراوانتر بەڕێوە دەچوو قازانجێکی زۆری لێدەکەوتەوە. لەم سۆنگەیەوە ڕێکخستەبوونی دەسەلات لەشێوەی ئیمپراتۆریەتی بەرفراوان تا بڵێی سوودمەند دەبینن. زۆر بەئاسانی ئەو مەیلە لەئیمپراتۆریەتەکانی سەرجۆن، بابلو ئاشووردا دەبینرێت. بەتایبەتیش ئیمپراتۆریەتی ئاشووری لەبازرگانیکردن بەکەرەستەی خاو و مادده هەلگیراوەکان ببوو بەپسپۆڕ. داخوازیەکانی بەدەستەوەگرتن و پاراستنی سەرچاوەکانی قازانج، ڕێگای لەپێش ئەوە کردەوە لەپێناو دەسەلاتدا دوودڵی لەپیشاندانی دڕندانەترین دیمەن نەکەن. ئاشووریەکان بەسەرفرازیەوە دەیانگێڕایەوە کە چۆن قەلا و شورایان بەکەللە سەری مرۆڤ دروست کردووە.

پارسەکانیش بەهەمان ئاراستە بەلام لەمیانەی پەیرەوەی نەرمو ئەخلاقی تر خوازیاری بەدەست هێنانی ئەنجام بوون. لەو کارەیاندا سەرکەوتووش بوون. بابل شارە سوپەرەکەی ئەو قۆناخە بوو. شارێکی بەکێشە و بەرپرسیار بوو کە حەفتاو دوو میللەت تێیدا دەژیان. شارەکانی پارس بابلیان بۆ خۆیان کردبوو بە نموونە. لەگەڵ ئەوەی هەلمەتی گریک - ڕۆما لەبواری شارگەراییدا ڕێگا چارەیەکی پێشکەوتووتر بوو بەلام ئەو شارانەش خاوەن هەمان کێشە بوون، لەسەرووی هەمووشیانەوە کێشەکانی بەڕێوبەرایەتی، گوزەران و بەرگری(پاراستن) جێگای باسبوو. لەبواری بیناسازیدا سەنتێزی هێلینی قۆناخێکی پێشکەوتووی بواری بیناسازی لەخۆرهەلاتی ناویندا هێنایە ئاراوە. لەم بارەیەوە ئاشنای بیناسازی شکۆدار دەبین. بەلام دەستنیشان کردنی ئەو خالە هێندە قورس نییە کە بەتەنیا شارێک یاخود پەرستگایەک ڕێگای لەپێش کێشەگەلێکی فرەڕەهەندی سەر کۆمەلگا کردۆتەوە. بۆ نموونە لەم بارەیەوە تاوتوێ کردن و هەلسەنگاندنی هەرەمەکانی فیرعەونی میسر بەکاریگەرە کە چۆن

کۆمەڵگای لەناو بردووە. ئەسیناو ڕۆماش بەو سیفەتەی مەترەپۆلـە شـار بوون تا بینەقاقایان لە ناو کێشەدا ژیابوون.

هەرچەندە لەسەردەمی ئیسلامدا شارەکانی خۆرهـەڵاتی نـاوین گـەورە ببـوون ، بـەڵام لـەبواری بیناسـازیدا زۆر لـەدواوەی شـارەکانی سـەردەمی هێلینیدا بوون. چەندەی دەهات کەسایەتی خۆیان لەدەست دەداو بـەمجۆرە بـۆ خۆیـانو دەوروبـەریش دەبـوون بەسـەرچاوەی کێشـەکان. هـەروەها گوزەرنەکردنیان بۆ شۆڕشی پیشەسازی کێشەکانیانی قورستر کردووە.

هەڵمـەتی شارسـتانی ڕۆژئـاوای ئـەوروپا لـەبواری شـاردا بـەرەو ئـەو شارە ئابووریانەی برد کە لەسەر بنەمای بازرگانی و بازاڕ گەشەیان کرد. ئـەو هەڵمەتـە هـەر لەسـەرەتاوە مۆرکی سـەرمایەی پێـوە بـوو. لەناوچـە لادێییەکان و ناوەوەی شار بەردەوام لەهەوڵی هەژموونگەرایی سـەرتوێژی پیشەکاراندا بووە. ئەم دۆخەش تێکۆشانە سەخت و دژوارەکانی چینایـەتی لەگـەڵ خۆیـدا هێنـاوە. لەکاتێکـدا کێبڕکێـی نـاو خـودی شـارێک و نێـوان شارەکان سەرەتا مەیلی ئیمپراتۆریەت و پاشایەتی دنەدەدا، بـەڵام لەگـەڵ بەرپابوونی شۆڕشی پیشەسازی ناچار بـوون رادەسـتی دەوڵـەت ـ نەتـەوە بن. شارەکانی ئەڵمانیا و ئیتاڵیا ئەو توانایەیان نیشانداوە کە لەمێژوودا درەنـگ وەخـت دەسـتبەرداری دۆخـی ئۆتۆنـۆمی بـن و رادەسـتی دەوڵـەت ـ نەتەوە بوون (تا سەدەی نۆزدەهـەم). بـە بـڕوای مـن شۆڕشـی پیشەسـازی چارەسەری نییە، بەڵکو بووە بە کۆتایی شـارو سـەرەتای مردنـی. لەگـەڵ گەیشتن بە سەدەی نۆزدەهـەم پیشەسـازیگەرایی و بیروکراسـی شـارەکانی هـەرەس ئاسـا گـەورە کـرد، ئـەو گەورەبوونـە بێمانایـەی لـە شـێوەی شێرپەنجە بەردەوام بوو تەواو بەکارەساتێک بۆ ژینگە ئـەنجامگیر بـوو. بەمجۆرە شـار تـەنیا خـۆی ناکوژێـت، بـەڵکو دەوروبـەرو کۆمـەڵگای لادێ (واقیعی پانزدە هەزار ساڵەی مێـژوو، هێـزی بەرهـەم هێنـەر، سـەرچاوەی کلتـووری مـاددی و مەعنـەوی)ش لـەناو دەبـات و دەیکوژێـت. ئـەنجامیش پەلـەقاژە و بێزاربـوونی کۆمەڵگایـە لـەناو کێشـەکاندا؛ دەبێتـە ناوەنـدی بەرهـەم هێنـانی هـەژاری و بێکـاری گشـتی. خۆرهـەڵاتی نـاوین یـش کـە هەژموونی خۆی لەدەست داوە شارەکانی بووە بە ناوەندی ناشار؛ بووە بە

ناوەنـدی مردنـی شـار، لـەم سـۆنگەیەوە بـووە بـە ناوەنـدی مردنـی سەرەکیترین ئامرازەکانی کۆمەڵایەتیبوون کە کۆمەڵگایە.

مێژووی شارستانی خۆرهـەڵاتی نـاوین دیرۆکـی وێرانکردنـی ژینگـە و نکولی لیکردنێتی. لەبەر ئەوەی کلتووری ماددی و مەعنەوی واتە بەهاکانی شارستانی لەسەر بنەمای نکوڵیکردن(بە مانا دیالیکتیکیەکەی بە خراپ لـە قەڵەمدانی) لە بەهاکانی کۆمەڵگای نیولیتیک پێکهاتوون مێژوو ئاراستە و تەوژمێکی بەمجۆرە بەدەست دێنێت. کەچی لەراستیدا کۆمەڵگای نیولیتیک سەبارەت بەبەهای هەردوو کلتوریش ئیکۆلۆژیکە. لـەجیهانی مەعنەویـدا، لەئایینەکەیدا ژینگـە زینـدووە و وەک شکۆدارترین بـەها پیـرۆز دەکرێت. تواناکانی خۆراک کە لەدەوروبەری ژندا پێکهاتوون سـەرەتای ئابوورییـە. سروشت و ژن لەناو یەکێتیەکی تەبادان. دایکە خوداوەنـد دەکرێتـە هێمـای چەمکی ئایینی سروشتی و زیندوو. بەشی زۆری ئامرازەکانی بەرهەمهێنانی ماددی داهێنانی ژنە. کلتووری خـۆراک و پۆشـاکیش مـۆرکی ژنـی پێوەیـە. لەگەڵ سەرهەڵدانی شارستانیش تەواوی ئەم بەهایانە نکوڵییان لێدەکرێت و لە ژێر هەژموونگەرایی پیاودا بۆ ئامرازەکانی بەدەست هێنانی قـازانج و سەرکوتکردن دەگۆڕێت. خاکی دایک بێ بایەخ و کەم دەبینرێت. پەرتووکـە پیرۆزەکان بەپیاوان دەڵێن"ژنـان کێڵگەتـانن، چۆن خوازیارن وەها بیکێڵن". لەمەش مەترسیدار تر ئەوەیە، چونکە شارەکانی سۆمەر بەردەوام خاک بە ئامانجی بەدەست هێنانی قازانج بەکار دێنن ڕێگا لەپێش درزبـوونی خـاک دەکەنـەوە، بـەمجۆرەش لەمیانـەی بیابـانبوونی دروسـتکراوەوە مەترسـی بیابـانیبوونی سروشـتی ئامـادە و گـەورە دەکـەن. ڕۆڵـی شارسـتانی لەبیابانیبوونی میزۆبۆتامیادا زۆر بەکاریگەرە.

لەروانگەی دونیابینی شارستانیشدا سروشت، ژینگە و خاک بـەردەوام بێ بایەخ دەبینرێت. لەبنەڕەتدا ئەو هەڵوێستە ئایدیۆلۆژییە. بـەئامانجی بەکەم زانین و بچووککردنەوەی کۆمـەڵگای گونـد ـ کشـتوکاڵ و بـەئاسـانی بەڕێوەبردنێتی کە خۆی لەدژی ئەو سەریهەڵداوە. لەبواری ئایدیۆلۆژیەوە شارسـتانی وێنـەی دونیایـەکی وەهـای نەخشـاندووە وەک بڵێـی دوژمنـی مرۆڤایەتییە و تـەنیا بۆ حیسـاب دانـە. دیسـان پەرتووکـە پیرۆزەکـانیش

دەڵێن"ئەوێ تەنیا شوێنی تاقیکردنەوەتانە". لەبەرامبەر ئەوەش لەکاتێکدا خاوەن دەوڵەتەکان(دەوڵەتگەراکان) لەم دونیایەدا بەهەشتی خۆیان دەئافرێنن، هەرگیز باوەڕیان بەو ئایینانە نەکردووە کە خۆیان دایانهێناون. چونکە باش دەزانن ئایینەکان دەستکردی خۆیانن. لەلایەکی دیکەشەوە چەندە مێژووی شارستانی بەرەو پێشەوە بچێت (لەڕاستیدا پێویستە چەندە بەرەو دواوە چووبێت) گەشەکردنی کۆمەڵایەتی کە بەشێوەیەکی تێکەڵ زەمینەی جیۆبایۆلۆژیک پێکدێت، لەبواری ئایدیۆلۆژییەوە ناچاری نکوڵیکردن لەم ناوەڕۆکەی دەکرێت و لەمیانەی هێما خەیاڵی و دەرهەستەکانی دونیای دیکە بۆ دژی خۆی دەگۆڕێت.

ناوەڕۆک و خودی کێشەی ئیکۆلۆژی لەو واقیعەدا شاراوەیە. لەم سۆنگەوە بە هەموو سامناکیەکەیەوە دەرکی پێدەکەین کە تەواو کێشەیەکی کۆمەڵایەتییە. کۆمەڵگایەک کە بەمجۆرە ناچاری نکوڵیکردن لەناوەڕۆک و خودی خۆی کراوە ناشێت بۆ ماوەیەکی درێژ بەردەوامی بەژیان بدات. لۆژیکی قازانجخوازی پاوانەکانی دەسەڵات و چەوسانەوە، هەروەها ئەو شەڕە سەربازی و ئایدیۆلۆژیانەی لەم پێناوەدا بەرپایان کردووە ئانتی - ئیکۆلۆژی، ئانتی - بایۆلۆژیک و ئانتی - کۆمەڵاتین. ئەو تەنگەژەی لەسەردەمی فینانسی هەژموونگەرایی ڕۆژگاری ئەمڕۆمان لەئارادایە وەک بڵێی تەواوی ئەو واقیعەی لەدیدگاو زهنی تەواوی مرۆڤایەتیدا نەخشاندووە، پیشانی هەموو کەسێک دەدات کە ئەو دونیا ساختە و دروستکراوەی هەژموونگەرایی خولقاندوویەتی بە دۆخێک گەیشتووە کە تەنیا بریتییە لەتۆمارەکانی کاغەز. لەهیچ قۆناخێکی مێژووی خۆیدا مرۆڤایەتی تا ئەم ڕادەیە لەسروشت، ژیان و کۆمەڵگا نامۆ نەبووە. بەهۆی ژیانی درێژخایەنی بێت لەگەڵ بارە تاڵانکار و بە پەژارەکەی شارستانی ناوەندی یان لەبەر ئەوەی بە هۆکارە ساختە و سروشتیەکانەوە لەسەرووی ئەو ناوچانەوە دێت کە نزیک بە بیابانبوونە کۆمەڵگای خۆرهەڵاتی ناوین تەنیا بەدەست کێشەکانەوە ناناڵێنێت؛ بەڵکو تا ڕادەیەک دەستبەرداری ژیان دەبێت کە چارەسەری لەخۆکوژیدا ببینێت. ڕاستتر بڵێین ناچاری دەست لێبەردانی ژیان دەکرێت.

## ٥. کێشەی چین، پلەداری، خێزان، دەسەلآت و دەولەت

لەمێژووی جیهاندا کۆمەلگای خۆرهەلاتی ناوین بەر لەسەرجەم کۆمەلگاکانی دیکە ئاشنای کێشەکانی چین، پلەداری و دەسەلآت بووە. وەک دەزانرێت یەکەمین سیستەمی پلەداری بەر لەدەسەلآت لەسەر لاوان و ژنان ئاواکراوە. ڕێککەوتنی نێوان پیاوی زۆردار و فێلباز + شامان یان ڕاهیب + پیاوە بەساڵاچووە ئەزموونبدارەکان شێوەی بەرایی سەرجەم پلەدارییەکان، دەسەلآت و دەولەتەکانە کە دواتر سەرهەلدەدەن. ئەو ڕێککەوتنە منداڵدانی تەواوی کێشە کۆمەلآیەتیەکانە. بەر لەدەستپێکردنی هەژموونگەرایی شاری ئوروک لەمیزۆبۆتامیای خواروو ئاشنای قۆناخی پلەداری ئەلعوبێد دەبین(٥٠٠٠ـ٣٥٠٠ پ.ز) پلەدارییەک جێگای باسە کە لەتەواوی میزۆپۆتامیادا بلاوبۆتەوە. سیستەمێکە لەدەوروبەری ماڵو خێزانی گەورەدا هۆنراوەتەوە. سەرەتای دەستپێکردنی سیستەمی خانەدانێتی یە. لەدەرەوەی ژنان، لاوان و چینی پلەداری سەروو ئەوانی دیکە خراونەتە ژێر پەیرەوی کۆیلایەتیەکی سیستەماتیک، لەم سۆنگەیەوە خەیاڵ و پراکتیکی دونیایەک فەراهەم دەبێت کە بۆ یەکەمەین جار بناخەی کێشەی کۆمەلآیەتی تێدا دادەنرێت. هەروەها میزۆبۆتامیا خاوەن واقیع و پێگەی ڕێبەرایەتی جیهانگیری ئەو سیستەمەیە. بنچینەی ئایدیۆلۆژیای خانەدانو بنەماڵەگەرێتیشە. بەهێزبوونی هەردوو دامەزراوەش تا ڕۆژگاری ئەمرۆمان لەنزیکەوە گرێدراوی ئەم هۆکارە مێژووییە یە، ئەم دامەزراوە هەرە کۆنانەی کۆمەلگا کە پیاو پێشەنگایەتی دەکات بەدرێژایی مێژوو پەرەیان سەندووە. لەکاتێکدا خانەدانێتی دەکرێتە کۆلەکەی سەرەکی دەسەلآتو شێوەی دەولەت، بنەماڵەگەرێتی(خێزانگەرێتی) یش بە تەواوی دەکرێتە خانەی سەرەکی فەرمی کۆمەلگاکان. ئەو شەڕانەی دەسەلآت لەژمار نایەن کە بەدرێژایی مێژوو لەپێناو دامەزراندن و ڕووخاندنی بنەماڵە و خانەدانەکان بەڕێوە براون. لەمیانەی ئەم شەڕانەوە

کۆمەڵگاکان تەنیا نەکراون بەسەرچاوەی کێشە، بەڵکو لەناوەوە لەناو دەبرێت.

پێویستە سیستەمی خانەدانێتی وەک پێکهاتەیەکی یەکپارچە دەرکی پێبکرێت کە بونیاد و ئایدیۆلۆژی تێدا تێکەڵ بەیەکتری بوون. لەگەڵ ئەوەی خانەدانێتی لەناو خودی سیستەمی تیرە دەرکەوتووە بەڵام مانای نکوڵیکردنە لەتیرە و بەسیفەتی دەستەبژێری بنەماڵەی چینی سەروو خۆی بونیاد دەنێت. خاوەن پلەدارییەکی زۆر وشکە. چینی باڵادەستی بەرابیە. شێوەی بەرایی دەسەڵات و دەوڵەتە. پشت بەبنەمای پیاو و منداڵی نێر دەبەستێت. بوون بەخاوەن ژمارەیەکی زۆری کوڕ بۆ دەسەڵاتەکەی گرنگ و بایەخدارە. ئەم ئارەزووەش ڕێگای لەپێش سیستەمی فرەژنی، ژیانی حەرەمسەرا و کەنیزەکی کردۆتەوە. ئەگەر هەندێک لەپیاوان خاوەن دەیان ژن و سەدان منداڵن ئەوە گرێدراوی ئایدیۆلۆژیای خانەدانێتی یە. دەسەڵات و دەوڵەت سەرەتا لەناو خانەدان دەئافرێنرێت. گرنگرینیشیان خانەدان ئەو دەزگایەیە سەرەتا تیرە و خێڵی خۆی و سیستەمی تیرەکانی دیکەی هۆگری یەکەمین جیابوونەوەی چینایەتی و کۆیلایەتی کرد. لەشارستانی خۆرهەلاتی ناویندا بینینی دەسەڵات و دەوڵەتێکی بێ خانەدان وەک بلێی مەحاڵە. بەهۆی ڕیشەداربوونی واقیعی خانەدان و بوونی بە پێگەی قوتابخانەی ئامادەکاری دەسەڵات ـ دەوڵەت دۆخەکە بەمجۆرەیە.

لەگەڵ گۆڕانی خانەدانێتی بۆ ئایدیۆلۆژیای فەرمی مۆرکی خۆی لەبونیاد و پێکهاتەی خێزانیش داوە، بەشێوەی "بنەماڵەگەرێتی" ڕێگای لەپێش ئایدیۆلۆژیایەکی خوارووتر کردۆتەوە. جیاوازی لەنێوان خێزان و خێزانێکی دیکەوە جێگای باسە. بەدرێژایی مێژوو و بەر لەمێژووش شێوە زۆر جیاوازەکانی بەیەکەوە بوونی ژن و پیاو لەئارادا بووە. بەتایبەتیش شێوەی خێزانی کلان(تیرەی بەرایی) زۆر بەربلاو بووە کە قورسایی ژنی پێوە دیاربووە. لەم چەشنەی خێزاندا پیاو ـ مێرد هێندە ناناسرێت. خاڵان و منداڵەکان زۆر گرنگترن. جۆرێکی دیکەش ئەوەیانە کە پیاو- ژن تێیدا وەکو یەکن. بەپێچەوانەوەی مەزەندەکان ئەمجۆرەش بەشێوەیەکی بەربلاو لەمێژوودا جێگای باس بووە. سیستەمی خێزانی پیاوسالاری زۆر دواتر و

بە شێوەی سێبەری سێیانەی خانەدانێتی ـ دەسەڵات ـ دەوڵەت پەرەی پێدراوە. ئامانجی سەرەکیشی پێگەیاندنی ژنان و منداڵەکانێتی بەگوێرەی بەرژەوەندیەکانی خانەدان، دەسەڵات و دەوڵەتی چینەکانی سەروو و ئافراندنی کەسایەتیەکی ئاراستەکراو. بەرژەوەندی ئەم دەسەڵات و دەوڵەتە بناخەی خێزانی فرە ژنو فرە منداڵ پێکدێنێت کە پێویست نییەو ڕێگا لەپێش کێشەی کۆمەڵایەتی زۆر قورس دەکاتەوە. هاوشێوەی خانەدان هەر سەرۆک خێزانێک بوون بە خاوەن ژمارەیەکی زۆری ژن و منداڵ وەک هێزێک و گەرەنتی ژیان دەبینێت. زهنیەتی زاڵ بەسەر کۆمەڵگا بەردەوام ئەم لایەنە هاندەدات. لەڕاستیدا لەچارەسەرکردن زیاتر لەم ڕێگایەوە دەرگا لەبەردەم سەرجەم کێشە کۆمەڵایەتیەکانیدا ئاواڵا دەکات. پەیبردن بەو ڕاستیەی کە ئەم دۆخە پێویستی ئایدیۆلۆژیای فەرمییەو لەلایەن ئایینەوە پشتیوانی لێدەکرێت و خوازیاری تۆکمەکردنین، سەبارەت بەدەرککردن بەکێشە کۆمەڵایەتیەکان گرنگ و بایەخداره. کلتووری خانەدانێتی و بنەماڵەگەریتی کە تا ئێستا لەکۆمەڵگای خۆرهەڵاتی ناویندا بەهێزە. بەهۆی داخوازی بەدەستهێنانی پشک لەدەسەڵات و دەوڵەت، ئەو ژمارە زۆرەی دانیشتوان کە ڕێگای لەپێش کردۆتەوە یەکێک لەسەرچاوە سەرەکیەکانی کێشەکانە. بەکەمزانینی ژنان، نەبوونی یەکسانی، بێ پەروەردەیی منداڵان، شەڕەکانی ناو خێزان و کێشەی ناموس هەمووی گرێدراوی بنەماڵەگەریتی یە. وەک بڵێی کرۆکیەکی بچووکی کێشەکانی ناو دەوڵەت و دەسەڵات لەناو خێزاندا ئاواکراوە. لەو چوارچێوەیەشدا بۆ شیکارکردنی دەسەڵات ـ دەوڵەت ـ چین و کۆمەڵگا شیکارکردنی خێزان مەرجە.

ئەگەر لەتەوەرەی دەسەڵاتدا ئاواکراین ئەوا خێزان و خانەدان بەرچاوترین بابەتی ئایدیۆلۆژیا و پراکتیکی دەسەڵاتگەریتی و دەوڵەتگەریتین. هەمیشە بەردەوام بوونی کێشەکانی دەوڵەت و دەسەڵات لەخۆرهەڵاتی ناویندا هۆکارەکەی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە ئەو کۆمەڵگایەی بناخەکەیان پێکدێنێت بنەماڵەگەریتی و خانەدانگەریتی دایپۆشیون. کێشەگەلێکن کە دوولایەنە کاریگەری لەیەکتر دەکەن. سەبارەت بەم بابەتە

دەرککردن بە لایەنی ئایدیۆلۆژی کێشەکان زۆر گرنگ و بایەخدارە. تاکو ئێستا زهنیەتی کۆمەڵگای خۆرهەڵاتی ناوین لەدەرککردن بەو ڕاستییە دوورە کە هێزی دەسەڵات و دەوڵەت وەک ئامرازی چارەسەرکردنی کێشەکان بیری لێ کراوەتەوە ئەنجامێکی پێچەوانەی لێکەوتۆتەوە و ژیانێکی پڕ لەلاوازی، دوور لەداهێنان و تەژی کۆیلایەتییان خوڵقاندووە. لەبەر ئەو هۆکارەیە کە گلۆڵەی ئەم پەیوەندیانە وەک سەرچاوەی سەرەکی کێشەکان ڕاڤە دەکەین و ئەمەش زۆر گرنگە. بەهۆی ئەو ڕەوشەی هەر زوو پێشوەخت دەرکم پێکرد پەیوەندیەکی زۆرم بەرامبەر ئایدیۆلۆژیا و ڕێکخراوە دیموکراتیەکان، گفتوگۆ و کردارەکانی پیشاندا. ڕۆژ بەدوای ڕۆژ ژیان فێری دەکردن کە ڕێگای چارەسەر کردنی کێشە کۆمەڵایەتیەکان بێرەدا تێپەڕ دەبێت.

دیسان بەپێچەوانەی مەزەندەکان چین دەسەڵات و دەوڵەت ناخولقێنێت. بەپێچەوانەوە بونیادەکانی دەوڵەت و دەسەڵات ـ کە لەسەر بنەماڵەگەریتی و خانەدانێتی ئاوا کراون ــ ڕێگا لەپێش چینایەتی دەکاتەوە. لەپێشینەیی هی ئایدیۆلۆژیاو پراکتیکی پلەداری دەوڵەتگەراییە. لەمێژووی شارستانیەتی خۆرهەڵاتی ناویندا دەتوانرێت دەستنیشان بکرێت کە ئەم قۆناخە بەشێوەیەکی بەربلاو لە ئاراُدا بووە. نەک لەخوارەوە بۆ سەرەوە، بەڵکو لەسەرەوە بۆ خوارەوە مەیلەکانی جیاوازی چینایەتی بەهێزترە. لەمەش گرنگتر لە جیاتی پەیوەندیەکی چین و دەوڵەت لەدەرەوەی خۆیان، لەبواری ئایدیۆلۆژی و کرداریەوە پەیوەندیەکی تێکەڵاوی چین ـ دەسەڵات و دیاردەی دەوڵەت لەئارادا دەبێت. ئەمەش قۆناخێکە کە تا دوا ڕادە بە شێوەیەکی داپۆشراو ڕوودەدات. بەجۆرێکە بە هۆی خەیاڵە ئایدیۆلۆژییە تیرەگەرا، بنەماڵەگەرا ، خانەدانگەرایی و دەوڵەتگەراییەوە چین دەخرێتە ڕەوشێکی نەبینراوەوە. بەمجۆرەش ڕێگری لەپێش پەرەسەندنی وشیاری چینایەتی دەکەن. کاتێک شیکار لەبارەی چینەوە ئەنجام دەدرێت پەیڕەوکردنی هەڵوێستی بەرجەستەو کۆنکرێتی گرنگە. پێویستە وەک چۆنیەتی پێکهاتنی لەمێژوودا هەڵوێستی بەرامبەر پێش بخرێت. لەکاتێکدا جیاوازی چینایەتی کۆمەڵگا لەخۆرهەڵاتی ناویندا

بەدیدێت بەشێوەیەکی تێکەڵـە لەگەڵ خێزان، خانـەدان، دەسـەڵاتبوون و دەوڵەتبوونی فەرمی. چونکە کۆیلایەتی تەنیا لەسـەر ڕەنجـی مـادی ئـاوا ناکرێـت. بـەر لەهـەموو شـتێک لەسـەر زهنیـەت، سۆز و جەسـتە ئـاوا دەکرێت. تا کۆیلایەتی ئایدیۆلۆژی بەدیتەیـەت کۆیلایـەتی ڕەنجـی مـادی پەرەناسـەنێت. بـۆ بینینـی ئـەو کێشـانەی سـەرچاوەی خۆیـان لەتایبەتمەندێتییە بەربلاوەکانی چین وەردەگرن پێشاندانی هەڵوێستێکی گشتگیرانەی بەمجۆرە ئەزموونبەخش و فێرکەرتر دەبێت. هەڵسەنگاندن و بینینـی بونیادەکـانی دەوڵـەت و دەسـەڵات لەسـەر کۆمـەڵگای خۆرهـەڵاتی ناوین وەک قازانجی سیاسی (بەدەست هێنانی قـازانج لەمیانـەی هێـزەوە) زیاتر نزیک بەڕاستیمان دەکاتـەوە. لەپەیوەنـدی کۆیلـە ـ کۆیلـەدار زیـاتر توانـا کەڵەکـە بـووە کۆمەڵایەتیـەکان بەشـێوەی دەسـت بەسـەرداگرتنی ناوەندەکانی دەوڵەت و دەسەڵات فەراهـەم دەکرێت. دەسـەڵات دیاردەیـەکی لەدەوڵـەت بـەربلاوترە. ئەگـەر دەوڵـەتیش نـەبێت بەشـێوەیەکی بـەربلاو دەسەڵات دەتوانێـت هـەبێت و بژێـت. هـەر بۆیـەش پێویسـتە ناوەنـدەکانی دەسـەڵات وەک جۆرێـک لەپاوانـەکانی سـەرمایە هەڵسـەنگێنرێت. کاتێـک قازانج نەبێت بەدەسەڵات بـوون هـیچ مانایـەکی نییـە. ئامـانجی سـەرەکی پێکهێنـانی دەسـەڵات قازانجـە. هەڵسـەنگاندنی دەسـەڵات وەک دەزگایـەکی جیـاواز لـەقازانج لادانـە. ئەمـەش بابـەتێکی گرنگـە کـە سۆسـیۆلۆژیای ڕۆژئـاوا خـۆی لەڕۆشـنکردنەوەی دەدزێتـەوە. چونکـە پاوانـەکان تـەنیا لەمیانەی سیستەمی سـەرمایەداری و وەک سـەرمایە ئـاوا نـاکرێن. بەشـی هـەرە زۆریـان لـە مێـژوودا وەک گـروپ یـان پاوانـەکانی دەسـەڵات ئـاوا دەکرێن. مەحاڵە بەبێ دەسەڵات بیر لەقازانج بکرێتـەوە. ئـەم دەستنیشـان کردنـە بـۆ شارسـتانیەتی ئـەوروپاش پەسـەندە و لـەجێگای خۆیدایـە. تەنانەت کاتێک پاوانەکانی دەسەڵات وەک ئامرازە کلاسیک و پاڵاوتـەکانی قازانج بیری لێدەکرێتەوە ئەوا دەتوانین بە شێوەیەکی باشتر مێژوو ڕاڤـە بکەین.

دەوڵەت دیاردەیەکە لەدەسەڵات جیاوازترە. ئەویش پشت بەدەسـەڵات دەبەستێت بـەڵام بەسیفەتی شێوە گرتنێکـی جیـاوازتر. سـەرەتا چەنـدین

ناوەندی دەسەڵات یەک دەگرن و کاتێک ئەگەری بەدەستهێنانی قازانجێکی زیاتر ببینن، ئەوا وەک حەسرەتێکی بەهێز دەوڵەت بوون دەکەنە ئامانجی خۆیان. بەردەوام دەوڵەت وەک ڕێکخستنی قازانجی هاوبەشی ناوەندە جیاوازەکانی دەسەڵات بونیاد دەنرێن. لەم سۆنگەیەوە بەهۆی پشکەکانی قازانج بەردەوام ململانێ، تەنانەت شەڕ و پێکدادانی ناوخۆ لەناواخنی بونیادەکەیەوە دێتە ئاراوە. هەروەها لەبەر ئەوەی خاوەن نەریتێکی ڕەواکراو و پاڵاوتەترە سەرجەم پاوانەکانی قازانج دەوڵەت وەک گوزارشتی پەیوەندیەکانی خۆیان دەبینن و لایەنگری لێدەکەن. بەڵام لەدۆخێکدا هەڕەشەیەکی ترسناک لەسەر بەرژەوەندیەکانی دەوڵەت جێگای باس بێت، ئەوا پارچەکردنی دەوڵەت، لێگەڕینەکانی دەوڵەت و دەسەڵاتی نوێ دەکەوێتە ڕۆژەڤەوە. بەدرێژایی مێژووەکەی شارستانی خۆرهەڵاتی ناوین خاوەن ئەزموونی لە ژمارنەهاتووی بەم جۆرەیە.

دەتوانرێت شیکارێکی واقیعیانەی دەسەڵات و دەوڵەت لەسەر بنەمای قۆناخی شارستانی ناوەندیدا ئەنجام بدرێت کە زیاتر لەپێنج هەزار ساڵ تەمەنیەتی. هەرچی مێژووی پێنج سەد ساڵەی مێژووی ئەوروپایە سەبارەت بەشیکاری کردنی دەوڵەت و دەسەڵات شوێن و کاتێکی ناتەواوە. هەر بۆیە بەشێوەیەکی لێهاتووانە شیکردنەوە دەرهەق بەدەوڵەت و دەسەڵات ناکرێت. لەکاتێکدا سەبارەت بەم بابەتە مارکسیزم تەواو نموونەیەکی نەزانی پیشان دەدات، لیبرالیزمیش لەناو هەڵوێستی چەواشەکارانەی ورناترداییە. هەرچی هێزە محافەزەکارەکانن باشتر ڕاستیەکە دەزانن بەڵام درکاندنی و ئاشکراکردنی بەگوێرەی بەرژەوەندی خۆیان نابینن. زمانی ئایدۆلۆژی - میتۆلۆژی هەڵدەبژێرن و باسە چەواشەکارەکان قووڵتردەکەنەوە. کاتێک لەهەموو شتێک زیاتر کێشەکانی دەوڵەت و دەسەڵات وەک مەسەلەگەلێکی هەڵبەستراو لەناو کۆمەڵگا پیشان دەدەن، ئەمە گرێدراوی ڕادەکانی قازانجە کە لەگەوهەریاندا هەیە. ئەگەر ڕاڤەیەکی سۆسیۆلۆژی ڕاستەقینە سەبارەت بەدەستەواژەکانی ئایین و خوداوەند بکرێت کە بەدرێژایی مێژووی شارستانی پەرەی پێدراوە ئەو کاتە دەبینرێت کە قاڵب و هێلکاریەکی دەوڵەتە؛ شکۆدارکردنی

ئایدیۆلۆژیانەی پراکتیکی پادشا - خوداوەندە. بەڕادەی شرۆڤەکردنی دەوڵەت - نەتەوەی ڕۆژگاری ئەمڕۆمان وەک ئەو خوداوەندەی دابەزیوەتە سەر زەوی، بەدەربڕینە عەلمانیەکەی هەڵسەنگاندنی وەک هەمان ڕێکخستن کە خوداوەندی لێ داماڵێنراوە، لەناوەڕۆکدا لەیەکتر جیاواز نین. بەبەراورد لەگەڵ مارکس لەم بارەیەوە هیگڵ بەشێوەیەکی قووڵتر مێژوو دەخوێنێتەوە.

لەخۆرهەلاتی ناویندا ئەو کێشانەی زیاتر بەشێوەیەکی بەربڵاو و کەڵەکەبوو بەدەستیەوە دەناڵێنێت کێشەکانی خێزان، خانەدان، چین، دەسەڵات و دەوڵەتە.

## ٦. کێشەکانی ئەخلاق، پۆلیتیکا و دیموکراسی کۆمەڵگای خۆرهەلاتی ناوین

شیکارکردنی قۆناخی پێنج هەزارساڵەی شارستانی ناوەندی لەسەر بنەمای دەستەواژەکانی ئەخلاق، سیاسەت و دیموکراسی زۆر فێرکەر و وانە بەخش دەبێت. لەبەشەکانی پێشووتر ئاماژەم پێکردبوو کە سروشتی کۆمەلایەتی بەسیفەتی دیاردەی ئەخلاقی و سیاسی پەرەی سەندووە. ئەگەر بەکورتیش بێت پێویستە دووبارەی بکەمەوە ئەگەر ئەخلاق و سیاسەت نەبێت کۆمەڵگاش نابێت. تەنانەت ئەگەر هەبێتیش جگە لەکۆمەڵێکی بێ شێوە (ئامۆرف) هیچ مانا و گوزارشتێکی دیکەی نابێت. ئەگەر ئەمجۆرە کۆمەڵگایانە بوونیان هەبێت، تەنیا ئۆبژەی کەرەستەی کۆمەڵگاکانی دیکەیە.

دەشێت ئەخلاق وەک یەکێتی و یەکپارچەیی ئەو هەڵوێستانە پێناسە بکرێت کە لەکاتی یەکەمین بونیادنانیدا کۆمەڵگا نواندوویەتی. ئەمەش کۆ و یەکپارچەیی ئەو تەگبیر، کار و چالاکیانەیە کە کۆمەڵگای سەرەتایی لەپێناو گوزەران، زۆربوون و خۆپاراستن ئەنجامیداون. بەو ڕادەیەی ئەم یەکپارچەییانە بوونەتە نەریتی باو ئەوا ئەخلاق پێکهاتووە. وەک چۆن بەبێ زۆربوون، پاراستن و خۆراک کۆمەڵگا بەردەوام نابێت، کۆمەڵگا بەبێ ئەخلاقیش نابێت. لەگەڵ ئەوەی سیاسەت دەستەواژەیەکی تۆزێک

جیاوازتره، بەڵام لەنزیكەوە گرێدراوی ئەخلاقە. جیاوازیەكەی لەگەڵ ئەخلاق ئەوەیە كە چالاكیەكی رۆژانەیی و هەنووكەییە. لەكاتێكدا ئەخلاق بەسیفەتی نەریت بەشێوەی قالب كاری خۆی دەكات و رۆڵ دەبینێت، ئەوا سیاسەت مانای یەكپارچەیی ئەو بڕیارانەیە كە سەبارەت بەكێشە رۆژانەییەكانی پێش كۆمەڵگا وەردەگیرێت. بەو رادەیەی كۆی بڕیارەكان ببێت بەرێورەسمو نەریتی باو، لەگەڵ نەریتە ئەخلاقیەكان یەكدەگرن و دەبن بە رێساكانی ئەخلاق. كارتێكردنی هەردووكیان بۆ سەر یەكتری جێگای باسە. لە كاتێكدا وەك نەریتێكی باو ئەخلاق چوارچێوە پێشكەش بەسیاسەت دەكات، سیاسەتیش لەڕێگای بڕیارە كاراكانیەوە بەردەوام ئەم چوارچێوەیە بەرفراوان و قووڵدەكاتەوە. لەدۆخێكی بەمجۆرەدا ناشێت هەردوو دەستەواژە و دیاردە بەتەواوی لەیەكتری جیابكرێتەوە.

دیموكراسیش وەك سێیەمین دەستەواژەو دیاردەی گرنگ پێویستە بخرێتە سەر هەردوو دیاردە و دەستەواژەی یەكەم. لەم مانایەدا ناشێت بیر لەكۆمەڵگایەكی بێ دیموكراسی بكرێتەوە. ئەگەر كۆمەڵگایەكی بەمجۆرە جێگای باسیش بێت ئەوا لەدۆخی ئۆبژەی پێداویستی كۆمەڵگادایە و ناتوانێت گوزارشت لەخۆی بكات. لەڕەوشی كۆی ئامرازەكانی كۆمەڵگاكانی دیكە ڕزگاریان نابێت و ئیفلیج دەبن. لەم چوارچێوەیەدا لەناوەڕۆكدا سیاسەت دیموكراتیكە. سیاسەتی ڕاستەقینە سیاسەتی دیموكراتییانەیە. سیاسەتە نادیموكراتیەكان بڕیاری یەكلایەنەی حوكمڕانی هێزەكانی دەوڵەت و دەسەڵاتی پلەدارییە كە زۆر دواتر دەركەوتن. ناشێت "بڕیارەكانی حوكمڕانی" ئەم هێزانە بەسیاسەت ناودێر بكرێت، بەڵكو بەڕێساكانی حكومڕانی ناوزەد دەكرێن.

مسۆگەر سیاسەتی ڕاستەقینە ئەوەیە كە لەمیانەی بەشداریكردن و گفتوگۆی دیمۆس(هەمەگیری تەواوی ئۆرگانەكانی كۆمەڵگای قەبیلە، خێزان، خێڵ، قەوم و نەتەوە) ئەنجامدەدرێت. سیاسەت دەستەواژە و دیاردەیەك نییە كە بەبێ كۆمەڵگا و بەشداریكردن پێك بێت. لەم سۆنگەیەوە هەروەكو چۆن سیاسەت ناچارە دیموكراتی بێت، ناچارە ئەخلاقیش بێت. ئەو كۆمەڵگایەی دیموكراسی تێدا نەبێت سیاسی نییە،

ئەو کۆمەڵگایەی سیاسیش نەبێت ئەخلاقی نابێت. ئەم گوزارشتە زاراوەیی و دیاردە سێیانییە بە شێوەیەکی ژیانی یەکتری دەکەن بەپێویستیەک.

شارستانی ناوەندی خۆرهەڵاتی ناوین بەشێوەی ناکۆکی و دژایەتی کردنی گوزارشتی ئەم سێ دیاردە و دەستەواژە سەرەکیەی کۆمەڵگا سەریهەڵداوە و پەرەیسەندووە. پەیوەندیەکی دیالیکتیکی بنەڕەتی لەنێوانیاندا هەیە. چەندە کۆمەڵگای شارستانی(شار- چین - دەسەڵات) پەرە بسەنێت، بەوڕادەیە ئەخلاق، سیاسەت و دیموکراسی دوا دەکەوێت. لەهەمان کاتدا بەهەمان ئەندازە گرژی و ململانێ لەنێوانیاندا دێتە ئاراوە. دەشێت لەداستانەکانی سۆمەر بەتایبەتیش باسەکانی لەبارەی ژن، جووتیار و شوانکارەکان ئەم قۆناغ و پرۆسەیە ببینرێت؛ ئەمەش گوزارشت لەواقیعی گرژی و ململانێ دەکات. لەداستان و دەقە ئایینەکانی دواتردا هێندە گوێمان لەدەنگی ئەم سێیانەیە (کۆڵەکە سەرەکیەکانی کۆمەڵگە) نابێت. کەواتە لەململانێکەدا بنکەوتوون. بەراورد بەمەش تا ئێستا داستانی تیرەو خێڵەکان زیندووە و تا ڕۆژی ئەمڕۆمان هاتوون. واتە بەتەواوی بونیادی ئەخلاق، سیاسەت و نەریتی دیموکراسییان لەدەستنەداوە. ئایینە تاکخودابیەکان بەسیفەتی دەرهەستکردنێکی سەروو زۆر باس ــ بە خراپ ــ لە نەمرود و فیرعەون دەکەن. دیسان ئەمەش بەو مانایە دێت کە بەلانی کەم لە سەرەتادا خاوەن هەنگاوی ئەخلاقی، سیاسی و دیموکراتین. باسکردنی ئەخلاق، سیاسەت و دیموکراتی لەمیانەی پشتبەستن بە شارستانی ئەوروپا، زۆر ناتەواوە، بێ بناخەیە و بۆرژوازیانەیە. ناشێتو ئەو دەرفەتە لەئارادا نییە لەڕوانگەی چینێکی خۆپەرستی وەک بۆرژوازی پەرەسەندنی مێژوویی گوزارشتی دەستەواژە و دیاردەکانی ئەخلاق، سیاسەت و دیموکراسی، هەروەها ڕاستینەکەی لەناو هەمەگیری و یەکپارچەییدا دەرکی پێبکرێت. پێویستە تا دواڕادە بە شێوەیەکی ڕەخنەگرانە هەڵوێست بەرامبەر بەمجۆرە زانستانەی ڕۆژئاوا پیشان بدرێت.

پێویستە ئەو حوکمە بکەین کە لە تەواوی ئەو توێژە کۆمەڵایەتییانەی لەدەرەوەی سیستەمی شارستانی ناوەندی ماونەتەوە بەشێوەیەکی

پۆلێنکراو دیاردەکانی ئەخلاق، سیاسەت و دیموکراسی بەهێزترن. لەم چوارچێوەیەدا تەواوی جڤاتە بێکار و نیمچە کۆچبەرەکانی تیرە، خێڵ و مەزهەبە بەرخودانکارەکانی لەشاخ و بیابانەکان گیرساونەتەوە و جڤاتە شوانکارە و جووتیارەکانی ناوچە لادێییەکان هەڵسەنگاندنیان وەک هێزی نزیکتر لەبەرخودان، ئازادی و یەکسانی واقیعی یە. هەرچی ئەو فاکتەرانەن کە سەرباری بەرخودانیش کراون بەکۆیلە دەشێت لەپلەی دووەم و بەشێوەیەکی بابەتیانە لەو پرۆژەیەدا هەڵسەنگێنرێن. ئەوەی بۆ ئازادی و یەکسانی گرنگە، لەم سۆنگەیەوە ئەوەی بۆ کێشەکانی ئەخلاق، سیاسەت و دیموکراسی گرنگە، کۆیلایەتی بابەتی نییە؛ بەڵکو وەڵامی ئەو پرسیارانە گرنگە تا چ ڕادەیەک رادەست نەبووە، چەندە بەرخودان دەکات، چەندە کۆچبەرەو تا چەند لە پێناو بیرو باوەڕیەکانی خۆیدا دەجەنگێت.

هەڵبەتە کێشەی ئەخلاقی، سیاسی و دیموکراسی جددی لەکۆمەڵگای خۆرهەلاتی ناوین لەئارادایە. وەک پێویستیەکی قۆناغ و پرۆسەی شارستانی ئەم کێشانە زۆر بەرفراوانن. بەڵام زانینی ئەم ڕاستیەش گرنگە کە یاسا، سیاسەت و دیموکراسی شارستانی ئەوروپا لەڕادە بەدەر بورژوازیانەیە و نوێنەرایەتی دیاردەی ئەخلاقی، سیاسەت و دیموکراسی کۆمەڵگای مێژوویی و جیهان ناکات ،چونکە ئەوەی بورژوازی دیموکراسی نییە، بەڕێوەبردنی دەوڵەتە. ئەگەر بڵێی ئەوەی بەناوی دیموکراسی دەکرێت ـ بەتەواوی گشگیریش نەکرێت ـ ڕۆڵی "گەڵای عەیب داپۆشەرە دەبینێت" کە بەڕێوەبەرایەتی دەوڵەت دەشارێتەوە هەڵوێستێکی ڕاستە. هەمان پێودانگ بۆ هەڵوێستەکانی ئەوروپا سەبارەت بەمافەکانی مرۆڤیش لەجێگای خۆیدایە. بەتایبەتیش یاسا بەتەواوی لەجێگای ئەخلاق دانراوە. یاسا گلۆڵەی پەیمانگەلێکی دەرهەق دەوڵەت و دەسەڵاتن و هیچ کاتێک جێگای ئەخلاقی زیندوو ناگرێتەوە. پێویستە دەرک بەم خاڵەش بکرێت کە ئەو کار و بڕیار و کردەوانەی لەپێناو کاروبارە ناوخۆیی و دەرەکیەکانی دەوڵەت ئەنجام دەدرێت بەسیاسەت ناودێر ناکرێت. لەوانەیە بەسیاسەتی دەوڵەت ناوزەند بکرێت، بەڵام ناشێت بەسیاسەتی کۆمەڵگا ناوببرێت. هەرچی ئەو شتگەلانەن کە بەناوی دیموکراسیەوە ئەنجام دەدرێن زۆر

لەدەرەوەی کۆمەڵگان و جگە لەپەردەکانی شانۆگەری هیچی دیکە نییە.

لەسەر بنەمای ئەم کورتە رەخنانەوە زۆر بە دڵنیاییەوە دەتوانین بڵێین کە پۆتانسیێلی دیموکراسی، ئەخلاق و سیاسەت لەکۆمەڵگای خۆرهەلاتی ناوین بەهێزە. هەبوونی کێشەی جددی ئەخلاقی، سیاسی و دیموکراسی بەهێزی پۆتانسیێلەکەی پیشان دەدات. تا ئێستاش بەهێزبوونی مەیلی دەوڵەت و دەسەلات گەرایی، هەروەها هەبوونی کێشەی ئەخلاقی، سیاسی و دیموکراسی بەهێز لەلایەکەی دیکەوە پێویستی ئەخلاق، سیاسەت و دیموکراسی یگرە هەبوونیشی دێنێتە بیری مرۆڤ. وەک پێویستییەکی ئەو ناکۆکییە دیالیکتیکیەی نێوانیان تەنیا بەم شێوەیە دەشێت گوزارشت لەراستی بکرێت.

### ٧. کێشەی ئابووری و ئایدیۆلۆژی لەکۆمەڵگای خۆرهەلاتی ناویندا

تەواوی ئەو باسانەی لەچوارچێوەی کێشەکانەوە ئاماژەمان پێکردن لەراستیدا لەمیانەی لایەنە ئایدیۆلۆژی و ئابوریەکەشیەوە هەوڵی خستنەرووی دراوە. بەو ئامانجەی کێشەکان لەچوارچێوەو مانای بەرتەسکی فاکتەرەکانی کلتووری ماددیو مەعنەوی بخەتنە رووی بەردەوامکردنی هێڵکاری خۆمانمان بەگونجاو زانی. لێرەدا ئاماژە بەسەردێرە گرنگەکانی دەکەم.

زانستی ئابوری - سیاسی رۆژئاوا بەر لەهەموو شتێک ئەو کەهانەت و چەواشەکارییە زانستیانەی لەلقەکانی دیکەدا پەرەی پێداوە سەبارەت بەکۆمەڵگا پەیرەوی دەکات. پێویستی بەمە هەیە. کەڵەکە بوونێکی سەرمایە و رادەیەکی قازانج جێگای باسە کە جیاوازە بەڵام پێشکەوتووە. لەئاشکراکردنی ئەم راستییە زیاتر ئابووری سیاسی ناوبژیوانێ لەپێناوی شاردنەوەیدا دەکات. دەشێت وەک ڤێرسیۆنی هاوچەرخی باسی میتۆلۆژی هەڵسەنگێندرێت.

لەبنەرەتدا کێشەی ئابووری لەگەڵ پەراوێزکردن و بەدەرنانی ژن لەئابووریدا دەست پێدەکات. خودی ئابووری هەرشتێکە کە دەبێتە بابەتی

خۆراک. هەرچی بەگوێرەی ئابووری سیاسی (پەرتووکی سەرمایەی مارکسیشی لە ناودا)یە ئەو قازانج، داهات، سوود و کرێیانەی بەگوێرەی بازاڕەکان و لەڕێگەی بەرهەم هێنانەوە بەدەست دەهێنرێن بابەتە سەرەکیەکانی ئابوورین. لێرەدا زانست بوونی نییە. بەڵکو دیسپلینێک جێگای باسە کە تەواو بەگوێرەی ژیانی بۆرژوازییە کە لەسەر قازانج ئاواکراوە. ئەو ژیانە ئابوورییەی لەسەر بنەمای قازانج ڕێکخراوە قووڵترین کێشەی کۆمەڵگایە. ڕێکخستنی ژیانی مرۆڤ بەگوێرەی قازانج مانای درندەترین دەسەڵات دەبەخشێت. دەستەواژەی بیۆ ـ دەسەڵات لەراستیدا تۆزێک گوزارشت لەو واقیعە دەکات. بەدرێژایی مێژوو تەواوی کۆمەڵگاکان بەچاوی گومانەوە تەماشای کەڵەکەکردنی ئەو پارە و موڵکەی کردووە کە لەدەرەوەی پێویستی مرۆڤە و بەئامانجی دەوڵەمەند بوون کۆکراونەتەوە، لەگەڵ ڕەخسانی یەکەم دەرفەتیشدا لەبڵاوکردنەوەی ئەو کەڵەکەکردنانە بەسەر خاوەن پێداویستیەکان دوودڵییان نەکردووە. لەخۆڕا نییە کەڵەکەکردنەکانی بەئامانجی ڕووبەڕووبوونەوەی کارەساتەکان نین بەڵکو بەئامانجی دەوڵەمەندبوونی هەندێک کەس و گروپ کۆدەکرێتەوە بەردەوام دووچاری داوەری خراپی پێوانە ئەخلاقییەکان هاتووە. ڕەهنکردنی بەهایەکی پیرۆزی وەک ژیانی مرۆڤ لەژێر چەپۆکی کەڵەکەکاران بەگەورەترین بێ ئەخلاقی و بەدرەوشتی لەقەڵەمداوە. ئەو شتەی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری ڕۆژئاوا لەمیانەی هەزار و یەک دامەزراوی سیاسی و هێز هەوڵی ڕەواکردنی دەدات ئەم دیاردەیە. ئەو لێڤی ئەتهان (لێویاتان)[1]ەی لەپەرتووکی پیرۆزدا باسی دەکرێت لەناوەڕۆکدا ئاماژە بەم دیاردەیە دەکات. وەک جانەوارێکی دژی کۆمەڵگا خەیاڵ دەکرێت. ئەو دیاردەکانی ئابووری نین، بەپێچەوانەوە ڕۆحی ئابووری دەکێشن و لەژێر ناوی ئابووری ـ سیاسیشەوە بەناوی زانست پێشکەش دەکرێت. ئەو هەوڵەی مارکس لەراسیۆنالیست کردنی ئابووری سیاسی

---

[1] Leivlathan بە گوێرەی تەورات لویاتان درندە یان جانەوەرێکە لەشێوەی نەهەنگدایە و لە دەریادا دەژی و هەموو شتێک قووت دەدات. بۆ یەکەمین جار لەلایەن تۆماس هۆبزەوە بەواتای دەوڵەت و دەسەڵاتی ستەمکارانە بەکارهێنرا، تەنانەت پەرتووکێکی بەم ناوەوەیە.

ئینگلیزدا پیشانیدا گوزارشت لەئانتی - ئابووری دەکات نەک ئابووری. ناوبردنی ئەمە بەئابووری نەک تەنیا لەکۆمەڵگای سۆسیالیستی تەنانەت لەهەر کۆمەڵگایەک بێت ئەخلاقی نابێت. لەکاتێکدا ویستوویەتی هیگل هەڵسێنێتەوە سەر پێیەکانی خۆی سەراوژێر کەوتووە. بەکورتی کەڵەکەکردنی سەرمایە و ئۆپەراسیۆنەکانی قازانجی کە لەسەر بازاڕ ئەنجام دەدرێت بناخەی ئەو کێشە ئابووریانەیە کە لەمێژوودا هاوتاکەی نەبینراوە.

پێویستە جارێکی دیکە ئاماژە بەم خاڵە بکەم: لەدۆخێکدا خزمەت بەپێداویستییە ژیانیەکانی مرۆڤ بکات لەبوارەکانی بەخێوکردن(خۆراک)، پۆشاک، گەیاندن و حەوانەوە، دژایەتیکردنی بازار و هەڵسەنگاندنی وەک ئامرازی فەتیشزم هیچ لایەنێکی گونجاو و کۆکی نییە. لەم چوارچێوەیەدا بازاڕ پێویستە و ئامرازێکی باشی ئابووریە. ئەمە نییە کە دژایەتی دەکەین. بەڵکو بەرەنگاربوونەوەی سیستەمی قازانجی زێدەڕۆییانە جێگای باسە کە لەمیانەی یارێکردن بەنرخەکانی بازاڕو مەودای درێژ و دووری نێوان بازاڕەکان بەدیدێت، واتە بەرەنگاربوونەوەی سەرمایەداری جێگای باسە. هەڵبەتە ئانتی ـ سەرمایەداریبوون، دژایەتیکردنی ئەم سیستەمە و هەرشتێکە کە سیستەم لەسەر پێیانی رابگرێت. واقیعی بازاڕ لەدەرەوەی ئەم چوارچێوەدایە. بەپێچەوانەوە پاوانەکانی سەرمایە بەردەوام یاری بەنرخەکان دەکەن و لەمیانەی زیندوو هێشتنەوەی دەرفەت و توانستەکانی قازانج ئاڵوگۆڕێکی تەندروست و عادیلانە لەبازاڕدا بەربەست دەکات. واتە سەرمایەداری تەنیا ئانتی ـ ئابووری نییە بەڵکو دژە ـ بازاڕیشە. ئەگەر وەها نەبوایە بەردەوام لەمیانەی تەنگەژە و یاریەکانی فینانس ژیانی کۆمەڵگا سەراوبن دەکرا؟ سەرباری ئەو زانست و تەکنۆلۆژیا زەبەلاحەی لەئارادایە ئەو کێشانەی هەڕەشە لەمرۆڤایەتی دەکەن لەسەرووی هەمووشیانەوە زیادبوونی لەڕادەبەدەری ژمارەی دانیشتوان ، و وێرانبوونی بێکاری، هەژاری ژینگە بە قەدەر ئەو قۆناخە گەورە دەبوو؟

ڕۆڵ بینینی ژن لەسەنتەری ئابووریدا خاسیەتێکە دەرکی پێدەکرێت. چونکە منداڵی دەبێت و بەخێوی دەکات. ئەگەر ژن لەئابووری تێنەگات

ئەی کێ تێدەگات! کاتێک بە گشتی لەمێژووی شارستانی بەتایبەتیش لەمۆدێرنیتەی سەرمایەداری ژن لەئابووری بەدەرنرا، لەبەر ئەم هۆکارە ئابووری ـ کە پیاوە زەبەلاحەکان زیاترین یاری پێدەکەن ـ بوو بەگلۆڵەی کێشەکان. ئەم یارییەی هیچ ڕایەڵەیەکی سروشتی لەگەڵ ئابوریدا نییە و تەنیا لەڕێگەی چاوچنۆکی و داخوازی بەدەستهێنانی ئەوپەڕی هێز و قازانجەوە خوازیارە تەواوی هێزەکانی ئابووری لەسەرووی هەمووشیانەوە ژن بخاتە ژێر کۆنترۆڵی خۆیەوە، لەئەنجامدا ڕێگا لەپێش هەر جۆرە هێزێکی پلەداری، دەسەلات و دەوڵەت دەکاتەوە کە وەک تەنێکی نەخۆشی لەسەر کۆمەڵگا گەورە بێت، بەمجۆرەش بەقۆناخێک گەیشتووە کە چیتر ناتوانێت بەردەوام بێت.

دوای ژن تەواوی ئەو توێژانەی بەئابووری ڕاستەقینەوە سەرقاڵن لەسەرووی هەمووشیانەوە جووتیاران، شوانکاران، پیشەگەران و بازرگانە بچووکەکان لەلایەن ئامێر و دامەزراوەکانی پاوانی سەرمایە و دەسەلاتەوە هەنگاو بەهەنگاو لەئابووری بەدەرنران و بەمجۆرە دۆخ و زەمینەی غەنیمەت و تالانکاری تەواو ئافرێنراوە. لێرەدا ڕووبەڕووی بابەتێکین کە پێویستی بەزۆرترین ڕۆشنکردنەوە هەیە. شارستانی کە بەمانایەک لەماناکان تالانکردنی ئۆبژە و گۆڕەپانەکانی ژیانی ئابوورییە، چۆن رەواکراون و تا رۆژی ئەمڕۆمان هاتن؟ ئەو هێزانەی ئابوورییان لەناوبرد چۆن وەک فاکتەرە سەرەکییەکانی ئابووری ناسێنراون و پیشاندران؟ ئەگەر بڵێین لەکاتی ئافراندنی خوداوەندەکان لەکۆمەڵگای سۆمەر راهیبەکان زۆر لەمە واقیعیتر بوون بە هەڵەدا ناچین. سەرەڕای تەواوی ئەو ڕەخنانەش بەڵام کارل مارکس پەی بەو مەترسی و کارەساتە بردبوو کە لەژێرناوی ئابووری سەرمایەدارییەوە خرابوویە ڕوو. بەڵام ئەگەر بڵێین لەقۆناخێکدا کە مۆدێرنیتەی سەرمایەداری چەندەی بۆی کراوە هەژموونگەرایی خۆی ئاواکردووە شیکار و چالاکییە شۆڕشگێڕیەکەی هێندەی برکرد راستتر دەبێت.

جیاوازیەکی گرنگ لەکۆمەڵگای خۆرهەلاتی ناویندا ئەوەیە کە زیادەکانی ئابووری بەدەستی دەوڵەت تالان دەکرێت. لەراستیدا ئەگەر ئەم

خاڵە ڕەچاو بکەین کە لەشارستانی ئەوروپاشدا بەبێ دەوڵەت قازانج بەرهەمی خەیاڵێکە، ئەو کاتە دەبینین کە لەدوا شیکاریدا دەوڵەت تاکە خاوەنی زێدە (بەرهەم، بەها)کانی کۆمەڵگایە. لەدەرەوەی دەوڵەت باسکردن لەقازانج جگە لەفریودان و دەستخەرۆکردن هیچی دیکە نییە، لەدەرەنجامدا مێژووی شارستانی دیرۆکێکی دژە ئابوورییە. گشت کێشە ئابووریەکان وەک ئەنجامێکی ئەم ناکۆکیە دێنە ئاراوە. چەندە دەوڵەت، شارو چینی دەسەلات دەستی خۆیان لەئابووری بکێشنەوە، بەمانایەکی دیکە بچووک ببنەوە و ئابووری بۆ بەرپرسیارە ڕاستەقینەکانی خۆی بەجێ بێڵن بەو ڕادەیە کێشە ئابووریەکان دەکەونە سەر ڕاستەڕێی چارەسەرکردن. ئەم دەست نیشانکردنەی بۆ ئابووری جیهانگیری ڕاستە زیاتر بۆ ژیانی ئابووری خۆرهەڵاتی ناوین لەجێگای خۆیدایە.

بەو سیفەتەی هێزی کلتووری مەعنەوییە کۆمەڵگا بەبێ ئایدیۆلۆژیا نابێت. لەگەڵ ئەوەی ئایدیۆلۆژیا گرێدانی بەزهنیەتەوە هەیە بەڵام دەستەوەژایەکی جیاوازترە. دەشێت باس لەزهنی ئاژەلان تەنانەت ڕووەک و ئەتۆمیش بکرێت. بەلام ئایدیۆلۆژیا تایبەت بەکۆمەڵگای مرۆڤە. لەبنەڕەتدا ئەرکی ماناداركردن و ڕێکخستنی ژیانە. چونکە ئەم ماناو ڕێکخستەکردنانە نەبن کۆمەڵگا لەسەر پێ نامێنێت و دەکەوێتە ناو مەترسییەوە. لەبەر ئەم هۆکارە ئایدیۆلۆژیا کێشەیەکی زۆر سەیرە. مانای وشەکە واتای لۆژیکی ڕامانەکانە. کۆمەڵگای مرۆڤ وەک سروشتێکی زۆر نەرم لەمیانەی لۆژیکی رامان و فیکرەوە بۆ شێوەگرتن و ئازاد بوون لەبارو گونجاوە. بەلام بەهۆی ئەم خاسیەتەی بۆ بەکۆیلە کردنیش لەبارە. بەهۆی بونیادەکەیەوە هەم سەرچاوەی کێشەیە، هەم چارەسەرکەری کێشەیە.

ئایدیۆلۆژیاکان ڕۆڵێکی گەورەیان لەشارستانیەکانی خۆرهەڵاتی ناویندا بینیوە. خودی شارستانی زۆر شت قەرزباری داهێنانە میتۆلۆژییەکانی راهیبەکانی سۆمەرە. پەنتاتۆن(ئەنجوومەن)ی خوداوەندەکان گاریگەری کردۆتە سەر تەواوی ئایینەکان. بەشێوەیەکی تێکەڵ لەگەڵ شارستانی مادی بەردەوام شارستانیەتێکی مەعنەویش

ئاواکراوە. هێزی پادشایەتی و خانەدانێتی کە لەسەر زەویەوە هەڵکشاوە شکۆدارکردن و ناساندنی خۆی بەرەمزی خوداوەندی کردۆتە ئەرکی سەرەکی ئایدیۆلۆژی. پادشای سەر زەوی بە شێوەی خەیاڵی ئیلاهی لەئاسمان رەنگیداوەتەوە. لەو سەردەمەوە فەلسەفە، زانست، هونەر و ئایینەکان بەردەوام بەدوای ئەم خوداوەندانەدا گەڕاون. ئەوەی دۆزیویانەتەوە؛ لەلایەکەوە جیهانی ڕاستیەکان بووە، لەلایەکی دیکەشەوە جیهانی خەیاڵی ڕاستییە چەواشەکراوەکان بووە.

ئەوەی سەبارەت بەجیهانی ئایدیۆلۆژی خۆرهەڵاتی ناوین گرنگە بەدواداچوونە بۆ چۆنیەتی گۆڕینی ئایدیۆلۆژیای میتۆلۆژی بۆ ئایدیۆلۆژیای ئایینی، ئایدیۆلۆژیای ئایینی بۆ ئایدیۆلۆژیای فەلسەفی و دواتر گۆڕینیان بۆ تیۆرییە زانستیەکان: ئەرکیان بەدواداچوون و دۆزینەوەی دونیای ئەو کێشە ماددیانەیە کە ڕووبەڕوویان بۆتەوە. مسۆگەر وەڵامی کێشەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی و ئابووری لەئایدیۆلۆژیادا دەدۆزنەوە: ئیتر ڕاستیەکەی بێت یاخود چەواشەکراوەکەی. دامودەزگاکانی دەسەڵات، دەوڵەت و خانەدان و بەشێوەیەکی زۆر نموونەیی لەدونیای ئایدیۆلۆژی خۆیان بەشێوەی ئیلاهی دەئافرێنرێن و دەنوێنرێن. ئەگەر شیکاری ئایدیۆلۆژی سەبارەت بەم لایەنانەیەوە بکرێت، ئەوا دەرفەتی زانیاری و ڕۆشنگەریەکی ڕاستتر دەرهەق بەکۆمەڵگا دەرەخسێت. دونیای ئایین و خوداوەندەکانی چاخەکانی یەکەم و ناوین مۆرک و شوێنپەنجەی ڕەواکراوی دونیای سەرمایەداران، دەوڵەت، دەسەڵات، خانەدان و پلەداری هەڵکشاوی پێوەیە. شەڕ و پێکدادانەکانی نێوانیان بەهەمان شێوە لەتارماییو شوێنپەنجەکانیشیاندا ڕوو دەدات. بۆ باش تێگەیشتنی کێشە ماددیەکان تا چەندە بواری ئایدیۆلۆژی پێویست بێت، پێچەوانەکەشی هێندە پێویستە. بەڕادەی جیاکردنەوەی هەردوو لایەنو ڕووەکەی، پێویستە بەردەوام پەیوەندی و ڕایەڵەکانی نێوانیان ببینرێت و بابەتی بەدوادا گەڕان بێت.

لەقۆناخەکانی شارستانیدا هێزە بونیادنەرەکان تەواو ئاگاداری کارەکتەری خەیاڵی ئایدیۆلۆژیان. کاتێک ئەم دونیا خەیاڵییە وەک

واقیعی پێشکەش بەدونیای کۆیلەکان دەکەن هەم کۆیلەکان ماڵی دەکەن، هەم ئارەزووەکانیان لغاو دەکەن و هیوا دەخوازن بەو خەیاڵە ئۆقرە بگرن کە بەدونیای دیکە ناوی دەبەن. لەم سۆنگەیەوە ئەو دۆخە دەبوو بەنەریت و باوبوونی دونیایەکی ئایدیۆلۆژی پڕ لەکێشە. بەردەوام پێشکەشکردنی مێژووی شارستانی لەژێر سێبەری ئایین و خوداوەندەکان پەیوەندی بەو راستیەوە هەیە.

لەرۆژگاری ئەمرۆشماندا کێشە قورسە کۆمەڵایەتیەکان بۆ ئەم چەشنە کێشە ئایدیۆلۆژیانە دەگۆردرێت. لەوانەیە بەهۆی ئەو بڕوایەیان کە بەشێوەیەکی ئاسانتر شیکاری دەکرێن بەمجۆرەیە. زیندووبوونەوەی ئایدیۆلۆژیای ئیسلامی رەنگدانەوەی زیادبوونی کێشە کۆمەڵایەتیەکانە. هۆکاری نەبوونی ئایدیۆلۆژیاکانی مۆدێرنیتەیە بەچارەسەری کێشەکان بۆ نەبەستنی پەیوەندیەکی واقیعی لەگەڵ کێشە کۆمەڵایەتیەکاندا دەگەڕێتەوە. سەرنەکەوتنی ئایدیۆلۆژییە نەریتیەکان(ئایینیەکان)بێت یاخود ئایدیۆلۆژیەکانی مۆدێرنیتە(لیبرالیزم، نەتەوەپەرستی، سۆسیالیزم و هتد) بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە بەشێوەیەکی راست کێشە کۆمەڵایەتیەکانیان نەخستۆتە روو. هەردوو شێوازەکانی شۆڕشگێڕی و پەرەسەندن(تدریجی) بۆ چارەسەری هەم لەبواری گوتە هەم کردار ژیانکردنی راستی دەسەپێنن.

## ٨. کێشەی شۆڕش لەکۆمەڵگای خۆرهەڵاتی ناویندا

ئەو کێشە کۆمەڵایەتیانەی هەوڵی پێشکەشکردنی هێلکارکەیماندا هەڵبەتە چڕبوونەوەو تەرکیزکردنیان لەسەر کێشەی شۆڕش مایەی تێگەیشتنە. هەوڵدەدەم پێناسەیەکی جیاوازتر لەبارەی شۆڕشەوە بکەم. لەلایەنێکەوە دەتوانین مێژووی خۆرهەڵاتی ناوین وەک دیرۆکی دژە شۆڕش راڤە بکەین. دژە شۆڕش بەرامبەر بە کێ؟ دژە شۆڕشێک دژی سەرجەم ئەو فاکتەرە کۆمەڵایەتیانەی لەسیستەمی شارستانیدا بەدەرنراون. بەڵێ دژە شۆڕش لەبەرامبەر ژن، لاوان، کۆمەڵگای گوند ـ کشتوکاڵ، تیرەو خێڵە نیمچە کۆچەرەکان، خاوەن باوەڕی و مەزهەبە نهێنیەکان و

بەكۆیلەكراوەكان. لەكاتێكدا شارستانی بۆ هێزەكانی بەرژەوەندی خۆی سیستەمێكی نوێ یاخود شۆڕشە، بەلام بۆ هێزە بەرهەڵستكارەكان وێرانكاریو دژە شۆڕشە. بەبڕوای من شۆڕش ئەوەیە كە كۆمەڵگای ئەخلاقی، سیاسی و دیموكراتی سەر لەنوێ و بەشێوەیەكی پێشكەوتوانەتر ئەو خەسڵەتانەی خۆی بەدەست بێنێتەوە كە بەردەوام بوارو كرداری سیستەمی شارستانی بەرتەسك دەكاتەوە.

بەگوێرەی ماركسیست - سۆسیالستێك شۆڕش"كۆمەڵگای سۆسیالیستی"یە. بۆ شۆڕشگێڕێكی موسڵمانیش "كۆمەڵگای ئیسلامی"یە. بۆ بۆرژوازیش"كۆمەڵگای لیبراڵ"ە. لە ڕاستیدا كۆمەڵگای بەم چەشنە بوونیان نییە. هەروەكو لەچاخی ناوینیشدا بینراوە ئەمانە تەنیا ناولێنانن. لەمیانەی پێوە هەڵواسینی ئەتەكێتێكەوە كۆمەڵگا خەسڵەت و چۆنایەتیەكەی ناگۆڕێت. بۆ نموونە دوای هەڵوەشانەوەی یەكێتی سۆڤێت ئاشكرا بوو كە جیاوازیەكی ڕیشەیی لەنێوان مرۆڤی سۆڤێتی سۆسیالیست و مرۆڤی لیبرالی ئەوروپادا نییە. ئەو جیاوازیانەی نێوان كریستیان و موسڵمانێك كە سەرچاوەكەی بۆ ئایین دەگەڕێتەوە كاریگەریەكانی بۆ سەر ژیان زۆر ڕێژەییە. ئەگەر جیاوازییەكی چۆنایەتی لەنێوان كۆمەڵگاكاندا بكرێت، ئەمە تەنیا لەسەر بنەمای وەسفكردنی كۆمەڵگای ئەخلاقی، سیاسی و دیموكراتی دەكرێت كە هەوڵی پێناسەكردنیماندا. دەشێت لەمیانەی ئەم دەستەواژە و دیاردەكانیەوە بەشێوەیەكی واقیعیانە جیاوازی بنەڕەتی دەستنیشان بكرێت. بێگومان ئەو كۆمەڵگایانەی ئەخلاقی، سیاسی و دیموكراتین زیاتر خاوەن دەرفەتی ژیانێكی یەكسان و ئازادترن. ئەوەی بخوازێت دەتوانێت بەكۆمەڵگای سۆسیالیستی ناوی ببات. ڕاڤەیەكی واقیعی كۆمەڵگای خۆرهەلاتی ناوین لەدەستنیشانكردنی خەسڵەتەكانی ئەخلاقی، سیاسی و دیموكراتی شۆڕشی چاوەڕوانكراودا زەحمەتی نابینێت. لەڕووداوو گۆڕانكاریەكانەوە دەركی پێدەكرێت كە سەرجەم ئایدیۆلۆژیا نەریتی و مۆدێرنیستەكان ڕەوشەكەیان ئاڵۆز و بە كێشەتر كردووە. ئەو دەرەنجامەش ڕاستینەی پێویستی ژیانی و دەست لێبەرنەدراوی دیموكراسی سیاسی و ئەخلاقی دەسەلمێنن. كێشەی سەرەكی

شۆڕشـــی کۆمــەڵگاکان لەسیاســەتی دیموکراتییانــە بێبــەرین، واتــە لەئــەخلاقیش بێبەشـن، کێشـەکەیان بەدەسـتهێنانی ئـەم خەسـڵەتانەیە. کاتێک کێشەی شۆڕش بـەمجۆرە دیـار بکرێت، ئـەوا بەرنامـەی سیاسـی، ستراتیژی و سەنگەرگرتنی تەکتیکی و هەنگاوی کرداری ڕاستیش بەگوێرەی ئەمــە دەستنیشـــان دەکـــرێن..چـــەمکی شۆڕشـــێکی بـــەمجۆرە زۆر لەهەڵوێســتەکانی شۆڕشـــی ئیســـلامی، سۆسیالیســـتی و میللیگـــەرایی (ناسیۆنالیســـتی) جیـــاوازترە. لـــەناو مۆدێرنیتـــەی ســـەرمایەداریدا لەدواشیکاردا ئەو هەڵوێستانە بەتایبەتیش لەئەنجامگیربوون بە دەوڵەت ـ نەتــەوە درەنـگ ناکـەون. هـەرچی مۆدێرنیتـەی سـەرمایەدارییە ئـامرازی چارەسەرکردنی کێشەکان نییە، بـەڵکو ئـامرازی گـەورەکردنی کێشـەکان و بڵاوکردنەوەیەتی لەناو تەواوی کۆمەڵگادا.

چەندە شۆڕش لەکردەو هەنگاوەکانی گۆڕەپـانی ئـەخلاقی، سیاسـی و دیموکراســـی مـــەودا ببـــڕێ، ئـــەوا لەمۆدێرنێتـــەی ســـەرمایەداری دووردەکەوێتـــەوە و تازەگـــەری دیمـــوکراتی بەرجەســـتە دەکـــات و پەرەدەسـەنێت. دەستنیشـانکردنی جیاوازییـەکی دیکـەی کێشـەی شـۆڕش لەشێوازی ژیان و چالاکیدا گرنگ و بایەخدارە. هەڵوێستە ڕاستەهێڵییەکان چەنـدە هەڵـەبێت، ئـەوا گـەورەکردن و زیـادکردنی جیاوازییـەکانی نێـوان تیۆری ـ کرداریش بـەرەو چـالاکی چـەوتت دەبـات. پێویسـتە زۆر بەباشـی بزانرێت شێوەی ژیانی جیاوازی بەر لەشۆڕش و دوای شۆڕش جێگای باس نییە. بەتایبەتیش بۆ شۆڕشگێڕێک بەمجۆرەیـە. بـوون بـەمرۆڤی کـردە و چالاکی لەگەڵ خۆ تەیارکردنی تیۆریدا بەدی دێت. هـەر کەسێکی لـەژیانی ڕۆژانەدا خەسڵەتەکانی دیموکراتی، سیاسی و ئـەخلاقی لەگوتـە و کرداردا پیشان نەدات بەشۆڕشگێڕ ناونابرێت. ئـەو جـۆرە کەسـانە نابنـە خـاوەنی ژیـانێکی شۆڕشـگێڕی و میللیتـانی. هـەروەها تـەنیا لەمیانـەی بـەرگری خۆیی، کۆمەڵگا نابێت بـەچالاکوان. ئەگـەر شـەڕی بـەرگریکردن لـەخود و هـەر جـۆرە بەرخودانکارییـەک لەگـەڵ بونیادنـانی کۆمـەڵگای ئـەخلاقی، سیاسـی و دیمـوکراتی نـەکرێن بەیـەک چانسـی سـەرکەوتنی هەمیشـەیی نابێت. وەک چـۆن کێشـەکانی کۆمـەڵگا یەکپارچەیـە، پێویسـتە شۆڕش و

شۆڕشگێڕیش لەتەواوی گوتە و کردارەکانیدا بەرنامەی سیاسی، ستراتیژ و پلاننامەی تەکتیکی لەناو یەکتردا جێبەجێ بکات. چونکە لێشاوی ژیان یەکپارچەیە. نابێت مەزەندەی ئەوە بکەین کە لەمیانەی قۆناخێکی لەیەکدابڕاو بژین. ئەگەر وانە لەهەندێک نموونەی مێژوویی وەربگرین ئەوا نموونەکانی حەزرەتی محەمەد، عیسا، موسا و زەردەشت تا دوارادە فێرکەر و ئەزموونبەخشن. ئەو کەسایەتییە مێژووییانە بەر لە هەزاران ساڵ ئاگادارمان دەکەنەوە کە پێویستە شۆڕش و شۆڕشگێڕانی کۆمەڵگای خۆرهەڵاتی ناوین چۆن سەرتاسەر، خاوەن ئامۆیەکی بەردەوام، بەپرەنسیپ و کرداری بن. پێویستە شۆڕشەکانی خۆرهەڵاتی ناوین بەگوێرەی قاڵبەکانی مۆدێرنێتەی سەرمایەداری نەبێت، بەڵکو بەگوێرەی بەها مێژووییەکانی خۆیان بێت، بەڵام تەنیا لەمیانەی یەکبوونی لەگەڵ زانستی رۆژانەیی سەرکەوتوو دەبێت.

لەئەنجامدا دەتوانین تەنگەژە و قەیرانەکانی خۆرهەڵاتی ناوین لەسێ قۆناخدا کورت بکەینەوە. قۆناخی یەکەم هەڵکشانی سیستەمی شارستانی ناوەندییە کە لەساڵانی ٣٥٠٠ پ.ز سەریهەڵدا و لەدەوروبەری دیاردەکانی خانەدان، پلەداری، شار، دەسەڵات، دەوڵەت و چین دا پەرەیسەند. ئەم سیستەمە سەرچاوەی کێشەکانی کۆمەڵگایە. لەدەرەوە لەمیانەی سیستەمی تیرەکانەوە، لەناوەوەش لەرێگای سیستەمی ئاینی زەردەشتی و ئیبراهیمیەوە هەوڵی وەڵامدانەوەی ئەم قۆناخە دراوە. قۆناخی دووەم، سیستەمی شارستانی ناوەندی لەمیانەی شارستانی ئیسلامەوە دوا قەڵەمبازی خۆی ئەنجامدا، بەڵام بەهۆی سەرنەکەوتنی تەواوی لەو رێنسانسەی بەرامبەر بەکێشە کەڵەکەبووەکانی ساڵانی ١٢٠٠ زایینی هەوڵی بۆ داوە، پێشەنگایەتییەکەی کەوتە دەست هەنگاوەکانی شارستانی و شارەکانی نیمچە دوورگەی ئیتاڵیا و تەنگەژە و کێشەکانی قووڵتر بوویەوە.

قۆناخی سێیەم کە لەرۆژگاری ئەمڕۆمان لەژێر ناوی "کێشەی رۆژهەڵات" لەئارادایە لەگەڵ بەدەستەوەگرتنی هەژموونی شارستانی ناوەندی لەلایەن ئەوروپاوە و هێرشەکانی بۆ سەر ناوچە لە ساڵانی ١٨٠٠

دەستی پێکردووە. هەرچی لێگەڕینەکانی چارەسەرییە کە بەپشتبەستن بەمۆدێرنیتەی سەرمایەداری هەوڵی بۆ دراوە بە قورسترکردنی کێشەکان ئەنجامگیر بووە؛ ڕێگای لەپێش خراپەکارییەکی وەها کردۆتەوە کە بەئاستی قەیران، جینۆساید و خۆکوژی گەیشتووە.

بەشی چوارەم

## لێکەڕینەکانی چارەسەری و بەرخودانە مێژووییەکانی کۆمەڵگای خۆرهەڵاتی ناوین

پێشخستنی زانستە کۆمەڵایەتیەکانی شارستانی ناوەندی ئەورووپا لەسەر بنەمای ڕەسەن پەسەندکردنی شارستانی گریک ـ ڕۆما تا رادەیەکی زۆر نووسین و خوێندنەوەی مێژووی جیهانی چەواشە کردووە. خودی زانستە کۆمەڵایەتییەکانیش لەژێر کاریگەری قووڵی ئەم چەواشەکارییانەدان. بێگومان هەر سەردەمێک یاخود شارستانییەکی خاوەن بانگەشە بەداخوازییەکانی ڕەسەنایەتی و خۆ بەسەنتەر دانان بارکراون. شارستانی ناوەندی ئەورووپا سەبارەت بەم بابەتەشەوە دیسان پێشخوەت فەزیلەتی ڕەخنەدانی پیشانداوە. دەرکەوتنی ڕەوتی ڕەخنەگرانە نووسین و خوێندنەوەی مێژوویی جیهانی واقیعیتر (نزیک بەراستی) کردووە. لێکۆڵینەوەکانی زانستی کۆمەڵایەتی لەم بارەیەوە قووڵبوونەوەیەکی بەرچاوی بەخۆیەوە بینیوە. هەروەکو لەسەرجەم زانستەکاندا روویداوە گۆڕانی زانستە کۆمەڵایەتییەکانیش بۆ دیسپلینگەلێکی زۆر، ڕێگای لەپێش مەترسی پارچەبوونی یەکگرتوویی ڕاستی کردۆتەوە. کاتێک داوەری "راستی یەکگرتووە"ی هیگل بۆ کاردانەوەی "راستی یەکگرتوو نییە"ی ئادۆرنۆ دەگۆڕێت، پوختەی نۆخەکە دەخاتە روو. ئاشکرایە کە بەهۆی پەرچەکردار بەرامبەر مێژووی ماکرۆی گەردوونی مەیلی زێدەڕۆییانە بەرەو مێژووی میکرۆکان لەسەرووی هەمووشیانەوە "مێژووە نەتەوەییەکان" یەکپارچەیی راستی تێکداوە و خراپیەکانی زیاتر کردووە. پشتگوێخستنی لەرادەبەدەری رووداو و دیاردە میکرۆکان و قۆناخەکانی پەیوەندییان لەلایەن هەڵوێستی هەمەگیری(یەکگرتوویی) رۆڵی لەدەرکەوتنی ئەم ئەنجامەدا هەبووە. هەنگاوی راست بەڵام سەخت ئەوەیە کە هەڵوێستەکانی هەمەگیری و

پارچەیی (ماکرۆ و میکرۆ) وەک چۆن روویداوە لەناو یەکتردا شیکار بکرێن و لەمیانەی پەیڕەوی سەنتێزکردنەوە پێشکەش بکرێت. لەهەوڵەکانی خوێندنەوە، نووسین و خستنەڕوودا بایەخێکی زۆر بەم هەڵوێستە دەدەم.

فەلسەفەی مێژووی جیهانی هیگل وەک دەستەواژە پێشکەوتن لەگەڵ خۆیدا دێنێت. پشتبەستنی فەلسەفەی مێژووی هیگل بەشارستانی گریک ـ ڕۆما و بەزیادەوە لەپێشبوونی لایەنە میتافیزیاکەی ڕێگای لەپێش رەخنەی قورس کردۆتەوە. ڕەخنەی نیچە سەبارەت بەهیگل فێرکەرەو پڕ لەوانەیە. بەتەواوی هێزیو بەشێوەیەکی روونو ئاشکرا بەرامبەر بانگەشە دەرهەست و ئەبستراکتەکانی هیگل، نیچە ژیانی بەرجەستە دەسەپێنێت. خوازیارە بڵێ "ڕاستی بەرجەستەیە". کاتێک ئەم هەنگاوە دەهاوێژێت بەتەواوی مێژووی جیهانی و ئەبستراکت پشتگوێ ناخات. تەوەرەی گریک ـ ڕۆما تێپەڕدەکات. تا سەردەمی زەردەشت درێژ دەبێتەوە. لەوێدا هەوڵدەدات بەرامبەر بەمیتافیزیای ئایینی تاکخودایی لەفەلسەفەی ئەخلاق بکۆڵێتەوە. خوازیارە فەلسەفەی ئازارو خرۆشان بئافرێنێت. تاڕادەیەک باسی هیگڵگەرایی چەپی مارکسمان کرد. تا چەند خۆی وەک ماتریالیستێکیش بناسێنێت، بەڵام ناتوانین بڵێین مارکس میتافیزیکی پۆزێتیڤی تێپەڕکردووە. زانستی کۆمەڵایەتی فەرەنسی(بناخەی مێژووی نەتەوەی میکرۆ) گشتی پارچە (میکرۆ) گەرایە. شۆڕشی فەرەنسا و دەوڵەت ـ نەتەوە ئەوپەڕگەرو کۆماریگەراییەکەی بەش و ڕۆڵی لەمەدا گەورەیە. هەرچی قوتابخانەی مێژووی ئینگلیزە کە لەسەر بنەمای ئابووری سیاسی ئینگلیزی سەریهەڵداوە تا دوا ڕادە براگماتیست[1]ە. ئامانجی تەواوی دۆزینەوەی کۆڵەکە و پاڵپشتی مێژوویییە بۆ ئیمپراتۆریەت و هەژموونگەرایی هەڵکشاوی ئینگلیز و فەراهەمکردنی بناخە

---

[1] براگماتیزم: مەزهەبێکی فەلسەفی کۆمەڵایەتییە، لەو بڕوایەدایە حەقیقەت لەکۆی ئەزموونی مرۆڤایەتیدا دەدۆزرێتەوە نەک فیکری تیۆری دوور لە واقیع؛ مەعریفەش ئامراز یان ئەرکێکە لە زمەت پێویستیەکانی ژیاندایە. براگماتیزم جەخت لەسەر ئەنجامو بەرژەوەندی دەکاتەوەو بە فاکتەری سەرەکی حەقیقەتیان دادەنێت. دژی ئەو بۆچوونە دەوەستێتەوە کە پرەنسیپی مرۆیی‌و فیکر بە نوێنەری حەقیقەت دادەنێت.

ئایدیۆلۆژیەکەیەتی. بەهۆی پەیوەندییە پتەوەکەی بەکردارەوە لەهەنگاوەکانی ئەلمان و فەرەنسایییەکان سەرکەوتووترە. ئەو سیستەمەی سەرکەوتووبێت فەلسەفەکەشی سەرکەوتوو دەبێت، بەلام ئەمە بەمانای دروستیو ڕاستبوونی نایەت. وەک چۆن هەر سەرکەوتنێک حەقیقەت نییە، هەر شکستێکیش بەڵگەی چەوتی نییە. ئەم ڕاستی یە بەباشی نەزانین ناتوانین کاروانێکی دروستی حەقیقەت بگرینە بەر.

کاروانی زیاتر لەپێنج هەزار ساڵەی سیستەمی شارستانی ناوەندی کە سۆمەر سەرچاوەکەی پێکدێنێت، لەسەرووی ئەو فاکتەرانەوە دێت کە لەبەرژەوەندی مێژووی جیهانیدایە. بەکارنەهێنانی ئەم کۆڵەکەیە لەلایەن هیگڵەوە بۆ بێبەهرەیی و نابینایی ئەو ناگەڕێتەوە، بەڵکو ئەو کاتە هێشتا لێتوێژینەوەکانی دەرهەق بەسۆمەرۆلۆژی جێگای باس نەبوون. ماتریالەکانی سەبارەت بەسەرچاوەکانی دەرکەوتنی ئایینی ئیبراهیمیش زۆر سنووورداربوون. هێندە دەرک بەگرنگی سیستەمی قەبیلەش نەکراوە یاخود بەشێوەیەکی شایستە ئەو ڕۆڵە جیهانیەی هەڵنەسەنگێنرابوو کە لەگەڵ سیستەمی نیولیتیکدا گێڕاویەتی. هەلومەرج و زەمینەی قۆناخ(سەردەمی شۆڕشی فەرەنسا و دواتری) تەواو بەرووی لێکۆڵینەوەکانی مێژووی میللیگەرایی(فاکتەری ئایینی نوێ) و دەوڵەت - نەتەوەدا کراوەتەوە. هەر ڕۆشنبیر و مێژوونووسێک بەدوای مێژووی نەتەوەیی خۆیەوە بوو. روون و ئاشکرایە بەهۆی کارەکتەری ئەو شۆڕشەی ڕوویداوە(هەژموونگەرایی بۆرژوازی) تەواوی ئەم هەوڵانەی نووسینی مێژوو بەڕوانگەی قورسی چینایەتی بارگاوی کرابوون. لەکاتێکدا ڕۆشنبیرە بۆرژواکان ڕۆڵی سەرەکییان لەنووسینی مێژووی دەوڵەت - نەتەوەدا دەبینی، مەحافەزەکارەکانیش سەرلەنوێ بەدوای بناخەی مێژوویی ئەرستۆکراسی فیۆداڵدا دەگەڕان، دیموکراسیخواز و سۆسیالیستەکانیش لێکۆڵینەوەی مێژووی رەنجدەران و گەلانیان گرتە ئەستۆ. هەرچی سروشتی کۆمەڵگایە هەڵوێستێکی دەسەپاند کە هێندە نەرم و ئاڵۆز بێت لەمیانەی ڕوانگە چینایەتیەکانەوە شرۆڤە نەکرێت، لەم سۆنگەشەوە یەکگرتوو بێت بەلام گرنگی بەشەو پاژەکانیش بخاتە ڕوو.

لەسەرەتاکانی سەدەی بیستەمدا تیۆری رەخنەیی (قوتابخانەی فرانکفۆرت) و قوتابخانەی مێژوویی ئانالیس بەشێوەیەکی قووڵتر هەڵوێستەکانی هەمەگیرە و پارچەییان تاوتوێ کرد. شۆڕشە زانستیەکانی نیوەی دووەمی سەدەی بیستەم ڕەنگدانەوەی لەسەر زانستی کۆمەڵناسیش هەبوو، ئەمەش دەرفەتی بۆ باسو لێتۆێژینەوەی هاوسەنگتر رەخساند. دەتوانین بڵێین لەڕۆژگاری ئەمڕۆماندا تۆزێکی تر نزیکی حەقیقەتی کۆمەڵایەتی، مێژوویی و جیهانی بووینەتەوە. ئەگەر شتێک لەدیالیکتیک تێ بگەین، ئەوا پێویستە باش بزانین کە لەگەڵ نزیکبوونەوەی زیاتر لەحەقیقەت هەڵە و چەوتی مەزنیش جێگای باسن.

کاتێک هیگل ناسنامە و کاروانە مێژووییەکەی ناپلیۆن (بزاوتە سیاسی و سەربازیەکانی) هەڵدەسەنگێنێت. لەناوەڕۆکدا لەئەڵقەیەکی ڕاست و گرنگدا دەستی پێکردبوو. هەروەها کاتێک کە ناپلیۆن وەک ئەو خوداوەندەی هاتۆتە سەر زەوی و سیستەمەکەشی(سیستەمی دەوڵەتی نەتەوە) وەک هۆمۆژەنترین و دواترین شێوەی نموونەیی دەوڵەت هەڵدەسەنگێنێت، باسێکی فێرکەرە و پێشکەوتن لەگەڵ خۆیدا دێنێت. سەبارەت بەم بابەتە پێویستە حەقیقەتگەرایی هیگل پشتگوێ نەخرێت. وەک کەسایەتی ناپلیۆن خودی ئەو مێژووەیە کە تا ئەو قۆناخە هاتووە. ئەگەر لێتوێژینەوە لەبارەی فاکتەرەکانی ئەو کلتوورە ماددی و مەعنەوییە بکرێت کە ئەویان ئافراندووە ئەوا گەیشتن بەم ئەنجامە زەحمەت نابێت. بەکورتی ڕاڤەی بکەین؛ ڕەنگدانەوەی سێیانەی "باوک ــ کوڕ ــ ڕۆحی پیرۆز"ی ناوەڕۆکی پێکهێنەری ئایینی کریستیانی دەبێت بەدەوڵەتگەرا، ئیلاهیبوونەکەی ناو بونیادەکەیشی دۆخی بەرجەستەی دەوڵەت وەردەگرێت. لەڕاستیدا دەتوانرێت ڕاڤەی بەمجۆرە سەبارەت بە یەهوودیەت و موسلمانێتش پێشبخرێت. کاتێک کلێسا نەتەوەییەکان و خوداوەندی بەدەوڵەت بوو یەکدەگرن، ئەوا دەتوانرێت' دەوڵەت ـ نەتەوە' وەک خوداوەند شرۆڤە بکرێت. هەر ئەمەشە کە هیگل ئەنجامیداوە.

دەشێت زیاتر پەرە بەم ڕاڤەیە بدرێت و بەشێوەیەکی بەربڵاو بەکاربهێنرێت. هەروەها بەئامانجی تێگەیشتنێکی باشتر ڕاڤەکردنی

دەستەواژەی خوداوەند گرنگی و بایەخێکی زۆری هەیە. تەنانەت کاتێک دورکهایم یش خوداوەند وەک "خەیاڵی ناسنامەی کۆمەڵگا" ڕاڤە دەکات سۆسیۆلۆژیایەکی باشی پەرە پێداوە. واقیعیترین تێگەیشتنی سۆسیۆلۆژی سەبارەت بەخوداوەند ئەوەیانە کە وەک خەیاڵی ناسنامەی گشتی کۆمەڵگا ڕاڤەی دەکات. ئەو کۆمەکەی خوازیارم پێشکەش بەم ڕاڤەیەی تەنیا خەیاڵ نییە بەڵکو "خوداوەند بەرنامەیەکی سیاسی - کۆمەڵایەتییە". لە تێگەیشتنی حەزرەتی محەمەد سەبارەت بە ئەڵلا بەرفراوانتر هەوڵی شرۆڤەکردنی ئەو بابەتە دەدەین. گرنگترینیشیان؛ خاڵەکانی سەبارەت بەڕاڤەکانی ئایینی ئیبراهیمیەوەیە. تا باسە میتۆلۆژیەکانو پەنتائۆنی خوداوەندەکانی میسر و سۆمەر وەک پێدراوێک بەکار نەهێنرێن ئەوا کارکردن لەسەر سۆسیۆلۆژیای ئایینە ئیبراهیمیەکان مەحاڵیش نەبێت بەڵام زۆر ناتەواو دەبێت.

ئەگەر بۆ دواوە درێژە بەئاوڕدانەوەی خۆمان بدەین ئەوا دەبینین کە ڕاڤەکانی داستانی ئینانا و گلگامێشی شارستانی سۆمەری فێرکەرترە کە لەبەڵگە نووسراوەکانەوە بەدەستمان گەیشتوون. ئەگەر تاکە سنتوونی نووسینی مێژووی گەردوونیش نەبێت، بەڵام ناشێت نکوڵی لەوە بکرێت کە یەکێک لەو پەیرەوە گرنگانەیە کە بەم ئاراستەیەدا دەچێت. لەوانەیە بڵێن لەمیانەی ڕاڤەکردن لەسەر میتافیزیاوە مێژوو نانوسرێت. ئەمە بانگەشەیەکی زۆر وشک و بێتامە. لەبەرامبەر ئەمەشدا وەڵامەکەم بەم شێوەیە "بەشی هەرە زۆری کلتووری مرۆڤ تا ڕۆژی ئەمڕۆمان میتافیزیکە". چونکە لەقەلەمدانی تەواوی میتافیزیا بەشتێکی دوور لەحەقیقەت نە راستە، نە دەرفەتیشی هەیە. تەنانەت ئەو پۆزیتیڤیستانەی ئاڵای ئەم بانگەشەشیان بەرزکردبوویەوە دواتر ئاشکرا بوو کە خۆیان میتافیزیاگەرا هەرە قەبەکانن. ئەم هەڵسەنگاندنەی نیچە دەرهەق بەم بابەتە ڕۆشنکەرەوەیە؛ "پەیڕەوکردن یان پەیڕەونەکردنی میتافیزیا گرنگ نییە، گرنگ ئەنجامدانی میتافیزیایەکی باشە"، ئەو میتافیزیایەی ئازارەکانی ژیان کەم دەکاتەوە و جۆش و دڵخۆشی زیاد بکات میتافیزیای باشە. یەکێک لەزەقترین نموونەکانی میتافیزیای خراپ ئەوەیانە کە

چەمکی گەردوونی پۆزیتیفیست دەوڵەت - نەتەوە و فاشیزمی کرووە بە دێو.

با دیسان بگەڕێینەوە سەر بابەتەکەوە، ئەگەر دەرک بەسیستەمی شارستانی ناوەندی نەکرێت تێگەیشتنی مێژووی جیهانی زۆر ناتەواو دەبێت. ئەگەر مێژووی جیهانیش دەرکی پێنەکرێت، ئەوا تێگەیشتنی مێژووی پارچەکراوەکانی کۆمەڵگاکانیش تەنیا ناتەواو نابێت، بەڵکو بەهۆی نەبوونی بەراوردکاری زۆر بێمانا دەبێت. سەبارەت بەم بابەتە پێویستە باسی تێبینیەکی زۆر کورت بکەم دەرهەق بەسیستەمی قەبیلە. ئەو هەڵوێستە ڕاست نییە کە دوای کلان قەبیلە دەکات بەورد (میکرۆ)ترین بابەتی باسکردن. قەبیلەش وەک کلان بونیادێکی سیستەماتیک و تایبەتمەندێتی گەردوونی (جیهانی) لەخۆوە دەگرێت. ئەگەر سیستەمی کلان و قەبیلە نەخرێتە سەر باسی مێژووی گەردوونی، ڕاڤەکردن تەنیا پڕ لەهەڵە و چەوتی نابێت، بەڵکو تا بڵێی ناتەواو دەبێت. هەروەکو چۆن لەڕۆژگاری ئەمڕۆماندا بەبێ مێژووی نەتەوەیی باس لەمێژووی گەردوونی ناکرێت، ئەوا بەبێ کلان و قەبیلە باسی مێژووی گەردوونی و پاژە مێژووەکانیش ناکرێت. هەرچی دانایی دەسپێکردنی سەرەتای مێژووە بەکاتی سەرهەڵدانی نووسینەوە بەتەواوی بژارێکی میتۆلۆژیایە. ئەگەر بەمیتۆلۆژیای پۆزیتیفیست ناوی ببەین ڕاستترە.

ئەم کورتە ڕوونکردنەوانەی سەبارەت بەلێکەڕین و بەرخودانە مێژوویەکان ئاماژەمان پێکردن بۆ زیاتر تێگەیشتنی بابەتەکە گرنگە. کاتێک سەردەمی ناوەندی بەشێوە ڕەسەنەکەی دەستی پێکرد ئەو جیهانەی کە لەبەرامبەریدا سەری هەڵدابوو ئەو دونیایە بوو کە بەهەموو شکۆداریەکەیەوە لەقۆناخی کۆمەڵگای نیولیتیکدا دەژیا. دەشێت پەیوەندییەکی دیالیکتیکی تەواو لەنێوان هەردوو قۆناخ دابنرێت. هیچ گومانێکی تێدا نییە کە سەرجەم پلان، پڕۆژە و بنەماکانی جێبەجێکردنی ئەم گریمان و پێکهاتە دیالیکتیکییە لەپەرستگاکانی ڕاهیبی سۆمەر داهێنراوە. ئەگەر بەشێوەیەکی دیکۆمێنتی - ئەزموونی بیربکەینەوە یاخود عەقڵانی ــ ئەبستراکت ئەوا پەیوەندی دیالیکتیکی ئاواکراو پێشکەوتنی

مەزن لەخۆوە دەگرێت. سەرجەم بەهاکانی کلتووری ماددی و مەعنەوی بەپیتترین ناوچەی هیلالی زێڕین میزۆپۆتامیای سەروو (مێژووناس گۆردن شیلد ئەم کلتوورە هاوتای کلتووری ئەوروپای دوای سەدەی شازدەهەم دەبینێت) وەک کەرەستەیەکی یەدەگ بۆ شارستانی سۆمەر(گلۆلەی شار- چین - دەولەت) بەکاردەهێنرێت. دواتر لەمیانەی کارکردن لەسەر ئەو بەهایانەو گۆڕینیان ئەو ئامێرە دەخولقێنرێت کە شارستانی پێدەڵێن.

پەیڤەکانی شارستانی و ئامێر هێندە گرنگن کە پێویستی بەتاوتوێ کردنیان هەیە. لەبەر ئەوەی شارستانی بووە بەسیستەمێکی زاڵ، پەیڤێکە پڕوپاگەندەیەکی زۆری بۆ کراوە. ئەو پەیڤە مانای شارستانبوون و سڤیل (مەدەنی) بوونە. شارستانی ناوی ئەو ژیانە نوێیەیە کە لەمیانەی سیفەتەکانی مەدەنی، مۆدێرن، جوامێر، راسیۆناڵ، ڕێکو پێک، بەڕێز، جوان، بە حیساب، بەپلان، متمانە پێکراو، ئاشتیخواز و هتد شکۆدار دەکرێت. لەکاتێکدا لەڕێگای ئەم پەیڤانەوە کاریگەری کلتووری ماددی لەسەر ژیانی واقیعی و بەرجەستەدا وەسف دەکات، لەمیانەی پەنتائۆنی خوداوەندە نوێیەکان و دیمەنەکانی بەهەشتەوەش کلتووری مەعنەوی تەیار دەکات. لەسایەی ئەم دەستەواژانەوە کلتووری مەعنەوی بەشێوەیەکی نایاب بەرزترین بەرنامەی هێزە نوێکانی شارستانی پێشکەش دەکات کە بەنەمری بارکراوە. لەکاتێکدا پەیڤەکانی دەرهەق بەکلتووری ماددی نزمترین بەرنامەی ژیانی ڕۆژانە دەخەنە ڕوو، باسەکانی کلتووری ماددیش بەرنامەی بەرزترین بانگەشەکانی ژیانی داهاتوو پێشکەش دەکات. لەبەرئەوەی بەرزترین و نزمترین بەرنامەکانیان داهێناوە پێویستە بایەخێکی زۆر بەپەرستگاکانی ڕاهیبی سۆمەر بدرێت. ڕۆڵی پەرستگاکانی ڕۆژگاری ئەمڕۆمان لەپڕوپاگەندەکردن بۆ سیستەمی بونیادنراو بەولاوە تێپەڕ ناکات.

پەرستگا رەسەنەکانی سۆمەریەکان لەپێکهێنانی دیاردەکانی شارستانی پێنج هەزار ساڵەی دواتردا ڕۆڵی منداڵدانیان بینیوە. راهیبەکانی سۆمەر سەرەتا بەخۆیان ئاواکردنی سەرجەم ئایدیۆلۆژیاو دەزگاکانی شار، چین و دەولەتیان بەڕێوە بردووە. واتە دۆخی سەرەتایی

ئەو ئامێرەی ئافراندووە کە شارستانی پێدەگوترێت. پێویستە هیچ گومانێکمان لەوەدا نەبێت کە بنەچەی دەستەواژەی"داهێنانی ئیلاهی" تا بڵێی پەیوەندی بەخولقاندنی ئامێری شارستانیەوە هەیە. بەسیفەتی ئامێر دەستەواژەی شارستانیش خاسیەتێکی شایستەی شیکارکردنە. ئامێر پەیڤێکە کە وەک ناو و سیفەت بەو ئامرازانە دەدرێت کە بۆخۆیان کار دەکەن ـ بۆ نموونە ئۆتۆمبێل ـ ئەو پرسیارەی پێویستە بوروژێنرێت ئەم ئامێرە بونیادنراوەی کۆمەڵگا چ مانایەک دەبەخشێت. ئاشکرایە کە ڕۆڵی مێژوویی ئەم ئامێرە بریتییە لەکارپێکردنی خێراتری ئەو کۆمەڵگایەی خستویەتیە ژێر کۆنترۆڵ و فەرمانڕەوایی خۆیەوە، واتە بەدەستهێنانی زێدە (بەها و بەرهەمی)ی کۆمەلایەتی زیاتر و زەوتکردنیان. ڕۆڵ لەئەرک جیاوازترە و دەستەواژەیەکە پەیوەندی بەناوەڕۆکەوە هەیە. دەشێت دەست لەئەرک بەربدرێت، بەلام ڕۆڵ دەستبەرداری لێناکرێت. چونکە مەسەلەیەکە پەیوەندی بەناوەڕۆک و بونیادی ئۆرگان - ئامرازی پەیوەندیدارەوە هەیە. ئەگەر ئامراز پەرتەوازە بێت ئەوکاتە ڕۆڵیش کۆتایی دێت. لەمیانەی ڕژێمی شار- چین - دەوڵەتەوە شارستانی ئامێرێکە ڕۆڵێکی بەمجۆرەی هەیە. ئەو ئامێرەیە کە کۆمەڵگا دەخاتە کارەوە، تەنانەت کارێکی خێرایان پێدەکات. هەروەها کاتێک بیەوێت نایانخاتە ناو کارەوە، بەبێ کاربیان دەهێڵێتەوە. تەنیا بەمەش ناوەستێت، دەستبەسەر زێدە (بەرهەم و بەهاکان) دا دەگرێت. لەم پێناوەشدا هەر جۆرە تەگبیرێکی ئایدیۆلۆژی و سەربازی کردووە. لویاتان (جانەوەر)ێکە کە بەهەزار و یەک فرت و فێڵ، درۆ و زۆرداریەوە خۆی بەسەر کۆمەڵگادا سەپاندووە. ئامێرێکە دەستی بەسەر ئەو کلتوورەدا گرتووە کە کۆمەڵگا لەگونجاوترین ناوچەکانی ژیۆبیۆلۆژیا ـ کەملیۆنان ساڵ بەردەوام بووە ـ ئافراندوویەتی و خۆشی بەخولقێنەری دادەنێت.

لەدۆخێکی وەهادا پێویستە بپرسین: ئەی کێیە کە هۆفە و وەک جانەوەران وایە؟ ئایا ئەو کۆمەڵگایانەن کە وەک دایک و منداڵ لەگەڵ سروشت لەباوەشی یەکتردا دەژین یاخود ئەوانەن کە سواری سەرپشتیان بوون و بەهاکانیان زەوت کردووە؟ ئاشکرایە لەمێژە کاتی ئەوە هاتووە

دەستەواژەکە پێچەوانە بکەینەوە، تەنانەت درەنگیش کەوتووە. هێزەکانی شارستانی دڕندە و جانەوەرن. مرۆڤە ڕاستەکانیش ئەوانەن کە وەک دایک ـ منداڵ لەگەڵ سروشت و لەناو خۆشیاندا پڕ لەخۆشەویستی دەژین. ئەوانەن لەناو کۆمەڵگایەکدا دەژین کە ژن ڕۆڵی کارا و لەپێشی تێدا دەبینێت. ئەوانەن کە بەبێ وێران کردن و پیسکردنی ژینگە دەژین. فشار و چەوسانەوە بۆ خۆیان نامۆ دەبینن. دەشێت ئەم پێناسانە ساکار ببینرێن. بەڵام بۆ ئەوەی بەشێوەیەکی ڕوونتر دەرک بەدژایەتییە دیالیکتیکیە بکرێت کە شارستانی بەرامبەر بەکۆمەڵگا تێی کەوتووە، ڕۆشنکەرەوەیە، مرۆڤ دێنێتەوە هۆش خۆی و دەیگۆڕێت. پێویستە لەبیر نەکەین کە زۆربەی زۆری ئێمەی مرۆڤ جگە لەگەمژەکانی شارستانی ڕۆڵێکی دیکە نابینین. واتا ئەوانەین کە ئامێرەکە بەکاریان دێنێت. وەک هەر ئامێرێکی دیکە دەشێت شارستانیش ل ماوەکانی کارکردندا هیلاک بێت و دووچاری تەنگەژە بێت. هیچ کاتێک کێشە و تەنگەژە قورسەکانی کەم نابێتەوە. هەرچۆنێک بێت جڤاتی ئەو مرۆڤە زیندووانەی حکومڕانیان دەکەن بوونەوەرێکی خاوەن مێشک و ئارەزوون. ئەم بوونەوەرانەش نەرماییەکی بەم چەشنەیان هەیە، بۆ ماوەیەکی درێژ بەرگەی درۆ و زەحمەتیەکان ناگرن. دەتوانن بەرخودان بکەن و ڕاپەڕن، دەتوانن ژیانێکی ئازاد، یەکسان، برایانە و ماناداتر خەیاڵ بکەن. لەپێناو ژیانێکی بەمجۆرە دەتوانن خۆیان ڕێک بخەن و تەنانەت بجەنگن.

لەسەر ئەم بنەمایە لەژێر سێ سەردێڕی سەرەکیدا درێژە بە بابەتەکەمان دەدەین.

### أ. تەنگەژەکانی شارستانی و لێکەڕینەکانی لەپێناو چارەسەریدا

کاتێک باسی شارستانی دەکەین و سیستەمی شارستانی ناوەندیش دەکەین بەبابەتێکی سەرەکی لێکۆڵینەوەکەمان مانای نکوڵیکردن یان پشتگوێ کردنی شارستانیەکانی دیکە نایەت. باس لەبێ بایەخیشیان ناکەین. بەڵکو جەخت لەسەر ئەوە دەکەمەوە کە دەستەواژەی ڕووباری دایکی تەوژمی مێژوو ئەزموون بەخش و فێرکەرترە و پێشکەوتنی زیاتریش

لەگەڵ خۆیدا دێنێت. ئەوانی دیکە ئەو لقانەن کە دەڕژێنە ناو ڕووباری سەرەکیەوە. تەوژمەکەی بەهێز دەکەن بەڵام ناوەڕۆک و خاسیەتەکانی شارستانی ناگۆڕن. ئەو سیستەمەی لەبەرزترین ئاستدا سەردەمەکانی ڕابردوو و ڕۆژگاری ئەمڕۆمانی دەستنیشان کردووە، ناوبردن و هەڵسەنگاندنی وەک سیستەمی ناوەندی جیهان کۆمەک بەهەڵسەنگاندنی لقەکانی دیکەش دەکات. لەمیانەی تاوتوێکردنی تەوژمی مێژوویی جیهانیەوە دەتوانین ڕاستتر دەرک بەو لێشاوە مێژووییانە بکەین کە لەزەمان و شوێنی جیاواز پێکهاتوون. گشتی دەتوانێت بەش روون بکاتەوە، بەڵام بەش توانای رونکردنەوەی گشتی نییە. لەبەر ئەم هۆکارانەیە کە چەسپاندنی سیستەمی جیهانی یاخود سیستەمی شارستانی ناوەندی پێنج هەزار ساڵە هەڵدەبژێرین.

شارستانی شاری سۆمەر سەرەتا بەشێوەیەکی زۆر بەپیت دەست بەکار بوو؛ وەک ئەو ئامرازەی تازە لەوەکالەت دەرکەوتبێت زۆر بەخێرایی زیادی کرد. شارەکان یەک بەدوای یەکتر ئاواکران. بەهەرلایەکدا بڵاوبوویەوە لەسەرووی هەمووشیانەوە لەمیزۆپۆتامیای خواروو و سەروو. هەر شارێکیش مانای زێدە ـ بەهایەکی زیاتر بوو. لەسەر ئەم بنەمایەش وەرچەرخانی خێرای پلەدارییە جێنشینەکان بۆ دەوڵەتی خانەدانەکان چاوەڕوانکراو بوو. لەکاتێکدا بازرگانی کەرەستەی خاو و گواستراوە (محمول)ی خێرا دەکرد، شارەکانی ناچاری کێبڕکێی هەژموونگەرایی دەکرد. ئەو هێزەی بەسەر بازرگانیکدا زاڵ دەبوو چانسی هەژموونگەرایی زیاد دەبوو. هەروەها ئاواکردنی ژمارەیەکی زۆری شارەکان لەناوچەیەکی بەرتەسکدا هۆکارێکی دیکەی دنەدانی کێبڕکێ و شەڕی هەژموونگەرایی بوو. هەروەها ژمارەی دانیشتوان یش کە سەرەتا پێویست بوو، بەڵام بەهۆی زیادکردنی رادە بەدەر ئیتر دەبوو بە کێشە. بەرهەم مانای زیادبوونی ژمارەی دانیشتوان بوو. تاوەکو خاک زۆر و زەوەند بێت و دەرفەتەکانی ئاودێریش ڕێگا بدات، ئەم سیستەمە سەرکەوتوانە بەڕێوە دەچوو. بەڵام ناوچە بەپیتەکان تەنیا بەکەنارەکانی دیجلە ـ فورات سنوردار بوو. لەگەڵ پەلکێشکردنی ئەو ناوچانە بۆ ناو

پرۆسـەی شـارگەرایییەوە ئیتـر هەلومەرجـە بابەتیـەکانی تەنگـەژەش دەرەخسان.

ئوروک نزیکەی پێنج سەد ساڵ بەردەوامی بەسەردەمی خۆیداوە، لەدەرەنجامی کێبرکێدا شوێنی خۆی و هەژموونگەراییەکەی بۆ شاری ئور لەدەستداوە. تەنگەژە ئوروک رێگای لەپێش قەڵەمبازی شاری ئور کردەوە. لەدەرەنجامی ئەو تەنگەژانەی سێ خانەدانی ئوری قۆناخی ٣٠٠٠ــ ٢٠٠٠ پ. ز، خانەدانی ئەکەدی سامی قۆناخی ٢٣٥٠ــ ٢١٥٠پ. ز و خانەدانی گودیای ئاری سەردەمی ٢١٥٠ــ ٢٠٥٠ پ. ز تێیدا ژیان کۆتایی بەم قۆناخەش هات. ئەو بەڵگانەی لەئاراداں پیشانیدەدەن لەم قۆناخەدا شەڕ و پێکدادانی نێوان شارەکان زۆر بەربلاو بووە. تەنانەت هەندێک شار بەتەواوی لە بەین براون. بۆ نموونە لەداستانی "نەفرەت لە ئەگادا" دەبینین چەندین چیرۆکی هاوشێوە جێگای باسە. کیبرکێ و قەیرانێک لەئارادابوون کە هیچیان لەکێبرکێ و قەیرانەکانی رۆژی ئەمرۆمان کەمتر نییە. چونکە هەرکاتێک قازانج مانای زێدە ــ بەرهەمە. لەم سۆنگەوە هەموو کاتێک هۆکاری شەڕ و پێکدادانەکان هاوشێوە دەبێت و هەمان ئەنجامیشیان لێدەکەوێتەوە. زۆر ئاشکرایە کە تەنگەژە شارستانی دەستی پێکردووە. هەروەکو ئێراقی رۆژگاری ئەمرۆمان شاری وێرانە و شەڕە بێڕەحمەکان ئەم واقیعە دەسەلمێنن. ئەگەر بەبیرمان بێتەوە کە ناوی ئێراق لەئوروکەوە هاتووە ئەو کاتە باشتر تێدەگەین کە مێژوو (مێژووی شارستانی)ێکی چەندە خەمگین جێگای باس بووە.

ئەو چارەیەی بۆ تەنگەژەش بدۆزرێتەوە نەریتییە. تا رۆژی ئەمرۆمان شارستانی چڕبۆتەوە و هیچی لەخێرایی و هەبوونی خۆی لەدەستنەداوە؛ دۆزینەوەی ناوچە و گۆڕەپانی زیاتری چەوسانەوە، لەم پێناوەشدا بەدەستهێنانی هێز، دەوڵەت و دەسەلاتی زیاتر ئامانجی سەرەکی بووە. ئەوەی لەکۆتاییەکانی سالانی ٢٠٠٠ پ.ز بەشێوەیەکی بەهێز لەتەنگەژە رزگاری بووە هێزی بابلە. خاوەن هێز و توانایەکی زیاتری چەوسانەوەیە. لەبواری پیشەسازی و بازرگانیدا پێشکەوتووە. سەرباری هەندێک دابڕان توانیویەتی تا سالانی ٣٠٠ پ.ز هەژموونگەراییەکی بەکاریگەری هەبێت.

هەروەکو لەنموونەی ئەسکەندەردا بینراوە تەواوی هەژموونگەراکانی ئەو قۆناخە خوازیارن لە بابل بمرن. ئەوەی بەباشترین شێوە سوودی لەتەنگەژەکانی بابل بینیوە کۆلۆنی و بازرگانە ئاشووریەکانی بان سەریان بووە کە گورگی بازرگانی بوون. ئاشوورییەکان جۆرێک لەفینقیەکانی زەمینی بوون. ئەوەی فینقیەکان لەمیانەی بازرگانی دەریای سپییەوە ئەنجامیانداوە ئاشووریەکان لەرێگای بازرگانی وشکانیەوە بەدەستیان هێنا. ئاشووریەکانی کێبڕکێیەکی توندیان لەگەڵ بابل دەکرد، لەژێر هەژموونگەرایی بابلدا بوون(٢٠٠٠ـ١٦٠٠ پ.ز) بەڵام توانیویەتی پاوانی بازرگانی لەدەستی خۆیدا بهێڵێتەوە.

لەئاکامی ئەو تەنگەژەی دوای حامورابی تێی کەوت سەرهەڵدانی دوو هێزی مێژوویی جێگای باس دەبێت: دەرکەوتنی ئیبراهیم لە ناویدا(شیمانەی سالانی نێوان ١٧٠٠ـــ ١٦٠٠ پ.ز دەکرێت). لەدەرەوەش هەنگاونانی هۆریەکان لەقۆناخی بەرگریەوە بۆ هێرش کردن. لەساڵی ١٥٩٦پ.ز هاوشێوەی فەرمانڕەوایەتی ئەمرۆی بەغداد بابل گوزەری حکومرانیەکی هاوبەشی خانەدانە بەڕیشە هۆریەکان(هیت و کاسیتەکان ناسراون) دەبێت.

لەگەڵ لەدەستدانی هەژمونگەرایی بابل دوو هێزی هەژموونگەرایی نوێ دێنە سەر شانۆ. هەژموونگەرایی هیتیتەکان لە ئەنادۆڵی ناوین کە هاتوشاش(چۆرم ـــ بوغازکۆی ڕۆژی ئەمڕۆمان) ناوەندەکەیەتی، لەگەڵ هەڵکشانی هەژموونی میتانی واشوکانی ( سەرێ کانی سنووری نێوان سوریا و تورکیای ئەمڕۆ) ناوەندەکەی بوو. هەردووکیشیان لەلایەن ئەو میرنشینانەوە ئاوا دەکرێن کە پێگەی میرێتیان هەیە و پشت بە هۆریەکان دەبەستن(١٦٠٠ ـ ١٢٥٠ پ.ز). شانبەشانی ئەوەی سەردەم قۆناخی خانەدانی نوێی میسرە، سەردەمێکی بریقەدار و نوێی شارستانی خۆرهەڵاتی ناوینیشە. دیبلۆماسیەکی زیندوو و گواستنەوەی ژن بۆ کۆشکی یەکتر و قۆناخی جۆرێک لەپەیوەندی ئەنتەرناسیۆنالی بەرایی لەنێوان ناوەندی هەرسێ شارستانی بەڕێوە دەچێت. هەرەسهێنانی هەژموونگەرایی هیتیت و میتانی بەهۆی تەنگەژەباوەکان (تەنگەژەکانی ئەم قۆناخە درێژخایەنترین

لە نێوان سەد تا چوارسەد ساڵ لەگۆڕاندایە) ڕێگا لەپێش هەڵکشانی خانەدانەکانی ئاشوور دەکاتەوە کە لەئامادە باشیدان. بەشێوەی دوو قۆناخ(١٣٠٠- ١٠٠٠، ٩٠٠- ٦٠٠ پ.ز) دەبن بەتواناترین هێزی هەژموونگەرایی خۆرهەڵاتی ناوین.

دەگێڕنەوە کە ئیمپراتۆریەتی ئاشوور ستەمکار و دڵڕەقترین هێز بووە کە مێژوو ناسیویەتی. ئەگەر بۆ ناواخنی مەسەلەکە شۆڕبینەوە ئەوا پەیوەندی ستەمکاری بەقازانجی پاوانەوە مانادار دەبێت. وەک گەل ئاشووریەکانیش هیچ جیاوازیەکیان لەگەڵ گەلانی دیکەدا نییە. بەڵام پشت بەستنی هەژموونگەراییەکەی بەپاوانی بازرگانیەوە بۆ بەدەست هێنانی قازانج توندوتیژی دەکات ناچارییەک. هەر وەکو پاوانەکانی کشتوکاڵ(فەرمانڕەوایی سۆمەریەکان بۆ زەوی) توندوتیژی نەبێت قازانج لەپاوانەکانی بازرگانیشدا بەدەست ناهێنرێت. ئەم ڕاستیانە لەژێر توندوتیژی ئاشووریەکاندا شاراوەیە. ئەگەر نوێبوونەوەیەک هەبێت کە هەژموونگەرایی ئاشوور بۆ شارستانی هێنابێت ئەوەیە؛ دەسەڵاتی زیاتر بۆ بەدەست هێنانی قازانجی زیاتر، بۆ بەدەستهێنانی دەسەڵاتی زیاتر توندوتیژی زیاتر پێویستە. ئاشکرایە کە گەورەبوونێک لەبواری شوێن و چوارچێوەی توندوتیژیدا جێگەی باسە. هەر بۆیە شێوازی ڕێگە چارەی ئاشووری لەمێژوودا بەدایکی تەواوی ڕێگا چارەکانی توندوتیژی دادەنرێت. ئەم نەریتە زۆر شت قەرزباری هەژموونگەرایی ئاشوورە کە تا ئێستاش لە خۆرهەڵاتی ناوین وەک ڕێگەی چارەسەرکردنی کێشەکان بیری لێدەکرێتەوە.

توندوتیژی ئاشوور و سووربوونی قازانج کە بناخەکەی پێک دەهێنێت برینی گەورەیان لەویژدانی مرۆڤدا کردۆتەوە. تەنیا بەڕێخۆش کردن بۆ تەنگەژە نەوەستاوە، بەڵکو بۆتە هۆکار ئاشووریەکان بکەونە دۆخێکەوە وەک هێزی سیاسی - سەربازی و گەل - کۆمەڵگا جارێکی دیکە نەتوانن پشتی خۆیان ڕاست بکەنەوە. ئەو توندوتیژییە وایکردووە لەمیانەی نزای خراپو نەفرەتەوە لەلایەن گەلانی خۆرهەڵاتی ناوین یادیان بکرێتەوە (پاوانەکانی دەسەڵات و بازرگانیان)؛ ئەمەش ڕێگای لەپێش باڵگرتنی ئەو

گەلانــە کردۆتــەوە لــەپێناو ئازادیــدا. ئەفســانەی کــاوەی ئاســنگەر و "بەرخودانی سێسەد ساڵە"ی بەناوبانگی ماد و ئورارتوویـیەکان بەرهـەمی ئەم قۆناخەیە. گرنگترینیشیان ڕێگایان لـەپێش سـەردەمێک کردۆتـەوە کـە لەمێژوودا بەقۆناخی ژیری(٦٠٠ـ ٣٠٠ پ.ز) ناو دەبرێت. لـەم قۆناخـەدا کـە دەتـوانین بـەقۆناخی دانـاییش نـاودێری بکـەین بـۆ شـیکارکردنی ئـەو کارەسـاتە گـەورەی ئاشـووریەکان گـەلانیان تـووش کـردووە پێویسـتی هزراندنی مەزن سەریهەڵداوە. ڕاپەڕینی هـزر و ویـژدان هێـزی ئافرێنـەری ئـەو قۆناخـەیـە. ئـەو سـەردەمەی کـە لەناوەنـددا زەردەشـت ڕۆڵـی تێـدا دەبینــی، لەڕۆژهــەڵات بـودا و کۆنفۆشـیۆس لــە هیندسـتان و چـین نوێنەرایـەتیان دەکرد(سـەدەی شەشـەمی پ.ز) لـەڕۆژئاواش لای گریکـەکان سوقرات نوێنەرایەتی دەکرد. لەپاڵ توندوتیژی بێ سنوور و سووکایەتی پێکـردن تەنگـەژەی مـەزن زەمینـەی بـاڵگرتنی ویـژدان و هـزریش ئامـادە دەکات.

هەژموونگەرایی ئاشووری کە لەئاکامی ڕێکەوتنی نێوان میـدیا و بابـل لەگۆڕنرا دوای قۆناخێکی کورتی بابل و میدیا(٦٠٠ـ ٥٥٠ پ.ز) جێگای خـۆی بۆ خانەدانی پـارس بەجێهێشت(٥٥٠ـ ٣٣٠ پ.ز). بـاس لـەوە دەکرێـت کـە لەچارەســـەرکردنی کێشـــەکان پارســـەکان ڕێبـــازێکی پێچەوانـــەی ئاشووریەکانیان پەیڕەوکردووە. لەلایەنی دیالێکتیکیشـەوە دەشـێت ڕاسـت بێت. لێبووردەیی، ئازادی کلتووری بـۆ گـەلان بـەبێ جیـاوازی و عەدالـەت لەبەڕێوەبەرایەتیدا ئـەو تایبەتمەندییـە ئەرێنیانـەن کـە پـەیڕەوی گوتـەی ڕاست لەخۆوەی دەگرێت. بەم لایەنانەوە دەتوانرێت بگوترێت کـە شـێوازی چارەسەری پارسەکان لەلایـەن گـەلانی ڕۆهـەڵاتی ناوینـەوە وەک ئـەهوەن ئەلشەر پێشوازی لێکراوە. بەرفراوانترین هەژموونگەرایی مێژوو ئاواکراوە. لەڕۆژهەڵاتەوە تا هیندسـتان لـەرۆژئاواش تـا مەکـەدۆنیا درێـژ بوویـەوە. تەنیا چین و کۆماری ڕۆمـا لـەدەرەوەی مانـەوە. هەرچییـەک بێـت دیسـان هێزێکــی شارســتانی بــوو. لەماوەیــەکی کورتــدا کاریگــەری ناکۆکییــە ســەرەکیەکەی بــەدەر کــەوت و تەنگەژەکــەی قوڵدەبوویــەوە. لــەناوەوە

پێکدادانە دژوارەکانی ناو خانەدان، لەدەرەوەش پەلاماری قەبیلەکان هێدی هێدی کۆتایی پێدەهێنا.

برپرەی پشتی هێزەکانی ئەسکەندەریش ڕەسەنەکانی قەبیلە بوون. شمشێری ئەسکەندەر بیانوو بوو. بەپێچەوانەی مەزندەکان لەشەڕڤانی و جەنگاوەرێتی مەزنی ئەسکەندەر زیاتر دارزانی کۆتایی بەهەژموونگەرایی پارس هێنا. سەردەمی هێلینزم(٣٠٠ پ.ز- ٣٠٠ زایینی) لەقۆناخێکی نزیکەی ٥٠٠ ساڵ بوو بەسەنتێزێکی ڕاستەقینەی ڕۆژهەڵات - ڕۆژئاوا. کاتێک هێلینیەکان بەداهێنانە ڕۆژئاواییەکان وەڵامی داهێنانە ڕۆژهەڵاتیەکانی پارسیان دایەوە، سەنتێزێکی مەزن لەمێژووی مرۆڤایەتیدا هاتە ئاراوە. شارستانی گریک (٦٠٠- ٣٠٠ پ.ز) بەم پرۆسەیە کاریگەر بووە و لەمیانەی هێلینزمەوە قەڵەمبازیەکی گەورەی ئەنجام داوە. هەرچەندە ڕۆما هەژموونی سیاسی و سەربازی بێت بەڵام هێلینیەکان نوێنەرایەتی پێشکەوتنی کلتوورییان کردووە. خانەوادەکانی پارت و ساسانی بەردەوامی پارسەکان لەبواری مێژوویدا کۆمەکێکی کلتوورییان جێگای باس نییە. شەڕی هەژموونگەراییان لەگەڵ ڕۆما، جارێکی دیکە لەکۆمەڵگای خۆرهەڵاتی ناویندا ڕێگای لەپێش لێگەڕین و بەرخودانی مەزن کردۆتەوە. کریستیان و مانیزم وەک ئەنجامێکی ئەم لێگەڕینانە سەریان هەڵداوە. دەرکەوتنی ئیسلامیش بەردەوامی ئەو قۆناخەیە.

قۆناخی هەژموونگەرایی ڕۆما هەنگاوێکی دیکە سیستەمی شارستانی بەرەو پێشەوە بردووە. تا نیمچە دوورگەی ئینگیلتەرا بەشێکی زۆری ئەوروپا بۆیەکەمین جار ئاشنای شارستانی بوون. بۆ بەشی ئەفریقیا و خوارووی هیندستان تەشەنەی کردووە. نیمچە دوورگەی عەرەبی لەلایەن ساسانی، ڕۆماو حەبەشیەکانەوە خراوەتە ناو گەمارۆی شارستانیەوە. لەلایەکی دیکەوە چین یش بەشێوەکی قووڵ و بەرفراوان شارستانی خۆی بڵاو دەکاتەوە. ئاشکرایە لەگەڵ گەیشتن بە ساڵانی زایینی هێزەکانی شارستانی لەمیانەی ڕاکێشکردنی جڤاتە مرۆییەکان بۆ ناو تەنگەژە بونیادیەکانیان تەمەنی خۆیان درێژ کردۆتەوە، بەڵام نەیانتوانیوە چارەسەری مایندە فەراهەم بکەن. گووتە بەناو بانگەکەی بودا ئەم ڕاستی

یە دەردەبڕێت: "ئاگر بە ئاگر ناکوژێنرێتەوە"، گوزەرکردنی دەسەڵات لەڕێگای دەسەڵاتێکی زیاترەوە چارە نییە. لەفراوانکردنی ئەو ڕووبەرە دەچێت کە ئاگر سووتاندوویەتی. هەرەسهێنانی ڕۆما جارێکی دیکە ڕێساکەمان دەسەلمێنێت. ململانێ گەورەکانی نێوان ئیمپراتۆرەکان لەناوەوە( لەدوا قۆناخیدا سەردەمی فرە ئیمپراتۆری لە ئارادا بووە) کاتێک لەگەڵ هێرشە یەک بەدوای یەکەکانی سیستەمی قەبیلەکان بوون بە یەک ئیتر هەرەس دەست لێبەرنەدراو بوو. بزاوتە ویژدانییە گەورەکەی کریستیانیش ڕۆڵێکی گرنگی لەو رووخانەدا هەبووە..

ساسانیەکانیش لەناو قۆناخێکی هاوشێوەدا دەژین. کاتێک لەململانێ ناوخۆییەکان لەگەڵ بزاوتەکانی قەبیلە و ئایین دەبن بە یەک، دژواربوونی تەنگەژە و هەرەس دەست لێبەرنەدراوە. سەدەکانی ٤ و ٥ سەردەمی تەنگەژەی جیهانگیری سیستەمی شارستانی ناوەندی ( سیستەمی جیهانی)یە. لەماوەی چوار هەزار ساڵەی ڕابردوودا ژن وەک سۆزانیەکی تایبەت و گشتی بەتەواوی بەندکراوە، کراوە بەبابەتی موڵکایەتی تایبەت و گشتی، بەمجۆرەش کراوە بەئۆبژە و کاڵا. دوای ژنان توێژی پیشەکارانی شار و لادێییە جێنشینەکانیش وەک ژن بەکۆیلەکراون، لەپاڵ وەرگرتنی باج و سەرانەش کراون بەئامرازی بەدەستهێنانی"وەچە" بۆ دابینکردنی پێویستی شەڕەکانیان. جگە لە چینە بەئیلاهیکراوەکەی سەروو، سەرجەم ئەندامە کۆنترۆڵکراوەکانی کۆمەڵگای فەرمی مەرجی کۆیلایەتی گشتییان بەسەردا سەپێنراوە. لقەکانی چین، هیندستان، تەنانەت لقە تازەکانی ئەفریقیاو ئەمریکا لە ژێر سیستەمێکی وشکی"کاست"دایە. لێکەڕین و بەرخودانەکان بەرامبەر ئەم سیستەمە سەرهەڵدەدات.

هەروەکو تەنگەژە بونیادیەکانی سەرمایەداری سەرجەم تەنگەژەکانی شارستانی سێ خەسڵەتی سەرەکی سیستەم دەسەلمێنێت. یەکەمیان؛ لەگەڵ ئەوەی پەیوەندی ناوەند ـ کەنار لەگۆڕاندایە هەمیشەییە. دووەمیان؛ بەهۆی قازانجەوە بەردەوام پێکدادان و کێبڕکێ لەنێوان هێزەکانی سیستەم لەئارادایە. سێیەمیان؛ وەک دەرەنجامی هەردوو خەسڵەتی پێشووتر سیستەم ناچارە لەناو قۆناخی هەڵکشان ـ داکشانی بەردەوامی

تەنگەژەکاندا بژیت. وەک ئەنجامێکی ئاسایی هەرسێ خەسڵەتیش سیستەم بەڕێوەبەرایەتییەکی خاوەن کارەکتەری هەژموونگەرایی دەکات بەناچارییەک. شارستانیەکان بەبێ هەژموونگەرایی بەڕێوە ناچن. ئەو چوار خەسڵەتە سەرەکییانە هەر لەسەرەتاوە شارستانیەکان ناچاری جیهانیبوون دەکات. ئەم واقیعەش سەرچاوەی بۆ سروشتی پاوانەکانی دەسەڵات و سەرمایە دەگەڕێتەوە. چەندە زیاتر لەبوارەکانی ئاسۆیی و ستوونی بڵاو ببنەوە، ئەوا هێز و قازانجیش کار لەیەکتری دەکەن و بەو ڕادەیە گەورە دەبن. مسۆگەرە کە ڕایەڵەیەک لەنێوانیاندا هەیە. ئەگەر لەڕۆژی ئەمڕۆماندا شارستانی ژیانی گەمارۆ داوە (سەرجەم پێدراوە کۆمەڵناسیەکان ئەم واقیعە دەسەلمێنن)، تەنگەژەش تەنیا بەمرۆڤ سنووردار نەماوە و بونیادی ژینگەشی خستۆتە ژێر هەڕەشە و مەترسییەوە، هۆکاری ڕاستەقینەی بۆ خەسڵەتی وێرانکاری و دڕندایەتیەکەی دەگەڕێتەوە کە هەر لەسەرەتاوە لەبونیادەکەی دایە. لەناوەڕۆکدا ڕووداوەکان ئاشکرابوونی بوویەرەکەیە.

## ب . بەرخودانەکانی قەبیلە، خێڵ و قەوم (ئەتنیک)

سەرباری ئەوەی سیستەمی جیهان لەمیانەی تیۆر و گریمانەی ئایدیۆلۆژییەوە بانگەشەی زۆری بۆ دەکات بەڵام سیستەم وەک پێویستیەکی فەرمانی ئیلاهی ئاوا نەبووە و بەڕێوە نەچووە. ئاشکرایە کە سیستەم و فەرمانی ئیلاهی (سەرباری هەوڵە بەرفراوانەکانی دەمامک کردن و پەردەپۆش کردنی بەڵام مانای"فەرمان" و "ستەم" زۆر ئاشکرایە) نوێنەرایەتی فەرمان و ڕێساکانی چینی بەڕێوەبەرایەتی (بەڕێوەبەر+سەرباز+ڕاهیب) دەکات کە لەسەر زێدە بەرهەم و بەهاکانی کۆمەڵگا ئاوا بووە. سەرباری ئەو هەژموونگەراییە ئایدیۆلۆژیەی هەزاران ساڵە بەوردە کاری و دووبارە کردنەوەی بەردەوامەوە هەوڵ دەدرێت وەک حەقیقەت پێویستیەکی ئیلاهی دەرخوادی کۆمەڵگ ـ لەسەرووتریانەوە تا کۆیلەی هەرە خوارەوە ـ بدرێت، بەڵام ستەم، زۆرداری و تاڵان نەیتوانیوە بەتەواوی خۆی بشارێتەوە و بسەپێنێت. ڕاپەڕینی ئەو قەوم و خێڵانە

رووپداوە کە لەدەرەوەی سیستەم ماونەتەوە، لەناو سیستەمی قەبیلەدا دەژین و بەردەوام رووبەرووی پەلامارە بەردەوامەکانی بەکۆیلەکردن و تالان بوونەتەوە، هەر وەک و سیستەمی شارستانی ئەویش بەپێی قۆناخ هەمیشەیی بووە. وەک پروپاگەندەیەک سیستەم ئەو بزووتنەوانەی بە "بەربەر" ناو بردووە. لەبەر ئەو هۆکارانەی روونم کردنەوە پێچەوانەکەی راستە، سیستەمی شارستانی"ئامێرێکی هۆفێتی"یە. ئەوەی ناخوازێت لە ژیانی مرۆییانە داببرێت سیستەمی قەبیلە ـ کۆمۆنە.

بەتایبەتی پێویستە ئاماژە بەم خاڵە بکرێت وەک چۆن هەندێک گەل توانیویانە لەبواری مێژوویدا خۆیان بنوێنن، بەڵام زۆربەی زۆریان لەمەدا سەرنەکەوتوون. لەبنەرەتدا پێویست بوو مێژوو بەم جۆرە نەبێت کە نووسراوە. دڵنیام کە دیرۆکی راستەقینە مێژووی ئەوانەیە کە خۆیان نەنواندووەو نەنووسیوە. رەنج، بەرخودان، داهێنان و دۆزینەوەکانی زۆربەی زۆرینەی کۆمەڵگا بەردەوام شاردراونەتەوە. بەمەبەست و بێ مەبەستیش بەم جۆرە بووە. دەستکەوتە کۆمەڵایەتیەکانیش دەستی بەسەردا گیراوە. خاوەنە راستەقینەکانیان نەناسراون، نەخۆیان نووسیویانە، نە لەبارەیانەوە نووسراوە. بەتایبەتیش سەرباری ئەوەی داهێنان و دۆزینەوەکانی ژنان، جووتیار، شوانکار و پیشەکاران زۆربەی زۆری داهێنانەکان پێکدێنن، بەڵام بەهیچ جۆرێک مێژوو ئەو مافەی بەخاوەنەکانیان نەداوەتەوە. کاتێک مێخواوەند "ئینانا" بانگی پادشا ـــ خوداوەندەکان دەکات و یەکە یەکەی داهێنانەکان دەژمێرێت و دەڵێت "ئەی ئێوە ١٠٤ ما (داهێنان، دۆزینەوە و رێساکۆمەڵایەتیەکان)کانی منتان نەدزی؟" لەوانەیە بەبێ مانایی و لاواز بەرگوێمان کەوێت (چونکە گوێچکەکانمان وەها فێرکراوە) بەڵام داستانی ئینانا داستانی هەرە دوایی باسکردنی مێژووی راستەقینەیە. لەداستانی دوومووزی و ئەنکیمدۆ[٢]دا

[٢] داستانی دوموزیو ئەنکیمدۆ: ئەنکیمدۆ نێرخوداوەندی جووتیاریو کشتوکاڵە. دوموزیش نێرخوداوەندی چاکەو وەچە خستنەوەیە. داستانەکە باس لە ناکۆکی نێوانیان دەکات؛ بە تایبەتیش لە مەسەلەی هاوسەرگیری لەگەڵ مێخوداوەند ئینانا. شەرەکەنو لە ئەنجامدا دوموزی شوانکارە دەمرێت. دواتر بۆ دۆزەخ شۆر دەکرێتەوە، ئینانای

کاتێک دونیای جوتیار و شوانکارە لەڕێگای ئەم جۆرە داستانەوە ئاماژە بەگرنگی ڕەنج، دۆزینەوە و داهێنانەکانی خۆیان دەکەن، ئەو کاتە مێژوو زیاتر نزیک بەڕاستیەکان بوو. مێژووە نەتەوەییە پۆزیتیڤیستەکانی ڕۆژگاری ئەمڕۆمان سەرباری سەرجەم پەیڤە زانستیەکانیان بەڵام نموونەی میتافیزیای خراپن کە زۆر لەحەقیقەت دوورن. ئەگەر سۆسیۆلۆژیای پۆزیتیڤیست ـــ زانستگەرایی ناوەندێتی ئەوروپا لەگەڵ میتۆلۆژیای سەردەمی سۆمەر بەراورد بکەین، لێکۆڵینەوە و ڕاڤەیان لەبارەوە بکەین ئەوا دەبینرێت کە میتۆلۆژیای سۆمەری زیاتر نزیک بەحەقیقەتی کۆمەڵگایە. بەلایەنی کەمەوە باوەڕی و ئەقلانیەتی من پێشبینی ئەم ئەنجامە دەکات. با سەیرێکی نموونە بەرجەستەکانی خودی بەرخودانە مێژووییەکان بکەین.

## أ . بەرخودانی قەبیلە بەبنەچە سامیەکان و دژە هێرشەکانیان

هەندێک بەڵگەی زانستی دەیسەلمێنن کە شەش هەزار ساڵ بەر لەئێستا هەندێک ناوچەی سەوز و باراناوی لەبیابانی گەورە و ڕۆژهەڵاتی نیمچە دوورگەی عەرەبیدا لەئارادا بوون. باسی ئەوەمان کردبوو کە سیستەمێکی بەرفراوانی بەناوی سەمیتیک بەشێوەیەکی تێکەڵ لەگەڵ ئەم زەمینە ژیۆبایۆلۆژیە پەرەی سەندووە. لەساڵانی ٤٠٠٠ پێش زایین بەدواوە ئەم سیستەمە دووچاری فشارێکی دوولایەنە هات. ئەم دوو فاکتەرە گرنگەی فشاریش دەستپێکردنی قۆناخی بیابانبوون و وشکە ساڵی خۆزایی و هەڵکشانی شارستانی میسر و سۆمەر بوون. لەم سۆنگەیەوە کۆچی قەبیلەکان لەناوەوە بۆ ناوچە مێرگاویەکان، لەدەرەوەش کۆچی مێژوویی بەرەو ناوچە سەوز و باراناویەکانی دەکرد بە ناچارییەک. مێژوو بەبەڵگەوە باس لەم بزاوتانەی کۆچبەری دەکات. لەکاتێکدا میسریەکان ئەم مرۆڤانە بە "ئابیرۆ(مرۆڤە تۆزاویەکان)" (بەواتای تۆزاوی و چڵکن بەکارهێنراوە) ناودێر دەکەن، هەرچی سۆمەریەکانن بە "ئامۆریتەکان"

---

پاکیزە بۆ رزگارکردنی بە هانایەوە دەچێت. وەک ڕێزگرتنێک بۆ دوموزی ساڵنامەی ئەکەدی شوێنی بە مانگی تەمووز داوە.

ناویان دەبەن کە یان هەمان مانا دەبەخشێت یان مانای 'مەترسیدارەکان'ی هەیە. بەشێکی گرنگیان دەکەن بەکۆیلە و خزمەتکاری خۆیان. هەروەکو لە بەکۆیلە کردنی رەشپێستەکاندا بینراوە، ئەو دۆخە بەشێوەیەکی دلڕەقۆو بێرەحمانە تا ڕۆژی ئەمڕۆمان هاتووە و بەکاردەهێنرێت.

ئایا سیستەمی کۆیلایەتی شەش هەزار ساڵە لەئاکامی چ جۆرە ئێش و ئازارێک بەڕێوە چوو؟ کێ و چۆن لەئاکامەکانی سودمەند بوون؟ بەهەر حاڵ تا وەڵامی ئەو پرسیارانە نەدرێتەوە مێژووی ڕاستەقینە نانووسرێتەوە. لەبەر ئەوەی شوێنگەی میسر بۆ بەرگری گونجاو تر بوو، دەیتوانی بەشێوەیەکی باشتر خۆی بەرامبەر کۆچ و پەلامارەکانی ئەو قەبیلانە بپارێزێت. بەڵام سۆمەریەکان بەرامبەر بەرخودان و پەلاماری ئەمانە لەدۆخێکی بێ بەرگریدا بوون. وەک دەبینین بەردەوامبوونی تەوژمی ئەو بەرخودان و پەلامارانە لەساڵانی ١٤٠٠پ.ز ئەنجامگیر بووە. دوای تێکشکانی بەرخودانی سۆمەریەکان لەلایەن بەرخودان وپەلاماری ئەو قەبیلەیەی لەمێژوودا بەخانەدانی ئەکەدی ناودەبرێن، سیستەمی دەسەڵاتیان گرتە دەست. دەشێت قۆناخی ئەم خانەدانەی یەکەم ئیمپراتۆری مێژوو سەرجۆن دایمەزراندووە و لەساڵانی ٢٣٥٠ــ ٢١٥٠ حکومڕانی کردووە دەتوانین وەک ڕژێمێکی 'ئاشووری ـ بەرایی' تاوتوێ بکرێت. ڕێسایەک لەناسنامەی سەرجۆن پێکدێت. ئەمەش ڕاستینەی ئەو ڕێسایەیە؛ لەهەلومەرجی شارستانیدا کاتێک سەرۆک قەبیلەکان دەرفەت ببینن بۆ زۆردارێک دەگۆڕێن کە هاوتای نەبینراوە. ئەو ناخۆشیانەی کە پێشتر بینیویانە، چاوبرسێتیان و سەرخۆش بوونیان لەسەر تەختی دەسەڵات ڕۆڵی لەم دۆخەدا هەیە.

لەدەرەنجامی دووەمین شەپۆلی قەبیلەی سەمیتیک قۆناخەکانی بابل و ئاشوور دێتە ئاراوە. لەمیانەی پادشا نیمچە خوداوەندەکانیانەوە بەناوبانگن کە هیچیان لە سەرجۆن کەمتر نەبووە. ڕۆڵێکی مێژوویيان هەبووە لەپەرەسەندنی دامەزراوەکانی دەسەڵات و بازرگانیدا. بێگومان لەپەرەسەندنی دامەزراوی کۆیلایەتیدا ڕۆڵیان لەخانەدانە ڕەسەنەکانی سۆمەر و میسر کەمتر بووە. هیچ گومانێک لەوەدا نییە کە بابل و ئاشوور

ڕۆڵێکی جیهانییان لەدامەزراوەبوونی کلاسیکی سەرکوتکردن و چەوسانەوەدا هەبووە. ئەو کۆمەکەشیان لەهی گریک ـ ڕۆماییەکان کەمتر نەبووە، ئاماژەکردن بەم خاڵەش بایەخێکی زۆری لەنووسینی مێژوویەکی ڕاستدا هەیە. لەکاتێکدا لەسەردەمی ئەکەد، بابل و ئاشوور زمان و کلتووری سۆمەری پەسەند دەکەن و دەیخەنە پلەی دووەمەوە، هەردوو زمانی ئەکەدی و ئارامی بوونەتە زمانی فەرمی قۆناخ. بەتایبەتیش زمانی ئارامی بەو سیفەتەی زمانی لاتینی خۆرهەڵاتی ناوینە تا زمانی عەرەبی بوو بەزمانی شارستانی فەرمی هەر بەکارهێنراوە. بەهۆی بەبیرهێنانەوەی پاوانەکانی دەسەڵات و بازرگانی پشتیەوە ئەم پێگەی گرنگ و بایەخدارە. هەروەها زمانی هاوبەشی ئایدیۆلۆژیا (ئیلاهیاتە) یە.

سێیەمین گەورە شەپۆلی جەنگاوەرێتی قەبیلەی سەمیتیک (سامی) بەناوی عەرەبەوە بەڕێوە دەبرێت. ئەو بەرخودان و پەلامارە ئانتی ـ شارستانیانەی نزیکەی سالآنی ٥٠٠ پ.ز بەر لەئیسلام کە خۆیان بەناسنامەی عەرەبیەوە دەنواند، لەڕێگەی ئیسلامەوە لەئاستی جیهانەوە ڕۆڵی دەگێڕا. توانیویانە لەتەواوی باکوری ئەفریقیا، دەوروبەری بیابانی گەورەوە تا دەگاتە نیمچە دوورگەی عەرەب و بنارەکانی زنجیرە شاخەکانی زاگرۆس ـ تۆرۆس بڵاوببنەوە. بزاوتێکی زۆر مەزنی قەبیلەیە. دوو هەزارو پێنج سەد ساڵە بەهەمان خێرایی لەهەمان جوگرافیادا بەردەوامی بە هەبوون و گۆڕانکاری خۆی دەدات. بەتایبەتیش قۆناخو پرۆسەی وەرچەرخانی عروبە شایستەی لێتوێژینەوەیە. دامەزراوەبوونی شێخایەتی، ئەمیرێتیو سوڵتانێتی لەچینی سەروودا، سەبارەت بەتێکەیشتنی دەوڵەت و دەسەڵات فێرکەرو بایەخدارە. چاوگی زاراوەکانی شێخایەتی، ئەمیرێتی، سوڵتانێتی، دەسەڵات و دەوڵەت لەزمانی عەرەبیەوە هاتووە. بۆ نموونە مانای وشەی دەوڵەت لەپەیڤێکەوە هاتووە بەو شەوە دەگوترێت کە لەگەڵ ژنێکی بەغەنیمەت هێنراو بەسەر دەبرێت. وەک وشەش پەیوەندی دەوڵەت بەدەستدرێژی و کۆیلەکردنەوە سەیرە. تەواوی ئەو زاراوە و بیردۆزانەی لەزمانی عەرەبیدا باس لەدەسەڵات

دەکەن ماناکانیان ڕووت و ئاشکرایە، ئاماژەن بۆ ڕابواردن و کات بەسەربردن.

لەعەهدی قەدیم (تەورات) وردەکاری لیستەی قەبیلە سەمیتیکەکان پیشکەش دەکرێت. بەتایبەتیش باسی وردەکاری سەرگوزەشتەی قەبیلەی عیبرانی دەکرێت. ئەم بابەتە لەبەشی ئایینە تاکخوداییەکاندا بەشێوەیەکی بەرفراوان شیکاردەکرێت، بەڵام ئەو ئەنجامەی پێویستە لەو بەشەدا هەڵبهێنجرێت؛ ڕووبەڕووی تابلۆیەکی ئاڵۆزی قەبیلەی سەمیتیکین. بۆ نموونە کەنعانیەکان لقێکن. لەوانەیە ئەرمەنیەکانیش لقێکی دیکە بن.

'بەدەویەکان' چینی خوارووی خێڵ و قەبیلەکانی سەمیتیک پێکدێنن. دەشێت وەک عەرەبە لادێییەکان ڕاڤە بکرێن کە لەمێرگ و بیابانەکان لەدۆخێکی هەژاریدا دەژین. بەدەوێتی پۆلێنبەندیەکە بەئەندازەی لایەنی قەبیلەگەری مانای چینایەتی و کۆمەڵایەتیشی هەیە. خاوەن مێژوویەکی کۆنو ناسنامەیەکی کۆمەڵایەتی تایبەت بەخۆیەتی. لەم چوارچێوەیەدا بەدەوێتی عەرەبێتیەکی جیاوازترە. وەک تورکمانێتی لای تورکەکان و کرمانجێتی کوردان مانایەکی کۆمەڵایەتی و کلتووری هەیە. عەرەبەکان بەچینی سەرەوەو خوارەوە قەومێکن سیستەمێکی قەبیلەیان هەیە لەدێرزەمانەوە تا ڕۆژی ئەمڕۆمان کاریگەریان لەمێژووی جیهان کردووەو سەرقاڵیشی کردووە لەسەرووشیانەوە کاریگەری لەسەر خۆرهەڵاتی ناوین هەبووە. گۆڕان و وەرچەرخانیان بەهەموو خێراییەوە بەردەوامە. ئەگەر کاریگەری پێکدادانەکانی نێوان عەرەب ـ ئیسرائیل (کە هەردووکیان سامین) لەسەر جیهانو خۆرهەڵاتی ناوین ڕەچاو بکرێت ئەو کاتە دەرکی پێدەکرێت کە واقیعی ئاماژە پێکراو چەندە گرنگ و جێی بایەخە. تا گۆڕان و وەچەرخانەکانی دیاردەی عەرەب دەرکی پێنەکرێت، ئەوا تێگەیشتنێکی تەواو بۆ خۆرهەڵاتی ناوین و جیهان زەحمەت و ناتەواو دەبێت.

بەگشتی تاوتوێکردنی لێکەڕین و بەرخودانی قەوم و قەبیلە سەمیتیکەکان بەتایبەتیش عەرەبەکان کە لەکامە ماناداا ئانتی ـ شارستانی یان لەناو شارستانیدان بابەتێکی بەگرفت و کێشەیە. جیاکردنەوەی ئەتنیکی و ئایینی لەیەکتری کێشەیەکی زۆر جدییە. هەمان کێشەی

جیاکردنـەوە لەقـەوم و قەبیلـەکانی دیکـەش جێگـای باسـە. بـەلام لای عەرەبـەکان کێشـەکە زۆر ئـالۆزترە. جێگـرتن لـەریزی سیسـتەم یـاخود بەرهەلسـتکاران بـەردەوام لـەرۆژەڤی تـەواوی بزووتنـەوە هاوشـێوەکانی جیهاندا بووە. هەم لە مێژوو هەم لەرۆژی ئەمرۆماندا ئەم کێشە بـەردەوام هەبووە. بزاوتی قەوم و قەبیلـەکانی سـەمیتیک و عـەرەب خـاوەن هـەردوو رەهەنـدن، ئەمـەش گرنگـە. پەیوەنـدی و ناکۆکیـەکی دیـالیکتیکی لـەنێوان لایەنی شارسـتانی و ئـانتی ـ شارسـتانی قـەوم و قەبیلـەکان لەئارادایـە و لەناو ململانێدان. لەکاتێکدا ئەتنیک زیـاتر بەلایـەنی ئـانتی ـ شارسـتانی خـۆی دەنوێنێـت، بـەلام لایـەنی ئـایینی زیـاتر خـۆی بەلایـەنی شارسـتانیگەرایی پیشـاندەدات. بـەلام دەتوانرێـت بگوترێـت کـە مـەیلی شارستانیگەرایی و ئانتی ـ شارسـتانی لـەناوەوە و نێوان هـەردوو جۆر بزووتنـەوەدا بـۆ وەچـەرخان و گـۆران کـراوەن. راڤـەکارە نـەریتی و مۆدێرنەکان باسێکی زۆر ئالۆزیان لەنێوان ئەم دوو لایەنەدا پێشخستووە. ئالۆزی گووتە و پیشاننەدانی تەندروستانەی دیاردەکان لەبواری کرداریـدا ئەنجامی زۆر چەوت لەگەل خۆیدا دێنێت. ئەگەر مرۆڤ پەسەندی بکات کـە گووتـە = لەپێشـینەیی کـردار لەگـەل خۆیـدا دێنێـت، ئـەو کاتـە مایـەی تێگەیشتن دەبێت کە گونجاو بوونی باسەکانمان لەگەل بابەت و کێشـەکان چەندە گرنگ و بایەخدارە.

## ب . بەرخودانی هۆریەکان و هێرشەکانیان

لەو باوەرەدام کە وشەکانی ئاری، ئورو هۆری لـەبواری ئەتمۆلۆژیـدا رەگەکەیان بۆ زمانی سۆمەری دەگەرێتەوە و مانـای گروپـی شـاخی یـاخود کوێستانی دەبەخشێت. لەوانەیە بـەهۆی ئـەو جوگرافیایـەی تێیـدا دەژیـان دراوسێی باکوری رۆژهەلاتی سۆمەریەکان بـوون بۆیـە بەگـەلی "شـاخ ـ گرد"ناویـان بـردوون. چونکـە تـا ئێسـتاش کوردانی لەهـەمان جوگرافیـادا دەژین بەچەند نازناوێک بانگ دەکرێن کەمانـای "گەلی شاخی" دەبەخشێت. گووتەی 'کارت ـ کـورد"یش یەکێکـە لـەم نەریتانـە. هـەر بۆیـەش گووتـەی "گەلی شاخی" مایەی تێگەیشتنە.

هەرچەنـده لـەبواری ئەتمۆلۆژیـدا هۆریـەکان بخرێنـە نـاو گروپـی قەبیلەکانی هیندۆ- ئەوروپی بەڵام لەتەواوی ئەم گروپە زیاتر خەسڵەتێکی لۆکاڵیان هەیە. بەگوێرەی شرۆڤەی من هەمان ئەو جڤاتەن کە لەسەردەمی کۆتاییهاتنی چوارەمین قۆناخی سەهۆڵبەندانەوە لەهەمان ناوچەدا دەژیـن و ڕۆڵـی پێشـەنگایەتییان لەشۆڕشـی نیولیتیکـدا بینیـوە. سـەرجەم لێتوێژینـــەوە ژیۆبایۆلۆژیـــک، ئارکۆلۆژیـــک، ئـــەنترۆپۆلۆژی و ئەتمۆلۆژیەکان لەو بارەوە هاوفیکرن کە ئەو گەلـە (کورد)ی تـا ئێستا لەهەمان ناوچەدا دەژیت خاوەن کارەکتەرێکی زۆر کۆن و خۆجێییە.

زانست دەست نیشانی کردووە کە جڤاتـەکانی سـەردەمی نیولیتیک شەش هەزار ساڵ بەر لەئێستا لەناوەندی هیلالـی زێڕین، پـەنجابو نیـل فاکتەرە پێویستەکانی کلتووری ماددیو مەعنەوی پێشکەوتنی شارستانییان پێگەیانـدووە. پێشـتر ئامـاژەم پێکردبـوو کـە گـۆردن شـیلد ئـەم قۆناخـە پێگەیشتووەی نیولیتیکی بەئەوروپای دوای سەدەی شـازدەهەم دەچوێنێت. چەندین لێکۆڵینەوەی جیاواز بەهەمان ئـەنجام گەیشتوون. شـوێنپەنجەی کلتووری ئەلعوبێدیش لـە ناوچـەدا بـۆ سـاڵانی ٤٠٠٠ پ.ز درێـژ دەبێتـەوە. شـوێنپەنجەی کلتـووری ئەلعوبێـد ـــ کلتـوری میزۆبۆتامیـای خوارووــ پیشانی دەدات کە لەو کاتەوە ئاڵوگۆڕیان لەگەڵ کلتووری ناوچە بەردەوام بووە. لەوەش گرنگتر پاشماوەی قۆناخەکانی ئوروک، ئورو ئاشوور زۆر زیـاترن، لــە کـەنارەکانی دیجلـەو فـورات و حـەوزی نێوانیانـدا بزاوتـە بەربڵاوەکانی کۆلۆنی ئـەو قۆناخـەمان بـەرچاو دەکـەوێت. لـەو بارەیـەوە پاشـماوە ئارکۆلۆژیـەکان پێدراوی زۆر بەرجەسـتەمان پێشکەش دەکـات. لەدۆخێکی وەهادا بەگوێرەی ڕەوشی دەستنیشان کراو شـەش هـەزار سـاڵە مەترسی هەڕەشـەو پـەیڕەوکردنی کۆلـۆنی لەسـەر ناوچـەو گەلەکـەی لـە ئارادایـە. دەشـێت بـوونی هەڕەشـەی هاوشێوە لەلایەنـەکانی دیکەشـەوە جێگـەی بـاس بێت. بەتایبـەتیش ڕووبـەڕووی ئـەو هەوڵانـەی داگیرکـاری دەبێتـەوە کـە لەڕێگـەی قەفقاسـیاوە بـەردەوامنو پـەرە دەسـەنن. ئـەو ناوچانەی شۆڕشی نیولیتیکی تێدا پێشکەوت لەبـەر ئـەوەی ناوچـەی زۆر بەپیتو کۆن بوون هەروەکو کۆچەکانی ڕۆژگاری ئەمڕۆمان بەرەو ئەمریکاو

یەکێتی ئەوروپا، لەهەر لایەکەوە جموجۆلی کۆچی دانیشتوان بەرەو ناوچە چاوەڕوان کراوە. ناوچە بەپیت و دەوڵەمەندەکان بەردەوام سەرنج ڕاکێش بوون. لەم لایەنەوە هیلالی بەپیت تایبەتمەندێتی زۆر سەرنجڕاکێشی هەیە.

دەشێت دۆخێکی پێچەوانەش جێگای باس بووبێت. بەهۆی زیادبوونی ژمارەی دانیشتوان دوای قۆناخی پێگەیشتنی سیستەم دەشێت ئیتر ناوچە تەسک بووبێتەوە. چاوەڕوانی کۆچبەری بۆ زۆر شوێن دەکرێت لەسەرووشیانەوە بۆ ئەو ناوچانەی نزیکن، دراوسێن یاخود بەپیتن. تۆمارە مێژووییەکان لەم بارەشەوە هەندێک پێدراومان پێشکەش دەکەن. پیشانمان دەدەن کە هەر لەقۆناخی کاملبوونەوە(٧٠٠٠ـ٤٠٠٠ پ.ز) کلتووری ناوچەکە لەبواری کلتووری (بێ مرۆڤ)و جەستەیی (مرۆڤ) بەگوێرەی قۆناخی خۆی بەشێوەیەکی خێرا لەهەر لایەکی جیهاندا بلاوبۆتەوە. ڕاستیەکی زانستییە هەرچەندە بەتۆزێک درەنگ کەوتنیشەوە بێت بەلام لەو مێژووە بەدواوە کە ئەم بەها و کایە کلتووریانە لەمیانەی هەردوو ڕێگاوە لەناوەوەی ئەوروپا تا هیندستان (ڕاستینەی گروپە زمانی هیندۆـ ئەوروپی ئەمە دەسەلمێنێت) لەمیسرەوە تا دەگاتە سۆمەر بلاوبوونەتەوە. لەدۆخێکی پێچەوانەدا وشەکانی چاخی بەردینی نوێی گەلێکی خۆجێیی لە هیندستان و ئەوروپادا چی دەکات! هەروەها ناتوانرێت وەلامی ئەم پرسیارەش بدرێتەوە ئەی بۆچی شوێنپەنجەی شارستانی لەخاکە لیتاویەکانی نزیک بەدەریا لە نزیک نیل، فورات، دیجلە و پەنجاب نەدۆزرایەوە کە هەمان خاکی بەپیتیان هەیە. بەڕادەی دەستەواژەی شارستانی ناوەندی دەستەواژەی"سەردەمی کشتوکالی ناوەندی"یش بۆ خوێندنەوەو نووسینەوەی ڕاست و تەندروستانەی مێژووی مرۆڤایەتی پێویستە.

لەبنەڕەتدا میراسی دوازدە هەزار ساڵەی پەرستگای گۆبەکلی تەپەی ئورفا هەرشتێک لەبارەی خۆجێیەتی(ئۆتانتیک) بوونی ئەم گەلە روون دەکاتەوە. گەلی ناوچەکە ــ پشت بە سیستەمی قەبیلە دەبەستێت ــ خاوەنی کلتوورێکی دێرین و زۆر پێشکەوتووە. بۆچوونی ئەو

شوێنەوارناسانەی خۆیان بەشداری هەڵکۆڵینەکانیان کردووە، سەرلەنوێ نووسینەوەی مێژوو پێویست دەبینن. بەبایەخەوە ئاماژەی پێدەکەم؛ لێرەدا لەناو هەڵوێستێکی شۆڤێنیانەدا نیم؛ ئەوەی جێگای باسە، نووسینی مێژوویەکی راستە بۆ تەواوی مرۆڤایەتی. ڕاستیەکی حاشا هەڵنەگرە کە لەهەموو شتێک زیاتر نووسینی مێژوویەکی ڕاست بۆ مرۆڤایەتی پێویستە. چونکە مێژووی ڕاست مرۆڤی ڕاستە، مرۆڤی ڕاستیش ژیانی ڕاستە.

دەتوانین تێبینی بکەین بەهۆی ئەو فشارەی لەسەریان زیادی دەکرد قەبیلە هۆریەکان لەقۆناخی ٤٠٠٠ـ٣٠٠٠پ.ز پەرەسەندنیان بەخۆیانەوە بینیو بونیادی خێڵایەتی گۆڕاون. بێگومان تێبینیەکانمان لەڕێگای تۆمارە مێژووییەکانەوەیە. لەم قۆناخەدا شوێنپەنجەکانی خێڵ دەبینین. بەڵگە نوسراوەکانی سۆمەر زیاتر باسی دراوسێکانی رۆژهەڵات دەکات. ئەگەر بەشێوەیەکی سنووردایش بێت لەبەشەکانی پێشوودا باسی ڕەچەڵەکی سۆمەریەکانم کردبوو. بەڕای شەخسی خۆم سۆمەریەکان سەنتێزێکی کلتووری پێشکەوتوون کە لەئەنجامی پەلهاوێشتنی کلتووری و جەستەیی هەندێک گروپی سامیشیان لەخۆ گرتووە. بەرگری لەم بۆچوونەی خۆم دەکەم. وەرچەرخانی هۆریەکان بۆ دۆخی خێڵایەتی بەڵگەی پێشکەوتنیانە لەبواری سیاسیشەوە. لەزۆربەی دۆخەکان خێڵ قۆناخێکی ناچاری پێویستی بەرگری و بەڕێوەبەرایەتی هاوبەشی قەبیلەکانە. مسۆگەرە کە زیادبوونی کێشەکانی ناوخۆ بەتایبەتیش زیادبوونی کێشە دەرەکیەکان خێڵایەتی خێراکردووە. قۆناخی ٣٠٠٠ـ٢٠٠٠ پ.ز پیشانیدەدات کە خێڵەکان هەنگاویان بۆ پێکهاتەیەکی لەجۆری کۆنفیدراسیۆن هاوێشتووە کە ڕایەڵەی نێوانیان خاوە. لەکلتووری سۆمەری(قۆناخی گۆدیا ـ گۆتی٢١٥٠ ـ ٢٠٥٠ پ.ز) و کلتووری ئەنادۆڵی ناوین ( ئەو نامەیەی لە هاربیل ی ئەنوم ـــ ناوچەی ئەلبستانی ئەمڕۆی تورکیا ـــ ەوە بۆ میرنشینی نیشالی ـ کولتەپە ـ نووسراوە)ی بەر لە هیتیتەکان دەبینرێت کە دەستەبژێری سیاسی پێکهاتوون. نووسراوەکان بەزمانی هۆریین.

لەبەڵگە دەستکەوتووەکانەوە دەرکی پێدەکرێت کە دەستەبژێرە هۆرییەکان هەم لەدۆخی بەرگری لەخۆکردن هەم لەپێگەی پەلهاوێشتندا

بوون. بەرامبەر بەهێرش و فشاری ئاشوورییەکان بەردەوام پێویستی بەبەرخودان دەبینێت. بوونی گانگایەکی دەوڵەمەندی کانزا و دار ڕێگا لەپێش پەلامارە بەردەوامەکانی پادشاکانی ئاشوور دەکاتەوە. لەدەرەنجامی ئەو فشارانەوە بەشێوەی دووبالّی گرنگ وەلام دەدرێتەوە. لەئەنادۆلّی ناوین کۆنفیدراسیۆنی هیتیت(١٦٥٠ــ ١٢٠٠ پ.ز) کە سەرەتا ناوەندەکەی نیشایە و دواتر دەبێت بەهاتووشاش، میتانیەکان (١٥٠٠ـ ١٢٥٠ پ.ز) کە واشوکانی ناوەندەکەیانە. زۆر بەدڵنیاییەوە دەتوانرێت بگووترێت کە هەڵمەتەکانی فشار، چەوسانەوە و کۆلۆنیکردن لەلایەن بازرگانە بابلیەکان بەتایبەتیش ئاشوورییەکان ڕێگای لەپێش ئەم کۆنفیدراسیۆنانە کردەوە. دەشێت لەمیانەی داگیرکردنی بابل لەساڵی ١٥٩٦ پ.ز لەلایەن گەلانی ئەم دوو کۆنفیدراسیۆنەوە بەم ئەنجامە بگەین. بەگرنگیەوە ئاماژە بەم خاڵە دەکەم: لەڕێگای زاراوەسازی نەتەوەیی ڕۆژگاری ئەمڕۆمان ناتوانین پێکهاتە سیاسی و کۆمەڵایەتیەکانی چوار هەزار ساڵ بەر لەئێستا شرۆڤە بکەین. لەجیاتی دەستەوەستانو نەنووسینی هیچ شتێک، ئەوەی ئەنجامیدەدەین گووتنی چەند پەیڤێکە سەبارەت بەپێکهاتنی خەیاڵی مێژوویێک، پێویستە بەمجۆرە دەرک بەهەڵوێستمان بکرێت. چونکە بەجۆرێکی دیکە ناتوانین چەواشەکردنەکانی مێژوو و مەیلەکانی نکولّیکردن بشکێنین.

لەساڵانی ٢٠٠٠پ.ز هۆرییەکان بەو پێگەیە گەیشتوون ببنە خاوەنی ئەو ناوچانەی کە ئەمڕۆ کوردان تێیدا دەژین یاخود حکومڕانی بکەن. بەتایبەتیش لەهەلکۆڵینی گردەکاندا دەبینین کە هەندێک جار کۆلۆنی سۆمەر، بابل و ئاشووریان وێرانکردووە و سوتاندوویانن. لەتەپۆلکەی ئورفا ـ بۆزۆوا ـ توتریشدا ئاشنای وارگەیەک دەبین شیمانە دەکرێت لەساڵانی ٢٠٠٠پ.ز کۆلۆنی بووە و سووتێنراوە. هەر کەسێک خەباتێکی ئاسایی ئەتمۆلۆژی بکات تێدەگات کە زمانی هۆری زمانی کوردی بەرابیە. شێوەزارەکانی دێرسیم، بینگۆلو زاگرۆس کە لەقووڵایی شاخەکاندا ماونەتەوە و تێکنەچوون نزیکییان لەزمانی هۆری ئەو ڕاستییە دەسەلمێنێت.

ئاشکرایە کە سەردەمی ٢٠٠٠ـ ١٠٠٠پ.ز قۆناخێکی بەرخودانە بەرامبەر کۆلۆنیگەرایی بابل و ئاشوور. بەتایبەتیش هەژموونگەرایی ئاشوور کە لەماوەی نێوان ١٣٠٠ـ ١٠٠٠ بالای گرت لە دەشتی بسمیل ی ڕۆژی ئەمڕۆمان ناوەندی ئەیالەتێکی ئاواکرد و پەلاماری بەردەوامی دژی ئەو قەبیلە و میرنشینە هۆریانە بەرێوە برد کە لەناوچەی لیجە ـ گەنج هێشتا بەرخودانیان دەکرد. بەلگەی زەقی ئەو ڕاستییەش وێنە هەلکۆلراوەکانی پادشای ئاشوورە لەسەر بەردەکانی نزیک بە لیجە. وەک تێبینی دەکرێت شالاو و پەلاماری هاوشێوە بۆ سەر زاگروسیش ئەنجامدراوە. لەبەلگە ئاشووریەکانی بۆ سالانی ١٢٠٠پ.ز دەگەڕێنەوە باسی کۆنفیدراسیۆن و گەلی نایری(نەهری) دەکرێت. کەنارەکانی زاب ـ دیجلە شوێنی نیشتەجێبوونیانە. پێویستە بەگرنگیەوە ئاماژە بەو خالە بکەم؛ ئەو پێکدادانانەی نێوان پاشاو دەستەبژێرەکان لەئارادایە لەسەر زێدە(بەرهەم و بەها)کانی کۆمەلگایە. لەبەرامبەر ئەمەشدا وەک گەل ئاشووری و هۆریەکان توانیویانە بەیەکەوە لەناو ئاشتیدا بژین. بناخەی شەڕێکی سیستەماتیک لەنێوان گەل و قەبیلەکان بوونی نییە.

لەبەر ئەوەی ناودێرکردنی هۆری بەزمانی سۆمەرییە، کاتێک کاریگەری زمانی سۆمەری لاواز بوو و زمانی ئەکەدی و ئارامی زالبوون کە زمانی چالاکی بابل و ئاشوور بوون، بێگومان گۆڕانکاری و جیاوازی لەناولێنانەکانیشدا جێگای باس دەبێت. لەو قۆناخانەدا هیچ کەس و قەبیلەیەک نالێت"من عەرەبم، ئاشووریم، کوردم". بەلکو ناوی ناسنامەکەی بەگوێرەی ناوی قەبیلە و خوداوەندی قەبیلەکەیەتی. خوازیارە بەمجۆرە ناوبنرێت. لەدوای سالانی ١٠٠٠پ.ز ناوە سۆمەریەکانی هۆریەکان جێگای خۆیان بۆ ناولێنانە ئاشووری ـ ئارامیەکان بەجێدێلن. ناوەکانی مادو بیانلی (گەلی میدیا و وانی ئەمڕۆ) زیاتر لەتەرمۆلۆژی ئاشووردا باسدەکرێت. ناوی ئورارتوو کۆنترەو شیمانە دەکرێت لەسەردەمی سۆمەریەکانەوە مابێتەوە.

سالانی ١٠٠٠ پ.ز بەدواوە قۆناخی ئامرازە ئاسنینەکانە. ئاسن کانزایەکی گرنگ و بەرچاوە. وەک نەوتی ڕۆژی ئەمڕۆمان بابەتی شەڕو

پێکدادانە. وەک کانەکانی مس کانەکانی ئاسن و بەکارهێنانی لەزنجیرە شاخەکانی زاگرۆس ـ تۆرۆس زۆرن. شارستانی ئورارتوو(٩٠٠ـ ٦٠٠پ.ز) بەو سیفەتەی شارستانیەکی ئاسنە تاکە هێزە کە بەرامبەر پاشاکانی ئاشوور لەسەر پێیان ماوەتەوە. سەرباری ئەوەی میرنشینەکانی میدیا لەناو بەرخودانی بەردەوامدابوون، بەلام تەنیا لەساڵی ٦١٢ پ.ز توانیان بەرامبەر دەوڵەت یان شارستانی ئاشووری سەرکەوتن بەدەست بێنن. بەرخودانی میدیاش گرنگە کە نزیکەی سێسەد ساڵ بەردەوام بووو دەکەوتە جەمسەری رۆژهەلاتی ئورارتوویەکان. میدیاییەکان تا ساڵی ٥٥٠ پ.ز دەسەلاتیان لەبەرژەوەندی پارسەکان لەدەستدا، بەردەوامییان بەکۆنفیدراسیۆنی خۆیاندا. دوای ئەمەش قۆناخێکی زۆر جیاوازترە. ئەرستۆکراسی ماد لەمیانەی رێککەوتنی لەگەڵ پارسەکان پێگەی پلە دووی بەسەند کردو درێژەی بەبوونی خۆیدا؛ ئەمە قۆناخێکی بنەڕەتی بەکرێگیراوێتی باوی کوردە. لەمێژووی هیرۆدۆت دا بەمجۆرە باسدەکرێت: ئاستیاخ ی دوا پاشای میدیا بەفەرماندەی خائین هیرباکۆس دەڵێت "ئەی هیچ و پووچ ئەوا پاشایەتی منت رووخاند، ئەی بۆچی خۆت یان میدیاییەکی دیکەت نەکرد بەپاشا، لەجیاتی ئەوە بەکرێگیراوێتیتان بۆ پارسە نارەسەنەکان هەڵبژارد؟". ئەمە پرسیارێکە لەواقیعی رۆژی ئەمرۆشمان لەجێگای خۆیدایە.

لێگەڕین و بەرخودانی سولالەی قەبیلەکانی زنجیرە شاخی زاگرۆس ـ تۆرۆس لەقۆناخی پارس ـ ساسانیدا لەمیانەی پەرەسەندنێکی دوولایەنە بەردەوام دەبێت. لەلایەکەوە بەرامبەر ئەرستۆکراسەکانی پارس ـ ساسانی و بەکرێگیراوانی ناوخۆیان بۆ پێگە و رەهەندی تەسکی قەبیلە پاشەکشێ دەکەن، لەلایەکی دیکەوە لەسەر بنەمای جووتیاری و شوانکارییەوە لەدۆخی نیشتەجێیی و نیمچە نیشتەجێیی هەوڵ بەرگریکردن لەبوونی کۆمەلایەتییان دەدەن. هەروەک بەدەوییە عەرەبەکان شێوازی ژیانێکی گۆشەگیری و دەرەوەی شارستانی جێگای باسە. ئەو سەرۆکایەتییەی لەئاستی خێڵەکان لەئارادایە جگە لەئیدارەکردن لەگەڵ شارستانی و چارەسەرکردنی کێشەی نێوان هۆز و خێڵەکان رۆڵێکی گرنگیان نییە.

هــەروەها جگــە لــەئاواکردنی میرنشــینە بچووکــەکان مــەیلێکی جــدی دەسەلاتیشیان نابینرێت. کاتێک باسی دەوڵەت دەکرێت، ڕێکـەوتن لـەگـەڵ ئێران، هێلـین و ڕۆمـا و توانـەوە لەناویانـدا بەبیریانـدا دێـت. هـەروەکو لەچاخـەکانی یەکەمیشـدا ڕوویـداوە بـۆ ماوەیـەکی درێژخایـەن بەتـەنیا بزاوتی ئاواکردنی دەسەلات و نفوزیان کزبووە.

لەلایــەکــی دیکــەوە دووەمــین مــەیلی ســەرپەهەڵداوە ئــەو مەیلــە ئایدیۆلۆژیەیە کە کارەکتەری ئایینی لەپێشە. هەرچەندە عەشیرەتەکانیش هەر کاتێک ئایدیۆلۆژیای خۆیان هەیە، بەلام ئـەوەی لێرەدا باسدەکرێت بزاوتـەکانی سـەرووی عەشـیرەتە، واتـە لەسـەر بنـەمای عەشـیرەت نـین. بەتایبــەتیش میتراگــەرایی، کریســتیانی، یــەهوودیو مانیگــەرایی ڕەوتیگەلیکن هەوڵی بەکاریگەربوون دەدەن. زەردەشتێتی ـ ئێزیـدێتی کـە بەردەوام کردنی زەردەشتایەتییە بـاڵێکی جیـاوازترە. ئـەو بزووتنەوانـەش لەچوارچێوەی بەرخودانداندانو زیاتریش لەڕیزی هەژاراندا بەکاریگەرن.

لەسەردەمی بلاوبوونەوەی ئیسلامدا بەرخودانی گەلی بەپێشـەهۆری ـ میدیایی بۆ یەکەمجار بەناوی کـورد دێنـە سەر شـانۆی مێـژوو. بەرامبـەر بەبزاوتە ئایینیەکان بەرخودانی عەشـیرەت و قەبیلـەکان لەپلـەی دووەمـدا دەمێنێتـەوە. بـێ دەوڵـەت مانــەوەی ساسـانیەکان لەسـاڵی ٦٥٠ زایینـی و پاشداکشـانەوەی ڕۆمـای ڕۆژهـەلات (بێزەنـت) بـۆ ئـەودیوی شـاخەکانی تـۆرۆس، سـەبارەت بەبـەرخودان و پەسـەندکردنی کوردانــەوە قۆنـاخێکی نوێیە. لەسەر بنـەمای بـوون بـەخاوەنی میرنشینی بچـووک چینـی بـاوی بـەکرێگیراو لەگـەڵ تـەواوی خانەدانـەکانی ئیسـلام (ئەمـەوی، عەباسـی، سـەلجۆقی، عوسـمانی..هتد) درێـژە بـە بـەکرێگیراوێتی خۆیـان دەدەن. هاوشێوەی دەوڵـەتی مـەروانی هەوڵـەکانی خۆڕێکخسـتە کـردن بەشـێوەی دەوڵـەت درێـژ ناخایـەنێت. هەڵسـەنگاندنی سـەلاحەدینی ئـەیوبی وەک دامەزرێنەری خانـەدانێک کـە عەرەبـەکان بـەڕێوە دەبـات لەجێگـەی خۆیـدا دەبێت. بەمەبەستی بچووکردنەوەیەوە ئەمە ناڵێم، چونکە بەجۆرێکی دیکە هیچـی بـۆ نـەدەکرا. بـەرخودانی بـەناوی بنەماڵـە لاوازە، بـەلام بـەناوی ئیسلام بەهێزە. لەو قۆناخەدا کوردە هەژارەکان لەژێر نـاوی کرمانجـەکان

زیاتر لەدەرەوەی سیستەمی شارستانی دەمێننەوە. کرمانجەکان بەشێوەی بنەماڵـەی بچـووکی دابـڕاو لەقەبیلـەو سیسـتەمی شارسـتانی لەشـار و گوندەکان لەدۆخی نیمچە کۆچبەری ڕەنجبەری و شەرڤانیان کردووە، لـەم چوارچێوەیەدا لەڕێگای بەرخودانەوە درێژەیان بەهەبوونی خۆیان داوە.

لەچوارچێوەی ئەو باسەدا روون دەبێتـەوە کە بـۆچی تـا ئێسـتاکەش لەئاستی ئایـدیۆلۆژیا بنەماڵەگـەریتی و قەبیلـە گـەریتی هێنـدە بـەهێزە. دەشـێت دونیـای ئـەو زهنیەتـەی کـوردان مایـەی تێگەیشـتن بێـت کـە دوا نوێنـەری ئـەو گروپانەیـە کـە بـەردەوام میراسـی ڕەسـەنترین و کـۆنترین قەبیلـەکانی مێژوویـان لەیـەکتری وەرگرتـووە. لەئاسـتێکدا لـەدەرەوەی دیاردەی سیاسەت‌و شارستانی هێڵراونەتـەوە کـە ئـەم جـۆرە دەسـتەواژە و دیاردانـە ناناسـن و لێـی تێناگـەن. بەمانایـەکی دیکـە بـەهۆی هەژموونـە ئایدیۆلۆژی و خڵتەکانیان دەرفەتی تێگەیشتنیان پێنادرێت. پێگـەی چینـی سـەرووی بـەکرێگیراو جیـاوازترە. ئاشـنـای سیاسـەت و شارسـتانین. لەپراکتیکدا کێ دەست بۆ بەرژەوەندیەکانیان نەبات لایەنگری دەکەن. جگـە لــەهێز و بەرژەوەنــدی هــیچ پرەنسـیپێکیان نییــە. هــەر کێیــەک دەسەڵاتداربێت، تەنیا بەڵێ بۆ بەژەوەندیەکانیان بکـات، هـیچ بەهایـەکی کۆمەڵایەتییان نییە لەپێناویاندا خیانەتی لـێ نەکـەن. بـەکورتی گـەرەنتی کردنی ژیانیان لەمیانەی پەیوەندییەکی هێز و بەرژەوەندی لەسەر بنەمای خیانـەتکردن لەسـەرجەم بـەهاکانی کۆمـەڵگای سیاسـی و ئـەخلاقی وەک خەسڵەتێک بەشێوەیەکی مێژوویی لەکوردە بەکرێگیراوەکانـدا بونیـادنراوە کە لەکۆمەڵگاکانی دیکەدا زۆر بەسنووورداری دەبینرێت.

ئەگەر هۆریـەکان وەک بـاڵی ڕۆژئـاوای ئاریانیـەکان پێناسـە بکـەین، ئەوا دەتوانین قەبیلە پارسەکان یش وەک ئاریانیەکانی ڕۆژهـەلات پێناسـە بکەین. خزمایەتی کۆمەڵایەتی و مێژووییان جێگای باسە. خـۆی لەخۆیـدا ئـەم ڕاسـتی یـە لەئۆرگانیزاسـیۆنی میدیاـ پـارس بەرجەسـتەیە. لـەم سۆنگەیەوە پێویستی ئەنجامـدانی شیکارێکی تایبـەت بەپارسـەکان واتـە سەبارەت بەئێرانیەکانی ڕۆژی ئەمڕۆمان پێویست نابینم. شیمانە دەکرێت

گروپــە ئاریانیــەکانی بلوچســتان[٣]، پاکســتان و ئەفغانســتان ڕۆڵــی هاوشێوەیان لـەمێژوودا بینیـوە. ئـەوەی دەرهـەق بەهۆریـەکان گـوتراوە، بەشـێوەیەکی بەرجەسـتە دەتوانرێـت سـەبارەت بەسـەرجەم قەبیلـە ئاریانیـەکان بـاس بکرێـت. جیاوازیـەکانی نێوانیشـیان ڕۆژ بـەڕۆژ پەرەیسـەندو تـا ئـەم تابلۆیـەی ڕۆژی ئـەمڕۆمانی دروسـتکرد. ئەگـەر تـا ئێستاکەش بەرخودانکاری ئایینی و قەبیلە زیندووە(وەک ئـەوەی پاکستان و ئەفغانستان)، ئەمە پیشانیدەدات کە ڕەگە مێژووییەکەیان چەندە کۆن و بەهێزە.

### ج ـ بەرخودان و هێرشەکانی قەبیلەی ئورال ـ ئالتای[٤]

دەشێت دوا ئەڵقـەی کلتـووری ئـورال ـ ئالتـای لـەتیرە و قـەبیلـەکانی نێـوان شـاخەکانی ئـورال ـ ئالتایـدا ببینرێـت. هەرچەنـدە لـەدوورەوە خزمایەتیەکیان لەگەڵ چینیەکانەوە هەبێتیش، بەڵام بەهۆی پەرەسـەندنی کلتـووری و نـاکۆکی شارسـتانی بـۆ گروپێکـی زۆر جیـاواز گـۆڕاون. لەسـەردەمی سـەرهەڵدانیەوە بـەردەوام نـاکۆکی لەگـەڵ شارسـتانی چـین هـەبووە. ناکۆکیـەکی هاوشێوەی قەبیلـە ــ شارسـتانی نێـوان هـۆری ــ سۆمەریەکان سەری هەڵداوە. ئەم گروپانەی تورکە بەرابییەکان واتە هون و مەغۆلـەکان ناوەندەکـەی پێکدێنن، لەسـاڵانی ١٠٠٠پ.ز بـەدواوە بـەردەوام

---

[٣] بلوچسـتان: دەوڵـەتێکی سـەردەمی خەلافـەتی عوسـمانییە. میـر ئەحمـەدخان دایمەزرانـدووە، لـە مـاوەی ١٦٥٠ ـ ١٨٩٣ بـەردەوام بـووە، پایتەختەکـەی کـلات بووە.بلوچەکان گەورەترین گروپی نەژادی پاکستان بوون. شارستانی بلوچی یەکێک لە شارسـتانییە ریشـەدارەکانی مێـژووە، بلوچسـتانیش یـەکێک لـە شـوێنە دێرینـەکانی نیشتەجێبوونی دیرۆکی مرۆڤایەتی جیهانە. زمانی بلـوچیش یەکێک لە زمانە کۆنەکانی مرۆڤایەتییە.

[٤] زمـانی ئـورال ـ ئالتـای: گـروپی زمـانی ئـوراڵ زمـانی فنلەنـدیو هـەنگاری لـەخۆوە دەگرێت. گروپی زمانی ئالتایش زمانە تورکیەکان (تورکەکانی ئاسیا، تورکەکانی یاقوت، قەرغیز، قازان، ئۆزبەک، تورکمـان و جـەواش) و زمـانی مـەنغۆلی کە زمـانی تونغـارو مەنشۆریا لەخۆوە دەگرێت.

لەرووبەریکدا جموجۆلیان دەکرد کە سەریکی ناوچەی شارستانی چین بوو، سەرەکەی دیکەشی شارستانی رۆما، سەریکی دیکەشی لەباشوور شارستانی پارس بوو. هەروەکو عەرەبستان لەم ناوچەش کە بەئاسیای ناوین ناودەبریت بەهۆی بیابانبوون و فشاری هێزەکانی شارستانی ژیانیکی بەرخودانکارانە ببوو بەناچارییەک.

لەسەرچاوەکانی چیندا لەسێیەمین سەدەی پێش زایین سەرنج رادەکێشریتە سەر هەرەشەی هونەکان. باس لەخانێک دەکات کە تورکاندراوەکەی مەتاخان ی پێدەگووتریت. باسی پەلامارەکانی قەبیلەی هۆن دەکریت بەرێبەرایەتی مەتاخان کە لەسالی ٢٠٩پ.ز روویداوە. ئەگەر ئەم قۆناخە بۆ سالانی ١٠٠٠پ.ز دریژبکریتەوە لەوانەیە راستتر بێت. شارستانی چین بۆ ١٥٠٠ پ.ز دەگەریتەوە. لەبەر ئەوەی ناکۆکیەکانی نێوان قەبیلە ـ شارستانی بەردەوام لەئارادا بووە دەشێت ئەو هێرشانە بۆ سالانی ئاواکردنی شارستانی بگەرێندریتەوە. هەلبەتە دیواری چین ئەو راستی یە پیشاندەدات.

وەک دەزانریت ئەم جڤاتانە لەسالانی ٧٠٠٠پ.ز وە لەباشووری سیبریاوە هاتوونەتە خوارەوە. لەریگای لێتویژینەوە ئەتمۆلۆژی و ئەنترۆپۆلۆژیەکانەوە سەلمێنراوە کە لەمێژوویکی نزیکدا لقێکیشیان لەگەرووی بیرینگەوە چوونەتە ئەمریکا. شیمانە دەکریت لەسالانی ٤٠٠٠پ.ز ئاشنای کۆمەلگای نیولیتیک بووبن. لەوانەیە شارستانی چین و وشکە سالی ریگا لەپێش گۆرانکاری بنچینەیی دۆخەکەیان بکاتەوە. هەروەکو گروپە سەمیتیکەکان بەهۆی ئەم هەلومەرجانەوە دەکەونە ناو قۆناخێکی پر لەجموجۆلیەوە. کاتێک ئەنجامێکی ئەوتۆیان لەبەرخودان و پەلامارەکانیان بۆ سەر شارستانی چین بەدەست نەهێناوە، لەسەدەی سێیەمی زایینی بەدواوە روویان لەرۆژئاوا کردووە. وەک زانراوە جاران لەسەرچاوە کۆنەکانی ئێران ئەم گروپانە بەناوی 'تورانیەکان' باسکراون. لەبەر ئەوەی دراوسێی باشوری رۆژئاوای ئێران بووە چاوەروانی هەبوونی پەیوەندی بەردەوامیان دەکریت. مردنی کۆرش ی ئیمپراتۆری پارسی ئێرانی لەپێکدادانێکی لەگەل گروپی ئیسکیتی ناو سنوورەکانی(ماسگاتا)

کازاخستانی ڕۆژی ئەمڕۆمان، بەپێی پێویست کارەکتەری پەیوەندی نێوانیان دەخاتە ڕوو. ئەگەر بەبیرمان بێتەوە کە ئیسکیتەکان لەسەدەکانی ٨ـ٦ پ.ز کۆنفیدراسیۆنێکی بەهێزیان لەناوچەی نێوان باکوری ڕووباری تونا و ئاسیای ناوین ئاواکردبوو، ئەو کاتە باشتر شیمانەی ڕەهەندی ناکۆکیەکان دەکرێت.

ڕەچەڵەکی قەفقاسی و ئاسیای ناوینی ئیسکیتەکان هیچ لەڕەوشەکە ناگۆڕێت. ئەوەی گرنگە هێزێکی ئانتی ـ شارستانیگەراییە. بەئاسانی لەیەکتر جیاناکرێتەوە کە فشار و سەرکوتکردن ڕێگای لەپێش جموجۆڵیان کردەوە یاخود بەهۆی چاوبڕینیان لەدەوڵەمەندیەکانی ناوچەی شارستانیەوە کەوتنە جموجۆڵەوە. تا دوارادە دۆخێکی تێکچڕژاو لەنێوان هەردوو بابەتدا جێگای باسە. شارستانیەکان خوازیاری فراوانبوونی بەردەوامن. ئەمەش ئەنجامەکەی فشار و سەرکوتکردنە. هەرچی ڕاپەڕینە لەکاتێکدا شارستانی بۆ بەدەستهێنانی سەرکەوتن بەتایبەتی ناچاری بەکارهێنانی ڕێبازی سیاسی و سەربازی و ئامرازەکانیان دەبێت، بەلانی کەم کاتێک دەستەبژێری تیرەکانی بەرخودان ئەم هەڵوێستەیان هەبێت ئەوا خوازیاری ڕووخاندنی شارستانین یاخود بەشێکی لێ جیادەکەنەوە. لەهەردوو دۆخیشدا ڕێگا لەپێش بڵاوبوونەوەی سیستەمی شارستانی دەکەنەوە. هەروەکو سەبارەت بەئەکەدییەکان ڕوویدا لەبەر ئەوەی سەرۆکی هێزە نوێکانی قەبیلە هۆگری نیعمەتەکانی شارستانین (ئەگەر بەشێوەیەکی سنوورداریش بێت لەسەرۆکایەتی قەبیلەدا ژیانی لەسەر نیعمەتی هاوشێوەی ئەمە ئاوا کراوە. ژیانێکی بەر لە شارستانی جێگای باسە) بژاریان یان توانەوەیە لەناو ئەو شارستانیەی شەڕیان لەدژی کردووە یان شارستانیەکی نوێ ئاوا دەکەن.

لەداستانی بەناوبانگی شانامە بەشێوەیەکی دوورودرێژ باسی شەڕی نێوان ئێران ـ توران دەکرێت. وشەی توران تەنیا تورکە بەراییەکان لەخۆوە ناگرێت. بەڵکو سوودی بۆ گوزارشتکردن لە سەرجەم گروپەکانی ناوچە هەیە. وەک دەزانرێت تیرەکانی توران ناو بەناو تا هیندستان یش دزەیان کردووە. زیاتریش خزاونەتە ناوچەکانی ئێران، ئەفغانستان و

پاکستان و کۆنفیدراسیۆنە کاتیەکانیان ئاواکردووە. کۆنفیدراسیۆنی قەبیلەکان کە هونەکان لەسەرەتاکانی سەدەی پێنجەم لەهەنگاریای ڕۆژی ئەمڕۆمان ئاوایانکرد هێندە بەکاریگەر ببوو کە لەساڵی ٤٥٣ بەڕێبەرایەتی ئەتیلا گەیشتە دەروازەکانی ڕۆما. ئەگەر تکاو پاڕانەوەی پاپا نەبوایە لەوانەیە بەر لەگۆتەکان ڕۆمای برووخاندبایە. هەروەها گەیشتبوونە دەروازەکانی ڕۆمای ڕۆژهەلاتیش. ئافاریەکان[٥]ی سەر بەهەمان گروپ تەواوی باشووری ڕوسیای ڕۆژی ئەمڕۆمانی خستبووە ژێر کاریگەری خۆیەوە. بزاوت و جموجۆڵی چەندین گروپی دیکەی هاوشێوە جێگای باسە. لەسەدەی ٦ پ.ز کیمەر[٦] و ئیسکیتەکان لەدەروازەکانی ئورارتووە تا دەگاتە سنوورەکانی لیدیا (پادشایەتیەکە لە سەدەی ٧ـ ٦ پ.ز لە ئەنادۆڵی ڕۆژئاوا ئاواکراوە) دەوروبەریان سەراوبن کردووە. ڕاستیەکی زەق و بەرچاوە کە تەواوی ئەم گروپانە بەرخودان و هێرشێکی هاوشێوەی گروپە سەمیتیکەکان دژ بەسۆمەریەکانیان بەرامبەر بەشارستانی پارس ـ ڕۆما بەڕێوە بردووە. پێویستە ڕق و کینەی گەلانی قەبیلە بەرامبەر شارستانی بەتاوانبار کردنیان 'بەربەریتی - هۆڤیتی' ئەنجامگیر نەبێت پێویستە بەشرۆڤەی زانستی روون بکرێتەوە.

---

[٥] ئافاریەکان: گەلێکە لە ساڵی ٥٥٢ زایینی بەرەو رۆژئاوا کۆچی کردووە، سەرەتا لە قوقاز دواتر لە باکووری دەریای رەش جێگیر بووە. کۆچەکەی تا دەوروبەری رووباری تونا بەردەوام بووە، بەردەوام پەلاماری بەلقانی داوە، سلاڤو بولگاریەکانی خستۆتە ژێر فەرمانڕەوایی خۆیەوە. سنووری ئیمپراتۆریەتەکەیان لە رووباری ڤولگا تا رووباری بییە، لە دەریای باکوور تا ئەدریاتیک درێژ بۆتەوە، تەنانەت لەگەڵ بولگارەکان ساڵی ٦٢٦ ئەستەنبۆلیان گەمارۆ داوە.دوای هێرشی ئیمپراتۆریەتی فەرەنسی (٧٩١) لاوازو پەرتەوازە بوون.

[٦] کیمەر یان سیمریەکان (Cimmerians) : گەلێکە لە باکووری دەریای رەش لە نێوان رووباری قەزوینو تونا نیشتەجێ بووە (لە سەدەکانی ٨ - ٩ پ.ز). باڵێکی کیمارە کۆچپێکراوەکان دواتر لە کەناری دەریای رەشی باشوور نیشتەجێ دەبن. هەندێک کەس بە نوێنەری مێژووی کلتووری تورکەکانیان دادەنێن.

بۆ یەکەمین جار لەساڵانی ٥٥٠زایینی دا دەبینین کە میرنشینێک بەناوی گۆک تورک (بۆیەکەمین جار لێرە وشەی تورک دەبینرێت) لەسنوورەکانی مەغۆلستانی ڕۆژگاری ئەمڕۆمان ئاواکراوە. لەکۆنفیدراسیۆنی عەشیرەت دەچێت. بەهۆی ناکۆکییە ناوخۆییەکانی تەمەنی کورت دەبێت. ئویگورەکانیش تاقیکردنەوەی شارستانیەکی سەرەتایی بەر لەئیسلامە. ئاییني بودیزم و مانی لەم بونیادەدا بەکاریگەرە کە لەساڵی ٧٥٠زایینی ئاواکراوە. شارستانیەک لەئارادا نییە بتوانێت کێبڕکێ لەگەڵ چین بکات. تا سەردەمی هاتنی ئیسلام بۆ ناوچەکە بزاوتی قەبیلە ئانتی ـ شارستانیگەراکان بەسەر ناوچەکەدا زاڵن. لەگەڵ هاتنی ئیسلام بۆ ناوچەکە ئەم دۆخە نیمچە کۆچەرییە دووچاری گۆڕانکاریەکی ڕیشەیی هات.

دەرکەوتنی ئیسلامیەت لەچوارچێوەی کۆتاییهاتن بەشارستانیەکانی چاخی یەکەم و گوزەرکردن بۆ شارستانیەکانی چاخی ناوین ڕێگا لەپێش گۆڕانکاریەکی بنەڕەتی دەکاتەوە. لەکاتێکدا لەسەردەمی دەرکەوتنیدا ئانتی ـ شارستانیگەرا بوو، بەڵام دوای ماوەیەکی کورت بوو بەبناخەی شارستانی، لەڕاستیدا گۆڕانکاریەکە بەبایەخەوە پێویستی بەڕاوەستە و تاوتوێ کردن هەیە. سەرەڕای ئەوەی لەمیانەی پشتبەستن بە بەدەوییە عەرەبە دژە ـ شارستانیەکان ئەو پێهەڵگرتنەی ئەنجامدا و بوو بەهێزی هەژموونگەرایی چاخی ناوین، ئەو پێکدادانە ناوخۆییانەی بەخۆیەوە دیو ئەو وەرچەرخانانە شایستەی لێتوێژینەوەیە کە سەبارەت بەسیستەمی قەبیلەکانی خۆرهەڵاتی ناوین ڕێگای لەپێش کردۆتەوە. دەشێت پەلهاوێشتن و گەیشتنی ئیسلامیەت بەسنوورەکانی چین وەک شۆڕشی شارستانی هەڵسەنگێنرێت چونکە شارستانی چین بەهەزاران ساڵ نەیتوانی پەلبهاوێژێت. هەروەکو ناوی کورد و کوردستان ناوی تورک و تورکستان یش لەسەردەمی ئیسلامدا بەکارهێنراوە. ئەمانە دیاردەیەکن بەشێوەیەکی ڕوون و ئاشکرا ڕۆڵی ئیسلام لەئاواکردنی قەومدا پیشاندەدات. گوزەرکردن لەقەبیلەوە بۆ قەوم ناوی وڵات و قەوم دەکات بەپێویستیەک. لەسەدەی دەیەم زۆربەی زۆری تیرە تورکەکان ڕوویان لەئیسلام کردبوو. دوو

فاکتەری گرنگ ڕۆڵ لەئیسلامبوونی خێرای تورکەکاندا دەبینێت: یەکەمیان؛ موسڵمانێتی وەک چین مرۆڤ ناکات بەکۆیلە، دووەمیان؛ لەگەڵ ڕووخانی ئیمپراتۆریەتی ئێران ڕێگای ئێرانیان بۆ کرایەوە چونکە بەربەستێکی گرنگی بەردەمیان بوو. ئاشکرایە کە گرنگترین قۆناخی مێژووی تورک لەمیانەی شارستانی ئیسلامەوە بەدیهاتووە. بەدەوڵەتبوونی خێرای ئەرستۆکراسانی قەبیلە جیابوونەوەی تورک - تورکمانیشی لەگەڵ خۆیدا هێناوە. ئەمەش هاوشێوەی جیاوازی عەرەب - بەدەوی و کورد - کرمانجە. لەکاتێکدا تورک پێناسە و ناوی توێژی شارستان بوو، بەڵام تورکمان پێناسە و ناوی ئەو توێژە موسڵمانە بوو کە لەلایەن سیستەمەوە بەدەر دەنران و درێژەیان بە پێگەی ئەنتی ـ شارستانی خۆیان دەدا. ناکۆکی قەبیلە و چینایەتی تێکەڵ بەیەکتر دەبن.

پێویستە باش تێبگەین کە ئیسلام لەهەمان کاتدا بزاوتێکی چینایەتییە (چینی سەروو ناوین). تورکەکان تەنیا بەقایمکردنی پێگەکەیان لەتورکستان نەوەستان: لەمیانەی خانەدانەکانی سەلجوقی و عوسمانیەوە لەسالانی ١٩٠٠ـ ١٠٠٠ ڕۆڵی هێزی هەژموونگەرایان بینی. بەرخودان و پەلامارەکان زیاتر دژی ئیمپراتۆریەتی بیزەنتی ئەنجامدران. لەئەنجامدا لەکاتێکدا ئەنادۆڵ دەبوو بە تورک - موسڵمان، تورکمانەکان لەزۆربەی شوێنەکانی خۆرهەلاتی ناوین و تەنانەت بەلقانیش بلاوبوونەوە(بەتایبەتیش ناوچە شاخاویەکانی بۆ ئاژەڵداری و کۆچبەرێتی گونجاون). لەبنەڕەتدا تورکمانەکان درێژەیان بەقەبیلەگەراییدا. لەپەلهاوێشتنی تورکەکان بۆ خۆرهەلاتی ناوین ناکۆکی و پێکدادان لەنێوان تورکەکانی تینووی دەسەلات و نفوز لەگەڵ هێزە دەسەلاتدارەکانی قەومەکانی دیکە ڕوویداوە. پێگەی تورکمانەکان لایەنگری ئاشتی و تەبایی بوو. لەشارستانیبوونی تورکەکانیشدا زۆر بەروونی دەبینرێت کە شەڕ سەرچاوەی خۆی لە دیاردەی هێزەوە وەردەگرێت.

دوای بەرەبابە تورکەکان خزمەکانیان تیرە مەغۆلەکان دووەمین گەورە بزاوتی بەرخودان و پەلامار لەئاسیای ناوین بەردەوام دەکەن. بەبێ ئەوەی ئیسلام بنەماکەی پێکبهێنێت. لەبواری مێژووی جیهانییەوە سەدەی

سێزدەهەم سەدەی مەغۆلەکانە. کارەکتەری ئانتی ــ شارستانی هێزی مەغۆلەکان سەرنجڕاکێشە کە لەڕۆژهەڵاتی دوورەوە تا دەگاتە تەواوی ئۆراسیایان فەتح کردبوو. لەتەواوی خۆرهەڵاتی ناوینیشدا بڵاوبوونەوە. ئەگەر خوازیار بوونایە دەیانتوانی تەواوی شارستانی تازە گەشەسەندووی ئەوروپا بڕووخێنن. شارستانی چین یشیان خستە ژێر رکێفی خۆیانەوە. بەڵام وەک پێویستی هەمان ڕێسا ئەوانیش لەتوانەوە لەناو سیستەمی شارستانی ڕزگاریان نەبوو. هێزە نیمچە تورک ــ نیمچە مەغۆلەکەی تەیموریش بەدرێژایی سەدەی چواردەهەم قەڵەمبازێکی هاوشێوەیان ئەنجامدا. هەردوو هێزیش خانەدانەکانی سەلجوقی و عوسمانیەکان(عەباسیەکانیش)یان تێکشکاند. بەڵام هێزە بەئەزموون و تاقیکراوەکەی هەزاران ساڵەی ئامێری شارستانی زانیویەتی چۆن سەرۆکە بەتواناکانی سیستەمی قەبیلەی جیهانگیر بخاتە ناو بونیادی خۆیەوە، خۆی زیاتر و بەهێزتر بکات و بەمجۆرەش بەردەوام بێت.

بڵاوبوونەوەی بزاوتی قەبیلەی تراکیا[٧] بۆ ناوەوەی ئەنادۆڵ کە دوای دەستبەسەرداگرتنی تروادە لەکۆتاییەکانی ساڵانی ١٢٠٠پ.ز لەچوارچێوەی خۆرهەڵاتی ناوین و کەنارەکانی ئیجە سەریانهەڵدا و هەندێک پاشایەتی وەک فریگیایان ئاواکرد، هەروەها ڕووخاندنی هیتیتەکان لەلایەن تیرەکانی بەقەومەکانی ئاو ناسرابوون و بڵاو بوونەوەیان تا سنووری شارستانی میسر (لەوانەیە بە هۆی ئەم ڕەوشە بێت کە ئەمڕۆ بەباپیرە شیمانەکراوەکانی فەلەستینیەکان دادەنرێن) بزاوتی گرنگی بەرخودان و هێرشی قەبیلەکانن. ڕووخاندنی شارستانی میکانی (ساڵانی ١٢٠٠پ.ز) لەلایەن قەبیلەکانی دۆر، ئایۆل و ئیۆن کە خۆیان بەباپیرەی هێلینیەکان دادەنێن و دوای ماوەیەکی درێژ لەهەردوو یەخەی ئیجە قۆناخی ئاواکردنی

---

[٧] قەبیلەی تراکیا: ناوەکەی بۆ تراکیا دەگەڕێتەوە کە ناوچەیەکی مێژوویی ـ جوگرافییەو دەکەوێتە باشووری رۆژهەڵاتی بەلقان نێوان بولگاریا ـ یۆنان ـ تورکیای ئەوروپیو بە سێ دەریا دەورەدراوە: دەریای رەش، ئیجەو مەرمەرە. زۆربەی زۆری دانیشتوانی تراکیا موسڵمانن‌و لەناو یۆنان، بولگاریاو تورکیادا دەژین. سپارتاکۆس‌و محەمەد عەلی پاشا لە بەناوبانگترین رۆڵەکانی تراکیان.

دەوڵەتشاریان دەست پێکردووە (٧٠٠ـ ٥٠٠ پ.ز) کە گرنگیەکی زۆری مێژوویی هەیە و لەسەرلەنوێ کۆلۆنیزەکردنی سەرتاسەری ئەنادۆڵ هەنگاوی گرنگن. ئەمانە هەنگاوێکن کە کاریگەری و شوێنپەنجەی هەمیشەییان لەسەر شارستانی و کلتووری خۆرهەڵاتی ناوین بەجێهێشتووە. لەکاتێکدا قەبیلەکانی تراک لەناو کلتووری ناوچەدا توانەوە، تیرەکانی قەبیلەی هێلینی مۆرکی خۆیان لەکلتووری ناوچەکەدا. هێلینیزم شادەمارێکی شارستانی و کلتووری خۆرهەڵاتی ناوینە.

بێگومان قەبیلەکانی قەفقاسیاش پەیوەندییەکی بەردەوامییان بەخۆرهەڵاتی ناوینەوە هەبووە. هێرش و بەرخودانی زۆر گرنگیان بەرامبەر شارستانیبوون پیشانداوە. جگە لەئیسکیت و کیمەرەکان نموونەی دیکەش جێگای باسن. شیمانە دەکرێت جۆرجی و ئەرمەنیەکانیش بەپەرەسەندنی هاوشێوەدا تێپەڕیون. جڤاتی ئەو قەبیلانەی لەوڵاتی سەرەکی ژیانی قەبیلەکان واتە لەقەفقاسیا دەژیان، هەر لەسەردەمی سۆمەریەکانەوە بەردەوام دابەزینیان و گەڕانەوەیان لەناوچە جێگای باس بووە. کلتوورەکەیان دەوڵەمەندتر کردووە و ڕۆڵێکی گرنگیان لەبەرهەڵستکاری شارستانیەکەیاندا بینیوە. دەشێت وەک چوارەمین قەبیلەی هێزی هێرش و بەرخودان لەمێژووی ناوچە جێگیر بکرێن. پەرەسەندنەکانی ڕۆژگاری ئەمرۆمان ئەو ڕاستیە دەسەلمێنێت.

لەسەرەنجامدا سیستەمی قەبیلە درێژەی بەپێگەی مێژوویی خۆیداوە؛ بەرامبەر بەسیستەمەکانی شارستانی بەگشتی، بەتایبەتیش دەرهەق بەشارستانی ناوەندی هەم کارەکتەری ئانتی ـ شارستانیگەرایی و دوور سیستەمی پاراستووە، هەم بەردەوام خوێنی نوێی بەسیستەمی شارستانی بەخشیوە. لەبنەڕەتدا بۆ پێکهاتن و بەردەوامکردنی سیستەم لەناو ناکۆکیەکی دیالیکتیکیدا بووە. بەردوام ڕۆڵی سەرچاوەی خوێنی تازەی بینیوە، بەشێوەی بنەماڵەگەرێتی و خانەدانگەرێتی گۆڕانکاری بەسەردا هاتووە. وەرچەرخانی سیستەمی قەبیلە بۆ دەزگایەکی بنەماڵەگەری و خانەدانێتی لایەنگری شارستانی یەکێک لەو گۆڕانکاریە گرنگانەیە کە کۆمەڵگاو مێژوو بەخۆیانەوە دیوە. بنەماڵە گەرێتی و خانەدانێتی

دامەزراوێکن لەسەر بنەمای نکوڵیکردن لەسیستەمی قەبیلە پێکهاتوون. پێویستە زۆر بەباشی دەرک بەم تایبەتمەندێتیانەیان بکرێت. تەنیا لەسەر بنەمای ئەم وەرچەرخانەوە خزمەتیان بەشارستانی کردووە و پێی کاریگەر بوون. لەناوەڕۆکدا سیستەمی قەبیلە دامەزراوێکە ئانتی ـــ شارستانیگەراییە و پەیوەندی یەکسان ـ ئازاد تێیدا زاڵە. بنەماڵەگەرێتی و خانەدانێتی دیاردەگەلێکی لایەنگری شارستانین کە نکوڵی لەو ناوەڕۆکە دەکەن بەڵام گرنگی بە پاراستنی ڕووخساری قەبیلە دەدەن. ئەو دوو دامەزراوە بەشێکی زۆری سەرچاوەی ئەو هێزو پەیوەندیانە بەرهەم دێنن کە لەسەرەوە و خوارەوە ڕۆڵ لەبەردەوامبوونی شارستانیدا دەبینن. لەم سۆنگەیەوە ئەگەر ئەو دوو دامەزراوە نەبن شارستانی بەئاسانی درێژە بەهەبوونی خۆی نادات.

لەشوێنی خۆیدایە سەرنج بۆ ئەم خاڵە ڕابکێشین: ڕێکخستنی شێوەی قەبیلە تایبەتمەندێتیەکی دەست لێبەرنەردراوی کۆمەڵگابوونە. چونکە لەمیانەی پەرەپێدانیەوە کلانیشی خستۆتە ژێر بوونیادی خۆیەوە، یەکینەی جیهانی ڕێکخستنی مرۆڤە. ئەگەر خێزان، خانەدان و ئەو جۆرانەی مۆدێرنیتەی سەرمایەداریشی بخەینە سەر کە وەک 'کۆمپانیا'ی لێهاتووە، لەوانەیە باشتر دەرک بەتایبەتمەندێتییە جیهانیەکەی بکەین. هەروها بەپێی پێویست ڕوونمان کردەوە کە سەرجەم بونیادەکانی پلەداری، دەسەڵات و دەوڵەت بەبێ بنەماڵە و خانەدان نابێت. بەڵام پێویستە بەبایەخەوە کارەکتەری یەکسان ـ ئازاد و ئانتی ـــ شارستانیگەرایی سیستەمی قەبیلە لەگەڵ شێوەکانی بنەماڵە گەرێتی، خانەدانێتی و کۆمپانیاگەرایی لێک جیابکەینەوە کە تێکدراوە و کراوەتە سەرچاوەی کۆیلایەتی و قازانج. گوزەرکردن، گۆڕان و وەرچەرخانی شارستانی (مۆدێرنیتە)سەرمایەداری و سەرجەم سیستەمەکانی شارستانیشی لەناودا لەهەر دامەزراوەیەکی نوێی کۆمەڵایەتی کە دامەزرێت لەوانەیە لەهەلومەرجێکی پێشکەوتووی زانستیدا سیستەمی قەبیلە بەشێوەیەکی یەکسان و ئازادانەتر جێگای خۆیان بگرن.

سەرباری ئەوەی پرۆپاگەندەیەکی زۆریان بۆ دەکرێت بەڵام دەوڵەتشار، ئیمپراتۆریەت و جۆرەکانی دەوڵەت ـ نەتەوە دامەزراوەی کۆمەڵایەتی ڕاستەقینە نین. بەڵکو ئەوانە ناوەندەکانی بەدەستهێنانی هێز و قازانجن کە بەشێوەی مەزنایەتی ریزکراون. واتە ڕێکخستنە سەرەکیەکانی شارستانین. ئامێرەکانی بەرهەمهێنانی قازانجو توندوتیژی سەر کۆمەڵگان. لەوانەیە دەوڵەتشار تا رادەیەک کۆمەک بەکۆمەڵگا بکات. چونکە بچووکە و لەگەڵ کێشە کۆمەڵایەتیەکاندا تێکەڵە. لەم سۆنگەیەوە کاتێک بۆ دیموکراسی کراوە بێت تا رادەیەک دەشێت هەستیار و هێزی چارەسەری بێت. نموونە مێژووییەکەی ئەو بابەتەش دیموکراسی ئەسینایە. هەرچی جۆرەکانی ئیمپراتۆریەت و دەوڵەت ـ نەتەوەیە ڕێکخستنێکی دەرەوە یان سەرووی کۆمەڵگاکان و گرێدراوی توندوتیژی و ئامانجی قازانجن (باج، داهات، سوو تەنانەت کرێش). وەک پێویستیەکی هەژموونگەرایی ئایدیۆلۆژی بەشێکی زۆری پەرتووکە مێژووییەکان چیرۆکە خوێناوییەکانیان وەک فاکتەری سەرەکی ئاوتوێ دەکات. هەربۆیە کاتێک مێژووناسی مەزن فرناند براودل لەکۆتایی پەرتووکی 'دەریای سپی لەسەردەمی فیلیپی دووەم' دا دەڵێت ناخوازم ببم بەئامرازی باسکردنی ئەمجۆرە مێژووە، بەڵام پێویستیەکی ناچاری مێژوونووسی جێبەجێ دەکەم، زیاتر نزیکی باسە ڕاستەکەیە. هەڵوێستەکەی کۆمەک بەچۆنیەتیو پێویستی پەرەپێدانی مێژوونووسی پێشکەش دەکات. زانستی مێژوو ئاراستەی پێشکەوتنی گرتۆتە بەر. پێویستە مەودایەکی زیاتر ببڕێت. ڕۆڵی نابیناکردنی مێژووی شارستانی پڕکراو بەهەژموونگەرایی ئایدیۆلۆژی ڕاستینەی کۆمەڵگای مێژوویی روون ناکاتەوە، بەڵکو ڕۆڵی نابیناکردنی دەبینێت؛ پێویستە ئەو خاڵە لەبیر نەکەینو کارو خەباتی خوێندن و نووسینی مێژووش بەگوێرەی ئەم ڕاستییە ئەنجامبدەین.

دڵنیام کە پەرتووکە مێژووییەکانی سەرلەنوێ دەنووسرێنەوە بەهایەکی زۆر بەپەرەسەندنی سیستەمی قەبیلەکان دەدەن. پەرەسەندنی گونجاوترین شێوەی کار و خەباتی ئابووری، کۆمەڵاتی، سیاسی و ئایدیۆلۆژی (ئایینی، هونەری و زانستیشی لەناودا) لەرەهەندەکانی دۆخی

نوژەنی قەبیلەدا، ڕۆڵە ژیانیەکەی لەپەرەسەندنی تەندروستانەی ژیانی کۆمەڵایەتیدا دەست لێبەرنەدراوە. چونکە چیتر مرۆڤایەتی بۆ ماوەیەکی درێژخایەن باری دامەزراوەکانی بنەماڵەگەریتی، خانەدانێتی و کۆمپانیا گەرایی مۆدێرنیتە هەڵناگرێت کە تەنیا تویکڵەکەی ماوەتەوە. چیتر دەوڵەت - نەتەوە ناتوانێت بەردەوامی بەئیلاهیبوونی زیۆسیانەی دامەزراوەکانی ژیانی ساختە بدات.

چوارچێوەی دیموکراتی ئەو پەلامار و بەرخودانەی سیستەمی قەبیلە بەرامبەر سیستەمەکانی شارستانی بەڕێوەیان بردووە کێشەیەکی دیکەی گرنگە. بەکورتی لێکۆڵینەوەی ڕۆڵی ئەم بەرخودان و هێرشانە سەبارەت بەشارستانێتی دیموکراتی و شارستانی دەوڵەتی گرنگیەکی زۆری هەیە. بەپێی پێویست ڕۆڵی دەرهەق بەشارستانی دەوڵەتی ڕوون کراوەتەوە. لەمیانەی چەندین نموونەی زەق و بەکاریگەرەوە هەوڵی خستنەڕووماندا کە هەر لەقۆناخی قەبیلەگەراییەوە سەرۆکایەتی قەبیلە بۆ هێزی شارستانی بەرایی گۆڕاون، لەگەڵ ژیانی یەکسان - ئازادی قەبیلە لەناو ناکۆکی بەردەوامدا بوون، هەر بۆیە پێکدادانە ناوخۆییەکانی قەبیلە بەردەوام لەئارادابوون. لەکاتی بەریەکەوتنیان لەگەڵ شارستانیشدا لەدۆخی شکستدا یەکسەر رادەستی هێزەکانی شارستانی دەبوون و قەبیلەشیان ناچاری خۆبەدەستەوەدان دەکرد، بەڵام لەحاڵەتی سەرکەوتنیشدا یان بە سیفەتی خانەدانی نوێ سەرۆکایەتی شارستانی کۆنیان بەدەستەوە دەگرت یان لەژێر ئەرکی دامەزرێنەری خانەدانەکەیان شارستانیەکی نوێیان بەرز دەکردەوە. بەڵام ئەمە تەواوی چیرۆک و مێژوو نییە.

کاتێک لەڕوانگەی شارستانێتی دیموکراتیەوە هەوڵی شیکارکردنی بابەتەکە بدەین، بۆمان دەردەکەوێت و تێدەگەین کە فاکتەری سەرەکی مێژووی جیهانی خاوەن خەسڵەتێکی دیموکراتییە. بەردەوام مێژوو شارستانییە دەوڵەتیەکانی وەک تاکە ڕاستییەک پێشکەش کردووە. بەتایبەتیش ڕۆڵی نابیناکردنی مێژووناسی دەوڵەت - نەتەوە و نەتەوەیی پۆزیتیڤیست ڕۆڵی دیاریکەریان سەبارەت بەم بابەتە بینیوە. تەنانەت لەم

بەرگرینامەیەی بەکورتی هێلکاری مێژوومان تێدا پێشکەش کرد سەلمێنراوە کە دەشێت خوێندنەوە و نووسینەوەیەکی جیاوازو ڕاست لەبارەی مێژووەوە ئەنجام بدرێت. لەمەزەندەکان زیاتر مێژوو خاوەن کارەکتەری شارستانێتی دیموکراتییە. کاتێک لەسەر ئەم بنەمایە بخوێندرێتەوە، ئەو کاتە دەبینرێت کە تەنیا کەرەستە و ماتریالێکی زۆری لەناودا نییە بەڵکو لەئاستێکی بەرزدا تۆڕی ئایدیۆلۆژی و بونیادە سیستەماتیکەکان و ڕێکخستنەکان جێگای باسن. پێویستە لەبیر نەکرێت کە یان بەهیچ شێوەیەک پارادیمی ی کۆمەڵایەتی جڤاتە نادەوڵەتیەکان لەمێژوودا نەنووسراوە یان وەک نموونەی بوخچەی پینەکراو بەشێوەیەکی پارچە پارچە هەندێک گەڵاڵەنامەی نووسراوە. هەروەها ئەوەی نووسراویشە یاخود هەوڵی نووسینی دراوە قەدەغەکراوە، چەواشەکراوە و لەزۆربەی دۆخەکانیشدا ڕێگیری لێکراوە. لەمەزەندەکان زیاتر تێکۆشانی ئایدیۆلۆژی سەبارەت بەنووسینی مێژوو ئەنجامدراوە. تاوەکو زۆر بەباشی نەزانرێت ئەو مێژووەی لەبەرەستدایە مێژوویێکی فەرمییە کە بەپارزنگی ئایدیۆلۆژی سیستەمەکانی شارستانیدا تێپەڕیوە، ئەوا خوێندنەوەی مێژوو تەنیا زهن و ژیان، واتە تەنیا ژیانی کۆمەڵایەتی مانادار تەنگەتاو ناکات، بەڵکو بەدۆخێکی دەگەیەنێت ئیتر بەردەوام نەبێت. چونکە ژیانێکی ڕاست لەمیانەی مێژوویێکی چەوتەوە بەدینایەت. ئەوانەی بەشێوەیەکی ڕاست مێژووی ئازادیخوازییان نەنووسن بەئازادی ناژین.

سەرباری تەواوی ئەو خیانەت و شکستانەی دووچاری هاتن بەڵام ئاشکرایە کە بەرخودانەکانی قەبیلە یەکێکن لەهێزە بزوێنەرەکانی مێژوو و بەردەوام لەناو بونیادی یەکسان ـ ئازادی شارستانێتی دیموکراتیدا ژیاون. خودی قەبیلە و سەرچاوە نەبڕاوە و لەبن نەهاتووەکەی کۆمینالیزمی دیموکراتییە. کاتێک تێگەیشتنمان سەبارەت بەقەبیلە پەرەپێدەدەین پێویستە تەنیا بەبونیادە باو و نەریتیەکانەوە هەڵواسراو نەمێنین. هەبوونی ڕایەڵەی خزمایەتی مانای بوون بەقەبیلە نابەخشێت. چونکە تەنیا پەیوەندییەکانی خوێن بۆ بوون بەقەبیلە پێویست و بەس نییە. خەسڵەتی سەرەکی قەبیلە، هەبوون یان قەوارەیەکی کۆمەڵایەتییە. تۆڕی

سەرەکی ژیانی مانادارى کۆمەڵگایە. بەئامانجی باشتر تێگەیشتنی، بۆ نموونە تەنانەت کاتێک مارکسیش دەخوێنیتەوە ئەگەر لەڕوانگەی قەبیلەوە هەڵیسەنگێنیت ئەنجامی زۆر واقیعیتر بەدەستەوە دەدات. بزووتنەوە ئەنارشیستەکانیش ڕێکخستنێکی قەبیلەیی نموونەیین. بزاوتە ژینگە پارێزو فێمینستەکان زیاتر نزیک بەم سیفەتەن. بابەتێکی فێرکەرو ئەزموونبەخشە کە پارتیو دامەزراوە دەوڵەتیەکانی کۆمەڵگای مەدەنی چۆن لەڕێگای تایبەتمەندێتی ئانتی - قەبیلەییان بۆ ڕێکخستنێکی قاوغ گۆڕاون.

تەنیا لەهەندێک هەلومەرجدا دەشێت قەبیلە بەکۆمۆن ناوببرێت؛ بەو مەرجەی خاوەن کارەکتەی ئازادی و یەکسانی بێت. هەروەکو چۆن لەمێژوو ڕویداوە ئەگەر سەرلەنوێ بونیادنانەوەی شارستانێتی دیموکراتی لەسەر ئەم بنەمایە پێشبخرێت مانادار دەبێت. مێژوو تەنیا کاروانی شارستانی دەوڵەتی نییە. زیاتریش کاروانی کۆمینالیزمی دیموکراتیکە. ژیانی هەزاران ساڵەی سیستەمی قەبیلەکان، هێرشی بەرامبەر و ئەو بەرخودانە سەربەرزانەی بە درێژایی مێژووی شارستانی نواندوویانە بەپێی پێویست ئەم ڕاستییە دەسەلمێنێت. ئەم کاروانە ڕەسەنەی مێژووە کە پێویستی بەپەرەپێدانی تیۆرییەکەی و سەرلەنوێ بونیادنانەوە هەیە.

## ج ـ بەرخودانی ئایینی یاخود شەڕی چینایەتی لە سیستەمی شارستانی ناوەندیدا

سیستەمەکانی شارستانی خاوەن بونیادێکی چینایەتین. هەم بەرهەمی جیابوونەوەی چینایەتییە هەم خۆشی خێرای دەکات. لەدەستنیشانکردنی دیاردەی چین زیاتر، ئەوەی جێی بایەخە چۆن کاراکراون و شێوەکانی پێکهاتنیانە. هیچ کاتێک لەڕاستینەی چینایەتیدا ناسنامەکان بەشێوەیەکی ڕووت خۆیان دەرناخەن و نالێن "من چینم". بەتایبەتیش لەمیانەی تەرمینۆلۆژی چینایەتی مارکسیستەوە ڕاستینەی چینایەتی بەشێوەیەکی ڕاست پێشکەش ناکرێت. هەروەکو چۆن هەڵوێستە زانستگەراییەکانی پۆزیتیفیزم ڕۆڵێکی-نابینایی و چەواشەکارانەی لەتەواوی دیاردە، ڕووداوو پەیوەندییە سۆسیۆلۆژیەکاندا بینیوە هەمان ڕۆڵی لەدیاردەی چین و

پەیوەندیەکانیشیدا بینیوە. مارکسیزم لەکاریگەری قووڵی ئەم لایەنەی مۆدێرنیتە ڕزگاری نەبووە. تا ئێستاش تێنەگەیشتوون کە یەکێک لەهۆکارە سەرەکیەکانی سەرنەکەوتنیان گرێدراوی ئەو هەڵوێستەیانە.

گرنگی و بایەخی کێشەی چینە کۆمەڵایەتیەکان هەم لەبواری زاراوە ـ تیۆری هەم لەبواری سیاسی ـ کرداری بەردەوامە. لەبواری ئایدیۆلۆژی و کردارییەوە پێویستییان بەنوێبوونەوەیەکی بنەڕەتی هەیە. بەتەنیا شیکارەکانی بۆرژوازی ـ پرۆلیتاریا لەڕوانگەی چینایەتیەوە ڕووداوەکانی مێژوو بەشێوەیەکی ڕاست ناخاتە ڕوو. چونکە سەرنەکەوتنی پراکتیکی پەیوەندییان بەچەمکی مێژووییشەوە هەیە. شیکارە پۆزیتیڤیستەکانی مارکسیەکان لەبارەی چین هەروەکو چۆن زۆر لەڕوونکردنەوەکانی ئەو ئایینە کلاسیکیانە جیاوازتر نەبوو کە ڕەخنەیان دەکردن، بگرە لەتێگەیشتنی هۆکارەکانی سەرنەکەوتنیش دوور بوون. ئەزموونی سۆڤێت ئەو لێکچوونەی سەلماند؛ دەتوانن تەلاریکی سەد نهۆمی ئاوا بکەن، بەڵام ئەگەر بناخەکەی بەشێوەیەکی ڕاست دانەنرابێت ناتوانن ڕێگری بکەن ل ڕۆژێکدا نەڕووخێت. هیچ کەسێک ناتوانێت نکوڵی بکات کە بوویەرێکی لەم جۆرە ڕوویداوە. وەک بانگەشەی بۆ دەکرێت هەڵوێستەکە زانستی نەبوو. ئەگەر زانستی بوایە، ئەمجۆرە شیکارانە ئەنجامنەدەدران. نموونەیەکی دیکەی بەکاریگەر دەرهەق بەو ڕاستیەی کە لەئەزموونەکانی سۆسیالیزمی بونیادنراو لەهەڵوێستە ئایینیەکان ژێرکەوتووتربوون ئەوەیە کە پارتی کۆمۆنیستی ئەفغانی دووچاری هات. بەڵام لەبەرامبەر ئەوەدا تاڵیبانی ئایینگەرا تا ئێستاش بەهێزە و دەتوانێت لەگەڵ دامەزرێنەرەکەی(ئەمریکا) و هاوپەیمانەکانی بجەنگێت.

پێویستە چۆن تەماشای سروشتی کۆمەڵگا بکەین؟ تەنانەت لەبارەی پەیڕەویشەوە کێشەگەلێکی گەورە سەبارەت بەم بابەتە لەئارادایە. سەرجەم پەیڕەوە تاقیکراوەکان بگرە مانایان بۆ سەرجەم شەڕە کاولکارەکان، قەیران و کێشە گەورەکانی ژینگە، بێکاری و برسێتی نەدۆزیوەتەوە. لەوانەیە بپرسن کە خاوەن ڕێباز و پەیڕەوەکان چ بەرپرسیارێتیەکیان لەمەدا هەیە. دەشێت ئەو وەڵامەیان بدرێتەوە؛

ڕاستینەی کۆمەڵگا یەکپارچەیە(یەکگرتووە). بەلانی کەم بەرەی زانستیش هێندەی بەرەی شەڕ بەرامبەر گشت گۆڕانکاریەکان بەرپرسیارە. ئەگەر هەست بەم بەرپرسیارێتییە نەکات واتە لەئەخلاقی زانستی بێبەشە؛ ئامرازێکی ساکاری سیستەمە. ئەو کاتە قسەکردن بەناوی شەڕی چینایەتی لەولاوە بمێنێت، تەنانەت مافی بانگەشەکردنی زانستیشی نابێت. سەرەکیترین خاسیەتی زانست بانگەشە کردنی ڕاستییە. تەواو جێگای خۆیەتی کە کۆتەڵی مێژوویی ئەخلاقی زانست برۆنۆ[٨] (لە ساڵی ١٦٠٠ زایینی لە ڕۆما سووتێنرا) وەک نموونەیەکی ئەم بابەتە پێشانبدەین. تاوەکو بەسووتانی جەستەت بەرگری لەباوەڕی ڕاستت نەکەیت هەرگیز ناتوانرێت باس لەئەشقی زانست (زانست بۆ مرۆڤ شتێکی ژیانییە) بکرێت. ئەشقی زانستیش نەبێت مرۆڤی زانست (زانا)ش نابێت.دەشێت مەنسوری حەللاجیش وەکو نموونەیەکی جیاوازتر پێشکەش بکرێت. هەر زانایەکی نەتوانێت ببێتە هێزی چارەسەرکردنی کێشە ژیانیەکانی سەردەمی خۆی، بەلانی کەم ئەگەر وەک سەربازێکی بەرەی شەڕ بەرپرسیارێتی ئەخلاقی باجی شەڕ بەمەرگ یاخود دیلی خۆی نەدات و پەسەندی نەکات، ئەوا شایانی هەڵگرتنی ئەو سیفەتە نییە.

---

[٨] فەیلەسوف، ئەستێرەناس، ڕاهیبێکی ئیتاڵییە، لە نێوان ساڵانی (١٥٤٨ ـ ١٦٠٠)دا ژیاوە. یەکێکە لە فەیلەسوفە دامەزرێنەرە گرنگەکانی فەلسەفەی ڕێنسانس و بەهۆی شاعیرییەوە بە نزیکترین فەیلەسوف دەژمێردرێت لە ئەدەبەوە. وەک هزرمەندێکی جۆشی سروشت پەروەرزییش بە ناو دەکرێت. یەکەم کەس بووە کە گوتوویەتی گەردوون بێ سنوور و چونیەکە و زۆر هەسارەی تر لە شێوەی زەویدا هەن. هەر لەسەر ئەمەش لەلایەن ئەنگیزاسیۆنی کەنیسەی کاتۆلیکی ڕۆما دەسگیر دەکرێت، حەوت ساڵ لەزینداندا دەمێنێت، سەرباری فشارو ئەشکەنجەیەکی زۆر لەبۆچوونەکانی پاشگەز نابێتەوە، دواتر لەلایەن هەمان دادگاوە دادگایی دەکرێت و بە لە ڕێ دەرچوویەک ڕادەگەیەنرێت. بە زیندوویی لەبەرچاوی خەڵک لەمەیدانی کامبۆ دیفۆری دەسووتێنرێت. کاتێک حوکمەکەی ڕادەگەیەنن دەڵێت "کاتێک حوکمەکەم ڕادەگەیەنن لەمن زیاتر ترس لە دڵتاندایە".

ئەم گووتە بەھەمان شێوە بۆ سياسەتمەداريش لەجێگای خۆيدايە، بگرە لەئەوانەی ديكە زياتريش. چونكە سياسەت بڕيارگای سەرەكی چارەسەركردنی كێشە كۆمەڵايەتيەكانە، ئامرازی گەڕان بەدوای قازانج و بەرژەوەنديپەرستی نييە. بەڕاستی ئەو كەسەی دووچاری شكست بووبێت بەراستی سياسەتمەدار بێت (بەڕێوەبەرێكی ساكاری كاروباری دەوڵەت نەبێت) تەنيا شايستەی دەركردن نييە، بەڵكو سيسفۆس[١] ێكە ئەنجامێكی زۆر لەمردن خراپتری لەكۆڵ ھەڵگرتووە. ئەوانەی بانگەشەی پێچەوانەكەی دەكەن كەسانێكن كەھەرگيز ژيانی كۆمەڵگای باوەڕمەنديان نەناسيوە.

نەک تەنيا دياردەی چين و نەتەوە، بەڵكو ئەوانەی بەر لەھەموو شتێک بەپێی پێويست ئاشنای سروشتی كۆمەڵگا نين پێويستە باش بزانن كە نەدەتوانن ببن بەزانا نە سياسەتمەداريش ئەوەی خوازياری ئاماژەپێكردنی بووم؛ ئەخلاقيبوون و بەرپرسيارێتی زانستی و سياسی زۆر گرنگە. ئەم دێرانە لەژێر سەختترين ھەلومەرجی سزای گۆشەگيريدا دەنووسم كە لەژووری ئينفراديدا بەسەرمدا سەپێنراوە. تاكە بەھای من لەسەرپێيان رادەگرێت ئەشقی زانستە، ئاماژەكردن بەو ڕاستييە قەرزی مرۆڤايەتی يە، جگە لەئەشقی زانست ڕێگە چارەيەكی ديكە نييە كە قورسترين ئازارەكان ـ مردنيشی لەناودا ـ ی ژيان بڕەوێنێتەوە.

## أ. چين و ئايين

بۆ بەزاراوەكردنی واقيعی بەرجەستەی نێوان چين و ئايين ديسان بۆ سەرچاوە ڕەسەنەكە شۆڕ دەبمەوە. بەئەندازەی ئاواكردنی شار و دەوڵەت سۆمەر بۆ ئافراندی ئايديۆلۆژيا و چين يش نموونەيەكی بەكاريگەر و فێركەرە؛ لەسەرچاوەی گريک ـ ڕۆما زياتر لەئاستێكی بەرز و فراوانتردا فاكتەرە بالاكانی فێركاری و ئەزموونبەخشی لەخۆوە دەگرێت. ڕەسەن

---

[١] سيسيفۆس يان سيزيف : (Sisyphps) كەسايەتيەكی ميتۆلۆژيای گريكە، قەدەر و چارەنووسەكەی ئەوەيە: بەردێک ھەڵبگرێت و تا لوتكەی شاخی ببات، بەلام بەردەكە بۆ خوارەوە خلۆر دەبێتەوە، سيزيف دێتە خوارەوە جارێكی ديكە بەردەكە لە كۆڵی خۆی دەكات و بەرەو لوتكە دەچێت، ئەم خرەكە تا ناكۆتا بەردەوام دەبێت.

پەسەندکردنی سەرمایەداری ئەوروپا و توێژینەوە سەبارەت بەچین و ئایدیۆلۆژیاکەی نەک تەنیا بۆ مارکسیزم بەڵکو ناکۆکیەکی گەورەیە بۆ هەموو ئەوانەی کار و خەباتی ئایدیۆلۆژی (زانست و فەلسەفەشی لە ناودا) بەڕێوە دەبەن. زۆر ئاشکرایە کە بەقەدەر رەسەنەکە ئەنجامی راست لەدوا نوسخەی ڕاستینەی کۆمەڵایەتی بەدەست ناهێنرێت. لەگووتەی راهیب زیاتر هەوڵدەدەم گووتەی ئایدیۆلۆگەکانی سۆمەر بۆ ئەوانە بەکار بێنم کە سەرقاڵی ئایدیۆلۆژیا، زانست و فەلسەفە بوون. سەبارەت بەچین و ئایینەوە لای سۆمەریەکان چی ڕوویدا، دەتوانرێت چ جۆرە وانەیەک لەمە هەڵێهنجرێت؟ لەهەڵسەنگاندنەکەمدا لەبەرجەستەوە هەنگاونان بۆ ئەبستراکت وەک پەیڕە و هەڵدەبژێرم.

هەروەها کاتێک لەزیگوراتەکان ـــ لەهەمانکاتدا بڕیارگایەکی ئایدیۆلۆژییە ـ کار و بارەکانی ئابووری، سیاسی و بەرگری ڕێکدەخران نەیاندەگووت " ئەو کارە ئابوورییە، ئەوەشیان سیاسەتە یان بەرگری". ئەو کارانەیان لەیەکتر جیا نەدەکردەوە. خەڵک دەخرانە بەرکارەوە، بوار و گۆڕەپانەکانی بەرهەمهێنان دەپارێزران. پلاننامەی سیاسەت (بەگوتەی ئەمڕۆ ئابوری سیاسی)یش دادەنرا. شێواز زۆر بەرجەستەیە. هەمووی لەناو یەککگرتوویی هەمەگیریدایە. بەهەرحاڵ هیچ کاتێک بیریان لەوە نەکردۆتەوە کە بەبێ ئاواکردنی زەقورە دەشێت ئابووری، سیاسەت و بەرگری ڕێک بخەن. بەر لەهەموو شتێک زیگورات (زەقورە) ناوەندی بەرهەمهێنانی ئایدیۆلۆژییە. لێرەدا چەمک و باوەڕییەکان دادەهێنران. شیمانەی بەهێز ئەوەیە کە چەمک و باوەڕیەکان لەکۆمەڵگای نیولیتیک ی هەزاران ساڵەی هیلالی زێڕین کۆدەکرایەوە کە خۆشیان بەردەوامی ئەو بوون. بەڵام کێشەی دەربازکردنی ئەو کۆمەڵگایەیان هەبوو. هەر بۆیە ڕێسا و باوەڕیەکانی ئەو چەمکانەیان وەک خۆی بەکار نەدەهێنا. پێویستی بەگۆڕانیان هەبوو. لەو کۆمەڵگایەی کە بونیادیان ناوە، کەسانێک هەبوون دەستیان بەسەر بەشی شێری زێدە ـ بەرهەمی بەپیتیەکەدا دەگرت، هەشبوون کە بەنان و سک کاریان دەکرد. هەروەها پێویستی بە کەسانێکی بەرگریکاریش هەبوو. چونکە هەر کاتێک لەناوەوە

یان دەرەوە ئەگەری سەرهەلدانی یاخیبوونێک بەرامبەر سیستەم هەبوو. سیستەمی بونیادنراو شتێکی لەمجۆرەیە. جێگرتن لەو سیستەمەدا بەرپرسیارێتیەکەی قورسە. لەهەموو لایەکەوە بونیادێکی کۆمەلایەتی جیاواز لەمرۆڤی کۆمەلگای قەبیلەی یەکسان و ئازاد جێگای باسە.

تاک و کۆمەلگای مرۆڤ، کۆمەلگای باوەڕی و زهنیەتە. هیچ کۆمەلگایەکی مرۆیی بێ باوەڕ و بێ زهنیەت نەبووە. کەواتە زهنیەت و باوەڕی بابەتی لەپێشینەیە. ئەگەر لەبواری زهنیەت و باوەڕی سەرکەوتن بەدەست نەهێنرێت کۆمەلگا ناخرێتە ناو کارەوە. بەرهەمی ئایدیۆلۆژی ئەم ئەرکە لەپێشینەیە جێبەجێدەکات. داهێنانی ئایدیۆلۆگەکانی سۆمەر ناسراون. وەرچەرخانێک لەئایینی دایکە خوداوەندەوە بۆ ئایینی خوداوەندی پیاو (ڕەنگدانەوەی کۆمەلگای پیاو سالاری)، لەتەوتەمی سەر زەویەوە بۆ خوداوەندی ئاسمان، لەخوداوەندی هەر قەبیلەیەکەوە بۆ خوداوەندی شار و خوداوەندی گشتی ئەرز و ئاسمان وەک ڕەمزی یەکێتی شارەکان جێگای باسە. ئەو مانایەی بەچەمکی خوداوەند دەدرێت خۆراکی خۆی لەدوو بوار وەردەگرێت: هزر و باوەڕیەکانی سەبارەت بەسروشتی کۆمەلگا و ئەو خەیالانەی زادەی هەر شتێکی دەرەوەی مرۆڤ و کۆمەلگاکەین کە بەسروشتی یەکەمی ناودەبەین. فاکتەرە کۆنەکانی کلتووری مەعنەوی پێشەنگایەتی ئەمانە دەکەن. واتە ئامرازە نوێکانی ڕەواکردن؛ فاکتەرەکانی میتۆلۆژیا و ئایین لەم سەرچاوانەوە تێر خۆراک دەبن و پێویستیەکانی بونیادنانی کۆمەلگای نوێ دەخەنە ڕوو. تا سەرکەوتن بەدەست دێنن چالاکی ئایدیۆلۆژی بەردەوام دەبێت. کاتێک پەسەندکرا ئیتر دەکرێت بەدامەزراو و سروت، مرۆڤی ئەرکدار دەستنیشان دەکرێن، قوربانی پێشکەش دەکرێت و پەرستگاکان ئاوادەکرێن. تەواوی ئەم کارانەش لەپێناو بەردەوامکردنی کۆمەلگا نوێیە بەپیت و قازانج بەدەست هێنەکەیە. ئێرە شوێنی باسکردنی فاکتەرەکانی پانتائۆنی ئەن، ئەنلیل، ئەنکی، نینهورساک، ئینانا، عەشتار، ماردۆک..هتد نییە. بەلام ئاشکرایە ئەو کارەی ئەنجامدراوە بەئامانجی بەدەست هێنانی ڕەوابوونی کۆمەلایەتی بووە. ئەوەی لێرەدا گرنگە سیستەمی نوێی خوداوەندەکانە کە

شوێنی سیستەمی کۆنی خوداوەندەکانیان گرتۆتەوە نوێنەرایەتی چی دەکەن یاخود ڕەنگدانەوەی چین.

کە دەگوترێت دونیای مەعنەوی ڕەنگدانەوەی کلتووری ماددییە دەسنیشانکردنێکی چەوت نییە. بەڵام چۆنیەتەکەی گرنگە. بەهەرحاڵ نوێنەرایەتیەکی هاوشێوەی ڕەنگدانەوەی وێنەی گا لەئاودا جێگای باس نییە. چونکە ڕەنگدانەوەی مەعنەوی بەشێوەیەکی زۆر جیاواز ڕوودەدات. ڕەنگدانەوەیەکی سادە نییە. بەڵکو زۆر جیاواز پێکدێت. بونیادێکی ڕاستەقینەیە کە مرۆڤ دەکات بە مرۆڤ. بونیاد و ڕەنگدانەوەی قەبە. دوو دەستەواژە و چەمکی لێک جیاوازن. هەڵوێستێکی قووڵی سۆسیۆلۆژیانە دووره پەرێز نابێت و پەسەندی دەکات کە خوداوەند خەیاڵی ناسنامەی کۆمەڵگایە. پێویستە خەیاڵی ناسنامەی کۆمەڵگا بچووک نەبینین. بەدواداچوونی ئەم خەیاڵە تا تەنۆلکە بچووکەکانی ژێر ئەتۆمیش درێژ بۆتەوە. تەنانەت لەڕۆژی ئەمڕۆماندا لەتاقیگەکانی جەرەن[١٠] 'CERN' بەدوای تەنۆلکەی 'گەردیلەی هیگس' ، "تەنۆلکەی ئیلاهی" دا دەگەڕێن کە بونیادی ماددە پێکدێنێت. چیرۆکەکەی باس بکرێت چەندین بەرگە کتێب پڕ دەکاتەوە. لێرەدا سۆسیۆلۆژیای پۆزیتیڤیست پیشاننادەم. زۆر باش ئاگادارم کە ئەو هەڵوێستە قەبەترین ئایینگەراییە. بەو سیفەتەی خەیاڵی ناسنامەی کۆمەڵگایە دەتوانم بڵێم خوداوەند کۆی گەردوونی ١٣.٨ ملیار ساڵەیە. دەشێت بڵێین ئەو شتەیە کە لەناو ناچێت. نیازی ئەنجامدانی میتافیزیایەکی وشکیشم نییە. بەئامانجی ئاگادارکردنەوەی ئەوانەی بابەتەکە سادە و بچووک دەبینین، ئاماژەی پێدەکەم. وەک چۆن کۆمەڵگا تەوژمی هەرە ژێری مادە ـ وزەیە، دەستەواژە و چەمکی خوداوەندیش نەرمترین دەستەواژەی مانا ـ وزەیە. ئەوەی بیەوێت چەندەی خوازیارە مانای لێ بار دەکات. ئەوانەی هونەری مانایان کردۆتە پیشەی خۆیان

---

[١٠] تاقیگەی سیرن یان ناوەندی ئەوروپی بۆ لێکۆڵینەوەی ناوەکی (Ceren ): تاقیگەیەکی سویسرییە دەکەوێتە نزیک جنێڤ. گەورەترین تاقیگەی خێراکردنی پێکدادانی هایدرۆنەکانە. ئەو تاقیگە زەبەلاحە درێژیەکەی لە ٢٧ کم زیاترە، ١٣٠ م لەژێر زەوییەو دەکەوێتە سەر سنووری سویسرا ـ فەرەنسا.

(دەتوانین بەفەیلەسوف ناویان ببەین) وەک پسپۆری ئەم کارەن. پێخەمبەرەکانیش بەلانی کەم هێندەی فەیلەسوفەکان شارەزای داهێنانی مانا و چەمکن.

ئەوەنتاژمان سەبارەت بەشارستانی سۆمەر لەوەدایە بەشێوەیەکی رووت و پەتی پیشانمان دەدات کە کارەکە بەمجۆرە بەڕێوە چووە. هیچ نموونەیەک وەک شارستانی سۆمەر بەشێوەیەکی هێندە سادە، بەڕادەی سادەییەکەشی شکۆمەند پەرەسەندنی کلتووری ماددی بۆ بواری مەعنەوی نەگواستۆتەوە. ئەمەیە بانگەشەکەم؛ ئەوەی ناخوازێت، ناچار نییە بزانێت و بڕوا بکات. پەنتائۆنی سۆمەر خۆ بەئیلاهیکردنی چینە نوێیە هەڵکشاوەکەیە. بەسووربوونەوە داکۆکی لەسەر دەکەم: ئەم مەسەلە زۆر روون و ئاشکرایە. ڕۆڵی ڕەگی تەواوی ئەو لێکەڕینانەی ئایین، فەلسەفە، هونەر و زانستی بینیوە کە دواتر بەدرێژایی مێژووی پێنج هەزار ساڵەی شارستانی ناوەندی پەرەیسەندووە. خودی زەقورە ئەم ڕاستییە ڕوون دەکاتەوە. نهۆمی هەرە سەرەوە پەنتائۆنی خواوەندەکانە. نهۆمی ناوینیش هی ڕاهیبەکانە، پەیامبەرانی خوداوەند و داهێنەرانی هونەری مانایە، نهۆمی خوارەوەش شوێنی بەندە ـ کۆیلە کارکەرەکانە. ئایا رووبەڕووی ئەم سێیانەیەی هەموو ئایینەکان نابینەوە؟ سیستەمی خوداوەند ـ پەیامبەر ـ بەندەکان. ئەی سیستەمی چینایەتی بنەڕەتی بەم شێوەیە نییە؟ لەکاتێکدا سەرباز+بەڕێوەبەری سیاسی+ڕاهیب چینی سەروو پێکدێنن، چینی ناوین+بیروکراسی+دەزگاکانی ڕەواکردن (زانکۆ، پەرستگا، میدیا) ئەڵقەی ناوین پێکدێنن. ئەوانەی هەرە خوارەوەش ئەو کەسانەن کە لەدەرەوەی هەردوو چینی یەکەم دەمێنن: پرۆلیتاریا، لادێیی، فەرمانبەر، خوێندکار، ژن، منداڵ، بێکار و.. هتد.

سۆمەریەکان بۆ ئەوەی دامەزرێنەر و ئافرێنەرانی مانای دوای خۆیان درۆ و دەلەسە پێش نەخەن بەشێوەیەکی زۆر سادە ناوەڕۆکی کارەکەیان بونیاد ناوە کە مایەی تێگەیشتن بێت. کاتێک دەڵێم بەشێوەیەکی سادە و ساکار مەبەستم ئەوە نییە وەک بلێی یاری دەکەن، بەڵکو دەڵێم لەمیانەی توانایەکی بێ وێنەوە هونەری مانایان جێبەجێ کرووە. کاتێک بەقۆناخی

ئیمپراتۆریەکانی ئەکاد، بابل وئاشوور دەگەین دەبینین کە لەپەنتائۆنی فرە خوداییەوە هەنگاو بۆ هەڵکشانی خوداوەندێک هاوێشتراوە کە بەسەر ئەوانی دیکەدا زاڵ دەبێت و دەیانکات بەیاریدەدەرەکانی خۆی. ئاشکرایە چەندە هێز و نفوز ناوەندی دەبێت پەنتائۆن یش ناوەندی دەبێت. کاتێک نۆرە دەگاتە ئەو پاشایانەی هەرگوتەیەکیان ڕێسا و یاسایە، دەرگا بۆ باوەڕییە تاکخوداییەکانیش دەکرێتەوە. لەکۆمەڵگای نیولیتیکدا هەر کلان و قەبیلەیەک خوداوەندێکی خۆی هەیە. چەندە کلان و قەبیلە هەن، هێندە خوداوەندەش. کۆمەڵگا گەورە بێت و بەدۆخێکی یەکگرتوو بگات، چەندە جیابوونەوەی چینایەتی بێتە ئاراوە و بەڕێوەبەرایەتیەکان پێک بێن، تەنانەت بەڕێوەبەرایەتییە تاکە کەسیەکان ئاوابکرێن، ژمارەی خوداوەندەکانیش لەزۆرەوە بۆ یەک دادەبەزێت. بەشێوەیەکی زۆر ڕوون و ئاشکرا نوێنەرایەتی دەکرێت. چەندەی ژنان لەناو کۆمەڵگا کاریگەری خۆیان لەدەستدەدەن، ڕەگەزی خوداوەندەکانیشمان دەگۆڕێت. خوداوەندی پیاو، باوک و باپیر پەیدا دەبێت.

ئەوەی دەیخەینە ڕوو هێڵکاریەکە. بێگومان پرۆسەکە زۆر ئاڵۆزەو پڕ لەشەڕو پێکدادان گوزەری کردووە. ڕاهیبەکان کاتێک ئایینەکانیان نزیک بەمیتۆلۆژیا ئاوا دەکرد، ئاستی باوەڕی مرۆڤی قۆناخی خۆیان بەبنەما دەگرت. ئەو خاڵەی لەژێر سەرکەوتنەکانیاندا شاراوەیە؛ بونیادی گونجاوی بەگوێرەی سەردەمیان ئاوا کردووە. کاتێک کۆمەڵگا و تاکەکانی گۆڕاون ئایینیش گۆڕانکاری بەسەردا هاتووە. لەلایەکی دیکەشەوە هەندێک کەس دەردەکەوتن کە ئەم تۆڕانەی خوداوەندەکانیان بەگوێرەی بەرژەوەندی، هزری تاکەکەسی و باوەڕیەکانیان نەدەبینی. پێکدادانی بەرژەوەندیەکان لەناوەوە و دەرەوەی کۆمەڵگا بەبێ کارتێکردنە سەر بیروباوەڕیەکان بەڕێوە نابرێت. تاک و چینە پێکدادەرەکان، لەئایین و خوداوەندە پێکدادەرەکاندا رەنگدەداتەوە. پێویستە ئەم ڕێسا کۆمەڵایەتییە زۆر بەباشی بزانرێت؛ تا شەڕێکی گەورەی هونەری مانا ئەنجام نەدرێت، هیچ شەڕێکی چینایەتی جدی ڕوونادات. بەدەست و دڵی ڕووت شەڕی بەهێز و هەمیشەیی ناکرێت. پێچەوانەکەشی ڕاستە. ئاشتی و تەبایی

مەزنی کۆمەڵایەتی، لەمیانەی تەبایی و ئاشتی نێوان هونەرە مەزنەکانی ماناوە بەدیدێت.

داینەمۆی شارستانی ناوەندی کاتێک لەشارەکانی سۆمەر کەوتە ڕێ خوداوەندەکانیشی لەگەڵ خۆی بارکردبوو. بەبێ ئەوەی گۆڕانکاریەکی جدیّ لەهێڵە سەرەکیەکانیدا ڕوو بدات، ئەو گۆڕانکاریانەی لەساڵانی ١٦٠٠ پ.ز لەقۆناخی تەنگەژە بابل لەهێزەکانی دەسەڵاتدا ڕوویدا لەبواری ئایینیشەوە دووڕیانی دەکرد بەبژارێک. تەنگەژە و کەوتن، گومانکردن و کەوتنە لە سیستەم. نەدەبوو کە گومان و بێ باوەڕبوون بە خوداوەندەکانی پەنتائۆن ڕەنگ نەداتەوە.

## ب . دەرکەوتنی ئاینی ئیبراهیمی

شیمانە دەکرێت نەمرودەکان (پاشا و بەڕێوەبەرەکانی سەروو)ی بابلیش هەڵکەوتەی قۆناخێکی تەنگەژە هاوشێوەی کەوتن و گومانکردنی سەبارەت بەخوداوەندەکان هاتوون. مێژووی ڕاستەقینە لەبەر دەستدا نییە. بەڵکوچیرۆکی هەزاران ساڵ بەر لەئێستا جێگای باسە. بەڵام لەسەر بنەمای پێوانە واتادارەکانی زانستی ڕۆژی ئەمڕۆمان دەتوانین هەندێک شرۆڤە و ڕاڤە پێشبخەین. ئەگەر ئەو ڕاستییە ڕەچاو بکەین کە مێژوو هونەری ڕاڤەیە، ئەوا هیچ گومانی تێدا نییە کە هێزی هەر ڕاڤەیەک لەمیانەی مەودواو نزیکیەکەی لەڕاستیەوە پێودانگ دەکرێت.

ئەو شوێنەی حەزرەتی ئیبراهیم لێیەوە کۆچی کردووە ئورفایە. ڕاڤەی کۆمەڵگای مێژوویی ئورفا دەشێت لەڕاستینەی ئایینی ئیبراهیمی نزیکمان بکاتەوە. هەروەها ئەگەر ماوە و قۆناخی شیمانەکراوی دوورکەوتنی لەژێر ڕۆشنایی مێژووی جیهانیدا ڕاڤە بکەین، لەوانەیە هەنگاوێک زیاتر نزیکی ڕاستی ببینەوە. پێویستە نەکەوینە داوی خۆشەویستی ڕاستی تەواو. چونکە ڕاستیەکی بەمجۆرە بوونی نییە.

لەدوای چوارەمین قۆناخی سەهۆڵبەندان بەهۆی ناوچە بەرفراوانەکەیەوە ژیۆبیۆلۆژیای ئورفا بۆ جڤاتەکانی مرۆڤ دیمەن و ڕووخساری بەهەشت دەنوێنێت. کەشی ئاودێری سروشتی لەناوچەکە زاڵە.

لەکار و خەباتە زانستییە پەیوەندیدارەکانەوە بۆمان روون دەبێتەوە لەمیانەی ڕووەک و زیندەوەرەکانی یەوە ناوچەیەکی زۆر سەرنجڕاکێش بووە. چاوەڕوانی دەکرێت دوای سەدان هەزار ساڵ و گەیشتنی مرۆڤایەتی بەقۆناخی زمانی هێمایی لەم شوێنەدا تەقینەوەیەک بەخۆیەوە ببینێت. هەروەها بەهۆی ڕێگا مەزنەکەی دەرکەوتنی مرۆڤ کە سەرچاوەی خۆی لەرۆژهەڵاتی ریفی ئەفریقیاوە دەگرت، ڕۆڵی وێستگەی بڵاوکردنەوەی مرۆڤی بۆ دونیا دەبینی. ئەوانەی تێیدا ژیاون یان تاقییان کردۆتەوە ئاگادارن کە هەلومەرجی لەبار و گونجاوی هەیە. دەتوانین بڵێین بۆ مرۆڤایەتی ئەو کاتە ناوچەیەکی نموونەیی حەوانەوە، گوزەران، خۆپاراستن و زۆربوون بووە.

مسۆگەر بووە کە بەردە چەقێنراوەکانی لەهەڵکۆڵینەکانی گۆبەکلی تەپە دەرکەوتوون پەرستگان و مێژووەکەشیان بۆ دوازدە هەزار ساڵ بەر لەئێستا دەگەڕێتەوە. گەڕاندنەوەی مێژوو بۆ ١٥٠٠٠ پ.ز زێدەڕۆیی نابێت. چونکە کلتوورێکی هەزاران ساڵەی لەپشت نەبێت ئەمجۆرە پەرستگایە بونیاد نانرێت. ئەم چەسپاندنە زانستییە و ڕاڤەی جیۆبایۆلۆجی بەیەکدەگەن. نزیکەی پازدە هەزار ساڵ زیاترە کە سیستەمێکی بەهێزی قەبیلە جێگای باسە. چونکە پەرستگا نوێنەرایەتی سیستەمی قەبیلە دەکات. هەر قەبیلەیەک پەرستگایەکی بازنەیی بچووکی هەیە. شیمانە دەکرێت لەژێر زەویدا نموونەی دەرنەهێنراوی هاوشێوە هەبێت. بۆ نموونە لەگردۆڵکەکانی نزیک حەڕان پاشماوەی پەرستگای نیوبازنەیی هاوشێوە جێگای باسە. لادێییەکانی ڕۆژی ئەمڕۆمان بەنانەت خەڵکی شاریش خاوەنی هونەری دروستکردنی ئەو بەردە چەقێنراوانە نین. کەواتە مرۆڤی ئەو قۆناخە لەدۆخ و پێگەیەکی پێشکەوتوودا دەژیان. گەورەیی پەرستگاکان چل جار هێندەی پەرستگاکەی مەککە (قۆناخی دەرکەوتنی ئیسلام)یە. کەچی بونیادی پەرستگاکەی مەککە لەبەردی زۆر سادە و ئاسایی دروست کراون. لەدۆخێکی وەهادا دەتوانرێت ڕۆڵی ناوەندی پیرۆزی ئورفا بەلایەنی کەم بۆ قۆناخێکی پازدە هەزار ساڵ بەر لەئێستا بگەڕێنرێتەوە. نەک تەنیا بەگوێرەی مەککە، بەڵکو بەبەراورد لەگەڵ

قودس (لەکۆتاییەکانی سالآنی ١٠٠٠پ.ز بناخەی یەکەمین پەرستگا لەلایەن پێخەمبەر سولێمانی کوڕی حەزرەتی داود دانراوە) و تەواوی شوێنە پیرۆزەکانی دونیا لەو قۆناخەدا هەم زۆر گەورەترە هەم لەلایەنی زەمەنەوە زۆر کۆنترە. بەگوێرەی شرۆڤە و ڕاڤەی شەخسی خۆمەوە تا سەردەمی حەزرەتی ئیبراهیم بەلایەنی کەم ناوچە دە هەزار سال لەپێگەی ناوچەیەکی ناوەندیدا بووە.

ئەو قۆناخەش کە بەنیولیتیک ناودەبرێت مانای دە هەزار سال ناوەندێتی جیهانە. لێرەدا دەستەواژەی ناوەند گرنگە. لەدەستەواژەی شارستانی ناوەندی پێنج هەزار سالەوە ئاگادارین کە پەیوەندی ناوەند ـ کەنار لەمێژووی جیهاندا هەمیشەییە. مێژووی بێناوەند بوونی نییە. لەمێژووی شارستانیدا جێگۆڕکێیەکی زۆر لەنێوان پەیوەندیەکانی ناوەند ـ کەنار ڕوویداوە. هیچ شوێنێک بەهەزاران سال پێگەی ناوەندێتی نەبووە. بەو سیفەتەی یەکەمین ناوەندی مرۆڤایەتییە و بەهۆی ماوەکەشی ناوچەی ئورفا شوێنێکی بێ هاوتایە. تایبەتمەندیەکی دیکەی خۆجێیی خەلکی (مرۆڤەکانی) ئەو ناوچەیە. لەوانەیە خەلکانێک هەبن لەدەرەوە هاتبن و تێیدا نیشتەجێ بووبن. بەلام ئەو گەلەی پەرستگاکانی بونیادناوە بەردەوام لەو ناوچەیە ماوەتەوە. لەبەر ئەوەی شوێنی بنەڕەتی نیشتەجێبوونی هۆریەکانن کە یەکەمین کۆمەلگای قەبیلەیە لەمێژوودا ناودێرکرابێت، هەروەها بوونی پایتەختی ئیمپراتۆریەتی میتانی (واشوکانی ـ سەرێکانی ـ جەیلان پنار) لەم ناوچەیەدا، دەرفەت بەتێگەیشتنی ناسنامەی ڕەسەنی گەلەکەی دەدات. هەروەها لەپێگەی ناوەندی هیلالی زێڕینیشدایە. ئەو رابوونە کلتوورییەی سەرچاوەکەیان بۆ هیلالی بەپیت دەگەڕێتەوە مسۆگەرە کە ڕۆلی سەرەکییان لەتێرخۆراککردنی هەر لایەکی ئەو ناوچەیەدا هەیە بەتایبەتیش شارستانیەکانی سۆمەر و میسر. پێویستە سەفەری حەزرەتی ئیبراهیم بۆ میسر و پەیوەندیەکەی بە بابلەوە وەک چیرۆکێکی سەلمێنەری ئەو ڕاستیە ببینرێت. وەک دەزانرێت هیکسۆسەکان (لە سالآنی ١٨٠٠پ.ز) لە میسر خانەدانێکیان ئاوا کرد لەم ناوچەوە هەلقولا بوون. پەرستگاکان ڕاستیەکی

دیکەش ئاشکرا دەکەن. دەتوانین بیخەملێنین کە کلتووری میواننداری و دیاری لەکارە گرنگەکانی پەرستگا بوون. ئەم ڕاستیەش سەرەداوی سەرهەڵدانی بازرگانیمان بەدەستەوە دەدات. لەپەرستگاکانی سۆمەرەوە تێدەگەین کە پەرستگاکان یەکەمین ناوەندی ئاڵوگۆڕکردن بوون. کاتێک خەسڵەتی بازرگانی لەسەرهەڵدانی حەزرەتی ئیبراهیم ڕەچاو بکرێت، ئەوا ئەم ڕاستییە بەرجەستەتر دەبێت. ژماردنی بەڵگە و تێزەکانی دوای حەزرەتی ئیبراهیم پێویست و گرنگ نابینم. چونکە زۆر باش دەزانرێت.

ئورفای سالانی ١٦٠٠ پ.ز لەناوەڕاستی سێ هێزی مێژوویی ئەو قۆناخەدایە: میزۆپۆتامیای خوارووی ژێر کۆنترۆڵی هێزەکانی سۆمەر- بابل - ئاشوور، هیتیتەکانی لەئەنادۆڵی ناوەوە لەهەڵکشان دان و هەروەها میسر کە خانەدانە تازەکانی فیرعەون تێیدا بەهێز بوون. هەر لەو قۆناخەدا لەپاڵ ئەوەی ناوچەی ئورفا بەپیتترین ناوەندی ژیۆبیۆلۆژیا بوون، بەرەو گرنگترین ناوەندی جیۆپۆلیتیک هەنگاوی دەهاوێشت. میتانیەکان ئەم بۆشاییە جیۆپۆلیتیکە پڕدەکەنەوە و هەڵدەکشێن. لەسەرەتای قۆناخی مێژوویەکداین کە توێژەرە قووڵەکانی مێژوو بۆ یەکەمین جار وەک قۆناخێکی شکۆداری دیبلۆماسی و پەیوەندی نێوان شارستانیەکانی هەڵدەسەنگێنن. لەکاتێکدا ئاڵوگۆڕێکی بەردەوامی نێوان کلتوورەکان لەئارادا بوو تەواو گەردەلوولێکی بازرگانی هەڵی کردووە. قۆناخێکە کە بازرگانی وەک کلتوورێک بووە بەنەریت و دامەزراوە. بەردەوام کۆشکەکان بووک دەگۆڕنەوە و کچ بەیەکتری دەدەن. ئایین و ئایدیۆلۆژیاکان تێکەڵ دەبن و دەگۆڕێن. هیتییەکان خۆیان وەک 'وڵاتی هەزار خوداوەند دەناسێنن'. ئەو ناوچەیە ناوەندی "ئەسپسواری"یشە کە لەو قۆناخەدا زۆر پێویستە. وڵاتی ئەسپەوانی ئەسپی بەناوبانگی (کیکولی)یە کە لەداستانەکاندا باس دەکرێت. قۆناخی لوتکەی سیستەمی قەبیلە جێگای باسە.

ئورفا تەنیا بەهۆی پیرۆزی ئایینەوە گرنگ نییە، بەڵکو ئەو بەرە کلتوورە مێژوویییە لەپشت هونەرمەندێتی گۆرانی، پەند، ساز، دەهۆڵ و زوڕنادا هەیە. ئەو ڕاستیە لەپشت دەرکەوتنی حەزرەتی ئیبراهیمیشەوە

هەیە. لەڕاستیدا تا ئێستاکەش ئەو بابەتە ئاشکرا و زەلال نییە ئەوەی کۆچی کرد ئیبراهیمێک بوو یان هەزار. ئەمە هێندە گرنگیش نییە. ئەوەی گرنگە لەو قۆناخەدا مەیلێکی بەهێز لەئارادایە. هەلومەرج و ناوچە زۆر بەجموجۆڵە و بازرگانیشی کردووە بەپیشەیەکی بەسوود و مایەی قازانج. حەزرەتی ئیبراهیم تەنیا تاکێکی چینی بازرگانی بەدامەزراوە بووە. ئەوەی گرنگە بازرگانی نێوان شارستانیەکان بەدامەزراوە و بەدەزگا بووە. بازرگانی ئاژەڵ زۆر زیندووە. لەم لایەنەوە ناوچە زۆر لەبارە هەر بۆیە حەزرەتی ئیبراهیم لەگەڵ مێگەلەکانی لەجموجۆڵدایە. ئاشکرایە کە بازرگانی مەڕ و ماڵات بووە. سەفەری هەزاران بازرگانی بەم جۆرە بۆ میسر سروشتی بازرگانییە. بازرگانی کۆیلەش لەئارادایە. وەک کۆیلە فرۆشتنی حەزرەتی یوسف مانادارە. بازرگانی ژنی کەنیزەکیش جێگەی باسە. کڕینی هاجەر لەلایەن حەزرەتی ئیبراهیمەوە سەبارەت بەم مەسەلە ڕۆشنکەرەوەیە.

هەروەها حەزرەتی ئیبراهیم خاوەن قەبیلەیەکی بەهێزە. خۆشی سەرۆک قەبیلەیە. لەکلتووری شکۆداری پەرستگاوە دەرکی پێدەکرێت کە هەر قەبیلەیەک خواوەندێکی تایبەت بەخۆی هەبووە. ئاشکرایە کە خواوەندی قەبیلەی حەزرەتی ئیبراهیم لەگەڵ خواوەندەکانی بابل دەجەنگێن کە هەوڵی کۆنترۆڵکردنی ناوچەکە دەدەن. بەرژەوەندییە ماددیە ناکۆک و یەکتر بڕەکان، لەکلتووری خوداوەندە هەڵبژاوەکان ڕەنگ دەداتەوە. شیمانەیەکی بەهێزە کە وشەی ئوری ناوی ئۆرفا زادەی سیفەت یان ناوی ئور (گرد)ی زمانی سۆمەرییە. ئەگەری هەیە ئورفا مانایەکی وەک (خەڵکی گردۆلکە) هەبێت. ئەمە ماناپێدانێکی ڕاستە. بابەتێکی دیکەی گفتوگۆ کراو بنەچەی ئەتنیکی حەزرەتی ئیبراهیمە. تەواو زەلال نییە هۆرییە یان سەمیتیک. تەنانەت لەڕۆژگاری ئەمڕۆشماندا ناوچەکە هەرێمێکی تێکەڵە. وەک بڵێی کلتووری قەبیلەیەک نییە تێکەڵی نەبووبێت. زمانی عیبرانیش پڕە لەو نموونانەی کە لەبواری ئەتمۆلۆژیەوە تێکەڵاویەکی سنووردار بەبیری مرۆڤدا دەهێنێت.

هەمووومان بەشێوەیەکی دەرخکراو ئەو چیرۆکە دەزانین کە لەپەرتووکە پیرۆزەکان سەبارەت بەحەزرەتی ئیبراهیم گووتراوە. لەچوارچێوەی ئەو چیرۆکانەی کە کراونەتە مولکی پەرتووکی پیرۆز؛ لەگەڵ نەمروددا ململانێی کردووە، بتەکانی شکاندووە، خواستویانە فڕێی بدەنە ناو ئاگر، بەڵام لەمیانەی پەڕجوویەکەوە ڕزگاری بووە، دواتر بۆ فەلەستین ـ ئیسرائیلی ڕۆژی ئەمڕۆمان کۆچی کردووە، دوای ئەوەی هاجەری کەنیزەک ئیسماعیلی دەبێت بۆ مەککە ناچاری کۆچ دەکرێت، لە سارای ژنە ڕەسەنەکەی ئیسحاقیان دەبێت، یاقوبیش یەکێک لەدوو کوڕەکانی ئیسحاقە، یوسفی کوڕی یاقوبیش وەک کۆیلە دەفرۆشرێتە فیرعەونی میسر، لەدەرەنجامی ئەشق و تەڵەکەبازیەکانی کۆشکیشدا تا پلەی وەزیری بەرز دەبێتەوە. چەندین چیرۆکی دیکەش دەکەونە ناو ئەو چوارچێوەیەوە.

ئاشکرایە کە کلتووری حەزرەتی ئیبراهیم کلتووری هیچ یەکێک لە شارستانیەکانی سۆمەر و میسر نییە. بەڵکو کلتووری هەزاران ساڵەی قەبیلەکانی ئورفایە. بەڵام کلتوورێکە لەقۆناخی وەرچەرخانێکی گرنگدا کراوە بەتێکەڵە و سەنتێز. ئەگەر چیرۆکەکەی ڕاڤە بکەین لەوانەیە بەهەندێک ئەنجامی مانادار بگەین. نەمرود ئەدرەسی والیەکانی بەڕێوەبەرایەتی بابلە. ئەو شوێنەی کۆی بتەکانی لێیە نوێنەری پەنتائۆنی بابلە لە ئورفا. باوکی حەزرەتی ئیبراهیم لەخزمەتی نەمرود دایە. بەڵام گرفت و ناکۆکییان هەیە. هەرچیەک بێت ڕەسەنێکی قەبیلەی ناوچەیە. چاوەڕوان دەکرێت باوەڕی ئایینی تایبەت بەخۆی هەبێت. حەزرەتی ئیبراهیم بەدوای بەرژەوەندی باوکیەوەیە، لەم سۆنگەیەوە بەدوای بەرژەوەندی قەبیلەوەیە. ئەنجامیش ململانێ و شەڕە. شکاندنی بت و ئەزموونی فڕێدانە ناو ئاگر بەشێوەیەکی ڕوون و ئاشکرا ئەو ڕاستییە دەخەنەڕوو. کەواتە نەک تەنیا قەبیلەی خۆی بەڵکو ڕێبەرایەتی شەڕی بەرژەوەندی تەواوی قەبیلە هاوشێوەکان دەکات. بەمانایەک لەماناکان شەڕی خۆجێیی و وڵاتپارێزییە بەرامبەر بەکۆلۆنیالیزمی بابل. پەنتائۆنی بابل سەنگەر و بەرەی مانای ئەم شەڕەیە، بڕیارگای ئایدیۆلۆژیەتی.

هەرچی بڕیارگای ئایدیۆلۆژی حەزرەتی ئیبراهیمە کلتووری مەعنەوی قەبیلەیە، واتە ئایینگەرایی و ئیلاهیگەراییەکەیەتی. بەگوێرەی ئەوەی خۆی ڕێبەرایەتی کردووە ئەوا خوداوەندی قەبیلەکەشی ڕێبەرایەتی خوداوەندی قەبیلەکانی دیکە دەکات. هەر بەم جۆرەش دەبێت. لەبەرئەوەی دەوڵەتە نەمرودی بابل لەشەڕی دوو بەرەی مانادا بەهێزتر یان سەرکەوتوو دەبێت. ڕێگاکانی کۆچبەریش بۆ حەزرەتی ئیبراهیمیش دەبێت بەناچارییەک. هەم ساڵان هەم ڕێگاکان بۆ حەزرەتی ئیبراهیم زۆر زەحمەت و سەخت دەبن. چونکە ئەو شەڕەی تێی کەوتووە جدییە. دژی نەریتی شارستانی دەوەستێت. شکاندنی بت ڕەتکردنەوەی سیستەمی شارستانی فەرمی یە (مۆدێرنیتەی فەرمی قۆناخی خۆی).

بێگومان سەدان کەس و قەبیلەی بەمجۆرە لەگەڵ شارستانی ناتەباو لەناو شەڕدا بووە. بابل و ئاشوور بە 'قڕکردنی قەبیلە' بەناوبانگن کە بەجۆرێک لەجۆرەکان جینۆسایدی ئەو قۆناخەیە. لەم سۆنگەیەوە قۆناخی ناڕەحەتی و شەڕێکی مەزن جێگای باسە. حامورابی بەناوبانگ پاشا سەرسوڕهێنەرەکەی ئەم قۆناخەیە (١٧٠٠ـ١٦٠٠ پ.ز). گوایە یەکەمین ڕێساکانی یاسای داناوە.

لەم لایەنەوە تێکۆشانی حەزرەتی ئیبراهیم بەجۆرێک لەجۆرەکان لەشەڕی ڕزگاری کۆلۆنی و چەوساوەکانی ڕۆژی ئەمڕۆمان دەچێت بەرامبەر بەشارستانی سەرمایەداری. ئەگەر یەکێک لەهۆکارەکانی چوونی بۆ میسر بازرگانی مەڕ وماڵات بێت، لەوانەیە دووەمین هۆکاری گرنگ پێویستی دۆزینەوە و گەڕان بەدوای هاوپەیمانێک بێت. مسۆگەر دەشێت ئەم دەرەنجامە لەچیرۆکی یوسف هەڵبهێنجرێت. چونکە کێبڕکێی نێوان شارستانیەکان لەم قۆناخەدا چەندە بڵێی پەرەیسەندووە و دژوار بووە. ژمارەیەکی زۆری پێکدادانی نێوان هیتیت ـ میسر، بابل ـ هۆری (هیتیت) و بابل ـ میسر تۆمارکراوە. وەک دیاردەبێت حەزرەتی ئیبراهیم لەدەرەوەی کۆنترۆڵی هەرسێ شارستانیەت لەنزیک شاری قودس نیشتەجێ بووە کە کەشوهەواکەی تۆزێک لە ئورفا دەچێت. وەک کۆچبەرێک ژیانی خۆی تێدا بەسەر دەبات. بەزەحمەتیەوە شوێنی گۆڕێک دەکڕێت. پەیوەندییان بە

ئورفاوە بەردەوام دەبێت. یاقوب ی نەوەکەی لەگەڵ راهێل و لیای کچانی لاڤانی خزمە نزیکەکەی هاوسەرگیری دەکات.

ئەوەی سەبارەت بەبابەتەکەمان گرنگ و بایەخداره ، ئەو وەرچەرخانەیە کە ئایینی حەزرەتی ئیبراهیم پێیدا تێپەڕیوە. وەک دەبینرێت حەزرەتی ئیبراهیم کەوتۆتە ناو گومانێکەوە. شکاندنی بتەکانی نەمرود گومانە ئایینیەکەی دەسەلمێنیت. هەرچەندە نوێنەری خوداوەندی ئایینی دیکەشبن، شکاندنی بتەکانی هێمایەکی ئاشکرای گومانی ئایینیەتی. 'دەنگە غەیبیەکان' جێگەیەکی گرنگ لەنەریتی هزری ئەو قۆناخەدا دەگرێت. دەنگە غەیبیەکان دۆخێکە کە هەندێک ئیلهام و لەهۆشخۆچوونی قاڵبوونەوەی هزر ڕێگای لەپێش دەکاتەوە. زمانی ئیلهامە. دەڵێن ڕۆژێکیان دەنگێکی بەمجۆرەی بیستووە. گوایە ئەو دەنگە یاخود ئیلهامە (دەنگی غەیبی) ی بۆی هاتووە، بەم جۆرە ڕاڤەی دەکات :"وا هەوە" شیمانە دەکرێت ئەم گوتە بەزمانی هۆری بێت. ماناکەی "ئەمە هەوە". واتا سەنتێزی نوێی خوداوەندەکەیەتی کە چاوەڕوانی دەکرد و هیواخوازی بوو. گەیشتنی حەزرەتی محەمەد و موسا بەخوداوەند بەم شێوەیە دەبێت. کەواتە نەریتەکە زۆر کۆنە. تا ئێستاش ئەتیمۆلۆگەکان لێتوێژینەوە لەبارەی "ئەمە هەوە" دەکەن. ڕاڤەی شەخسی خۆم بەم جۆرەیە، هاوفیکرییەکیش لەم بارەوە هەیە کە هەنگاو بەهەنگاو گوتەکە بۆ گوتەی 'یاهوە ' Yahweh دەگۆڕێ، دواتریش بۆ 'یەهوودی' Yahudi . چیرۆکی کورتی خوداوەندە بەناوبانگەکەی عیبرانیەکان بەم جۆرەیە.

گووتەی عیبرانی کە لەناوهێنانی "ئاپیرۆ"ی میسریەکانەوە هاتووە پێشتر ئاماژەم پێکردبوو کە مانای"مرۆڤە تۆزاویەکانی بیابان" دەبەخشێت. دەشێت حەزرەتی ئیبراهیم ئەو قەبیلەی ڕێبەرایەتی دەکرد و سەرلەنوێ ئاوای کردووە بەعیبرانی ناوی بردبێت، هەروەها ئایینەکەشی بە یەهوودا (هەر وەکو وشەی ئیسرائیل لەناوەڕۆکدا یەهووداش ناوی خوداوەندە) ناوبردبێت کە وەک مانا سەرلەنوێ بونیادی نابوویەوە. لەو بڕوایەدام کە بەم جۆرە شیکارکردنی ڕەگی مێژووی ئایینی نوێ و سەرگوزەشتە کورتەکەی تا بڵێی مانادارە. ڕووبەرووی ئایینگەرایی

قەبیلەیەکن کە سەرلەنوێ بونیاد نراوەتەوە و زۆر هەست بەتەنیایی دەکات. ئایینگەرایی و ئیلاهیگەرایی قەبیلەیەک کە بەوەرچەرخاندا گوزەری کردووە ئەگەر شۆڕش نەبێت ئەوا مسۆگەر وەک ئیسلام و پرۆتستانتی ریفۆرمێکی جدییە. لەوانەیە بەرگریکردنی دەمارگیرانە لە قەبیلەیەک و خوداوەندەکەی کە بەوەرچەرخاندا تێپەڕیون و سەرلەنوێ بونیاد نراونەتەوە ( ئەو هەلومەرجەی کە قەبیلە سامیەکانی کەنعان تێیدا زاڵن) ئەنجامی سەختی و زەحمەتیەکانی ژیانی ماددی بێت. هەر لەو قۆناخەی کە وەک قەبیلە دەستیان داوەتە بازرگانیەوە باش دەرکی پێدەکرێت بۆچی یەهوودیەکان گرنگی زۆریان بە پارە و بازرگانی داوە و لەم بارەوە لەئاستی دونیادا بوونەتە پسپۆر. لەژیاندا مانەوەی قەبیلە گرێدراوەی بازرگانییە، لەم سۆنگەوە گرێدراوی پارەیە.

داخوازی قوربانی کردنی ئیسماعیل و دەست لێبەردانی بەهۆی دەنگێکی غەیبەوە فاکتەرێکی تەواوکەرو گرنگی ئایینی نوێیە. نەریتی قوربانی زۆر کۆن و بەربڵاوە. قوربانی کردنی متداڵانیش یەکێک لەمانەیە. نەریتێکە تا ئەو سەردەمە پەیڕەو کراوە. لەحەزرەتی ئیبراهیم و مانا ئیلاهیەکەیەوە دەرکی پێدەکرێت ئیتر ئەمە نەریتێکە کە مۆدێل و سەردەمی بەسەر چووە. ئەمە یەکێک لەماددە گرنگەکانی ریفۆرمە. قوربانی کردنی ئاژەڵە ناسراوەکان جێگای قوربانیکردنی مرۆڤ دەگرێتەوە.

ئەو ئەنجامەی لەچیرۆکی ئیسماعیل و هاجەر هەڵدەهێنجرێت؛ قەبیلە عەرەب - سامییەکان بەسۆز و دڵخۆشیەوە پێشوازییان لەئایینی نوێ نەکردووە. دەشێت وەک ئەزموونێکی "ئیسلامگەرایی بەرایی" هەڵسەنگێنرێت کە زۆر پێشوەخت لەدایک بووە. بەڵام بڵاونەبۆتەوە. هەر لەو قۆناخەوە گرنگی ناوەندێتی مەککە خۆی دەنوێنێت. لێرەدا پەنتائۆنی قەبیلەیەکی جیاواز جێگای باسە. هێشتا پاگانیزم (خوداوەندگەرایی و بتگەرایی قەبیلە) زۆر بەهێزە. نازناوی ئیسرائیل پەرەسەندنێکی زۆر سەیرە کە لەسەردەمی یەعقوبدا شێوەی گرتووە. پاشگری ئەل لە کەنعانیەکان (قەبیلە سەمیتیکەکانی وڵاتی لوبنان - فەلەستین) وەرگیراوە. ئەو دەستەواژە بەڕیشە سەمیتیکە لەمانای "بەرزایی، شکۆمەند" نزیکە.

لای قەبیلەی عیبرانی دەبێت بە "ئەلۆهی". لەگەڵ ئیسلامیەتیش بۆ "ئەڵڵا" دەگۆڕێت. دەتوانین بڵێین خوداوەندی گشتی قەبیلە سامیەکان.

وشەی "گۆتی" قەبیلـەکانی هیندۆ- ئـەوروپی و "گۆدیـا" ی شێوەزارو زمـانی کـوردی - ئێرانـی هـەمان مانـا دەبەخشن. مانـای بـاپیرە یـاخود خوداوەندی هاوبەشی قەبیلـەکان دەبەخشێت. لەبـەر ئـەم هۆکـارە قەبیلـە گۆتیەکان و هەژموونگەرایی گۆدیا ٢١٥٠ پ.ز لـە سۆمەر مانـادارە؛ مانـای پاشا- خوداوەند دەبەخشێت. گودیا نازناوی پاشایەکە لـەو قۆناخـەدا زۆر بەکارهێنراوە. ئیسرائیل مانـای"زۆرانبازێ لەگـەڵ خوداوەنـد" دەبەخشێت. ڕاستتر بڵێـین شـەڕ دەکـەن. وەک بەردەوامیـەکی نـەریتی بـت شکێنەری حەزرەتی ئیبراهیم دیارە. لەهەڵمەتـە ئایدیۆلۆژیـە بێژمارەکانیـان دەرکـی پێدەکردێت کە بەدرێژایی مێژوو عیبرانیەکان زۆرانبازییەکی زۆریان لەگـەڵ خوداوەنــد کــردووە. پێویســته لــەبیر نەکــەین هــەر نوێبوونەوەیــەکی ئایـدیۆلۆژی مانـای"زۆرانبـازێ لەگـەڵ خوداوەنـد" دەبەخشـێت. دواتـر شارەزایی ڕۆشنبیرە یەهوودیەکان لەبارەی مانـاپێدانەوە باس دەکەم.

چیرۆکێکـی کـۆچی قەبیلـە بـۆ میسـر جێگـای باسـە شـیمانە دەکرێـت لـەقۆنـاخی ١٦٠٠ـ ١٣٠٠ پ.ز ڕوویـدابێت. سەرگوزەشـتەی یوسـف و موسـا لەدەرەنجامی ئەو کۆچە دێتە ئاراوە. دەگێڕنەوە کە لەمیسر بەئەزموونێکی درێـژدا تێپـەڕیون، لەهەلومـەرجێکی نیمچـە کۆیلایەتیـدا ژیـاون، هـەوڵی پاراسـتنی یـەکێتی خۆیـان داوە، دووچـاری جیابوونەوەیـەکی دیـاری چینایەتی هاتوون، شیمانە دەکرێت حـەزرەتی موسـاش یـەکێک لـەپیاوە لەپێشینەکانی پاشماوەی ئـەم قەبیلـە بـووە، هاوشێوەی ئـەو ناکۆکیـەی حــەزرەتی ئیبــراهیم لەگــەڵ نــەمرود ئــەویش نــاکۆکی و ململانێیــەکی هاوشێوەی لەگـەڵ فیرعـەون (ناسـنامەی پاشـا)ی میسـر دەبێـت، ئەمـەش هاوکاتی سەردەمی ئەخناتوون بـووە کـە ئـایینی تـاکخوایی ڕاگەیانـدووە، کۆچکردنەکەشی لەسالانی ١٣٠٤- ١٢٨٠ پ.ز بووە لەو قۆناخـەی ڕەمسێسـی دووەم فیرعـەون بـووە. لەتەوراتیشـدا کۆچـە بەناوبانگەکـەی حـەزرەتی موسـا، بـەرخودانی بەرامبـەر هەلومەرجـە سـەختەکانی سروشـت (نیمچـە دوورگەی سینا هەلومەرجێکی سـەختی هەیـە) شـەڕو ناکۆکیـەکانی لەگـەڵ

چەندین قەوم و قەبیلەی نەیار باس دەکرێت. لەناو ناخۆشی کۆچ و بەرخودانێکی چل ساڵیدا دەژیت. نەریتی "دەنگی غەیبی" جارێکی دیکە لەشاخی توور دووبارە دەبێتەوە. دە فەرمانەکە (سروش و فەرمانی خودایی) وەردەگیرێت.

شیمانە دەکرێت وشەی عیبرانی بەرهەمی ئەو قۆناخە بێت. "ڕەب"ی جێگای ناوە کۆنەکانی خوداوەند دەگرێتەوە. ڕەنگدانەوەیەکی دیاری جیابوونەوەی چینایەتییە. بەشێوەیەکی زۆر توندو دژوارتر دژایەتی بتپەرستی دەکرێت. باوەڕی (شێوەی پەرستن) یەکی نوێ لەدەوربەری ئەو سەندوق (نەریتی پەرتووکی پیرۆز)ە پێکدێت کە دە فەرمانەکەی تێدا شاراوەتەوە. لەتەوراتدا ڕیزبەندیەکی قۆناخەکان دەکرێت. تەرمۆنۆلۆژیەک بەشێوەی دەرکەوتن - کاهینەکان - ڕێبەرەکان - پاشاکان - پێخەمبەران - کاتبەکان بەکاردەهێنرێت. پێویستە لەبیر نەکەین لەو قۆناخەی حەزرەتی ئیبراهیم تێیدا ژیاوە (ساڵانی ١٦٠٠ پ.ز) تا ساڵانی ٦٠٠ پ.ز هیچ بەڵگەیەکی نووسراوی ئایینی بوونی نییە باسی یەهوودی. هەندێ نەریت لەئارادان کە بەزارەکی گوتراونەتەوە. لەو بڕوایەدام کە نەریتی نووسراو لەسەردەمی ئەشعیاوە دەست پێدەکات و پەرەدەسێنێت. لەسەردەمی دیلێتی بابلدا (٥٩٦ـ ٥٤٠ پ.ز) زۆر فاکتەر لە زەردەشتێتی وەردەگیرێت. بەهزری گریک یش کاریگەر دەبن. لەمیانەی گۆڕانکاری و پێدانی بەردەوامەوە پەرتووکی پیرۆز ئامادە دەکرێت کە بە عەهدی دێریک (پەیماننامەی کۆن) ناودەبرێت. ڕاڤە و بەرگە ئەستوورەکانی بینکەش دەکرێت؛ لەبەرئەوەی کۆی نەریتە پارێزراوەکانە گرنگە. ئەو کاریگەرییە ئایینی، فەلسەفی و وێژەییەی دواتر هاتە ئاراوە، ئیلهامە هونەریەکانیان مەزن بوون. هەروەها ڕاڤەگەلێکی زۆر پێشخراوە.

لەگەڵ ئەوەی کورتە چیرۆکی چەمک و دەستەواژەی تاکخودایی بەمجۆرەیە، بەڵام لەئایینە ئیبراهیمیەکاندا بەشێوەیەکی زۆر جیاواز باسدەکرێت. خوازراوە وەک هەژموونێکی ناسنامەی ئایدیۆلۆژی پێش بخرێت. یەکێک لەفیکرە سەرەکیەکان: "پرۆژەی" ئاوا کردنی پاشایەتیەکی بچووکی یەهوودیەکانە. تەنانەت سپینۆزاش ڕاڤەیەکی بەم جۆرە دەکات.

خۆی لەخۆیدا ئایینی تاکخودایی چەمک و دەستەواژەیەکە لە میسر ڕاگەیەنرا بوو. زۆر پێشتر بەڕیزە: ئەن، ماردۆک و ئاشوور نازناوی گەورەترین خوداوەندیان لە سۆمەر، بابل و ئاشوور بەدەست هێنا بوو. هەروەکو پێشتریش بەبایەخەوە جەختم لەسەر کردەوە ئەمانە چەمک و دەستەواژەیەکن کە هێما و ڕەنگدانەوەی دەزتگا و دامەزراوە بەکاریگەر و دەسەڵاتدارەکانی پاشایەتی و پاشان. بەبت کردنی پاشاکان و پێشخستنی سرووتی تایبەت بە ناویانەوە، بەشێک لەهەوڵەکانی ڕەواکردنە. لەتەواوی شارستانیەکاندا هەوڵێکی هاوشێوەی هەژموونی ئایدیۆلۆژی جێگای باسە. لەبەرئەوەی ئامرازگەلێکی زۆر بەهێزی مەشروعیەت و ڕەوا کردنن، هەر شارستانیەک هەوڵدەدات ئەم ڕێبازە یاخود ئایینە شکۆدارتر بکات. قەبیلە یان قەومی یەهوودیش بەم نەریتە مێژووییە کاریگەر دەبن، هەربۆیە ئاواکردن و ئافراندنی ئامرازی ڕەواکردنی پاشایەتییە بچووکەکەی قەومەکەیان چاوەڕوان کراوە و مایەی تێگەیشتنە. نەریتی بەربڵاو ئەو بەشەیە کە بۆتە پشکی عیبرانیەکان.

پرۆژەی ئەو پاشایەتییەی بەردەوام لەمیانەی ئایدیۆلۆژیەکەیانەوە لەخەیاڵدانی عیبرانیەکاندا بوو لەساڵانی ١٠٢٠ـ ٩٥٠ پ.ز دەبێتە واقیعێکی بەرجەستە. ساول ـ داود و سولەیمان وەک کەسایەتی سێ پاشای گرنگ لەمێژوودا ڕەنگدەدەنەوە. ئەمانە پاشا ـ پێخەمبەرەکانن. یەکسەر جیاوازیەکەی لەگەڵ ئەوانەی میسر و سۆمەردا دەبینین. نابن بە پاشا ـ خوداوەند بەڵکو پاشا ـ پێخەمبەر. هەربۆیە پێویستە ئەو شرۆڤەی خوێنەرانی تەورات پشتگوێ نەکەین کە دەڵێت؛ پێخەمبەرایەتی لێگەڕینێکە لەپێناو پاشایەتی یەهوودی. هەڵبەتە شرۆڤکردنی تەواوی تەورات وەک پرۆژەیەکی پاشایەتی ڕاست نابێت. بەڵام دیسان پێویستە ئەم ڕاستییە ببینرێت کە پەیوەندییەک لەنێوان تاکخوداوەند و پادشایەتی و دەوڵەتی خۆجێیی و میللی هەر قەومێکدا هەیە، ئەمەش کێشەیەکی گرنگی پەیڕەوە پێویستە لەخوێندنەوەی پەرتووکی پیرۆزدا فەرامۆش نەکرێت. بەڵام بەهۆی ئازاری ژیانە پڕ لە ناسۆریەکەیان، زەحمەتیەکانی ڕووبەڕووی بوونەتەوە، هەروەها زۆری و گەورەیی ئەو شارستانی و قەبیلانەی

لەگەڵیاندا جەنگان، یەهوودیەکان بایەخێکی زۆریان بەوردەکاری، پیرۆزی و جیاوازی ئەو سەنتێزەی خۆیاندا کە ئاوایانکرد. پێویستە دیسان ئاماژەی پێ بکەم، کاریگەری کلتووری قەبیلەیەک لەپشت ئەم ئایینگەرایەی هەیە و بەلانی کەم دە هەزار ساڵ ڕۆڵی ناوەندی بینیوە. پشکی ئەم کلتوورە لەپاراستنی هێزەکەیدا گرنگە. پێویستە هۆکاری بەهێزی نەریتی ئایینی خۆرهەلاتی ناوین لەپشکی ئەم کاریگەریەدا بگەڕێین.

تا ئەو کاتەی ئایینی کریستیانی وەک باڵێک لێی جیادەبێتەوە ئایینی عیبرانی کاریگەریەکی جدی نییە. کاریگەریەکی زۆر کەمی لەسەر گەلانی دیکە کردووە. چونکە کارەکتەری ئایینی قەوم ڕێگری لەبڵاو بوونەوەی دەکات. تەنانەت چەسپاندنی "قەومی هەڵبژێردراو" ئەم تاکانەییەی بەهێزتر کردووە. گرنگیە سەرەکیەکەی لەکاتی دەرکەوتنی کریستیانی و موسڵمانێتی و پەیوەندیەکانی لەگەڵ میللیگەرایی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری خۆی دەنوێنێت. پەیوەندیەکی زیاتر لەچوارچێوەی چەمک، تیۆری و تیۆلۆژیدایە. ریفۆرمیزەکردنی فاکتەرە ئایدیۆلۆژی و بونیادە تیۆلۆژیەکانی شارستانی میسر و سۆمەر دوو باڵە بەهێزەکەی شارستانی ناوەندی تایبەتمەندیەکی دیکەی گرنگیەتی. ئەگەر ئەم ڕیفۆرمە نەبوایە مێژووی خۆرهەلاتی ناوین، لەم سۆنگەیەوە مێژووی جیهان زۆر جیاوازتر ئاراستەی دەگرت. وردەکاری گرنگیەکەی لێرەدایە: هەرگیز مرۆڤ نابێت بەخوداوەند پرەنسیپێکی سەرەکی ئایینی عیبرانیە. مرۆڤ تەنیا دەتوانێت ببێت بەپێخەمبەر (نوێنەر و پەیامبەری خوداوەند).

ئەمە پەرەسەندنێکی زۆر گرنگە. پاشاکانی میسر و سۆمەر بەهەزاران ساڵ بەسیفەتی پاشا ـ خوداوەندەکان مەشروعیەتیان بەخۆیان داوە. ئەوەی بەشێوەیەکی سیستەماتیک لەدژی دەوەستێتەوە نەریتی ئیبراهیمی یە. لەکاتێکدا لەکلتووری گریک لەمیانەی فەلسەفەوە ڕکابەرایەتی لێکچوونی مرۆڤ ـ خوداوەند دەکرێت، لەخۆرهەلاتی ناوینیش لەڕێگای ئایینە ئیبراهیمیەکانەوە لەدژی دەوەستنەوە. بێگومان پەرەسەندنە ئابووری، کۆمەلایەتی و سیاسیەکان ڕۆڵی لەم هەلوێستەدا هەبووە. ئەو

چەمکـە ئابووریـەی خـودی حـەزرەتی ئیبـراهیم لەکەسـایەتی خۆیـدا نواندوویـەتی زۆر لـە لیبرالیـزم دەچێـت. هەرەوەزیـەکانی فیرعـەون و نەمرودیش پشتی بەخستنە گـەڕو کـارکردنی کۆیلـە دەبەست. سیستەمێکی ئامێر و مەکینە لەکۆیلـەکان ئـاوا کرابـوو. چـەمک و دەسـتەواژەی بەنـدە ـ خوداوەنـد (تـا ئێسـتاش کـاری پێدەکرێت) لەسـەردەمی ئـەم کۆیلایەتییـە بـەئامێر و ڕۆبـۆتکراوە ماوەتـەوە. هەرچەنـدە ئـایینی ئیبراهیمـی ئـەو پەیوەندیە ڕیشەدارەی نەڕوخاندووە بەڵام زۆر نەرمی کـردووە، چاکسـازی تێدا کردووە. کاریگەریەکەی بۆ ئەم ڕۆڵە دیاریکەرەی دەگەڕێتـەوە. خـودی قەبیلـەی عیبرانـی هـەم لای نـەمرود (پاشـاکانی بابـل) هـەم لای فیرعـەون (پاشاکانی میسر) بـەرخودانێکی زۆریـان بەرامبـەر ئـەم جـۆرە کارپێکردنـە کـرووە. کلتـووری قەبیلـە بەکۆیلـەکردنی تـەواوی پەسـەند نـەکردووە. بەرخودانی هەزاران ساڵەی کلتووری قەبیلە بەرامبەر کۆیلایەتی لەبناخەی ئەو دیاردەیەدا شاراوەیە کە بەشەڕی چینایەتی نـاودێری دەکـەین. ئـەوەی باس دەکرێت تـەنیا بـەرخودانێکی ئـەتنیکی نییـە. ئـەو بابەتـەی مـن وەک دەستەواژە و چەمکێکی جیاواز گرنگی پێدەدەم لێرەدا دەکەوێتـە گـەڕ. نـەک شەڕی چینایەتی، بەڵکو شـەڕی پەسـەندنەکردنی بـوون بـە چـین، شـەڕی جیانەبوونـەوەی چینایـەتی گرنگتـرە. ئـەو ڕاسـتییە هـەم لـە مێـژوودا ڕووبەڕوومان بۆتەوە، هەم هەڵوێستی ڕاست ئەمەیانە.

ئەمـە ئـەو بابەتەیـە کـە مـارکس و مارکسیسـتەکان هـیچ لێـی تێنەگەیشـتن. ئـەوان (جیابوونـەوەی) جیـاوازی چینایـەتی وەک پەرەسەندنێکی ڕاستەهێڵی، پێشکەوتنخواز و ئـەرێنی مێژوو دەبیـنن. ئـەم چەمکـەیان کـە بـەڕادەی هەڵـەکانیان بناخـەی شکستەکانیشـیان پێکـدێنێت ڕۆڵێکـی زۆر نەرێنیانـەی بینیـوە. بـەرخودانی هـەزاران سـاڵەی قەبیلـە، عەشـیرەت و قـەوم، تەنانـەت شـەڕی ڕزگـاری نیشـتیمانی بەرامبـەر مۆدێرنیتـەی سـەرمایەداری بەهەنـدێک لایەنیـەوە لەهەمانکاتـدا شـەڕی بەرخودانە دژی جیابوونـەوەی چینایـەتی. ئـەم تایبەتمەندیانـە لـەئایینی ئیبراهیمیـدا بـەهێزە. بـەڵام دواتـر لاڕێکردنیـان و گۆڕینیـان بـۆ ئـایینی شارستانی پێویستە وەک دیاردەیەکی جیاواز هەڵسەنگێنرێت. لەهـەر سێ

ئایینی ئیبراهیمیدا بەرخودان بەرامبەر کۆیلایەتی رەوایە و هاندەدرێت. لەبواری ئابووریشدا رێگایان لەپێش چاکسازی گرنگ کردۆتەوە. بونیادێکی یەکسانیخوازتر کراوە بەئامانج. سەدەقە، زەکات و بەخشین ئامرازی گرنگن. ئامانجی نەرمکردنی سنووره وشکەکانی ئابوورییە. ئەگەر لەبواری سیاسیدا دیموکراسی و کۆمار نەکراون بەئامانجیش، بەلام دەسەلات و قەلەمڕەوی پاشا- خوداوەند نەرم کراوە. دەستەواژەی"پاشای سێبەری خوداوەند" پێشخراوە. ژیانی کۆمین مانادار بووە و زەمینەی جێبەجێکردنی ڕەخساوە. ئاشکرایە کە لەبوارەکانی ئابووری، کۆمەلایەتی و سیاسیدا ڕیفۆرم ئەنجام دراوە نەک شۆڕش. بەلام پێویستە ئەم هەنگاوانە لەچاو قۆناخی خۆی بەکەم نەزانرێت و بچووک نەبینرێت. من ئەم هەنگاوانەم وەک هەلوێستی'سۆسیال - دیموکرات'ی ئەو قۆناخەی سیستەمی شارستانی ناوەندی هەلسەنگاند بوو. بزووتنەوەی ئابووری - کۆمەلایەتی لەم شێوەن. بەشێوەیەکی چڕ باسی لایەنی ڕەنگدانەوەیم کرد بەسەر کلتووری مەعنەوی و ئایین. دیسانیش سیفەتی پەیامبەری و وەکیلی خوداوەند(بۆ مرۆڤ) شۆڕشێکی تیۆلۆژییە. کاریگەرییان بەسەر مێژووی جیهان زۆر مەزن بووە. لەبەشی تایبەت بەئیسلامدا تۆزێکی دیکە هەولی تاوتوێکردنی ئەم مەسەلەیە دەدەم.

لەگەل ئەوەی لەپەرتووکی کێشەکانی دەربازکردنی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری و تازەگەری دیموکراتی بەرگرینامەکەمدا بە شێوەیەکی بەرفراوان پەیوەندی ئایدیۆلۆژیای عیبرانی یاخود یەهوودیم لەگەل میللیگەرایی، لەم سۆنگەیەوە پەیوەندیەکەیم لەگەل دەولەتگەرایی - نەتەوە تاوتوێ کردبوو، بەلام پێویستە لێرە ئاماژەی پێبکەم کە ئەو پەیوەندی و کاریگەریەکەی زۆر گرنگە. مەترسیدارترین دەرەنجامەکانیشی لەمیانەی"جینۆسایدی یەهوودیەکان" بەسەر خودی گەلی یەهوودیدا هاتووە.

## ج. بەرخودانی کرستیانی و شەڕی چینایەتی

لەبەرئـەوەی ئـاینی کرستیانی لەسـەرووی ئـەو بزووتنـەوە کۆمەڵایەتییە جدییانەی مێژوو دێت کە بێ بناخەی ئـەتنیکی سـەریهەڵداوە هەربۆیـە گرنگـەو جێگـای بایـەخ پێدانـە. لـەکاتی دەرکەوتنیـدا لـەجیاتی ئـاواکردنی شارسـتانیەکی نـوێ، لایـەنی ئـازادیخوازی و یەکسـانیخوازی لەپێشـە. وەک پەرچـەکردارێک بەرامبـەر پرۆسـەی پێکهـاتنی چینـی ژێـر و جیابوونەوەی چینایـەتی سیستەمی شارستانی ناوەندی سێ هەزار و پێنج سەد ساڵەی خۆرهەڵاتی نـاوین دەردەکـەوێت کـە لـە ئیمپراتۆریـەتی ڕۆمـا بەلوتکە گەیشتووە. لەقۆناخەکانی حـەزرەتی ئیبـراهیم و موسـادا بزاوتـی ئـایینی لەتایبەتمەنـدێتی چـین زیـاتر تایبەتمەنـدێتی قەبیلـە و قـەومی لەخۆوە دەگرت. مەسیحیەت ئایینی کۆمەڵگابوونێکی نوێیە کە لەسـەرووی تایبەتمەندێتیەکانی قەبیلـە و قەومـە، هـەم تـەواوی بێکـار و هـەژارەکانی لەسیستەم بەدەرنراون، هەم قەبیلە و تەریقەتە (تـازە سـەریان هەڵـداوە، بۆ نموونە ئەسـەنیەکان) دیـل کراوەکـان و سـەرباز و کۆیلـە هـەڵاتووەکان دەچوونـە ڕیزەکانیـەوە. قەبیلـە یـاخود دەوڵـەتێک ئـاوا ناکرێـت. لـەژێر بوونیـادی هــەر قــەوم و دەوڵەتێکـدا گروپێکــی کۆمەڵایــەتی کۆمینــال پێکـدەهێنرێت. هـەر بۆیـە شایسـتەی سـەرنجدان و لـێ وردبوونەوەیـە. لەکاتێکـدا نــەبوونی بــە بزاوتــی قــەوم و شارسـتانی ڕێگــای لــەپێش بــەرفراوانبوونی خێــرای دەکــردەوە، بــەردەوام بەربەســتێکی لــەپێش تــەقلیبوونی دەســەڵات و شارسـتانی دروسـت کـردووە. ئـەمڕۆش لـەناو دووڕیــانێکی هاوشـێوەدا دەژیـت. سـەرباری ئـەوەی لایـەنی کۆمینـالی دیموکراتی زۆر بەهێزە، بەڵام لـەم بـوارەدا پەرەسـەندنەکەی زۆر سنوردار ماوەتەوە. ئەم لایەنەی کە لەسەرەتادا بەهێز بـوو لـەقۆناخی گـوزەرکردن بۆ شارستانی کەوتۆتە پلە و پلانی دووەمەوە. هەروەها لەسـەر ئاراسـتەی میللیگەرایی قەومەوە پەرەی سەندووە.

سەبارەت بەدەرکەوتنیەوە چیرۆکگەلێکی زۆر جێگـای باسـە. تەنانـەت هـەبوون و نـەبوونی عیسـایەکی ڕاسـتەقینە گفتوگـۆی لـەبارەوە دەکرێـت.

هەروەکو مەسەلەی چەندین ئیبراهیم چەندین عیساش لەئارادا بوون. چونکە سزای لەخاچدان بەشێوەیەکی بەربڵاو لە ڕۆما پەیڕەوکراوە. یادەوەریەکانی بزووتنەوەی سپارتاکۆس تازەیە. دەگێڕنەوە لەکاتی ئەنجامدانی ئەم بزاوتەدا پێنج هەزار کەس لەسەر ڕێگاکانی ڕۆما لەخاچ دراون. کردەوەی هاوشێوە لە ئەیالەتی قودس یش جێبەجێ کراوە. لە ئینجیل (پەیمانی نوێ) دا بەشێوەیەکی بەرفراوان باسی چیرۆکی عیسا دەکرێت. بەجۆرێک لەجۆرەکان ئینجیل وەک ڕۆمانی حەزرەتی عیسایە. دەشێت ئەو لقەی هونەر کە لەکلتووری ڕۆژئاوا بەڕۆمان ناودەبرێت بە ئینجیل کاریگەر بووبێت. باس لەوە دەکرێت کە عیسا سەر بە ئایینی مووسەوی بووە، ڕق و کاردانەوەی بەرامبەر چینی سەرووی زانا ئایینیەکان هەبووە، هەنگاوی بۆ کرداری پەرستگایەکی جیاوازتر هاوێشتووە، خواستوویەتی لە قودس دا ببێتە خاوەن نفوز و کاریگەری تەریقەتی ئەسەنی و یەحیا (پێخەمبەر)ی واعیزکاریشی لەسەر بووە. لەچوارچێوەی ئەم باسەدا دەگووترێت کە لەپێگەی ڕکابەرایەتی والی ڕۆما و پاشایەتی یەهوودای بەکرێگیراودا بووە. چیرۆکی دوازدە حەواریەکەش سنووری هێز و کاریگەریەکەی قۆناخی دەرکەوتنی پیشاندەدات. هیچ جۆرە هەوڵدانێکی بۆ سەرهەڵدان و ڕاپەڕین نەبوو. وەک جۆرێک لە گروپی پڕوپاگەندە کردنە. قۆناخی ئەو گروپە لەقۆناخی پڕوپاگەندەیی حەزرەتی محەمەدی مەککە دەچێت. لەگەڵ ئەوەی عیسا زمانێکی جیاوازتری هەیە، بەڵام بەجۆرێک لەجۆرەکان گوتەکانی ـ کە لایەنگری هەژارانە ـ ڕاڤەیەکی پەیمانی کۆنە. دوای لەخاچدانی گرووپەکەی دەوروبەری بەخێرایی پەرتەوازە دەبێت. گوایە لەئاکامی هەواڵدانی یەهوودا ئەسکاریۆتەوە دەستگیرکراوە کە بەحەواری سێزدەهەم دادەنرێت. لەم نموونەشەوە دەرکی پێدەکرێت کە هەواڵگری یەهوودی بۆ مێژوویێکی زۆر کۆن دەگەڕێتەوە. شیمانەیەکی بەهێزە عیسا کاریگەریەکی دیاری لەناو گروپە بچووکەکەیدا هەبووە. بەڵام هەر وەکو ئاماژەی پێکراوە ئەوەی دیاریکەرە بەرهەمداری هەلومەرجی کۆمەڵایەتییە. واقیعی عیسا ڕۆڵی کاراکردنی ئەم هەلومەرجەی بینیوە.

تاکە ناوی بەکاریگەری دوای خۆی عەزیز پاولە کە دەڵێن لە تەرسوس لەدایک بووە و لە شام هاتۆتە سەر ڕێی ڕاست؛ ئەو کەسەیە کە بزوتنەوەکەی کۆکردۆتەوە سەر یەک. لە سەدەی یەکەمدا (ئینجیل)ێکی نووسراو جێگای باس نییە کە بە فەرمی پەسەند کرابێت. ئینجیلەکان لە دووەمین و سێیەمین سەدەدا کۆدەکرێنەوە. چەندین نموونەی پەسەندو ئەرێ نەکراویشیان هەیە. ئینجیلە پەسەندکراوەکان چوارن. بابەتەکانیان لە یەکتری نزیکن، شێوازەکانیان جیاوازە. ڕاستەوخۆ وەک گوتەی خوداوەند ڕێک نەخراون. کاتێک باسی ڕووداوەکان دەکرێت جێبەجێ باسی گوتەکانی خوداوەندیش دەکرێت. سوود لە هزر و ڕامانی گریکی ئەو سەردەمەش وەرگیراوە. تیۆلۆژیەکەی گوتە و باسێکی تێکەڵەی گریک و عیبرانی لە خۆوە دەگرێت. گرنگترین چەمک و دەستەواژە باوک، کوڕ و ڕۆحی پیرۆزە. ئەمە شوێنپەنجەی پەنتائۆنی خوداوەندی سێیانە لەخۆوەدەگرێت کە مێژووەکەی زۆر کۆنە. لە چەندین سیستەمی شارستانی مێژوودا نوێنەرایەتی پەنتائۆنی سێیانە جێگای باسە. لەم لایەنەوە پەنتائۆنی ڕۆما ڕوون و ئاشکرایە. مێژووی ئایینی زۆر لەم لێکچوونانە دەخاتە ڕوو. ئەو بابەتەی گفتوگۆیەکی زۆری لەبارەوە دەکرێت، ئاخۆ عیسا خوداوەندە یان لە سروشتی مرۆڤە گرێدراوی ئەم مێژووەیە. لە کاتێکدا ئایینی یەهوودی خوداوەندێتی مرۆڤ قەدەخە دەکات، چەندین ئایینی شارستانی بەشێوەیەکی گۆڕاو بەردەوامی بە گووتەی پاشا خوداوەند دەدەن. وەک دەبینرێت لە مەسیحیەت دا هەوڵدەدرێت هەنگاو بۆ سەنتێزێک بهاوێژرێت. بەڵام وەک دەزانرێت ئەم جیاوازییە ڕێگا لە پێش دابەش بوونی مەزهەبی و پێکدادانی گەورە دەکاتەوە. جیاوازی کۆمەڵایەتیش ڕۆڵ لەمەدا دەبینێت. بۆ نموونە ئەو ئاریوسیانەی کارەکتەری مرۆییانەی حەزرەتی عیسایان بە بنەما دەگرت نوێنەرایەتی چین و توێژە هەژارەکانیان دەکرد، هەرچی ئەوانەن کە لە ناو فەلەکی دەسەڵاتی ڕۆمادا بوون، زیاتر خۆیان لە ڕیشە ئیلاهیەکەی پێچابوو.

تا کاتی نووسینی ئینجیل کرستیانەکان لەشاخ و بیابانەکان لە ژیانی خەڵوەتدا دەژیان. بزاوتە گەورەکانی ڕۆژوو گرتن جێگای باس بووە.

عەزیزە بەناوبانگەکان بەرهەمێکی ئەو سەردەمانەن. لە ڕێگەی ئاواکردنی دێرەکانەوە هەنگاوی دووەمیان هاوێشتووە. سەدەکانی سێیەم و چوارەم قۆناخی دامەزراندنی دێرەکانە. کرستیانەکان لە هەر لایەکی خۆرهەلاتی ناویندا بلاوبوونەتەوە. ئەوانەی لە شەڕەکانی ڕۆما ـ ساسانیەکان بێزاربوون، دەترسن و لە سەربازان ڕادەکەن بەکۆمەڵ بەشداری ڕیزەکانیان دەبن. کرستیانی دەبێتە ئایینی چەندین قەوم لە سەرووی ئەمانەشەوە ئاشووری، ئەرمەنی و گریکەکان، لە سەدەی چوارەم بەولاشەوە دەبێتە ئایینی فەرمی ڕۆمای ڕۆژهەلات(بێزەنت) . ئەو قەومە بچووکانە لە بواری کلتوورییەوە پێشکەوتووترین قەومی ئەو قۆناخە بوون کە لە ستەم و چەوسانەوەی ڕۆما و ساسانیەکان وەڕس ببوون. پێویستە قیبتیەکان(گەلێک لەسەردەمی فیرعەونەکانی میسر ماوەتەوە)یش بخەینە سەر. دانەرو سەرکردەکانی کلێسا سەرکێشی بزووتنەوەکەیان دەکرد. ڕاگەیاندنی مەسیحی بوونی ئیمپراتۆر قوستەنتین (ئەو کەسەیە کە لەساڵی ٣١٢ لەبێزەنت، ئەستەنبوڵی ڕۆژی ئەمڕۆمان ڕۆمای ڕۆژهەلاتی ڕاگەیاند)و کۆبوونەوەی ساڵی ٣٢٥ی کونسوڵی ئیزنیک قۆناخ و سەردەمێکی نوێیە.

مەیلەکانی شارستانی و دژە ـ شارستانی ڕێگا لەپێش پێکهاتنی چەندین مەزهەب دەکاتەوە. کلێساکانی سوریانی و ئەرمەنی (نەستووری و گریگۆریان) دادەمەزرێن. بەم جۆرە یەکەمین هێماکانی دابەش بوونی ڕۆما ـ لاتین بەدیار دەکەوێت، کە بانگەشەی جیهانیبوونی دەکرد. سەدەکانی پێنجەم و شەشەم بەگشتی قۆناخی بلاوبوونەوەی بزاوتەکەیە لەتەواوی ئەوروپا. سەدەکانی حەوتەم و دەیەم قۆناخی بلاو بوونەوەیە لەئەوروپای ڕۆژهەلات. سەرکەوتنی لەئەوروپا و تێپەڕکردنی پاگانیزم (ئایینی قەبیلە خۆجێییەکان) بۆ پێکهێنانی شۆڕشێکی کلتووری مەعنەوی دەگەڕێتەوە. کاتێک بزووتنەوەی کرستیانی ڕۆژئاوا کلتووری مەعنەوی پازدە هەزار ساڵەی ڕۆژهەلات بۆ ئەوروپا دەگوازێتەوە، تۆوی پەرەسەندنەکانی دواتریش دەچێنێت. هەر بزوتنەوەیەکی کۆمەلایەتی مێژوو سەرەتا بەدۆخی کۆرپەلەیی لەکلتووری مەعنەویدا پێکدێت. ئەگەر ئەم پێکهاتنە نەبێت

پەرەسەندنەکانی کلتووری مەعنەوی لەخۆیەوە ڕوونادات. ئەگەر لەداڕشتنی بناخەی ئەوروپا گواستنەوەی کلتووری مەعنەوی لەلایەن ئایینی کرستیانیەوە هەر شتێکیش نەبێت، بەڵام گرنگترین بەشیەتی. بەڕیزە پێویستە گواستنەوەی کلتووری موسەوی و ئیسلامیشی بخرێتە سەر. لەکاتێکدا لەخۆرهەڵاتی ناوین گفتوگۆکانی دەرهەق بەفەلسەفە لەکۆتاییەکانی سەدەی بیستەم لەئیسلامیەتدا گرنگی خۆی لەدەست دا، بەڵام لەمیانەی ئەو گفتوگۆیانەی لەتەوەرەی دەستەواژەکانی "ناوگەرایی"[11] "واقیعگەرایی" لەو مێژووە لەئەوروپا پەرەیسەند، هەڵمەتی مێژوویی قەڵەمبازی فەلسەفەی دەست پێکرد. لەڕێگای بزاوتی پرۆتستانتی و ئەو ڕیفۆرمانەی ئەنجام دەدران قۆناخی کلێسا میللیەکان دەستی پێکرد. ئەم بزاوتانەی لەگەڵ ڕێنسانسدا بوون بەیەک ڕۆشنگەری ئەوروپا ئامادە دەکەن و هەژموونگەرایی ئایدیۆلۆژیەکەی فەراهەم دەکەن.

کرستیانی ڕۆژهەڵات ئاراستەیەکی جیاوازتر دەگرێتە بەر. زمانی ئارامی کە دەڵێن حەزرەتی عیساش قسەی پێدەکرد، بەجۆرێک لەجۆرەکان زمانی میللی ئاشووریەکانە. ئاشووریەکان لەو کاتەوە کە سەردەمە شکۆدارەکەیان لەدەستدا لەژێر هەژموونگەرایی پارس و ساسانیەکاندا دەژیان. ئاساییە کە بەدوای دەرەتانێکدا بگەڕێن. هێزی سەربازییان بەشی ئەمەی نەدەکرد. بەڵام لەبواری کلتووری وەک یادگای خۆرهەڵاتی ناوین بوون. لەم سۆنگەیەوە ڕۆڵیان لەدەرکەوتنی ئایینی کریستیاندا زۆر گرنگە. هەر لەسەرەتاوە کریستیانیان وەک ئایینێکی میللی پەسەند کرد، کۆمەکی گرنگیان پێشکەش کرد. بەتایبەتیش ڕاهیبە نەستوریەکان لەمیانەی ئەو ڕۆڵەی لەگواستنەوەی کلتوری گریکدا بینیان کۆمەکێکی گرنگیان پێشکەش بەتیۆلۆژیای کرستیانی کرد. ئەنتاکیا یەکێک لە

---

[11] ناوگەراکان (Nominalism) :مەزهەبێکە خاوەنەکانی سەر بەفەلسەفەی چاخی ناوینی ئەوروپین. بزاوتێکی مەنتقو ئەپستمۆلۆژییەو کاریگەریەکەی بۆ بواری زانستی نوێو هاوچەرخ درێژ بۆتەوە. ناوگەراکان لەو بڕوایەدان کە کولییات بریتییە لە وشە (یان دەنگ)، بۆچوونە گشتییەکانیش گوزارشت لە هیچ حەقیقەتێک ناکەن (لە زهن و دەرەوەی زهن)؛ بەڵکو بۆچوون بۆ هێماگەلێکی گشتی دەگوترێتو گوزارشتی لێدەکات.

ناوەندە بەناوبانگەکانیان بوو. بەڕێزە ئورفا و نوسەیبین (تورابدین)یش ناوەندی مێژووییان بوون. باسی بانگهێشتکردنی حەزرەتی عیسا بۆ ئورفا دەکرێت. ڕاهیبە کلدانییە خاوەن بنەچە بابلیەکانیش یەکێک لەهێزە گرنگەکانی پەرەپێدانی ئایینی کرستیانین. لەسەدەکانی چوارەم و پێنجەم ڕاهیبە نەستووریەکان لەدەریای سپیەوە تا دەگاتە هیندستان بەشێوەیەکی کاریگەریانە ئایینی کریستیانیان بلاوکردەوە. مێژووناسەکان بانگەشەی ئەوە دەکەن: ئەگەر ئیسلامیەت سەریهەلنەدابووایە ئەوا لەماوەیەکی کورتدا ئێرانیش دەکەوتە ژێر کاریگەری کرستیانیەوە. لەگەل ئەوەی ئایینەکانی میترا و مانی لەناوچەدا بەکاریگەر بوون، بەلام کرستیانی لەپێشتر بوو. لەم سۆنگەیەوە دەتوانرێت قەلەمبازی کرستیانی بۆ ئاشووری و کلدانیەکان وەک جۆرێک لەڕێنسانس لەقەلەم بدرێت. هەرچەندە ململانێ مەزهەبیەکانی نێوانیان بەهێزیش بێت، بەلام سەبارەت بە ئاشووریەکان کرستیانی ڕێنسانسێک بوو کە پێشوەخت لەدایک بوو. وەک بلێی ڕاهیبە نەستووریەکان لەم چوارچێوەیەدا خوازیارن بناخەی شارستانیەک دابنێن. هەم لەشەڕ و پێکدادانی نێوان بێزەنتی و ساسانیەکان بێزاربوون، هەم دەیان ویست سوودی لێوەربگرن. هەولیان دەدا سوود لەناکۆکیەکانیان ببینن و خۆیان بەهێز بکەن. وەک دەزانرێت لەم لایەنەوە کاریگەرییان لەسەر حەزرەتی محەمەد هەبووە.

قەومی ئەرمەنیش بزاوتێکی کرستیانی هاوشێوەی ئاشووریەکانی پەسەند کرد. ئەوانیش وەک ئاشووریەکان هەم لەئاکامی پێکدادانی نێوان بێزەنتی ـ ساسانیەکان زیان بەخش دەبن هەم خوازیارن سوودمەند بن. کرستیانی زەمینەیەکی ئایدیۆلۆژی باشی پێشکەش بەم ڕەوشە دەکرد. ماوەیەکی کورت دوای پەسەند کردنی فەرمی ئایینی کریستیانی لەسەرەتاکانی سەدەی چوارەمدا ئەرمەنیەکان لەمیانەی مەزهەبی گریگۆریا هەولی میللیکردنیان دا. ئاستی پێشکەوتن و پێگەیشتوویی کلتووری مێژووییەکان دەرفەتی ئەم هەولە دەدات. لەڕێگەی ئایینی کرستیانیەوە میللیگەراییەکی پێشوەخت هاتە ئاراوە. بەلانی کەم ئەمە ئەنجامە بابەتیەکە بوو. بزاوتێکی گرنگ و زەبەلاحی کلێسای ئەرمەنی

سەریهەڵدا. بەڵام ئەو کڵێسا کرستیانیانەی بەئاراستەی دەوڵەت بەرەو پێشەوە دەچوون خوازیاری بزمار لێدان و پارچەکردنی ئەم ڕۆڵە بوون. لەتەواوی ناوچەکانی نیشتەجێبوونی ئەرمەنیەکان کلێسای شکۆدار ئاوا کرابوو. دروستکردنی کڵێسا بزاوتێک بوو کە شوێنی خۆی لەبیناسازی خۆرهەڵاتی ناویندا گرتووە. ئاشوریەکانیش هیچ لایەنێکیان لەهی ئەرمەنیەکان کەمتر نەبوو. پێویستە ئاماژە بەو خاڵە بکرێت کە جۆرجیەکانیش بەپرۆسەیەکی کریستیانی بوونی هاوشێوەدا تێپەڕیون. گەلێکن بەبیروباوەڕ و بیناسازیەکەیان سەرنجراکێش بوون.

گریکەکان گەلێک و کلتورێک بوون هەر لەکاتی دەرکەوتنیانەوە بەئایینی کرستیانیەوە پەیوەندیدار بوون. توانستە کلتوورییە بەهێزەکەی پشتیان بەکار دێنن و بەخێرایی شێوە بە ئایینی کرستیانی دەدەن. فەلسەفەی ستۆوایی (ڕەواقی) و فەلسەفەکانی ئەرستۆ و ئەفلاتوون لەسەرووی ئەو فاکتەرانەوە دێن کە کرستیانیان بەرەو پێشەوە بردووە. بەجۆرێک لەجۆرەکان سەنتێزی فەلسەفەکانی گریکیان بەتیۆلۆژیای خورهەڵاتی ناوین دەشێلا. پلاتۆنیس (سەدەی سێیەم) یەکێک لە...نەنگەکانی ئەم بزووتنەوەیە بوو. کریلۆس، سیمیۆن و ئاتاناس ...ر گەلێکی شایستەی سەرنجدانبوون. بەرخودانیان بەرامبەر ڕۆما بە...بانگە. لەم سۆنگەیەوە کڵێسای یۆنانیش بە ناسنامەی میللیەوە لە...ردسەندندا بوو. دەبوایە ڕێنسانسەکەیان لەمیانەی ئەو کرستیانەیەوە ئەنجام بدەن کە خۆیان شێلابوویان و ڕەنگڕێژیان کردبوو. بوونی بێزەنت بەناودندی ئیمپراتۆریەت بەلایەنی ئەرێنی و نەرێنییەوە ئەو هەڵمەتەی بەهێز کرد.

ئەو ڕێنسانس و بەرخودانەی ئەم سێ گەلە لەڕێگای ئایینی کرستیانیەوە بەرامبەر شارستانی ڕۆما و بێزەنت پیشانیاندا، وەک خونچە پێشوەختەکانی بەهار دواتر لەلایەن بزاوتی ڕکابەری هاوشێوە ــ کەلەگەڵ ئیسلامیەتدا بەخێرایی دەرکەوتن ــ دووچاری تراژیدیا بوونەتەوە. ئەم دۆخەش سەبارەت بەمێژووی خۆرهەڵاتی ناوین دەبوو بەسەرەتای بیابانی کلتووری و تراژیدیایەکی ڕاستەقینە.

بەرخودانڤانی کرستیانی بەچوارچێوە چینایەتیەکەی، بەرفراوانی و ناوەڕۆکە ئایدیۆلۆژیەکەیەوە ڕۆڵێکی گەورەی لەگۆڕینی شارستانی ناوەندی بینیوە. ڕۆڵێکی گەورەیان هەبووە لەخاڵیکردنی ناوەڕۆکی ئایدیۆلۆژی هەردوو زلهێزە هەژموونگەراکەی ئیمپراتۆریەتی ڕۆما و ساسانیەکانی ناوچە و گەیاندنیان بەئاستی هەڵوەشانەوە. تەواو ئانتی ـ شارستانی نییە. بەڵام بزووتنەوەیەکیش نییە لەتەوەرەی شارستانیەتدا بێت. ئەگەر لەسەر شێوەگرتنی سیاسی هەژاران قاڵببوایەوە، لەوانەیە چارەی دونیای بەشێوەیەکی دیکە گۆڕیبوایە. دەبوایە وەڵام و ئەنجامی بەرخودانەکەیان سیستەمێکی پێشکەوتووتری سیاسی بوایە. کەوتنە دۆخی خزمەتکردنی هێزەکانی شارستانی، بۆ خۆی شتێکی ئەرێنی نەبووە. هەوڵیداوە لەهێزەکانی شارستانی بچێت، ئەمەش لەناوەڕۆک و گەوهەری خۆی دووری خستۆتەوە. بەرپرسیارێتیەکەی لەپەرەسەندنی سەرمایەداریدا بچووک ناکرێتەوە و بەکەم نازانرێت؛ لەبەر ئەوەی گەلە کرستیانیەکانی بەرامبەر ئیسلامیەت نەپاراستووە، بەرپرسیاریەتیەکی مەزنی لەنووسینی نەرێترین لاپەڕەکانی مێژووی خۆرهەڵاتی ناویندا هەیە. هەر وەکو لەپەرەسەندنی دیاردە کۆمەڵایەتیەکاندا دەبینرێت، لەهەڵوەشاندنەوەشیدا ئەو تۆڕە ئایدیۆلۆژیانەی تێیدا دەژین دەست لێبەرنەدراو و ژیانییە. ڕەوشی ئایدیۆلۆژی کۆمەڵگاکان ڕۆڵێکی ئەزموونی لەدەست نیشان کردنی داهاتوویان دا دەبینێت.

کێشەکانی باڵی کریستیانی بزووتنەوەی ئیبراهیمی کە وەک ئەنجامێکی تەنگەژەکانی شارستانی ناوین سەریانهەڵداوە تا ڕۆژی ئەمڕۆشمان لەگەڵ ئیسلامدا بەردەوامە ـــ لەگەڵ یەهوودیەتیشدا ـــ شارستانێتی دیموکراتی لەم لایەنەوە بە ئەندازەی کێشەی یەهوودی بۆ شیکار کردن و چارەسەرکردنی کێشەکانی کریستیانیش ژیانی و دەست لێبەرنەدراوە.

ناسینی بزاوتە چالاکەکانی مانی و میترایی سەردەمی کریستیانی و دەرک کردن بەڕۆڵەکەیان لەسیستەمی شارستانیدا گرنگ و بایەخدارە. مانی کەسایەتیەکی بەنرخ و پایەدارە کە لەکەنارەکانی دیجلەی ناوین

خۆی پێگەیاندووە، لەرێگای سەنتێزێکی تێکەڵەی کریستیانی، زەردەشتی و هێلینیــزم هــەوڵی پێهــەڵگرتن و وەڵامدانــەوەی گریکــوێرەی شــەڕو بنبەستبوونەکانی ڕۆما و ساسانی داوەتەوە. لەساڵانی ٢٧٦ـ ٢١٦ زایینـی دا ژیــاوە. لەلایــەن محافــەزەکارترین ئەنــدامانی شارســتانی ساســانیەوە کوژراوە. ئەگەر سیستەمەکەی سەری گرتبوایە، دەبوو بەرێنیسانسێکی پێشوەختی خۆرهەلاتی ناوین. ئایدیۆلۆژیاکەی خاوەن خەسڵەتێکی ئایینی تــەواو نییــە بەتایبەتمەندێتیــە تێکەڵەکــەی فەلســەفە و هونــەر ســەرنــج ڕادەکێشــێتە ســەر خۆیــەوە. دەیتــوانی ببــێ بەئەلتــەرناتیفی دۆگمــاتیزمی ئــایینی. کلتــووری خۆرهــەلاتی نــاوین پێویستیەکی زۆری بەمــە هــەبوو. لەئاسیای ناوینەوە (لە دەوڵەتی ئویگار دانی پێدانراوە) تادەگاتە ناوەوەی ئەوروپا لایەنگرو پشتیوانی هەبووە. لەمیانەی خەسڵەتە دوالیزمیەکەیەوە ڕۆڵــی لەپەرەســەندنی فیکــری دیالیکتیکیــدا بینیــوە. دەشــێت وەک خونچەبوونی کلتوورێک هەڵیسەنگێنن کە پێشوەخت سیس بوو.

لەلایەنێکەوە میترایزم سۆفیگەرایی ئێرانە. بەکارهێنان و پەیڕەوکردنی زەردەشــتایەتی وەک ئــایینی فــەرمی، میترایزمــی لــەناو گــەل بــەناوبانگ کردبوو. لەمیانەی بلاوکردنەوەی پەیڕەو و پایەکانی گەیشتن بەحەقیقەت کۆمەکی پێشکەش بەپەرەسەندنی ئــەخلاقی کۆمــەڵگا کــرد. یــەکێک لــە دوا پەناگەیانەیە کە کلتووری ئێران بەرامبەر بەکرستیانی پەنای بردتۆتە بەر. وەک مانیگــەرایی ئــەویش هــەوڵی بەربەســتکردنی پێکدادانــەکانی ڕۆمــا ـــ ساســانی داوە. ئێــران خــاکی بــەپیتی ســەرهەڵدانی کلتوورەکــانی دەرەوەی شارستانیە. هەروەها نموونەی مەزدەکیەکانیش شایستەی یادکردنەوەیــە. بەڵام وەک پەردەیەکی ئەستوور ئیسلامیەت هــەموویانی داپۆشــی. جۆرێــک لــە یــەکرەنگی دەوڵــەت ـــ نەتــەوەی پێشــوەختی بەســەر تــەواوی ئــەم دەوڵەمەندی و مۆزائیکە کلتوورییەدا زاڵ کرد.

### د . بەرخودانی زەردەشت: شەڕی ئەخلاقی دژی شارستانی

لــەناو ئایدیۆلۆژیــەکانی دژ بەشارســتانی زەردەشــتایەتی جێگــا و مانایەکی تایبەتی خۆی هەیە. ڕووخسارە ڕۆشنو بریقەدارەکــەی زنجیــرە

شاخی زاگرۆس، دەنگە شکۆدارەکەیەتی. ویستی لەڕێگای بەرخودانی کۆمەڵگای ئەخلاقیەوە وەڵامی هەژموونگەرایی ئایدیۆلۆژی چەپەڵی سیستەمی شارستانی بداتەوە. بەرامبەر بەدرۆ بریتی بوو لەڕاستی. سەرەڕای ئەوەی کلتووری سەرەکی ناسنامەی ئێرانی بوو، بەلام لە بەرامبەر کرستیانی و ئیسلامیەتەوە خۆی نوێ نەکردەوە.

بزاوتی زەردەشتی کە دەرکەوتنەکەی بۆ سالانی ١٠٠٠ پ.ز درێژ دەکرێتەوە لەبزووتنەوەیەکی ڕەسەن زیاتر ڕیفۆرمێک بوو. دەشێ بڵێین ڕیفۆرمی لەنەریتی ئاهورا مەزدا کردووە کە کۆنترە. ئاهورا مەزدا کۆنترین باوەڕی ئاریانییە. دەشێت وەک یەکێک لەخواوەندە هاوبەشەکانی قەبیلە ئاریانەکان هەڵسەنگێنرێت. لەوانەیە پێویستی ڕیفۆرم لەسیستەمی ئەو باوەڕییە بەرامبەر پەلامارەکانی ئاشوور سەریهەڵدابێت کە لەسالانی ١٠٠٠ پ.ز دەستی پێکردووە. چونکە قەڵەمبازێکی ئایدیۆلۆژی بەرامبەر هەژموونگەرایی ئایدیۆلۆژی ئاشوور پێویست بوو. پەرەسەندنی لەمیانەی کارەکتەرێکی ئەخلاقیەوە پەیوەست بەڕاستیەوەیە. ژیانی ڕاست پرەنسیپێکی زەردەشتی بووە. کاتێک دۆخ بەم شێوەیە بێت، ئەوا وەڵامی ئایدیۆلۆژیەکان ئەتیکبوونیان دەبێتە پێویستیەکی ژیانی. تۆڕێکی ئایدیۆلۆژی جیاوازی هەیە. پشت بەدوالیزمی ڕیشەیی لەجۆری ڕوناکی ـ تاریکی، چاکە ـ خراپە و ڕاست ـ چەوت دەبەستێت. لەم لایەنەوە زایینێکی پێشوەختی دیالیکتیکی بەخۆوە دەبینێت. بەشێوەیەکی دیالیکتیکی نزیکی مێژووش دەبێتەوە. کاریگەریەکی زۆری لەسەر هەرسێ پەرتووکی پیرۆزیش هەیە. دەشێت لێبووردنی کۆرش سەبارەت بەیەهوودیەکان ـ لە قۆناخی نەفیکردنیان بۆ بابل(٥٩٦ ٥٤٠ پ.ز) ـ و ناردنەوەیان بۆ زێدی خۆیان ئەم کاریگەرییەی زیاد کردبێت. بەبایەخەوە باسی کاریگەریەکەیان لەسەر بودیزم دەکرێت. هەرچەندە باس لەوە بکرێت کە زەردەشت لەسەدەی شەشەمی پێش زایینی ژیاوە، بەلام زیاتر وەک خەیاڵێکی هاوبەشی ماغەکان (راهیبەکانی زاگرۆس) دێتە بەرچاو. دەشێت یەکێک لەماغە بەکاریگەرەکان بووبێت. لەگەڵ ئەوەی ناسنامەی ئەتنیکی زەردەشت کێشەیەکی گرنگ نییە، بەلام گشت

شیمانەکان ئاماژە بەبنەچە میدیاییەکەیەوە دەکەن. لە زمانی کوردیدا وشەی ماغ گوزارشت لە تۆپەڵەی ئەو پشکۆیانە دەکات کە لە ئاگرداندا کۆبۆتەوە. وەک دەزانرێت قەبیلە میدیاییەکان بەشی زۆری ژیانی وەرزی سەختی زستانی زاگرۆسیان لەدەوروبەری ئەو ئاگردان و ئۆجاخانە بەسەر دەبرد. بەهێزترین گفتوگۆ و وەعزەکانیشیان لەدەورووبەری ئەو ماغانە بەڕێوە دەچوون. هەر بۆیەش واعیزەکان بە ماغ (موغ)ی ناودەبرێن. پیرۆزی ئاگر لەزەردەدەشتیدا دەبینرێت. چونکە لەسایەی ژیانی ڕۆژانەوە ئاگادارن ژیان بەبێ ئاگر نابێت. بەگوێرەی بیروڕای بەربڵاو لەباکوری ڕۆژئاوای ئێرانی ئەمڕۆ، واتە لەمیدیا ژیاوە. پرەنسیپی روون و زەلالی سەبارەت بەژیانی کۆمەڵایەتی جێگای باسە. گرنگیەکی زۆر بەپەیوەندی هاوسەرێکی تەندروست دەدات. لەجیاتی پلەداری ڕیشەدار ڕایەڵەیەکی نزیک بەیەکسانی و ئازادی نێوان هاوسەران جێگای باسە. درۆکردن گەورەترین بێ ئەخلاقییە. ژیانێکی کۆمەڵایەتی دوور لەپەیوەندیەکانی کۆیلایەتی گرنگ و بایەخدارە. کشتوکاڵ و ئاژەڵداری چالاکی ئابووری بەرچاو بوون. دوورە پەرێزی لەگۆشت خواردن دەکرا. کاروباری کشتوکاڵ هەمان بەهای پەرستن و سرووتی هەبوو.

دەتوانرێت بگووترێت کە لەڕێگای مادەکانەوە کاریگەری کردۆتە سەر کلتووری گریکیش. لەمێژووی هیرۆدۆت دا مادەکان گەورەترین پانتاییان گرتۆتەوە. وەک گەل هێندە باسی پارسەکان ناکرێت. مەزندە دەکرێت کە کەسایەتی ماد لەبەرزترین ئاستدا کاریگەری کردۆتە سەر گریکەکان. لەبەر ئەوەی کەسایەتی پەیوەندی بەئەخلاقەوە هەیە، ئەوا کاریگەری زەردەشتایەتی مایەی تێگەیشتنە. شیمانەکردنی ڕایەڵەی بوێری و ڕاستی لەگەڵ ئەم کلتوورەدا هێندە زەحمەت نییە. بینینی ڕۆڵە مەزنەکەی ئەم کلتوورە لەپشت ئیمپراتۆریەتی ماد ـ پارسەوە هێندە زەحمەت نییە.

سەرسامبوونی فەیلەسوف نیچە بە زەردەشتەوە گرنگ و فێرکەرە. نیچە فەیلەسوفێکە بەئاسانی داوەری نەکردووە. هەر بابەتێکی لێپرسینەوەی لەبارەوە کردبێت پوختە و کورتبڕییە. خۆی وەک شاگردی زەردەشت پێناسە دەکات. خۆ نوێکردنەوەی ئەم کلتوورە و بەشێوەیەکی

زۆر لاواز (لەوانەیە تۆزێک لای زەردەشتیەکان مابێت) ڕەنگدانەوەی لەڕۆژی ئەمڕۆماندا زیانێکە بەر مرۆڤایەتی کەوتووە. بەدڵنیاییەوە دەتوانرێت بگوترێت مۆنارشی ئێرانی ناوەڕۆکی ئەم کلتورەی خاڵیکردووە. دەشێت خاوەنداریێتی میدیاییەکان لەم کلتووره کاریگەرییەکی لەم هەڵوێستەدا ببینرێت. کریستیانی و ئیسلامیش لەگەمارۆدانی ئەم کلتوورەدا ڕۆڵیان هەبووە. هەڵوێستێکی بەم جۆرەی هەردوو ئایینی هۆمۆژەن و دۆگماتیک چاوەڕوانکراوە. وەک بەربەستێکی ئایدیۆلۆژی جدی لەپێشیان قیت دەبێتەوە. لەم سۆنگەیەوە دەتوانین بڵێین لەڕێگای تەگبیری زۆر توند و دژوارەوە سەرکوت (لەلایەن ئیسلامیەتەوە) کراون. شیمانە دەکرێت کوشندەترین گورزی لەلایەن فەتحی ئیسلامیەوە بەرکەوتووە. ئەو بەڵگانەی لەبەردەست ماون تەڵەزم و پاشماوەیەکی کەمن. هێندە ڕاستیەکەی پیشانناده‌ن. بەهۆی فاکتەری کارەکتەرەکەیان و ئەو ناوچەیەی تێیدا روویانداوە لەوانەیە یاخیبوون و بەرخودانەکانی لەلایەن کۆمۆنالیستە بەناوبانگەکانی وەک مەزدەک و بابەک ئەنجامدراون دوا نوێنەرایەتی زەردەشتیزم بووبن. هەردووکیشیان بەو بەرخودانەی بەرامبەر مۆنارشییە رزیوەکەی ئێران ـ ساسانی و سوڵتانە عەباسیەکان ئەنجامیانداوە بوونەتە ڕەمز و هێمای قارەمانێتی. هەروەکو ئاماژەشمان پێکرد کاریگەریەکی زۆریشیان لەسەر میترابیزم و مانیگەراییش هەبووە.

دژە ــ شارستانیگەراییەک لەسەر بنەمای ئەخلاقی و لەژیانی کۆمەڵایەتیشدا بوون بەخاوەن کەسایەتی (مرۆڤی باڵای نیچە) بەها و پرەنسیپێکی ژیانی شارستانێتی دیموکراتییە. یەکێک لەو شادەمارانەی پێویستە شارستانێتی دیموکراتی لەناو کلتووری خۆرهەڵاتی ناویندا خاوەنداریێتی بکات و تێر خۆراکی بکات نەریتی زەردەشتە.

کێشەیەکی سەرەکی دەرهەق بەزەردەشتایەتی پەیوەندیەکەیەتی بەئایینە ئیبراهیمیەکانەوە. تا چەند دەتوانرێت سەربەخۆ و بەتەنیا بە قوتابخانە و ڕەوتێکی پێخەمبەرایەتی لەقەلەم بدرێت؟ لەکام لایەنەوە دەتوانرێت بخرێتە سەر ئەڵقەکانی زنجیرەی پێخەمبەرە ئیبراهیمیەکان؟ ئەو وەڵامەی بدرێتەوە ئەم پرسیارانە: تا ڕادەیەکی مەزن زەردەشت لەناو

ئایینە ئیبراهیمیەکاندا هەرس کراوە. کاریگەریەکەی لەسەر ڕێکخستنی تەورات، لەم سۆنگەیەوە لەسەر ئینجیل و قورئان مسۆگەرو بەرفراوانە. مێژوونووسەکان باس لەوە دەکەن لەکاتی نەفیکردنیان و مانەوەیان لە بابلدا یەهوودیەکان زۆر بەفیکری زەردەشت کاریگەربوون کە ڕۆڵی هەژموونگەرایی ئایدیۆلۆژی دەبینی. هەڵبەتە بەشێوەیەکی روون و ئاشکرا ئەم کاریگەرییە لەسەر ئەو نوسخانەی پەرتووکی پیرۆزدا دەبینرێت کە لەم و مێژووە بەدواوە ڕێکخراون. هەروەها بۆ ماوەیەکی درێژ یەهوودیەکان لەگۆڕەپانی حکومڕانی پارس ـ ساسانیەکان چەندین ئەرکی گرنگیان ئەنجامداوە. بەسیفەتی بازرگانی چالاکییان هەبووە. لەناو کوردەکانیشدا نفوزێکی شایستەی ئاماژەپێکردنیان هەبوو. هەروەها تا ئێستاش کوردە یەهوودییەکان وەک کەمایەتییەکی گرنگ لە ئیسرائیل دەژین. هەربۆیە کارلەیەککردنی دوولایەنە درێژخانە.

کاتێک دەڵێن بۆچی شوێن پەنجەیەکی ئەوتۆی زەردەشت نەماوەتەوە، مسۆگەر پێویستە ئەو خاڵە ڕەچاو بکرێت. ئەگەر بڵێین زەردەشتایەتی لەناو نەچووە، بەڵکو لەلایەن هەرسی ئایینی ئیبراهیمی هەرس کراوە، بەمجۆرەش دەژیت راستتر دەبێت. هەروەها ڕێکخەرانی پەرتووکی پیرۆز، حەزرەتی محەمەد و موساشی لەناودا لە ئادەم و نوحەوە، تا دەگاتە ئیدریس[١٢]یش تەنانەت سەرجەم پێغەمبەرەکانی بەر لەحەزرەتی ئیبراهیمیشیان خستە ناو چوارچێوەی ئایینی ئیبراهیمیەوە. بگرە ئەسکەندەری مەکدۆنیشیان بەناوی ئەسکەندەری زولقرنەین خستە ناو لیستەوە. نموونەی بەم جۆرە زۆرن. کاتێک بەمجۆرە دەرک بە نەریتی ڕێکخستنی پەرتووکە پیرۆزەکان بکرێت، ئەوا بەدڵنیاییەوە دەتوانرێت بگووترێت زەردەشت بە سیفەتی پێغەمبەری ئیبراهیمی بەردەوامی بە هەبوونی خۆی دەدات.

---

[١٢] ئیدریس: سێیەمین پێغەمبەرە دوای شیت و ئادەم.

## هـ ــ ڕاستی بەرخودان و شالاوی ئیسلامی: شەڕی سەردەمی دەرەبەگایەتی چینی ناوین (بازرگان)

شیکردنەوە و لێوردبوونەوەی ئەو واقیعەی لەژێر ناوی ئیسلام پیشان دراوە بەلانی کەم هێندەی لێکۆڵینەوەی ئەو ڕووداوانەی لە ژێرناوی سەرمایەداری ئەنجام دراون گرنگ و بایەخدارە. نەک تەنیا سەبارەت بەمێژووی شارستانی خۆرهەلاتی ناوین، بەلکو بۆ نووسین و خوێندنەوەیەکی ڕاستی دیرۆکی جیهان(گەردوون)یش ئەم جۆرە کار و خەباتانە پێویستن. هەروەک و چۆن ئەگەر چاخی ناوینی ئیسلام نەبێت وەک پێویستیەکی دیالیکتیکی دونیای دیاردەکانی بەناو سەرمایەداری و مۆدێرنیتەکەی بوونیان نابێت، ئەوا ئەگەر شیکارێکی ڕاستی هەردوو دیاردە و سەردەمیش نەبێت ژیانێکی کۆمەلایەتی ماناداریش لە ڕۆژگاری ئەمڕۆماندا نابێت.

ئەگەر تا ئێستاکەش ئیسلام گرنگی ڕۆژانەیی و هەنووکەیی خۆی دەپارێزێت خۆی لەم ناوەڕۆکە دیالیکتیکییەی وەردەگرێت. ئیسلام زنجیرەی دیاردەگەلێکە کە زۆر ناوی دەهێنرێت، بەلام ناوەڕۆکەکەی دەرکی پێنەکراوە. هیچ پێناسە نەکراوە. لەوانەیە گروپی دیاردەگەلێکی هێندە ئالۆز و تەمومژاوییە کە دەرفەتی پێناسە کردنی نابێت. تەنانەت هیچ گفتوگۆ لەو بارەوە ناکرێت کە تا چەندە و چ ڕاستییەک پیشان دەدات. لە پێناویدا ڕۆژوو دەگیرێت، نوێژ دەکرێت، زەکات دەدرێت، تەکبیر دەکرێت و شەڕ و جیهادی لەپێناودا دەکرێت، بەلام خۆشی تەواو کراوە بەنهێنییەک. ئەمە ئەو پرسیارەیە کە بوروژێنرێت؛ لەدۆخێکی وەهادا بۆچی هێندە لەڕۆژەڤدا دەهێلدرێتەوە؟ لەخۆرهەلاتی ناویندا ئیسلام چی چارەسەر کرد؟ سیستەمێکی گریمانەیی چارەسەرکردنی کێشەکانە، یاخود ئافرێنەری کێشەکانە؟ پێویستە چی لەبنەمای ماددی تێبگەین؟ دەوڵەتە یان جڤات؟ ماناو وەلامە ئابووری، کۆمەلایەتی و سیاسیەکەی چییە؟ چەمک و دەستەواژەی فەتحی ئیسلامی ئامرازی چییە؟ دەشێت ئەم جۆرە پرسیارانە زیاتر بکەین و زۆر پێویستیشە. چونکە گروپی ئەو دیاردەگەلەی بەدونیای ئیسلام ناودەبرێت لەڕۆژی ئەمرۆماندا تا ڕادەیەک

لەناو بنبەستبوون و بێچارەییدایە کە ناتوانێت خۆی پێناسە و شیکار بکات و لەناو پووکانەوە و داڕزینێکی کۆمەڵایەتیدا دەژیت کە ڕۆژانە لە دۆخی خۆکوژیدایە و ناتوانێت بەڕێوە بچێت.

بەقەدەر کلتووره مەعنەویەکەی کلتووره ماددیەکەی ئەم دیاردەیەش گروپی شتگەلێک دێنێتە بیری مرۆڤ کە سنوور و ناوەڕۆکەکەی دیار نییە، ڕزیوە و پەرتەوازە بووە. شتی ڕاست ئەوەیە یان بەهیچ جۆرێک ئەم ناوە بەکارنەهێنرێت یاخود ئەگەر دەرفەتی ئەمەیان نەبێت بۆ سیستەمێک بگوازرێتەوە کە بان و سنوورەکانی، کێشە و ڕێگەچارەکانی دیاربێت. شارستانی ڕۆژئاوا زۆر ئاگادارە کە خەریکی چییە و بەمجۆرە درێژە بەهەڵمەتە جیهانگیریەکەی دەدات. وەک پێویستیەکی بونیادی سیستەم و ئەو کێشانەی ڕووبەڕووی دەبێتەوە، چەندە تەنگەژە و قەیران بەخۆیەوە ببینێت، خاوەن ئەو کلتووره ماددی و مەعنەویەیە کە دەرەقەتیان بێت. بەڵام لەخۆرهەڵاتی ناوین لەلایەن گروپی دیاردەگەلی ئیسلامیەوە تەنگەتاو کراوە. تەنیا باس لەو زەحمەتیانە ناکەم کە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لەناوچە دووچاری هاتووە. تەواوی شارستانی ئەوروپا بەتایبەتیش ئەو دوو سەد ساڵەی دوایی بەرامبەر بەخۆرهەڵاتی ناوینی ئیسلامی دووچاری زەحمەتی و تەنگەژەیەک هاتووە کە بە "کێشەی ڕۆژهەڵات" ناوی دەبات. بەڵام ئەوەی گەورەترین زیان، وێرانکاری و بێچارەیی لەمەدا بەردەکەوێت ئەو دونیایەیە کە بەئیسلام ناو دەبرێت. ئیتر بنبەست بوون و نابەردەوام بوونی دۆخەکە هێندە ڕوون و ئاشکرایە کە تەواوی جیهان وەک ڕۆژی ڕووناک دەبینێت. بێگومان بەقەدەر شیکار کردنی زهنیەتی دیاردەکەی بەرامبەرمان چارەسەرکردن بەپێش خستنی وەڵامی سەرلەنوێ بونیاد نانەوەیدا تێپەڕ دەبێت.

کاتێک دەڵێین ئیسلام ناوەکانی خودا (ئەڵڵا) و محەمەد دوانەیەکی گرنگ و یەکگرتوو پێکدێنن. هیچ گروپێکی وشەگەلی دووانەیی تا ئەم ڕادەیە گوزارشتێکی ژیانی بۆ گەلانی خۆرهەڵاتی ناوین لەخۆ نەگرتووە. لەپێناو ئەم دوو ناوەدا شەڕی مەترسیدار ڕێکخراون و بەو ڕادەیەش گڵۆڵەی خۆشەویستی پێکهێنراون. دۆزینەوەی گروپێکی دیکەی وشەگەلی

دووانەیی زەحمەت بوو کە ئەم دژایەتی و ناکۆکیە لەناوەخنیدا هەڵبگرێت. ئەو پرسیارە سەرەکیەی پێویستە بوروژێنرێت: بۆچی بەمجۆرەن؟ بەراستی بەتێگەیشتنەوە لە ناو ئەم دوالیزمەدا دەژین و دەیژێنین؟ دڵنیام کە وەڵامەکە نەرێنی دەبێت. ئەگەر نەرێنی نەبوایە، ئەوا مێژوو و ڕۆژی ئەمڕۆمان لەخۆرهەڵاتی ناویندا هێندە بێ‌ڕەحم نەدەبوو، لەسەر گرێکوێرەکان بەڕێوە نەدەچوو و بەمشێوەیە نە دەژیان. ئەوەی لێرەدا خوازیارم ئەنجامی بدەم، پێشخستنی هێلیکارییەکی مانایيە. ئەوانەی بەبابەتەکەوە پەیوەندیدار دەبن دەتوانن سوود لەم هێڵکارییە ببینن.

بێگومان محەمەد دیاردەیەکە دەکەوێتە چوارچێوەی ئایینە ئیبراهیمیەکانەوە. بەڵام ژیان و گووتەکانی هێندەی ئیبراهیم، موسا، عیسا و پێغەمبەرەکانی دیکە تەموومژاوی نییە. زانیاریەکانی دەرهەق بەحەزرەتی محەمەد بەرجەستەترە. بەلانی کەم دەتوانرێت بەشێکی زۆری دیاردە و ڕووداوەکانی ژیانی بەشێوەیەکی بەرجەستە بەدواداچوونی بۆ بکرێت. بەڵام پێویستە خۆمان لەو بارەیەوە هەڵنەخەڵەتێنین کە ئەو پێگەیەی بەشێوەیەکی زەلال ڕۆژەڤەکەمان ڕۆشن دەکاتەوە. بەپێچەوانەوە لەوانەیە ڕێگە لەپێش ئاڵۆزیەکی زیاتر بکاتەوە. وەک مەزندە دەکرێت هەموو کاتێک بەرجەستە کۆنکرێتی نییە. محەمەد بەرجەستەیەکە کۆنکرێتی نییە. پێویستە بەردەوام ئەو ناکۆکییە لەفیکرماندا بێت کە ئەم دەستەواژەیە گوزارشتی لێدەکات و بەم جۆرە هەڵوێست پیشان بدەین. لەڕووالەتدا یاخود لەدۆخی بەرجەستەدا محەمەد کوڕی عەبدوڵلا و ئامینەیە کە خێزانێکی هەژاری قەبیلەی هاشمی خێڵی قوڕەیشی بوون، سەرقاڵی بازرگانی بوون و ئەشرافە لەپێشەکانی مەککە بوون. دەڵێن لەتەمەنی منداڵیدا هەندێک پەرجووی نواندووە. ئەم جۆرە باسانە لەکلتووری خۆرهەڵاتی ناویندا تا کەسێتی سەرجۆن درێژ دەبێتەوە و بۆ هەر کەسایەتییەک دەگوترێت کە هەنگاوی گرنگی ناوە. لەوانەیە وەها بێت! لەسەردەمی خۆیدا دەکەوێتە خزمەتی خەدیجەی بازرگان و چەند جارێک کاروانی شام ـ مەککە ئەنجام دەدات. جارێکیان زانیارییەکی زۆر

لە بەحیرا[١٣]ی راهیبی نەستووری شارە بەناوبانگەكەی ڕۆما بۆسرا (خۆم بینیومە و چەندین جار سەردانم كردووە. كلێساكەی بەحیرای ڕاهیبیشم بینی لەناو قرێژدا بوو) وەردەگرێت. لەو قۆناخەدا ڕاهیبە نەستووریەكان زۆر بەكاریگەر بوون. گرنگترین گروپی پەرەسەندنی ئایدیۆلۆژی بوون.

شام شارێكی گرنگی بازرگانی و كلتووری قۆناخی خۆیەتی. شارێكی ئەزموونبەخش و فێركەرە. بونیادێكی بایۆلۆژی و فیزیۆلۆژی ئەوتۆی هەیە كە ببێتە دەروازەی بەهەشتی رزگاربوون لەبیابان. مەككەش شارێكی گرنگی بازرگانییە. شارێكی زادەی بازرگانییە. شام لەپێگەی مەترۆپۆلی دەریای سوور و ئەودیویەتی. كلتووری پاگانیزم و فرەئاییني لەشاردا بەربڵاوە. سابیئی و حەنەفیەكانیش جێگای باسن كە پڕوپاگەندەیان بۆ ئاییني تاكخودایی دەكرد. بەكورتی شار پڕ لەكالا، موڵك، كلتور، خوداوەند و ئاینەكانە. ڕەوشی هەژاری حەزرەتی محەمەدو بەهاوسەرگیری ئەنجامگیربوونی پەیوەندیەكەی بەخەدیجەوە زۆر گرنگە. هاوسەرگیریەكەی گۆڕینی دۆخی چینایەتییە. لەم چوارچێوەیەدا حەزرەتی محەمەد پێگەی بۆرژوازی ناوین بەدەست دێنێت. ئەمەش هەندێك ئەنجام لەگەڵ خۆیدا دێنێت. منداڵیان دەبێت. چەندە گەورە دەبێت و پێشكەوتن بەخۆیەوە دەبینێت ناكۆكییەكانی لەگەڵ باڵەكانی دیكەی قوڕەیش زیاد دەبێت. باڵەكانی دیكەی قوڕەیش لەپێگەی ئەرستۆكراسی عەشیرەتدان. ڕێگا بەپێشكەوتنی زیاتری حەزرەتی محەمەد نادەن و ڕۆژانە كۆسپی نوێتری لەپێش دروست دەكەن. ئەمەش شەڕێكی جددی چینایەتییە و لەچوارچێوەی هەمان عەشیرەتدا پەرە دەسەنێت.

لەدۆخێكی وەهادا ئەو خاڵە گرنگەی پێویستە دەست نیشان بكرێت؛ حەزرەتی محەمەد بەڕادەیەك خاوەن كارەكتەری چینایەتییە كە یەكەمین

---

[١٣] بەحیرای راهیب: راهیبێكی ناوچەی بەسرای باشووری سوریا بوو. ئەو كەسەیە كە مژدەی پێغەمبەرایەتی داوە بە حەزرەتی محەمەد.

بەسرا یان بوسرا: شارێكی رۆمانی كۆنە، سەر بەپارێزگای درعای ولاتی سوریای رۆژی ئەمڕۆمانە. مێژووەكەی بۆ دوو هەزار ساڵ پێش زایین دەگەڕێتەوە. پایتەختێكی ئاینیو ناوەندێكی بازرگانی گرنگ و رێڕەوێكی سەر رێگای ئاوریشم بوو.

چالاکی لەناو هەمان عەشیرەتی خۆیدا دەبێت. محەمەد جەنگاوەری چینێکە. کامە چین؟ ئاشکرایە چینی بازرگانی ناوینە کە خۆشی تازە جێگای تێدا گرتووە. مسۆگەرە کە دووانەی خەدیجە و محەمەد پێشەنگایەتی چینی بازرگان دەکەن کە لەدۆخی ئاوابوون (لە مەککە) دایە. ئەو هێزەی بەرامبەری کێیە؟ ئەرستۆکراسی باوو نەریتی عەشیرەتە. خۆشیان لەڕێگای بازرگانیەوە قازانج بەدەست دێنن. بەلام ڕۆلی سەرەکییان پەیوەندی بەدەسەلاتی سیاسیەوە هەیە. کۆنفیدراسیۆنی عەشیرەت کە بریتییە لەدۆخی کۆرپەلەیی ئەو دەولەتەی لەدەروازەی ئاوابووندایە، لەوانەیە شێوەی بەڕێوەبەرایەتی مەککە بێت. بەربلاوی سیستەمی کۆیلەداری، کۆیلایەتی قوولی ژنان و بێنرخ بوونیان تا ئەو ڕادەیەی کیژۆلەکان بەزیندوویی زیندەبەچاڵ بکرێن، بەشێوەیەکی ڕوون و ئاشکرا کارەکتەری کۆیلەداری بەڕێوەبەرایەتی ئەرستۆکراسی پیشاندەدات. هەروەها بوونی سێ بتی گەورە (لات، مەننات، عوززا) لەپەنتائۆنی مەککە پیشانیدەدات کە بالی مەککەی سێیانەی خوداوەندی سیستەمی نەریتی شارستانیش پێکهاتووە. ئەم خالەش کارەکتەری نەریتی، پلەداریو سۆمەرییانەی بەڕێوەبەرایەتی دەخاتە ڕوو. هەلبژاردنو پەرستنی پاگانیزم وەک ئاینێکی فەرمی لەلایەن ئەرستۆکراتەکانەوە ڕوونی دەکاتەوە کە بۆچی حەزرەتی محەمەد هێندە بەدژواری دژە ـ پاگانیزم بووە.

پێویستە بەگرنگیەوە ئاماژەی پێبکەم کە شەڕە چینایەتی و کۆمەلایەتیەکانی دیکە لەهەر قۆناخێکی دیرۆکیدا بەر لەهەموو شتێک شەڕ لەدونیای چەمک و دەستەواژەکاندا ڕوودەدات، بەتایبەتیش لەنێوان ئایدیۆلۆژیا فەرمی و نافەرمیەکاندا ڕوودەدات. واقیعە کۆمەلایەتییە ماددیەکان لەمیانەی کلتووری مەعنەویەوە گوزارشت لەخۆیان دەکەنو پەرە دەسەنن. لەشارستانی سۆمەرەوە تا دەگاتە شارستانی گریک شەڕە میتۆلۆژی و ئاینیەکان و بگرە شەڕە فەلسەفیەکانیش وەک شێوەی گوزارشتی پێکدادانەکانی کلتووری ماددی بەکارهێنراون. ناچاری بەکارهێنانی بوون، چونکە بەجۆرێکی دیکە تێکۆشان ناکرێت. بونیادی

ماددی لەگەڵ بوونیادی ماددیدا پێکدانادات. چونکە کۆمەڵـە شتگەلێکی بـێ ڕوح و بێ ئیفـادەن و تـەنیا مرۆڤـی زینـدوو دەتوانێت شـەڕیان لـەپێناودا بکات. لەپەیوەندی نێوان هەردووکیاندا دەست نیشان کردنی ئەو خاڵە زۆر گرنگە کە کلتووری مەعنەوی و خەیاڵـەکانی مانـا چـۆن و لەمیانـەی کامـە میکانیزمەوە کامە دیاردەی کلتووری ماددی دەنوێنن، یاخود پێکدێنن.

لـەدۆخێکی وەهـادا دەتـوانین بـەم جـۆرە گوزارشـتی زانسـتیانەی شەڕەکانی مەککە ڕوونبکەینەوە. سـەرەتا ململانێیـەکی ئایـدیۆلۆژی دواتـر شـەڕێکی کـرداری لـەنێوان چینـی ئەرسـتۆکراتی بـاو، وشـک و بتپەرسـت لەگەڵ چینی ناوینی بازرگانی نوێ ڕوودەدات. ڕیزکردنی ئاراستەو لێشاوی ڕووداوەکان ئەرکی ئەم دێرانـە نییـە. ئـەوەی گرنگـە نـاوەڕۆکی حەقیقەتـە شاراوەکەیەتی. دڵنیام و هیچ گومـانێکم لـەوەدا نییـە کـە ئەمـە ناوەڕۆکـە شاراوەکەی ئەم شەڕە و جەستە ڕووتەکـەی حەقیقەتـە. لـەقۆناخی مەککـە ململانێیـــەکی ئایـــدیۆلۆژی دەکرێـــت. لـــەقۆناخی ئورفـــای حـــەزرەتی ئیبراهیمیشدا تێکۆشانێکی هاوشێوەی ئەمە بـەڕێوە چووبـوو. بەکۆچبـەری ئـەنجامگیرببوو. هـی ئـەویش پێهـەڵگرتنی چینـی بازرگـان بـوو. یەکـەمین قۆناخی ململانێ و شەڕی موساش لەشـاری فیرعەونـدا ئایـدیۆلۆژی بـوو، واتـە لەلایـەنی چـەمک و مانـاوە بـوو. دیسـان ئـەنجام کۆچبـەری بـوو. کۆچبەرییـەکی بـەرفراوانتر و قەبارەگـەورەتری ئـەو قەبیلەیـە کـە جـاران سـەرقاڵی ئاژەڵـداری و بازرگـانی پێکردنـی بـوون. بـەڵام پێهەڵگرتنەکـەی عیسا جیاوازترە. بەلانی کەم هەنگاوو بەرخودانەکانی سێ ساڵی دەستپێک شـــەڕی تـــەواوی پـــەراوێزخراوەکانی دەرەوەی سیســـتەم بـــوو لـــەپێناو ئاواکردنی جڤاتێکی کۆمەڵایەتی نـوێ. پێهـەڵگرتنی گـەردوونی ئەمـە بـوو. هـەرچی پێهەڵگرتنەکـەی حـەزرەتی محەمـەدە قەڵـەمبازێکی زەلالـی چینـی ناوینی بازرگانە.

قۆنـاخی مەدینـە بریتییـە لەفەراهـەم کردنـی پەیماننامـە سیاسـی و کۆمەڵایەتییەکـەی. پەیماننامـەی نـوێ گەڵاڵەنامـەی دەوڵـەتێکی نوێیـە. چالاکییـە سیاسـی و سـەربازیەکانی دە سـاڵ بـۆ لـەدایکبوونی دەوڵـەتێکی گـەورە لەشـارێکی بچووکدا بـەس بـوو. ئـەوەی تـر کێشـە و شـەڕەکانی

پەلهاویشتنێکی خێرا و بەرفراوان بوو لەکات و شوێنی جیاوازدا. خاڵێکی گرنگی پێویستە لێرەدا مایەی تێگەیشتن بێت، بەراوردکردنێتی لەگەڵ نموونە مێژووییە هاوشێوەکانی. چەندین دەوڵەت لەخۆرهەلاتی ناوین ئاواکران کە بازرگانیان بەبنەما دەگرت، لەسەرووی هەمووشیانەوە دەوڵەتی ئاشووری. مسۆگەر لەئاواکردنی هەر دەوڵەتێکدا پاوانی بازرگانی بەو سیفەتەی جەمسەرێکە پێگە و ڕۆڵی هەیە. پاوانی بازرگانی نەبێت دەوڵەتیش نابێت. پێویستە هیچ کاتێک لەبیرمان نەچێت کە لایەنێکی قورسی دەوڵەت لەپاوانی بازرگانی پێک هاتووە.

جیاوازی حەزرەتی محەمەد لەپەیماننامەکەی مەدینەدا، توانی بۆ جاری یەکەم قەبیلە عەرەبەکان ـ کە هێشتا دەستی بەهێزی شارستانیان پێ نەگەیشتبوو لەدۆخی مەنجەڵێکی کوڵادا بوون ـ بکاتە هاوبەشی ئەو پەیماننامەیە. ئەو شتەی حەزرەتی محەمەدی کردووە بەتاقانە، دەوڵەتێکی لەقەبیلەو قەبیلەگەرایی عەرەبەوە ئافراندووە. ئاواکردنی دەوڵەت، مانای ئاواکردنی پاوانگەرایی خێرایە لەسێ بواردا: کشتوکاڵ، پیشە ـ پیشەسازی و بازرگانی. ئەو زێدە(بەها، بەرهەم) کۆمەلایەتیانەی بناخەکەیان بۆ سێ هەزارو پێنج سەد ساڵ بەر لەدایکبوونی ئەستەنبوڵ دەگەڕێتەوە، زەوتکردنیان لەمیانەی ئەم سێ پاوانەوە توانستێکی ماددی ئەوتۆیە کە تالانکردنی سەیرە. بەخێراترین ڕێگاوە گەیشتنە بەسەرمایەیەکی گەورە و زەبەلاح. تەنیا هەستکردن بەبوونی ئەم سێ پاوانە بۆ "شەڕێکی شێتانە"ی ئەم قەبیلانە بەسە کە بەهەزاران ساڵ لەبیابانەکانی نیمچە دوورگەی عەرەب لەسنووری برسێتیدا ژیاون. شارەزایی و پسپۆرییە گەورەکەی حەزرەتی محەمەد لەوەدایە کەتوانیویەتی فشار و گەمارۆدانی قەبیلە عەرەبەکان لەلایەن سێ شارستانییە گەورەکەی دەوروبەری ببینێت، هەستی پێبکات و لێی تێبگات. لایەنێکی دیکەی هەرە گرنگی شارەزاییەکەی لەوەدایە لەمیانەی تیۆریەکی ئایینی نایابەوە ئەم واقیعە ماددیەی بۆ ڕاستیەکی مەعنەوی واتا بۆ ئیسلام وەرچەرخاند، لەڕێگەی ئەم ناوەشەوە جڤاتی قەبیلەکانی خستە ناو کردارو چالاکیەوە، واتا خستییە ناو شەڕەوە. ئیسلام هەلقولان و

لێشاوی وزەی قەبیلە سەرخۆش و خرۆشاوەکانی نواندنی مەعنەوی بابەتی پاوانی شەڕە بۆ سەر شانۆی مێژوو و ناوچەکانی شارستانی ناوەندی. ئەویش لەمیانەی هاوار، شمشێر، خوێن، باوەڕی و غەنیمەتەوە!

بەو ئامەنجەی جەنگاوەریتی قەبیلە عەرەبەکان بەکەم نەزانرێت ئەم دەستەواژانە بەکار دێنم. لێرە پێویستی ئەنجامدانی جیاوازییەکی جددی دەبینم. بەڕاستیش هەژار و نەدارانی قەبیلە باوەڕیان بەو ئایدیۆلۆژیایە هێنابوو کە لەژێر ناوی ئیسلامدا ڕێکخرابوو، یان کرابوون بەباوەڕمەند. باوەڕیەکی سەیر و بێ سنووریان هەبوو کە شەڕێکی پیرۆز بەڕێوە دەبەن. تۆزقاڵێک گومانیان لەوەدا نەبوو کە لەپێناوی خودا شەڕ دەکەن. بەڵام ناتوانرێت هەمان شت سەبارەت بەتەواوی ئەرستۆکراسی قەبیلە و فەرماندەکان بگوترێت. چونکە بەشێکی زۆریان هەر لەسەردەمی حەزرەتی محەمەددا بۆنی پاوانی بابەتەکەیان کردبوو، دەیانزانی کە مەسەلەی خوداوەند زۆر بڵێیی یاخود لایەنی پروپاگەندەیی بابەتەکەیە. هەر بۆیەش بەسیفەتی خانەدانێتی ئەمەوی لەماوەیەکی زۆر کورتدا (ئەگەر قۆناخی هەر چوار خەلیفەی ڕاشیدی بژمێرین نزیکەی بیست ساڵە) دەست بەسەر دەوڵەتی نوێدا دەگرن.

لێرەدا پێویستە تۆزێک بوەستین؛ خودا (ئەڵڵا)ی حەزرەتی محەمەد چۆن شتێکە؟ چەمک و دەستەواژەیەکە، یان حەقیقەتە؟ بەڕێوەبردنی گفتوگۆیەکی فراوان لەسەر بنەمای وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارەی دوایی شارستانی ئەوروپا بوو بەهێزی هەژموونگەرایی جیهان. لەم سۆنگەیەوە هەرچەندە درەنگیش کەوتبێت، بەڵام جگە لەگفتوگۆکردن و دۆزینەوەی وەڵامی ئەم پرسیارە هۆگرانی ئیسلام هیچ ڕێگایەکی دیکەیان نییە. ئەگەر هەبێت ئەویشیان ڕەتکردنەوەی ببڕای ببڕی ئیسلامە. ئەمەشیان ئەگەرێکی نەکردەییە، هەربۆیە وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە بژارێکی دەست لێبەرنەدراوە.

ئەڵلا وەک ناو چاوگەکەی بۆ ئەل دەگەڕێتەوە کە لەئەتمۆلۆژیای سامیدا ڕابردوویەکی زۆر کۆنی هەیە. پێشتریش باسم کردبوو کە مانای

"شکۆمەندی" دەبەخشێت و هاوتای ناوەڕۆکی دەستەواژەی خوداوەندی دەرهەست (ئەبستراکت)ی گشت قەبیلە سامیەکانە. شیمانە دەکرێت لەڕێگای قەبیلەی یەهوودییەوە لەجڤاتی کەنعانییە سامیەکانەوە وەرگیرابێت. لەتەورات سەرەتا دەکرێت بە ئەلا، دواتریش بۆ "ڕەببی" دەگۆڕێت، لەئایینی کریستیانیش دەبێت بە "باوک ـ کوڕ ـ ڕوحی پیرۆز"، لەگەڵ سەرهەڵدانی حەزرەتی محەمەدیش دەکرێت بە ئەڵڵا. ڕیشە و چاوگی دەستەواژەی وشەکە ئاشکرایە. لێرە ناکەومە ناو بابەتی تیۆلۆژیەوە. پێشتریش بەکورتی ئاماژەم پێکردبوو. دەتوانم ئەمەی لەسەر زیاد بکەم: دەستەواژەکانی خودا 'ئەڵڵا'و محەمەد لەدۆخی ناسنامەی سیمبۆلیدا سەرجەم فاکتەرە ماددیو مەعنەویەکانی کلتووری کۆمەڵایەتی (کۆمەڵگا) لەخۆوە دەگرێت یان وەڵامیان دەداتەوە. ئەوەشی ڕوونکردۆتەوە کە کۆمەڵگا چ مانایەک دەبەخشێت. تەنانەت حەزرەتی محەمەدیش کاتێک دەڵێت تەواوی کۆمەڵگا، لەمەدا مەبەستی "کۆمەڵگای مەدینە" واتە "کۆمەڵگای ئیسلامە" کە تازە پێکهاتووە یان بونیادنراوە. دەستەواژەی ئەڵلا بەمانای وزە و ڕوحی تەواوی فاکتەرە ماددیو مەعنەویەکانی ئەو کۆمەڵگایە بەکار دەهێنرێت. ئەو کۆمەڵگایەی ئاواکراوە کۆمەڵگای ئەڵلایە. خۆی لەبنەڕەتدا ئەم جۆرە گوزارشتانە بەشێوەیەکی بەربلاو بەکاردەهێنرێن. تەنانەت گەردو تۆزقاڵێکی کۆمەڵگا جێگای باس نییە کە ئەڵلا ڕێگەی پێنەدابێت. حەزرەتی محەمەد دەستەواژەکە فراوانتر دەکات. دەیکات بەهۆکاری ئافراندنی هەر شتێک کە هەبووە، هەیە یاخود لەداهاتوودا دەبێت، لێرەدا کرانەوەیەک جێگای باسە کە لەمیتافیزیاکەی هیگل دەچێت. خوداوەندی عیبرانی سنووردارتر بوو. هەرچی "دیمورگ"ەکەی گریکەکانە ڕۆڵی بونیادنەری تەنیا لەوەدا دەبینی کە هەیە. واتە ئافرێنەر نەبوو. لەڕاستیدا بەشێوەیەکی هەڵە گفتوگۆ لەبارەی ئافرێنەری دەکرێت. ئەو ئافرێنەرییەی لای حەزرەتی محەمەد جێگای باسە، مانای ئافرێنەری قەبا نابەخشێت.

خوداوەندەکانی پەنتائۆنی سۆمەر بەشێوەیەکی ڕوونو ئاشکرا نوێنەرایەتی کاربەدەستە باڵاکانی دەوڵەتی نوێیان دەکرد. ئامادەکردن و

ڕێکخستنەکەی سادە و بەکاریگەر بوو. ئەم جۆرە ڕێکخستنانە بۆ ئاستی کلتووری مەعنەوی قۆناخی خۆی بەپێی پێویست جێگای باوەڕ و مەشروعیەتکار بوو. بەڵام ڕێکخستنی خوداوەندە قەبەکان بۆ ئەم جۆرە مەشروعیەتەی ئاستی زهنیەتی کۆمەڵایەتی و کلتووری مەعنەوی سەردەمی حەزرەتی محەمەد بەس نەبوو. هەربۆیە تەنیا وەک حەزرەتی ئیبراهیم بەشکاندنی بتەکانی کەعبە نەوەستاوە کە نوێنەرایەتی ئەم ڕێکخستنەی دەکرد، بەڵکو بەتەواوی لەناوی بردوون. پەرستنی بتی بەگەورەترین گوناح داناوە. سزاکەی لەم دونیایەدا مردنە، لەدونیاکەی دیکەشدا دۆزەخی ئەبەدییە. لەمیانەی هەڵوەشاندنەوە و قەدەخەکردنی بنەڕەتی ئەو پەنتائۆنەی لەسەردەمی سۆمەر و میسرەوە بەردەوام بووە، خوداوەندی نوێ واتە ئەڵڵا یەکێک لەشۆڕشە مەزنەکانی مەعنەویاتی ئەنجام داوە. بەر لەهەموو شتێک "شۆڕشی ئیلاهی" جێگای باسە. لەمیانەی ئەو شۆڕشەوە زیان و دەستکەوتەکانی کۆمەڵگا چی بوون؟ ئەمە پرسیارێکی جیاوازترەو بەبڕوای من گفتوگۆکردنی زۆر گرنگ و بایەخدارە. گفتوگۆیەک کە لەسەر بنەمای بەراوردکردنی پەیوەندی فرەخوداوەندی بەفرە کۆمەڵگایی و دیموکراسی لەگەڵ پەیوەندی کۆمەڵگای تاکخودایی و دیکتاتۆریەتی مۆنارشی لەوانەیە دەرەنجامی گرنگ لەگەڵ خۆیدا بێنێت.

بەڵام دیسان بەبڕوای من لێکچوونی دەستەواژەی ئەڵڵای حەزرەتی محەمەد لەگەڵ "نموونەی خەیاڵەکان"ی ئەفلاتوون و دەستەواژەی "ئەنتەلگیا"ی ئەرستۆ[١٤] واقیعیترە. بە لەبەرچاوگرتنی ئاستی زانستی ڕۆژگاری ئەمڕۆمان بیرکردنەوەیەکی هاوتا بەدەستەواژەی 'ئانتی - ماددە' و "وزە" کە باشتر مایەی تێگەیشتنە گونجاوتر دەبێت. ئەم بەشە وەسفکردنی ئەڵڵایە کە وەڵامی گەردوونی دەرەوەی مرۆڤ دەداتەوە. حەزرەتی محەمەد دڵنیایە کە وشەی ئەڵڵا گوزارشت لەسەرتاسەری ناسنامەی کۆمەڵگا دەکات. لەمیانەی ئەم ئاماژەوە بەوە دەگەم؛ کردە و

---

[١٤] وێنە لای ئەرستۆ :(Entellagya) وێنە یان حەقیقەتی کردەیی یاخود سروشتی خوڕسک.

چالاکی بەناوی ئەڵڵا دەستەواژەیەکی لەخۆڕا یاخود پڕوپاگەندە نییە. لەڕاستیدا گوزارشت و دەربڕینی پراکتیکێکە کە ماناکەی بەرفراوانە. بەتایبەتیش کاتێک سروشتی کۆمەڵگا جێگای باس بێت مسۆگەر چالاکی بەناوی خودا (ئەڵڵا) مانای "تێکۆشانی کۆمەڵایەتییە". هیچ گومانێکم لەوەدا نییە کە حەزرەتی محەمەد دەستەواژەکەی بەم مانایە بەکارهێناوە. لەوەش گرنگتر لەو باوەڕەدام کە ئامانجی سەرەکی فەتحکردنی پاوانەکانی قازانج (کشتوکاڵ، پیشەسازی، بازرگانی)ی خۆرهەڵاتی ناوین بووە. تێکۆشانی کۆمەڵایەتی حەزرەتی محەمەد نموونەیەکی ڕەسەنی سۆسیال دیموکراتی چینی ناوین یاخود بەو شێوەیەی من هەوڵی بەکارهێنانی دەدەم تێکۆشانی 'کۆماری دیموکراتییە' کە 'کۆمەڵگای دیموکراتی'ش لەخۆوە دەگرێت.

هیچ هێمایەک لەئارادا نییە کە ئاماژە بەویستی حەزرەتی محەمەد بکات بۆ ئاواکردنی پادشایەتیەکی نوێ. بەهەمان شێوە هیچ ئاماژەو هێمایەکی داخوازی ئاواکردنی خانەدانیش بەرچاو ناکەوێت. ئەگەر بیویستایە هێزی ئەمەی هەبوو. هەر لەسەرەتاوە دەیتوانی ڕێگری لەدامەزراوەی خەلیفایەتی بکات. بەڕاوەستەکەی لەیەکەم مزگەوتی مەدینەدا ڕاڤە بکەین؛ کێشەی کۆمەڵایەتی گفتوگۆ دەکرێت. ئەمەیان خاڵێکی زۆر ڕوون و ئاشکرایە. هەر ئەندامێکی ئامادە لەجەماعەتدا هەڵدەسایەوە سەرپێ، تەنانەت بەبێ هەڵسانەوە و لەچێی خۆیشیان سەبارەت بەسەرجەم کێشە کۆمەڵایەتیەکان بۆچوونی خۆیان بەیان دەکرد و حیسابیان دەپرسی. مسۆگەر پێکهاتە و میکانیزمی کۆبوونەوەکە دیموکراتیکە. ژنان و کۆیلەکان و ئەندامانی هەر قەوم و گروپێکی ئەتنیکی بەشدارییان تێدا دەکرد. دەیانتوانی مافی قسەکردن وەربگرن. بۆ نموونە بیلالی حەبەشی کۆیلەیەکی ڕەشپێستی ئەفریقیاییە. سەلمانی فارسی ئەسحابەیەکی بەڕەچەڵەک فارسە. تەنانەت ژنان دەتوانن بەیەکەوە لەگەڵ پیاوان نوێژ بکەن. ئاشکرایە کە لەسەرەتادا شۆڤێنیزمی ڕەگەز و قەوم جێگای باس نییە. بەهەمان شێوە جیاوازی چین و قەبیلەش لەئارادا نییە. بەشداربوونی دیموکراتیانەی دەستپێکی ئیسلام ڕاستییەکی حاشا

هەڵنـەگرە. هـەروەها لەیەکـەمین کۆبوونـەوەکانی مزگەوتـدا بەڕێوەبـەرو فەرماندە چاوەڕوانکراوەکان دەستنیشـان دەکرێن. لـەپێناو نەهێشـتنی بـێ عەدالەتی بڕیارگەلێکی زۆر وەردەگیرێت.

دەشێت بابەتی غەنیمەتیش بەمجۆرە راڤە بکرێت؛ لەحاڵەتێکدا ئەگـەر نـەکرێت بەبابـەتی قۆسـتنەوەو تـاڵانی شەخسـی، ئـەوا بەدڵنیایـەوە دەتوانرێـت بگوترێـت کـە وەرچـەرخانی پاوانـەکان بـۆ مـوڵکی گشـتی هەڵمەتێکی عادیل و دیموکراتیانەیە. دەتوانین بڵێین تەنیا ئەم دوو بابەتە پیشـانیدەدات کـە لـەدۆخی لەدایکبوونیـدا سـەبارەت بەدیموکراسـی و عەدالەتی کۆمەڵایەتی ئیسلامیەت چەندە کراوە بووە. چونکە ئەگـەر ئـەم بەشداریکردنە دیموکراتیانە نەبوایە خستنەگەڕی ئەو هەموو قەبیلە، هەژار و ئەندامانی چینی ناوین نەکردە بوو. رێکخستنی حەزرەتی محەمەد لەسەر بنـەمای تونـدوتیژی نـەبوو، بـەڵکو رێکخسـتنێک بـووە بـەنـاوی ئەشـقی خوداوە پێشخرابوو. شەڕەکەشی بەهەمان شێوەیە. ئاشکرایە کە شۆڕشێکی ئایدیۆلۆژی ، کۆمەڵایەتی، ئـابووری و سیاسـی بـەرفراوان بـەڕێوەبراوە. نـرخ و بەهایـەکی زۆر بەشـێوازی بـەڕێوەبردنی ئـەم شۆڕشـەی حـەزرەتی محەمـەد دەدەم. پێوانـەکانی شۆڕشـگێڕی راسـتەقینە دەخاتـە ڕوو. ئـەو پێناسـە گەوهەرییـەی مـن لـە "حەقیقـەتی محەمـەد" لـێ تێگەیشـتووم بەمجۆرەیە؛ بەشێوەیەکی تۆکمە تۆڕی ئایدیۆلۆژی شۆڕشـی ئـاواکردووە، بەهـەمان تۆکمـەییو لێهاتوویشـەوە لەهـەر ئاسـتێکی کۆمـەڵگادا بـڵاوی کردۆتـەوە، بـەهۆشـیاری و باوەڕیـەکی ئاشـقانەش بـەڕێوەی بـردووە. بەگوزارشـتێکی عامیانـە ئەوانـەی تـر گووتـەی پڕوپـووچن. ئەگـەر ئـەم ناوەڕۆکە نەبێت شێوەکانی عیبادەت و زکر کردنیش جگە لەگووتەو کردەی پڕوپووچ هیچ مانایەکی دیکەیان نییە.

هەنـدێک خـاڵ جێگـای باسـن کـە حـەزرەتی محەمـەدیش لـەکاتی ئەنجامدانیانـدا دوو دڵـی کـردووە و بـۆ رەخنـەکردن کـراوەن. یەکـەمیان، کوشتنی پیاوە یەهوودیەکانە( پیاوانی قەبیلەی بەنی قوڕەیزە) دوای شەڕی خەندەق کەرێکەوتنیان لەگەڵ هێزەکـانی مەککـەدا کردبـوو. یەهوودییـەکان ئـەم بوویـەرە وەک یەکـەمین تاقیکردنـەوەی "جینۆسـاید" شـرۆڤە دەکـەن.

ئــەوەی لێــرەدا جێگــای باســە ســەرجەم یەهوودیــەکان نــین، نێــرە پێگەیشتووەکانن. هەروەها لەشەڕێکی چارەنووسسازدا ڕێکەوتنی قەبیلـەی ناوبراو لەگەڵ لایەنی بەرامبەر جێگای باسە. بەبڕوای من ئـەو بوویـەرەی کوشـتن زێدەڕۆییـە و لایـەنێکی نـەرێنی ئیسـلامە کـەدواتر دەقۆزرێتـەوە. دووەمیــان، لەبــەر ئــەوەی هەڵوێســتە دوو دڵەکــەی ســەرەتای دەرهــەق بەخوداوەنـدەکانی لات، مـەننات و عـوززای بـۆ هەڵوێسـتێکی رادیکـاڵی نکوڵیکردن گۆڕیوەو ئەمەش ڕێگای لەپێش ڕژێمی سوڵتانی کردۆتـەوە کـە دواتر دونیای ئیسلام زەوت و تالان دەکات، هەربۆیـە زێدەڕۆیی لێکراوە. چـەمک و دەسـتەواژەیەکی نـەرمتری خوداوەنـد، ئەگـەر بـەڕادەی دونیـای کرستیانیش نەبێت، بەلام لەوانەیـە کۆمـەکێکی زیـاتری بەپەرەسـەندنێکی فرەلایەنی دونیای ئیسلام کردبوایە. دەشێت ڕەخنەگەلی زیاتری لەم جۆرە پێشـبخرێت. ئــەوەی گرنگــە پــەی بــەم راســتییە ببرێــت کــە ئیســلام بزووتنەوەیەکی گەورەی ڕەخنکردنەو لەم چوارچێوەیەشـدا هەرچەنـدە زۆر درەنگیش کەوتبێت ئەم چەکە سەبارەت بەکێشە کۆمەلایەتییە سـەرەکیەکان بەکاربهێنرێت.

لەبەر ئەوەی بابەتەکەمان زۆر گونجاو نییە هەر بۆیە شرۆڤە و ڕاڤـە دەرهەق بە ٩٩ سیفەتی ئەڵلا ناکەم. بەلام بەر لەهەر شتێک پێویسـتە بڵـێم کە ئەم ٩٩ سیفەتە مسۆگەر "بەرنامـەی وەرچـەرخانی کۆمەڵگایـە". هـیچ گومانێکم لەوەدا نییە کە بـەو ڕادەیـەی ئـەڵلا و ٩٩ سیفەتەکەی بـەرزترین بەرنامـەی درێژخـایەنـە، بەرنامەیـەکی کۆمەلایـەتی کورتخـایـەنی دەرهـەق بەپێداویستییە ڕۆژانەییەکانیش لەخۆوە دەگرێت. هـەرگیز هـیچ گومـانێکم نییە و دڵنیام کە لای حەزرەتی محەمـەدیش واتاکـەی بـەم شێوەیە بـووە. ئەوەی زۆر جێگای داخ و خەم و پەژارەیـە؛ دوای کەسـایەتییەکی مێژوویـی وەک حەزرەتی محەمەد هەندێک کەسـایەتی سـووک و ڕیسـوای ئـاڵوودە و شەهوەتباز لەخیانەتکارە سپڵەکانەوە تا دەگاتە جۆرەکانی مونافیقێتیەوە لـەژێر نـاوی "ئیسـلامگەراییەوە" توانیویانـە تـا ڕۆژی ئـەمڕۆمان درێـژە بەساختەکاری خۆیان بدەن. ئەمە ئەو "بوویەر"ەیە کە تراژیدییەو مسۆگەر پێویستە لوغزو نهێنیەکەی شیکار بکرێت.

لەمە بەدواوە هەوڵی ڕیزکردنی ماوە و دیاردەکانی ئیسلام دەدەین.

١- سەردەمی چوار خەلیفە( راشیدی) لەمیانەی کۆکردنەوەی قورئان ــ فەرموودەکان و خێرایی بەردەوامبوونی بزاوتەکانی فەتح خۆی دەنوێنێت. لەو قۆناخەدا درزبوونێکی جددی لەئیسلامدا جێگای باس نییە. ئەرستۆکراسییە کۆنەکەی هێشتا هێزی ڕێکخستنی دژە شۆڕش و هەڵمەتی خۆی نییە. بۆچی سەرەتا ئیمام عەلی نەبوو بەخەلیفە جێگای گفتوگۆیە. چەندەی بەسەر دەچێت ئەم گفتوگۆیە گەورە دەبێت. هێشتا میرنشینی سەڵتەنەت جێگای باس نییە. قۆناخێکی نزیک لەکۆمارو دیموکراسی لەئارادایە. تا کۆتاییەکانی ساڵانی ٦٥٠ی زایینی بێزەنتیەکان بۆ پشتی شاخەکانی تۆرۆس راوەدوونراون، خانەدانی ساسانی و ئیمپراتۆریەتەکەیان ڕووخێنراوە. لەنێوان ساڵانی ٦٥٠- ٦٦٠ کێبڕکێی نێوان عەلی، مەعاویە و عوسمان دژواردەبێت. عوسمان و عەلی دەکوژرێن. لەکەسایەتی مەعاویەدا ئەرستۆکراسی مەککە تەنیا بەتۆڵەسەندنەوە لە ئیسلامی شۆڕشگێڕ ناوەستێت؛ بەخێرایی رژێمی سەڵتەنەت ئاوادەکات کە ناوەندەکەی شامە. وەک بڵێی لەمیانەی گۆڕینی خانەدانی ساسانی و پێشەنگایەتی بەکاریگەر ئیمپراتۆریەتی ساسانی بەردەوامە. خۆی لەخۆیدا بیروکراسی نوێ بریتییە لەکۆکراوەیەکی بیروکراسی کۆنی ئێران. لەڕوواڵەتدا وەک ناو ئیسلام ماوە بەڵام لەناوەڕۆکدا دووچاری خیانەتێکی گەورە هاتووە. لەکۆمەڵکوژییە تراژیدییەکەی کەربەلا(٦٨١) لەکەسایەتی حوسەیندا ئەندامەکانی دیکەی بنەماڵەی محەمەد بەبێ جیاوازی کردن لەنێوان ژن و منداڵ لەمیانەی کردەوەیەکی تۆڵەکردنەوە لەناو دەبرێن. بەبڕوای من ئەوەی دواتر ئیسلام نییە "دژە ـ ئیسلامە" یان ئیسلامی چەواشەیە.

تاکو دژە ئیسلام یان ئیسلامی چەواشە بەشێوەیەکی روون و ئاشکرا راڤە نەکرێت ئەوا شرۆڤەکردنی هیچ یەک لەو بزاوتە کۆمەڵایەتیانەی بەدرێژایی مێژوو بەناوی ئیسلام بەڕێوەبراون و ژیانداری کراون مانایەکی راست و دروست لەخۆوە ناگرن. چەندین نەریت و تەریقەت بەناوی ئیسلامەوە نوێکراونەتەوە. تەنانەت لەژێر ناوی ئەهلی بەیتەوە

"عەلەویگەرایی" و "شیعەگەرایی"ش ڕێکخراون. بەڵام تەواوی ئەم هەوڵانە ناتوانن شوێن پێی ئیسلامی چەواشە لەق بکەن کە زاڵ و باڵادەستە. لەبنەڕەتدا ئیسلامی چەواشە بزووتنەوەیەکی ئاوێتەگەرایی سیستەمی باوی شارستانی ناوەندی ڕۆهەلاتی ناوینە. لەسەر بنەمای خیانەتکردن لەبەها سەرەکیەکانی شۆڕشگێڕی، دیموکراسی، نادەوڵەتی و جۆرێک لەجۆرەکانی کۆماری سۆسیال وەک قۆناخێکی مێژوویی نوێ ئیسلام دەکرێت بەیەکێک لەدیاردە نەریتەکانی شارستانی سێ هەزار و پێنج سەد ساڵە. عەباسیەکان وەک یەکێک لەلوتکەکانی ئیسلامی چەواشە ڕۆڵ دەبینن. ئەگەر بەئەندازەی خانەدانی ئەمەویش نەبێت، بەڵام ئیسلامی چەواشە دەکەن بەگەورەترین هێزی هەژموونگەرایی خۆرهەلاتی ناوین. ئەو بنەماڵەو خانەدانەی لەقۆناخی نێوان ساڵانی ٧٥٠ ـ ١٢٥٠ زایینی ژیاوە بەجۆرێک لەجۆرەکان مانای بابلی نوێیە. لەساڵی ٧٦٠ ز بەسیفەتی پایتەخت و بابلی نوێ شاری بەغداد بونیاد دەنرێت. لەم قۆناخەدا بزاوتێکی فەلسەفەو تیۆلۆژیای ئیسلامی جێگای باسە کەتەواو ئەنجامگیر نەبووە. گفتوگۆی ئەقڵی ئازاد پێشخراوە. ئەلکەندی، فارابی، ئیبن رازی، جابر، ئیبن سینا و ئیبن روشد کەسایەتی گرنگی ئەو قۆناخەن. لەقۆناخی خۆیاندا گفتوگۆکانیان سەبارەت بەفەلسەفە زۆر لەپێشەوەی گفتوگۆکانی ئەوروپایە. هەروەها لەبواری پەرەسەندنە زانستیەکانیشەوە خۆرهەلاتی ناوین لەپێشەوەدایە.

کۆتاییەکانی سەدەی دوازدەهەم هەم لە مێژووی شارستانی هەژمونگەرایی خۆرهەلاتی ناوین، هەم بەو سیفەتەی ئیسلام دوا ناوی ئەو هەژموونگەراییە خاڵێکی هەستیاری قۆناخی وەرچەرخانە. چارەنووسی خۆرهەلاتی ناوین و ئیسلام گرێدراوی چۆنیەتی تێپەڕکردنی ئەم خاڵەی وەرچەرخانە، ئایا سەرکەوتوو دەبێت یان نا. دەشێت ماوەی بەر لەم وەرچەرخانەی مێژووی ئیسلام وەک ئیسلامی عەرەبی هەڵسەنگێنرێت. ئیسلامی عەرەبی نوێنەرایەتی ئیسلامی چەواشە دەکات نەک ئیسلامی شۆڕشگێڕی. لەو سەردەمەدا ئەرستۆکراسی قەبیلە توانیویەتی وەک هێزی شارستانی خۆی ڕێکبخات و هەژموونگەرایی هەرێمی ئاوابکات. ناوەکەی

دیکەی ئەو ئیسلامە" ئیسلامی سووننی" یە. مانای ئەتمۆلۆژی ئیسلامی سوننی ئیسلامی نەریتی، راستڕەو و ئەرستۆکراتیکە. سێسەد ساڵ دوای سەرهەڵدانی پەسەندکردنی ئایینی کرستیانی وەک ئایدیۆلۆژیای فەرمی رۆمای رۆژهەڵات(بێزەنت) دێنێتەوە بیری مرۆڤ. جیاوازیەکەی ئیسلام لەوەدایە ئەو پرۆسەو قۆناخە بەخێرایی روویداوە. سێ سەد ساڵ نییە، بەڵکو قۆناخێکی نزیکەی سی ساڵەیە.

ئەگەر دابەشبوونێکی رادیکاڵ نەبێت ئەوا دۆخێکی ئاساییە کە ئاوێتەبوون لەگەڵ شارستانیدا روونادات. هەروەکو کرستیانی ئەم قۆناخەو پرۆسەیە لەئیسلامیشدا بەشێوەیەکی بەربڵاو جێگای باس بووە. چەندەی هەژارانی قەبیلە بۆیان روونددەبێتەوە کە لەلایەن هێزی دەسەڵاتەوە واتا لەلایەنی ئەرستۆکراسی قەبیلەوە دووچاری خیانەت هاتوون هەنگاو بۆ شەڕێکی ریشەداری ناوخۆ دەهاوێژن. یەکەمین نموونە بزووتنەوەی خەواریجەکانە. یەکەمین گەورە فراکسیۆن کە پەرچەکرداریان سەبارەت بەناکۆکی نێوان مەعاویە ـ عەلی دەبێت و دەکەونە ناو چالاکی و هەنگاوی کرداریەوە. سەرجەم ئەندامەکانی بەدەوین. رق و تووڕەیی گەورەیان بەرامبەر بەوەرنەگرتنی پشکە بەڵێن پێدراوەکەیانە. سەرباری ئەوەی خۆیان شەڕەکەیان کردبوو، بەڵام چینی باڵادەستی ئەرستۆکرات زەوتی کربوو کە بەدوای ئاواکردنی خانەدانیەتیەوە بوو. چالاکی زۆرخوێناویان رێکخست. عەلی بوو بەقوربانی ئەم قۆناخە. خەواریجەکان لەبنەڕەتدا پلانی کوشتنی ئەو سێ کەسەیان دانابوو کە لەهەوڵی دەسەڵاتدا بوون ( عەلی، مەعاویە و عومەری کوڕی عاس). دووانیان بەرێکەوت رزگاریان بوو. بەلایەنی ئانتی ـ شارستانیگەرایی یەوە بزووتنەوەی خەواریجەکان زۆر سەرنج راکێش بوون. لەبەر ئەوەی زۆر ئاشیرکراون هەڵسەنگاندنی بابەتیان لەبارەوە نەکراوە. ئاشکرایە کە نوێنەرایەتی هەژارترین و رەنجدەرترین توێژی قەبیلەکان دەکەن. وەک پەرچەکردارێک بەرامبەر لەدەستچوونی بەشداریکردنو دیموکراسی سەرەتایی دەستپێکی ئیسلام و زاڵبوونی پەرەسەندنێک بەئاراستەی دەسەڵاتگەرێتی و دەوڵەتبووندا نەخشەی ئەم چالاکیانەیان دارشت و

جێبەجێیان کردووە. لەبەر ئەوەی شایستەترین نموونەی تۆمارکراوی ململانێی دیموکراسی ــ دەسەڵاتی ناو بونیادی ئیسلامە گرنگییە مێژوویەکەی مەزنە.

هەروەکو زۆرجار نموونەکەی لەمێژوودا بینراوە نەبوونی ڕێبەرایەتی ئایدیۆلۆژی و ڕێکخستنی تێکچوونیان و توانەوەیانی لەناو چەرخی هێزەکانی دەسەڵاتدا لەگەڵ خۆیداوە هێناوە. بنەماڵەی محەمەدیش کە بەئەهلی بەیت ناودەبرێت دوای کارەساتەکەی کەربەلا جارێکی دیکە پشتی خۆی ڕاستنەکردەوە. سەرباری ئەوەی بزاوتی دوانزدە ئیمام، بزووتنەوەی فاتیمی و ئیسماعیلی بەناوی بنەماڵە سەریانهەڵداوە بەڵام نەیانتوانی ئیسلامی سوننی لەدەسەڵات بخەن. ئەم مەیلەی زیاتر لە ئێران، ئەنادۆڵ و باکوری ئەفریقیا هەوڵی بەهێزبوونی دراوە هەرچەندە لەماوەیەکی کورتدا هەندێک دەوڵەتی ئاواکردبێت، بەڵام لەنوێنەرایەتی کردنی ئیسلامی شۆڕشگێڕانە دووربوون. باڵەکانی ئێران لەسەرەتاکانی سەدەی شانزەهەم لە ژێرناوی " شیعە" توانیان ببن بەهێزی شارستانی فەرمی. ئیسلامی ئەم دەوڵەتەش وەک ئەوەی دەوڵەتی فاتیمی ( باکوری ئەفریقیا) لادانێکی ڕاستڕەوانەی ناو ئەهلی بەیت بوو. عەلەویەتی هەزاران، هەروەها قەرمتی، مورابیتەکانو گروپی حەسەن سەباح یش کەوەک ئەوان بوون، وەک بەرخودانێکی ڕادیکاڵ دژی دەسەڵات وەستانەوە.

٢ - خانەدانەکانی ئەمەوی و عەباسی لەبنەڕەتدا کاتێک ئەرستۆکراتەکانی قەبیلەی نیمچە دوورگەی عەرەبیان گەیاندە دەسەڵات و چەندین دەوڵەتیان بۆ ئامادەکردن ئیتر ڕۆڵی مێژوویی خۆیانیان گێڕابوو. لەم ڕێگایەوە وزەی ناوەکی سیستەمی قەبیلەیان مژیبوو کە نەریتێکی هەزاران ساڵە بوو. ئەو عەرەبانەی کە مابوونەوەش وەک پۆلێنێکی دیرۆکی لەدۆخی "عەرەبە بەدەویەکان" ەوە سەرلەنوێ مانادار بوون. دەشێت ئەمانە وەک توێژە کۆمەڵایەتییە جێنشین و نیمچە جێنشینەکانی چینە هەژارەکانی ئەو قەبیلانە پێناسە بکەین کەچوونەتە ریزی ئیسلامەوە. هەمان دۆخی دابەشبوونە کە لەتورکمانەکانی تورکەکان و کرمانجەکانی کوردان دوای موسڵمان بوونیان ڕوویداوە. ئەم دابەشبوونە

جیابوونەوەیەکی کۆمەڵایەتی زۆر جدیەو رشترین بزووتنەوەی چینایەتی مێژووی خۆرهەڵاتی ناوینە. بەشێوەیەکی گشتی لەپێگەی رکابەرایەتی کردنی ئەرستۆکراسی قەبیلەی دەسەڵاتگەرادا دەمێنن، لەژێر پەردەی ئایدیۆلۆژی ئیسلامی شۆڕشگێڕ لەسەرووی هەمووشیانەوە لەژێرناوی عەلەویەتی و تەریقەت و مەزهەبی جیاوازەوە درێژە بەهەبوونی خۆیان دەدەن.

بەو سیفەتەی ئیسلامی چەواشەیە سونیگەرایی عەرەب توانی عەرەبەکان لەدۆخی جڤاتی قەبیلە پەرتەوازەکان ڕزگار بکات و بەپێگەی قەوم (قەومی نەجیب = قەومی ڕەسەن) یان بگەیەنێت. بەردەوامیش قەبیلەگەراییەکی هەژموونگەرا و شۆڤێنی لەگەڵ خۆیدا بارکردبوو. وەک جۆرێک لەشێوەی فاشیزمی ئیسلامگەرایی بوو. هێزە رادیکاڵەکانی ئیسلامگەرایی ڕۆژی ئەمڕۆمان (ئیسلامی سەلەفی مۆدێرن) ئەم ڕاستییە دەسەلمێنن. پەرەسەندنی هاوشێوە لەکرستیانی و موسەویەتیشدا بەردەوام بووە. کاتێک ئیسلامی عەرەبی دەستی گرت بەسەر پاوانی دەسەڵاتی سیاسی شارستانیدا ئیتر ڕووبەڕووی بژاری مێژوویی بوو. بژاری یەکەم؛ فەتحگەرایی سەربازی بوو. ئەم فەتحگەراییە بەچاوی غەنیمەت تەماشای زێدە (بەها، بەرهەم) کۆمەڵایەتیەکان دەکات و پشت بەزەوتکردن و دەستبەسەرداگرتنیان دەبەستێت. لەو قۆناخەدا بەپێی پێویست بابەتی غەنیمەت لەکۆمەڵگای خۆرهەڵاتی ناوین جێگای باس بوو. بەنۆرە جزیە و سەرانەی قورس و زۆر لە کریستیان و موسەویەکان و ئەوتوێژانە وەردەگیرێت کە بەکافر ناودەبرێن، هەروەها لەکاتی شەڕدا لەژێر ناوی "غەنیمەت"ەوە تالانکاری دەکرێت، واتە دەست بەسەر زێدە کۆمەڵایەتیەکاندا دەگیرێت. ئەو باجەی لەخەڵکی موسڵمانیش وەردەگیرا گرێدراوی سیستەمی (ئاشار) بوو؛ واتە پشکی یەک لە دەی زێدە ـ بەرهەمو داهاتی ساڵانە پێکدێنێت. هەرچەندە سەمیر ئەمین خوازیارە ئەمە وەک دۆخێکی پۆلێنکراوی سیستەماتیکی 'باجگەراکان' پێشکەش بکات، بەڵام ئەمە بژارێکی هێندە مانادار نییە. ڕەفتار و کردەیەکی گشتی شارستانییە.

بـژاری دووەم؛ پاوانگـەرایی بازرگـانی بـوو. دەشـێت بگوترێـت کـە قۆناخێکی جددی سەبارەت بەم بابەتە جێگای باس بووە. خـۆی لەخۆیـدا بەشێکی گرنگی نـەجیبزادە نەریتییـەکان پێشـتر ئاشـنای بازرگـانی ببـوون (تەنانـەت لەمەککـەش ئەرستۆکراسـی لەسـەر بنـەمای بازرگـانی بـوو). لەنیمچـە دوورگـەی عـەرەب هەلومـەرجی جیۆبـایۆلۆجی بـۆ پاوانگـەرایی کشـتوکاڵ گونجـاوو لـەبار نـەبوو. بـەهۆی خەسـڵەتی بیابـانی ناوچەکـە ئاژەڵدارییش بەشێوەیەکی سنووردار ئەنجام دەدرا. بازرگانی مەودای درێژ، لەم سۆنگەیەوە دەرفەتەکانی قازانج و داهات بازرگانی کربوو بـەپاوانێکی گرنگـی قـازانج. شـام، حەلـەب[15]، بەسـرە، قـاهیرە، تـایف، مەککـە، قـەیرەوان، سـەمەرقەند، بوخـارا، گەزنـە، هیـرات، بەتایبـەتی بەغـدادی پایتـەختیش وەک ناوەنـدێکی گرنگـی بازرگـانی لەسـەردەمی هەڵکشـانی خۆیاندا بوون. زۆر بەر لەئەوروپا شۆڕشـێکی پێگەیشتوویی"شـارگەرایی و بازرگانی" لەئارادابوو.

سەدەکانی ٨ـ ١٢ لەهەمان کاتدا سەردەمی "شۆڕشی شـارو بازرگـانی" ئیسـلامە. لـەپاوانی کشـتوکاڵ و پیشەسـازیدا قـازانج سـەرلەنوێ رێکخرابوویـەوە، لـەم سـۆنگەیەوە بەشـێوەیەکی سـنووردار مابوویـەوە. هەمان هەڵمەتی شۆڕشگێڕانە لەکشتوکاڵ و پیشەسازی ئەنجامنـەدرابوون. هەستیارترین خاڵ سەبارەت بەئیسلامیەت لەم بابەتەدا کۆبۆتـەوە..بۆچی هەنگاو بۆ هەڵمەتێکی بەرهەمداری کشتوکاڵ و پیشەسازی نەهاوێشـتووە. لەڕاستیدا لەهەردوو بواریشدا توانستێک لەخۆرهەڵاتی ناوین جێگای باس بوو. تەنیا ڕووبارەکانی نیل، دیجلـە، فورات و پـەنجاب خـاکی بـەپیت و ئـاوی پێویسـتیان بـۆ شۆڕشـی کشـتوکاڵ پێشـکەش کردبـوو. یەکـەمین شۆڕشەکانی کشتوکاڵ بناخەی شارستانی میسر و سۆمەریان پێکدەهێنا. هەروەها شۆڕشی هەزاران ساڵەی کشتوکاڵی نیولیتیک یش هێشـتا دەست بەکار بوو. واتە کۆمەڵگایەکی زۆر پتەوی گونـد ــ کشـتوکاڵ لـەئارادابوو.

---

[15] حەلەب: دەکەوێتە باکووری سوریا، دووەمین گەورە شـاری سوریایە. یەکێک لە شـارە دێرینـە ئاوەدانـەکانی جیهانـە. مێژووەکـەی بـۆ چـوار هـەزار سـاڵ پـێش ئێسـتا دەگەڕێتەوە.

گرێدراو بەمێژووی شار لەبواری پیشەگەرایی و پیشەسازیش خاوەن درێژخایەنترین توانستەکانی مێژووبوون (نزیکەی چوار هەزار و پێنج سەد ساڵە). بەتایبەتیش لەسەردەمی عەباسیەکان بناخەی پێویستی فەلسەفی و زانستی نیمچە شۆڕشێکی ڕێنسانسی ئەنجامدابوو. ئەگەر خوازیار بوونایە زۆر بەئاسانی دەیانتوانی شۆڕشێکی پیشەسازی و کشتوکاڵی زۆر لەهی ئەوروپا پێشکەوتوتر ئەنجام بدەن.

بەبڕوای من بینینی هۆکاری سەرەکی ئەنجامنەدانی ئەم شۆڕشە لەشێوازی کەڵەکەکردنی قازانجدا ڕاستترین و دروستترین ڕاڤەیە. بەبێ ئەنجامدانی شۆڕش لەڕێگای بازرگانی و غەنیمەتەوە دەیتوانی قازانجێکی زۆر و زەبەلاح کەڵەکە بکات. غەنیمەتەکانی دەسەڵات و شەڕ سەرنج ڕاکێش و بەپیتتر دەبینران. جگە لەچین تا ڕادەیەک تەواوی شوێنە جێنشینەکانی جیهانی کردبوو بەمەیدانی بازرگانی و غەنیمەتی خۆی. "فەتحگەرایی جیهان" ئەم دەرفەتەی بۆ دەڕەخساند . سوپاو شەڕ کرابوون بەپیترین پاوانەکانی داهات، ڕێکخستن و چالاکی قازانج. کەچی هێزە پێشەنگەکانی شۆڕشی کشتوکاڵ و پیشەسازی ئەوروپا ــ ئینگلتەرا و هۆلندا ــ بۆ دەربازکردنی دۆخی تەنگەتاوی پاوانەکان ( کە لەلایەن ئیسپانیا، فەرەنساو پاپایەتیەوە تەنگەتاوکرابوون) چارەیان لەئەنجامدانی هەڵمەتی یەک بەدوای یەکی کشتوکاڵ و پیشەسازیدا بینیبوو. چونکە لەرەوشێکی پێچەوانەدا هەڵوەشانەوەیان و داگیرکردنیان لەلایەن هێزە گەمارۆدەرەکان ئاسان بوو. پاوانی دەسەڵاتی خۆرهەڵاتی ناوین کێشەیەکی بەمجۆرەی نەبوو. لەهەرلایەک قورساییەکی یەکسانی هەژموونگەرایی جێگای باسبوو. هێزێکی ئەوتۆش بەرامبەر ئەو هەژموونگەرایە لەئارادا نەبوو کەتایبەت داوای پاوانی قازانج بکات. قەومە کریستانیەکان ئەگەر نیازی شۆڕشێکی بەمجۆرەشیان هەبێت (ئەرمەنیەکان، ئاشووری و گریکیەکان بۆ ئەمە گونجاو بوون) بەهۆی بێزەنت (هێزی ستاتۆگەرایی ئەو سەردەمە) چانسی ئەنجامدانی نەبوو. هەروەها ئیسلامیش ڕێگایانی بڕیبوو. لەم سۆنگەیەوە سوپاو هونەری شەڕڤانی بەو سیفەتەی پاوانگەرای دەسەڵات بوون لەدۆخێکدا بوو هێشتا

دەیتوانی وەک گرنگترین ئامرازی قازانج رۆڵی خۆی ببینێت. سەرکەوتنێک بەسبوو تاکو وڵاتێک و کۆمەڵگایەک بکرێت بەمەیدان و بابەتی غەنیمەت. ئەو سەرچاوانەش هەرەس ئاسا گەورە دەبوون کە لەپێناویدا دەجەنگان.

کەواتە لەبەر ئەوەی بەبەراورد لەگەڵ پاوانی سیاسی و سەربازی شۆڕشی کشتوکاڵ و پیشەسازی قازانجێکی زۆری بەدەست نەدەهێنا هەر بۆیە پێشنەدەخرا. پێشنەکەوتنی شۆڕشی پیشەسازی و کشتوکاڵ دەبووە هۆی پێشنەکەوتنی شۆڕشی زانستی ، ئەمەش ڕێگای لەپێش پەرەنەسەندنی شۆڕشی فەلسەفی و هونەری دەکردەوە. بەبڕوای من لەبەر ئەم هۆکارە سەرەکییە رێنسانسی ئیسلام، ریفۆڕم و رۆشنگەری تا دوایی پەرەی پێنەدراو ئەنجام نەدران. خیانەتی لەمێژووی چوارسەد ساڵەی خۆی کردو بەدەستەکانی خۆی دەرفەتی گواستنەوەی هەژمونگەرایی بۆ دەستی ئەوروپا رەخساند. ئەمەش لەنزیکەوە پەیوەندی بەسەرکوتکردنی کریستیانیو موسەویەکان و تەنگەتاوکردنیان بەرەو ئەوروپاوە هەیە. بەمجۆرە لەکاتێکدا ئیسلامیەت (سوننی) دواترین و بەرزترین هەڵمەتی شارستانی ناوەندی خۆرهەڵاتی ناوین ئەنجامدەدات، لەهەمانکاتدا ناسنامەی کۆی هێزەکانی سەربازی، سیاسی، ئابووری و ئایدیۆلۆژی (ئیسلامی سوننی فەرمی) بوو کە هۆکاری سەرەکی هەرەس هێنانەکەی بوو.

شارستانی ئیسلامی و بەزهەڵستکارە دیموکراتیەکەی دوای سەدەی دوازدەهەمین لەو دۆخە دەردەچێت کە قەومیەتی عەرەب بناخەکەی پێکبێنێت، بەڵکو دیمەنێکی فرە قەومیەت وەردەگرێت. گوزەرکردن بۆ قۆناخێک جێگای باسە کە زیاتر ئەرستۆکراتی قەبیلە تورکەکان رۆڵی پێشەنگایەتی تێدا دەبینن. لەم قۆناخە گرنگەدا کە کاریگەریەکەی تا رۆژگاری ئەمرۆمان بەردەوامە سەراوبنبوونێکی چینایەتی و ئەتنیکی ڕوودەدات. هەر لەسەردەمی ئەمەویەکانەوە شۆڤێنیزمی قورەیش ( شۆڤێنزمی قەبیلە) لەژێر ناوی قەومی نەجیبدا بۆ شۆڤێنزمی عەرەب (شۆڤێنزمی قەوم)ی گۆڕابوو. دوای خیانەتی چینایەتی ئیسلامی چەواشە (بەرامبەر هەژاران و بەدەویەکان) دووەهەمین گەورە خیانەت لەسەر

بنـەمای قەومگـەرایی بـوو. دواتـر ئـەم میراسـە وشکە ناکۆکییـە قـەومی و چینایەتیەکانی قووڵتر کردووە.

دوای ئەرستۆکراسی عەرەب، ئەرستۆکراسی قەبیلە تورکـەکان لەپلـەی دووەمـدا نوێنەرایـەتی ئیسـلامی چەواشـەیان کـردووە. بەپێچەوانـەی مەزندەکان سەردەمی سەلجۆقیەکان (١٠٤٠ ـ ١٣٠٨) ئـەو قۆناخـە نییـە کـە ئەرستۆکراسی تورک بەتەواوی تێیدا زاڵە. وەک دەزانرێت چەندین کەس و گروپ هەر لەسەردەمی کۆچی هونەکان بەرەو رۆژئاواوە لەتیرە تورکـەکان دابـڕان و لـەناو سنووری فـەرمانڕەوای دەوڵـەتی عـەرەب و بێزەنتـی ئـەو قۆناخـە وەک سـەربازی مووچـەدار ئـەرکیان وەرگرتـووە. ئەمـە نـەریتێکی بـەربڵاوە. بەمشـێوەیە لەسـەدەی نۆیەمینـەوە کەوتوونەتـە خزمـەت عەباسیەکانیشـەوە. میرنشـینی سـەلجۆقی شـێوەیەکی تۆزێـک پێشکەوتووتری ئـەم پرۆسـەو قۆناخـەیـە. سـوڵتانە عەباسـیەکان وەک پێویستیەکی بەرژەوەندیـەکانیان ئەرکدارکردنی سـەلجۆقیەکان لـەئێران و ئـەنادۆڵ وەک پرەنسـیبێکی سـتراتیژی پەسـەند کردبـوو. بـۆ ماوەیـەکی درێژخایەن، بگرە تا کۆتاییەکانی خانەدانی عەباسی ناوەنـدی سـەڵتەنەت لـەژێر کـۆنترۆڵی بەغـداد دەرنـەچووە. هەرچەنـدە دابڕانـی کردەیـی کورتخایەنیش جێگای باس بووبێت، بەڵام لەبواری ئایدیۆلۆژی، سیاسـی و کلتووری بەیەکەوەن و بەردەوامی یەکترن.

٣ ـ بنچینـەی تورکـە سـەلجۆقیەکان (سـەبارەت بـە ئەرستۆکراسـی) بابەتێکی سەیرە کە پێویستی بەلێکۆڵینەوە هەیە. شیمانەیەکی بەهێزە کـە خودی سەلجۆق بەگ لەکۆتاییەکانی سەدەی دەیەم لەگەڵ دەوڵەتی تورکی خەزرای یەهوودیەوە پەیوەندی بەستووە، تەنانەت ئەرکیشی وەرگرتـووە. دەشێت لەناوی هەرچوار کوڕەکەی (بەهەڵەدا نـەچووبم ناویـان میکائیـل، موسـا، یوسف و ئەرسـەلان)دا ئـەم راسـتییە بخوێندرێتـەوە. بـەڵام بـاش دەرکی بەو راستییە کردووە بۆ ئەوەی لەدونیای ئیسلامیدا بەکاریگەر بێت کە تا سنوورەکانی چین حکومڕانی خۆی ئاواکردبوو، یان دەبوو موسڵمان دیاربێت یاخود ببێت بە موسڵمان. پەیوەندی نێوان نوخبەکانی یـەهوودیو ئەرستۆکراسی تورکی کە لەخۆرهەڵاتی ناویندا بڵاوبوونەتـەوە کێشـەیەکی

مێژوویی و هەنووکەیە کەتا رۆژگاری ئەمڕۆمان بایەخدارەو پێویستی بەلێکۆلینەوەیەکی باش هەیە. بەتایبەتیش ئەگەر لایەنی سەربازی، ئابووری و سیاسی دەرەنجامەکانی روون و ئاشکرا نەکرێن زەحمەتە بەشێوەیەکی شایستە دەرک بەڕاستییە مێژوویی و هەنوکەییەکانی بکرێت و بسەلمێنرێت.

سەلجۆقیەکانی بەگی تیرە تورکەکان تا سەردەمی دەولەتی ئەنادۆل توانیویانە بەشێوەی خانەدانی جۆراوجۆرەوە حکومڕانی خۆیان بەسەر جێنشینەکاندا بسەپێنن. لەمیسر بەشێوەی خانەدانی تۆلۆن ئۆغولاری و ئیخشیتەکان، لەئێراق و سووریاش لەرێگای ئەتا بەیلگە هەمەجۆرەکان، لەئەنادۆل و ئێرانیش بەشێوەی سولتانە سەلجۆقیەکان. ئەمجۆرە پەلهاویشتنەی بەگەکانی تیرە تورکەکان لەخۆرهەلاتی ناویندا دوو گەورە ئەنجامی مێژوویی هەبووە: یەکەمیان؛ پێگەی دووەمین قەومی حکومڕان — دوای عەرەبەکان — بەردەوام ستراتیژی سەرەکییان لەسەر دەولەت و دەسەلات بووە. بەلام ئەنجامی سروشتی ئەم مەیلەیان تواندنەوەی چینی سەروو بووە لەناو کلتوری فارس و عەرەبەکاندا. بەشێوەیەکی زۆر ئاشکرا خاوەندارێتییان لەتورکێتی نەکردووە. تورکێتی بەشێوەیەکی داپۆشراوو بابەتی ماوەتەوە. ئەرمەنیەکان، ئاشووریەکان و گریکەکان (تارادەیەکیش کوردەکان) بوونەتە قوربانی ئەم کاراکتەرەی رژێمی سولتانێتی عەرەبو تورکەکان. هەروەکو پێشتریش ئاماژەمان پێکرد ئەرمەنیەکان، ئاشووریەکانو گریکەکان (هێلینیەکان) بەوسیفەتەی یەکەمین قەومە کریستیانەکانن سەرلەنوێ خۆیانیان بونیاد ناوەتەوە. سەبارەت بەهەر سێ قەومیش بەجۆرێک لەجۆرەکانی کرستیانی جۆرێک لەمیللیگەرایی بوو. راستر میللیگەرایی قۆناخی خۆیی بوو. لەجیاتی نەتەوە پێناسەکردنی بەشێوەی میللیگەرایی قەوم واقیعیترە. لەسەر ئەم بنەمایە کرستیانی پەسەندکرابوو. جیاوازیەکەی لەگەل کاسۆلیکی لاتینی لەم واقیعەدا شاراوەبوو. لەسەرەتا بەخێرایی رێگای لەپێش بوژانەوەو بەنەتەوەبوونی پێشوەختیان کردەوە. کریستیانی جۆرێک لەرۆلی میللیگەرایی بینیوە.

لەدوای ریفۆرم سەرجەم گەلانی ئەوروپا لەسەرووشیانەوە باکوری ئەوروپا بەپرۆسەو قۆناخێکی بەمجۆرەدا تێپەڕیانکرد. کرستیانی رۆژهەلات پێشوەخت ئەم پرۆسەی دەستپێکردبوو. دواتر دوای وەرچەرخانی ئیسلام بۆ میللیگەرایی‌یەکی بەرایی (ئیسلامی چەواشە، ئیسلامی سەلتەنەت ـ دەسەلات) ئیتر گەلە دێرینەکان دووچاری دێوەزمەو کارەسات دەهاتن. لەبەر ئەوەی لەبەرگەکانی پێشووتردا بەشێوەیەکی بەرفراوان رۆلی ئایدیۆلۆژیای قەومی یەهوودی لەمەدا هەلسەنگێندراوە دیسان بابەتەکە دووبارە ناکەینەوە. بەلام فاکتەرەکانی قەبیلەگەرایی ناوەڕۆکی ئەم ئایدیۆلۆژیایە زۆر بەر لەقۆناخی دەولەتگەرایی ـ نەتەوە هەروەکو چاخی یەکەمین کاریگەریەکەی زۆر بەرفراوانتر لەسەر چاخی ناوین بەردەوام بووە. لەسەردەمی میرنشین و سولتانە تورک و عەرەبەکان کە بەنۆرە هێزی هەژموونگەرایان لەدەستدابوو لەئەنجامدا مێژوو دژ بە ئەرمەنی، ئاشووری و هێلینیەکان وەرچەرخابوو. تاڕادەیەک دژی کورد و فارسەکانیش بوو. لەمیانەی بەکارهێنان و تاقیکردنەوەی هەر رێ و رێبازێک تۆزێک ماوە تا رۆژی ئەمڕۆمان کلتوورو گەلە کریستیانەکان لەناو بچن. لەناوچوونی ئەم کلتوورە پێشکەوتووانەی چاخەکانی کۆن و ناوین گەورەترین خیانەتی شارستانی خۆرهەلاتی ناوین بووە بەرامبەر بەگەلان. ئەم تراژیدیا نەفرین و مێژووییە رۆلێکی دیاریکەری هەیە لەبیابانی کلتووری خۆرهەلاتی ناوین و خزانی بۆ ناو قەیران و خۆکوژیەوە. کوردان هێندەی گەلە کریستیانەکان دووچاری لەناوبردنی جەستەیی نەهاتن، بەلام لەبواری کلتوورییەوە ناچاری خیانەتێکی زۆر قورسترکراوە. کورد گەلێکە تا ئێستا تا بینە قاقای لەناو ئەو خیانەتەدا دەژیت. باسی ناسنامە ناکەم، چونکە تا ئێستا دانیان پێدا نەناوە. ئاشکرایە کە کێشەی چۆنیەتی بونیادنانی خۆیان بەشێوەی ناسنامەیەکی ئازاد لەسەدەی بیست و یەکەمدا دەبێتە سەرەکیترین کێشەی خۆرهەلاتی ناوین.

لەبواری شێوەو زەماندا ئەم کۆتاییە تراژیدیەی کریستیانەکان بەتایبەتی لەئەنادۆل دووچاری هاتن هاوشێوەی ئەو بوویەرەیە کە

موسڵمان و یەهوودیەکانی ئیسپانیا دووچاری هاتن. چەندین پێدراوی مێژوویی ئاشکرای دەکات کە بەرامبەر بە لەناوبردنی موسڵمان و یەهوودیەکان لەلایەن میرنشینە کریستیانیە ئیسپانیەکان و ئەورووپای کاسۆلیکی پشتیوانیانەوە، کریستیانەکانی ئەنادۆڵیش لەلایەن سوڵتانە عوسمانیەکان و بانقدارە یەهوودی و بازرگانە بەکرێگیراوەکانیان دووچاری لەناوبردن هاتن. لەسەر بنەمای رێکەوتنی هاوشێوەی ئەو قۆناخە، بەرامبەر بە لەناوبردنی یەهوودی و تورکە موسڵمانەکانی بەڵقان، لەناوبردنی پاشماوەی ئەو کریستیانانەش لەتەواوبووندابوو کە لە ئەنادۆڵ مابوونەوە. جیاوازی ئەم قۆناخە لەوەدایە ئەمجارە لەلایەن موسڵمانان و میرنیشینەکانەوە نییە، بەڵکو لەلایەن چینی بۆرژوازی تازە پێگەیشتوو و نوخبەکانەوە ئەنجامدراوە.

دووەمین گەورە ئەنجامی مێژوویی ئەوە بوو کە لەئاستی چینایەتی روویدابوو. هاوشێوەی ئەو دابڕانە چینانەیەتییەی لەنێوان عەرەبە نەجیبزادەکان و بەدەویەکان هاتنە ئاراوە لەنێوان بەگەکانی تیرە تورکەکان و هەژارەکاندا روویدا. لەکاتێکدا بەگەکان بەناوی تورکێتیەوە ناسنامەیان بەدەست هێنا، تیرەکانی خوارەوە خۆیان بە تورکمان پێناسەکرد. تورکمان تورکێتی ئەو قەبیلانە پێناسە دەکات کە خراونەتە دەرەوەی دەسەڵات و موسڵمانێتی سوونیەوە. تورکمانەکان کە زیاتر لەناوچە لادێیی ــ شاخاویەکاندا دەگیرسێنەوە و بەئاژەڵدارییەوە سەرقاڵن، هەنگاو بەهەنگاو گرێدراو بەخاک نیشتەجێ دەبن و کارەکتەری لادێیی بەدەست دێنن. لەبنەڕەتدا ئەوانەی تورکێتی لەزمان و کلتووردا دەژێنن تورکمانەکانن. هەرچی تورکە بەگەکان بوون بەڕادەیەک خۆیان لەگەڵ نەجیبزادە عەرەب و فارسەکان کردبوو بەیەک کە لەناو زمان و کلتووری عەرەب و فارسدا بتوێنەوە. دوورکەوتنەوە لەتورکمانەکان و بەچاوی گومانەوە سەیرکردنیان و شەڕو پێکدادانی بەردەوام لەگەڵیاندا وەک یەکێک لەململانێ و شەڕە چینایەتییە گرنگەکان جێگای خۆی لەمێژوودا دەگرێت. هەروەکو عەرەبەکان ئاشکرایە کە ململانێیەکی دژواری چینایەتی روودەدات.

سەرەتاکانی سەدەی بیستەم هەوڵی نوێنەرایەتی کردنی ئەم ئیسلامێتییە درا کە بەگو موسڵمانە تورکەکان ڕێبەرایەتییان دەکرد. ڕەنگدانەوەکەیان گەیشتە ئەورووپای ناوین. لەسەر بنەمای مۆدێرنیتەی هەڵکشاوی ئەورووپا لەسەدەی حەڤدەهەمینەوە کەوتە ناو قۆناخی دواکەوتنەوە. ئەم پاشەکشێیەی تا ناوەڕاستی ئەنادۆڵ بەردەوام بوو لەساڵانی ١٩٢٠کان بەرابەرایەتی مستەفا کەمال وەستێنراو بەکۆماری تورکیا ئەنجامگیر بوو. کۆمار لەچوارچێوەی سازشکردنی نوخبەی دەسەڵاتی تورک لەگەڵ دەوڵەت ـ نەتەوەکانی مۆدێرنیتەی ئەورووپا و لەسەر بنەمای پەسەندکردنی هەژموونگەرایی ئەورووپا دامەزراوە.

دوای ئیسلامی عەرەب و تورک بنەچە فارس ـ ئێرانیەکان سێیەمین نوخبەی دەسەڵاتی ئەرستۆکراتی پێکدێنن. بەرهەڵستکاری فارس ـ ئێرانی کە بەباوەڕی و بانگەشەی گرێدان بەنەریتی دوازدە ئیمام و ئەهلی بەیت بەرامبەر نەریتی ئیسلامی سوننی عەرەب و تورک پێکهاتووە هەر لەسەردەمی ئەمەویەکانەوە لەناو هەڵمەتی یەک بەدوای یەکدابووە. هیچ کاتێک لەڕێکخستنی یاخیبوونی ناوەکی و دەرەکی دژی سوڵتانە ئەمەوی و عەباسیەکان درەنگ نەماون کە لەبیروکراسیەکەیاندا بەکاریگەر بوون. دوای چەندین ئەزموونی دەسەڵاتی ناوچەیی لەساڵی ١٥٠١ بەشێوەیەکی فەرمی مەزهەبی شیعە پەسەند دەکرێت و هەوڵدەدرێت سیستەمی ئیمپراتۆریەتی ئێرانی کۆن نوێ بکرێتەوە. ئەو ئیمپراتۆریەتەی بەپێشەنگایەتی فارسە شیعە و ئازەرییە بەبنەچە تورکمانەکان ئاواکراوە بەردەوام لەگەڵ سوڵتانە عوسمانییە تورکەکان دەکەوێتە ناو شەڕ و پێکدادانەوە. ئەم پێکدادانەی ئامانجی سەرلەنوێ بەدەست هێنانەوەی ئەو هەموو هەژموونگەرایییەیە کە لەخۆرهەڵاتی ناوین لەدەستیان دەرکەوتووە هەردوو هێزیش هیلاک دەکات و ڕێگا لەپێش بەهێزبوونی هەژموونگەرایی ئەورووپا دەکاتەوە. هەرچەندە دەسەڵاتە شیعەکان دژی دەسەڵاتە سوننیەکان پێگە و سەنگەریان گرتووە، بەڵام پێناسەکردنیان وەک شێوەیەکی دیکەی ئیسلامی چەواشە ڕاستتر دەبێت. تاکە جیاوازیەکەی لەوەدایە کە زیاتر نەریتی ئەهلی بەیت و عەلەویەتی دەقۆزێتەوە و

بەکاری دەهێنێت. تاکو عەلەویەت بەسیفەتی دژە ـ دەسەلاتگەرێتی، دژە ـ شارستانی و شارستانێتی دیموکراتی نوێنەرایەتی نەکرێت، هەر بونیادێکی دەسەلات کە بەم ناوە ئاوابکرێت لەشێوەکەی دیکەی ئیسلامی چەواشە بەولاوە مانایەکی دیکەی نییە.

٤ـ لەسەردەمی سەڵتەنەتی ئیسلامیدا بەو سیفەتەی چوارەمین گەلە کوردان رۆڵیان هێندە دیار نییە. وەک دەزانرێت لەکۆشکەکاندا بەکاریگەر بوون. چەندین نوێنەری بەگایەتی و میرنشینی کوردان لەکۆشکەکانی ئەمەوی، عەباسی، سەلجۆقی، عوسمانی و ئێرانیدا هەبووە. هەم وەک کەس رۆڵیان بینیوە و هەم بەگێتییان کردووە. خانەدانی ئەیوبی لەرێگای سەلاحەدینەوە لەقۆناخی ١٢٥٠ ـ ١١٦٨ ئیمپراتۆریەتێکی ئاواکردووە و شام ناوەندەکەی بووە. لەگەڵ ئەوەی بەبنەچە کورد بوون، بەلام لەرۆڵ بینین وەکو خانەدانە تورکو عەرەبە راستەقینەکان دوودڵیان نەکردووە. خانەدانی مەروانی لەسالانی (٩٩٠ـ ١٠٩٠) حکومڕانیەکی ئاواکردووە ناوەندەکەی مەیافارقین (سیلوانی ئەمرۆ) بووە. چەندین میرنشینی دیکەی هاوشێوە ئاواکراون. بنەماڵەی شەرەفخانی خەڵکی بەدلیس تا سالانی ١٥٦٠ بەردەوامییان بەهەبوونی خۆیان داوە. لەبەر ئەوەی میرنشینە کوردەکان زیاتر وابەستەی نەریتی سوونني بوون بەرامبەر بەسەڵتەنەتی شیعەی سەفەوی بەپێشەنگایەتی ئیدریسی بەدلیسی رێکەوتنیان لەگەڵ سوڵتانە عوسمانیەکان ئەنجام داوە. میرنشینە کوردەکانی لەناو سیستەمی سەڵتەنەتی عوسمانیدا خاوەنی بەرفراوانترین ئۆتۆنۆمی بوون لەسەدەی ١٩ دا رەوشیان تێکچووە. لەمیانەی یاخیبوونی بەدرخان بەگەوە دوا هەلی خۆیان بەکار هێناو دۆڕاندوویانە (١٨٦٠ـ ١٨٣٥).

هەرچەندە دوای بەگەکان شێخانی کورد خواستوویانە وەک بەکریگیراوێکی جیاوازتری دەسەلات بەکاریگەر بن (١٨٢٦ـ ١٩٢٦) بەلام تووشی هەمان چارەنووس هاتوون. بارزانیو تالەبانیش بەو سیفەتەی بەردەوامی هەردوو باڵو ئەرستۆکراسی قەبیلەن لەمیانەی پشت بەستن بەو پەیوەندیانەی لەسەر بنەمای میللیگەرایی ئەتنیکیو ئایینی لەسەدەی

بیستەم لەگەڵ هێزە هەژموونگەراکانی سەرمایەداری بەستوویانە، لە ئێراقی ڕۆژی ئەمڕۆماندا بەپێگەی دەسەڵاتی هەرێمی گەیشتوون.

بەرهەمی ئەو هەژارییەی لەقەبیلە کوردەکاندا هاتۆتە ئاراوە و هاوبەرامبەری هەژارانی قەبیلە عەرەب و تورکەکانە بەکرمانج ناودەبرێن. ڕاستتر دەشێت بەم جۆرە پێناسە بکرێت. لەولاتری هەژارانی قەبیلە کرمانج گوزارشت لەو کوردە دەکات کە پەیوەندی قەبیلەیی پەرتەوازە بووە، بۆ گەلێکی لادێیی و کۆچبەر گۆڕاوە. چینی خوارەوەیە. کورد توانیویەتی وەک ئۆبژە بمێنێتەوە. هەرچی توێژە بەکرێگیراوەکەی چینی سەردەستی کوردە زیاتر لەمیانەی پەیوەندیەکانی لەگەڵ نوخبەی دەسەڵاتی نەتەوەی دەسەڵاتدارو تا ڕادەیەکیش لەگەڵ هێزە هەژموونگەراکانی ئەوروپاو ئەمریکا، لەسەر بنەمای فەرامۆشکردنی کوردە ڕەنجدەرە پەرتەوازەبووەکانی لەبواری کلتووریشدا دووچاری جۆرێک لەجینۆسایید هاتوون، هەولی ژیان دەدەن. ئەو واقیعە مۆرکی خۆی لەتێکۆشانی نەتەوەیی و چینایەتی دیاردەی کورد داوە.

٥ ـ لەدوای سەدەی دوازدەهەم گەردەلوولی شالاوی مەغۆلەکان سیستەمی شارستانی ئیسلامی پێچاوە. بەلام مەغۆلەکان پێچەوانەی تورکەکان بەر لەوەی ببن بەموسڵمان پەلاماری ئیسلامیان داو جگە لە میسر بەشێوەیەکی زۆر سامناک هەموو شوێنێکیان داگیرکرد. بەهەمان خێراییش بوون بە موسڵمان و هێزە هەژموونگەرا نوێیەکەی سیستەم. دەشێت سەدەکانی ١٣ ، ١٤ بەسەردەمی خانەدانی مەغۆلی ناوببرێت. مێژوونووسان لەو بڕوایەدان کە هێزەکانی مەغۆل و موسڵمانەکانی ئەندەلووس لەو هێز و توانایەدا بوون ئەگەر بیانویستایە لەدوای سەدەی دوازدەهەم و بەر لەپێشکەوتنی شارستانی ئەوروپا دەیانتوانی لەناوی ببەن. هۆکاری سەرەکی ڕوونەدانی ئەم بوویەرە، لەداخوازی زیاتر، ئەوروپای ئەو سەردەمە لەدۆخێکدا نەبوو داهات و قازانجێکی زۆر پێشکەش بەهێزە تالانکارو داگیرکەران بکات. گەورەترین چانسی لەوەدا بوو بەبەراورد لەگەڵ ئەو موسڵمان و دەوڵەمەندێتییەی شارستانی چین و خۆرهەلاتی ناوین پێشکەشیان دەکرد ئەو لای دەست نەدەکەوت. چونکە

ئەوەی ئیسلامی وەستاندووە نە شارل مارتێلە، نە بەرگرییەکی بەهێز و جددی لەمپەری بەردەم داگیرکاری مەغۆلە. دەشێت گفتوگۆ لەو بارەیەوە بکرێت کە مەغۆلەکان هێزێکی ڕووخێنەرن بۆ ئیسلام یان خوێنی تازەن.

دەشێت خانەدانی تەیموور وەک بەردەوامی مەغۆلەکان هەڵسەنگێنرێت. ئەوانیش مۆرکی خۆیان لەسەدەی پازدەهەم داوە. پاشماوەی هەردوو خانەدان ئیمپراتۆریەتی بابوریان ئاواکرد کە تا ناوەڕاستی سەدەی هەژدەهەم وەک هێزێکی هەژموونگەرا لە هیندستان لەسەر پێیان بوو. دەوڵەتی ئیسلامی ئەندەلووس کە سەر بەدوا خانەدانەکانی ئەمەوی بوو لەڕۆژئاوا تا ناوەوەی ئەوروپا پەلیهاوێشتبوو(٧١١ـ ١٤٩٢). هەروەکو لەپاشەکشێکەی عوسمانیەکاندا رووییدا بەرامبەر بەشارستانی ئەوروپای هەڵکشاو لەداڕووخان و لەناوچوونێکی پێشوەخت ڕزگاری نەبوو. ئەوەی موسڵمانەکان لەنیمچە دوورگەی ئیبریک دووچاری هاتن هاوشێوەی ئەو تراژیدیایەیە کە کرستیانەکانی ئەنادۆل دووچاری هاتن.

بەشێوەیەکی گشتی ئەوەی شارستانی ئیسلامی لەسەدەی دوازدەهەمەوە تا سەرەتاکانی سەدەی نۆزدەهەم تێیدا ژیاوە سەرجەم بەها ئەرێنیەکانی لەسەرووی هەمووشیانەوە بەها کلتووری و بازرگانیەکانی بەئەوروپا دۆڕاند و تەنیا تویکڵی شارستانی مایەوە. خەرمان و توانستەکانی پێنج هەزار ساڵە لەمیانەی پێنج سەد ساڵدا گواسترایەوە. ئەم گۆڕانکارییەی هێزو شوێنی شارستانی هەژموونگەرایی ناوەندی پێنج هەزار ساڵە گەورەترین وەچەرخانی مێژووە. تا ئێستاش جیهان لەژێر کاریگەری بوومەلەرزە بەردەوامەکانی ئەو گەورە وەرچەرخانەدا دەژیت.

## و. ڕۆڵی مێژوویی سەرهەڵدانی ئایینە ئیبراهیمیەکان

ڕۆڵی مێژوویی سەرهەڵدانی ئایینە ئیبراهمیەکان بەلانی کەم هێندەی بەرخودانی قەوم و قەبیلە دژە ـ شارستانیگەراکان گرنگ و بایەخدارە. سەرباری ئەوەی لەناو قەبیلە سەریانهەڵداوە بەڵام لەناوەڕۆکدا لەچوارچێوەی بزووتنەوەی چینایەتیدایە. بەرخودان و دژەهێرشی ئەو

قەوم و قەبیلانەی لەلایەن هێزەکانی شارستانیەوە بە "بەربەر" ناودەبرێن دەشێت وەک بەرخودان و هێزێک شرۆڤە بکرێت کە لایەنی دیموکراتییان لەپێشە و زیاتر لەدەرەوە سەرچاوە دەگرن. لەبەرامبەر ئەمەشدا ئەو پێهەڵگرتنانەی بەشێوەیەکی گشتی لەلایەن ئایینەکانەوە بەتایبەتیش لەلایەن ئایینە ئیبراهیمیەکانەوە ئەنجامدراون تایبەتمەندێتی قەوم و قەبیلەش لەخۆوە بگرن، بەڵام بزوتنەوەیەکی ناوخۆیین کە لایەنی چینایەتییان لەپێشە. هەردوو بزووتنەوەی دژە مۆدێرنیتەی سەرمایەداری لەدەرەوە بزافە نەتەوەییەکان لەناوەوەش بزاوتە چینایەتیەکان دێننەوە بیری مرۆڤ.

چوارچێوەی چینایەتی ئایینە ئیبراهیمیەکان ئاڵۆزە کە بەردەوام بەرامبەر سیستەمی شارستانی ناوەندی پێنج هەزار ساڵە بەرخودانی کردووە و دژەهێرشی ئەنجامداوە و گرنگترین قۆناخی مێژووی جیهانە. لەناو چوارچێوەیەکی زۆر بەرفراواندا جووڵە دەکات کە لەپرۆلیتاریایەکی هەژار تا ئەرستۆکراتێک درێژ دەبێتەوە. سەرەکیترین بابەتی نارەزاییان ئەوەیە کە نموونە ڕەسەنەکانی سیستەمی شارستانی ناوەندی واتە سۆمەر و میسر خۆیان وەک "قەڵەمبازی ئیلاهی" دەخەنە ڕوو. بونیادە ئایینیەکانی سیستەمی ئایدیۆلۆژیای ئیبراهیمی بەردەوام بەگومانەوە تەماشای ئیلاهیبوونی ئەم سیستەمەی پاشا ـ خواداوەندیان کردووە و ئیلاهی نەبوونی ئەمانەیان کردووە بە "بانگەشە"ی سەرەکی سەرهەڵدانیان. سەرەکیترین گوزارشتی ئەو دەرکەوتنەیان بە شێوەی "مرۆڤ نابێت بەخوداوەند ـ ئیلاهی"یە. باشترینی مرۆڤەکان تەنیا دەتوانن ببن بەپەیامبەرانی خودا و بەندەکانی. داواکردنی شتێکی لەوە زیاتر بابەتی نەفرین‌و گەورەترین گوناهە. لەسەر ئەم بنەمایەش تێکۆشانێکی ئایدیۆلۆژیو شەڕێکی هەزاران ساڵەی هەژموونگەرایی ڕوویداوە. تەواوی نووسین و خوێندنەوەکانی مێژوو شوێنپەنجەی ئەم شەڕ، ململانێ و بانگەشەی پێوەیە.

کاتێک سیستەمی شارستانی ناوەندی هەڵدەسەنگێنرێت و لەم بارەیەوە شتگەلێک دەخوێنرێتەوە یان دەنووسرێت پێویستە زۆر سەرنجی

ئەم ڕاستییە بدرێت و بەهیچ جۆرێک لەبیر نەکرێت. هەوڵەکانی قەومگەرایی و قەبیلەی یەهوودی بۆ ئاواکردنی خوداوەند و ئایین ناوەندی سەرهەڵدانی ئیبراهیم (سەنتێزی زەردەشتایەتی و مانیگەرایشی لەناودا)ی پێک دێنێت. لەڕێگای چەمکێکی ئایینی و ئیلاهی ئەقڵانیەوە هەوڵی ڕووبەڕووبوونەوەی هەژموونگەرایی ئایدیۆلۆژی ئایین و میتۆلۆژی شارستانی ناوەندی دەدات. لەحەزرەتی ئیبراهیمەوە تا دەگاتە حەزرەتی محەمەد تەواوی پێغەمبەران ڕۆڵی مێژووییان لەم شەڕەی (شەڕی هەژموونگەرایی ئایدیۆلۆژی) مانادا هەیە. بەرامبەرە ماددیەکەی ئەو کلتوورە مەعنەوییە ئایینیەی نوێنەرایەتی دەکەن توێژی بازرگانی چینی ناوینە. لەکاتێکدا ئەرستۆکراتەکانی قەبیلە نوێنەرایەتی بەرزترین ئاستی چینایەتی دەکەن، هەژارانی قەبیلەو هەر جۆرە پرۆلیتاریا و گروپە سەربەخۆو پەراوێزخراوەکان نوێنەرایەتی چینو توێژەکانی ژێر دەکەن. قەومی یەهوودی کە لەدۆخی ناوەندیدایە بەدرێژایی مێژوو هەوڵیداوە لەبوارو مەیدانی کلتووری ماددی و ئایدیۆلۆژی بەردەوامی بەپێگەی پێشەنگایەتی خۆی بدات. لەمیانەی"پەیمانی کۆن" واتا لەڕێگەی تەوراتەوە هەوڵیداوە پێشەنگایەتی ئایدیۆلۆژی خۆی وەک ڕووباری دایک یان چاوگ پیشان بدات. لەمیانەی کەڵەکەکردنو خەرمانی "مانا"ی کە لەسیستەمەکانی شارستانیو هێزە ڕکابەرەکانی شارستانیەوە کۆی کردوونەتەوە، بەردەوام هەوڵیداوە خۆی بەرفراوانو دەوڵەمەند بکات. تا ڕۆژی ئەمڕۆمان توانیویەتی لەشەڕی مانادا لەدۆخی هەژموونگەراییدا بمێنێتەوە. لەچوارچێوەی کلتووری ماددیشدا لەبواری بازرگانی و پارەدا هێزو ئەزموونێکی مەزنی بەدەست هێناوەو هەمان هەژموونگەرایی لەم بوارەشدا کاریگەر کردووە.

هەڵسەنگاندنو تاوتوێکردنی یەهوودیەت بەشێوەیەکی یەکگرتووو هۆمۆژەن چەوتە و ناتەواو دەبێت. لەکاتێکدا هێزە ناوەندیەکانی یەهوودی بەگشتی لەمیانەی ناکۆکی و پەیوەندیەکی نزیک لەگەڵ سیستەمی شارستانیدا دەژیان، بەڵام هێزە دیموکرات و سۆسیالیست ـــ کۆمۆنیستەکانی بەرهەڵستکارانی ناوخۆ بەردەوام بەدوای لێگەڕینو

بونیـــادە دژە ــــ شارســـتانیگەراکانی شارســـتانێتی دیمـــوکراتی و سۆسیالیستیەوە بوون. پێویستە ئەم مەیلە بەکەم نەزانرێت کە بەدێژایی مێـژووی یـەهوودی لـەئارادابووە. لەسـەرجەم بزووتنـەوە ڕکابـەرەکانی دیموکراتی ڕادیکاڵ، سۆسیالست، ئەنارشیست، فێمینیست، ئیکۆلـۆژی و بەرهەڵستکارەکانی دیکـەی دەرەوەی سیستەمدا ڕۆڵـی گرنگیـان بینیـوە. چەنـدە یەهوودییـە ڕاسـترەو و ناوەندگـەراکان پارەگـەران و لایـەنگری شارستانی دەوڵـەتی و بازرگـانین، تـوێژە چـەپرەو و ڕەنجدەرەکانیشیان بەو ئەنـدازەیـە لایـەنگری ئایدیۆلۆژیای کۆمینـال، ئـازاد و دیموکراتی و بونیادەکانیان بوون.

مەسیحیەت بەگرانی نوێنەرایـەتی هـەژارترین توێژەکـان، هـەر جـۆرە کۆیلـە و هـەژارانی قەبیلـە و گروپـە گۆشـەگیرەکانی دیکـە دەکـات. لەگـەڵ ئەوەی لەسەردەمی دەسەلاتگەرێتی(کریستیانی)دا بۆ دوو گروپـی سـەرەکی دابەش بوو، بەڵام تا ئێستاش فاکتەرێکی بەکاریگەری کلتووری مەعنەوییە لەجیهاندا. جیابوونەوەی ئەو کلتوورە ڕۆڵێکی گرنگـی لەپەرەسەندنەکانی لایـەنی دیمـوکرات و سۆسیالیسـتەکاندا هەیـە. پێویسـتە سۆسـیالیزم و دیموکراسی کرستیانی لەسەر بنەمای ئەم جیابوونەوەیە هەڵسەنگێنرێن.

سێیەمین گـەورە ڤێرسـۆنی ئـایینی ئیبراهیمـی کـە حـەزرەتی محەمـەد لەڕێگایەوە قەڵەمبازی خۆی ئەنجامدا و لەماوەیەکی کورتدا وەک ئیسلامی چەواشە شێوەی گرت زیـاتر نوێنەرایـەتی تـوێژی بازرگـانی دەوڵەمەنـد و ئەرستۆکراتی سیستەمی کردووە. بەمانایەکی تـر کراوە بەهەژموونگـەرایی مـاددی و مەعنـەوی ئـەو تـوێژە. لەخۆرهـەلاتی نـاوین بەشـێوەیەکی سـەرکەوتووانە شـەڕی هەژموونگـەرایی بەرامبـەر هێزەکـانی شارسـتانی ناوەنـدی کلاسـیک (بەرامبـەر بیزەنتـی و ساسـانیەکان و تەتانـەت ئیمپراتۆریـەتی چینـیش) و دوو ڤێرسـیۆنە گرنگەکـەی دیکـەی ئـایینی ئیبراهیمـی موسـەوێتی و مەسیحی بـەڕێوە بـردووە. بـەهۆی نەگەیانـدنی سەرمایەداری بازرگانی بەئاستی شۆڕشی کشتوکاڵ و پیشەسازی لەسەدەی دوازدەهەمەوە لەماوەی پێنجسـەد سـاڵدا لەدۆڕانـدنی هەژموونگەراییەکـەی بەمۆدێرنیتەی سەرمایەداری ئەوروپا ڕزگاری نـەبوو. هـەر بۆیـە پێویسـتە

وەک سیستەمێکی کلتووری ماددی و ئایدیۆلۆژی یەکگرتوو بیر لەئیسلامیەتیش نەکرێتەوە. بەبەراورد لەگەڵ موسەویێتی و کرستیانی زیاتر دووچاری دابەشبوون هاتووە و بەهیچ جۆرێک بەکارەکتەری سیستەمێکی یەکگرتوو نەگەیشتووە. دەستەواژەی ئەڵلا کە پەنایان بۆ بردووە، بۆ بەدیهێنانی یەکێتی بەس نەبووە. لەکاتێکدا نەریتی سوونني تا رادەیەکی مەزن هەژموونگەرایی خۆی بەسەر سیستەمی شارستانی ناوەندیدا زاڵ کردووە، بزووتنەوە رکابەرە دیموکرات، کۆمیناڵ و ئازادیخوازەکانی بەرامبەریشی بەردەوام لەئارادا بوون. ئەم بزووتنەوانە هیچ کاتێک بەتەواوی ملکەچییان نەکردووە. هەرچەندە نەبووبن بەبزووتنەوەیەکی سیستەماتیکی شارستانێتی دیموکراتی، بەڵام بوونەتە یەکێک لە شادەمارەکانی میراسی ئازادیخواز، کۆمیناڵ و دیموکراسی هەرە داناي جیهان و خۆرهەڵاتی ناوین.

بەشێوەیەکی یەکپارچەیی (یەکگرتوو) بزووتنەوەی ئایینی ئیبراهیمی توانیویەتی هەژموونگەرایی ئایدیۆلۆژی سیستەمی کۆیلەداری شارستانیەکانی میسرو سۆمەر تا دەگاتە مۆدێرنیتەی سەرمایەداری بشکێنن، پارچە بکەنو وەربچەرخێنن (لەرێگای ریفۆرم و شۆرشەوە). سەرباری ئەوەی فاکتەرە پاوانگەراکانی کلتووری ماددییان نەرم کردووە، بەڵام بەهەمان رادە نەیانتوانیوە بەشۆرشو ریفۆرمیاندا تێپەرێنێت. زیاتر لەرێگای تویژە راست رەوەکانی ناویانەوە هەولی سازشکاری کردنی لەگەڵ سیستەم داوەو خستنە ژێر هەژموونگەرایی خۆی بەبنەما گرتووە. لەبەرامبەر ئەمەشدا تویژە بەرهەڵستکارە چەپەکان بەو سیفەتەی بزووتنەوەی کۆمیناڵ، چینایەتی و عەلمانی گەلن بەردەوام لەگەڵ مەزهەبە ئایینیە رادیکاڵە دژە ـــ شارستانیگەراکان بەدوای یۆتۆپیا، پرۆژەو بەرنامەی دیموکرات، یەکسان و ئازادیخوازدا بوون و لەم پێناوەدا جەنگاون.

هەژموونگەرایی کلتووری ماددی و ئایدیۆلۆژی تەوەرەی یەهوودی بەرامبەر بەجیهانیبوونی کاسۆلیکی (سیستەمەکانی شارستانی) ئیسلامی چەواشە و دژە ـــ ریفۆرم رێبەرایەتی پاوانگەرایی سەرمایەداری تازە

گەشەسەندووی ئەوروپا و پێهەڵگرتنە ئایدیۆلۆژیەکەی کردووەو لەمیانەی پێشکەش کردنی کۆمەکێکی ماددی و مەعنەوی ڕۆڵێکی گرنگی لەسەرکەوتنی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری ئەوروپادا هەبووە. هۆکاری سەرەکی ئەمەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە بەئامانجی مردن (کوشتن) لەلایەن هەردوو شارستانییەوە تەنگەتاو کرابوون. هەم لەخۆرهەڵاتی ناوین هەم لەئەوروپا بەردەوام هەوڵدراوە یەهوودیەکان لەگیتۆکاندا بخرێنە ژێر کۆنترۆڵ و چاودێرییەوە. بەردەوام دووچاری تالان و کۆمەڵکوژی بوونەتەوە. ئەرستۆکرات و بۆرژوازی بازرگانی ــ کشتوکاڵ لەهۆڵەنداو بریتانیا کە بەرامبەر بانگەشەکانی هەژموونگەرایی پادشایەتیەکانی ئیسپانیاو فەرەنسای ئەوپەڕی ڕۆژئاوای ئەوروپا تەنگەتاو ببوون، لەسەدەی شازدەهەمینەوە دەرگای خۆیان بۆ سەرمایەی ماددی و مەعنەوی یەهوودیەکان کردەوە و ڕێککەوتنێکی مێژوویيان ئەنجام داوە. ئەم ڕێککەوتنە هەم بانگەشەکانی هەژموونگەرایی ئیسپانیا و فەرەنسا(سەدەی ١٩- ٢٠)ی تێکشکاندووە هەم هەژموونگەرایی ئیسلامی لەخۆرهەڵاتی ناوین تێکشکاندووە، هەرە دوایيش شارستانی و بانگەشەکانی ئەڵمانیای ــ هیتلەر و ڕوسیای سۆڤیەتی تێکشکاندووە و لەم چوارچێوەیەشدا هەژموونگەرایی جیهانی ئاواکردووە و تا ئێستاش درێژەی پێدەدات. وەک وارنەر سۆمبارت و هاوشێوەکانی نالێم یەهوودیەت سەرمایەداری داهێناوە، بەڵام ئەگەر کۆمەکی ماددی و مەعنەوی یەهوودیەت نەبێت زۆر زەحمەتە بیر لەسەرکەوتنی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری بکرێتەوە.

بانگەشەی مێژوویی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری چارەسەرکردنی ئەو قەیران و کێشانەیە کەسیستەمی هەژموونگەرایی شارستانی ناوەندی (کۆی گوزارشتی هەر جۆرە پاوانەکانی دەوڵەت، دەسەڵات، ئایدیۆلۆژی، پیشە، بازرگانی و کشتوکاڵ) تێی کەوتووە. لەبەشی دواتردا توێژینەوە و وردبوونەوە لەو بارەیەوە دەکرێت کە ئەم بانگەشە مێژووییە چارەسەری یاخود تەنگەژە و قەیرانی گەورەتری بەرهەم هێناوە.

بەشی پێنجەم

## مۆدێرنیتەی ئەورووپا لە سیستەمی شارستانی ناوەندیو هێزە هەژموونگەرا نوێیەکان

لەپێناو تێگەیشتنی قەیرانە جیهانگیرییەکەی لەخۆرهەڵاتی ناویندا چڕبۆتەوە دەرککردن بەوەرچەرخانی شارستانی ناوەندی لەئەورووپا ڕۆڵی کلیل دەبینێت مەرجە. وەک چۆن تا دەرک بەخۆرهەڵاتی ناوینی چاخی ناوین نەکەین، لەچۆنیەتی خزانی شارستانی بۆ ئەورووپا. هەروەها لەوەرچەرخانو گەیشتنی بەهێزە هەژموونگەراکان تێناگەین، ئەگەر سەرگوزەشتەی شارستانی لەئەورووپاش تێنەگەین ئەوا لەتێگەیشتنی خۆرهەڵاتی ناویندا بەچەمکێکی ڕاست ناگەین. پەیوەندیەکی زۆر بەهێزی دیالیکتیکی لەنێوانیاندا جێگای باسە.

ئەو بابەتەی لەبەشەکانی پێشووتر هەوڵی ڕوونکردنەوەی درا سەبارەت بەهۆکاروچۆنیەتی گواستنەوەی شارستانی ناوەندی ڕۆژهەڵاتی ناوین بوو بۆ ئەورووپا. سەرەکیترین پرسیاری دەرهەق بەشارستانی ناوەندی گواستراوە بکرێت ئەوەیە: بۆچیو چۆن شۆڕشی پیشەسازی دەستی پێکردووە. لەبەرئەوەی لەبەشەکانی دیکەی بەرگرینامەکەمدا لەزۆر لایەنەوەو تا ڕادەیەک وەڵامدراوەتەوە، هەوڵدەدەم لەهەندێک لایەنی دیکەوە وەڵام بدەمەوەو زۆرپێویستیش نەبێت دووبارەی نەکەمەوە.

بۆ ئەوەی هەمان ئەو هەڵەیە نەکەین کە کارل مارکس تێی کەوتبوو بەر لەهەموو شتێک پێویستە بەمانای مێژوویی‌و سۆسیۆلۆژی سروشتی شۆڕشی پیشەسازی‌و سەرمایەداری پیشەسازی بگەین. کارل مارکس دڵنیابوو کە وەک دیاردەیەکی ئابووری لێکۆڵینەوە سەبارەت بەسەرمایەداری دەکات. هەروەکو چۆن زانستە نوێکان لەسەرووی هەمووشیانەوە کیمیاو فیزیا ناچارن پشت بەدیاردەکان ببەستن؛ بەبڕوای ئەو تاوتوێکردنی کۆمەڵگاش وەک دیاردەیەکو شیکارکردنی لەمیانەی

تێڕوانینی ئابوورییەوە سەرەکیترین هەڵوێستی زانستی بوو. نەک تەنیا هەڵوێستە فەلسەفیو ئایینیە نەریتیەکان، بەڵکو ڕەوتی فەلسەفەی ئایدیالیستی ئەڵمانی، هەڵوێستی کۆمەڵناسە فەرەنسیەکانو قوتابخانەکانی ئابووری ـ سیاسی ئینگلیزی سەردەمی خۆشی تێرکەر نەبوون. هەموومان ئاگادارین کە بەیەکەوە لەگەڵ فریدریک ئەنگلس هەوڵیانداوە لەمیانەی ئەو قوتابخانەوە هەنگاوێک بهاوێژن کە بە "سۆسیالیزمی زانستی" ناویان بردووە. بێگومان ناشێت نکوڵی لەو "شۆڕشی زهنی"یە بکرێت کە دەستیان پێکردووە. لەلایەنی سۆزو هەستیشەوە دژی ئەو سەرمایەدارییە بوون کە سەرکەوتنی خۆی ڕاگەیاندبوو. هەروەکو تەواوی قەڵەمبازو پێهەڵگرتنە مێژووییەکان لەپێشاندانی هەڵوێسی ڕێکخستنیدا دوودڵییان نەکرد.

یەکێک لەو ئەنجامە گرنگانەی زانستی ڕۆژی ئەمڕۆمان پێی گەیشتووە کارەکتەری مێژوویی‌و کۆمەڵایەتی حەقیقەتە (ڕاستی دەرک پێکراو). بێگومان هەروەکو چۆن مێژوویی بوونو کۆمەڵایەتیبوون لەجیهانیبوونو تاکانەیی دابڕاونین، بەپێچەوانەوە لەسەرگوزەشتەی تێگەیشتنی ڕاستیدا گوزارشت لەقاڵبوونەوەی هەوڵەکانو جیهانگیربوون دەکات. هەربۆیە دەست نیشانکردنی پێگەی کارل مارکسو قوتابخانەکەی لەم سەرگوزەشتەیەدا گرنگو بایەخدارە.

لەجیاتی ئەوەی سۆسیالیزمی زانستی وەک ڕەوتێکی تێکشکاو بەرامبەر سەرمایەداری ببینرێت، هەڵسەنگاندنی وەک ڕەوتێکی ناتەواو مانادارترە، چونکە دەسکەوتو سەرکەوتنیشیان جێگای باسە. ئەوەی پێویستە ڕوونکردنەوەی کەموکوڕیو هەڵەکانی ئەو بانگەشانەیە کە تێیدا سەرنەکەوتوون. لەبەرگرینامەکەمدا ڕوونکردنەوەی لەمجۆرەم کردووە. گرنگی لەوەدایە لەجیاتی دووبارەکردنەوە، لەمیانەی هەڵوێستێکی ڕەخنەگرانەی نوێو یەکپارچەییەوە درێژە بەو هەڵوێستە بدرێت. هەوڵی ئەنجامدانی ئەوە دەدەم.

لەسەرووی هەموو شتێکەوە لەجیاتی ئەوەی شۆڕشی پیشەسازی وەک شۆڕشێکی ئابووری هەڵسەنگێنرێت، لەو بڕوایەدام ئەگەر وەک شۆڕشێکی

ئایدیۆلۆژیو سیاسی بیری لێبکرێتەوە رۆشنکەرەوەتر دەبێت. تەنانەت تا وەک شۆڕشێک نەناسرێت کە لایەنی سەربازی لەپێشە، ئەوا بەشێوەیەکی کاملو تەواو ناتوانرێت دەرک بەپێهەڵگرتنی شارستانیانەی ئەوروپا بکرێتو لەو سەرمایەدارییەش تێناگەین کە بەبنەمای گرتووە. ئەوەی پێویستە لەکۆتایی بگوترێت با لەسەرەتادا بیڵێین؛ هێزەکانی شارستانی ناوەندی لەمیانەی شۆڕشی پیشەسازی سەرمایەداری ئەوروپا گەورەترین سەفەربەری ئایدیۆلۆژی، سیاسیو سەربازی مێژووی خۆی ئەنجامدەداتو جیهانگیری دەبێت. ئەمەیە پێناسەی مێژوویی شارستانی ئەوروپا.

بەو سیفەتەی شۆڕشی پیشەسازی ئامرازێکی هەژموونگەرایی ئایدیۆلۆژی، سیاسیو سەربازییە تا لەچوارچێوەی یەکپارچەیی مێژوویی‌و کۆمەڵایەتی دەرکی پێنەکرێت، تێگەیشتنێکی تەواوو کاملانەی سەردەمەکەمان مەحاڵە. بۆ تێگەیشتنی ئەو راستییە تەنیا کۆکردنەوەی پوختەی ئاماری ئەو شەڕانە بەسە کە لەناو کۆمەڵگاکانو نێوان کۆمەڵگاکان ریگای لەپێش کردۆتەوە یان دژ بەژینگە دەستی پێکردووە. حەقیقەتێکی ئاشکراو حاشاهەڵنەگرە کە لەهیچ سەردەمێکی مێژوویی‌و کۆمەڵگادا ئاماری شەڕ بەو ئاستە نەگەیشتووە کە لەسەر بنەمای شۆڕشی پیشەسازی هاتۆتە ئاراوە، لەوەش مەترسیدارتر بۆ یەکەمجارە کە وێرانکردنی ژینگە بەسنوورو ئاستێک گەیشتووە چیتر کۆمەڵگا ناتوانێت بەردەوام بێت. هەرچەندە قەیرانی جیهانگیری لەمیانەی توانا نائاساییەکانی دەسەڵاتو ئامرازە ئایدیۆلۆژیەکان هەوڵدەدات بەگوتەو کردارەکانی کۆمەڵگا بکات بەکۆیلە، حەقیقەتیش وەک گوتەو رەفتاری دژ لەژیانی رۆژانەدا بەردەوام دەبێت.

## أ. مانای مێژوویی‌و کۆمەڵایەتی شۆڕشی ئەوروپا

ئەگەر هەژموونگەرایی ئایدیۆلۆژی هەر کۆمەڵگایەک رەچاو بکەین کە وەرچەرخانی کۆمەڵایەتییان ئەنجامداوە ئەوا هاوشێوەیەکیشی لەسەردەمی شارستانی ئەوروپاشدا دەبینین. وەرچەرخانی ماددی

شارستانی وەک خۆی نابینین، بەڵکو بەوجۆرە دەیبینین کە لەبواری مەعنەوی (بەواتا سنووردارەکەی کلتووری ـ ئایدیۆلۆژی) رەنگدەداتەوەو پیشاندەدرێت. ئەم واقیعەی بۆ سەرجەم سەردەمە گرنگەکان پیشاندراوە بۆ چاخی ئەورپاش جێگای باسە. نەک تەنیا لەهێزی هزراندن‌و بیرماندا، لەمەزەندەکان زیاتر ئەم واقیعە لەهێزی ژیانیشماندا جێگای باسە. سەردەمەکان پەسەندکراوی بەمجۆرەی تایبەت بەخۆیان هەیە. لەدۆخێکدا نین تێپەڕ نەکرێن، بەڵام تا قۆناخێکی دیالیکتیکی راستەقینە بەدی نەکرێت رزگاربوون لەو واقیعە فەراهەم نابێت. هەرچەندە مەزەندە بکەین کە لەپێگەی دژایەتیکردنیداین بەڵام رەوشەکە بەمجۆرەیە.

کاتێک لەم روانگەیەوە تەماشای ئەو حەقیقەتانە بکەین کە بەناوی میتۆلۆژیا یان زانستی ئەوروپاوە باس دەکرێت ئەوا شیکارێکی راستتر دەرهەق بەقۆناخی شارستانی ئەوروپا دەکرێت. نەفیکردن‌و کۆچبەری کرستیانەکان‌و تارادەیەکیش موسەویەکان بەرامبەر پەلامارە ئایدیۆلۆژی ـ کردەییەکانی ئیسلام لەخۆرهەڵاتی ناوین لەسەر بنەمای مێژوویی هەستان‌و پێهەڵگرتنی پیشەسازیدایە. ماوەیەکی کەم بەر لەدەرکەوتنی ئیسلام کرستیانی‌و موسەوی وەک ئایدیۆلۆژی هەژموونگەرایی دوای رۆما (رۆمای رۆژئاوا) لەپەرەسەندندا بوون. لەچینەوە تا دەگاتە نیمچە دوورگەی ئیسپانیا چالاک ببوون. هاوشێوەی ئەو هەڵکشانەی شار کە ئەوروپا لەدوای سەدەی دەیەمین بەخۆیەوە بینی لەخۆرهەڵاتی ناوینیش جێگای باس بوو. لێرەدا لەمیانەی سوود وەرگرتن لەکلتووری کۆنی هێلینی هەڵمەتە نوێیەکەی شارستانی چاخی ناوین لەپەرەسەندنابوو. بەتایبەتیش هەڵکشانێکی دیاری شارستانی لەقەومەکانی گریک، ئەرمەنی‌و ئاشووری بەدی دەکرا. رێنسانسێکی بەرایی لەرۆژەڤدابوو. مانیگەراییش لە بەهێزترین سەردەمی خۆیدابوو. بتپەرستی لەهەڵوەشانەوەیەکی خێرادابوو. لەکاتێکدا رۆمای رۆژئاوا لەبەرامبەر ئەم پەرەسەندنانە رووخا، هەرچی رۆمای رۆژهەڵاتە تەنیا لەمیانەی پەسەندکردنی کرستیانی وەک ئایدیۆلۆژیای فەرمی توانی شوێنی خۆی

لەمێژوودا بگرێت. ئەم پەرەسەندنە ئایدیۆلۆژیانە شوێنێکی گرنگیان لەبناخەی هەڵکشانی رۆمای رۆژهەڵات (بێزەنت) هەیە.

ئەو رابوونەی بە شۆڕشی ئیسلام ناو دەبرێت وەک ئەنجامێکی ئەو قەیرانە هاتە ئاراوە کە لەنیمچە دوورگەی عەرەبیدا جێگای باس بوو.وەک مەزهەبێکی رادیکالی ئایینی ئیبراهیمی شێوەی گرت. یەکگرتنی هێزەکانی قەبیلە هەزار ساڵیەکان و شێوەگرتنی ئایدیۆلۆژی نوێ بناخەی هەستان‌و قەڵەمبازەکەن. ئیسلام قۆناخی بەرایی هەستانی ئۆغوزو مەغۆلەکانە. بەریەککەوتن لەگەڵ شارستانیدا دەرفەت‌و چانسی بوون بەهێزی هەژموونگەرایی نوێی رەخساند. لەکاتێکدا هێزی هەژموونگەرایی باوو نەریتی ئێران بەرامبەر بەپێشکەوتنی ئیسلام بەخێرایی هەرەسی دەهێنا، بێزەنتیش لەپاشەکشێی خێرا رزگاری نەبوو. هەر لەناوەڕاستی سەدەی حەفتەمەوە ئیسلام لەرۆژهەڵاتی ناویندا هێزە هەژموونگەرا نوێیەکەی شارستانی بوو. لەگەڵ خێراتربوونی هەڵوەشانەوەی بێزەنت، کرستیانی تا رادەیەکیش موسەویەکانی بۆ ئەوروپا گواستەوە. لەخۆرهەڵاتی ناوین چەندە ئیسلام هەڵکشا، لەئەوروپاش کرستیانی بەو رادەیە بالای گرت. چەندەی کرستیانی خۆرهەڵاتی ناوین هێزی خۆی لەدەستدا، کرستیانی ئەوروپاش بەهێزبوونی کرد بەمەسەلەیەکی مان‌و نەمان.

شالاوی خاچپەرستەکان (نێوان سەدەکانی ١١ــ ١٤) تێرای پێچەوانەکردنەوەی دۆخەکەی نەکرد. هۆکاری سەرەکیش پەیوەندییە بونیادییەکەی هەژموونگەرایی شارستانی ناوەندی بوو لەخۆرهەڵاتی ناویندا. هەروەکو چۆن لەبوارەکانی بەرهەمهێنان، بازرگانی‌و دراودا پێگەی پێشەنگایەتی پارێزراوبوو، سەبارەت بەبابەتەکانی زانست، هونەرو سیاسەت ـ سەربازیش هێزی هەژموونگەرایی بەردەوامی بەبوونی خۆیدەدا. گرنگترین ئەنجامی شالاوەکانی خاچپەرستان؛ بەو ئاستەی شارستانی کە بەدرێژایی ئەو قۆناخە ئەوروپا پەرەی پێداوە ناتوانن کێبڕکێی رۆژهەڵات‌و ئیسلامی پێ بکەن. ئەم واقیعەش هێزەکانی شارستانی ئەوروپای ناچار کرد قەڵەمبازێک ئەنجامبدەن. لەکاتێکدا وانەو ئەزموونەکانی لەشارستانی ئیسلامی نیمچە دوورگەی ئیبریک

(ئەندەلوس) وەریانگرتبوو هێشتا تازە بوو. هێزە ئیسلامییە عوسمانیەکانی لەرێگای ئەنادۆلەوە تا بەلقانو ئەورووپای ناوین بڵاوبوونەوە لەسەدەی شانزدەدا کاریگەریەکەیان وەک دێوەزمەیەک بوو. هەڵکشانی سەرمایەداری لەسەدەی شانزدەهەمدا پەیوەندی بەم واقیعەوە هەیە.

هێزەکانی شارستانی ئەورووپا کە لەدەرەنجامی ئەزموونی سەدان ساڵەیان باشتر تێگەیشتبوون تاوەکو لەبواری هەردوو کلتووری ماددیو مەعنەوی شارستانی ئیسلام دەرباز نەکەن ناتوانن کێشەی بوون یان مانو نەمان چارەسەر بکەن، پەرەپێدانی سیستەمی سەرمایەدارییان وەک بەکاریگەرترین رێگەچارە تاوتوێ کرد. بێگومان لێرەدا مەبەستم باسکردنی مێژووی سەرمایەداری نییە. هەروەکو دەزانرێت ئەم بابەتە پێویستی بە چەندین بەرگی تێرو تەسەل هەیەو بەپێی پێویست باسکراوە. ئەم خاڵەی پێویستی بەجەختکردنەوە هەیە، ئاشکراکردنی پەیوەندییە ستراتیژییە سەرەکیەکەیەتی. چونکە بەبێ ستراتیژی دەرک بەمێژووی ستراتیژی ناکرێت. ریزکردنی رووداوەکان، شیکارە بەرفراوانەکان بۆ تێگەیشتنی مێژووی شارستانی بەس نین. ئەگەر لەفاکتەرە سەرەکیەکان (بەرهەمهێنان، بازرگانی، سیاسەت، سەربازی، ئایدۆلۆژی)ی شارستانیدا فاکتەرە ستراتیژیەکان روون نەکرێنەوە، قۆناخەکانی پەرەسەندنو وەرچەرخان یان بەشێوەیەکی تەواو دەرکی پێناکرێت. هەر قۆناخێکی شارستانی لەسەر بنەمای ئەو فاکتەرە سەرەکیانەی نوێنەرایەتی دەکات ستراتیژیەتی هەژموونگەراییو کێبڕکێی ناوخۆییو دەرەکی بەخۆوە دەبینێت. بەردەوام بەشێوەیەکی تێکەڵ لەگەڵ ستراتیژییە دژەکاندا دەژین. تێکۆشانی نێوان ئەو ستراتیژیانە دیاریکەری ئەنجامن. هەڵمەتی سەرمایەداری شارستانی ئەورووپا وەک بژارێکی ئەو تێکۆشانە بەدیهاتووە کە هێزە ستراتیژیەکان لەناوەخۆیان یان بەرامبەر دەرەوە ئەنجامیدەدەن.

ناشێت بژاری سەرمایەداری وەک ئەنجامێکی "کاروانی ئەقڵانی" هیگل یان ئەنجامێکی ناچاری ئایدیۆلۆژیای پەرەسەندنی رۆشنکەرەوەی کارل

مارکس هەڵسەنگێنرێت. هەروەکو لەهەردوو پەرتووکەکەی یەکەمی بەرگرینامەکەم هەوڵی خستنەڕوومان دا سەرمایەداری سیستەمێکە لەسەردەمی سۆمەریەکانەوە بوونی هەیە. توخمێکی تێکدەری کۆمەڵگایە کە وەک دیاردەیەکی بێ ئەخلاق و بێکەڵک لەیادەوەری کۆمەڵگاکاندا دەژیت و بەئیرادەی خۆیان شەڕی لەگەڵدا دەکەن. کاتێک ناوە بەناوە رەنگدانەوەیان لەسەر رووخساری کۆمەڵگادا بوو بێتیش، رووبەڕووی وەلامی زۆر دژوار بوونەتەوە؛ هەربۆیە بەشێوەیەکی نهێنی و فێڵبازانە لەشاراوەو تاریکترین قوژبنەکاندا هەوڵی بەردەوامبوونیان داوە. هیچ یەکێک لەئامرازو پەیڕەوەکانی چەوسانەوە هێندەی سەرمایەداری خەسڵەتی تێکدان، پەرتەوازەکردنی کۆمەڵگاکانی نەبووەو بەو رادەیە دووچاری قەیران و کائۆسی نەکردوون. سەرباری ئەوەی خۆشیان چەوسێنەر و سەرکوتکەر بوون، بەلام تەواوی هێزەکانی شارستانی بەهۆی ئەم بونیادەیان سنووردارکردن و سەراوژێرکردنی سەرمایەدارییان بۆ بەردەوامکردنی کۆمەڵگا بەناچارییەک بینیوە. نەک هەر تەنیا قۆناخێکی پێشکەوتووی شارستانی نییە، بەڵکو جێگای نەفرینی کۆمەڵگاکان بووەو وەک نەخۆشی شێرپەنجەی کۆمەڵگای ئەخلاقی و سیاسی وەسفکراوەو مانادار بووە. واقیعی قەیران، رووخان و قڕکردنی کۆمەڵگای ئەمڕۆمان و دەوروبەرەکەی راستی و کارایی هەڵوێستی ئەخلاقی دەسەلمێنێت کە ویژدانی حەقیقەتی کۆمەلایەتییە. سەرمایەداری سەرکەوتنێکی زۆر بۆ ئەو هێزانە فەراهەم دەکات کە بەشێوەیەکی تەواو کامل بەکاری بێنن. بەلام باجەکەی قەیرانی بەردەوامی کۆمەڵگاکان، ئیفلیجکردنی راوەستە ئەخلاقی و سیاسیەکەی، تێوەگلاندنێتی بۆ ناو شەڕە ناوەکی و دەرەکیەکان و تووشبوونی قڕکردن و وێرانکارییە. لەئەنجامدا هێز و دەوڵەمەندێتی لەچەند دەستێکی کەمدا کۆبۆتەوەو ئەو دەستانە سەرکەوتنیان بەدەست هێناوە. باجەکەشی کۆمەڵگایەکی رووخاوو ژینگەیەکە کە چیتر بەردەوام نابێت.

ئێستاکەش با لەمیانەی چەند سەرەدێڕێکی سەرەکییەوە سەرکەوتنی ئەو سەرمایەدارییە لە شارستانی ئەوروپادا بەرجەستە بکەین.

## ا. شەڕی هەژموونگەرایی شاری ڤێنسیا

سەرەکیترین مەسەلەی جێگای پرسیارە: سەرباری هەڵکشانی بۆچی ڤێنسیا نەیتوانی ببێت بە ڕۆمای دووەم. ئەو سەرکەوتنەی ڕۆمای چاخی کۆن بەدەستی هێنا ڤێنسیاش دەیتوانی بەدی بێنێت. ڤێنسیا لەڕۆما بێ تواناتر نەبوو. فەزیلەتیان هێندە زۆر بوو کە لەگەڵ ڕۆما بەراورد ناکرێت. لەسەرجەم پۆلێنەکانی شارستانی لەسەرووی هەموو شیانەوە بازرگانی، بەرهەمهێنان، پارە، دەسەڵات، زانستو هونەردا لەلوتکەدا بوون. لەچینەوە تا خۆرهەڵاتی ناوین توانیبووی بۆ تەواوی ڕۆژهەڵات دزە بکات، لەباکوریش لە بەلتیقو بنارەکانی سیبریاوە تا دەگاتە بیابانی گەورەی باشوور لەزۆر ناوچەدا بڵاوبوویەوە. بەلانی کەم هێندەی ڕۆما دەریای سپی بەدەستەوە بوو. لەتەواوی ئەم ناوچانە پاوانی بازرگانی خۆی ئاواکردبوو. بەلانی کەم بەقەدەر ڕۆما دەوڵەمەندێتی بۆ ڤێنسیاش گواسترابوویەوە. ناوەندە نوێیەکەی بانقگەرایی، سەنەد، پارەو ئامرازە داراییەکانی بوو. کاتێک بەسەرچاوەی قازانج ببینرابوایە دەیتوانی باشترین بەرهەمی پیشەسازی قۆناخی خۆی بەرهەم بێنێت. بەتایبەتیش وەک بلێی هەناوی ئیمپراتۆریەتی ئیسلامو بێزەنتی هەڵکۆڵابوو. تەنانەت بەهایەکیش نەمابوو نەیگوازێتەوە. ئەگەر ڤێنسیا وەک هێزی هەژموونگەرایی سەدەکانی ١٤ و ١٥ هەڵسەنگێنین زێدەڕۆیی نابێت. لەم لایەنەوە دەشێت وەک سەرەکیترین هێز شرۆڤە بکرێت کە لەمێژوودا بەهاکانی شارستانی ڕۆژئاوای بۆ ئەورووپا گواستۆتەوە.

ناشێت بەبێ ڤێنسیا بیر لەشارستانی ئەورووپا بکرێتەوە. هەروەکو چۆن ناشێت بەبێ ڕۆما بیر لەچاخی کۆن بکرێتەوە، بەهەمان شێوە بەبێ ڤێنسیا ناشێت بیر لەچاخی ناوین بکرێتەوە. بەو ڕادەیەی پێناسەکردنی ڤێنسیا وەک ئەو هێزە یان مامانەی سەرمایەداری لەمنداڵدانی چاخی ناوینەوە هێناوەتە دونیاوە ڕاستە، لەهەمانکاتدا مانای دەستنیشانکردنی ڕۆڵە مێژووییەکەشی دەبەخشێت. ئەو تەنیا کۆرپەلەکەی سەرمایەداری

نـەهێنا دونیـا، لـەرێگای ئـەو کۆرپەیـەی سکیدا بونیادەکـانی سـەرجەم شارەکانی چاخی ناوینی پێتاندو ئـەوروپای بـۆ سـەرمایەداری ئامـادەکرد. ئـەوەی ئـەوروپای بەسـەرمایەداری دووگیـان کـرد ڤینسـیایە. سـەرباری ئەمەش نەبوو بەرۆمای دووەم. چونکـە رۆمـا شوێنی دانیشتنی پاپایـەتی بـوو. پەیوەنـدی نێـوان پاپـاو ڤینسیاش بـەردەوام بەکێشـەو شـەڕ بـووە. هەڵکشانی کرستیانی کاسۆلیکی رۆما لەسەردەمی ڤێنسیادا رێکـەوت نییـە. دەشێت سەرجەم شالاوەکانی کاسۆلیکی رۆما بۆ سـەر ڤینسیا بەهـەبوونی سەرمایەداریەوە روون بکرێتەوە. بەگشتی وەک سەرجەم ئایینە گـەورەکان کرسـتیانی کاسـۆلیکیش بەگومانـەوە تەماشـای سـەرمایەداری کـردووەو لەبەرپاکردنی گەورەترین شەڕی ئایینی لەبەرامبەریدا دوودڵـی نـەکردووە. ئـەو رووەی لـەژێر نـاوی دیاردەکـانی شـۆڕش، ئەنگیزاسـیۆنو شـەڕە مەزهەبیەکان لەئەوروپا رەنگیداوەتەوە بەردەوام رووێکی ئەو شەڕە بـووە. بەتایبەتیش شەڕی لەگەڵ پرۆتستانتی لەنزیکەوە وابەستەی شـەڕەکەیەتی لـەدژی سـەرمایەداری. بێگومـان کرسـتیانیبوونی ئـەوروپا بەشـێوەیەکی بابەتی ژێرخانی بۆ پەرەسەندنی سەرمایەداری فەراهەم کردووە. بەلام ئەم هەبوونە بەتەنیا مانای سەرمایەداری نابەخشێت. ئیسلام فاکتەری زیاتری ژێرخـانی بـۆ سـەرمایەداری فەراهـەم کـردووە، بـەلام توانیـوێتی رێگـا بەسەرمایەداریش نەدات.

دووەمین هۆکاری گرنگی نـەبوونی ڤێنسیا بـەرۆمای دووەم، گرێـدراو بەهۆکاری یەکەم، دەسەلاتی خۆی بەسەر شارەکانی نیمچە دوورگـەدا ئـاوا نـەکرد و ئیتاڵیـای بەشـێوەی دەوڵـەت - نەتـەوە رێکنەخست. لـەبواری ئایدیۆلۆژیـەوە ڤێنسیا بـۆ دەوڵـەت ـ نەتـەوە کراوە نـەبوو. لەوانەیـە بەهێزترینو دواترین نموونەی دەوڵەتۆکەی شار بووە. ئەم واقیعـە بـەپێی پێویسـت روونیدەکاتـەوە کـە بـۆچی قۆنـاخی کۆرپـەیی سـەرمایەداری تێپەڕنـەکردووە، لەکۆتاییـەکانی سـەدەی هەژدەهەمـدا لەمیانـەی بەرخودانەکەی بەرامبەر ئەکیومەنێتی ڤاتیکانو دەوڵەت ـ نەتەوەی ئیتاڵیا ـ ئەوروپا گوزارشت لەهێزی مێژوویی ئەسلزادەکانی شار دەکات.

پێویستە زۆر باش بزانرێت کە بەئەندازەی دەوڵەتگەرایی شار دیموکراسیگەرایی شاریش بەهێزترین فۆرمی نوێنەرایەتی مێژوون. تەنانەت شاهێدی بۆ دیموکراسی راستەوخۆش کردووە. سیستەمە ئیمپراتۆریەتەکانی چاخەکانی کۆنو نوێو سیستەمی دەوڵەت ــ نەتەوەی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری لەسەر بنەمای نکوڵیکردن لەدیموکراسیگەراییو دەوڵەتگەرایی شار ئاواکراون. ئەزموونی شاری ڤێنسیا باشترینو روونترین بەڵگەی سەلمێنەری ئەم واقیعەیە. لەلایەک بەرخودانی بەرامبەر ئیمپراتۆریەتی خانەدانی هاسبورک ــ فاتیکان، لەلایەکی دیکەش بەرخودانی بەرامبەر نەتەوە ــ دەوڵەتی پێشوەختو سیستەمەکەی ویستفالیا ــ گوزارشت لەم واقیعە دەکات. لەرۆژی ئەمرۆمان لەکاتێکدا بیر لەرەخنەکردنو سەرلەنوێ ژیاندنەوە ــ بونیادنانەوەی شار دەکرێتەوە، ئەزموونی ڤێنسیا تا دوارادە فێرکەرە. بێگومان ئەگەر بەقەدەر ڤێنسیاش نەبێت چەندین شاری ئەوروپا لەسەرووی هەمووشیانەوە شارەکانی ئیتاڵیا هەم وەک دەوڵەت هەم دیموکراسی وانەی فێرکەرانە پێشکەش دەکەن.

### ب . گوزەرەکردن لە دەوڵەتشارەوە بۆ دەوڵەت . نەتەوە: ئەزموونی ئەمستردام . هۆڵەندا

کێشەی سەرەکی کە لەسەدەی شازدەهەم لەئەوروپا لە ئارادابوو، هەوڵی سەرمایەداری بوو لەبەرامبەر سیستەمە ئیمپراتۆرییە کلاسیکەکان تاکو بەسەریاندا زاڵ بێتو ببێتە هێزی شارستانیەکی فەرمی. هێزی ستراتیژی سەرەکی ئەو قۆناخە هێزەکانی ئیمپراتۆریەتن کە پشت بەخانەدانی هابسبۆرگ دەبەستن. دوای ئەوەی شارستانی موسەوی (٧١١ - ١٤٩٢)و ئیسلامی ئەندەلوسیان لەنیمچە دوورگەی ئیبریک لەناو بردو، دووچاری کۆچبەریان کردن کەهەر لەسەردەمی نیشتەجێبوونیانەوە لەگەڵیاندا لەناو ململانێو شەڕدابوون، بەپشتیوانی ڤاتیکان یش لەتەواوی ئەوروپا لەپای ئاواکردنی هەژموونی خۆیان بوون. بەڵام لەئاستی ئەوروپا چەندین دەوڵەتشارو میرنشینو پاشایەتی بەرخودانیان

کرد. لەسەرووی هەمووشیانەوە پاشایەتی فەرەنسا، بریتانیاو ئەڵمانیاو چەندین شاری ئیتاڵیا بەرخودانێکی دژواریان کرد. بەرامبەر بەهەژموونگەرایی ئایدیۆلۆژی کاسۆلیکی ئەکویمەنی پرۆتستانتی سەریهەڵداو بەشێوەیەکی فەرمی سەردەمی کڵێسا نەتەوەییەکانی راگەیاند. لەبواری سیاسیو ئایدیۆلۆژیەوە ئەوروپا کەوتە ناو کائۆسێکی گەورەوە. رەنگی مەزهەبی تێکەل بە شەڕەکانی هەژموونگەرایی بوو. لەلایەکی دیکەشەوە ئەو رێنسانسەی لەشارەکانی ئیتاڵیا لەسەرووی هەمووشیانەوە لەڤینسیا دەستی پێکردبوو بەخێرایی لەتەواوی ئەوروپا بلاوبوویەوە. لەگەوهەردا رێنسانس بەرهەمی دەوڵەتگەرایی‌و دیموکراسیگەرایی هەڵکشاوی شاربوو.

بەرامبەر بەسکۆلاستیزمی چاخی ناوین رێنسانس خاوەنی هەستانێکی عەلمانی ـ سکۆلار بوو. لەم سۆنگەیەوە گەڕانی چەندین شارو میرنشینی بەدوای پارێزەردا خاڵێکی مایەی تێگەیشتنە. لەسەدەی شازدەهەمدا رێنسانس رۆڵێکی یەکلاکەرەوەی هەبوو لەجیابوونەوەی هونەرو فەلسەفەیەکی ئاینی بەرەو هونەرو فەلسەفەیەکی عەلمانی. بەو سیفەتەی مانای ریفۆرم لەئایین دەبەخشێت پرۆتستانیش لەنزیکەوە وابەستەی سەرهەڵدانی رێنسانسە. هەڵەیەکی گەورەیە ئەگەر شۆڕشەکەی سەدەی شازدەهەمی ئەوروپا بەسەرمایەداری ببەسترێتەوە. شۆڕشی ئەو قۆناخە هاوشێوەیەکی ئەو شۆڕشانەی شارە کە سۆمەریەکان بەرامبەر کۆمەڵگای نیولیتیکی میزۆبۆتامیاو هێلینیەکانی کەناری ئیجەش بەرامبەر جڤاتە "بەربەر" ەکان بەرپایانکرد. شۆڕشێکی گەورەی کلتوورە. بەهۆی ناوەڕۆکەکەیەوە هەر لەسەرەتاوە نوێنەرایەتی تایبەتمەندێتییە گەردوونیەکان دەکات. ئەوەی سەرمایەداری توانی سەرکەوتنی تێدا بەدەست بێنێت؛ لەکائۆسە گەورەکەی ئەو سەدەیەدا ئەو هێزەی پیشاندا کە خۆی وەک بژارێک پێشکەش بکات.

بەناوی تەواوی مرۆڤایەتی قۆناخ و پرۆسەیەکی مەحشەری لەرۆژئاوای ئەوروپا جێگای باسە. لەم قۆناخەی مەحشەردا تاڕادەیەکی زۆر شارستانیەکان هێزەکانی کۆنترۆلو چاودێرییان لەدەست دەدەن.

بۆشایی کۆنترۆل دێتە ئاراوە. سەرمایەداریش وەک بەرهەمی ئەم بۆشاییە گەورەترین پێهەڵگرتن‌و رابوونی خۆی ئەنجامداوە. ئەم رابوونەش لەئاواکردنی هەژموونگەرایی سامناکی ئەو جانەوارەی بەرووخسار مرۆڤ دەچێت کە بەهەزاران ساڵە هێزەکانی شارستانێتی نادەوڵەتی و شارستانی دەوڵەتی بەردەوام لەقەفەس بەندیان کردبوو و ئیتر زنجیرەکانی خۆی پساندووە. دەشێت مرۆڤ و کۆمەڵگا بەرامبەر سەرمایەداری بێهەژموون خۆڕاگری بکەن‌و ئارام بگرن، هەروەها ژینگەش وێران نەبێت. بەڵام کاتێک سەرمایەداری وەک هێزێکی هەژموونگەرایی هەڵدەکشێت ئیتر تەواوی کۆمەڵگا، ژینگە و سیستەمە کۆنەکانی شارستانی دەکەونە ژێر هەڕەشەیەکی مەزنەوە. سەرەکیترین خاڵی پێویستە دەرکی پێبکرێت، سەرمایەداری وەک هێزێکی چارەسەری لەقەیرانەکەی سەدەی شازدەهەمی شارستانی سەریهەڵنەدا، بەڵکو وەک هێزێکی هەژموونگەرایی سەرکوتکەر هاتە مەیدان.

پێویستە شۆڕشەکانی رێنسانس، ریفۆرم‌و رۆشنگەری ئەم سەدەیە لەگەڵ سەرهەڵدانی سەرمایەداری وەک رابوونی جیاواز لەیەکتری هەڵسەنگێنرێت. گەورەترین خیانەتی زانستی کۆمەڵایەتی تەوەرەی ئەوروپا لەمەدایە کە ئەم پرۆسە مێژووییانەی کردۆتە موڵکی سەرمایەداری. لەبەرئەوەی سەرجەم زانست‌و داناکان (کارل مارکس یشی لەناودا) بەشێوەیەکی راست هەژموونگەرایی سەرمایەدارییان پێناسە نەکردو رۆڵە مێژووییەکەیان دەست نیشان نەکرد دەرگایان لە بەردەم هەرجۆرە کارەساتێک ئاوالاکردووە.

رۆڵی میرنشین‌و شاری ئەمستردام ـ هۆڵەندا لەو تراژیدیا گەورەیەدا رەوشی تکاکاری‌و ئارەزووکردنە. خودی ئەمستردام یش وەک شارەکانی دیکەی کەنارەکانی ئەتڵەسی رۆژئاوای ئەوروپا لەسەرەتاکانی سەدەی شازدەهەم لەبواری ماسیگرتن، بازرگانی‌و کشتوکاڵەوە لەپەرەسەندندایە. لەشکۆمەندی ڤێنسیا دوورە. بەڵام تاکە چانسێکی هەیە؛ ئەو شوێنەیە کە چەندین لەو مرۆڤانەی تێدا کۆبۆتەوە کە بەئامانجی رزگاربوون لەدەسپۆتیزم‌و دەمارگیری ئەوروپای رەش روویان تێکردووە. نوێنەرە

نوێکانی ئەقڵی ئازاد لەسەرووی هەمووشیانەوە سپینۆزا، دیکارتو ئەراسمۆس گیرساوەی شارەکە بوون. لەبواری هونەر و زانستیشدا ئاشنای دانای کامل بووە. بێگومان توانستێکی بیرکردنەوە، زانینو هەست پێکردنی زەبەلاحی بەمجۆرە کاریگەری لەسەر پەرەسەندنە سیاسیەکانو بەرهەمهێنان دەبێت. هەربۆیە سەرەتا رۆڵی لەبازرگانیی دەریاییو راوەماسیدا بینیوە. زۆر بەئاسانی دەتوانێت کێبڕکێ لەگەڵ هەستانە هاوشێوەکانی شارەکانی پادشایەتی ئیسپانیاو پورتوگال دا بکات کە رەقیبی هەرە گەورەیان بوو. گرنگتریش ئەوەیە لەناوچەکانی ناوەوە لەسەردەمی سەرلەنوێ رێکخستنەوەی کشتوکاڵدا توانیویەتی هەنگاو بۆ زۆرترین بەرهەم بهاوێژێت. بالابوونی بواری بەرهەمهێنانو بازرگانی بەخێرایی لەبواری پیشەسازیی مانیفاکتۆراشدا وەڵامی دەدرێتەوە.

میرنشینی هۆڵەندا لەمیانەی ئاواکردنی قەوارەیەکی سیاسی بەهێز لەگەڵ ئەو هەرێمە بچووکانەی پەرەسەندنی هاوشێوەیان بەخۆیانەوە دەبینی هەوڵی ئەنجامدانی شەڕی هەبوون (مانونەمان)ی داوە. بەرامبەر بەچی؟ بەرامبەر بەهیوای ئیمپراتۆریەتی خانەدانەکانی هاسبۆرکو ڤالۆسیس (فەرەنسی) کە لەنێوان خۆیاندا هەوڵی قووتدانی ئەوروپا و دابەشکردنی دەدەن. بەرامبەر بەمەش پاشایەتی بریتانیا، میرنشینی هۆڵەنداو ئەڵمانیا بەرخودانێکی دژوار دەکەن. ئەڵمانیای بروسیاش هێزێکی دیکەی ئەم بەرخودانەیە. ئەوجارە لەسەربنەمای ئەوپادشایەتییەی ئیسپانیا ـ کە سەرکەوتنی بەرامبەر ئیسلامو موسەوی بەدەست هێناوە ـ خوازیارن سەرلەنوێ ئیمپراتۆریەتی جێرمەن ـــ رۆمای پیرۆز ئاوابکەنەوە. ئەکۆنیزمی کاسۆلیکی ئەم ئاواکردنەوە بەناچارییەک دادەنێت. لەلایەکی دیکەشەوە باڵی ناوەندی نەمسا (ڤییەننا)ی هاسبۆرگەکان هەوڵی وەستاندنی هەژمونگەرایی ئیسلامی عوسمانیەکانو ئەنجامدانی هێرشی بەرامبەر دەدات. خانەدانی ڤالویسی ئەو ناوچەیەی دواتر دەبێت بەفەرەنسا باڵێکی دیکەی رەقیبی ئەکۆنیزمی کاسۆلیکییە. سەرلەنوێ کەشفکردنو داگیرکردنی جیهان و ئەمریکا دەستی پێکردووە. گەیشتوونەتە ئەفریقیاو هیندستان، بناخەی پردەکان دانراون.

بەشێوەیەی روونو ئاشکرا دەبینرێت کە سەبارەت بەمیرنشینی هۆڵەنداو ئەمستەردام کێشەکە شەڕی مانو نەمانە. باڵی هەردوو خانەدان بەئامانجی قووتدانی ئەو ناوچانە تەواوی هێزی خۆیان سەفەربەرکردووە. لەپێناو بەدەستهێنانی بالادەستی ستراتیژی شەڕ لەهەستیارترین قۆناخی خۆیدا ئەنجامدەدرێت. لەتەواوی قۆناخە هەستیارەکانی مێژوودا ئەمجۆرە شەڕە ستراتیژیانە روویانداوە. سەبارەت بەهێزە ژێرکەوتووەکان تەنیا شەڕێک نادۆڕێنن، قۆناخێک لەدەستدەدرێت کە بەسەدان ساڵ کاریگەر دەبێت. لەهەمووش خراپتر، بوونی کۆمەلایەتی رووبەڕووی لەناوچوون دەبێتەوە. هەبوونی کۆمەلایەتی نوێ جێگای باسن — لەسەرووی هەموو شیانەوە هۆلەندا — کە چارەنووسەکەیان رووبەڕووی ئەمجۆر هەڕەشەو مەترسیانە بۆتەوە. باس لەقۆناخێکی مانو نەمان دەکەین کە هاواری یان هەموو یان هیچ، یان ئازادی یان مەرگی تێدا بەرز دەبێتەوە.

سەفەربەری میرنشینی هۆڵەندا ـ ئەمستردام لەنزیکەوە گرێدراوی ئەو رەوشە ستراتیژیەیە. ئەو لێهاتووییەی هەم لەبوارەکانی ئایدیۆلۆژی، سیاسی و سەربازی، هەم لەبواری بازرگانی، پیشەسازیو دارایی پێیگەیشتوون تەنیا لەمیانەی لەسەرپێمانەوە و ئیرادەی ژیانی ئازاد فەراهەم دەبێت. ئەم لێهاتووییو هێزەی ئیرادە خراوەتە روو، ئەمستردامو هۆلەندا کە لەناوەڕاستەکانی سەدەی شازدەهەم تێکنەشکاونو پێگەیشتنی خۆیان سەلماند هەروەکو ئورک — سۆمەرو ئەسینا — گریک لەسەدەی حەڤدەهەم لەسەرتاسەری جیهان بەئاستی هێزێکی هەژموونگەرا گەیشت.

بەرامبەر بەم لایەنە ئەرێنییەی دوالیزمی ئەمستردام، لایەنەکەی دیکەی ئەم دوالیزمە سەرمایەدارییە فێڵبازەکەیەتی. هەر هەستانێکی گەورەی مێژوو جمکێکی فێڵبازو خائینی هەیە. هێندەی باوەڕی زەردەشتایەتی باسی دوالیزمی رووناکی — تاریکی ناکەم. بەلام ناشێت تاریکاییەکی سەرمایەداری لەرابوونی ئەمستردام ـ هۆڵەندا نەبینرێت کە ئەومان دێنێتەوە یاد. تەنانەت لەم هەڵسەنگاندنەشیدا ئەو هەڵەیە پەسەند ناکەم کە کارل مارکس تێی کەوتووە، واتە ناڵێم سەرمایەداری سەرکەوت، ئەم هەڵەو غەفلەتە پەسەند ناکەم کە بەناوی زانستەوە

ئەنجامدراون، سەرمایەداری پشکی لەسەرکەوتندا نییە، بەلام یەکەمین پشکی هەیە لەقۆستنەوەی سەرکەوتندا. هەندێک کەس یان هێز بەردەوام دەخوازن ئەوانە بەکاربێنن کە قورسترین شەڕیان کردووە. خۆنواندنی سەرمایەدارانی هۆلەنداو ئەمستردام لەسەختترین ساتەکانی شەڕداو لەسەر رەسەنترین خوێن (وەک هزرو ئیرادە)ی مرۆڤ گەڕانیان بەدوای داهاتو بەدەستهێنانی قازانج وەک بەدیهێنەر و خاوەنی سەرکەوتن لەمێژوودا تۆمار ناکرێن، بەڵکو وەک قۆزەرەوەو ئیستغلالکارانی سەرکەوتن جێی خۆیان دەگرن. ئەگەر بەشێوەیەکی قووڵ لێکۆڵینەوە سەبارەت بەشۆڕشی هۆلەندا بکرێتو سەرلەنوێ بەناوی رەنجدەرو ئازادیخوازان بنووسرێتەوە مسۆگەرە کە ئەم راستییە خۆی دەسەپێنێت. ئەو سەرمایەدارییەی لەهەژموونگەرایی ڤێنسیا هێشتا کۆرپەلە بوو، لەهەژموونگەرایی هۆلەندا ـ ئەمستردام رۆڵی هەرزەکارێکی قەبەو وشک دەبینێت. هەروەکو ئەسکەندەری سەردەم زەبر لەهەموو شوێنێک دەوەشێنێتو تێکی دەشکێنێت.

ئەو گۆڕانکارییانەی لەبواری بەرهەمهێنانو ئامرازەکانی دەسەلاتدا رێگای لەپێشکردەوە رۆڵی سەرەکی لەهەلکشانی هەژموونگەرایی هۆلەندا دەبینێت. بونیادی مانیفاکتۆرا (کاری دەست)یی لەناو مالەکان دەرکەوتو بەشێوەی سەربەخۆ سەرلەنوێ رێکخرایەوە. نوێکاری هاوشێوە لەبواری کشتوکالیشدا پەرەی پێدرا. بەشێوەیەکی بەرفراوان ریفۆرمی زەوی‌و کشتوکال جێبەجێکران. لەپێناو بازرگانی‌و ماسیگری بەهێزترین تەکنیکەکانی دروستکردنی کەشتی بەکارهێنران. تەواوی ئەو فاکتەرانەش بەبەراورد لەگەل ناوچە ئابوورییەکانی دیکەی جیهانو ئەورووپا هەرزانترین بەرهەمی بەرهەم هێنا.

بونیادی دەولەتی پشتبەستوو بەیەکینەکانی میرنشینی‌و شار کە تەکنیکی دەسەلاتن بەئاراستەی دەولەت ـــ نەتەوەوە دووچاری گۆڕانکاری‌و وەرچەرخان هات. قەوارە یان کیانە سیاسییە نوێیەکە شتێک بوو بۆ جاری یەکەم دەهاتە ئاراوە. شێوەی دەولەت ـــ نەتەوەی رێکخستنی دەولەت بەیەکەم گەلالەنامەی خۆی گەیشت. هەم بەبنەما

نەگرتنی دەوڵەتشاری ئەمستردام، هەم دەستبەردانی لەمۆدێلی باوی میرنشینی هۆڵەندا لەمەدا بەکاریگەر بوو. ڕێکخستنی دەسەڵات بەشێوەیەکی گونجاوو تەبا لەگەڵ بەپێتی ئابووری بەڕێوەبرا. ریفۆرمەکانی بونیادی سوپاش رۆڵیکی گرنگی لەمەدا بینی. هەم لەبواری تەکنۆلۆژیای سەربازی هەم لەبواری ڕێکخستندا یەکەمین بونیادەکانی مۆدێرنیتە ئاواکران. پێشکەوتنی هاوشێوە لەبواری خۆتەیارکردنو پڕچەککردنیشدا بەدیهات. هەرچەندە لەبواری جوگرافیدا وڵاتێکی بچووکیش بێت، ئەم گۆڕانکاریو پێشکەوتنانە کردیان بەهێزێکی هەژموونگەرا. لەم لایەنەوە شۆڕشی هۆڵەندا لەپێگەی پێشەنگایەتی ئەو شۆڕشانەدایە کە دواتر لەئینگلتەرا، ئەمریکاو فەرەنسادا روو دەدەن.

لەشۆڕشدا بەدەست خستنی هەژموونگەرایی لەلایەن سەرمایەدارییەوە زۆر خوێناوی بووە. سەرەڕای ئەوەی هێزەکانی گەل شۆڕشیان ڕێکخستو تێکۆشانیان بەڕێوەبرد، بەڵام پێشەنگایەتی شۆڕش لەلایەن کەمینەیەکی خاوەنی سەرمایە دەستی بەسەردا گیراوە. ئەوانەی شۆڕشیان ڕێکخستووەو بەڕێوەیان بردووە، یەکێتیو سەربەخۆیی هۆلەندایان بەدەست هێناوە مسۆگەرە کەفاکتەرەکانی سەرمایەداری نین. ئەو دیاردەی بەدرێژایی مێژوو روبەڕوومان بۆتەوە جارێکی دیکە لەم گۆڕانکاریو وەرچەرخانەشدا هاتۆتە ئاراوە. هێزە کۆنەکانی شارستانی کاتێک شکستیش دێنن، لەجیاتی ئەوەی بەرامبەر بەکۆمەڵگا بەتەواوی دەسەڵات لەدەست بدەن، دەستبەرداری بۆ دەسەڵاتدارە هاوپەیمانەکانیان بەگوێرەی بەرژەوەندی خۆیان دەبینن. بەردەوام پەیوەندی چڕو رایەڵە بەرژەوەندییان لەنێواندا هەبووە. چینی نوێی دەسەڵات ئەگەر بۆرژوازیش بێت لەهەناوی چینی دەسەڵاتی کۆن لەدایک بووە. دۆخی پەرەسەندووی چینی دەسەڵاتداری کۆنە.

گرنگی مۆدێلی هۆڵەندا لەگەورەییەکەیدا نییە؛ بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە مۆدێلێکە داهاتوو لەخۆوە دەگرێت. لە گەڵەخۆیدا هەڵمەتێکی دیکەی بەشارستانی ئەورووپا ئەنجامداوە، ئەمەش وایکردووە لەئاستی جیهاندا بەکاریگەر بێت. جیهانی مۆدێرن زۆر شت قەرزاری هۆڵەندایە. هێڵی ڤێنسیا

ــ ئەمستردام خاوەن ئەو لەپێشینەو پێشەنگایەتییە کە لەسەدەی چواردەهەمەوە تا سەدەی هەژدەهەم شارستانی ئەورووپای وەرچەرخاندو کردی بەباڵادەستی جیهان. لەکاتێکدا ئیمپراتۆریەتی ئیسلامی عوسمانی دوا هێزی هەژموونگەرای شارستانی ناوەندی خۆرهەڵاتی ناوین لەناوەڕاستی ئەورووپا پاشەکشێی دەکرد، ئەورووپا لەکراسی ئایینی داماڵرابوو و رووبەڕووی گەمارۆی هەمەلایەنی ئەو هێزە هەژموونگەرا نوێیانە ببوویەوە کە لەدەمامکی ئایینی داماڵرابوون‌و لایەنی عەلمانییان لە پێش بوو.

ئەو وەرچەرخانە گەورەی لەدیالیکتیکی شارستانی ئەورووپا ــ خۆرهەڵاتی ناوین هەم لەخزینی هەژموونگەرایی بۆ ئەورووپا هەم لەو جیاوازییەی لەبواری چۆنایەتییەوە هاتە ئاراوە هێندە گرنگە کە تەواوی سەردەم دیاردەکات. باڵادەستی هەژموونگەرایی هۆڵەندا لەقۆناخی ١٦٥٠ ـ ١٧٥٠ رۆڵی سەرەکی لەو گواستنەوەو وەرچەرخانەدا بینیوە. لەکاتێکدا ڤینسیا شارستانی ناوەندی لەخۆرهەڵاتی ناوین دزی‌و لەرێگای ئیتاڵیاوە بۆ ئەورووپای گواستەوە (سەدەکانی ١٢، ١٦)، هەرچی هۆڵەندا ـ ئەمستردامە لەماوەیەکی زۆر کورتدا لەکەنارەکانی زەریای ئەتڵەسی وەریچەرخاندو کردی بەیەکەمین فەتحکاری جیهانی هەژموونگەرایی ناوەندی ئەورووپا. سیستەمی شارستانی ناوەندی دوای سەرگوزەشتەیەکی پێنج هەزار ساڵی رۆژهەڵاتی ناوین لەکەنارەکانی زەریای ئەتڵەسی دەبوو بەسیستەمێکی نوێی جیهانی تەوەرەی ئەورووپا.

### ج ـ ئەزموونی لەندەن ـ بریتانیاو
### ئەو ئیمپراتۆریەتەی رۆژی لێ ئاوانابێت

شۆڕشی هۆڵەندا ـ ئەمستردام هەر لەیەکەم قۆناخەکانییەوە لەگەڵ لەندەن ــ بریتانیا لەلایەن هەمان دوژمنی ستراتیژیەوە گەمارۆ درابوون. هەر بۆیەش پێویست بوو پەیوەندی نێوانیشیان ستراتیژی بێت. مۆنارشیەکانی ئیسپانیاو فەرەنسا سەبارەت بەهەردوو هێزیش رێگایان لەپێش کێشەی مان‌و نەمان کردبوویەوە. هۆڵەندا و ئینگلتەرا هەردووکیان بەیەکەوە لەژێر هەڕەشەو مەترسی قووتداندا بوون. تاکە رێگەچارەی

**هەبوونو رزگاربوونیان؛ ببن بەناوەندی هێزی هەژموونگەرایی ئەوروپا. تا مۆخی ئێسقان هەستیان بەم واقیعە دەکرد، کردبوویان بەبابەتی سەرەکی نیگەرانی فیکرو هزریان، هەمان راستی بۆ لایەنی بەرامبەریش لەجێگای خۆیدا بوو. ئەگەر نەبن بەهێزی هەژموونگەرا هەم هەژموونگەرایی ئایدیۆلۆژیای کاسۆلیکی هەم بانگەشەکانی بوون بەرۆمای دووەم لەدەست دەچوو. بەردەوامیو خەستبوونی شەڕو پێکدادانی نێوان هەردوو جەمسەری هەژموونگەرایی سەرچاوەی خۆی لەهەمان کێشەی مانو نەمان وەردەگرێت. لەئاکامدا کاتێک لەهاوسەنگی دەوڵەت نەتەوەی ویستفالیا ( ١٦٤٨) بەستاتۆیەک دەگەن سنووریک بۆ شەڕەکەی نێوانیان دادەنێتو ناوبەرەکانی ئاشتی رۆڵی درێژکردنەوەی کات دەبینێت.**

**هەڵکشانی لەندەنیش وەک جمکێکی ئەمستردامە. تووشبوونیان بەهەمان کێشەی ستراتیژی ناچاری کردوون رێگەچارەی هاوشێوە بدۆزنەوە. دۆخی دوورگەیی بریتانیا کارەکەی ئاسانتر کردووە. لەندەن وەک دەوڵەتشارێک لەدایک نەبووە. لەم لایەنەوە زۆر لەشکۆمەندی ڤینسیا دوورە. وەک ناوەندی پاشایەتی دامەزراوە، بەڵام هەر لەساڵی ١٢١٥ وە لەژێر باڵی ماگناکارتا[١] خاوەنی ئۆتۆنۆمیەکی رێژەییە. لەم سۆنگەیەوە هەر لەسەرەتاوە بۆتە لانکەی مۆدێلێکی سیاسی تایبەت. هەروەها هەر لەسەردەمی ئارسەری یەکەمین پاشای بریتانیا (سەدەی پێنجەم)وە لانکایەتیکردنی بۆ ئەرستۆکراسی خاوەن هێزی گونجانو هاوسەنگی پێویستە بخرێتە سەر ئەم واقیعە. لەلایەکی دیکەشەوە جیاوازییەکی بەمجۆرەی هەیە؛ دوا پەناگەی نەفیکراوەکانی کیشوەری ئەوروپایە. ناوە بەناوە دووچاری داگیرکاریش هاتووە. هەر**

---

[١] ماگناکارتا: بەڵگەیەکی ئینگلیزییە لە ساڵی ١٢١٥ لەئەنجامی شەڕی نەجیبزادەکان بەرامبەر پاشایەتی هاتە ئاراوە، لەمیانەی ئەو بەڵگەوە پاشای بریتانیایان لە دەسەڵاتەکانی دامالی؛ بە ناچاری ئیمزای کرد. ئەمەش هەنگاوی یەکەمی ئازادی دەستووری بوو. بەمجۆرە بنەماکانی چارەسەرکردنی زۆرداری، نایەکسانیو گەندەڵی دانراوە؛ بەم پێیە راگەیەنراوە کە کەس ناتوانێت دەست بەسەر موڵکو سامانی مرۆڤی ئازاددا بگرێت، دادوەریش ناکرێت، نافرۆشرێتو دوا ناخرێت.

لەسەردەمی یەکەمین داگیرکاری قەیسەرەوە کە بەناوی شارستانی ئەنجامیداوە بەردەوام لوقمەیەکی بەتامو سەرنجراکێشی فەتحکارانی کیشوەر بووە.

هەڵکشانی لەندەن لەنزیکەوە وابەستەی ئەو راستیو واقیعانەیە. لەندەن لەناوەوە بەرامبەر بەهێزە ئەرستۆکراسەکان خاوەن ئۆتۆنۆمیەکی رێژەیی بووە، لەدەرەوەش بەرامبەر داگیرکارییەک دوا سەنگەر و پەناگەی نەفیکراوان بووە. لەسەر بنەمای ئەم دیاردە ستراتیژیانەوە چارەنووسی خۆی بونیادناوە. کاتێک وەک شار باڵی گرتووە بەردەوام ئەو پێگە ستراتیژییەی خۆی رەچاو کردووە. تا رۆژی ئەمڕۆشمان درێژە بەم پێگەیەی خۆی دەدات. پێویستە لەبیرنەکەین کە لەدیاریکردنی چارەنووسی شارێکدا هەر لەسەردەمی یەکەمین شاری ئوروکەوە بەردەوام نیگەرانییە ستراتیژیەکان رۆڵی سەرەکییان بینیوە. بیرنەکردنەوە لەشارێکی بێ شوراو بێ قەڵا گوزارشت لەم راستیە دەکات. ئەوەی بەلانی کەم هێندەی ستراتیژی بۆ شار پێویستە بەرهەمی پیشەسازی، پیشە، بازرگانیو کشتوکاڵی بەرەی دواوەیەتی کە خۆراکی پێدەدات. ئەگەر دەوڵەت یان بەڕێوەبەرایەتیەکی دیموکراتی نەبێت ئەم فاکتەرانە پەرە ناسەنو بەردەوام نابن. وەک بڵێی لەندەن مەحکومی دۆخێک کراوە کە تەواوی ئەو فاکتەرە دارایی، پیشەسازی، بازرگانیو بەرهەمە ستراتیژیانە لەناو یەکتردا بژیت.

تا کۆتاییەکانی سەدەی پازدەهەم دوورگە هەوڵیداوە کۆتایی بەقۆناخی بەرخودان بەرامبەر بەهیواکانی داگیرکردنو فەتحکاری هێزەکانی کیشوەر بێنێت. لەناوەڕاستی سەدەی شازدەهەم لەمیانەی کۆتایی هێنان بەدوا داگیرکاری نۆرمانەکان دەبێتە خاوەن کەسایەتی. ئیتر بریتانیبوون ناسنامەیەکی سەربەخۆیە. سەردەمی یەکەمین ئەلیزابێتی دوای ساڵانی ١٥٥٠تایبەتمەندێتی بەدەستهێنانی ئەم ناسنامەی هەیە. لەمیانەی ناسنامەی ئەم دوورگەیە ناسنامەی شاری لەندەنیش بەهێز بووە و ئیتر دەتوانێت رۆڵی مێژوویی ببینێت.

کێشەی سەرەکی بریتانیـای لەنـدەن لەسـەدەی شـازدەهەمدا گـەمارۆی ئیسپانیا ـ پورتوگال لەزەریای ئەتڵەسیو پاشایەتی فەرەنسا لـەزەمینی، ئەوروپا پارچە بکات، بەڕووی جیهانی دەریاو زەمینیدا بکرێتـەوە. لەگـەڵ هۆلەنـدای ئەمسـتردام دووچـاری هـەمان کێشـە هـاتووە. ئەگـەر لەچارەسەرکردنی ئەو کێشـەیە سـەرنەکەوێت کیانـە سیاسـیەکەی کۆتـایی پێـدێت. ڕێگـای سەرکەوتنیشـی زۆرانبـازێی سـەرۆکایەتییە لەشـەڕی هەژموونگەراییدا. لەگەڵ تەواوبوونی گواستنەوەی شارستانی ناوەندی بـۆ ئـەوروپا، شـەڕێکی دژواری هەژموونگـەرایی لـەنێوان هێـزە جیاوازەکـان ڕوودەدات. سیستەمەکانی شارستانی سیستەمی هەژموونگەران.

بـۆ سـەرکەوتنی بریتانیـای لەنـدەن (ئینگلتـەرا) لەشـەڕی هەژموونگەرایی دا پێویستی بە پەرەپێدانی سێ ئامرازی سەرەکی مێژوویـی هەیە کە بەبێ ئەوان نابێت. ئەمانەش سەرمایەداری، دەوڵەت ـ نەتـەوەو پیشەسـازیبوونە. دوورگـە زیـاتر لـەبواری کشـتوکاڵیەوە دەتوانێـت خودبژێوی بەبنەما بگرێت. کشتوکاڵ تـا چ ئاستێکیش بـەپیت بێت بەشـی بەردەوامکردنی شەڕی هەژموونگـەرایی ناکـات کـە تێـی کـەوتووە. تـەواوی هەلومەرجـە نـاوخۆییو دەرەکیـەکان گۆڕانکاریـەکی نائاسـایی سیسـتەم دەکەن بەپێویستییەک. مێژوو پڕ لـەو نموونانەیـە کـە دەسـەلمێنن کاتێـک هەبوون دەبێتـە بابـەتی بـاس ئـەوا ئـەو هێـزە کۆمەڵایەتیانـەی تەنگـەتاو کراون قەلەمبازیان ئەنجامداوەو سیستەمی تەکنۆلۆژی، هزری، سیاسـی، سـەربازیو ئـابووری نوێیـان ئـاواکردووە. ئـەوەی بەشـێوەیەکی گشـتی لەئـەوروپای گـەمارۆدراو بەتایبـەتیش لەدوورگـەی ئینگلتـەرا ڕوویـداوە بوویەرێکی بەمجۆرەیە. گرنگی سەدەی شازدەهەم وابەستەی ئەم واقیعەیە.

بێگومان بریتانیای لەندەنی سەدەی شـازدەهەم نەداهێنـەری هەڵمـەتی سـەرمایەداری، دەوڵـەت ـــ نەتـەوەو پیشەسـازیبوونە نـە تاکـە هێـزی بونیادنەریشـە. لـەم سـێ لایەنـەدا پەرەسـەندن لەتـەواوی شـارەکانی ڕۆژئاوای ئەوروپا لەئارادایە لەسەرووی هەموشیانەوە لەشارەکانی نیمچە دوورگـەی ئیتاڵیـا. گۆڕانکـاری سیسـتەم لەئاسـتی کیشـوەرو جیهانیدایـە.

بەلام کۆمەکی تایبەتی لەندەن لەوەدایە کە پێ بەپێ رۆلی پێشەنگایەتی‌و کاراکردن دەبینێت. لەندەن مێشک‌و هێزی کاراکردنی سیستەمی نوێیە.

ئەو پرسیارە سەرەکییەی پێویستە بوروژێنرێت؛ کامە فاکتەر رۆلی دیارکەری بینی؟

١ـ بەسیستەمبوونی سەرمایەداری لەشیکارێکی تەواو دوورە، تا ئێستاش گفتوگۆ سەبارەت بەبابەتەکە دەکرێت. لەبەشە جیاوازەکانی بەرگرینامە روونکردنەوەی پێویستمان دەرهەق بەمژارەکە کرد. خالە سەرەکیەکانی رەخنەکردن خرانەڕوو. بەکورتی رادیکالترینیشیان سەبارەت بەشیکارەکانی سەرمایەی کارل مارکس بوو کە کەموکوڕی‌و هەلەی مەزن لەخۆوە دەگرێت. پێشکەشکردنی سەرمایەداری وەک سیستەمێکی ئابووری، پێگەیشتوو و پێشکەوتنخواز بناخەی هەلەکە پێکدێنێت. گشتاندنی شێوەی ئابووری وەک شێوەی کۆمەلگا مانای گشتاندنی هەلە دەبەخشێت. هەرچی بلاوکردنەوەیەتی لەمێژوودا لەژێر ناوی ماتریالیزمی مێژوویی کراوە بەپەیڕوێک. ئەنجامیش راستکردنەوەی ئایدیالیزمی هیگل نەبوو، بەلکو کاریکاتۆریزەکردنی بوو.

پێویستە زۆر بە باشی تێبگەین کە تا ئێستاش هیگل دەرباز نەکراوە. هەرچەندە شارستانی ئەوروپا رێگای لەپێش هیگل کردۆتەوە، بەلام تا ئێستاش مەحکوم‌و دیلی ئەوە. لەسەردەمی هیگلەوە فەلسەفە لەنزمترین ئاستی لوتکەدایە. نیچەش دژەکەی هیگلە. ئەویش لوتکەی رەخنەکردنی مۆدێرنیتەی سەرمایەدارییە. تا ئێستاش دەرباز نەکراوە. تایبەتبوونەکەشی لەوەدایە، هاوارێکی پێخەمبەرانەیە نالەباری و نەگونجاوی سەرمایەداری لەگەل ژیان رادەگەیەنێت. گەورەیی فرناند براودل یش لەوەدایە ئەو هێزەی پیشانداوە کە سەرمایەداری وەک پاوان پێناسە بکات نەک ئابووری. بەسیفەتی پاوان سەرمایەداری نەشێوەیەکی بەرهەمهێنانە نە قۆناخێکی مێژوویی‌و کۆمەلایەتییە، هەردووکیشیان نییە. ئامرازی رەواکردنی سەرمایەدارییە لەسەر بنەمای ئەو باسەی ئابووری ـ سیاسی ئینگلیزی پێدەگووترێت. سەرباری ئەوەی ئابووری نییە، بەلام کاتێک وەک "کاملترین سیستەمی ئابووری" پێشکەش دەکرێت، گەورەترین

خەڵەتاندنو چەواشەکردنی مێژووە کە لەژێر ناوی (زانست)ەوە ئەنجام دەدرێت. کارەکتەری تاڵانکارو قەبلێنەری پاوان دەکرێتە ئابووریو هەوڵی بەدەستهێنانی ئەم ڕەوابوونو چەواشەکارییە دەدرێت. سەرباری سەرجەم ڕەخنەکانیان بەڵام کارل مارکسو شوێنکەوتووەکانی لەمیانەی کۆمەکی پۆزیتیڤیزمیشەوە لە بوون بە ئامرازی ئەو هەڵانە ڕزگاریان نەبوو.

شیکارکردنی سەرمایەداریش وەک ئاینی ئیسلام یاخود کرستیانی یاخود وەک پاوانێکی ئایدیۆلۆژی ـ پراکتیکی، هیچ گومانی تێدا نییە ئاشنای حەقیقەتی سەنجراکێشترمان دەکات. چونکە سەرمایەداری بەرزترین ئاستی پاوانگەراییە لەمێژووی شارستانیدا. ئەگەر ئەو خاڵە ڕەچاو بکەین کە یەکەمین پاوانی مێژووی مرۆڤایەتی بە "پیاوی بەهێزو فێڵباز" دەستی پێکردووە، ئەوا باشتر مایەی تێگەیشتن دەبێت کە سەرمایەداری گوزارشتی دامەزراوەیی وەک ئەو هێزەی دەسەڵات دەرکی پێبکرێت کە لەرۆژی ئەمڕۆمان لەسەر تەواوی گۆڕەپانو بوارە کۆمەڵایەتیەکاندا زاڵە. لەم سۆنگەیەوە پێویستە پێشکەوتنو شێوەکانی سەرخانو ژێرخانی کۆمەڵگا بەمانای هەبوونی خۆییەوە ڕاستەخۆ پەیوەندیدار نەکرێن. هەروەها دەشێت سەرمایەداری وەک سیستەمی سەرکوتکردنو زێدە بەهای هەرە پێشکەوتوو ڕەوای سەر کۆمەڵگا پێناسە بکرێت. ئەو پێناسەیە دەرفەتی ئەوەمان پێدەدات باشتر تێبگەین کە بەشێوەیەکی گشتی پاوانەکان بەتایبەتیش پاوانی سەرمایەداری لەبوارەکانی ئابووری، کۆمەڵایەتی، سیاسی، سەربازیو ئایدیۆلۆژی جێگیر دەبێتو بەجۆرێک ڕەوایەتی پێدەدات وەک بڵێی هی خۆی بێت. بۆ نموونە پاوانی سەربازی مانای سوپایە، ئەویش لەسەرجەم شارستانیەکاندا هێزێکی سەرەکی دامەزراندن یان ئاواکردنی هەژموونگەراییە. هەرچی هەژموونە گوزارشتی دامەزراوەیی بەکۆمەڵی "پیاوی بەهێزو فێڵبازە" کە لەسەر کۆمەڵگا بڵاوبۆتەوە.

کاتێک لەژێر ڕۆشنایی ئەو پێناسەیەدا تەماشای ئەو سەرمایەدارییە بکەین کە بەگشتی لە ئەورووپا بەتایبەتیش لە بریتانیای لەندەن هەڵکشاوە ئەوا باشتر دەتوانین مانا بەخشی بکەین. تەنیا لەرێگای

پـاوانێکی هەژموونگـەرایی بـەهێزتر دەتـوانن بـەرەنگاری ئـەو پاوانـە هەژموونگەرایانـە ببنـەوە کـە لـەچوار لاوە دوورگـەیان گـەمارۆداوە. پاوانەکانی ئیسپانیاو فەرەنسا بـاوو نـەریتی بـوون. بەدیمـەنی ئـایینیو پاشایەتی بارگاوی بوو. لەبەر ئەو هۆکـارەش ئەگـەر دوورگـەش لـەمیانی پاوانی ئایینی و پاشایەتی وەلامیدابوایـەوە ئـەوا لەوانەیـە ژێربکەوتایـە، چونکـە رەقیبـەکانی لەهـەموو لایەکـەوە لەپێشـتر بـوون. تاکـە رێگـای رزگـاربوون ئـاواکردنی شـێوەیەکی نـوێی پـاوان بـوو، ئەمـە بـوو کـە ئەنجامـدرا. لەبـەر ئـەم هۆکـارە مێـژووییـە لەسـەدەی شـازدەهەم لەئایدیۆلۆژییەوە تا بەرهەمهێنان، لەسیاسەتەوە تا سەربازی لەسەرجەم بوارەکـانی کلتـووری مـادیو مەعنـەویی لەدوورگـە پاوانگەرایـیـەکی نـوێ ئاوادەکرێـت. سـەرمایەداری ئینگلیـز نـاوی ئـەم بونیادنانـە گشـتییەیە. ئاواکردنی لەسەر میراسی هزرو تەکنۆلۆژیای پێشکەوتووی مرۆڤایەتی نـە پێشکەوتن نـە شـێوەیەکی نـوێی کۆمـەڵگا، هەردووکیشـیان نییـە. تـەنیاو تـەنیا بـەدیهێنانی بـەهێزترین فۆرمیلـەی پاوانگەرایـیـە. کاتێـک لـەم چوارچێوەیەدا تەماشای ئەو گۆڕانکاریانە بکرێت، ئینجـا ئەگـەر لـەرێگای شۆڕش یان ریفۆرمەوە بـەدیهاتبێت، لەئاکامدا ئامـانجی دامـەزراوەبوونی پاوانە، بەلام هەڵبژاردنی ناوی لەندەن وەک شار، بریتانیـاش وەک وڵات تـەنیا بەمەبەسـتی ئاسـانکاری گێڕانـەوەی زارەکییـە. ئـەم شـەڕەی هەژموونگەرایی پاوان کە تا ساڵانی ۱۷۸۰ لەمیانەی رێککەوتنی ستراتیژی ئەمستردام - لەندەن بـەڕێوە چـووە، دوای شۆڕشی فەرەنساو شـەڕەکانی ناپلیۆن ئینگلتەرا توانیویەتی وەک تاکە هێزی هەژموونگەرا لەسەر پێیـان بمێنێتەوە.

ئەو رێساو دامـەزراوە نوێیانـەی لـەبوارەکانی کشتوکاڵ، بازرگـانی، فینـانسو پیشەسـازی پێشـخراون وەک مێژوویێکـی درێـژ لەبەشـەکانی پێشووتری بەرگرینامەکەم باسکراوە. ریفۆرمی ئـایینی تایبـەت بـەخۆی، دامـەزراوە زانسـتییە پاشـکۆکان و سیسـتەمی هونـەرو پەروەردەشـی بەدامەزراوە کردووە. بەکورتی مۆرکی خۆی لەشێوازی ژیـانی نوێداوە کە سەرەکیترین فاکتەری مۆدێرنیتەیە.

٢ــ دووەمــین دامــەزراوەبوونی گرنگــی لەســەردەمی هەڵکشــانی هەژموونگەرایی لەنـدەن ــ بریتانیـا بەشـێوەیەکی تێکـەڵ لەگـەڵ پـاوانی سەرمایەداری پەرەیسەند پلەداری کۆمەڵگا و ڕێکخستنی بونیادی دەوڵەتە بـە شێوەی دەوڵـەت ــ نەتـەوە. واتـە هاوتـەریبی پـاوانی سـەرمایەداری بونیادنراو لەسەر ئـابووری ڕێکخسـتنی دەوڵـەت ــ نەتەوەیـە کـە لەسـەر بواری دەسەڵات ئاواکراوە. بەناویەکداچوونێکی بـەهێزیان جێگـای باسـە، چونکـە پـاوانی دەسـەڵات نـەبێت پـاوانی ئـابووری بەدینایـەتو بیـری لێناکرێتـەوە. ئـەو دیاردەیـەی زانـا کۆمەڵایەتیـەکان ــ کـارل مارکسـیش لــەناودا ــ زەلالیــان نــەکرد یـاخود لەبارەیــەوە زۆر بەهەڵــەداچوون؛ مەزەندەیان کردبوو کە ئابووریش وەک بوارێکی تایبەت کاپیتالیزە کراوە، مێژووی سەرجەم شارستانیەکان سەلماندوویەتی: تەنیا کاتێک پاوانەکانی ســەر بــواری ئــابووری لەگــەڵ پاوانــەکانی ئایــدیۆلۆژیو دەســەڵات بەناویەکداچوون دەتـوانن زێـدە بـەها بەدەست بێنن. هـەروەها پێویستە پاوانی دەسەڵات وەک گوزارشتی دامـەزراوەیی و خەسـتی پـاوانی ئـابووری شرۆڤەو راڤە بکرێت.

ناوبردنی گوزارشتی دامەزراوەبووی دەسەڵات بەدەوڵەت باسێکی باوو نەریتییە. چونکە ئەم پاوانە نەریتییەی دەسەڵات کە لەگەڵ سـەرمایەداریدا تێکەڵە، ڕێکخستنی خۆی لـەچوارچێوەی فۆرمی دەوڵـەت ــ نەتـەوە وەک ناچاریـەکی حـەتمی بینیـوە. یـەکێک لەتایبەتمەندێتییـە سـەرەکییەکانی ڕێککەوتنی ستراتیژی نێوان ئەمستردام ــ هۆڵەنـداو لەنـدەن ــ بریتانیـا ئــەوەیـە کـە لــەفۆرمی دەوڵــەت ــ نەتــەوە دەوڵــەتیان بەسـەر تــەواوی کۆمەڵگادا بڵاوکردۆتەوە، چونکە تـا ئـەو سـەردەمە دەوڵـەتی نـەریتی بـاو بەشـێوەی بونیـادێکی سـەرووی کۆمـەڵگابوو، بایـەخێکی زۆری بـەدانانی سنووردەدا لەنێوان خۆیو کۆمەڵگادا. ئەم شێوەیەش هێزەکـەی سـنووردار دەکرد. بەڵام لەمۆدێلی دەوڵەت ـ نەتەوەدا لەبەر ئەوەی تەواوی کۆمەڵگای بەسیفەتی نەتەوە لەخۆوە دەگرت، لەمیانەی سوود وەرگرتن لەهەژموونـە ئایدیۆلۆژیو ئابووریەکەیەوە خۆی ڕەوا دەکات، ئەمەش زیـاترین ئاسـتی هێزی لەگەڵ خۆیدا دەهێنا.

کاتێک ئیمانوێل والرشتاین لەتوێژینەوە بەرفراوانەکەی " شیکاری سیستەمەکانی جیهان"دا شێوازی نوێی ڕێکخستنی دەوڵەت بەفاکتەری دیاریکەری بالادەستی کۆتایی هەژموونگەرایی ئینگلیز دادەنێت هەڵوێستێکی واقیعانەیە، بەڵام کەموکوڕی گەورەی ئەو بەرهەمە ــ هەروەکو کارل مارکس ـ لەوەدایە کە لەشیکارەکانی سەرمایەداریدا نقوم بووە، تەنانەت لەئاستی دەستەواژەشدا بێت هەڵوێست سەبارەت بەشیکارکردنی دەوڵەت ــ نەتەوە پیشاننەدراوە. ئەمەش وایکردووە سەرکەوتنەکانی شایستەی ئەو بەرهەمە مەزنانە بە شێوەیەکی زۆر سنوردار ڕەنگبداتەوە. دەوڵەت ــ نەتەوە شتگەلێکی زۆر قەرزداری قاڵبە نەریتیەکانی دەوڵەتو میللیکردنی ئایینە. پێچەوانەکەشی ڕاستە. لەکاتێکدا بەمیللیکردنی کلتووری نەریتی باو لەسەرووی هەمووشیانەوە میللیکردنی ئایین دەوڵەت ــ نەتەوەیان خولقاندووە، دەوڵەتیش میللیگەرایی وەک ئایینی نوێی خۆی هەڵبژاردووە. لەم سۆنگەیەوە ئەو فۆرمێلەی بەشێوەی سەرمایەداری = نەتەوە = دەوڵەت = میللیگەرایی ناوەڕۆکی خودی پرۆسەو قۆناخە نوێیەکەیە. ئەو شوێنەی ئەم پرۆسەیە پێیدەگات فاشیزمە.

دەوڵەت ـ نەتەوە گوزارشت لەبەرزترین ئاستی دەسەلاتی سەردەمی پاوانی سەرمایەداری دەکات. خۆی پاوانی پاوانەکانە. بەتایبەتیش لەقۆناخەکانی سەرەتایدا لەپێگەی بەرزترینو بەرفراوانترین دەستڕۆییدایە. هیگل گووتەنی ئەو خوداوەندەیە کە دابەزیوەتە سەر زەوی. دۆخی بەرجەستەیی دەستەواژەی خوداوەندە لەچوارچێوەی کۆمەڵگادا.

دووەمین ئامرازی سەرەکی کە لەهەژموونگەرایی لەندەن ــ بریتانیا بەلانی کەم هێندەی پاوانە سەرمایەدارییەکان بەکاریگەر بووە پاوانی پاوانەکان دەوڵەت ـ نەتەوە بووە. لەڕێگای ئەم ئامرازەوە بەپێگەی ئیمپراتۆریەتی بریتانیا گەیشتووە کە خۆری تێدا ئاوا نابێت. زۆر ئاشکرایە کە ناتوانرێت لەم بارەیەوە سنووری دژوار لەنێوان پاوانی ئابووریو پاوانی دەوڵەت ـ نەتەوە بکێشرێت. هێندە بەناویەکتردا چوونە زۆر جار دەبینرێت کە یەکێکیان چۆتە شوێنی ئەویتریان، بەڵام دیسانیش

پێویستە بەگشتی دەوڵەت بەتایبەتیش دەوڵەت ــ نەتەوە لەگەڵ سەرمایەداری هاوتا نەکرێت، هەروەها ئەگەر وەک سەرخانێکی ساکاریشیان هەڵنەسەنگێنرێت گرنگو بایەخدارە. پەیوەندیەکەی نێوانیان زۆر خەستو بەهێزە، بەڵام هاوتا یاخود ڕەنگدانەوەیەکی سادەی یەکتری نین. وەک دوو هەبوونی گەوهەری جیاواز بەردەوامی بەپەرەسەندنی کۆمەڵگای ـ مێژوویی خۆیان دەدەن.

پێگەی تایبەتی لەندەنو ئەمستردام لەواقیعی کۆمەڵگای مێژوویی لەوەدا بەرجەستە دەبێت کە کۆتاییان بەدەوڵەتۆکەی شارهێناوەو بوونەتە لانکەی دەوڵەتی وڵات ـ نەتەوە. پێگە ستراتیژیەکەیان ڕۆڵێکی سەرەکی لەمەدا بینیوە. بەڵام لەدۆخی نەبوونیان بەلانکەی دەوڵەت ــ نەتەوە، باجەکەی داگیرکارییو پێگەی شارێکی ئاسایی ئەو ئیمپراتۆریەتەیە کە لەدەرەوە دێت. جیاوازییان لەگەڵ ڤێنسیا گرێدراوی ئەم تایبەتبوونەیانە. ڤێنسیا ئاواکردنی دەوڵەت ـ نەتەوەی ئیتاڵیای نەکرد بەئامانجی خۆی. بەڵام وەک شار بەرگری لەناسنامەی خۆی کردو پاراستی. لەم سۆنگەیەوە لەندەنو ئەمستردام مۆرکی نکوڵیکردنی ناسنامەی شاریان پێوەیە. ئەم مۆرکە بەباشترین شێوە لەگەڕەکی "سۆزانیخانە"ی لەندەنو ئەمستردام دەبینرێتو هەستی پێدەکرێت. لای سۆمەریەکانیش ڕووداوێکی هاوشێوە لەنیپوورو بابلدا دەبینرێت (موساقەتین - یەکەمین سۆزانیخانەیە). هەر ناسنامەیەک نکوڵی لەخۆی بکات ڕاکردنی بۆ نییە دەبێت بە سۆزانیو فاشیست.

دەوڵەت ـ نەتەوەی لەندەن ــ بریتانیا بوو بەکاریگەرترین چەکی دەستی سەرمایەداری. لەکاتێکدا لەناوەوە لەرێگای ناسنامەی "هاووڵاتی"و لەسەربنەمای ئۆپەراسیۆنەکانی هۆمۆژەنکردن "چۆنیەککردن"ی تەواوی پێکهاتە کۆمەڵایەتییەکان تاکی ـ مێرووڵە دەخوڵقێنێتو پرۆلیتاریا دەکات بەکۆیلەی نوێ، ئەندامەکانی پلەداری دەکات بەبۆرژوازی. وەک چەمکو دەستەواژە تاک، تاکڕەوێتی، مافو ئازادیەکانی تاکەکەس خزمەت بەپەردەپۆشکردنو ڕەواکردنی ئەم ئۆپەراسیۆنە مێژووییە دەکات. لەبەرامبەر ئەمەشدا شەڕی ناسنامەی بونیادەکانی پێکهاتە

کۆمەڵایەتیەکان ـ لەسەرووشیانەوە کارکەر، پیشەکار، لادێیی، رۆشنبیر، جڤاتە ئایینیەکان، ژن، ئەتنیک ـــ سەرهەڵدەدات. تاکو مانای دەستەواژەی تاکو هاوڵاتی شیکار نەکەین کە بۆرژوازی بەئامانجی مەشروعیەت بە دەمامکو ناکۆکیەکی زۆر بارگاوی کردوون، ئەوا مانا راستەقینەکەی ئۆپەراسیۆنی خولقاندنی کۆمەڵگای هۆمۆژەنی دەوڵەت ـــ نەتەوە تێناگەین.

ئۆپەراسیۆنی دەوڵەت ـ نەتەوە بۆئافراندنی کۆمەڵگایەکی هۆمۆژەن لەناوەوەدا بە دۆخە راستەقینەو هەرە رووتەکەی لەمۆدێلی دەوڵەتی فاشیستدا ئاشکرا دەبێت. پەیوەندی هەردوو جەنگی جیهانی لەگەڵ ئەم مۆدێلە زۆر بەرچاوو سەرنجراکێشە. لەمیانەی نکوڵیکردن لەتاکانەیی گەردوون کە دەست لێبەرنەدراوە (تاکانەیی ـ گەردوونی کە دەستەواژەی سەرەکی فەلسەفەن) واتە لەرێگای نکوڵیکردن لەجیاوازیو هەمەرەنگیەوە کە خودی ژیانن، دەوڵەت ـ نەتەوە خوازیارە خۆی بکات بەتاکە هێزی باڵادەست. دروشمی یەک دەوڵەت، یەک زمان، یەک نەتەوەو یەک کلتوور کە هیتلەر بەرزی کردبوویەوە بەباشترین شێوە ئەو دۆخە روون دەکاتەوە. یەکانەییەکی بەمجۆرە لەدۆخی ئەوخانە شێرپەنجەییە دەچێت کە تەواوی خانەو شانەکانی پێکهاتەی جەستەی مرۆڤ لەناو دەباتو تەنیا خانە شێرپەنجەییەکە تەشەنە دەکاتو بڵاودەبێتەوە. خانەکان بەشێوەیەکی نائاسایی زیادیان کردووە. بەڵام ئەوەی روودەدات، مردنی نائاساییو پڕ بەئێشو ئازارە.

مەیلی هۆمۆژەنکردن کە بەشێوەی "ئەندازیاریێتی کۆمەڵگا" لەبناخەی دەوڵەت ـ نەتەوەدا جێگای باسە ئەگەر لەرێگای دیموکراسیو یاساوە سنووری بۆ دانەنرێت، ئەوا هەروەکو لەقۆناخی فاشیستبووندا بینراوە ئەنجامەکەی قڕکردنی کۆمەڵایەتیو هەموو جۆرەکانی جینۆسایدە. ئەوەی لە دەوڵەت ـ نەتەوە لەجینۆساید زیاتر ئەنجامدراوە قڕکردنی کۆمەڵگایە کە مانای مینیمیزەکردنی جیاوازییەکان یاخود پێکهاتە کۆمەڵایەتیەکان دەبەخشێت. لەسەر ئەم بنەمایەش دیکتاتۆریەتی دامەزراوەیی لەمیانەی ئەو هێزەوە ئاوادەکرێت کە لەدەستی بژارەی دەسەڵاتدا کۆبۆتەوە. چونکە

بەهێزبوون و ناوەندیبوونی زیاتری دەوڵەت ڕێگا لەپێش دابەزینی دیموکراسی بۆ نزمترین ئاستو لاوازبوونی کۆمەڵگا دەکاتەوە. واتە "زانستی کۆمەڵایەتی" پەرە پێدراو ڕۆڵێکی گەورە لەوەدا دەبینێت. ئەو ڕۆڵەی ئابووری سیاسی لەرەواکردنی سەرمایەداریدا بینی، فەلسەفەی دەوڵەتو یاسا بۆ ڕەواکردنی دەوڵەت ـ نەتەوە دەیبینن. فەلسەفەی هیگل ئینجیلی دەوڵەت ـ نەتەوەیە. گرنگترین خاڵی کە لەبەرژەوەندی دەوڵەت ـ نەتەوەدا باسبکرێت، لەقۆناخی سەرهەڵدانیدا ئەو نەریتخوازە بۆ بایەخانەی بژاردو جیای کردنەوە کە وەک بزمارێک ڕۆڵیان لەناو پێکهاتەکانی کۆمەڵگادا دەبینی. هەروەها پارچەبوونێکی زێدەڕۆیانەش مانای کۆمەڵگایەکی کائۆس دەبەخشێت. لەبەر ئەوەی بۆ ماوەیەکی درێژخایەن ژیان لەناو کائۆسدا مەحاڵە، لەقۆناخی سەرەتایدا دەوڵەت ـ نەتەوە سنوورێک بۆ ئەم ڕەوشە دادەنێت، بەمجۆرەش هەستانێک ئەنجامدەدات کە لەناو خراپەکاندا باشترین بژارە.

لەکاتێکدا دەوڵەت ـ نەتەوەی لەندەن ـ بریتانیا لەمیانەی ئەو ئامرازە نوییەوە هێزی دەوڵەتە هەژموونگەرا پەلاماردەرەکان تێکدەشکێنێت زیاتر بەمەیلێکی پراگماتیکیانە جولاوەتەوە. ئەم واقیعەیە کە لەپشت پراگماتیزمی ئینگلیزد شاراوەیە. دەوڵەت ـ نەتەوەی ئینگلیز لەناو ژیاندا لەدایک بووە. کێشەی مانو نەمانو ئەو گەمارۆیەی دووچاری هاتبوو لەبواری پراکتیکیدا پێگەیشتنی ئەو ئامرازەی فەراهەم کردووە. بایەخی بەپراکتیکی کوێرانەو ئەو چەنەبازی ـ تیۆریانەش نەداوە کە لەکردار دابڕاون. بەپێی داواکاریو پێویستیەکانی خۆی بووە بە دەوڵەت ـ نەتەوە. لەوەش گرنگتر بەردەوام دیموکراسیو یاسای وەک هێزێکی یەدەگ داناوە. نەریتی دیموکراسیو یاسای کۆمەڵگای ئینگلیز بەردەوام بەرەنگاری هاربوونی دەوڵەت ـ نەتەوە بۆتەوە. بەڵام یاساو دیموکراسی قوربانی دەوڵەت ـ نەتەوە نەکراوە. ئەمە دووەمین هۆکاری گرنگە کە ئینگلتەرا توانیویەتی بەرامبەر دەوڵەتە هەژموونگەراکانی دیکە بەهێز بێتو لەسەر پێیان بمێنێتەوە. بەکورتی کۆمەڵگای ئینگلیزی بەرامبەر بەجانەوەرە

نوێیەکە وریایە کە ناوی لویاتان (دەوڵەت ـ نەتەوە)ەو تادوا ڕادە لەبەرامبەریدا بەتەگبیرە.

لەمیانەی کۆمەکو میراسی ئەمستردام ــ هۆلەندا هەژموونگەرایی لەندەن ـ بریتانیا تەنیا هەژموونگەراکانی ئاستی ئەوروپا (پاپایەتی، مۆنارشی فەرەنسا، هابسبۆرگەکانی نەمساو ئیسپانیا)ی پەرتەوازە نەکرد، بەڵکو هێزە هەژموونگەراکانی دیکەی ئاستی جیهانیشیان پەرتەوازە یان پارچەکردووە و بەمجۆرەش بێکاریگەری کردوون. بەجۆرێک ڕەفتاری کردووە کەشایستەی هەژموونگەرایەکە. لەسەر ڕێبازی "یان هەموو یان هیچ" نەجوولاوەتەوە. بەڵکو جموجۆڵو ڕەفتارەکانی نزیک بەنەریتی ئیمپراتۆریەتەکانی ڕۆماو ئیسلام بووە. سەدەی نۆزدەهەمی خستە ژێر فەرمانڕەوایی ئیمپراتۆریەتێک کە لەدوورگەیەکی بچووکی جیهانو ژمارەیەکی زۆر کەمی دانیشتوان هەڵکشاو باڵای گرت.

٣ــ شۆڕشی پیشەسازی ڕۆڵی سێیەمین فاکتەری گرنگ لەهەژموونگەرایی لەندەن ـ بریتانیادا دەبینێت. بەبێ شۆڕشی پیشەسازی بیرکردنەوە لەهەژموونگەرایی ئینگلیز مەحاڵیش نەبێت زۆر زەحمەتە. لەکاتی بیرکردنەوە لەشۆڕشی پیشەسازی زۆر گرنگە نەکەوینە ناو دوو هەڵەوە کە بەمەبەست ئەنجامدراون، یان بەمانایەکی دیکە سەرمایەداری ڕەوابوونی پێداونو پەردەپۆشی کردوون. یەکەمیان؛ هاوتاکردنی شۆڕشی پیشەسازییە لەگەڵ سەرمایەداریو دەوڵەت ـ نەتەوە. هیچ گومانێکی تێدا نییە کە هەم سەرمایەداری هەم دەوڵەت ــ نەتەوە پیشەسازیبوونیان کردووە بەئایین. ئیندوستریالیزم گوزارشت لەو واقیعە دەکات. بەڵام پیشەسازی دیاردەیەکی کۆمەڵگای ـ مێژوویی هێندە گرنگە کە ناشێت بۆ مۆدێلی میتۆدی ئیندوستریالیزم دابەزێنرێت. لەو بەردەی مرۆڤ سەرەتایی بەدەستیەوە گرت تا دەگاتە بۆمبی ئەتۆمی کە کۆمەڵگای مرۆڤ دروستی کردووە ڕاستی پیشەسازی جێگای باسە. بەکورتی پیشەسازی پۆلێنێکە بە قەدەر مێژووی کۆمەڵگا کۆنەو تا کۆمەڵگا هەبێت ئەویش بەردەوام دەبێت. بەبێ ئەو ناشێت بیر لەکۆمەڵگاو مێژوو بکرێتەوە.

بەڵام ئەو دیاردەیەی بەگشتی لەسەردەمی شارستانی ئەوروپا بەتایبەتیش لەواقیعی بەرجەستەی ئینگلتەرا خەست بۆتەوە، لەکۆتاییەکانی سەدەی هەژدەهەمەوە تا ڕۆژی ئەمڕۆمان هیچی لەخێرایی خۆی کەم نەکردۆتەوەو لەدۆخی تەقینەوەی شۆڕشگێڕانەوە خۆی نواندووە شتێکە زۆر لەپیشەسازی جیاوازترە. وەسفکردنی بە شۆڕشی پیشەسازی بەتەواوی ڕەوشەکە روون ناکاتەنەوە. لەمێژووی کۆمەڵگاکاندا شۆڕشی بەمجۆرە نابینرێت کە هێندە درێژخایەن بووبێتو لەدۆخی شۆکی یەک لەدوای یەک بەردەوام بووبێت. بەڵام ئەو شتگەلەی پێشکەوتنەکەی بواری پیشەسازی لەدۆخی دیاردەیەکی پەرەسەندن یان شۆڕشگێڕی دەردەخات؛ خستنە ژێر باڵی هەژموونگەرایی سەرمایەداریو دەوڵەت ـ نەتەوەیە. وەک دیار دەبێت چەکی ئەتۆمی لەسەرووی لیستەی ئەو دۆزینەوانە دێت کە هەرگیز کۆمەڵگای سیاسیو ئەخلاقی مۆڵەتی پێنادات. دەرفەتو زەمینەی بۆ نارەخسێنێت. ئەویش بەرهەمێکی پیشەسازی ناوەکییە، بەڵام ئەوەی بۆ چەکی ئەتۆمی گۆڕیوە مسۆگەرە سەرمایەداری دەوڵەت ـ نەتەوەیە. ئەم دۆخە جیاوازییەکەی نێوانیان دەخولقێنێت.

دەشێت پیشەسازیبوونو شۆڕشی پیشەسازی رووبدەنو پێویستن. بەڵام ئەوەی لەدووسەد ساڵی دواییدا لەدۆخی شۆکو لەژێر ناوی پیشەسازی ئەنجام دەدرێن دەکەوێتە چوارچێوەی ئیندوستریالیزمەوە. واتە ڕەهەندی ئایدیۆلۆژی بەدەست دێنێت. هەژموونگەرایی پشتبەستوو بەسەرمایەداریو دەوڵەت ـ نەتەوە ڕۆڵی دیاریکەری لەمەدا هەیە. کاتێک هەردووکیان بەریزە یەکتریان بەهێزکرد، ئەو کاتە دەبن بە ئامرازێک کە وێرانکاری کۆمەڵگاو ژینگە لەگەڵ خۆیاندا دێنن. لەم سۆنگەیەوە دووەمین خاڵی گرنگ ئەوەیە، لەئامرازێک زیاتر ئیندستریالیزم مەیلێکی ئایدیۆلۆژییە. ئەوەی پیشەسازی کردووە بەئایدیۆلۆژیاش دیسان سەرمایەداریو دەوڵەت ـ نەتەوەیە.

سەبارەت بەسەرمایەداری پیشەسازیبوون مانای زۆرترین قازانجە. بەدڵنیاییەوە پیشەسازیبوون دیاردەیەکە لەسەدەی نۆزدەهەمدا لەئارادابوو. پیشەسازیبوونی هەرە زێدە مانای دەستبەسەرداگرتنی

زیـــاترین قـــازانج بـــوو. بەدەســـتهێنانی تایبەتمەنـــدێتی ئـــایین‌و ئایدیۆلۆژیا، واتە بەدەستهێنانی خەسڵەتی ئیندوستریالیزم هۆکارەکەی بـۆ ئـەوە دەگەڕێتـەوە کـە بـووە بـەهێزی بەدەسـت هێنـەری زیـاترین قـازانجی ورووژێنـەرو سـەرنجراکێش. هـەرچی بـۆ دەوڵـەت ـــ نەتەوەیـە پیشەسازیبوون مانای دەسەلاتو سوپای بـەهێزە. لـەم سۆنگەیەوە ساتی مێژوویی ڕێککـەوتنی سروشـتی نێوان سـەرمایەداری‌و دەوڵـەت ـــ نەتـەوە هاتبوو. سەدەی نۆزدەهەم ئەو سەردەمەیە کـە سـەرمایەداری‌و دەوڵـەت ـــ نەتەوە لەسەر بنـەمای پیشەسـازیبوون لەبـەرزترین ئاسـتدا ڕێککـەوتنیان کردووەو پاوانەکان تێکەڵ بەیـەکتر بـوون. سـەدە شکۆمەندەکەی (سـەدەی نۆزدەهەم) ئیمپراتۆریەتی بریتانیای لەنـدەن کـە خـۆری تێـدا ئـاوا نابێـت ناوەڕۆکـو گەوهەری خۆی لەو ڕێککەوتن‌و پاوانە وەردەگرێت.

لەدۆخێکی بەمجۆرەدا نهێنی هێزی ئینگلتـەرا ـــ کـە سـەرەتـا بەرامبـەر ستراتیژییە هەژموونگەرا گەمارۆدەرەکان ستراتیژی مان - نەمانی داڕشت، دواتـــر بــــەناچاری لەئاســـتی جیهانـــدا بـــۆ بالادەســـتی هەژموونگەرایی وەرچەرخاند - ئەو ڕێککەوتن‌و پاوانگەراییەیـە کـە لەسـەر بنەمای دەوڵەت - نەتـەوەو پیشەسازیبوون بـەدیهاتووە. ئەمەیـە واقیعـی ئەو هەژموونەی ناوەڕۆکی سیستەمی شارستانی ناوەندی پێکدێنێت کـە تـا ئێستاش بەردەوامە، جیهان کۆنترۆڵو ئاراسـتە دەکـات، لـەم سـۆنگەیەوە جیهان دەچەوسێنێتەوە گورزی لێدەوەشێنێت.

بێگومـان ئـەوەی بـۆ ئینگلتـەرا دەگوترێـت بـۆ ئـەوروپاش لـەجێگای خۆیدایە. لەبەر ئەوەی خاوەن پێگەیەکی تایبەتەو هێزی لەپێشـینەی ئـەو مۆدێرنیتەیـە کـە لەسـەر سـێیانەی سـەرمایەداری، دەوڵـەت ـــ نەتـەوەو پیشەسـازیبوون جێگیـری کـردووە ئینگلتـەرا کـراوە بەناوەنـدو تـەوەری شیکارکردن. هەڵوێستی مارکس‌و ئەنگلس ڕاست بوو کاتێک لەشیکارکردنی سەرمایەداریدا ئینگلتەرایان بەبنەما گرت. ئاگـادار بـوون کـە شیکارکردنی ئینگلتـەرا مانـای شـیکارکردنی ئـەوروپا، تەنانـەت مانـای شـیکارکردنی جیهـانی داهـاتووە. چونکـە ناشـێت ئـەو سـێکوچکەی مۆدێرنیتـە بکرێـت بەموڵکی وڵاتێک یان کیشوەرێک. تەواوی بەرگرینامەکانم بـەپێی پێویست

ئەو واقیعە روون دەکەنەوە، بەڵام تاوەکو تایبەتبوونو رۆڵی شار، ناوچە، وڵاتو تەنانەت کیشوەرەکانیش نەخرێتە روو ناشێت کۆمەڵگای مێژوویی شیکارو روون بکرێتەوە. ئەوروپاو ئەو شار، ناوچەو نەتەوانەی پێکیدێنن هەریەکە واقیعێکن. هەروەها شارستانیبوونیانو گەیشتنیان بەئاستی هێزی هەژموونگەرایی شارستانی ئەویش واقیعێکە. لەکاتێکدا پێنج سەد ساڵی یەکەمی ئەم هەزار ساڵەی دوایی مێژووی ئەوروپا بەشێوەی کەمەند کێشکردنی فاکتەرو هۆکارەکانی هێزی هەژموونگەرایی ناوەندی رۆژهەڵاتی ناوین بۆ ناوخۆی تێپەڕبوو، هەرچی پێنج سەد ساڵی دواییە بەشێوەی سەرگوزەشتەی بەدەستهێنانی باڵادەستی هەژموونگەرایی تێپەڕبوو.

لێرەدا بابەتی باس نە تاکە تاکەی نەتەوەو وڵاتانی ئەوروپایە، نە سیستەمی یەکگرتووی شارستانی یاخود مۆدێرنیتەکەیەتی. لەوانەیە ئەم ناوچانە ئەو شوێنانەن کە هەرە زێدە لەمێژووی جیهانیدا لەبارەیانەوە نووسراوە. ئەوەی من دەینووسم لەوانەیە زانیاریگەلێکی ئاستی قوتابخانەی سەرەتایی بێت. نیازی منیش ئەمە نییە. ئەوەی بۆمنو ژیانم گرنگە، تەنانەت دیاریکەریشە روونکردنەوەی وەڵامی ئەو پرسیارەیە کە ئەم مێژوو و مۆدێرنیتەیە چ پەیوەندییەکی بەخۆمو کۆمەڵگاکەمەوە هەیە، لەم سۆنگەیەوە چ پەیوەندییەکی بەناوچەو جیهانەکەمەوە هەیە. سەرنەکەوتن لەمەدا مانای ئازاد نەبوونە (ژێردەستی یە). لەم سۆنگەیەوە نەگەیشتنە بەمانای ژیان. ئەرکی سەرەکی بەرگرینامەیەک؛ بەر لەهەموو شتێک روونکردنەوەی دۆخو واقیعی سەپێنراوو بەمسۆگەریش دەستنیشانکردنێکی راستی خاڵەکانی رزگاربوونو هەنگاونانە. لەدۆخێکی پێچەوانەدا جگە لەوەی لەناو چوار دیواردا سەرت لەدیوار بدەیت شتێکی دیکە ناکەیت. بەپێچەوانەی مەزەندەکانەوە ئەو دیوارەی مۆدێرنیتە ئامادەی کردووە نە ناوەوەی دیوار نەدەرەوەی هیچ یەکێکیان نابێتە چارەسەری کێشەی ئازادی و چارەسەریش نادات. ئەوەی بۆمن گرنگە، نەکەوتنە ناو ئەو پیلانە چەواشەکاریانەی مۆدێرنیتەیە. لەکاتی نووسینی ئەم دێرانەدا ئەوەی منی ئاراستەکرد بوێری پرسیارکردن بوو لەهۆکارو

چۆنیەتی دۆخی قوربانی بوونی تێکۆشەرە گەورەکانی ئازادی بەو مۆدێرنیتەیەی هەوڵی پێناسەکردنیمدا، هەروەها وەلامدانەوەیان بوو.

ب ـ توانستی مۆدێرنیتەی ئەوروپا لە چارەسەریدا

هێزی سیستەمێک لەسیستەمی شارستانیەکان لەمیانەی ئەو چارەسەرییە بنچینەییەیانەوە دەپێورێت کە بۆ کێشە کۆمەلایەتیەکانی هێناوە. سەردەمی نیولیتیک لەرێگای شۆڕشی کشتوکاڵەوە هەولیدا وەلامی ئەو کێشانە بداتەوە کە بەسەدان هەزار ساڵ مرۆڤایەتی لەناو هەلومەرجێکی ترسناکدا ژیاند. کلانە راوچیو کۆکەرەوەکانی خۆراک لەرێگای شۆڕشی کشتوکاڵەوە ئەم هەلومەرجانەی خۆیان نەرمتر کردو لەمیانەی پەرەپێدانی بەهرەی بەکۆمەڵگابوون بەدوای چارەسەریدا گەڕان. بێگومان ئەوە هەڵمەتێک بوو کە بەناوی مرۆڤایەتییەوە ماناکەی زۆر بەرز بوو. ئەم سەردەمە لەمیانەی ژیانێکی هەزاران ساڵە کاریگەریو شوێنپەنجەیەکی قووڵی خۆی لەسەر ویژدانو هزری کۆمەڵکاری مرۆڤایەتی بەجێهێشت. ئەوەش راستیەکی مەزنە کە تا رادەیەکی زۆر کۆمەڵگای مرۆڤ زادەی ئەو قۆناخەیە. تەنانەت کۆمەڵگای رۆژی ئەمڕۆشمان پشت بەو کۆمەڵگایە دەبەستێت. ئەو پرسیارەش جێگای بیرکردنەوەو تێڕامانە: ئاخۆ ئەو کۆمەڵگایە لەژێر ئەوەی ئەمڕۆ رابکێشینەوە چی دەمێنێتەوە؟ پێویستە هیچ کاتێک لەبیر نەکەین ئەگەر تا ئێستاش خاوەن خەونو خەیاڵی لەجۆری پیرۆزی، خودایی، پەرچوو و بەهەشتین ئەوا پاشماوەی ئەفسوونو گەورەیی ئەو کۆمەڵگایەیە.

چەندین نیشانەی مێژوویی دیاری دەکەن کە کێشەی سەرەکی ئەو کۆمەڵگایە مەسەلەی ئاسایش بووە. ئەو دەوڵەمەندێتیەی کشتوکاڵ رێگای لەپێش کردەوە شوێنەکانی نیشتەجێبوونی دەکرد بەئامانجێکی کراوەی پەلامارە دەرەکیەکان. تەنیا ئاژەڵە دڕندەکان سەرچاوەی هێرش نەبوون، بەڵکو جڤاتەکانی دیکەو پیاوە بەهێزو فێڵبازیەکانیش هێرشیان دەکرد. شۆڕشی شار زیاتر وەلامی کێشەی ئاسایشی دەدایەوە. قەلا، شووراو بەڕێوەبەرایەتیەکەی مانای زیادبوونی ئاسایش دەبەخشێت. ئالێرەوە کاتێک لەچوارچێوەی پەرەسەندنی کۆمەڵگادا شار وەک سەرەتای مێژوو

جێی خۆی دەگرێت گرنگیەکەی دەخاتە روو. هەرچەندە پەلاماری بەربەرە دەرەکیەکانی سنووردارێش بکات، ئەو جارە ئەو دیاردانەی چین‌و دەوڵەت کە خۆی لەناوەوە رێگای لەپێش کردەوە ناوەڕۆکی کێشەی کۆمەڵایەتی پێکدەهێنا. لەچارەسەرکردنی کێشە کۆمەڵایەتیەکان زیاتر رێگای لەپێش کێشەی زۆر نوێتر کردەوە.

جیاوازی چینایەتی‌و بەڕێوەبەرایەتی دەوڵەتی شارستانی پیشتبەستوو بەزێدە بەرهەم کۆمەڵگای بەدیاردەی پاوان ئاشنا کرد. پیاوی بەهێزو فێڵبازیش وەک پاوانێکی بەکۆمەڵ خۆی نوێکردەوە. هەرچی کێشەی ئاسایشی کۆمەڵگایە لەلایەن ئەو ئەندامانەی لە هەناویەوە دەرکەوتوون بۆ کێشەی گەورەتر وەرچەخان. خودی دەوڵەت کەخۆی وەک ئامرازی بەدیهێنانی ئاسایش دەناساند بوو بەسەرەکیترین ئامرازی نەهێشتنی ئاسایش. لێرەوە بەمانایەک لەماناکان مێژووی شارستانی چیرۆکی وەرچەرخانی دەوڵەتە لەئامرازێکی ئاسایشەوە بۆ دژەکەی. پەیوەندی دیالیکتیکی راستەقینە لەمیانەی دوالیزمی ئاسایش ــ نائارامی لەدامەزراوەبوونی سیاسەت ــ دەسەڵات ــ دەوڵەتدا رەنگدەداتەوە. بەسیفەتی پرۆسەو قۆناخی شار ــ دەوڵەت ــ شارستانی مێژوو مانای دیرۆکی کێشە کۆمەڵایەتییە کەڵەکەبووەکان‌و تێکۆشانە پەرەسەندووەکان دەبەخشێت. وەک دوو ڕووەکەی مەدالیایەک ئەگەر لەرووپەکیان شار ــ دەوڵەت ــ شارستانی نووسرابێت ئەوا رووەکەیتر دیموکراسی ــ یەکسانی ــ ئازادی لەسەر دەنووسرێت.

ئەو مێژووە دەهەزار ساڵییەی هیلالی بەپیتی دەورەدراو لەلایەن زنجیرە شاخی زاگرۆس ــ تۆرۆسەوە کە دەتوانین پێنج هەزار ساڵی دوایی وەک شارستانی ناوەندی بخەینەڕوو رووباری بنەڕەتی مرۆڤایەتییە. هەرچەندە شارستانی دیکەش سەرهەڵبدەن، لەئاکامدا لەرژانە ناو ئەم رووبارە شەرەکییە رزگاریان نابێت. بەهۆی گەڕان بەدوای رێگەچارەی ئەو کێشە کۆمەڵایەتییانەی گەورەو هەمەجۆر بوون مێژووی پێنج هەزار ساڵەی شارستانی ناوەندی چیرۆک‌و باسی قووڵبوون‌و بەرفراوانبوونی هەژموونگەراییە. بەردەوام ئەو باس و گێڕانەوە بریتی

بوو لەتێکەڵێکی میتۆلۆژیا، ئایین، فەلسەفە، هونەرو زانست. لەبەشەکانی پێشووتری بەرگرینامەکەمدا هەوڵی خستنەڕووی ئەم باسانە دراوە.

ئەو هێزە هەژموونگەرایانەی هەرە دوایی لەژێر ناوی ئیسلام خۆیان کرد بەنوێنەری هیچ خەیاڵیان نەکردبوو کە شارستانی ناوەندی لەجوگرافیای خۆرهەلاتی ناوین دەردەکەوێت. چونکە چەمکی چارەنووسی نووسراو مەسەلەیەکی باوەڕی بوو. کێشەکانی چەندەش گەورە بێت هەروەکو هەزاران ساڵی رابردوو دیسان لەو خاکە بەدوای چارەسەریدا دەگەڕان. چونکە ئەو شوێنە پیرۆزە بوو کە گشت خوداوەند، ماڵی خوداوەندەکان، پێغەمبەران، داناکانو سەرجەم قەبیلەو قەومە رەسەنەکان، هەرجۆرە میتۆلۆژیا، ئایین، فەلسەفەو هونەر ـ زانستێک رۆحیان بەبەرهاتو گیانی خۆشیان تێدا رادەست کردەوە. هەروەها ئەو شوێنە بوو کە زەمانیشی تێدا پیرۆزکرا. نیشتیمانی دایکی کلتووری مەعنەویو بەرهەمهێنان، بازرگانی، پارەو بازاڕبوو بەو سیفەتەی ئابوورییە. لەکاتێکدا لەسەرەتاکانی سالانی ١٠٠٠ زایینی شارە کەناریەکانی نیمچە دوورگەی ئیتالیا بۆ یەکەمین جار دەردەکەوتە سەر شانۆی مێژوو، هێشتا ئەوروپا زۆر دووری شارستانی بوو. تازە فەتحکردنی لەلایەن ئایینی مەسیحیەوە تەواو ببوو کە بەشێکی کلتووری خۆرهەلاتی ناوینە. شۆڕشی شارەکان یەکەمین هەنگاوی خۆیانیان دەهاوێشت. تەنانەت لەلایەن هەژموونگەرا رۆژهەلاتیەکان ئەوروپا شایستەی داگیرکردنیش نەدەبینرا، هێندە هەژاربوو خەرجی داگیرکردنەکەی خۆشی دابین نەدەکرد.

ئەو شەڕو پەلامارانەی شارەکانی ئیتالیا لەسالانی ١٠٠٠ زایینی بۆ سەر خۆرهەلاتی ناوین دەستیان پێکرد تەواو سەرکێشیو ماجەڕابوو. وەک ئەو کردەوانەی دۆزینەوەو کەشفی زەمینی خۆرهەلاتی ناوین بوو بەر لەزەریای ئەتڵەسی. رۆژهەلاتی ناوینیان فەتح نەکرد، بەلام بەر لەهەموو شتێک ئەو دەستەواژە، رێسا، یاساو گوزارشتە دامەزراویانەیان گواستەوە کە بۆ ئەوروپا مانایەکی ژیانی هەبوو. ئەوەی جێگای باسە بازرگانیی

زانیاریو مەعریفەیە. دوای ئەویش بازرگانی بەرهەمە ماددیەکان پەرەی پێدرا. تا ساڵانی ١٢٥٠ئەم کارەی گواستنەوە بەهەموو خێراییەکەیەوە بەردەوام بوو. هێرشی خاچپەرستەکانیش تەنیا رووی سەربازی ئەو گواستنەوەیە بوو. هەرچی چیرۆکی ئەوروپای دوای ئەو مێژووەیە زۆر باشتر دەزانرێت. هەوڵی پێشکەشکردنی گەلاڵەیەکیماندا. ئەم مێژووانە لە هەمانکاتدا ئەو دیرۆکەن کە کۆمەڵگاکانی خۆرهەڵاتی ناوین کەوتوونەتە ناو کائۆسو گێژاوەوە.

ئەو پرسیارە سەرەکییەی پێویستە بوروژێنرێت؛ لەکاتێکدا لەگۆڕەپانو بوارەکانی بەرهەمهێنان، بازرگانی، پیشەو دراودا لەکەنارەکانو ناوەوەی ئەوروپا شۆڕش لەئارادا بوو، بۆچی خۆرهەڵاتی ناوین لەو بوارە هاوشێوانەی تێیدا باڵادەست بوو بەبەستەڵەکی وەستابوو؟ لەکاتێکدا ئەوروپا لەئایینەوە هەنگاوی بۆ فەلسەفە دەهاوێشت، بۆچی خۆرهەڵاتی ناوین فەلسەفەی دەخنکاند؟ دەشێت بەمجۆرە هۆکارە سەرەکیەکەی روون بکەینەوە؛ واتە کۆمەڵگاکانی خۆرهەڵاتی ناوین لەمیانەی فیکرو تەکنۆلۆژیا کۆنەکانەوە دەیانتوانی بەپێی پێویست زێدە بەرهەم بۆ هێزە هەژموونگەراکان دەستەبەر بکەن. چونکە خۆرهەڵاتی ناوین نوێنەرایەتی کۆمەڵگایەکی دەکرد کە خودبژێوی بەشی بوو. بەڵام لەکۆمەڵگای ئەوروپادا رەوشێکی پێچەوانە جێگای باس بوو. هەرچی جیانەبوونەوی فەلسەفەیە لەئایین دەشێت بەبەس بینینی ئامرازی دەسەڵات روون بکرێتەوە. لەبەر ئەوەی ئایین مەشروعیەتی پێویست بۆ سوڵتانەکان دەستەبەردەکات، هەربۆیە پێویستی بەرەوابوونی فەلسەفی نابینن. لەکاتێکدا بەر لەهەزاران ساڵەوە میکانیزمەکانی دەسەڵات مانای خۆیان لەپیرۆزیەکانی ئاییندا دۆزیوەتەوە، ئاڵۆزکردنی مێشکی خەڵک لەرێگای فەلسەفەوە سوودی بۆ هیچ هەژموونگەراو زۆردارێک نییە. پێویستە زۆر بەباشی دەرک بەم لایەنەی باوەڕمەندێتی خۆرهەڵاتی ناوین بکرێت.

باوەڕمەندی ئامرازێکی زۆر بەکاریگەری رەواکردنی دەسەڵاتە. لەم سۆنگەیەوە دەرفەتدان بەجیابوونەوەی فەلسەفەو زەمینە سازکردن بۆ پاوانەکانی دەسەڵاتی جێگیر دەسپێشخەرییەکی مەترسیداربوونو مەحاڵ

بوو ریگای پێبدرێت. هەروەکو چۆن کارل مارکس بەناوی زانستەوە فەلسەفەی لەسەر تەخت هێنایە خوارەوە، هاوشێوەی ئەو ئیمام غەزالیش بەناوی ئایین فەلسەفەی مەحکومو ریسواکردبوو، هەردووکیشیان هێندە وابەستەی باوەڕیو هزرەکانیان بوون کە تێنەگەن چۆن بوونەتە ئامرازێکی دەستی ئەو هێزانەی لەدژیان دەجەنگان. کۆمەڵگای ئەورووپی دەرگای خۆی لەبەرامبەر هەردوو شۆڕشی کلتووری ماددیو کلتووری مەعنەوی کردەوە. هەروەکو چۆن زانیوویەتی پێویستیەکان لەدەرەوە وەربگرێت، لەناوەخۆشیدا کاری لەسەر دەرکردو بەسەنتێزی نوێی دەگەیاند.

هەوڵی پێناسەکردنی خزانی رێبەرایەتیو شوێنی شارستانی ناوەندی پێنج هەزار ساڵەی خۆرهەلاتی ناوین دەدەین. هەندێک جار پێویستی گەورەترین هێزی شۆڕشگێڕییە. ئەو شتگەلانەی ئەوروپا پێویستی پێیان هەبوو ئەمجۆرە رۆڵە شۆڕشگێڕیەیان بارکردبوو. لەئەستۆگرتنی رۆڵی شۆڕشگێڕی مانای چارەسەرکردنی کێشە کۆمەڵایەتییە سەرەکیەکان دەبەخشێت. با شیکاری بکەین کە قۆناخی شارستانی ئەورووپا (شێوازی ژیان کە بەفەرمی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری پێدەڵێن) لەرێگەی هەرسێ پێکە سەرەکیەکەیەوە هەوڵی چارەسەرکردنی کام لەکێشە بنچینەییەکانی داوە.

## أ . سەرمایەداری

خودی سەرمایەداری یەکەمین پێچکەی (کۆڵەکە)ی مۆدێرنیتەیەو لەجێگای رۆحو مێشکی سیستەمدایە. هەوڵی سەلماندنی ئەو راستیەماندا کە ئەو جانەوارەی بەدرێژایی مێژووی شارستانی لەناو قەفەسدا هەوڵی بەندکردنی دراوە، بووە بەمێشکو دڵی سیستەم، هێزی ئەقڵو سۆزی، نەک هەر تەنیا چارەسەری لەگەڵ خۆیدا نەهێناوە بەڵکو بۆخۆی مانای ئیفلاسکردنی سیستەمەکەکانی شارستانییە کە بۆ خۆیان بوونەتە سەرچاوەی کێشەکان. بونیادەکانی شارستانی لەبنەرەتدا مانای ئەو کۆمەڵگایەیە کە پاشەکشێی پشت شوراکانی شاری کردووە. دەشێت وەک کۆی ئەو بونیادە کۆمەڵایەتیانەش پێناسەبکرێت کە لەپشت شوراکانی شار

سەرلەنوێ ئاواکراوەتەوە. کەمی و ناتەواوی شورا سروشتیەکانو زیادبوونی جیاوازی چینایەتی، بەڕێوەبەرایەتی سڤیلی ناچار کردووە پلەداری بەشێوەی ئەو دامەزراوە ڕێکبخات کە بەدەوڵەت ناودەبرێت. ئەو بوویەرانە دووبارە ناکەمەوە کە لەبەشەکانی پێشووتر شیکارمان کردوون. نەک هەر کێشەکانی کۆمەڵگا بەدەوڵەت چارەسەر نەکرا، بەڵکو لەبواری چوارچێوەو بەرفراوانیەوە زیادی کرد. چەندە دەوڵەت پەرەیسەندووەو گەورە بووە، بەو ئەندازەیە پەرەسەندنو گەورەبوونی کێشە کۆمەڵایەتیەکان جێگای باسە. بەشێوەیەکی بەرجەستە ئەمەش مانای چەوسانەوەو فشاری زیاتر بوو. سەرباری ئەوەی لەئاکامی ئەو شەڕانەی تا سەردەمی شارستانی سەرمایەداری ڕوویانداوە کارەساتی گەورە لەناو کۆمەڵگای مرۆڤایەتیو ژینگە هاتنە ئاراوە، بەڵام دۆخی بەردەوامنەبوونی کۆمەڵگاکان جێگای باس نەبوو. چونکە ئاستی سەرکوتکردنو چەوسانەوە ڕێژەیەکی کەمی جڤاتە مرۆییەکانی دەگرتەوە. تەنانەت بژاردەترین فیرعەونو نەمرودەکانیش هێزەکانیان لەوالیەکانی ڕۆژی ئەمڕۆمان بەکاریگەرو دەستڕۆتر نەبوون. سەرۆک وەزیرانی سوێد کە خۆی بەدیموکراسیخوازترین کەس دادەنێت، خاوەن هێزو دەسەڵاتێکە دە ئەوەندی هی سوڵتان سلێمانە. کۆی سەرجەم ئەو چەوسانەوە (کۆی زێدە بەهاکان) یەی تا سەردەمی سەرمایەداری ئەنجامدراوە لەقازانجی ساڵێکی سەرمایەی جیهانگیری ڕۆژی ئەمڕۆمان زیاتر نییە. پێویستە لەمیانەی ئەو ڕاستیانەوە هەوڵی دەرک پێکردنی ترسوسامی ئەو چەوسانەوەو سەرکوتکردنە بدەین.

ئەو مێشکەی سەرمایەداری خستویەتیە سەری مرۆڤەوە خودی ترسو سامناکییە. لەمیانەی شەڕی ئەو پێنج سەدەیەی دوایی، تەکنۆلۆژیای ئەو شەڕانەو ستراتیژیەکانی ژێریەوە چی ئەنجامداوە؟ ئەگەر بڵێین ژمارەی ئەو کەسانەی لەقۆناخی پێنجسەد ساڵی دواییدا کوژراون دوووهێندەی ژمارەی ئەو کەسانەیە کە بەدرێژایی مێژووی شارستانی لەشارەکان کوژراون؛ ئەمە دان پێدانانی بەشێکی زۆر سنوورداری ڕاستییە. مەترسیدارتریش ئەوەیە؛ لەڕێگای ئەو شەڕانەوە چەندین گەل، کلتوور،

قەبیلـە، چـین، گـروپو بـەهای مـاددی لـەناوبران؟ جگـە لەدەسـتەیەکی ئۆلیگارشـەکان، بەشـێکی زۆری مرۆڤایـەتی چـۆن لـەدۆخی کۆیلـە هاوچەرخـەکان (پرۆلیتـار ــ کارکـەر) سـەرلەنوێ بونیادنرایـەوە؟ چـۆن ویستیان زەریای مرۆڤایەتی بەرفراوان لەناو زری چەند سەد نەتەوەیـەکی فەرمی بەند بکەن؟ چۆن مرۆڤ کرایە گورگی مرۆڤ؟ چۆن تـەواوی کۆمـەڵگا کرا بە ژن؟ ئەو زۆرداریيەی دوای کۆمەڵگا بۆ سـەر سروشت درێژبوویـەوە چۆن رێگای لەپێش ژینگەیەک کردەوە کە چیتـر بـەردەوام نـەبێت؟ دەشـێت پرسیاری هاوشێوە سەبارەت بەکێشە سەرەکیەکان زیاتر بکەین.

سەرمایەداری سیستەمێکە هێشتا شیکار نـەکراوە. سـەرباری هـەوڵ و بانگەشـەکانی مـارکسو مارکسیسـتەکان بـۆ چارەسـەری، بـەڵام مـەحاڵە ناتوانین بڵێین سـەرکەوتوو بـوون. تـەواوی نیشـانەکان پێمـان دەڵـێن کـە تەواوی رەخنەکانیان سەبارەت بەسەرمایەداری لۆژیکی بۆرژوازی بچووکی تێپەڕ نەکردووە. رەخنەکانی بۆرژوازی بچـووکیش لەئاسـتی هـەرە بـەرزی خۆیـدا جگـە لەبیروکراسـی سـەندیکاو سـەرمایەداری دەوڵـەت ئـەنجامێکی دیکەی لەگەڵ خۆی نـەهێناوە. پێویسـتە بـاش بزانرێـت کـە لـۆژیکی زاڵـی سەردەمەکەمان بەگوێرەی سیستەمی سەرمایەداری دیـزاین کـراوە. جیهـانی ئەکادیمیو زانستی ئێستاش شوێنی ئافرانـدنی ئـەو لۆژیکەیـە. ئەکادیمیـە زانسـتیەکانی رۆژی ئـەمڕۆمان وەک شـوێنی ئافرانـدنی میتۆلۆژیایـەک ئاوێتەی دەسەڵاتی سیاسی بووە کە زۆر لەزەقورەکانی سۆمەر ئـاڵۆزترە. لـەئامرازە رووتـەکانی باڵادەسـتی زیـاتر ئـەو میتۆلۆژیانـە بـەرخودانی کۆمەڵگایان تێکشکاندووە کە لەم شوێنانەوە بەناوی زانست دەئـافرێنرێن. ئەوەی جێگای باسە فریودانو خەڵەتاندنێکی زۆر لەوەی چاخەکانی ناوین زیاتر لەئارادایە.

هەرچی پێگەی هونەری کۆمەڵایەتی کۆمەڵگایە کە هەسـتو سـۆزەکانی مـرۆڤ شـکۆمەندو جـوان دەکـاتو خەسـڵەتی ئاشـتیخوازی پێدەبەخشـێت بەتەواوی بۆ دژەکەی وەرچەرخێنراوە. ئەو تامـەزرۆیی‌و شـەیدایيەی جگـە لەدەسکەوتی قـازانج هـیچ جـۆرە دەسـکەوتێکی دیکـە ناناسـێت، لـەپێناو گەیشتن بەئامانج قۆستنەوەی هەسـتو سـۆزەکانی جـوانی، شکۆمەندی و

ئاشتی وەک خودی هونەر پێشکەش دەکات. هەر مرۆڤێک بۆ بەدەستهێنانی خەڵاتی بەڵێن پێدراو کراوە بەئەسپی مەیدانەکانی پێشبڕکێ. لێرەدا شێوازێکی ژیان جێگای باسە کە هیچ بوونەوەرێکی زیندوو پەسەندی ناکات. نەخۆشی شێرپەنجە نەخۆشیەکی نموونەییو ڕەسەنی مۆدێرنیتەی سەرمایەدارییەو ریشەیەکی کۆمەڵایەتی پەیوەست بەسیستەمی هەیە. هیچ شتێک بەقەدەر نەخۆشی شێرپەنجە هێزی ڕوونکردنەوەی ڕاستی سەرمایەداری نییە. ئەنجامی مسۆگەری ڕەنگدانەوەی ڕۆجی سیستەمە لەسەر جەستەی مرۆڤ. لەوانەیە لەسیستەمەکانی پێشووتر و هەندێک بوونەوەردا بەشێوەیەکی دەگمەن چەند بوویەرێکی سنووورداری شێرپەنجە ببینرێت. دەشێت سێبەری (پاوان)ێک لەرەگو ریشەی ئەمانەدا ببینرێت کە لەسەر ژیاندا وێناکراوە. بەڵام لەسەردەمی سەرمایەدارییدا هیچ یەکێک لەئۆرگانو پێکهاتەکانی مرۆڤ نەماوە جۆرێکی تایبەتی شێرپەنجەی نەبێت. ئەمەش ڕاستیەکی حاشا هەڵنەگرە ئەو شێرپەنجەیەی لەسەرجەم ئۆرگانەکانی جەستە بەدەرکەوتووە سیستەمی شارستانی سەرمایەداری ئاشکرا کردووەو داویەتیە دەستەوە.

هێزە هەژموونگەراکانی ئەوروپا ئەو کێشانەیان چارەسەر نەکرد کە هەژموونگەرا کۆنەکان (کڵێسا، پاشایەتی، میرنشینەکان)ڕێگایان لەپێش کردبوویەوە. لەمیانەی پڕۆژەی "کۆمەڵگای هۆمۆژەن" دەستو پێیەکانی هەژموونگەراکانیان بڕیو یەکسانی کردن. کۆمەڵگای هۆمۆژەن بەرزترین ئاستی پێشکەوتوویی کۆمەڵگای کۆیلەیە. هیچ کۆمەڵگایەکی چینایەتی بەقەدەر سەرمایەداری هێزی ئافراندنی کۆیلایەتی نییە. بەپێچەوانەی مەزەندەکان کۆیلایەتی چاخەکانی یەکەمو ناوین لەدۆخێکی خراپتری هەلومەرجەکانی سەرمایەداریدا نەبوون. گرنگترین نیشانەش لەو سەردەمانەدا جێگای دیاردەی (کۆیلەی بێکار) نەبوو. (کۆیلەی بێکار) سەیرترین شێوەی کۆیلایەتییە کە مێژوو ئاشنای بووە. چونکە هەرگیزاو هەرگیز هیچ شێوەی کۆیلایەتیەک لەئارادا نەبووە کە هێندەی بێکاری مرۆڤ بچووک بکاتەوە، بەکەمی بزانێتو بیکات بەهیچ. هەروەکو باسدەکرێت مێژووی سەرمایەداری تەنیا دیرۆکی گۆڕینی لادێییو

پیشەگەران نییە بۆ کارکەرو پرۆلیتاریا، بەڵکو لەوە زیاتر مێژووی گۆڕینیانە بۆ بێکارو لۆمپان پرۆلیتار. ئایا سەبارەت بەکۆمەڵگایەک دەشێت بیر لەکێشەیەکی لەوە گەورەتر یان بیر لەکارەساتێکی لەوە گەورەتر بکرێتەوە؟

نەک تەنیا ئایدیۆلۆگە لیبراڵەکان بەڵکو بەهۆی کاریگەری مۆرکی بۆرژوازی بچووک بەسەریاندا هەر جۆرێکی زاناکانی زانستی کۆمەڵایەتی، سۆسیالیست، مارکسیستەکان توانا و بەهرەیان نەبووە لەسەر بنەمای پێناسەکردن و دەربازکردنی سەرمایەداری و بەرگریکردن لەکۆمەڵگا هێزی تێکۆشان بنوێنن. لەم لایەنەوە نکوڵی لەهەوڵو کۆششەکانیان ناکرێت؛ بەڵام ئەو راستیەش ئاشکرا بووە کە ئاسۆی بینایییان شێواوەو هەڵخەڵەتاوە، ئیرادەی تێکۆشانیشیان لاوازو ناتەواو بووە. ئەگەر ئەو کۆمەڵگایەی سەرمایەداری لەناوی بردووە لەمیانەی راوەستەی بەرگری خۆیی و هەڵوێستێکدا بەرگری لێنەکرێت کە بەگشتی مێژوویبوونەکەی و سەرجەم بوارەکانی لەخۆوە دەگرێت ئەوا رابوون و پێهەڵگرتن ئەنجام نادرێت.

پێویستە زۆر باش بزانین کە سەرمایەداری بەهۆی شارستانی ناوەندییەوە هەڵکشا کە پشتی پێدەبەستێت، لەو رۆژەی کە قەفەسی خۆی شکاندووە (پەیوەندی نێوان رۆشنگەری و دەرکەوتن لەقەفەسدا شایستەی لێتوێژینەوەیە. خراپترین ئازادیش ئازادبوونە لەو قەفەسە) بووە بەجیهانگیری و سیستەمی جیهانگەرایی وەرچەرخاندووە. هەر کەس لە (قەیرانی سەرمایەداری فینانسی جیهانگیری)رۆژی ئەمڕۆمان سەری سوڕماوە. حیسابی ئەوە دەکرێت کە ئەو زێدەبەهاو بەرهەمانەی بەبێ کارکردن و تەنیا لەرێگای یاریکردن بەئامرازەکانی دارایی لەم قۆناخەی قەیران بەدەست هێنراوە، زۆر لەو چەوسانەوە زیاترە کە بەدرێژایی مێژووی شارستانی ئەنجامدراوە. هیچ قەیران و دیاردەیەک وەک ئەو قەیرانە هەنووکەییەی فینانس بەباشی سەرمایەداری روون ناکاتەوە؛ وەک ئەو قەیرانە روونی ناکەنەوە کە سەرمایەداری بازاڕو ئابووری نییە. یەکێک لەلایەنە گرنگەکانی بەرگرینامەکەم ئاشکراکردنی بناخەی مێژوویی

ئــەم دیاردەیـــە، خســـتنەڕووی بونیـــادە بەکێشـــەکەی شارســـتانیو ڕۆشنکردنەوەی ئـەو واقیعـەی کـە سـەرمایەداری دۆخـی گشـتگیری ئـەم بونیادەیـە. قـەیرانی فینانسـی جیهـانگیری کـە بەکاریگـەرترین قۆنـاخی قەیرانی بونیـادی سـەرمایەدارییەو تـا ئێسـتاش بەردەوامـە؛ بەشێوەیەکی سەرنجڕاکێش ئەم ڕاڤە مێژووییە دەسەلمێنێت.

لەکاتێکـدا قـەیرانی فینانسـی جیهـانگیری لەناوەنـدە سـەرەکیەکان (ئەمریکا ـ یەکێتی ئەوروپا) یان لەتەواوی جیهان بڵاودەبێتەوە ڕزگاربوون لەو کائۆسە چۆن دەبێت کە ڕێگـای لـەپێش کردۆتـەوە. کاتێـک سیسـتەمی جیهـانی سـەرمایەداری لەمیانـەی قـەیرانی جیهانگیرییـەوە سـەرلەنوێ بەکاریگەریەکی شلەژێنەر لەناوچـەکانی شارسـتانی ناوەنـدی ڕۆژهـەلاتی ناوین ڕەنگبداتەوە کە لەشوێنیدا ئاواکراوە ڕێگا لـەپێش چـۆن کاردانـەوەو پەرچەکردارێک دەکاتەوە؟ ئیسلامی سیاسـی چییـە؟ ئایـا دەشـێت ئیسـلامی دەسەڵات بەتەواوی بە ئیسلام دابنرێت؟ سەرلەنوێ ئیسـلامبوونو ئیسـلامی رادیکـاڵ تـاچ رادەیـەک دژە سـەرمایەدارین؟ تـا چ رادەیـەک ڕووبـەڕووی فاشیزمێکین کە بەئیسلام دەمامکدراوە؟ لەپێناو وەڵامێکی شایسـتە بـۆ ئـەو پرسیـارانە پێویسـتە تەماشـای توانـای چارەسـەریو ئـەو کێشـە نوێیانـە بکـەین کـە دوو کۆڵەکـە سـەرەکیەکەی دیکـەی مۆدێرنیتـەی سـەرمایەداری ڕێگایان لەپێش کردۆتەوە.

## ب . دەوڵەت ـ نەتەوە

دووەمین کۆڵەکە گرنگەکەی مۆدێرنیتەی ئـەوروپا دەوڵـەت ـ نەتـەوەی بونیادنراوە. ئەویش بەلانی کـەم بەقـەدەر خـودی سـەرمایەداری لـەجیاتی گەلاڵەکردنی چارەسەری کۆمەڵایەتی، گوزارشت لەو سیسـتەمە دەکـات کـە کێشـەی کۆمەڵایـەتی تێیـدا بەبـەرزترین ئاست گەیشتووە. وەک مەزەنـدە دەکرێـت سـەرمایەداری پەرەسـەندنی ئـابووری نییـە؛ بـەڵکو دۆخـی سیستەماتیکی نکوڵیکردنی ئابوورییە. هەرچی دەوڵـەت ـ نەتەوەیـە وەک چۆن پیشاندەدرێت فۆرمی سەرەکی دیموکراسی، ئازادیو مافـەکانی مـرۆڤ نییە؛ بەڵکو سیستەمی نکوڵیکردنی ئـەو بەهایانەیـە. بـەهۆی پێشخسـتنی تیۆری، بەرنامەو ڕێکخستن دەرهـەق بـەم دووبابەتـە بـەلانی کـەم ڕەوتـە

سۆسیالیستو مارکسیستەکانیش هێندەی بۆرژوازییە لیبراڵەکان سەبارەت بەشێواندنی واقیعی کۆمەڵایەتی بەرپرسیارێتیەکی گەورەیان دەکەوێتە ئەستۆ. هەڵبەتە گووتەی دەوڵەت ــ نەتەوەی ناوەندی = سەرمایەداری هاوکێشەیەکی راست نییە. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا پێویستە زۆر باش تێبگەین تاوەکو کۆمەڵگا نەخرێتە ژێر حوکمڕانی ئەو دیکتاتۆریەتەی سەرلەنوێ لەمیانەی شێوازی دەوڵەت ـ نەتەوە بووە بەدامەزراوەیی ئەوا بەڕووی چەوسانەوەی سەرمایەداریدا ناکرێتەوە.

ناوەڕۆکی پەیوەندی نێوان دەوڵەت نەتەوەو سەرمایەداری بەجۆرێک تەواوی بونیادە کۆمەڵایەتی ـ ئابووریەکانی بەقووڵاییو فراوانی بەڕووی چەوسانەوە کردەوە کە لەمێژوودا هاوتاکەی نەبینراوە. چونکە دەوڵەت ــ نەتەوە بۆخۆی تەنیا بەسیفەتی شێوەی بەرزترین دەسەڵات دەرفەت بەچەوسانەوەی سەرمایەداری دەدات. گەورەترین گوناهی کارل مارکس لەوەدایە؛ بەبێ ئەوەی ئەم شێوازەی سەرلەنوێ بونیادنانەوەی دەوڵەت شیکار بکات، هەوڵیداوە ئابووری وەک سیستەمێک شیکار بکات کە لەسەرجەم ئابووریەکان پێشکەوتووترە. لەوەش مەترسیدارتر کارەکتەری دژە ـ ئابووری سەرمایەداری دەستنیشان نەکردووە.

هەروەکو چۆن لەچاخەکانی یەکەمو ناوین سیستەمەکانی چەوسانەوەو زۆرداری لەرێگای میتۆلۆژیاو ئایدیۆلۆژیا ئایینیەکانەوە رەواکراون، لەسەردەمی مۆدێرنیتەی سەرمایەداریشدا دەوڵەت ــ نەتەوە لەمیانەی ئەو وێنا زهنیانەی بەخەستی لەدەوروبەری ئاواکراوە رەوا بوونی پێدراوە تا ئێستاکەش دەوڵەت ـ نەتەوە لوغزێکی نەزانراوە. ئەو دەوڵەت ـ نەتەوەی بەردەوام شکۆدار دەکرێت، خوێنی لەپێناو دەرژێنرێتو گیانی بۆ بەخت دەکرێت خوداوەندە راستەقینەکەی مۆدێرنیتەیە. زۆر بەدڵنیاییەوە دەتوانم بڵێم؛ دەستەواژەی ئایینو خوداوەند بەگشتی بناخەی دەوڵەت بەتایبەتیش بناخەی دەوڵەت ـ نەتەوە پێکدێنن. بەواتایەکی تر باسو گێرانەوە میتۆلۆژیو ئایینیەکانی یەکەمین جووڵەو بزاوتەکانی زهنی ئەنالیتیکی جۆری مرۆڤن لەلایەن خاوەنی هێزو بەرژەوەندییە ماددیەکانەوە هەوڵی بۆ دراوە بەشێوەی دەوڵەت بەرجەستەبێت. بەمجۆرە

لەمیانەی هاوکێشەی یەکسانکردنی خوداوەندو دەوڵەت گۆڕانکاری و پەرەسەندنی بەکاریگەرو سەرنجڕاکێش هاتوونەتە ئاراوە.

لەئایدیۆلۆژیای یەهوودیدا سەردارو خوداوەند هەمان ناویان هەیە؛ رەب. چەندە رەب لەچوارچێوەی شەخس دەردەکەێتو دەبێت بەدامەزراوە لەدۆخی دەوڵەتدا مانادار دەبێت. هیگل یش ئەم پرۆسەیەی بۆ زمانی فەلسەفە وەرچەرخاندووە. خۆی گوتوویەتی؛ خوداوەند لەشێوەی دەوڵەت ـ نەتەوە لەسەر زەوی دەوڕات. ئەو ئەنجامەی کارل مارکس لەم باسەی هەڵهێنجاوە؛ ئایدیۆلۆژیا ئایینیەکان دیاردەگەڵێکی وەهمین (داهێنانی دروستکراون). لەم سۆنگەیەوە بەشایەنی بایەخ پێدانی نەزانی، یان گرنگیەکی زۆر کەمی پێدراوە. ئەم هەڵوێستە رۆڵێکی زۆری لەخزانی مارکس بۆ ماتریالیزمی قەبا بینیوە. لەرێگای سەرکۆنەکردنو ریسواکردنی میتافیزیاوە پۆزیتیڤیستەکانیش لەو بڕوایەدابوون کە قۆناخێکیان بڕیوەو چوونەتە قۆناخێکی دیکەوە؛ لەقۆناخی میتافیزیاوە هەنگاونان بۆ قۆناخی زانست. لەدەرەنجامی پراکتیزەکردنێکی زۆر خراپی سۆسیۆلۆژیاوە کەوتنە ناو زێدەڕۆییترین گێڕانەوەو باسی ئەوپەڕگەری کە کۆمەڵگا بۆ کۆمەڵێک ماتریالو شتومەک دەگۆڕێت. مارکسو ئەنگلس بەرادەیەک لەناو نەتەوەپەرستی چینایەتیدا خنکانو بێئاگابوون کە لەمیانەی راگەیاندنی دەوڵەت وەک سوودبەخشو سەرکەوتووترین شێوە بۆ پرۆلیتاریا، چۆن زەبرێکی کوشندەیان لەتێکۆشانی چینایەتی وەشاندووە. کاتێک سەرمایەداری دەوڵەت ـــ نەتەوەش بەناوی سۆسیالیزمی بونیادنراوەوە کۆمەڵگای قووتدا، ئەوەی مایەوە تەنیا خەیاڵی کۆمۆنیزمێکی ئیفلاس کردوو بوو.

بەئەندازەی سەرمایەداری بەڵکو لەو زیاتر بەر لەهەموو شتێک پێویستی بەشیکارکردنی دەوڵەت ـــ نەتەوە هەیە. دابەشبوونی جیهان لەرێگای سنووری یەکلاکەرەوە، سرووتەکانی نەتەوەی هاوچەرخ، جانەوەربووونی بیرکراسی قەفەسی ئاسنینی کۆمەڵگا، سوپا هەمیشەییەکان، سوپای بێکاران، میلیگەرایی وەک ئایینی هاوچەرخ، ئەو رەگەزپەرستییەی بۆتە دڕندەیەکی هار، دەمارگرژی ئەکادیمی زێدەڕۆ کە

هەزاران هێندەی دەمارگیری چاخەکانی ناوین رۆڵی چەواشەکردنی زهنو فیکر دەبینێت؛ تەواوی ئەمانە ئەو دەوڵەت ـ نەتەوەیە پێکدێنن کە رۆڵی ئامرازێکی هەزار روو دەبینێت.

بەرجەستەکردنی هەندێک لەو دەستەواژانە روونیدەکاتەوە کە دەوڵەت ـ نەتەوە کێشەیە یاخود چارەسەری.

## ١ . دەوڵەت ـ نەتەوە، سنوورو نیشتیمان:

بەدرێژایی مێژووی خۆی هیچ کاتێک کۆمەڵگای مرۆڤایەتی ئاشنای سنوورێکی شێوازی دەوڵەت ـ نەتەوە نەبووە. چونکە ئەمجۆرە سنوورە لەگەڵ سروشتی کلتووری مرۆڤ ناکۆکە. دەشێت سنوور بۆ زەویو زار دیاری بکرێت. جێگیربوونی جڤاتەکانی مرۆڤ لەسەر پارچە خاکێکو گونجانی ئەو شوێنە لەگەڵ کلتووری ماددیو مەعنەویدا رێگا لەپێش پێکهاتنی دەستەواژەی نیشتیمان دەکاتەوە. هەروەها نیشتەجێبوونی درێژخایەن کاریگەریەکی زۆری لەسەر پێکهاتنی شێوەی ناسنامەی قەومو قەبیلە دەبێت. لەم واتایەدا دەستەواژەی نیشتیمان بۆ کۆمەڵگاکان ژیانیو دەست لێبەرنەدراوە. چونکە کێشەکان چارەسەر دەکات. شانبەشانی ئەوەی سنووری وشک لەدیاردەی نیشتیماندا بوونی نییە, هەروەها زمانو کلتووری هاوبەشو بازاڕی ئابووریش پەرە بە چەمکی سنووری نەرم دەدەن. کێشەش ئەو کاتە دەست پێدەکات کە دەوڵەت ـ نەتەوەو سەرمایەداری ــ بەیەکەوە نیشتیمانو کۆمەڵگاکەی دەخەنە ژێر هەژموونگەرایی خۆیانەوە. تا چەند چەمکی زمانو کلتووری هۆمۆژەن بسەپێنرێت، گرێدراو بەبەرزبوونەوەی ئاستی گشتی کۆیلایەتی کۆمەڵگا نیشتیمانو سنووریش دەبێتە شوێنی چاودێریو کۆنترۆلێکی مەزن. بەڵام سنووری وشکی بەمجۆرە بۆ دەوڵەتەکان نەکێشراوە. وشکی سنوورەکان نوێنەرایەتی هێزی زنجیرو پێوەندەکانی کۆیلایەتی دەکات کە لەمێشکو ئیرادەی مرۆڤ دراوە؛ گوزارشت لەوەرچەرخانی زیندانێکی بچووک بۆ زیندانێکی گەورەی ئاستی وڵات دەکات. لەبنەڕەتدا ئەو جۆرە سنوورە وشکو توندانە مانای بەموڵککردنی مرۆڤ، بەکارهێنانیان

بەگوێرەی ئارەزووەکانیان، بەکالاکردنو بەسوپاکردنیانە، لەم دۆخەشدا هیچ جیاوازیەکی لەگەڵ زیندان یان دەستبەسەرکردنی گشتیدا نامێنێت. تا سنوورەکانی شێوازی دەوڵەت ــ نەتەوە نەکێشرێت، ناشێت تاکەکان لەکۆمەڵگا داببڕێنرێن و بکرێن بەپرۆلیتاریا. ئەو بوویەر و واقیعانەش تەنیا ئەو کاتە بەدیدێت کە (سنووری نیشتیمانی پیرۆز) دەکرێن بەئایینو رەوا دەکرێت. چونکە هەروەکو چۆن لەبنەڕەتدا سنووری دەوڵەت لەگەڵ واقیعی جوگرافیادا ناکۆکە، پێچەوانەی بزێوی و هەمەڕەنگی کۆمەڵگاشە.

خودی ژیان لەرێگای هەمەڕەنگی بەردەوامەوە مانا بەخش دەبێت. سەرباری پیرۆزکردنی بەلام سنووری سیاسی لەسەرووی لیستی ئەو داهێنانە کۆمەلایەتیانەوە دێت کە بەخێرایی دەگۆڕێن. تەنانەت سەد ساڵ بەر لەئێستا خەیاڵکردنی سنووری دەوڵەتەکانی رۆژی ئەمڕۆمان مەحاڵ بوو. بەمجۆرە نەخشکردنی وێنای ئەم پانتاییە جوگرافیانە لەزهن و فیکری هاوولاتیانو دڵنیاکردنیان بەوەی هەبوونێکی ئەزەلیو سەرمەدین، مانای ئافراندنی گەورەترین کێشەیە. لەراستیدا مردنی سەدان ملیۆن مرۆڤ لەئاکامی شەڕەکانی ئەو پێنج سەدەیەی دوایی کە لەپێناوی سنوورەکانی دەوڵەت ـ نەتەوە ئەنجامدراونو بەهایەکی لەژمار نەهاتووی کلتووری ماددیو مەعنەوییان وێرانکردووە. گەورەیی ئەو کێشانە دەسەلمێنێت کە رێگای لەپێش کردۆتەوە.

## ٢ ـ کۆمەڵگای نەتەوەیی دەوڵەت ـ نەتەوەی هۆمۆژەن

بۆچی هاوولاتیانی یەک شێوە؟ بۆچی دەوڵەمەندێتیەکی تێکەڵو هەمەڕەنگی وەک سروشتی کۆمەڵگا بۆ هاوولاتییەک وەرچەرخێنین کە هاوشێوەی (تەنەکەی بۆش) دەنگی لێوە بێت؟ ئاشکرایە کە هاوولاتێتی مۆدێرنیتە گوزارشت لەگوزەرکردنی کۆیلایەتی تایبەت بۆ کۆیلایەتی دەوڵەت دەکات. چونکە ئەگەر سوپای ئەم جۆرە کۆیلە مۆدێرنانە نەبن سەرمایەداری قازانج بەدەست ناهێنێت. سەرباری تەواوی هەوڵو ئەزموونەکانی پیرۆزاندنی ئەو حەقیقەتەی لەناوەڕۆکی هاوولاتێتیدا شاراوەیە، بەلام لەبنەڕەتدا بریتییە لەبونیادنانی کۆیلەیەکی هاوچەرخی

بەرهەمهێنەرو بەدیهێنەری قازانج. کۆمەڵگای نەتەوەیی هۆمۆژەن بەرهەمی "پرۆژەی ئەندازیاریێتی کۆمەڵگا"یە کە لەهیچ رژێمێکی فیرعەونیدا بیر لەجێبەجێکرنی نەکراوەتەوە. ساختەترین شێوەی جڤاتە. تەنانەت ئوممەتی پێخەمبەرانیش تا ئەو رادەیە یەک جۆر نەبوون. خودی ئەندازیاریێتی کۆمەڵگاش جگە لەستەمکارترین خوداوەندێتی گوزارشت لەمانایەکی دیکە ناکات. ئەمەش سەرچاوەی خۆی لەخوداوەندەکەی ئەفلاتوون وەردەگرێت کە بەدیمورگ (خوداوەندی بیناسازی) ناو دەبرێت. سەرباری ئەو هەموو بانگەشەیەی بۆ پۆزیتیڤیزم دەیکات بەڵام کۆمەڵگای دەوڵەت - نەتەوە وێنایەکی میتافیزیکی بێ ناوەرۆکو رووکەشییە. کۆمەڵگای بەمجۆرە بوونی نییە. تەنانەت ئەگەر ئاواش بکرێت، هەموو کاتێک مەحکومی داڕووخانو هەرەسهێنانە. هەرچی کۆمەڵگای دەوڵەت - نەتەوەیە کە لەفاشیزمدا بەپێگەیشتووترین ئاستی خۆی گەیشتووە دۆخی "کۆمەڵگای جەنگاوەرە"و بەم جۆرەش کۆمەڵگای دووەمین کێشەی گەورەیە. کۆمەڵگای جەنگاوەر (شەڕکەر) ئافرێنەری دڕندانەترین کێشە، جینۆسایدو کۆمەڵگاکوژیەکانە.

## ٣ . ناوەندەکانی دەوڵەت . نەتەوە بۆ بەرهەمهێنانی هاوولاتیانی

ئەمانە زیاتر خوێندنگا، سەربازگە، مزگەوت، کلێسا، حەورا و رێورەسمە فەرمیەکانن. چونکە تێرکردنی ئامەزرۆیی سەرمایەداری بەگشتیو سەرمایەی فینانس بەتایبەت کە لەزیادکردنی قازانجو سەرمایە سنوور ناناسن؛ تەنیا لەمیانەی پرۆسەیەکی رۆژانەیی یەکڕەنگکردنی ئاسنامەی تەواوی هاوولاتیان لەخوێندنگا، سەربازگە، کلێسا، حەورا، مزگەوتو رێوڕەسمە فەرمیەکاندا فەراهەم دەبێت کە بەشێوازێکی گونجاو لەگەڵ ئامانجەکانی بونیادنرابێت. چونکە بونیادنانی دەوڵەت ــ نەتەوە لەرێگای پەروەردەو پەیوەندی قازانج لەگەڵ سەرمایە دەرکی پێنەکرێت، ناشێت کۆمەڵگای مۆدێرن شیکار بکرێت. زۆر ئاشکرایە ئەو کۆمەڵگایانەی لەمیانەی ئەو جۆرە پەروەردەو دامەزراوانەوە بونیادنراون جگە لەپەلەقاژێکردن بەرامبەر کێشەگەلێکی زۆر هیچ بژارێکی دیکەیان نییە.

خودی پەلەقاژێش ئیفلاسکردنی زهنیەتە. واتە پۆزیتیفیزم بتگەرایی ئۆبژەی بابەتییە کە بەرامبەر قووڵایی مانای سروشتی کۆمەڵگا کوێر بووە. چونکە پەروەردەکردنی هاووڵاتی لەلایەن دەوڵەت ـ نەتەوەوە جگە لەبتپەرستیەکی ئۆبژەکتیڤی قەبا مانایەکی دیکەی نییە. لەرێگای ئەم پەروەردەوە جینۆسایدی فاشیزم هاتۆتە ئاراوەو ژینگە وێرانکراوە. واتە پەروەردەی دەوڵەت ـ نەتەوە سێیەمین گەورە فاکتەرە کە کێشەکانی کۆمەڵگای نەتەوەیی گەیاندۆتە بەرزترین ئاست.

## ٤ . بیرۆکراسی دەوڵەت . نەتەوە

لەناو سەرجەم بونیادە کۆمەڵایەتیەکاندا مۆدێرنیتەی ئەوروپا جیاکاری گەورەکردنی بیروکراسی هەیە بۆ بەرزترین ئاستی خۆی. بیروکراسی ساختەترین فاکتەرە کە سروشتی کۆمەڵگای رزاندووەو پەکی خستووە. ئەو بیروکراسییەی وەک گرێیەک لەسەر پشتی کۆمەڵگا گەورەدەبێت مەرجێکی ژیانی هەبوونی دەوڵەت ـ نەتەوەیەو ناتوانێت دەستبەرداری بێت. ئەگەر لەسۆسیالیزمی بونیادنراو بێت یان ئەو رژێمانەی بەلیبراڵ ناو دەبرێن بیروکراسی ئەو ئامرازە سەرەکیەیە کە سیستەم بەرێوە دەباتو قازانج بەدەست دێنێت. برِبڕی پشتی کۆمەڵگای دەوڵەت ـ نەتەوەیە؛ بەڵام قەفەسی کۆمەڵگای سروشتییە. لەرێگای ئەم قەفەسەوە سەرمایەداری کۆمەڵگا ماڵی دەکاتو بەرەو بەرهەمهێنانی کار ـ سەرمایە پاڵی پێوە دەنێت. لەم سۆنگەوە ئەگەر پەیوەندی بیروکراسیو دەوڵەت ـ نەتەوە لەگەڵ سەرمایەداری شیکار نەکرێت، نەک هەر تەنیا کێشەکانی کۆمەڵگای مۆدێرن چارەسەر ناکرێت، بەڵکو دەست نیشانکردنیشیان مەحاڵ دەبێت. دامودەزگا بیروکراتیەکانی وەک ئامرازی چارەسەرکردن پێشکەشی بوارە کۆمەڵایەتیەکان کراوە، چوارەمین گەورە سەرچاوەی کێشەکانی کۆمەڵگای مۆدێرنە.

## ٥ . دەوڵەت ـ نەتەوەو رەگەزگەرایی

ئەو پیاوسالارییەی پلەداری نەریتی باو لەسەر ژنی ئاواکردووە بەدرێژایی مێژووی شارستانی بەهێزو پتەوکراوە. ئەو دەسەلاتەی لەفۆرمی دەوڵەت ـ نەتەوەدا بەبەرزترین ئاستی خۆی گەیشتووە تارادەیەکی زۆر هێزی خۆی لەو رەگەزگەراییە وەردەگرێت کە خەستو بلاویکردۆتەوە، چونکە رەگەزگەرایی کردەیەکی بایۆلۆژی ئاسان نییە؛ بەڵکو ئایدیۆلۆژیایەکە بەلانی کەم بەقەدەر میللیگەرایی دەسەلات و دەوڵەت ـ نەتەوە بەرهەم دێنێت. چونکە رەگەزی ژن لەروانگەی پیاوی بالادەستەوە ئەو ئۆبژەو شتگەلەیە کە هەر جۆرە ئارەزوویەکی خۆی لەسەر جێبەجێدەکات. گووتەی "ژنان کێڵگەی خۆتانن، چۆن خوازیارن دەتوانن بیان کێڵن" ی پەرتووکی پیرۆزو گووتەی " ژن وەک ئامرازێکی مۆسیقایە، چۆن دەخوازن دەتوانن بیژەنن" ی مۆدێرنیتە ئەو واقیعە دەردەبڕن. هەروەها پەندی" قامچی سەریو جاشکۆکەی زگی کەم مەکەن" کارەکتەری فاشیستانەی بالادەستی دەخاتە ڕوو.

رەگەزگەرایی کۆمەڵگاش بەلانی کەم بەقەدەر سەرمایەداری جانەوەرێکی کۆمەلایەتی مەترسیدارە. چەندە جێگای داخە کە بە ئامانجی بەربەستکردنو شاردنەوەی حەقیقەتی ئەو دیاردەیە بالادەستی پیاوی فێڵبازو بێڕەحم هەڵوێستێکی چاوسوورو زۆردارانە پیشاندەدات. سەرەڕای ئەوەی بەقەدەر سەرمایەداری پێویستی بەلێکۆڵینەوەو لێتوێژینەوە هەیە، بەلام رەگەزگەرایی ئەو بوارە کۆمەلایەتییەیە کە لەناو تاریکیدا بەشاراوەیی هێڵراوەتەوە. هەڵوێستو رەفتارە رەگەزگەراییەکان یەکەمین سەرچاوەی گشت ئایدیۆلۆژیاکانی دەسەلاتو دەوڵەت پێکدێنن. ئەو بوارە کۆمەلایەتییەی کە قووڵترینو داپۆشراوترین جۆری کۆیلایەتی، چەوسانەوە و سەرکوتکردنی لەسەر پەیڕەو دەکرێت کۆیلایەتی ژنە. ئەو ئۆبژە کۆمەلایەتیەیە کە سەرجەم شێوەکانی دەسەلاتو دەوڵەتی لەسەر تاقیکراوەتەوە.

سەرمایەداریو دەوڵەت ـ نەتەوە کە بەهۆشیاریەکی قووڵی تێگەیشتنی ئەم تایبەتمەندێتیانەی کۆمەڵایەتی ژن دەجووڵێنەوە، گرنگیو بایەخێکی زۆر بەبەرکارهێنانی ژن دەدەن بەو سیفەتەی لە پێشترین ئامرازی سەرمایەو دەسەڵاتە. هەربۆیە پێویستە زۆر بەباشی بزانرێت ئەگەر کۆیلایەتی ژن نەبێت ئەوا هیچ جۆرێکی کۆیلایەتی چانسو دەرفەتی پەرەسەندنو ژیانی نابێت. سەرمایەداریو دەوڵەت ـ نەتەوە گوزارشت لەو پیاوە دەسەڵاتدارە دەکەن کە لەئاستێکی بەرزدا بووە بەدامودەزگا. راشکاوانەتر بیڵێین سەرمایەداریو دەوڵەت ـ نەتەوە پاوانی پیاوی زۆردارو چەوسێنەرە. پارچەکردنی ئەم پاوانە لەوانەیە لەپارچەکردنی ئەتۆم زەحمەتتر بێت.

بەو سیفەتەی دیموگرافیا (زانستی دانیشتوان) باڵێکی لاوەکی رەگەزگەرایی کۆمەڵگایە بەیەکەوە لەگەڵ مۆدێرنیتە بەمەبەستی ئاواکردنی سوپای سەربازی، سوپای بێکارانو کۆمەڵگای نەتەوەی ستاندار ئاماریش بەکاردێننو زاوزێی ژنان بەپێوانەی مێژوویی دەبەستنەوە. ئەو ئایدیۆلۆژیایەی بەماڵتۆسگەرایی[٢] ناو دەبرێت گوزارشت لەو رەوشە دەکات. زیادبوونی رادەبەدەری ژمارەی دانیشتوان کە هەڕەشە لەکۆمەڵگاو ژینگە دەکات لەگەوهەری خۆیدا کێشەیەکی بایۆلۆژی نییە، بەڵکو ئەنجامێکی قۆستنەوەی ئایدیۆلۆژیای رەگەزگەراییە لەلایەن سەرمایەداریو دەوڵەت ـ نەتەوەوە. خێزانگەرایی مۆدێرنیشی لەناودا ئایدیۆلۆژیای رەگەزگەراییو کردەوەکانی سەرمایەداریو دەوڵەت ـ نەتەوە لەوانەیە بۆ کۆمەڵگاو ژینگە گەورەترین سەرچاوەی کێشە بن. گرێدراو

---

[٢] ماڵتۆسگەرایی (Malthusianizim): ئەو تیۆریەی ژمارەی دانیشتوانە کە تۆماس ماڵتۆس (١٧٦٦ ـ ١٨٣٤) دایرشتووە. لێکۆڵەرەوەیەکی ژمارەی دانیشتوانو ئابووری سیاسی ئینگلیزە، بەتیۆزە بەکاریگەرەکانی دەرهەق بەژمارەی دانیشتوان پابەند بەبەرهەمهێنان، دابەشبوونو ئالوگۆڕ بەناوبانگە. بەبنەماگرتنی ماڵتۆسگەرایی کارەساتی مرۆیی لەگەڵ خۆیدا هێناوە، بووە بیانووی کۆمەڵکوژی گەلان، تەنانەت هەندێک نەژادی ژێردەست دووچاری نەزۆکی زۆرەملێیانە کران.

بەدەوڵەت ـ نەتەوە پێویستە رەگەزگەرایی کۆمەڵگا وەک پێنجەمین گەورە سەرچاوەی کێشەی کۆمەلایەتی هەڵسەنگێنرێت.

## ٦ . دەوڵەت . نەتەوەو میللیگەرایی (ناسیۆنالیزم)

ئەگەر دەوڵەت ـ نەتەوە ئەو خوداوەندە بێت کە لەسەر رووی زەوی دەگەرێت ئەوا میللیگەراییش ئایینە (عەلمانی - سیکولار)ەکەی ئەو خوداوەندەیە لەسەر زەوی. ئەگەر شیکاری تیۆلۆژیو سۆسیۆلۆژی ئەم دوو دەستەواژەیە نەکرێت، ئەوا پێناسەکردنی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری زۆر ناتەواو دەبێت. پێویستە زۆر بەباشی بزانرێت کە تەواوی پلەداریو ئایینەکانی دەوڵەت بناخەکانیان پێکدێنێت لەجیاتی تیۆ (خوداوەند)و تیۆلۆژیا (زانستی خواناسی) رەنگدانەوەیان لەمۆدێرنیتەدا بەشێوەی دەوڵەت ـــ نەتەوە و نەتەوەپەرستی (میللیگەرایی) جێگیرکراوە. شیکارکردنی پێگەی نێوان ئەو دوو دەستەواژەیە، رووی راستەقینەی مۆدێرنیزم ئاشکرا دەکات. سەرباری سەرجەم رووخسارە (دیاردە) پۆزیتیڤەکانیان بەلام دەوڵەت ـــ نەتەوەو نەتەوەپەرستی خاوەن کارەکتەرێکی میتافیزکیانەی هەرە قەباو بێ ناوەرۆکن، دەستەواژە ئەفسوونیەکانی بەدەستهێنانی قازانجی سەرمایەداریو سەرمایەن. دەوڵەت ـــ نەتەوەو نەتەوەپەرستی گلۆلەی پەیوەندی دیاردەیی ئەو ناکۆکی، چەوسانەوەو زۆردارییە هەمەجۆرەیە کە ئەو دەستەواژانە دەیخەنە روو. سەرنجراکێشیو کارەکتەرە هەژموونگەرایییەکەشیان بۆ ئەو پەیوەندییانەی قازانج، دەسەلاتو سەرمایە دەگەرێتەوە کە لەهەناوی خۆیان حەشاریانداوە.

پێویستە جارێکی دیکە جەختی لەسەر بکەمەوە: نەتەوەپەرستی (میللیگەرایی) تاکە بیانووی ئایینی مۆدێرنیتەیە، بەلام دەوڵەت ـ نەتەوە خوداوەندەکەیەتی کە لەژێر فەرمانیدایەو خزمەتی دەکات. راڤەکردنی میللیگەرایی وەک ئایینی ئایینەکان، دەوڵەت ـ نەتەوەش وەک خوداوەندی خوداوەندەکان تادوارادە فێرکەرو سوودبەخش دەبێت. هەر دەستەواژەیەکی پەیوەندی بەژیانی کۆمەلایەتیەوە هەبێت یان ئەو دیاردەیەی نوێنەرایەتی

دەکات هێندەی ئەم دوو دەستەواژەیەو گلۆڵەی پەیوەندییەکانیان کاریگەری خراپو نەرێنی نەکردۆتە سەر کۆمەڵگا. چونکە توانای کاریگەری نەرێنیانەی نییە. هەروەها هێزی ئاوەژووکردنو شاردنەوەی حەقیقەتیشی نییە. میللیگەراییو دەوڵەت ـ نەتەوە وەک دوو دەستەواژەو دیاردەی پۆزیتیڤیست لەبەرزترین ئاستدا نوێنەرایەتی چەواشەکردنو پەردەپۆشکردنی " رژێمی حەقیقەتی کۆمەڵگا" دەکەن. گرنگترین ئەرکی زانستی کۆمەڵایەتی سەبارەت بەشۆڕش لەناوبردنی هێزی چەواشەو پەردەپۆشکاری حەقیقەتی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگایە.

دەوڵەت ـ نەتەوە و میللیگەرایی رۆژی ئەمڕۆمان کە خۆیان بەئامرازەکانی ئاسایش تەیارو پڕچەک کردووە هەروەکو قۆستنەوەی سەرمایە زانستی کۆمەڵایەتیشیان دیل کردووەو بەگوێرەی ئارەزوو و ویستەکانی خۆیان بەکاری دێنن. مارکسیزمیش لەناو ئەم چوارچێوەدایە. هیچ زانست، ئایدیۆلۆژیاو هونەرێک نەماوە دەوڵەت ـ نەتەوە نەیخستبێتە ژێرفەرمانو خزمەتی خۆیەوە. هەر بۆیە رۆشنگەری راستەقینە بە شیکارکردنو دەربازکردنی ئەم دوو دیاردە پۆزیتیڤیستەی مۆدێرنیتەدا تێپەڕدەبێت. لەم سۆنگەوە هەڵسەنگاندنی دەوڵەت ـ نەتەوەو نەتەوەپەرستی وەک شەشەمین گەورە گلۆڵەی کێشەی کۆمەڵایەتی گرنگیو بایەخێکی زۆری هەیە. هەرچەندە خۆیان وەک ناوەندی کەمەندکێشیو هێزی چارەسەرکردنی سەرجەم کێشە کۆمەڵایەتیەکان پیشانبدەن، بەڵام داوەری مێژوویی حەقیقەتی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگا بەمجۆرەیە.

## ٧ . دەوڵەت . نەتەوە، دەسەڵاتو فاشیزم

دەوڵەت ـ نەتەوە شێوەیەکی ئاسایی دەسەڵات نییە. ماناکەی ئەوە تێپەڕدەکات کە بەرزترین شێوەی دەسەڵاتی دەوڵەت بێت. شێوەگرتنێکی دەوڵەتە کە فاشیزم لەسەر رێبازو شوێنپەنجەکەیەوە پەرەیسەندووە، چونکە ئەو هەژموونگەراییەی پاوانگەرایی سەرمایەداری لەسەر ئابووری ئاوای کردووە، تەنیا لەمیانەی رێکخستنو بەرفراوانبوونی دەسەڵاتی دەوڵەت لەئاستی کۆمەڵگادا بەدیدێت. دەوڵەت ـ نەتەوەش لەم مانایەدا

پێناسە دەکرێت. هەرچی فاشیزمە، ئەو قۆناخەیە کە ئەم شێوەیەی دەوڵەت لەکاتی دۆخی شەڕ لەگەڵ تویژە کۆمەلایەتییە چەوساوەو سەرکوتکراوەکانی ناوەوەو هێزە کێبڕکێ کارە دەرەکیەکان پێی دەگات. جیاوازی نێوانیان لەو جیاوازییە دەچێت کە لە نێوان هەردوو قۆناخی شەڕو ئاشتیدا جێگای باسە. لەهەر دووکیشیاندا پێکهاتە سیاسیە جیاوازەکان لەناو دەبرێن. لەو دۆخەدا دەسەلاتیش هاوشێوەی کۆمەڵگا هۆمۆژەن دەکرێت. واتە کۆمەڵگای هۆمۆژەنکراو بەشێوەی دەسەلاتی هۆمۆژەنکراو درێژە بەتەمەنی پاشکۆیەتیەکەی دەدرێت. دەوڵەتی فاشیستیش مانای بەرزترین ئاستی یەکێتی نێوان دەوڵەتو کۆمەڵگای هۆمۆژەنە. یەک زمان، یەک وڵات، یەک کلتوور، یەک ئالاو یەک نەتەوە دروشمی سەرەکیەتی. زۆر ئاشکرایە کە ئەم بونیادە نەک چارەسەرکردن بەڵکو کێشەگەلێکی گەورە بۆ سروشتی کۆمەڵگا دەئافرێنێت کە زۆر تێکەڵو هەمەڕەنگە. ئەمە ئەو قۆناخەیە کە بەشێرپەنجەی کۆمەلایەتی ناو دەبرێت. ئەو شێرپەنجەبوونە یان تەواوی کۆمەڵگا قووتدەدات یان وەک گرێیەکی کۆمەلایەتی دوای بڕینی فڕێدەدرێت.

بەمجۆرەش تەواوی کلتوور، ئەتنیک، زمان، پێکهاتەی سیاسی، هزرو باوەڕیەکانی بەدرێژایی مێژووی کۆمەڵگا کەڵەکەبوون لەسەردەمی دەوڵەت ــ نەتەوەدا ژیانیان دەکەوێتە ژێر هەڕەشەو مەترسیەوە. چەندە ئەو پێکهاتە، هزر و باوەڕیانە لەمیانەی بەرخودانو جیاوازیەکانیەوە درێژە بە هەبوونی خۆی بدات وداخوازی ژیانی هەبێت، ئەوا رووی فاشیستانەی دەوڵەت ـ نەتەوە ئاشکرا دەبێت. هەرچەندە خۆیان وەک سۆسیالیستیش پیشانبدەن، بەلام هەر دەوڵەت، بزاڤ و پارتیەک بەم شێوازە دژی جیاوازیو هەمەڕەنگی کۆمەڵگا بوەستێتەوە ئەوا فاشیستبوونەکەی دەست لێبەرنەدراوە. یان دەوڵەت ــ نەتەوە لەلایەن ئەمجۆرە بزووتنەوەو پارتیانە ئاوادەکرێن، یان دەوڵەت ـ نەتەوە بەخۆی ئەمجۆرە پارتیو بزووتنەوانە بونیاد دەنێت. هەرچەندە لیبرالیزمی بۆرژوازی لەژێر دروشمی دژە ــ فاشیستیو دژە ــ کۆمۆنیستی خاوەنداریتی لەچەمکی دەوڵەتی لیبراڵ بکات بەلام ئەمە تەفرەدانو خەڵەتاندنێکی مەزنە. چونکە

لیبرالیزم بەخۆی دایکو باوکی دەوڵەت ـ نەتەوەیە. ئەگەر لەسەردەمی پێکهاتنی بێت یان پێگەیشتنیدا دەوڵەت ـ نەتەوە نموونەییترین شێوەی دەوڵەتی لیبرالیزمە. لەم سۆنگەیەوە؛ هەروەکو ئەو واقیعەی سەرمایەداری فاشیزمی ئافراندووە، واقیعی ئافراندنی سۆسیالیزمی دەوڵەت (سۆسیالیزمی بونیادنراو)یش لەدەوڵەت ـ نەتەوەدا یەکدەگرن. ئەو شەڕە نەتەوەییانەی ئەم پێنج سەدەیەی دوایی بەتایبەتیش سەدەی دوایی ڕێگای لەپێش کردۆتەوە لەتەواوی مێژووی شارستانیی زیاتر خوێنی ڕشتووە، کۆمەڵکوژیو جینۆسایدی لێکەوتۆتەوە بەشێوەیەکی ڕوونو ئاشکرا دەیسەلمێنێت کە دەوڵەت ـ نەتەوەو فاشیزمەکەی نەک هەر نابن بەچارەسەری کێشەکانی کۆمەڵگا، بەڵکو حەوتەمین گەورە سەرچاوەی زەبەلاحو زۆرداری کێشەکان پێکدێنێت.

## ٨- دەوڵەت ـ نەتەوە، کۆمەڵگای ئەخلاقی و سیاسی (دیموکراسی)

دەوڵەت ـ نەتەوە داکۆکییەکی زۆر لەسەر ئەوە دەکات خۆی وەک دەوڵەتی یاسا پیشان بدات. تەنانەت خۆی وەک دۆخێک دەنوێنێت کە بۆ یەکەمجارە بەتەواوی یاسای تێدا فەراهەم بووە. نکوڵیکردن لەکۆمەڵگای ئەخلاقیو سیاسی لەژێر ئەم واقیعەیدا شاراوەیە. چونکە یاسا پۆلێنێکی کۆمەڵایەتییە کە چینەکانی دەوڵەت بەگشتیو بۆرژوازیش بەتایبەتی هەوڵدەدەن لەجێگای ئەخلاقو سیاسەت زاڵی بکەن. ئەو واقیعە قووڵەی لەژێر بانگەشە زێدەڕۆییەکەی یاساگەرایی شارستانی ئەوروپادا شاراوەیە، ئەم نکوڵیکردنەی کۆمەڵگای ئەخلاقیو سیاسییە. بەشێوەیەکی (تیۆری)دەڵێن کە دەوڵەت ـ نەتەوە باشترینو نموونەییترین چوارچێوەی یاسایە. بێگومان کاتێک ئەو دەوڵەت ـ نەتەوەیەی لەسەر بنەمای نکوڵیکردن لەکۆمەڵگای ئەخلاقیو سیاسی، واتە نکوڵیکردن لەکۆمەڵگای دیموکراتیک ئاواکراوە باشترین چوارچێوەی یاسای بۆرژوازی پێکدێنێت خاڵێکی مایەی تێگەیشتنە. بەڵام وەک بانگەشەی بۆ دەکرێت هیچ یەکێک لەدەوڵەت ـ نەتەوەو یاسا چوارچێوەی کۆمەڵگای دیموکراتی پێک ناهێنن. بەڵکو پێچەوانەکەی ڕاستە. دەوڵەت ـ نەتەوەو یاسا چەندە بەشێوەیەکی

تێکەڵ چڕببنەوەو دزەی ناو هەموو بوارو گۆڕەپانەکانی کۆمەڵگا بکەن، بەو رادەیە کۆمەڵگای ئەخلاقیو سیاسی دەرباز دەکرێت. بەم جۆرەش کۆمەڵگای دیموکراتی بۆ کۆمەڵگایەکی نواندنو پیشاندان دەگۆڕێت. لەناو رێساکانی دەوڵەت ــ نەتەوەو یاسا (دەستوور، یاساو جیهانی پەیڕەوەکانی ناوخۆ) جێگا بۆ ئەخلاقو سیاسسەت ناهێڵرێتەوە. چونکە ئەمانە دوای بژاردنێکی وردو دەست لێدانێکی بەردەوام پێکهاتوونو لەدواجاردا گوزارشت لەبەرژەوەندییە پاڵاوتەکانی پاوانگەرایی سەرمایەداری دەکەن. لەناو یەکگرتوویی ئەم رێسایانەدا دیموکراسی بۆ یارییەک دەگۆڕێتو کارەکتەری ئافرێنەرو بونیادنەرانەی لەناو دەچێت.

لەراستیدا سیاسەت وەک بواری ئافرێنەری چارەسەرکردنی کێشە کۆمەڵایەتیەکان رۆڵ دەبینێت. چونکە رێسای سیاسەت بریتییە لەداهێنان بەرەو باشتر، راستترو جوانتر لەپێناو کۆمەڵگادا؛ دەزانێت ببێت بەشکۆمەندارترین هونەری بەهرەمەندی ئەم ئافراندنە. ئەمەش هونەرێکە تەنیا لەمیانەی هەبوونی دیموکراسیو ئەخلاقی کۆمەڵگادا سەردەکەوێت. لەبەر ئەم هۆکارەش هەر بوارێک یاساو رێساکانی بۆرژوازی (کە دەوڵەت ـ نەتەوە چوارچێوەکەیەتی) بیخنکێنێت، جێگای هیچ شتێکی ئەخلاقیو سیاسی تێدا نامێنێت، رێگا بەکردە دیموکراتیەکانو بونیادی کۆمەڵایەتی نادرێت. لێپرسینەوەو دادگاییکردنی زانستی کۆمەڵایەتی تەوەرەی ئەوروپا بەو سیفەتەی لەدوا وێستگەی خۆیدا گوزارشتێکی میتۆلۆژییە بۆ سەراوژێرکردنی ئەوحەقیقەتە، خزمەتێکی زیاتر بەحەقیقەت دەکات، هەروەها زیاتریش بەحەقیقەتمان ئاشنا دەکات.

لەدۆخێکی وەهادا کاتێک دەوڵەت ـ نەتەوە و یاسا وەک سەرەکیترین ئامرازەکانی چارەسەرکردنی ئەو کێشە کۆمەڵایەتیانە دەسەپێنرێت کە لەگەڵ مێژووی شارستانیدا قووڵتربوونەتەوە بەو رادەیەی نکوڵی لەئەخلاق، سیاسەتو کۆمەڵگای دیموکراتی بکات ئەوا بۆ هەشتەمین گەورە گلۆڵەی کێشە کۆمەڵایەتیەکان دەگۆڕێتو ئەمەش حەقیقەتێکی حاشاهەڵنەگرە.

## ٩ . دەوڵەت . نەتەوە، کۆمەڵگای مەدەنیو ژینگە

قۆناخی تەنگەژەی سەرمایەدای کە لەساڵی ١٩٧٠ کانەوە قووڵبۆتەوە، لەهەمانکاتــدا قۆنــاحی قووڵبوونــەوەی قــەیرانی بونیــادی دەوڵــەت - نەتەوەشە کە بریتیە لەبەشێکی. ئەمە ئەو قۆناخەیە کە دۆخی رووتی خوداوەندی دەوڵەت ـ نەتەوە ئاشکرابووە، پەردە ئایدیۆلۆژیەکەشی داو بەداو هەڵوەشاوەتەوە. ئیتر لە پێناو بەربەستکردنی دارووخانی مەزن دەرکەوتنو سەرهەڵدانی بزووتنەوەکانی کۆمەڵی مەدەنی بووە بە ناچارییەک. دەشێت کۆمەڵی مەدەنی بەمجۆرە پێناسەبکرێت؛ ئەو کۆمەڵگایەیە کە لەدەرەوەی کۆمەڵگای دەوڵەتو خێزان ماوەتەوە. وەک رێکخستنێکی کاتی ئەو قۆناخە مانادار دەبێت کە دەوڵەت ــ نەتەوە تایبەتمەندێتی گەمارۆدەرانەی لەدەستداوە، لەبەرامبەر ئەمەشدا هێشتا کۆمەڵگا دیموکراتیزەبوونو ئازادی خۆی بەدەست نەهێناوە. لەهەردوو لایەنەوە فشاری دەخەنە سەر. رووبەڕووی دۆخێکی بەمجۆرە دەبنەوە: یان جێگای خۆیان لەریزەکانی دەوڵەت ــ نەتەوە دەگرن یان ریزەکانی کۆمەڵگای ئازادو دیموکراتیک. لەدۆخێکی پێچەوانەدا لەبێ رۆڵی رزگاریان نابێت. ئاسۆیەکی زۆر سنووورداری چارەسەرییان هەیە. باشترینیشیان لەچوارچێوەی فێمینیزمو ئیکۆلۆژیدا دەجووڵێنەوە. گروپە ئەنارشیستو چەپە کۆنەکانو ئەو پێکهاتە سیاسیو سەندیکایانەی پاشکۆو پاشماوەی دەوڵەت ـ نەتەوە نین جێگای خۆیان لەناو ئەو پۆلێنەدا دەگرن.

دەوڵەت ــ نەتەوە بەهۆی ئەو دارووخانانەی دووچاری هاتبوو بەناچاری جێگای بەکۆمەڵگای مەدەنی دابوو، بەڵام بەردەوام فشاری دەخاتە سەرو هێزی چارەسەرکردنی بۆ نزمترین ئاست دادەبەزێنێت. دەوڵەت ـ نەتەوە کە پێشکەوتووترین شێوەی زۆرداری دەسەڵاتە لەسەر کۆمەڵگاو ژینگەکەی بەوڕادەیەی کۆمەڵگای دیموکراتیو مەدەنی بەربەست بکات نۆیەمین گەورەترین سەرچاوەی کێشەکانە.

## ١٠ . دەوڵەت ـ نەتەوە، زانست، هونەرو حەقیقەت

پۆزیتیفیزم بایەخێکی تایبەت دەدات تاکو دەوڵەت ــ نەتەوە وەک دۆخی بەرجەستەی زانستو هونەر پیشانبدات. بەمجۆرەش مۆدێرنیتەی سەرمایەداری گەورەترین درۆ دەخاتە مەیدانەوە. بەسووربوونو داکۆکیکردنەوە بانگەشەی دیاردەگەری، بابەتیبوونو زانستیبوون دەکات. دەوڵەت ــ نەتەوە تەواوی هێزی خۆی بۆ ئەو پروپاگەندەیە تەرخان دەکات. دونیایەکی ئەکادیمی یەکجار زەبەلاح بونیاد دەنێت. ئەو میتۆلۆژیاو پروپاگەندەیەی هیچ خوداوەندو ئایینێک لەمێژوودا ئەنجامینەداوە لەسەردەمی ئەم مۆدێرنیتەیەدا هەڵدەبەسترێتو دەخرێتە بازاڕەوە. لەبەر ئەوەی تەواوی خانەو مەمیلە ئەخلاقیو سیاسیەکانی ، هەروەها تیشکۆکانی مانادانیان تێکدراون؛ هەربۆیە دەڵێی ئەو دڵو مێشکە نەماوە کە بەو میتۆلۆژیا هاوچەرخەو پروپاگەندەکانیان باوەڕ نەکات.

دوای ئەوەی ئەو زانستو هونەرانەی پۆزیتیفیزم چوارچێوەکەیانی پێکهێنابوو پشکی خۆیان لەقەیرانەکەی دوای ١٩٧٠کان وەرگرت رووبەرووی داماڵینی دەمامکەکانیان بوونەوە کە گوایە گوزارشتیان لەحەقیقەت دەکرد. ئەمەش بوویەرێکە لەنزیکەوە پەیوەندی بەپارچەبوونی دۆگماتیزمی دەوڵەت ـ نەتەوەوە هەیە. ئەوەی روویداوە دووەمین رۆشنگەرییە لەخاڵە تاریکەکانی رۆشنگەری یەکەمدا. دەوڵەت ــ نەتەوە کاتێک لەرێگای پرۆژەکانی ئەندازیارێتی سروشتی کۆمەڵگا ورد دەکات نەک تەنیا واقیعی دیاردەیی بەڵکو هەستو بێزانینەکەشی تێکدەدات. کاتێک دیاردە لەناوببرێت هەستو بێزانینەکەشی زەبری بەردەکەوێت.

یەکێک لەحەقیقەتە دەرکەوتووەکانی زانستی کۆمەڵایەتی مێژوویبوونی کۆمەڵگایە. لەجیاتی مێژووی کۆمەڵایەتی دەوڵەت ـ نەتەوە بونیادی میتۆلۆژیو خەیاڵی نوخبەی دەسەڵاتی بۆرژوازی وەک مێژوو پێشکەش دەکات. تەنانەت لەوە بێ ئاگایە کە لەمێژووی ئایینیو میتۆلۆژی ـ کە زۆر رەخنەی دەکرد ــ زیاتر چۆتە دەرەوەی حەقیقەت. کاتێک زانستی کۆمەڵایەتی ئەوروپا دەبێت بەئایدیۆلۆژیای فەرمی بۆ

کۆنەپەرسترین گوزارشتی میتۆلـۆژی وەردەچـەرخێت. سـەرباری تـەواوی بانگەشـەکانی زانسـتیبوونی بـەڵام میتافیزیکـە. تەنانـەت میتافیزیایـەکی باشیش نییە. ئەو دۆخەی هونەر تێیدا دەژیت لەهی زانست جیاوازتر نییە. هـــەردووکیان بوونەتـــە دوو بـــواری زیـــاتری ســـەرمایەی گرێـــدراو بەسـەرمایەداری. زانستو هونـەر چەنـدە بکرێن بـەکاڵا بـەهای حەقیقـەت لەدەستدەدەن. هەرچی لەناوبردنی فەلسـەفەو لەدەسـتدانی گرنگیەکەیـەتی بـەو سـیفەتەی زانسـتی حەقیقەتـە؛ بەقـەدەر ئـەو جینۆسـایدە مـاددیو جەستەییەی کۆمەڵگا دووچاری هاتووە ڕێگا لـەپێش کارەسـات دەکاتـەوە. کۆمـەڵگای بـێ فەلسـەفە کۆمەڵگایەکـە پەیوەنـدی خـۆی بەحەقیقەتـەوە لەدەستداوە. ئەمـەش تـەنیا مانـای گۆڕانی کۆمـەڵگا بۆ دۆخـی کۆمـەڵی ئۆبژەکـان دەبەخشێت. هـەرچی کۆمـەڵگای ئۆبژەیـە مانـای ئـەو کۆمـەڵو شـتگەلە دەبەخشـێت کـە تـەواوی تواناکـانی بـەرگری لەدەسـتداوەو بـۆ هەرجۆرە چەوسانەوەیەک کراوەیە. ناشێت بیر لەکارەساتێک بکرێتەوە کە هێندەی لەدەستدانی بەرگری خۆیی کۆمەڵگا گەورە بێت. کاتێک دەوڵەت ـــ نەتەوە کۆمەڵگا لەهونـەر، زانست و حەقیقـەت دوور دەخرێتـەوە و بـەبێ بەرگری خۆیی دەهێڵێتـەوە دەیـەمین گـەورە هۆکـاری کێشـەی کۆمەڵایـەتی پێکدێنێت.

ئەمسـتردام ـــ هۆڵەنـداو لەنـدەنی بریتانیـا کاتێـک دەوڵـەت ـــ نەتـەوەیان وەک ئـامرازێکی ستراتیژی ئـاواکرد زۆر بـاش ئاگـادار بـوون کەچی دەکەن. لەناو ئەوانەی ئامرازەکـەیان ئافرانـد کەسـانێک دەیـانزانی جانـــەوەرێکی چەنـــدە ترســـناکیان بەرهـــەمهێناوە. بـــەئامانجی سنووردارکردنیو پاراستنی کۆمـەڵگاو تـاک هەنـدێک تـەگبیری یاسـاییو دیموکراتییـان پەرەپێـداوە. هەڵبەتـە لـەپێناو بونیـادە ناوخۆییـەکان ئـەم کارەیـان ئەنجامـداوە. بەشـێوەی ئـەو خراپەکاریانـەی لەقوتووەکـەی پانـدۆرا دەرکـەوتوون دەوڵـەت ـــ نەتـەوەیان بـەڕووی جیهـان (زەمینـی ئەوروپاشـی لـەناودا)دا بڵاوکـردەوە. لـەم ڕێگایەشـەوە کۆمـەڵگای کـۆنو ئەوروپای دابەش کردو توانییان بیخەنە ژێر هەژمونگەرایی خۆیانەوە.

ئایدیۆلۆگـــە گـــەمژەکانی ئـــەڵمانو زانســـتگەرا پۆزیتیڤیســـتە فەرەنسیەکانی خۆیان بەئاقڵمەند لەقەڵەم دەدا؛ ئەم پاندۆرایـەی پیاویـان پیرۆزکـرد، وەک بڵێـی خوداوەنـدو ئـاینێکی راسـتەقینەیە بـۆ پـەنتائۆن (ئەنجوومەن)یان کەمەندکێش کردن. هەر نوخبەیەکی دەسەڵات کە کەوتۆتە ژێر کاریگەری مۆدێرنیتەی سەرمایەداری بەگوێرەی ئەم مۆدێلە تازانە بتـی خوداوەنـدە نوێیەکـەی خۆیانیـان دروسـتکردووەو لەشـوێنی کۆنـەکانیان داناون. دەستەبژێرەکانی رۆژهـەلاتی نـاوین کـە خاوەنـە هـەرە کۆنـەکانی دەستەواژەی خوداوەندو ئایینن لەهەرکەسێک باشتر ئاگاداربوون کـە پـەنا نەبەنە بەر ئەو خوداوەندو ئایینە دەرفەتی ژیانیان نامێنێت.

## ج. شۆڕشی پیشەسازی

سێیەمین پێکەو کۆڵەکەی مۆدێرنیتەی ئەوروپا شۆڕشـی پیشەسـازییە. شـــوێنگەیەکی تایبـــەتی لـــەمێژووی شارســـتانیدا هەیـــە. مســـۆگەرە کاریگەریەکـەی بەقـەدەر شۆڕشـەکانی کشـتوکاڵ و شـار بـووە.چەنـدین وەرچـــەرخانی شۆڕشـــگێڕیانەی بەخۆیـــەوە بینیـــوە. بـــەڵام ئەو وەرچەرخانانەی لەکۆتاییەکانی سەدەی هەژدەم لەئەوروپا بەتایبەتی لەئینگلتەرا روویداوە کارەکتەرو خەسڵەتی شۆڕشی گەورەی هەیـە. پێشـتر جەختییان لەسەر ئەو خاڵە کردبوویەوە کە پێویستە شۆڕشـی پیشەسـازی لەگـەڵ سـەرمایەداریو ئـابووری نـەکرێن بەیـەک شـت. پیشەســازی دیاردەیەکی کۆمەڵایەتییە کە تائێستا رەخنەیەکی جدیو بـەجێی لـەبارەوە پێشنەخراوە. بەر لەشۆڕشی پشەسازی هیچ کاتێک کشتوکاڵ ـ گونـد ـ شـــار بەتـــەنیا بەئاســـتی هەرەشـــەکردن لەکۆمـــەڵگا نەگەیشـــتوون. بەپێچەوانەوە بەهایەکی مەزنیان پێشکەش بەبوارەکانی کلتووری مـادیو مەعنەویی پەرەسەندنی کۆمەڵایەتی کرد. هێزی سەرەکی بونیادنانی ژیـانی کۆمەڵایـەتییان پێکهێنـا. هـەرچی ئـەو دیاردانـەن کـە لەگـەڵ شۆڕشـی پیشەسازییەوە لەئەوروپا هاتنە ئاراوە زۆر جیـاوازبوونو تـا ئێسـتاکەش شیکارێکی زانستی سەبارەت بەکاریگەریەکەیان لەسەر ژیـانی کۆمەڵایـەتی

نەکراوە. لەوانەیە یەکێک لەئەرکە سەرەکییەکانی زانستی کۆمەڵایەتی هەڵسەنگاندنێکی لێهاتووانەی کاریگەری پیشەسازی بێت لەسەر ژیان.

پێویستە پیشەسازی تەنیا بابەتی زانست نەبێت بەڵکو بەلانی کەم بەقەدەر ئەویش ڕۆژەڤی فەلسەفە بێت. مسۆگەر پێویستە فەلسەفە پیشەسازی بخاتە ڕۆژەڤی خۆیەوە. بەڵام کاتێک زانستی ئابووری تەنیاو تەنیا پیشەسازی وەک بوارێکی ئابووری تاوتوێ دەکات ئەوا ناتەواوی‌و کەموکوڕییەکی زۆر گەورەترە. هەروەها دەرەنجامەکانی تاوتوێکردنی ئابووری وەک فاکتەرێکی گەشەپێدان‌و بەرهەمێکی بەپیتتر بەشێوەی جینۆسایدو بەردەوامنەبوونی ژینگە دێتە ئاراوە.

مەحاڵە فاشیزم بەبێ پیشەسازی هەڵسەنگێنرێت. چونکە ئەو پیشەسازیانەی لەجۆری چەکی ئەتۆمی، زیندەوەرە بۆهێڵ گۆڕاوەکان بەرهەمدێنن‌و توانای وێرانکردنی کۆمەڵگایان بەهێزە هەر لەئێستاوە بوونەتە سەرچاوەی هەڕەشەومەترسیەکی مەزن. بێگومان لێرەدا باس لەو پیشەسازییە دەکەین کە کەوتۆتە ژێر کۆنترۆڵی سەرمایەداری‌و ئیکۆنیزمەوە. چونکە بەپێی پێویست ئاشکرابووە کە کۆنترۆڵی هەردوو ڕەوت بەسەر پیشەسازیدا بەمانا راستەقینەو مەجازیەکەشیەوە شێرپەنجەیەکی مرۆیی‌و کۆمەڵایەتی لێکەوتۆتەوە.

بەڵگەیەکی دیکەی گرنگ‌و سەلمێنەری ئەو راستیەی کە پیشەسازیبوونی بەئامانجی قازانج پێشخراوە ئیتر بەسنوورو ئاستەکانی بەردەوامنەبوون گەیشتووە بێکاری، هەڵوەشانەوەی کۆمەڵگای کشتوکاڵ ـ گوندو دەرکەوتنی ژینگەیە لەدۆخی ئیکۆلۆژی. بێگومان دانیشتنی سیستەمی جیهانی سەرمایەداری لەسەر تەختی باڵادەستیدا پەیوەندییەکی توندو بەهێزی بەپیشەسازیەوە هەیە. وەک دەزانرێت ئینگلتەرا لەسایەی پیشەسازی سەرمایەدارییەوە باڵاگرتنی هەژموونگەرایی خۆی فەراهەم کرد. شێوەکانی دیکەی بەرهەم هێنان هێزی ڕووبەڕووبوونەوەی هێزە باڵاکەی بەرهەمهێنانی پیشەسازی سەرمایەداری نییە. لەم سۆنگەیەوە شێوەکانی دیکەی کۆمەڵگا چانسی لەسەرپێ مانەوەیان زەحمەتە. بەڵام ئەوەی ئێستا هەر لەم قۆناخەشدا جێگای باسە بەرهەمهێنانێک لەپێناو دابینکردنی

پێداویستیە سەرەکیەکانی مرۆڤ لەئارادا نییە، بەڵکو بەرهەمهێنانێکە بۆ بەدەستهێنانی بالادەستی هەژموونگەرایی.

پرسیاری سەرەکی ئەوەیە؛ ئایا پیشەسازی بۆ دابینکردنی پێداویستییە سەرەکیەکانی مرۆڤە یاخود بۆ بالادەستی هەژموونگەراییە؟ لەگەڵ شۆڕشی پیشەسازیدا مسۆگەر دەبوایە لەدەرەوەی پێداویستییە سەرەکیەکانی بەناوی کۆمەڵگای ئەخلاقیو سیاسیەوە رێگا بەپیشەسازی نەدرێتو ئەرێ نەکرێت. کاتێک شۆڕشی پیشەسازی وەک سێیەمین قۆناخی گەورە وەرچەرخانی مێژوو کەوتە رۆژەڤەوە مسۆگەر پێویست بوو رێگری لێبکرێتو لەدەرەوەی پێداویستییە سەرەکیەکان بەکارنەهێنرێت. دەبوایە ئەمە ئەرکی سەرەکی ئەخلاق، یاسا، ئایین، فەلسەفە، زانستو سیاسەت بێت. چونکە مرۆڤایەتی لەم هەڵوێستە نامۆ نییە. دانانی بناخەی جیهانی چەمکو دەستەواژەکان، داوەرییە ئەخلاقیەکان، زانستی پەرەسەندوو ئایینە ئاسمانیەکان لەکاتی شۆڕشی کشتوکاڵدا گوزارشت لەو حەقیقەتە دەکات. هەروەها هونەر، دانایی، زانستو میتۆلۆژیاکانی سۆمەرو میسرو دانانی بناخەی ئایینە گەورەکان لەشۆڕشی شاردا بەڵگەیەکی دیکەی بەهێزی سەلماندنی ئەو حەقیقەتەیە. بەلام کاتێک شۆڕشی پیشەسازی چڕبوویەوە، شۆڕشی فەرەنسیو ئەو پێشکەوتنە هاوشێوانەی یەک بەدوای یەکتر هاتنە ئاراوە لەوەلامدانەوەی نموونە مێژووییەکان دوور بوون. لەجیاتی ئەوەی بەرخودانەکانی کلێسا، شۆڕشە فەلسەفیو زانستیەکانو قوتابخانە هونەریەکان ئەو خرۆشانو هاربوونەی سەرمایەدارییو دەوڵەت ــ نەتەوە بوەستێنن کە لەسەر بنەمای پیشەسازی روویداوە، بەلام لەپێناو کەوتنە ژێر فەرمانیەوە کەوتوونەتە ناو بێبەختی کێبڕکێوە. بێگومان رووخانی کۆمەڵگای ئەخلاقیو سیاسی رۆڵی سەرەکی لەمەدا بینیوە.

پێویستە زۆر بەباشی بزانین کاتێک ئەوروپا سیستەمی شارستانی ناوەندی خۆرهەلاتی ناوینی گواستەوە گرنگی لەپێشینەیی بەفاکتەری ئەخلاقی نەداوە. بەپێچەوانەوە بەدوای گواستنەوەیەکی نا ئەخلاقیەوە بوو. بەهۆی دەستنیشانکردنی ئەم خیانەتە قووڵەیە کە نیچە بەرقو

کینەیەکی گەورەوە شاکارە مەزنەکەی خۆی لەژێرناوی "وەهای گوت زەردەشت"دا دەنووسێت. لەم بارەیەوە نیچە هێندە توورەیە، بۆیە هاواردەکاتو دەڵێ: " هەموو ئەو شتانە دەردەنەوە (بڕشێنەوە) کە بەناوی مۆدێرنیتەوە قووتتانداون"، بێگومان کاتێک ئەمە دەڵێت مەبەستی ڕشانەوەی ئەو شتگەلەیە کە مۆدێرنیتەی سەرمایەداری دڵو فیکری مرۆڤیان پێ پڕکردووە. هەروەها ناشێت پشکی ئەو هەڵوێستە لەشێتبوونەکەیدا کەم بکرێتەوە. بەڵام هەروەکو چۆن وەرزی بەهار بەگوڵێکەوە دەست پێناکات، ئەوا لەڕێگای تاکە فەیلەسوفێکیشەوە ڕێگری نەدەکرا مۆدێرنیتەی سەرمایەداری بەرشانەوەی خۆی دڵو مێشکی مرۆڤ پڕنەکات. ئەدۆرنۆش کاتێک دەڵێت "ژیانی چەوت ڕاست ناژێنرێت" خوازیاری ئاماژەکردن بەهەمان واقیع بوو. چونکە زۆر باش تێگەیشتبوو کە بەتایبەتی بەردەوامکردنی ژیانی مۆدێرن دوای جینۆسایدی یەهوودی لەگەڵ تەواوی پیرۆزیەکانی مرۆڤ ناکۆکە. هەروەها دروشمەکانی " یان سۆسیالیزم یان هۆڤێتی" کە بەرامبەر هاربوونی سەرمایەداریو دەوڵەت ـ نەتەوە بەرزکرابوونەوە وەک بڵێی ئەوانیش دەرکیان بەو واقیعە کردبوو. ئەم هەستکردنو پەی پێبردنانە گرنگن بەڵام زۆر ناتەواون.

هەڵوێستی بەرتەسکی ئابووریانە سەبارەت بەشۆڕشی پیشەسازی تەنیا ناتەواو نییە، بەڵکو ڕێگای لەپێش پێشهاتی زۆر چەواشەکاریش دەکاتەوە. ئەو دسپلین (زانست)ەی بەئابووری سیاسی ناو دەبرێت نموونەیەکی ڕەسەنی چەواشەکردنو پەردەپۆشکردنی حەقیقەتی کۆمەڵایەتییە لەڕێگای ئیکۆنیزمەوە. ئەگەر سەرنج بدرێت دەبینرێت کە ئابووریناسە ئینگلیزەکان پێشەنگایەتییان کردووەو ڕێکەوتیش نییە کە بەهێزترین قۆناخی لەسەردەمی شۆڕشی پیشەسازیدا بووە. چونکە یەکەمین ئەرکی سەرەکی ئابووری سیاسی ئینگلیز ڕەواکردنی جانەوەری سەرمایەداری بوو لەژێر ناوی زانستی کۆمەڵایەتیدا. تەنانەت کاتێک کارل مارکسو فردیدریک ئەنگلسیش دەبنە ئامرازی ئەو هەوڵانە، دیار دەبێت کە چەندە بەکاریگەرو سەرکەوتووبوون. ئابووری سیاسی ئینگلیز ڕۆڵی سەرەکی لەدەربازکردن و پەراوێزکردنی کۆمەڵگای ئەخلاقیو سیاسیدا

بینیـوه. لەسـەر ئـەم بنەمایـە بـەناوی زانسـتەوە گـەورەترین خیانـەت بەرامبەر زانست ئەنجامدراوە. قوتابخانەی زانستی پۆزیتیڤیستی فەرەنسی دووەمین گـەورە هاوبەشـەکەی ئـەو خیانەتەیـە. چونکـە ئـەوەی ئـابووری سیاسـی ئینگلیـز لـەبواری ئابووریـدا ئەنجامیـداوە، قوتابخانـەی پۆزیتیڤیستی فەرەنسیش لەسەر تەواوی بـوارە کۆمەڵایەتیـەکان پـەیڕەوی کردووە. کاتێک قوتابخانەی پۆزیتیڤیست ئەخلاق، ئـایینو فەلسـەفە وەک میتافیزیایەک رادەگەیەنێت کـە سـەردەمیان بەسـەر چـووە، خۆیشـی وەک ئایینی دونیایی سەردەمی مۆدێرن رادەگەیەنێت بەپێی پێویست ئەم واقیعـە ئاشکرا دەبێـت. لەبەرئـەوەی دەرکـەوتنی هـزری پـۆزیتیڤیزمیش هاوکـاتی شۆڕشی پیشەسازییە، ئەمـە رێکـەوت نییـەو تیشـک دەخاتـە سـەر هـەمان بابەتەوە.

شۆڕشی پیشەسازی بەبێ ئەوەی هیچ لەخێرایی خۆی وون بکـات هـەر بەردەوامـە. هـیچ شۆڕشـێک لـەمێژوودا بـەمجۆرە درێژخایـەن نـەبووە. تەنانـەت بـەپێی کـات خێراتـر دەبێـت. دان بـەهیچ کۆسـپو بەربەسـتێک دانانێـــت. لەبنەڕەتـــدا تـــاکو ئـــەو دوو هێـــزەی چۆتـــە ژێـــر فەرمانەکانیانەوە واتە تـاکو گلۆڵـەی ئـەو دوو هێـزە مـەزنو بـێ سنوورە لەناویـەکتردابن ناشـێت چـاوەڕوانی جـۆرە پەرەسـەندنێکی دیکـە بکرێـت. بەمانایـەکی تـر لەسـەردەمێکدا کـە سـەرمایەداری و دەوڵـەت ـــ نەتـەوە چـــاوەڕوانی وەســـتاندنی ئیندوســـتریالیزمیان لێناکرێـــت، چونکـــە ئیندوســـتریالیزم هۆکـــاری هەبوونیانـــە. تـــا پیشەســـازی لەدەســـتی ئیندوسـتریالیزم رزگـــار نـــەکرێت، ناشـــێت کۆمـــەڵگا لـــەژێر دەسـتی هەژموونگـەرایی سـەرمایەداریو دەوڵـەت ـــ نەتـەوە رزگـار بکرێـت. بەپێچەوانەوە تا ئیندوستریالیزم وەک هۆکاری هـەبوونی سـەرمایەداری و دەوڵەت ـ نەتەوە بمێنێتەوە، ئەوا هێزی تـاودانی بەدەسـتهاتووی خێراتـر دەکاتو تا داڕووخانە کوشندەکەی کۆڵەکە سێکوچکەییەکەی هەر بـەردەوام دەبێت. هەربۆیە لەنزیکەوە تویژینەوەی رۆڵی ئیندوستریالیزم لەکێشـەی کۆمەڵایەتی، جینۆسایدو وێرانکردنی ژینگەدا گرنگیەکی زۆری هەیە.

## ١ . ئیندوستریالیزم‌و رووخانی کۆمەڵگای کشتوکاڵ . گوند

هەروەکو دەزانرێت دەشێت پێناسەیەکی گشتی بەم شێوەیە بۆ پیشەسازی بکەین، مرۆڤ لەرێگای ئامرازەکانەوە بەشداری چالاکییە کۆمەڵایەتیەکان دەکات نەک راستەوخۆ بەدەستی خۆیەوە. سەرەتاکەیشی بۆ سەردەمی لەدایکبوونی جۆری مرۆڤ دەگەڕێتەوە. وەک دەزانرێت ئامرازە بەردینەکان یەکەمین پیشەسازین. پیشەسازی جڤاتەکانی کۆکردنەوەو راو لەبنەڕەتدا پشتیان بە ئامرازە بەردینەکان دەبەست. پیشەسازی رستن، دەستاڕو دییزە بەرهەمی ئەو قۆناخەن. لەهیلالی بەپیتی کەوانەی زاگرۆس ـ تۆڕۆس کە شوێنی لەدایکبوونی سیستەمی شارستانی ناوەندییە لەسەردەمی ٦٠٠٠ ـ ٤٠٠٠ پ.ز هەڵمەتێکی مەزن لەبواری زانستو پیشەسازی هاتە ئاراوە. ئەو پیشەسازییانەی لەجۆری گاسن، رەوڕەوە، کولینگو مەنجەڵ دروستکران کە دەتوانن ببن بەنوێڵەکانی مێژوو. هەنگاوێکی لەپێشتری ئەو قۆناخە بوو بەشۆڕشی شار. رۆڵی ئامرازەکانی پیشەسازی لەو شۆڕشەدا گرنگە کە لەساڵانی ٤٠٠٠ ـ ٣٠٠٠ پ. ز هاتە ئاراوە. قەڵەمبازەکانی زانستو هونەرەکان لەگەڵ نووسینو زمانی ژمارە بەیەکەوە لەم قۆناخەدا فەراهەم بوون. بەو مەبەستە ئەو زانیاریانە دێنمەوە یادی خۆمان؛ ئەو پیشەسازیانەی لەو سەردەمە ئاواکراون هێشتا نەکەوتوونەتە ژێر فەرمانی پاوانگەرایی دەوڵەتو سەرمایەداری. لەژێرچاودێری سیاسیو ئەخلاقی کۆمەڵگای گوندو شار رۆڵی خۆیان دەبینی. هەڵوێستی سیاسیو ئەخلاقی رۆڵی دیاریکەری هەبوو.

پەیتا پەیتا ئەم چاودێرییە لەسیستەمی شارستانی ناوەندی لەکزبووندابوو کە لەساڵانی ٣٠٠٠ ـ پ.ز لەمیزۆپۆتامیا پەریسەندووە. لەم مێژووە بەدواوە حکومڕانی دەوڵەت ـ سێیانەی راهیب ـ حکومڕان ـ سەرباز ـ لەشوێنی بەڕێوەبەرایەتی پلەداری کۆن سەرلەنوێ بونیادنرایەوە. لەکاتێکدا پیشەسازی زیاتر لەپەرەسەندندابوو. کەوتە ژێر کۆنترۆڵی حوکمڕانی ئەو دەوڵەتەی تازە بونیادنراوە. زیادبوونی گرنگی پیشەسازی لەئابووریو کردە سەربازیەکاندا، کۆنترۆڵی دەوڵەتی بەسەر

تەواوی کۆمەڵگا بەتایبەتیش بەسەر کۆمەڵگای گوند - کشتوکاڵ لەگەڵ خۆیدا هێنا. لەم سۆنگەوە چەوساندنەوەی ئەو کۆمەڵگایانەی لەگەڵ خۆیدا هێنا. تا سەردەمی شارستانی بەواتایەک لەواتاکان لەرێگای کۆنترۆڵی پاوانگەرایی دەوڵەت لەسەر پیشەسازی مێژوو دیرۆکی ئەو چەوساندنەوەو سەرکوتکردنەیە کەلەسەر کۆمەڵگای ئاواکردووە. لەم قۆناخەدا کۆنترۆڵ یاخود چەوسانەوەی سەرمایەداری لەسەر پیشەسازی یەکجار کەمە. چونکە زیاتر لەرێگای بازرگانیو ربا (سوو)وە بەدوای کەڵەکەکردنەوە بوو. سەرباری کۆنترۆلی دەوڵەت بەڵام پیشەسازی هێزی شکاندنی کۆنترۆلی کۆمەڵگای ئەخلاقی و سیاسی نەبوو. لەبنەڕەتدا خزمەتی پێداویستییە سەرەکیەکانی کۆمەڵگای دەکرد. تەنانەت پیشەسازی سەربازیش زۆر دەگمەن ئەو چوارچێوەیەی دەبەزاند. کەواتە زۆر بەدڵنیاییەوە دەتوانین بڵێین پیشەسازی بۆ کۆمەڵگا سەرچاوەیەکی کێشە نییە، بەڵکو وەک ئامرازی چارەسەرکردن مانابەخش بووە.

هەرچی قۆناخی شارستانی ئەوروپایە ئەم هاوسەنگییە هەستیار، ژیانیو ستراتیژییەی نێوان کۆمەڵگا ـ پیشەسازی تێکداو هەژموونگەرایی خۆی مسۆگەر کرد. ساتی تێکدانی ئەم هاوسەنگیەیە کە پێویستە بکرێتە ئانو ساتێکی مەحشەریو راپەڕینێک بەناوی ئەخلاق، ئایین، زانست، فەلسەفەو هونەر بێتە ئاراوە. سەرمایەداری کە لەسەدەی شازدەهەمەوە پیشەسازی مانیفاکتۆرا، بازرگانیو فینانسی خستە ژێر کۆنترۆلی خۆیەوەو ئیتر دەبوو بەسیستەمی جیهانی یەکەمجاربوو بەو پێگەیە دەگەیشت. سەرمایەدارەکان بەو سیفەتەی خاوەنی ئەو کەڵەکەبوونە بوون کە هەزاران ساڵ بوو لەراڕەوە نهێنیەکانی کۆمەڵگا بەشێوەیەکی بێ ئەخلاقانە لەرێگای قۆرخکردنەوە کۆیان دەکردەوە، لەو سەدەیەدا دەرفەتی خۆیان دۆزیەوە. مێژووناسەکان داگیرکەری دەرەکی (بەتایبەتیش ئیسلامی عوسمانی)، پێکدادانی دەرەبەگە ناوخۆیی، دابەشبوونی کلێساو شەڕە مەزهەبیەکان وەک هۆکاری سەرەکی رەخساندنی ئەو دەرفەتە دەبینن. ئەمەش لایەنی راستی خۆی هەیە. چونکە سەرمایەداری لەخۆیەوە دروست نەبوو. بەڵکو لەلاوازترین ساتی کۆنترۆلی هێزەکانی کۆمەڵگا سەریهەڵدا.

لەبەرئەوەی بەشە پەیوەندیدارەکانی بەرگرینامەکەم بەهێڵە گشتیەکانیەوە ئاماژەی بەو قۆناخەکردبوو لێرە تەنیا بەبیری دێنمەوە.

سەرباری ئەوەی سەرمایەداری مانیفاکتۆرا، فینانسو بازرگانی هاوسەنگیەکەیان لە دژی کشتوکاڵ ـ گوند تێکدا بەڵام هێشتا کەلێنی نێوان جیاوازیەکان فراوان نەببوو. لەم سۆنگەیەوە کۆمەڵگای ئەخلاقیو سیاسی بەرگری لەهەبوونی خۆی دەکرد. هەروەکو چۆن ئایین، زانستو هونەرەکانیش بەتەواوی نەکەوتبوونە ژێر کۆنترۆڵی سەرمایەداری زیاتریش بەرخودانیان لەبەرامبەردا دەکرد.

پێویستە شۆڕشی پیشەسازی وەک بەرهەمێکی سەرمایەداری نەبینرێت. چونکە ماوەیەکی درێژ بەر لەشۆڕشی پیشەسازی لەمیانەی بوارەکانی بازرگانیو فینانسەوە ببوو بەسیستەمی جیهان. زۆر جار ئەم مێژووانە تێکەڵ دەکرێن. لەم ڕێگایەوە پێویستە خاڵێکی دیکەش بەبیربێنمەوە؛ پارەو بازرگانی بەتەنیا مانای سەرمایە نابەخشێن. دراو بەو سیفەتەی ئامرازێکی سادەی ئالوگۆڕە، ئەو بازرگانییەی بەنرخێکی پاوانکاری ئەنجامنادرێت هەردووکیان دەکەونە چوارچێوەی ئابوورییەوەو ئەرکێکی ژیانیو چارەنووسساز لەناو کۆمەڵگادا جێبەجێدەکەن. واتە گواستنەوەو ئالوگۆڕی کاڵا سادەکانو ئەو بازاڕانەی نرخی پاوانگەرایی لەخۆوە ناگرن بۆ ئابووری پێویستنو خەسڵەتی پەرەپێدانی ژیانی کۆمەڵایەتییان هەیە. بەڵام کاتێک دراو ببێتە ئامرازی سووی دەستی سەرمایەدارانو لەڕێگەی بازرگانییەوە نرخی پاوانخواز(هەرزان کڕینو گران بەها فرۆشتن) لەبازاڕەکان پێکبێت ئەوا سیستەم بەرەو سەرمایەداری بوون دەگۆڕێت. لەبەرئەم هۆکارە ئاماژەپێکراوانەوە کاتێک لەسەدەی شازدەهەم ئەو سیستەمە بەسەرکەوتن گەیشت دەرگای قیامەتی کردەوە.

سەدەکانی حەڤدەهەمو هەژدەهەم لەمێژووی مرۆڤایەتیدا وەک سەردەمی هەژموونگەرایی سەرمایەداری بازرگانی باسدەکرێت. هەروەها شۆڕشی پیشەسازی سەدەی نۆزدەهەمیش لەگەوهەری خۆیدا مانای سەرکەوتنی بیری بازرگانی (مارکنتالیزم)یە. ناوەڕۆکو گەوهەری ئەو شۆڕشەش لەداهێنانی ژمارەیەکی زۆری ئەو ئامرازو ئامێرانەیە کە

لەجیاتی دەستی کاری مرۆڤ خۆیان دەتوانن کاربکەن (لەسەرووشیانەوە کەشتیو شەمەندەفەری هەڵمی، ئەو ئۆتۆیانەی بەبەنزین کاردەکەن). ئەمەش هیچ پەیوەندییەکی بەسەرمایەدارییەوە نییە. لەراستیدا کەڵەکەبوونی پراکتیکی هەزاران ساڵەی مرۆڤ ئەم شۆڕشە تەکنۆلۆژییەی بەدیهێناوە. جیاوازی شۆڕشی تەکنۆلۆژی ئەو قۆناخە لەوەدایە؛ بەجۆرێک رێگای لەپێش بزاوتی دراوو بازرگانی کردۆتەوە کە نموونەکەی لەمێژوودا نەبینراوە. واتە لەمیانەی وەبەرهێنانی سەرمایە لەبواری پیشەسازیدا سەرمایەداری بازرگانیو دراو بەخێرایی قازانجێکی زۆریان بەدەست هێنا. زۆرترین قازانجیش یاسای سەرمایەدارییە. ئەویش مانای گەورەترین پێکهاتەی سەرمایەیە. ئەمەش پیشەسازی ناچاری زێدەڕۆییو ئەوپەڕگەری دەکات. دەرەنجامیش قەیرانەکانی بەرهەمهێنانە. بەڵام رێگەچارەی دۆزراوە بۆ دەربازکردنی ئەو قەیرانانە دیسان پیشەسازیبوونی زێدەڕۆیانەیە. وەک پێویستییەکی ئەم یاسایەش تا رۆژی ئەمڕۆمان شێتایەتی پیشەسازی بەردەوامە.

گۆڕانی پیشەسازی بۆ ئیندوستریالیزم، پەیوەندی بەکەوتنە ژێر کۆنترۆڵی سەرمایەدارییەوە هەیە. یەکەمین گەورە فشارو سەرکوتکردنی ئیندوستریالیزم بۆ کۆمەڵگا ئەوکاتە دێتە ئاراوە کە لەجیاتی ئەوەی بەرهەمهێنان بەگوێرەی پێداویستییە سەرەکیەکان بێت، داکۆکی لەسەر قاڵبوونەوە دەرهەق بەو بەرهەمانە دەکات کە زۆرترین قازانج بەدەست دێنن. ئەو کێشە هەمەلایەنانەی نموونەیان لەمێژوودا نەبینراوەو بەسەر کۆمەڵگادا زاڵبوون سەرچاوەی خۆیان لەو واقیعە وەردەگرێن. تێکچوونی خێرای هاوسەنگی نێوان کۆمەڵگای گوند ــ لادێییو کۆمەڵگای شار لەسەدەی نۆزدەهەمدا لەسەرووی ئەم کێشانەوەدێت. بەمجۆرە بەخێرایی پەیوەندی گەورەبوونی تەمەدون (شارگەرایی) لەگەڵ پێوانە کۆمەڵایەتییەکاندا نامێنێت. بەمجۆرەش قۆناخی شاری زەبەلاح (مێگا)[٣] دەست پێدەکات کە لەناوەڕۆکدا مانای نکوڵیکردنی شار دەبەخشێت. ئەگەر

---

[٣] شاری مێگا: شاری زەبەلاح.

شـوێنێک ژمـارەی دانیشـتوانی سـەدان هـەزار تێپـەڕبکات ـــ ملیۆنـان لەولایەنەوە بمێنێت ـ واتە پەیوەندی خۆی لەگەڵ واقیعی کۆمەڵایەتییەوە نەماوە. ئەم قۆناخـەی دەتوانن بەشارگەرایی ناشار یاخود نکوڵیکردنی شاروەسفی بکـەین زەمینـەی گـەورەترین کێشـەی کۆمەڵایەتییـە. شـار بـەو سیفەتەی تـەنیا شوێنی چەوساندنەوەی چینایـەتی نییـە بـەڵکو جێگـای گـەورەترین چەوسـاندنەوەی ژینگەیـە؛ لەئاسـتی واقیعیـو وەهمیشـدا گوزارشت لەشێرپەنجەبوونی کۆمەڵایەتی دەکات.

کاریگەرییە کاولکاریەکانی ئەم دوو سەدەیەی دوایی هەڵاوسانی شار بەژماردن تەواو نابێت. بەڵام جێگیرکردنی رووخـانی کۆمـەڵگای هەزاران ساڵەی کشـتوکاڵ ـــ گونـد لەسـەرووی ئـەم ریزبەندییـەوە دەسـت نیشـانکردنێکی راسـتو بەجێیـە. ئـەو قۆناخـەی لەسـەرەتاکانی سـەدەی نۆزدەهـەم دەسـتی پێکـرد وەک دیـارە لەسـەرەتاکانی ساڵانی ٢٠٠٠ تـەواو بووە. کاولکاری تەنیا بەمانای فیزیایی نەبووە، بەڵکو مانای وێرانکردنی کلتوریو ماددیو مەعنـەوی دەیـان هـەزار ساڵەیە کـە تـەلاری مرۆڤایـەتی بونیاد ناوە. تازە بەتازە ئەنجامـەکانی ئـەو وێرانکارییـە ئاشکرا دەبێت. ئەمـە زەبرێکـی هێنـدە کوشـندەیە؛ هـەر لەئێسـتاوە بـەردوامبوونو بەردەوامنەبوونی کۆمەڵگای مرۆڤایـەتی خستۆتە بـەر گفتوگۆوە. چونکـە ئەگەر تەنیا رێژەی گازی لیمۆنیت(سەرا) بـەو خێراییـەی ئێستا بـەردەوام بێت، ئەوا ناتوانرێت توانای خۆڕاگری کۆمەڵگاو ژینگە بخەملێنرێت. هـەر لەئێستاوە زانست سیناریۆکانی قیامـەتی سەدساڵی تر ئامـادە دەکـات. هەڕەشـەو مەترسـی بنـەڕەتی سـەبارەت بـەخودی کۆمـەڵگاو بونیـادە ناوخۆییەکەیەتی. چونکە بونیادی چینایەتی، ئەقڵی دەوڵـەت ـــ نەتـەوە، ئـابووری نائـابووری، بـێ فەلسـەفەبوون، لـەناوچوونی ئـەخلاق ـــ سیاسەتو قەیرانی بونیادی سەرمایەداری جیهانگیری گوزارشت لـەزیاتری هەرەسهێنانی سیستەم دەکـات. لـەپاڵ ئەمـەدا دۆخـی کائۆسـی سیسـتەمی هەژموونگەرایی شارستانی پێنج هەزار ساڵە جێگای باسە.

## ٢ . ئیندوستریالیزمو نکوڵیکردنی شار

ئاماژەمان بەخەسڵەتی نائاسایی کۆمەڵگای شار کردبوو کە لەکاتی رووخانی کۆمەڵگای کشتوکاڵ ـــ لادێ لەشار ئاواکرابوو. ئەگەر تەماشایەکی مێژووی شاربکرێت ئەوا دەبینرێت کەتا سەرەتاکانی سەدەی نۆزدەهەم دۆخێک نەهاتۆتە ئاراوە کە بەڕادەیەکی جدی هاوسەنگیەکانی کۆمەڵگا تێکبدات. سەرباری ئەوەی هاوسەنگیەکانی نێوانیان لەگەڵ کۆمەڵگای گوند بەردوام لەگۆڕاندایە بەڵام هەندێک جار دەبینرێت کە لەسەربنەمای دابەشکردنێکی بەپێتی کارو پەسەندکراو دەتوانن بەشێوەیەکی هاوبەش بەردەوامی بەکۆمەڵگا بدەن یان کۆمەڵگا بەدۆخێک بگەیەنن توانای بەردەوامکردنی هەبێت. لەگەڵ کەوتنەگەڕی یاسای زۆرترین قازانج کێشە دەست پێدەکات.

ناتوانم رێ لەخۆم بگرمو جارێکی دیکە ئاماژە بەدوو کەموکوڕیو هەڵە گەورەکەی کارل مارکس نەدەم. ئەوەی لای من جێگای داخە؛ بێ چانسیەتی لەدەستنیشانکردنی تەواوی مەترسیەکە سەرباری ئەوەی هەستی پێکردووە. پێویستە هەمان داوەریم سەبارەت چەندین فەیلەسوف، باوەڕمەند، هونەرمەندو زانای هاوشێوە دووبارە بکەمەوە. گوندەکان چۆڵنەکران بەڵکو رووخێنران. رەنج (کارکەر)ی ئازاد سەریهەڵنەدا، بەڵکو کەوتووترین کۆیلایەتی بێ سەردارو خاون ئیرادەی ئازاد (سوپای بێکارانو ئەو مووچەیەی سکی پێ تێر ناکرێت) ئاواکران. لەژێر ناوی بیروکراسیو چینی ناوینەوە بەملیۆنان فیرعەونو نەمرود لەجێگای نەمرودو فیرعەونەکانی چاخەکانی کۆن ئاواکران کە ژمارەیان چەند سەدێکی تێپەڕ نەدەکرد. بەمجۆرەش لەجیاتی تاکخوداوەندێکی داپۆشراو و چەند پاشا ـ خوداوەندێکی دەمامکدار سەردەمی خوداوەندو پاشا رووتەکان دەستی پێکرد کە ژمارەیان بەهەزارانە. ئەو شتگەلەی لێرەدا جێگای باسە بەقوربانیکردنی کلتوری ماددیو مەعنەویی کۆنە ـ کەهێندەی مێژووی مرۆڤایەتی دێرینە ـ بۆ یاسای زۆرترین قازانج. لەوانەیە بگوترێت: چۆن دەشێت پەیوەندی لەنێوان ئیندوستریالیزمو نکوڵیکردنی شار لەخۆی

لەگەڵ ئەو هەموو کاولکارییە دابنرێت؟ هەرچی شیکارەکانمانە سەبارەت بەمۆدێرنیتە بەپێی پێویست ئەو پەیوەندییەی روون کردۆتەوە.

شاری زەبەلاح (مێگا) مانای سەدان شارە کە تێکەڵ بەیەکتری بوون. نکوڵیکردن لەو راستیە شاراوەیە. بۆ ئەوەی شار مانایەکی هەبێت مەرجە تاقانەبێت. هەروەها پێویستە کۆپی یەکتری نەبن. چونکە لەدۆخێکی پێچەوانەدا کەسایەتی شار هیچ مانایەکی نابێت. لەرەوشێکی بەمجۆرەدا ئەوەی کۆمەڵگای لادێ برووخێنێت کۆمەڵگای خۆشی دەڕووخێنێت. چونکە زیادبوونی ژمارە هیچ مانایەک نابەخشێت. لەسەر ئەو بنەمایە ناکۆکی تەنیا لەنێوان بۆرژوازیو کارکەردا نییە. بەڵکو پەیوەندی لەنێوان دامەزراوە پاوانگەراو کۆمەڵگای ژێر هەڕەشەدایە کە کارکەرانیش بەشێکی پێکدێنن. لەیەکێتی سۆڤیەت ئیندوستریالیزم لەرێگای سەرمایەداری دەوڵەتەوە سەرکەوتنی بەدەست هێنا. بەڵام رووخانی خۆشی (سۆسیالیزمی بونیادنراو) وەک تەلارو قەڵایەکی کاخەزی، هەمان حەقیقەتی سەلماندووە، واتە ئیندوستریالیزم سەرمایەدارییە.

هەر لەئێستاوە ئاشکرابووە کە هەسارەکەمانو کۆمەڵگای مرۆڤ بەدۆخێک گەیشتوون بەشی تێرکردنی ئەو شارانەی ئیندوستریالیزم ناکات. نەک تەنیا بۆ چارەسەرکردنی کێشە کۆمەڵایەتیەکان بەڵکو بۆ رزگارکردنی ژینگەو خودی کۆمەڵگاش بەرامبەر بەئیندوستریالیزمو کۆڵەکەکانی پشتی ــ سەرمایەداریو دەوڵەت - نەتەوە ــ پێویستی بەبەرگریکردنێکی خۆیی (گەوهەری)سەرتاسەری هەیە.

### ٣ . ئیندوستریالیزمو دەوڵەت ـ نەتەوە

سەرباری دووبارەکردنەوەی بەردەوام بەڵام دیسان ئاماژەی پێدەکەم کە پەیوەندی نێوان ئیندوستریالیزمو دەوڵەت ــ نەتەوە پەیوەندییەکی هەبوونی مانو نەمانە. سەدەی نۆزدەهەم ئەو سەردەمەیە کە هەردوو دیاردەش بەلوتکە گەیشتوون. ئیندوستریالیزم چەندە پێویستی بە دەوڵەت ــ نەتەوە هەبێت، دەوڵەت ــ نەتەوەش بەو رادەیە پێویستی بەئیندوستریالیزمە. تەواوی ئەو کێشە کۆمەڵایەتیانەی لەژێر دە سەرەدێردا خستمە روو دەوڵەت ــ نەتەوە سەبارەت بەکۆمەڵگای

ئیندوستریالیست یش پەیرەوی دەکات. سەدو پەنجا ساڵ پێشتر کاتێک مارکسیزم نەک تەنیا شیکارێکی تێکەڵی سەبارەت بەئیندوستریالیزمو دەوڵەت ــ نەتەوە پێشنەخستووە، بەڵکو بەناوی پێشکەوتنخوازییەوە وەک دیاردەیەکی ئەرێنی وەسف کرد، روونی کردۆتەوە کە بۆچی سۆسیالیزمی بونیادنراو رووخاوە. دونیا ئەکادیمیەکەی لەئاست تێگەیشتنی ئەو حەقیقەتەدا نەزۆکە، چونکە لەکێڵگەی شارو ئیندوستریالیزم نەشونومای کردووە. بگرە لەوێشدا پێگەیشتووە. هەربۆیە تەنانەت جیهانێکیش خەیاڵ ناکات کە دەوڵەت ــ نەتەوەو ئایینی پیشەسازی تێدا پەیرەو نەکرێت. بەڵام ژینگە دۆستەکان سەرباری بنەچە چینایەتییە ئاماژە پێکراوەکەیان ئەگەر بەشێوەیەکی سنوورداریش بێت ئیتر دەستیان بەبینینی حەقیقەت کردووە. لێرەوە ئەگەر دەوڵەت ـ نەتەوەو ئیندوستریالیزم وەک هێرشێکی ئایدیۆلۆژی، ئابووری و سەربازی گشتگیری هاوبەشو تێکەڵ هەڵسەنگێنرێت واقیعیترە. ئاشکرایە کە سیاسەتی بەرتەسکی سەندیکاگەراییو پارتایەتی بەرامبەر بەم واقیعە بێ مانا دەمێنن. هەروەکو ئاماژەمان پێکرد ئەوەی دەمێنێتەوە بەرگری خۆیی کۆمەڵگاو ژینگەیە.

### ٤ . ئیندوستریالیزمو فاشیزم

دەوڵەت ــ نەتەوە بەو سیفەتەی مانای رژێمی شەڕ دەبەخشێت بەرهەمی هەلومەرجی فاشیزمو ئیندوستریالیزمە. چڕبوونەوەی شەڕی ناوخۆیش لەسەردەمی پیشەسازیدا دەست لێبەرنەدراوە کە سەرمایەداری دەست بەسەر بەرزترین رێژەی قازانجی مێژووی خۆیدا دەگرێت. تاوەکو شەڕ بەرامبەر کۆمەڵگا بەرپا نەکرێت زۆرترین قازانجو سەرمایە بەدینایەت.وەک پێویستییەکی یاسای زۆرترین قازانج دەوڵەت ـ نەتەوەی سەردەمی پیشەسازی ناچارە وەک رژێمێکی شەڕی ناوخۆ خۆی رێکخستە بکات. دژەکردنی دەسەڵات بۆ گشت پێکهاتەو مەمیلەکانی کۆمەڵگا ــ لە دەوڵەت ـ نەتەوەدا ـ گوزارشت لەدۆخی شەڕی ناوخۆ دەکات، کە ئەمەش چوارچێوەی پێناسەی فاشیزم پێکدێنێت. بەهەمان شێوەبوونی میللیگەرایی

توندڕەو بەئایدیۆلۆژیای فاشیزم پەیوەندی بەسروشتی شەڕی ناوخۆوە هەیە.

جیهانگیری شەڕ لەسەردەمی ئیندوستریالیزم لەهەردوو جەنگی جیهانیدا بەتەواوی خۆی سەلماندووە. واتە شەڕی ناوخۆ لەمیانەی جەنگی دەرەکی تەواو دەکرێت. هەرچی هەڵگیرسانی دژوارترین شەڕە ناخۆیی‌و دەرەکیەکانی مێژووە لەم دوو سەدەیەی دوایی ئیندوستریالیزم، هەروەها ڕۆڵ بینینی میلیگەراییە کە وەک ئایینی فەرمی؛ دەشێت لەمیانەی ئەو پەیوەندییە روون بکرێتەوە کە لەنێوان فاشیزم‌و سەرمایەی پیشەسازی لەئارادایە. جینۆساید ئەنجامێکی سەرتاسەریبوونی شەڕەکانی ئەو قۆناخەیە. لێرەدا سەرەکیترین کێشەی کۆمەڵایەتی بەرامبەر فاشیزمی دەوڵەت ـ نەتەوە بەو سیفەتەی دۆخی شەڕی سەردەمی ئیندوستریالیزمە، پەرەپێدانی بەرەی بەرگری خۆیی چین، گەل و نەتەوەی چەوساوەو ستەم لێکراوە.

## ٥ . ئیندوستریالیزم، ژن‌و خێزان

دوای کۆمەڵگای کشتوکاڵ ـــ گوند دووەمین دامەزراوەی کۆمەڵایەتی گرنگ کە لەسەردەمی سەرمایەداری پیشەسازی دووچاری پەرتەوازەبوون بووە خێزان‌و ژنە. بابەتێکی دیکەی گرنگ کە سۆسیۆلۆژیای ڕۆژئاوا پەردەپۆشی کردووە دیسان خێزان و ژنە. خۆی لەڕوونکردنەوەی هۆکارو چۆنیەتی بوویەری رووخانی خێزان دەدزێتەوە. هەروەها هەلومەرجی ماددی دامەزراوەی خێزان کە لەکۆمەڵگای شارستانی بۆتە ڕەوشێکی نەریتی باو، بەهۆی زیادبوونی بێکاری‌و گەندەڵییەوە تارادەیەکی مەزن لەناو دەچێت. بەمجۆرە خێزان هیچ مانایەکی کۆمەڵایەتی نامێنێت. کاتێک تاک لەکۆمەڵگا دادەبڕێنرێت، ئەو پشکەی لەم بابەتەدا دەبێتە بەشی ژن فڕێدانە کۆڵان، رادەستبوونی بەپیاوی باڵادەستە کە بەشێوەیەکی زۆردارانە هەلومەرجێکی ناکۆک بەسروشتەکەی بەسەردا دەسەپێنێت. واتە هەروەکو پڕوپاگەندەی بۆ دەکرێت لەو سەردەمەدا کۆیلایەتی ژن کۆتایی نەهاتووەو ژن ئازادی خۆی بەدەست نەهێناوە. چونکە کۆیلایەتی ژن لەسەردەمی سەرمایەداریدا کۆیلایەتی بازاڕە؛ هێندە قووڵە تەنانەت گشت خانەو

پێکهاتـەکانی جەسـتەی دەکـرێن بـەکاڵا. یـەکێک لەفاکتـەرە گرنگـەکانی قەیرانی ئیندوستریالیزم لەسەر خێزانو ژنـدا جێگـای باسـە. نـەک تـەنیا زیـادبوونی بـەردەوامی دۆخـی تـەلاقو منـدالآنی شـەقام، بـەڵکو چەوسـاندنەوەو دەسـەلآتگەرایی سـنوورنەناسـی رەگەزگـەرایی کۆمـەڵگا قوولآیی ئەو داڕووخانو قەیرانە دەخەنـەڕوو. بـەو سیفەتەی کێشـەی ژنو خێزان لەکۆمەڵگاداو هەروەها چارەسەرکردنیان سەرەکیترین فاکتـەرەکانی ژیـانی ئـازادن، لـەبواری تیـۆریىو کردارییـەوە پێویسـتییان بەهـەوڵو کۆششێکی مەزن هەیە.

## ٦ . ئیندوستریالیزمو ئیکۆلۆژی

ئیکۆلـــۆژی رۆڵێکـــی ژیـــانی لەئاشـــکراکردنی نابـــەردەوامی ئیندوستریالیزمدا بینـی. هـەر ئـەوان بـوون کـە هەڵـەو کەموکوڕیـەکانی شـیکاری سۆسـیالیزمی زانسـتی یـان زانسـتی کۆمەلآیـەتییان سـەبارەت بەسەرمایەداری پیشەسازی ئاشکرا کرد. گرنگترین ئەنجامی پێویستە لـەو خاڵـە هـەڵبهێنجرێت، ئـەو زانسـتەی بەباشـترین شـێوە مـەحاڵبوونی بـەردەوامبوونی سـەرمایەداری ئاشـکرا کـردووە بـواری ئیکۆلۆژییـە؛ نەگونجانو نالەباربوونی سەرمایەدارییە لەگەڵ ژیاندا. ئەگەر سیستەمێک ژینگـە تێکبـدات، واتـە زەمینـەی دەسـت لێبەرنـەدراوی ژیـان تێکبـداتو بـەدۆخێکی بگەیـەنێت دەرفـەتی ژیـانی تێـدا نـەمێنێت، ئاشـکرایە بـەهیچ بیانوویەکەوە ناشێت بـەرگری لـەو سیسـتەمە بکرێـت. لەحاڵەتێکدا بـەو خێراییـەی ئێسـتای بـەردەوام بێـت نـەک تـەنیا دونیـا بـەڵکو سیسـتەمی خـۆریش بەشـی ئیندوسـتریالیزم ناکـات. لەسـەردەمی سـەرمایەداری پیشەسازیدا سیستەم تەنیا بەمانا راستەقینەکەی نەبووە بـەهۆف، بـەڵکو بـووە بـەعزارئیلی راسـتەقینەی ژیـان. چونکـە هـیچ بەهایـەکی کۆمـەڵگا لەپیشەسـازیبوون رزگـاری نـەبووە. بەپیشەسـازی کردنـی سـێکوچکە بەناوبانگەکـەی هونـەر، وەرزشو سـێکس پیشـانیدەدات کـە لەلایـەنی ئەخلاقیو ویژدانییەوە کۆمەڵگا کۆتایی پێهاتووە. بەو سیفەتەی کلتووری مـادیو مەعنەوییـە گـۆڕانی پیشەسـازیو دەوڵەتگـەرایی ـــ نەتـەوە لەسەرجەم بوارەکـانی کۆمـەڵگا بـەر دیـواری ئیکۆلـۆژی دەکەوێت؛ئەمـەش

تەنیا بانگەوازێک نییە بۆ کۆمەڵگای ئازادو دیموکراتی بەڵکو بانگەوازێکە بۆ خودی ژیانیش.

### ٧ . ئیندوستریالیزم، زانستو میدیا

زانستەکانی دیکە لەشیکارکردنی ئیندوستریالیزم نزیک نەبوونەوە کە دەمامکەکەی لەلایەن ئیکۆلۆژیاوە داماڵرابوو. دۆخی پاشکۆیەتی زانست بۆ سیستەم رۆڵێکی دیاریکەری لەمەدا هەیە. بەگوێرەی ئەو پەندەی دەڵێت" سەگ گەز لە خاوەنی خۆی ناگرێت" دونیای ئەکادیمیو زانستیش گەز لەسەردارەکانیان ناگرن. ئەگەر ناوە بەناوە پێیان بڕەون کاتێک لەتێکیان بۆ فڕێدەدرێت یەکسەر بێدەنگ دەبنو درێژە بەخزمەتی خۆیان دەدەن. من داکۆکی لەسەر ئەوە دەکەمەوە کە بەلانی کەم بەئەندازەی رەواکردنی میتۆلۆژیانەی سیستەمی چەوساندنەوەو زۆرداری لەلایەن راهیبەکانی سۆمەرو میسرەوە رەواکردنی سیستەمی سەرمایەداری لەلایەن "زانستگەراییەوە" جێگای باسە. لەکاتێکدا بەناو زانستو جیهانی ئەکادیمی بیانووەکانی رەواپێدانی تیۆری ئامادە دەکەن، دونیای میدیاش پڕوپاگەندەی بۆ دەکات. سیستەمێک کە نالەباریو نەگونجانی لەگەڵ ژیانو کۆمەڵگادا ئاشکرابووە مایەی تێگەیشتنە کە بۆچی پەرە بەئامرازە هاوچەرخەکان و راگەیاندنی ئەمڕۆ دەدات. نەک تەنیا میدیا، بەڵکو سەرجەم دونیای نواندن ــ پیشاندان، پیشەسازی، هونەر، وەرزشو سێکس لەگەڵ تێزە زانستی، گومڕاو لادەرەکان دەکرێت بەیەک، بەمجۆرە سات بەساتی دڵو مێشکی تەواوی مرۆڤایەتی بۆردومان دەکەن. چونکە بەبێ ئەو بۆردومانە تەنیا لەرێگای ئامرازە رووتەکانی توندوتیژییەوە ناتوانن درێژە بەسیستەم بدەن.

هەیمەنەی سەرمایەداری هێزی سەرەکی خۆی لەهەژموونگەرایی ئایدیۆلۆژییەوە وەردەگرێت. ئەو راگەیاندنەی بووە بەپیشەسازیو زانستێک کە بووە بەپاشکۆو دەسکێکی دەسەڵاتو دەوڵەت ـ نەتەوە چەکی سەرەکی ئەو هەژموونگەراییەیە. رزگاری کۆمەڵگا بەر لەهەموو شتێک لەم دوو بوارەدا پێویستی بۆشۆڕش هەیە.

## ج . قەیرانی مۆدێرنیتەی سەرمایەداریو ڕێگەچارەی شیمانەکراو

تێزی سەرەکی بەرگرینامەکەم لەو بارەوەیە کە سیستەمی شارستانی ئەوروپا بەردەوامی سیستەمی هەژموونگەرا نەریتیەکانە کە لەسەر بنەمای سەرمایەداری دووچاری گۆڕان هاتووە. ئەو پێنج سەدەیەی دوایی سیستەمی شارستانی ناوەندی پێنج هەزار ساڵەی ڕەگەکەی بۆ میزۆپۆتامیا دەگەڕێتەوە لەلایەن هەندێ هێزی پێشەنگی پشتبەستوو بەئەوروپا لەسەر بنەمای ستراتیژی رزگاریو هێرشکردنەوە بۆ سیستەمێکی جیهانی نوێ وەرچەرخێنراوە. ئەو تایبەتمەندێتییە سەرەکیانەی بۆ سەرجەم سیستەمەکانی شارستانی لە ئارادایە بۆ مۆدێرنیتەی ئەوروپاش لەجێگای خۆیدایە. یەکەمیان؛ کێبڕکێو هەژموونگەرایی، دووەمیان؛ ناوەند ـ کەنار، سێیەمیان؛ ماوەکانی قەیرانی بونیادیو هەلومەرجی هەنووکەیی. هەروەها وەک لەهەر سیستەمێکی شارستانیدا دەبینرێت هەبوونی هێزە هەژموونگەراکانو هێزە یەکسانیخواز ـ دیموکراسیخوازەکان لەناو مۆدێرنیتەی ئەوروپاشدا جێگای باسە. ناکۆکی سەرەکی لەنێوان ئەو دوو هێزەدایەو بەدرێژایی مێژووش ناکۆکی لاوەکی لەناو هەریەک لەم دوو هێزەدا هەبووە. بەگشتی هێزە هەژموونگەراکان سەرکەوتنیان لەو ململانێیانەدا بەدەست هێناوە.

بۆ یەکەمین جار لەشارستانی ئەوروپا (مۆدێرنیتەی ئەوروپا) سەرمایەداری بووە بەسیستەمی جیهان. لەمیانەی ئاواکردنی پاوان لەسەر بازرگانی، فینانسو پیشەسازی، ڕێکخستنی شێوازی دەوڵەت ـ نەتەوەو پەرەپێدانی بەردەوامی ئیندوستریالیزم بەو هێزە گەیشتووە. وەرچەرخانیشی بۆ شارستانیەکی ناوەندی لەسایەی جێگیربوونی لەخۆرهەلاتی ناوینو بەپلەی دووەمیش داگیرکردنی چین، هیندستان، ئەمریکاو ئەفریقیاو کردنیان بەپاشکۆی خۆی بەدیهاتووە. کۆڵەکە سێیانیەکەی مۆدێرنیتەی ئەوروپا پشتی پێدەبەستێتو توانای چارەسەرکردنی کێشە کۆمەڵایەتیەکانیان لەدەستداوە کە لەبنەڕەتدا خۆیان هۆکاری سەرهەڵدانیانن. کۆڵەکە سەرەکیەکەی مۆدێرنیتەی

سەرمایەداری خۆی هۆکاری قەیرانە، لەبەر ئەوەی یاسای زۆرترین قازانج بەبنەما دەگرێت، پێداویستییە سەرەکییەکانی کۆمەڵگاو ژینگە فەرامۆش دەکات، هیچ کاتێک لەقەیران رزگاری نابێت. بەرهەمهێنانی زێدەڕۆیانەو هەژاری بەردەوام لەناو یەکتردان. هەرچی دەسەڵاتە کە لەمۆدێرنیتەدا سەرلەنوێ بەسیفەتی دەوڵەت ـ نەتەوە شێوەی گرتووە، لەسەرحیسابی کۆمەڵگا تا ئاستی فاشیزم خۆی بەرزدەکاتەوەو سیستەم بۆ رژێمێکی شەڕی ناوخۆو دەرەکی بەردەوام دەگۆڕێت.

تەنیا لەرێگای دۆخی شەڕی بەردەوامەوە دەشێت درێژە بەدۆخی قەیرانی بەردەوام بدرێت. شۆڕشی پیشەسازی کە لەهەناوی مۆدێرنیتەی ئەورووپا پەرەی پێدراوە لەمیانەی خۆراک پێدانی هەردوو کۆڵەکەکەی یەکەمی قەیرانەکە قووڵترو خەستتر دەکاتەوە. ئەو سیستەمەی بەشێوەی سێ ئەسپسوارەکەی مەحشەر کاردەکات رێگای لەپێش داوەری "مرۆڤ گورگی مرۆڤە"کردەوە کە لەکاتی لەدایکبوونیدا هۆبزی فەیلەسوف ئاماژەی پێکردبوو. بەڵام لەقۆناخی هەرەسدا لەدۆخی گورگی یەکتر دەرکەوتن، بوون بەگورگێک جگە لەخواردنی بەچکەکانی خۆیان هیچ چارەیەکی دیکەیان نەمابوو. تەنیا دەشێت بەمجۆرە راڤەی لەناوچوونی ژینگەو کۆمەڵگای ئەخلاقیو سیاسی بکرێت. قەیرانی سەرمایەی فینانسی رۆژی ئەمڕۆمان، دۆخی دیارو ئاشکرای قەیرانی بونیادی مۆدێرنیتەیە. هەرچی سەرچاوەگرتنێتی لەئەمریکا، بەپلەی یەکەمیش جیهانگیری خێرای لەیەکێتی ئەورووپا؛ بەڵگەی سەلمێنەری تەواوبوونی وەرچەرخانی مۆدێرنیتەیە بۆ سیستەمێکی جیهانی.

ئەوەی لەسیستەمی جیهان لەئارادایە تەنیا قەیرانی فینانس نییە؛ بەڵکو گوزارشت لەشکەلێکی زیاتر لەقەیرانی بونیادی سەرمایەداری دەکات. چونکە ئەوەی جێگای باسە قەیرانی شارستانی پێنج هەزار ساڵە. هەرچی رەنگدانەوەیەتی لەبواری فینانسدا، هێمایەکە بۆ چۆنیەتی پێکهاتنی جیهانێکی گریمانەیی کە لەراستییە کۆمەڵایەتییەکانو ماناکەیان دابڕاوە. لەهیچ قۆناخێکی مێژووودا سیستەمێکی تاڵانو دزی گریمانەیی هێندە زەبەلاح (بەبڕی ٦٠٠ترلیۆن دۆلار دەخەملێنرێت)ئاوا نەکراوە.

ئەم واقیعەش تەنیا لەهەلومەرجەکانی زەبەلاحی مێژوویی‌و هەنووکەیی سیستەمی شارستانیدا پێکدێت. بەلام ئەوەی لەقەیرانی رۆژی ئەمرۆماندا تایبەتە بونیادە سێ نهۆمیەکەیەتی. چونکە بەشێوەیەکی تێکەڵ، بونیادی‌و بەرجەستە لەناو شارستانی ناوەندی پێنج هەزار ساڵە، بەتایبەتیش شارستانی سەرمایەداری پێنج سەد ساڵی لەدۆخی بەرجەستەی قەیرانی فینانسی هەنووکەییەدا دەژیت کە بەشێوەیەکی تێکەڵ و بونیادی لەئارادایە.

## أ. ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا

ئەمریکا بەو سیفەتەی هێزی هەژموونگەرایی سیستەمە، ئەو توانایەی هەیە کە لەرێگای خۆنوژەنکردنەوە لەقەیرانی بونیادی رزگاری بێت. بەلام ئەو رزگاربوونە هیچ کاتێک نایگەیەنێتەوە ئاستی هێزی هەژموونگەراییەکەی سەدەی بیستەم. ئەو جارە لەمیانەی هاوبەشێتیکردن لەگەڵ هێزی زیاترەوە لەسەرووی هەمووشیان یەکێتی ئەوروپاو ژاپۆن هەولی بەردەوامکردنی هەژموونگەرایی خۆی دەدات. هەژموونگەرایی ئەمریکا ناچارە تەنیا وەک بەردەوامیەکی ئیمپراتۆریەتی بریتانیاو هاوپەیمانێکی ستراتیژی ئینگلتەرا نەمێنێت، بەلکو درێژە بەنەریتە دیموکراتیەکەشی بدات. پێویستە ئەمریکا هێزی خۆی تەنیا لە فاکتەرو توخمە هەژموونگەراکان وەرنەگرێت، بەلکو پێویستە هێزی خۆی لەو گروپە جیاوازو هەمەجۆرانەش وەربگرێت کە خاوەن نەریتی دیموکراتین. لەوانەیە بلێین چونکە ئەمریکا بەشێوەیەکی سەرکەوتووانە نوێنەرایەتی کلتووری ماددی‌و مەعنەوی کەڵەکە بووی پێنج هەزار ساڵە دەکات بۆیە هەژموونگەرایە. لەم سۆنگەیەوە تواناکانی خۆ نوژەنکردنەوەی زۆرە. بەهۆی ئەو جێگیربوونەی هێز کە ئێستا هەیەتی دەرفەتی نییە بەبونیادێکی نوێوە لەو قەیرانە دەربکەوێت. لەسەردەمی نوژەنکردنەوەدا قورسایی دەخاتە سەر بەرگریکردن لەهەژموونگەراییەکەی. جگە لەهێرشکردنە سەر سەنگەرەکان توانای بەردەوامکردنی هێرشێکی سەرتاسەری نییە.

## ب . یەکێتی ئەوروپا

وڵاتانی یەکێتی ئەوروپا بەو سیفەتەی خاوەنی وەرچەرخانێکی سەرمایەداریانەی سیستەمی شارستانی ناوەندین درێژە بەقورسایی خۆیان دەدەن. هەروەها بەردەوامی بەهاپەیمانێتیە ستراتیژیەکەی خۆی لەگەڵ ئەمریکا دەدات. بەڵام وڵاتانی یەکێتی ئەوروپا ناچارن خۆیان نوژەنبکەنەوەو ریفۆرم ئەنجام بدەن. ئەو هێزانەی ریفۆرم لەسەرمایەداری، دەوڵەت ــ نەتەوەو ئیندوستریالیزمدا بکەن زیاتر لەو وڵاتانەدا سەرهەڵدەدەن. چونکە ئەو وڵاتانە لەناو قووڵایی مێژووی پێنج سەد ساڵەی مۆدێرنیتەدا ژیاون. هۆکارەکەشی بۆ ئەوە دەگەرێتەوە کە چارەسەرکردن لەشوێنی هەبوونی نەخۆشیەکە دەبێت. خودی یەکێتی ئەوروپاش سەرچاوەی خۆی لەپێویستی ریفۆرمی هەرسێ کۆڵەکەکە وەردەگرێتو یەکێک لەبەرهەمەکانیەتی. واتە سەرمایەداری، دەوڵەت ـ نەتەوەو ئیندوستریالیزم لەدۆخی بەرجەستەی یەکێتی ئەوروپا لەبواری سۆسیالیزم، دیموکراسیو ژینگە بەریفۆرمدا تێپەردەبێت. ئەو هەنگاوانەی هاوێشتراوە چەندەی دەچێت خێراتر دەبێت. یەکێتی ئەوروپا بەو سیفەتەی لەتەواوی جیهانی گەیاندندا لەسەرجەم هێزەکانی دیکە زیاتر دەبیستێتو خاوەن مەعریفەیە زۆر چاک دەزانێت کە بەبێ ئەنجامدانی ریفۆرم ناتوانێت بەردەوامبوونی مۆدێرنیتەکەی زامن بکات. لەراستیدا ئەزموونی مۆدێرنیتەی ئەو پێنج سەد ساڵەی دوایی تێیدا ژیاون تادوارادە فێرکەرو سوود بەخشە. لەدۆخێکی بەمجۆرەدا ئەگەرێکی بەهێزە کە ئەمریکا لەرێگای نوژەنکردنەوە، یەکێتی ئەوروپاش لەمیانەی ریفۆرمەوە بەیەکەوە هەوڵی رزگاربوون لەو قەیرانە سیستەماتیکە بدەن. چاوەروانیکردنی قەلەمبازی سیستەمێکی نوێ لەیەکێتی ئەوروپا واقیعی نییە. دەشێت لەرابوونێکی نوێی زانستیو فەلسەفی سیستەمی نوێدا رۆڵی ناوەندێکی فێرکەرو ئەزموونبەخش ببینێت. بەڵام لەناو هێزو بزاوتەکانی سیستەمی نوێی چاوەروانکراودا رۆڵی سنووردار دەبێتو ناتوانێت رۆڵی سەرەکی ببینێت.

## ج . ژاپۆن

یەکەمین هاوپەیمانی هەژموونگەرایی ئەمریکایە لەرۆژهەلاتی ئاسیاو هێزێکە زیاترین کاریگەری قەیرانی بونیادی لەسەرە. ئەو هێزەیە کە سەبارەت بەنوژەنکردنەوەو ریفۆرم دووچاری زەحمەتی هەرە زۆر بۆتەوە. خاوەن خەسڵەتو تایبەتمەندێتی زێدەڕۆیی محافەزەکارانەیە. لەهەر هەلومەرجێکدا درێژە بەدۆخی هاوپەیمانێتی ئەمریکا دەدات. هەرچی کۆریای باشوورە بەردەوامی بەرۆڵی ژاپۆنێکی بچووک دەدات.

## د . چین

چین کە خاوەنی یەکێک لەناوەندە کۆنەکانی شارستانی رۆژهەلاتی ئاسیایە لەرێگای سەنتێزی لیبرالیزمو سۆسیالیزمی بونیادنراوەوە هەوڵدەدات ئەزموونێکی تایبەتی سەرمایەداری، دەوڵەت ـ نەتەوە و ئیندوستریالیزم بژێنێت. چاوەڕوان ناکرێت پێکهاتەیەکی جیاوازتر لەمۆدێرنیتەی تەوەرەی ئەوروپا بخاتە روو. بەڵکو بەپێچەوانەوە هەوڵدەدات پاشڤەڕۆترین جۆری هاوشێوەی بچمی ئەڵمانی (بروسیا) تۆکمە بکات. وەک بانگەشە دەکرێت چاوەڕوانی ناکرێت وەک هێزێکی هەژموونگەرایی ناوەندی نوێ شوێنی ئەمریکا بگرێتەوە. دەشێت ریفۆرمێکی سەرمایەداریانەی سنووردار بەخۆیەوە ببینێت کە بەلیبرالیزەبوون ناودەبرێت. هەروەها بەشێوەیەکی وشک بەردەوامی بە دەوڵەت ـ نەتەوەو ئیندوستریالیزم دەدات. چونکە بەشێوەیەکی دیکە ناتوانێت درێژە بەگەشەپێدانی سەرمایەداری بدات. دەشێت وەرچەرخانێکی دیموکراتی سۆسیالیستیش وەک ئەگەرێک بکەوێتە رۆژەڤەوە. پێویستە ئەو کاتە پێشبینی ئەو ئەگەرە بکرێت کە قەیرانی بونیادی سەرمایەداری قووڵتر دەبێتەوە. دەشێت ڤێتنامو کۆریای باکوریش وەک چینێکی بچووک هەڵسەنگێنرێت.

## ه . هیندستان

هیندستانیش وەک روسیاو بەرازیل بەتەواوی لەگەڵ سیستەمی هەژموونگەرایی نەبوونەتە یەک، بەڵام نەیانتوانیوە ببن بەناوەندێکی هەژموونگەرایی سەربەخۆش. ئەگەرێکی زەحمەتە لەماوەی درێژخایەندا

ئـەم پێگـەی خۆیـان دەربـاز بکـەن. لەبنەڕەتـدا لـەناو مۆدێرنیتـەی سەرمایەداریدا دەژین. ئەگەری هـەرە بـەهێز ئـەوانیش وەک چین خۆیـان تۆکمە بکەن. بەهەرەو توانای ئاواکردنی سیستەمێکی نوێو تایبەتیان نییە. پێگەی روسیا دوای حەفتا ساڵ ئـەزموونی سۆسیالیزمی بونیـادنراو جگـە لەمۆدێرنیتـەی سـەرمایەداری هـیچ ئـەنجامێکی دیکـەی لەگـەڵ خۆیـدا نەهێناوە. دەشێت لە هیندستان زیـاتر نەریتـە دیموکراتیـەکان دەرکەوێتـە پـێش. چارەنووسـی بـەرازیل یـش گرێـدراوی هەسـتانی دیموکراتییانـەی ئەمریکای باشوورە.

**و . ئەمریکای باشوور**

لەسەردەمی قەیرانی بونیادیدا ئەمریکای باشوور دەتوانێت هەستانو پێهەڵگرتنی دیموکراتییانەی تایبـەت بـەخۆی ئەنجامبدات. بـەڵام بـەهێزی بونیادە ئۆلیگارشیەکان لـەو وڵاتانـەدا لەوانەیـە بەشێوەیەکی جدی ئـەو جـۆرە پێشـهاتانە بەربەسـت بکـات. تەنانـەت پێچەوانەشـی بکاتـەوە. بەتایبەتیش کە هێشتا زەمینەی تیۆریو کرداری پێهەڵگرتنی دیمـوکراتیش هێندە پەرەینەسەندووە. لەگەڵ ئەوەی جڤـاتی ئـەو وڵاتانـەن کـە دەتـوانن زیـاترین بـەرخودان بەرامبـەر هەژموونگـەرایی ئـەمریکا ئـەنجام بـدەن، بەڵام وەک دیارە زەحمەتە بتوانن سیستەمێکی دیموکراتی ـ سۆسیالیستی تایبـەت ئاوابکـەن. بەگشتیکردنی نموونـەی کوبـاش پێویستی بەشـەڕێکە بەرامبـەر بەئـەمریکا، زەحمەتـە بەتـەنیا هێزێکـی بـەمجۆرەیان هـەبێت. لاوازیەکەیان سەرچاوەی خـۆی لەناتـەواوی پێشـەنگایەتی وردەبـۆرژوازی هێـزە دیموکراتیـەکان وەردەگرێـت. سـەرباری ئەمـەش ئـەمریکای باشـوور لەمیانەی هێزە بە ئیرادەو خاوەن بانگەشەکانی وەک تاقیگەیەکی زیندووی گەڕان بەدوای سیستەمێکی دیموکراتی ـ سۆسیالیستی وایە.

**ز . ئەفریقیا**

تـا ئێسـتاش هێـزی ئـەفریقیا زۆر سـنووردارە کـە بـەناوی خۆیـەوە قسـەبکات. لەسـەردەمی دەرکـەوتن لەداگیرکـەری کلاسـیکیو تیرەگەراییـدا دەژیـت. وەک دیـارە چارەنووسـی گرێـدراوی چارەنووسـی جیهانـە، کامـە خوداوەنـد یـاخود هێـزی گەلـەری حـوکمڕانی بکـات بـەگوێرەی ئـەو

پەرەدەسێنێت. ناشێت لەئاستی ئەمریکای باشوور ئەزموونی تاقیگەی کۆمەلایەتی بەخۆیەوە ببینێت. هەربۆیە هەلسەنگاندنی وەک دایکێکی هیوابەخش گونجاوترە.

## ر . خۆرهەلاتی ناوین

هەلسەنگاندنی خۆرهەلاتی ناوین وەک ناوچەیەکی کلتووری دێرین لەجیاتی جڤاتی ولاتان ئەنجامی مانادارتر دەدات بەدەستەوە. هەرچۆنێک بێت هێزی رەسەن‌و نوێنەری کلتووری رۆژهەلاتە. راستتر زەمینەیەتی. هێزی هەژموونگەرایی چوارهەزارو پێنج سەد سالی شارستانی ناوەندییە. خاوەنە دەهەزار سالیەکەی چاخی نیولیتیکە. هەرچەندە ئەمرۆ بووبێتە پاشکۆی شارستانییەک کە ئەوروپا سەرجەم توانستە ماددی و مەعنەویەکانی لەخۆی زەوتکردووە. بەلام دیسان مێژوویێکی بەمجۆرە یەکسەر لەناو ناچێت. لەم دوو سەدەیەی دوایی مۆدێرنیتەی ئەوروپا قورسایی خۆی خستۆتە سەر خۆرهەلاتی ناوین. ئەوروپا توانی لەسەپاندنی مۆدێرنیتەی خۆی بەسەر جیهاندا سەرکەوتن بەدەست بێنێت. هەروەکو چۆن لەرۆژی ئەمرۆمان‌دا بەشێوەیەکی زیندوو و راستەوخۆ دەیبینین، ناتوانن بلێن سەرکەوتنێکی هاوشێوەی لەخۆرهەلاتی ناویندا بەدەست هێناوە. ئەوروپا زەحمەتی لەوەدا نابینێت کە هێزو بەرخودانی دەولەتان بەرامبەر خۆیدا دەبینێتەوە. ئەگەر هێزی بەمجۆرە جێگای باس بوایە کارەکەی زۆر ئاسان بوو. ئەوەی بەرخودان دەکات‌و نوێ نەبۆتەوە زیاتر نەریتی کلتوورییە کە بینینی زەحمەتە. تەنانەت ئەوانەی خۆیان وەک نوێنەرە هاوچەرخەکانی کلتووری ناوچەش دەناسێنن ئەگەر بخوازن‌و هەولیش بدەن، هەروەکو لەناوچەکانی دیکەی جیهان بینرا ئەم کلتوورە رادەستبوون بەکلتووری ئەوروپا پەسەند ناکات. لەهێزی نوێنەرایەتی زیاتر، پەسەندنەکردن سەرچاوەی خۆی لەهێزی نەریتەکان وەردەگرێت. بەلام ئەو نەریتە خۆی لەئیسلامی رادیکال‌و سۆسیالیزمی بونیادنراودا نابینێتەوە. هەروەها سەرمایەداری، دەولەت ـ نەتەوە و ئیندوستریالیزمی مۆدێرنیتەش توانای گونجان‌و یەکگرتنی لەگەل نەریتدا نییە. ئەوەی لەئارادایە نموونەی کائۆسە.

یەکەمین جار لەمێژوودا سەنتێزی رۆژهەڵات ـ رۆژئاوا لەسەردەستی ئەسکەندەری مەزن بەدیهات. دەتوانرێت بگوترێت کە بەدرێژایی پێنج سەد ساڵ سەرکەوتووانە نوێنەرایەتی نەریتێکی کرد. نەریتی هێلینی بەو سیفەتەی کلتوورێکی سەرکەوتوو بوو کاریگەری کردە سەر تەواوی شارستانیەکانی دوای خۆی. شوێنپەنجەیەکی گەورەی لەکلتووری موسەوی، مەسیحی، ئیسلامیو هیندیدا بەجێ هێشت. زانیبووی چۆن ببێت بەهەویری سەرەکی مۆدێرنیتەی رۆژئاوا.

بەڵام سەبارەت بەهێزەکانی رۆژئاوای ئەوروپا (لەناوەڕۆکی خۆیدا هەڵمەتی ئەسکەندەر پشت بەکلتووری شارستانی گریکو کلتووری تیرەگەرایی بەلقان دەبەستێت) واتە هێزی ئەو سەردەمەی میرنشینو پاشایەتیەکان تێیدا گەشەیان کردوو بەشەڕی خاچپەرستەکان (١١٠٠ ـ ١٤٠٠) ناو دەبرێت؛ لەکاتی پەلاماردانیان بۆ خۆرهەڵاتی ناوین چاوەڕوانی هەمان سەرکەوتنیان لێنەدەکرا. چونکە ئەو جیهانەی پشتیان پێدەبەست وەک کلتووری ماددیو مەعنەوی لەهەموو بوارێکەوە لەخۆرهەڵاتی ناوین دواکەوتووتر بوو. تەنیا دەیتوانی ئەو بەها کلتووریانە بۆ خۆی ببات کە پێویستیەکی زۆری پێیان هەبوو. لەم لایەنەشەوە سەرکەوتوو بوو، دوای شێلانی بەو کلتووورە جێگیرە شارستانی خۆیان بەرزکردەوە.

تائێستاکەش هێرشەکانی ئەو سەدەیەی دوایی بۆ سەر خۆرهەڵاتی ناوین بەردەوامە (ناپلیۆن دەستی پێکردبوو، بریتانیا پەرەی پێدابوو، ئەمریکاش بەردەوامی پێدەدات). بەتایبەتیش لەرۆژی ئەمڕۆمان ئەو هێرشە بەشێوەی شەڕی گەرمو سارد لە ئەفغانستانەوە تا تونس، لە قەفقاسیاوە تا دەگاتە ئەفریقیای ناوین لەزۆر ناوچە درێژەی پێدەدرێت. ئەوەی لەئارادایە لاوازترین دۆخی سیستەمە. بەمانایەکی تر خۆرهەڵاتی ناوینی نەریتی لاوازترین ئەڵقەی مۆدێرنیتەی رۆژئاوایە. لەو دووسەدەی دوایی هەوڵی جێگیرکردنی کۆڵەکە سێکوچکەییەکەی دراوە، بەڵام ئەو هەوڵانە جگە لەقووڵکردنەوەی قەیرانو کائۆس هیچ رۆڵێکی دیکەی نەبینی.

هەرچی بەکرێگیراوەکانی مۆدێرنیتەن کە لەجیلوەی ئیسلامی ــ رادیکاڵەکان بن یان میانڕەوەکان ــ دەجووڵێنەوە، بوون بەخۆیو بەهاراتی رەوشی نوێی کائۆس. نەوەک ئیسلام، نە بەشێوەیەکی دیکە بۆ ئاواکردنی سیستەم خاوەن ئاسۆو توانا نین. سەرباری ئەوەی دۆخێکی خراپتر لەئەنارشیزمو کائۆس لەناوچەدا جێگای باسە، بەڵام ناتوانرێت باس لەدەستپێکردنی هەستانو پێهەڵگرتنی سەرکەوتووانە بکرێت. ئەوەی جێگای ئاماژەپێکردنە کوڵانی بەردەوامی دۆخی کائۆسە. هەر کوڵانێکیش مانای پێکهاتنی تێکەڵەیەکی نوێی توخمە جۆراوجۆرەکانە. یەکێک لەو ئەگەرانەی دەشێت لەئاکامی ئەو تێکەڵانە بێتە ئاراوە لەوانەیە سەنتێزێکی تایبەتی رۆژهەڵات ــ رۆژئاوا بێت. نە دەشێت رۆژهەڵات یەکێک لەجۆرەکۆنەکانی شارستانی خۆی سەرلەنوێ زیندوو بکاتەوە، نە رۆژئاواش دەتوانێت یەکلایەنە مۆدێرنیتەی خۆی ئەمپۆزە یان موتوربە بکات. بەهرەی پێکهاتە زانستیو بزووتنەوە رێکخستنیەکان بۆ وەڵامدانەوەی کێشە کۆمەڵایەتیەکان تایبەتمەندێتی سەنتێزی پێکهاتوو دەستنیشان دەکات.

ئەنجامدانی پێهەڵگرتنێک لەمیانەی نکوڵیکردنی لایەنەکان لەیەکتری لاوازترین ئەگەرە. هەروەها بەپێی پێویست ئاشکرابووە کە هەستانو پێهەڵگرتنی نوێ لەمیانەی رۆژهەڵاتناسی زانستی رۆژئاواش ئەنجام نادرێت. هەرچی زانستی سروشتی کۆمەڵگای رۆژهەڵاتە تەنیا لەچاوەڕوانی پێشەنگەکانیدایە. هەرچی هەڵمەتی چاوەڕوانکراوە لەمیانەی ئافراندنی ئەم زانستە، رێکخستنی، بزاوتنو بەکۆمەڵگا بوونی فەراهەم دەبێت. بەشی دواتر ئەگەری ئەم هەڵمەتە هەڵدەسەنگێنێت.

بەشی شەشەم

# قەیران لەکۆمەڵگای خۆرهەڵاتی ناوین‌و چارەسەری شارستانێتی دیموکراتیک

## أ . پێناسەکردنێکی راست بۆ ژیان لە خۆرهەڵاتی ناویندا

ئەرکی سەرەکی زانستی کۆمەڵایەتی پێناسەکردنی ژیانە. لەراهیبەکانی سۆمەرو میسرەوە تا دەگاتە زانستگەرا کۆمەڵایەتییە پۆزیتیڤیستەکانی ئەوروپا تەواوی ئەوانەی بانگەشەی سەرقاڵبوون بەزانستەوە دەکەن هەروەکو چۆن مانای کۆمەڵایەتی ژیانیان پێناسە نەکردووە، بەڵکو لەجیاتی ئەو ئەرکە سەرەکییە چەواشەکارترین‌و بیرکوێرکەرەوەترین گوزارشتی میتۆلۆژییان داهێناوە. ئەگەر لەچوارچێوەی کۆمەڵایەتیدا پێناسە بۆ ژیان نەکرێت، ئەو کاتە ناشێت باس لەزانستی کۆمەڵایەتی بکرێت. شتێک پێناسە نەکرابێت، زانستەکەشی نییەو پەرەی پێنادرێت. بێگومان ئەو دۆخە پەیوەندی بەبونیادنانی چەواشەکارانەی حەقیقەتەوە هەیە کە لەلایەن سیستەمەکانی شارستانییەوە ئەنجام دراوە. هەروەکو چۆن لەساتەکانی دەستپێکەوە تا دەگاتە رۆژی ئەمڕۆمان لەسیستەمەکانی شارستانیدا ژیانی کۆمەڵایەتی حەقیقەت روون ناکاتەوە، لەمیانەی پۆلێنەکانی میتۆلۆژی، ئایینگەرایی، فەلسەفەگەرایی‌و زانستگەراییەوە تاڕادەیەکی زۆر بەشێوەی بونیادو باسی چەواشەکارو چەوت گەیەنراوە. هەروەها ئەم باسانە لەرێگای هونەرەوە جیلوەکراوە. کلتووری ماددی شارستانی لەگەڵ کلتووره مەعنەویەکەیەوە دەخرێتە ناو پەیوەندی دیالیکتیکیەوە، بەمجۆرەش شێوازێکی ژیانی بەگوێرەی ئارەزوو، باوەڕی‌و بەرژەوەندیەکانی خوداوەندە رووت‌و داپۆشراوەکان لەمیانەی باسێکی زانراو یاخود رێپێدراوی مێژووەوە بەندەکان فێری شێوازێکی ژیان کراون.

هەرچەندە ئەم شێوازەی فێرکردن و بونیادنانی ژیانی هەژموونگەرایی لەلایەن دانا، بزاوت و جڤاتی لەژمار نەهاتووەوە رووبەڕووی نارەزایی بوویێتەوەو بەرخودانی لەبەرامبەردا کرابێت بەڵام دیسان درێژەی بە هەبوونی خۆیداوە.

لەبەشە جیاوازەکانی بەرگرینامەمدا، بەتایبەتیش لەو بەشانەی باسی ئازادی دەکەن، هەوڵمداوە ژیان بە گشتی، بەتایبەتیش ژیانی کۆمەڵایەتی مرۆڤ پێناسە بکەم. لەژێر رۆشنایی ئەو وەبیرهێنانەوەیەدا جارێکی دیکە پێویستیم بە پێناسەیەکی گەوهەری سەبارەت بەژیان بینی. بەتایبەتیش ئەو تیرۆر، کۆمەڵکوژیو جینۆسایدە رۆژانەییەی ژیان لەخۆرهەڵاتی ناوین دووچاری هاتووە ناچارم دەکات پێناسەیەک سەبارەت بەبابەتی ژیان بکەم کە لەقووڵاییدا مایەی تێگەیشتن بێت و ئاستێکی پێگەیشتوو و بەرزی هەبێت.

بەبڕوای من گەورەترین خراپەکاری سەرمایەداری؛ لەناوبردن یاخود نەهێشتنی پێناسەی ژیانە. بەواتایەکی تر گەورەترین خیانەتە بەرامبەر پەیوەندیی ژیان بەکۆمەڵگاو ژینگەکەیەوە. هەڵبەتە لەدۆخێکی وەهادا سیستەمی شارستانی ــ کە پاڵپشتێتی ــ ئەویش بەقەدەر خۆی بەرپرسیارە. باس لەوە دەکرێت کە لەبەهێزترین سەردەمی زانست و گەیاندندا دەژین. بەڵام سەرباری ئەو پێشکەوتنە نائاساییەی زانست زۆر سەیرە کە تا ئێستا ژیان و چوارچێوە کۆمەڵایەتیەکەی پێناسە نەکردووە. ئەو کاتە پێویستە بپرسین؛ زانستی چی و بۆ کێ؟ کاتێک وەڵامی ئەو پرسیارانە بدرێتەوە، ئەوکاتە دەرکی پێدەکرێت کە بۆچی زانا کۆمەڵناسەکان وەڵامی سەرەکیترین پرسیار نادەنەوە، واتە بۆ وەڵام"ژیان چییەو چ پەیوەندییەکی بەکۆمەڵگاوە هەیە؟" نادەنەوە. لەوانەیە ئەم پرسیارانە زۆر سادەو ساکار ببینرێن. بەڵام بەقەدەر ژیانی ئەو بوونەوەرە بەهادارە کە مرۆڤی پێدەڵێن. دوای ئەوەی لەمەشیان تێنەگەیشت ئەو کاتە مرۆڤ چ بەهایەکی دەبێت! لەدۆخێکی بەمجۆرەدا دەتوانین بڵێین بۆ بوونەوەرێک گۆڕاوە کە ژیانی زۆر لەژیانی ئاژەڵ یان رووەکێک بێ

نرخترە. مرۆڤایەتییەک کە ماناو حەقیقەتی خۆی نەزانێت یان بوونی نییە، ئەگەر هەبێتیش دەبێتە سووکترین‌و دڕندانەترینیان.

## أ. ژیـــان

لەوانەیە نەتوانرێت ژیان پێناسە بکرێت؛ بەواتایەکی تر بەشێوەیەکی ڕێژەیی هەستی پێدەکرێت، تارادەیەک مایەی تێگەیشتنە. تەنانەت ئەگەر پێشکەوتنی تەدریجی ڕاستیش بێت، بەڵام ڕوونکردنەوەی ڕاڤەی پەرەسەندنی داروینستی سەبارەن بەژیان و گەشەکردنی جۆرەکان زۆر لەڕۆشنکردنەوەی حەقیقەت دوورە. چاودێریکردنی ژیانێک کە سێ ملیار ساڵ بەرلەئێستا لەناوەوەی زەریا لەزیندەوەرێکدا دەستی پێکرد کە هێشتا نەببوو بەخانە تا دەگاتە مرۆڤی ڕۆژی ئەمڕۆمان بەشێوەی زنجیرێک بەردەوام بووە، کۆمەکی بۆ مانای ژیان سنووردارە. ئێستاکە زانست لەپێکهاتەی تەنۆلکە وردە ئەتۆمەکاندا بەدوای نهێنییەکانی ژیاندا دەگەرێت. ئاشکرایە کە لەمیانەی ئەم پەیڕەوەشەوە لەڕوونکردنەوەیەکی سنووَرداری ژیان بەولاوە زیاتر بڕ ناکات. مسۆگەر ژیان پەیوەندی بەو بابەتە ئاماژەپێکراوانەوە هەیە. بەڵام ئەمانە بەتەواوی کێشەکە چارەسەر ناکەن. پێوانەکردن‌و بەراوردکردنی ژیان لەگەڵ مردنیشدا بۆ بەدەستهێنانی ماناکەی بەس نییە. واتە گووتەی "ژیان بەر لەمردنە" شێوازێکی تێرکەری ڕوونکردنەوە نییە. ئەوەی ڕاسترە، ژیان تەنیا بەمردنەوە فەراهەم دەبێت. دەزانم کە ژیانێکی بێ مردن جێگای باس نابێت. بەڵام لەتێگەیشتنی مانای مردنیش دۆشداماوین. مردنیش بەلانی کەم هێندەی ژیان ئەویش پێناسە ناکرێت. لەوانەیە ئەمەش ئەنجامێکی ڕێژەیی بێت، لەوانەیە دەرفەتێک‌و شێوازێکی مەیسەربوونی ژیانە. هەروەکو دواتر بەشێوەیەکی بەرفراوان پێناسە دەکرێت ترس لەمردن پەیوەندییەکی کۆمەڵایەتییە. لەوانەیە مردن وەک شکڵێکی لەجۆری ترس بێت.

دوالیزمی ئایدیالیزم ـ ماتریالیزم هاوسەنگ‌و ڕۆشنکەرەوە نابینم. ئەو دوالیزمەی خاوەن کارەکتەری شارستانییە هیچ بەهاو نرخێکی ڕوونکردنەوەکەیان سەبارەت بەژیانەوە نییە. دەرهەق بەو ڕاڤەیەی خوازیاری پەرەپێدانیم، جەخت لەسەر ئەوە دەکەمەوە کە ئەم دوالیزمە

پەیوەندییەکـەی بەحەقیقەتـەوە زۆر سـنووردارە. بەهـەمان شـێوە دەستەواژەکانی زیندوو، بێ گیان یش لەبارەی ژیانەوە ڕۆشنکەرەوە نین، لەدۆخێکی بەمجۆرە دوورن.

حەقیقەتی یەکەم: جگە لە مرۆڤ سەرجەم ئەو بوونەوەرە زیندوو ـ بێ گیانانـەی خوازیـاری تێگەیشتنی ژیـانن تـەنیا دەتـوانن لـە ئـانو سـاتی خۆیاندا بژین. لەوانەیە ئـەو بەرخـەی لەلایـەن گورگێکـەوە قووتـدەدرێتو ئـەو هەسـارەیەی لەلایـەن کـونی ڕەشـەوە قووتـدەدرێت خـاوەن هـەمان چارەنووسـی گـەردوونی بـن. ئەمـەش بـۆ تێگەیشـتنی ژیـان وەک نهێنیەک وایە.

حەقیقـەتی دووەم: ئـەو زینـدەوەرەی خـۆی بـۆ بێچووەکـەی دەدرەوشـێنێتەوەو بەخێراییـەکی بـێ هاوتـاوە ئـاواکردنی پێکهاتـەی دیالیکتیکی لەلایەن تەنۆلکەکانی وردە ئەتۆمەوە وەک پێویستیەکی هەمان یاساو ڕێسای گەردوونی بەڕێوە دەچن.

حەقیقـەتی سێیەم: لەکۆمـەڵگای مرۆڤایەتیـدا ئـەم یاسـا گەردوونییـە خۆی بەدۆخی لێپرسینەوە گەیانـدووە؛ مـن کێم؟ ئەمـە پرسیارێکە کـە بـۆ یەکەمین جار یاسای گەردوونی گوزارشتی لەخۆی کردووە.

حەقیقەتی چوارەم: لەوانەیە وەڵامی پرسـیاری"من کـێم؟" دوا ئامـانجی گەردوون بێت.

حەقیقەتی پێنجەم: لەوانەیە سەرجەم ژیانی گەردوونی بەزیندوو ـــ بێ گیانیشەوە لەپێناو گەیشتن بەپرسیاری "من کێم؟"بێت.

حەقیقەتی شەشەم: دەشێت وەڵامـی "مـن خـۆمم، گـەردوونم، مـن ئـەو زەمانـەم ــ شـوێنەم کـە نەپێشـتر ــ دواتـر، نـە نزیـک ــ دووری نییـە!" ئامانجی دوایی بێت.

حەقیقەتی حەوتەم: لەوانەیە دانایی‌و حیکمەتەکانی فەنافیللا(توانـەوە لەخوداوەنـددا)، نیروانـاو ئـەنا ئەلهـەق ئامانجـە سـەرەکیەکانی ژیـانی کۆمەڵایـەتی مرۆڤـی ڕوونکردبێتـەوە یـاخود لەوانەیـە مەیلەکـەی بەرامبـەر ژیانی کۆمەڵایەتیە بخاتە ڕوو.

لەمیانەی ئەم حەوت حەقیقەتەوە ژیان پێناسە ناکەم. بەڵکو بوارو رووبەری پەیوەندیداربوونی دەپشکنم، خوازیاری لێکۆڵینەوەم. ژیان لەکاتی ژیانکردندا دەرکی پێناکرێت. ناکۆکیەکی بەمجۆرە لەنێوان ماناو ژیاندا هەیە. کاتێک ئاشقێک لەگەڵ مەعشوقەکەیدایە لەو شوێنەیە کە مانا کۆتایی پێهاتووە. توانای تێگەیشتنێکی مسۆگەر تەنیا لەمیانەی تەنیاییەکی رەها، واتە لەدووری مەعشوقدا فەراهەم دەبێت. گوتەی یا سەر یان یار نەک لەبواری جەستەیی بەڵکو بەمانا میتافیزییەکەی خوازیاری گوزارشتکردنی ئەو واقیعەیە. بەرگەگرتنی تەنیایی رەها تەنیا ئەو کاتە ئەنجامگیر دەبێت کە بۆ تێگەیشتنی رەها ئامادەو لێهاتوو بێت. تەنیایی رەهاش تەنیا ئەو کاتە بەدیدێت کە بەدۆخی هێزی مانا گەیشت، واتە ئەو کاتەی لەدۆخی پەیوەندی هێزی ماددی دەرکەوت. دوالیزمی هەبوون ـ نەبوون لەدوالیزمی مانا ـ مادده دەچێت. هەردوو دوالیزمیش شتگەلێکی دەرهەست (ئەبستراکت)و لەواقیعدا روونادەن. شیمانەیەکی بەهێزە کە ژیان توانای رێکخستنی بێکۆتایی ئەو دوالیزمانەیە. ناوبەرەکانی رێکخستن بەسیفەتی ساتەکانی کائۆس ئەگەر وەک مردنیش بێتە پێشەوە ئەوا بۆ فەراهەمکردنی ژیان وەک ناچارییەک دەبینرێت.

لەم کورتە هەڵسەنگاندنەدا بەشێوەیەکی سنوورداریش بێت هەوڵماندا هۆکارەکانی ئەنجامنەدانی پێناسەکردنێکی تەواو باس بکەم؛ پێناسەی رەهای ژیان پێویستی بە ئامادەیی، هیچێتی‌و تەنیایی رەهایە، لەبەرئەوەی ئەمەش تەنیا لەئاستی ئەبستراکتدا دەمێنێت، گەیشتن بەژیان‌و ماناکەی تەنیا بەشێوەی دوالیزم‌و رێژەیی فەراهەم دەبێت.

**ب ـ ژیانی کۆمەڵایەتی .**

ژیانی کۆمەڵایەتی سەربارى ئەوەی دەستەواژەیەکی زۆر سادەیە، وەک دەستەواژەی سەرجەم زانستەکان پێویستی بەروونکردنەوە هەیە. سەرەڕای بەکارهێنانی بەردەوامی بەڵام بەپێچەوانەی مەزەندەکان دەستەواژەیەکە هێشتا بەماناکەی خۆی نەگەیشتووە. نازانین کە ژیانی کۆمەڵایەتی چییە. ئەگەر زانیبوومانایە دەبووین بەبەرگریکارو داکۆکی

کارە بێ ئامانەکانی ژیانی کۆمەڵایەتیمان کە لەژێر حوکمڕانی سیستەمە هەژموونگەراکان لەت لەت کراوە. لەژیانی کۆمەڵایەتیدا نەزانی زاڵە نەک دانایی. لەجەمسەری بەرامبەری ژیانی هەژموونگەراییدا ژیانیکی نەزانانە جێگای باسە. چونکە پەردەی نەزانی‌و جەهالەت بەسەر ژیانی کۆمەڵایەتیدا نەپۆشرێت سیستەمە هەژموونگەراکان بەردەوام نابن.

بە لەبەرچاوگرتنی کارەکتەری ڕێژەیی ژیان هەوڵی پێناسەکردنی ژیانی کۆمەڵایەتی دەدەم. بەر لەهەموو شتێک پێویستە بڵێم؛ ژیانی کۆمەڵایەتی چۆنیەک، بێ سنوورو هاوشێوە لەهەر شوێنێک جێگای باس نییە. چونکە ژیانی ڕێژەیی مانای ژیانێکی تاک‌و تەنیایە. هەروەکو زانراوەو پێویستە بزانرێت تاکانەیی گەردوونیبوون ڕەت ناکاتەوە. نە تاکانەیی پەتی، نە گەردوونیگەرایی پەتی، هیچ یەکێکیان بەتەنیا جێگای باس نین. تاکانەیی ـ گەردوونی یش دوالیزمێکە بەلانی کەم بە قەدەر دوالیزمی مانا ـ ماددە بوونی هەیە. تاکانەیی نەبێت گەردوونیبوونیش فەراهەم نابێت. ئەگەر گەردوونیش نەبێت هیچ یەکانەیەک ناژیت. بۆ ڕوونکردنەوەی زیاتر دەشێت نموونەیەک بێنمەوە: بەسەدان جۆری گوڵ هەریەکەو دانەیەکن. بەڵام تەواوی جۆرەکانی ئەو گوڵانە لایەنێکی هاوبەشیان هەیە وایکردووە بەگوڵ ناوببرێن. ئەو لایەنە هاوبەشە گوزارشت لە گەردوونیبوون دەکات. ئەم ڕێسایە لە تەواوی هەمەڕەنگیەکانی گەردووندا جێگای باسە.

لەبەر ئەوەی لەبەشە پەیوەندیدارەکانی بەرگرینامەکەمدا هەوڵی خستنە ڕووی ژیانی کۆمەڵایەتیم داوە لەناو دۆخنی هەمەڕەنگی‌و مێژوویبوونیدا دووبارەی ناکەمەوەو تەنیا بەبیرهێنانەوەی بەسە. چیرۆکی هۆمۆساپیانس(مرۆڤی بیردەکاتەوە) کە شیمانە دەکرێت لەڕۆژهەڵاتی ئەفریقیا ژیاوەو تەمەنی نزیکەی دووسەد هەزار ساڵە و پەنجا هەزار ساڵ بەر لەئێستاش لەو خاکەی تێیدا لەدایک بووە بەزمانی هێمایی گەیشتووە، لەگەڵ توانەوەی دوایین قۆناخی سەهۆڵبەندان بیست هەزار ساڵ بەر لەئەمڕۆ لەبنارەکانی تۆرۆس ـ زاگرۆس لە کۆمەڵگای بەر لەکشتوکاڵ دەرکەوتووەو پانزدە هەزار ساڵیشە دەربازی سیستەمێکی

ژیانی کۆمەلایەتی بووە کە بەشێوەیەکی تێکەلی قەبیلەگەرایی کشتوکالو نێچیروانی ـ کۆکردنەوەی خواردەمەنی لەخۆوە گرتووە؛ پشکێکی گرنگی راستی لەخۆوە دەگرێت. قۆناخێکی پێنج ھەزار سالەی شارستانی ناوەندی خرایە سەر ئەو شێوازەی ژیان کە بەشێوەی کۆمەلگای کشتوکال ــ گوند پەرەیسەند. لەمیانەی هێلی گشتی یاخود بەشێوەی قۆناخ ـ بازنە ھەولی باسکردنی پەرەسەندنی کلتورێکی ژیانی ھەژموونگەرام داوە کە لەرێگای دوالیزمی کۆمەلگای کشتوکال ــ گوندو کۆمەلگای شار ــ بازرگانی ــ پیشەسازی ئەمرۆمان کاریگەری بووە. لەبەشی پێشتردا ئاماژەم بەقۆناخی ئەوروپای پێنج سەد سالی دوایی ئەو کلتوورە ھەژموونگەرایە کرد. زۆر ئاشکرایە کە ئەم کلتوورە لەپێکهاتنو پێگەیشتندا، تەنانەت قەیرانو تەنگەژە بونیادییەکانیشیەوە لەبنەرەتدا مۆرکی کۆمەلگای خۆرھەلاتی ناوینی پێوەیە. ئەوە ئەو کلتوور و کۆمەلگایەیە کە ھەولی خستنە رووی ماناکەیمدا. ھەرچەندە تاکانەییان زۆر بێتو مۆدێرنیتەی ئەوروپاش یەکێک لەو تاکانە بێت، بەھۆی قۆناخو شوێنەوە ھەرکاتێک دەشێت پۆلێنبەندیو ئەبستراکت بوون بەمانای تاقانەی تاکەکان جێگای باس بێت.

دۆخی کۆمەلگا ژیانی جۆری مرۆڤ بەسیفەتی تاکانەیی دەستنیشان دەکات. نەژاد یاخود تایبەتمەندییە جەستەییەکانی دیکە دیاریکەرنین. ئەگەر بەخێرایی نەمرێت، نەک تەنیا نابێت بەمرۆڤی دانا. بەلکو دەشێت جۆرێکی نزیکی بەو ئاژەلانە بێت کە بەزمانی ئیشارەت قسەدەکەن. مرۆڤی بێکۆمەلگا ئانتی ـ مرۆڤە. دەرکردنی مرۆڤ لەکۆمەلگا، بوون بەمرۆڤی بێکۆمەلگا گەورەترین سزایە کە دووچاری بێت، چونکە مرۆڤ ھەموو ھێزی خۆی لەکۆمەلگا وەردەگرێت. ئاستی پێگەیشتووترین زانستو داناکان گرێدراوی کۆمەلگایە. ھەلسەنگاندنی ژیانی کۆمەلایەتی وەک دیمەنو ژمارەی ماددی گەورەترین خیانەتی پۆزیتیڤیزمە بەرامبەر بەمرۆڤ. گەیشتن بەئاستی کۆمەلگای مرۆڤ تەنیا لەمیانەی ھەلمەتێکی گەردوونیەوە مانابەخش دەبێت.

تایبەتمەندییە سەرەکیەکانی کارەکتەری ژیانی کۆمەڵایەتی بژمێرین بەو سیفەتەی هەڵمەتێکی گەردوونییە.

١ ـ کۆمەڵگا بەمانای مێژوو بەرهەمی ململانێو تێکۆشانێکی زۆر دژوارە. لەئاکامی هەوڵی ملیۆنان ساڵەی جڤاتەکانی مرۆڤ لەشوێنی سەختو تێکۆشانی شکۆدارانەی پڕ لەئێشو بەردەوامەوە جڤاتی تاکانەی پێگەیشتووتر ئاواکراوە. هەندێک شوێنو قۆناخیش رۆڵی دیاریکەریان لەقەڵەمبازە کۆمەڵایەتیەکاندا بینیوە.

٢ ـ بەسیفەتی مێژوو کۆمەڵگا پێویستی بەپێگەیشتنی ئاستی ژیرییە. ئاستی ژیری مرۆڤ کۆمەڵگابوونەکەی دەستنیشان کردووە. کۆمەڵگابوونیش ئەو ئاستەی ژیری ناچارکردووە لەدۆخی زهنیەتدا کار بکاتو گەشە بسەنێت. ئاستی زهنیەتی سروشتی کۆمەڵگاش بریتییە لەپێکهاتەیەکی نەرمو پێگەیشتوو.

٣ ـ زمان تەنیا ئامرازی زهنیەتی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگا نییە، لەهەمانکاتدا فاکتەرێکی بونیادنەرە. زمان یەکێک لەو فاکتەرە سەرەکیانەیە کە کۆمەڵگا پێکدێنێت. بەو سیفەتەی ئامرازی ژیری دەستەجەمعی یە زۆر بەخێرایی پەرە بەنەرمایی سروشتی کۆمەڵگا دەدات.

٤ ـ شۆڕشی کشتوکاڵی ریشەدارترین شۆڕشی کلتووری ماددیو مەعنەوی کۆمەڵگایە لەمێژوودا. لەبنەڕەتدا کۆمەڵگای مرۆڤ لەدەوری کشتوکاڵدا شێوەی گرتووە. ناشێت بیر لەکۆمەڵگایەکی بێ کشتوکاڵ بکرێتەوە. کشتوکاڵ تەنیا بەچارەسەرکردنی کێشەی خۆراک ناوەستێت؛ لە ئامرازە سەرەکیەکانی کلتووری ماددیو مەعنەویدا لەسەرووی هەمووشیانەوە ژیری، زمان، ژمارەی دانیشتوان، نیشتەجێبوون، ئایین، ئامرازو پۆشاک رێگا لەپێش گۆڕانکاریو وەچەرخانی مەزن دەکاتەوە.

٥ ـ چونکە لەبەدیهێنانی هەمیشەییبوونی کۆمەڵگابووندا ژن خاوەنی خەستترین هەوڵو کۆششە، بە بەراورد لەگەڵ پیاو لەکۆمەڵگابووندا رۆڵی سەرەکی دەبینێت. وەچەخستنەوە، گەورەکردنو پاراستنی منداڵان ئاراستەی دایکانەیی پەرەسەندنی بەکۆمەڵگابوون مەیسەر دەکات. کۆمەڵگا زیاتر هەڵگری ناسنامەی دایک ـ ژنە. هەبوونی فاکتەرو تۆخمی مێیینە

لەبنچینەی ئایینو زماندا ئەم واقیعە دەسەلمێنێت. لەکۆمەڵگای کشتوکاڵ ـ گونددا ناسنامەو دەنگی ژن بەردەوامی بەهێزی خۆی دەدات.

٦ ـ سروشتی کۆمەڵگا لەناوەرۆکدا ئەخلاقیو سیاسییە. ئەخلاق سیستەمی رێسای کۆمەڵگا دەست نیشان دەکات، سیاسەتیش بەڕێوەبەرایەتیەکەی. لەکاتێکدا ئەخلاق سیستەمو هەمیشەییبوونی کۆمەڵگا فەراهەم دەکات، سیاسەتیش پەرەسەندنە خولقکارانەکەی مەیسەر دەکات. ناشێت بیر لەکۆمەڵگایەکی بێ سیاسەتو بێ ئەخلاق بکرێتەوە. ئەو سووانو تێکچوونەی لەئاستی ئەخلاقی و سیاسیەوە بێتە ئاراوە تێکەڵ لەگەڵ هەر جۆرێکی نایەکسانیو کۆیلایەتیەوە دێتە ئاراوە.

## ج ـ پلەداری کۆمەڵگاو دەوڵەت

دەستبەسەرداگرتنی ئەو کاریگەرییە کۆمەڵایەتییەی بەشێوەیەکی سروشتی لەدەوروبەری ژن ئاوابووە، زەوتکردنی لەلایەن ئەو پیاوەی لەمیانەی نەریتەکانی کۆمەڵگای نێچیروانیو تەڵەکەبازیو زۆرداریەوە هێزێکی گەورەی بەدەست هێناوە بناخەی سیستەمی پلەدارییە. سیستەمی پلەداری زۆرداریو فێڵبازی لەگەڵ خۆیدا دێنێتە ناو ژیانی کۆمەڵگاوە. لەبنەڕەتدا پلەداری لەدەوروبەری راهیبی نوێنەری تەڵەکەبازی، خاوەنی زۆرداری سەربازو خاوەن ئەزموونی کۆمەڵایەتی پیاوی تەمەندار نوێنەرایەتی دەکرێت. یەکەمین تێکۆشانی مەزن لەگەڵ ژن ـ دایکدا دەست پێدەکات. لەسەردەمی شارستانی ـ بەراییدا تاڕادەیەکی مەزن دەستڕۆیی دەکەوێتە دەستی پلەداری پیاوەوە. دەوڵەتیش لەگەڵ دامەزراوەبوونی بەڕێوەبەرایەتی پلەداری لەکۆمەڵگای شاردا دەست پێدەکات. لەگەڵ پەرەسەندنی توێژە دەوڵەتگەراو پلەدارەکان لەناو کۆمەڵگادا سیستەمی سیاسیو ئەخلاقی تێکدەچێت و گۆڕانکاریەکانی دژ بەکۆمەڵگا خێرا دەبن. دەشێت بەمجۆرە ریزیان بکەین:

١ ـ کۆمەڵگای شار: ئەو کار دابەشکردنەی کۆمەڵگای شار لەسەر بنەمای بازرگانیو پیشەکاری لەگەڵ کۆمەڵگای کشتوکاڵی دەستپێشخەریان بۆ کرد رێگای لەپێش پەرەسەندنێکی کۆمەڵایەتی تێکەڵ کردەوە، لەکاتێکدا بەدامەزراوەبوونی توێژی پلەداریو دەوڵەتگەرا لەسەرەوە گۆڕانکارییە دژە

ـ کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵ شاردا خێرادەبن. ئەم ئانتی ـ کۆمەڵگایە لەژێر ناکۆکیو کێشە کۆمەڵایەتیەکاندا شاراوەیە.

٢ ـ کۆمەڵگای چینایەتی: بەرفراوانبوونو چڕبوونەوەی دامەزراوەبوونی دەوڵەتو پلەداری ڕێگا لەپێش دووپارچەبوونی کۆمەڵگا دەکاتەوە. کارەکتەری چینایەتی یان جیاوازی چینایەتی فاکتەری نامۆکردنی سروشتی کۆمەڵگایە. لەهەر بوارێکدا هیرۆشێکی ئایدیۆلۆژیو ڕێکخستنی دژی کۆمەڵگا دەست پێدەکات. لەجیاتی کۆمەڵگای سروشتی، پلەداریو دەوڵەت کۆمەڵگای چینایەتی دروستکراو جێگیردەکەن کە درۆو زۆرداریيەکەی پەرەی پێدراوە. گووتە چەواشەکارو تاشیرکارەکانی خۆی دژی کۆمەڵگای ئەخلاقیو سیاسی لەنەریتی میتۆلۆژی، ئایینی، فەلسەفیو زانستیدا جێگیردەکات.

٣ ـ کۆمەڵگای داگیرکەر (کۆلۆنی): دەمەزراوەی دەوڵەتو پلەداری لەبنەڕەتدا لەسەر کەڵەکەبوونی بەهاکانی کۆمەڵگا ئاوادەکرێت. پێویستی بەرگرییو پاراستن لەگەڵ پێویستی بەڕێوەبەرایەتی دەکرێت بەیەک کە تارادەیەک هەستی پێکراوە، لەبەرامبەریشدا زەوتکردنی بەهای کۆمەڵایەتی ئەنجامدەدرێت کە چەندەی دەچێت دۆخێک بەخۆیەوە دەبینێت کە بەرگەی ناگیرێت. لەمەشدا هەم توندوتیژی هەم ئامرازە ئایدیۆلۆژیەکان بەیەکەوە ڕۆڵ دەبینن. گرێدراو بەشێوە و شوێنی داگیرکردنەکە کۆمەڵگا داگیرکەرەکان بۆ بەشی بازرگانی، پیشەسازیو فینانس جیادەبنەوە.

٤ ـ کۆمەڵگای شەڕانگێز: ئەو شێوەیەی کۆمەڵگایە کە لەجیاتی ڕەزامەندی لەڕێگای توندوتیژیەوە بەهای کۆمەڵایەتی زەوت دەکرێت. شەڕ زێدەڕۆییترینو دڕندانەترین شێوەی نامۆکردنی ژیانی کۆمەڵایەتییە؛ لەقولاییدا سروشتی کۆمەڵگا بریندارو سەقەت دەکات. لەدۆخێکی بەمجۆرەدا پەرچەکرداری کۆمەڵگاکان سەبارەت بەخۆپاراستن بەهێز دەبێتو بەرامبەر بەشەڕی نامۆکردن شێوەی شەڕی بەرگری خۆییو پارێزەری هەبوونی کۆمەڵایەتی وەردەگرێت.

## ب ـ ناسنامەی کۆمەلایەتی

تاقانە (یەکانە) کۆمەلایەتیەکان خاوەن پێکهاتەیەکی دەولەمەندن. تاقانەکان لەناوەخۆیاندا ژمارەیەکی زۆری پۆلێنی تاکی تاقانەکان پێکدێنن. بینینی کۆمەلگاکان وەک خاوەن یەک ناسنامە هەلوێستێکە سەرچاوەی خۆی لەسیستەمەکانی پلەداری‌و دەولەتی وەردەگرێت کە فاکتەری نامۆکارن. چەمکی ناسنامەی وشکی داخراو داسەپاندنی ئەو سیستەمانەیە. دەولەت ـ نەتەوەش پێگەیشتووترین شێوەی ئەو سیستەمەیە. ناسنامەکان فۆرمی کۆمەلایەتین. لەگەل تایبەتمەندێتیەکانی پەرەسەندنی کۆمەلگادا کۆک دێنەوە. بۆ ئاواکردنی سەنتێز لەگەل ناسنامەکانی دیکەدا کراوەن. کۆمەلگا بەبێ ناسنامە نابێت. ناسنامەش بەلانی کەم بەقەدەر ئەخلاق‌و سیاسەت ژیانییە. دەشێت دیارترین ناسنامە کۆمەلایەتییە فرە رەهەندەکان بەمجۆرە ریزبکەین:

١ ـ ناسنامەکانی قەبیلەو عەشیرەت: یەکەمین ناسنامەی پەرەسەندنی کۆمەلگاکان بەشێوەی قەبیلە (تیرە)یە. ناوبردنی کلان وەک ناسنامە زەحمەتە. چونکە کلان هێشتا لەسەرەتای جیاوازیبووندایە. بەلام بەسیفەتی ناسنامەی ـ بەرایی دەشێت کلان وەک خێزان‌و خانەی سەرەکی سەرجەم ناسنامەکان پێناسە بکرێت. عەشیرەت (خێل)یش بەسیفەتی قەبیلە و یەکێتی قەبیلەکان خۆراگرترین ناسنامەی ژیانی کۆمەلایەتییە. بەپێچەوانەی داخوازی هێزە دژە ـ کۆمەلایەتیەکان قەبیلەو عەشیرەتە لاوازبووەکان لەرووخساری کۆمەلگایەکی مەدەنی قۆناخی خۆی پێکدێت‌و ئەمەش دەست لێبەرنەدراوە. چونکە هەروەکو چۆن کۆمەلگاکان بەبێ کلان‌و بنەمالە نابن، بەبێ قەبیلەو عەشیرەتیش نابن.

٢ ـ ناسنامەی قەوم: وەک شێوەیەکی پێشکەوتووی ئاستێکی بەرزتری ئەو عەشیرەتانە پەرە دەسەنێت کە بەدرێژایی مێژوو خاوەن زمان‌و کلتوورێکی هاوبەش بوون. شوێنێکی هاوبەش بۆخۆیان وەک ولات‌و نیشتیمان پەرە پێدەدەن. ولات‌و نیشتیمان دەستەواژەیەکن کە پێویستە وەک کلتوور مانابەخش بن. هەرکۆمەلگایەک ناچار نییە

بەئاستی قەوم بگات. دەشێت چەندین کلان، قەبیلە، خێڵ‌و تەنانەت قەومی دیکەش لەناو قەومدا بژین. چەمکی ناسنامەی هۆمۆژەن داسەپاندنێکی فاشیزمی دەوڵەت ـ نەتەوەیە.

٣ ـ ناسنامەی نەتەوەیی: ئەو ناسنامەیەی لەدۆخێکدا دێتە ئاراوە کە ناسنامەی قەوم لەژێر شێوەی بەڕێوەبەرایەتیەکی جێگیرو هەمیشەییدا بێت دەشێت بەناسنامەی نەتەوە یاخود نەتەوەیی ناوببرێت. لایەنی لەپێشینەی نەتەوە بەئیرادەی خۆی بەڕێوەبەرایەتی خۆی دەکات. دەشێت بەڕێوەبەرایەتی لەشێوەی دیموکراتی یاخود دەوڵەتی ئاوابکرێت. کۆی ئەو گەل‌و قەبیلانەی لەژێر چەپۆکی بەڕێوەبەرایەتی نەتەوەکانی خاوەن بەڕێوەبەرایەتی دەوڵەتین لەجیاتی نەتەوە بەکۆیلە ناودەبرێن. لەکۆمەڵگا داگیرکراو یان کۆلۆنیەکاندا لەژێر ناوی یەک نەتەوەدا هۆمۆژەنی دەسەپێنرێت، دەرفەتی ژیانێکی ئازادو یەکسان بەنەتەوەکانی دیکەو تەنانەت یەکینەکانی ژێرتریش نادرێت. سیستەمە دیموکراتیەکان لەمیانەی ڕێگادانیان بەفرەکلتووری لەسیستەمە دژە ـ کۆمەڵایەتیەکان جیادەبنەوە.

## ٥ . پیرۆزییە کۆمەڵایەتیەکان

دەستەواژەی پیرۆزی پێناسەی کۆمەڵگاگەرایی شتگەلە ئەفسوونی، پەرجوو و نائاساییەکانە. ئەوەی پیرۆزە خودی کۆمەڵگایە. بەڵام لەجیاتی مەعریفەیەکی زانستی، کۆمەڵگا لەڕێگای مەعریفەی میتۆلۆژی‌و ئایینیەوە پێشوازی لێدەکات. لەراستیدا کۆمەڵگا خۆی پێناسەی دەکات. بەراوردکاری لەنێوان مەعریفەی میتۆلۆژیاو ئایینی لەگەڵ مەعریفەی زانستی دەشێت فێرکەربێت. چونکە پێویستە لەبیر نەکەین کە میتۆلۆژیا، ئایین‌و فەلسەفە بناخەی زانستی پێکدێنێت. کردەو چالاکییە زهنیەکانی کۆمەڵگا، جا ئەمانە پیرۆز یاخود پۆزیتیڤیست بن، هەمووی دەرهەق بەپێناسەکردنی خۆیەتی. چەندێک لەپیرۆزییە گرنگەکان ئەمانەن:

١ ـ خوداوەندییەکان(ئیلاهیەکان): هەرسێ ئایینە گەورەکە وەڵامی شتگەلە گەردوونیەکانە لەئایدیالیزمی ئۆبژێکتیڤیدا. لای هیگڵ ڕۆح

(geist) ڕەهایــە. لای کــارل مــارکس کۆمۆنیزمــە، لای میللیگــەراکانیش دەوڵەت ـ نەتەوەیە.

مانــای ئیلاهیبــوون لەزانســتی کۆمەڵایەتیــدا وابەســتەی ناســنامەی کۆمەڵگایە. دەشێت وەڵامی بەرزترین ئاستی ئەبستراکت (دەرهەست) کردنی کۆمەڵگابوون بداتەوە. چونکــە گــەورەیی ئــەڵڵا لــەدەرەوەی کۆمــەڵگا هــیچ مانایــەکی نییــە. ئــەڵڵا تــەنیا لەگــەڵ کۆمــەڵگا بــوونی دەبێت. جــا ئەگــەر کۆمەڵگا وەک تــەواوی گــەردوون پێشــوازی لێبکــات یــان وەک بــاوەڕییــەکی نــاوخۆی، هــیچ جیاوازیــەکی نییــە. نوێنەرایــەتی ئەمــە لەفەلســەفەدا ئایدیالیزمی ئۆبژەکتیڤو سۆبژەکتیڤە. بەڵام لەزانستدا تەنیا وەک ئۆبژەو سۆبژە دەمێنێتــەوە. لــەرێگای ئــەم پــەیڕەوەوە دەشــێت هەرشــتێکی مانــاو ئۆبژە لەخودا (ئەڵڵا) دەربهێنرێت. ئەگەر بــەزمانی زانســت گوزارشــتی لــێ بکەین؛ ئاستی مانای مرۆڤ گرێدراوی رادەی کۆمەڵگا بوونەکەیەتی. هێــزی مانــای مــرۆڤیش لــەرێگای پێگەیشــتنە کۆمەڵایەتیەکەیــەوە دەستنیشــان دەکرێت. مانای تاکی لەکۆمــەڵگا دابڕێنــراو کــە لیبرالیزمــی ســەرمایەداری دەیسەپێنێت، بەتەواوی درۆیەکی میتۆلۆژییە. تاکێکی لــە کۆمــەڵگا دابــڕاو تــەنیا وەک ئەنــدامی رەوە مــەیمونێک دەتوانێــت لــەناو مانــاو زهنیــەتی پێگەیشتوودا بژیت.

٢ ـ پێخەمبەرایــەتی: دووەمــین ئەڵقــەی پیرۆزیــەکانی کۆمەڵگایــە. هەوڵدەدرێت لەمیانەی سیفەتەکانی هەواڵی غــەیبو پــەیامنێری خوداوەنــد پێناسە بکرێت. لەگەڵ چینی سەرووی راهیبــەکان پێخەمبــەر جێگــای خــۆی لەهــەمان پۆلێنــدا دەگرێــت. لەکاتێکــدا لەفەلســەفەدا بەرامبەرەکــەی فەیلەســوفە، لەزانستیشــدا مرۆڤــی ئــەکادیمی (ئەکادیمیســیەن)یە. رۆشنبیرەکانی ئاستی باڵاش لەهەمان پۆلێندان. تایبەتمەندێتی هاوبەشــی گشتیان لەوەدایــە؛ لەپێگەیەکدان لەبــەرزترین ئاســتدا مانــای کۆمەڵایــەتی روون دەکەنــەوە. لەئاســتێکی بــەرزدا هەڵســەنگاندنی ئــەو پێگەیــەی مانــا لەراستیدا بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کــە لەناوەڕۆکدا کۆمــەڵگا هــەبوونی خــۆی دەردەبڕێــت. چونکــە ئــەوان لەپێگــەی ئاوێنــەو ویژدانــی کۆمــەڵگادان.

پیرۆزکردن وەک بەهاداربوون، شکۆداربوون، ماناداربوونو جوان بوون پێناسەبکرێت.

٣ ـ دانایی، شاعیری: سێیەمین ریزی ئەڵقەی پیرۆزییە. هەمان رۆڵ دەبینێت. هەڵگرانی بەها، ماناو گووتەکانی کۆمەڵگان. گوزارشت لەراوەستەی ئەخلاقیو شاعیری دەکەن. نوێنەری گووتەو هونەری بەهاکانی کۆمەڵگان. جیاوازیو تایبەتمەندێتیەکی بەمجۆرەیان هەیە؛ لەبەرزترین ئاستدا ماناداربوونی کۆمەڵگا دەژینو گوزارشتی لێدەکەن.

٤ ـ شتە پیرۆزەکان، تەوتەم یان بت: ئەو ئۆبژانە پیرۆز دەکرێن کە زۆرترین کۆمەکو رۆڵیان لەژیان، لەسەرپێ مانەوەو هەڵمەتەکانی کۆمەڵگادا هەبووە. گواستنەوەی پیرۆزی بۆ ئۆبژەکان، بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە پێداویستییەکی ژیانی بۆ کۆمەڵگا دابین دەکات. ئۆبژەیەک چەندە بەهادار بێتو کرابێت بەتەوتەم، بەوڕادەیە پیرۆزە. بۆ نموونە گەنم، زەیتوون، مەڕ، مانگا، ئەسپ.. هتد بەمجۆرەن.

## و ـ حەقیقەتی کۆمەڵایەتیو ونکردنی

سروشتی کۆمەڵگا سروشتێکەلێکی نەرمە کە لایەنی زهنییان پێگەیشتووە. بەمانا بارکراون. بەگشتی باری مانای زیندووەکان لەبێ گیانەکان زیاترە. لەسادەترین تەنۆلکەی گەردیلەوە تا دەگاتە ئاڵۆزترین توخمو پێکهاتەکانەوە زیادبوونێکی مانا جێگای باسە. زیادبوونی مانا پەیوەندی بەئازادییەوە هەیە. ئەو لایەنەی لەدوالیزمی وزە ــ ماددە بەتەنۆلکەی ماددی ناو دەبرێت بەردەوام ئەرکی بەربەستکردنی مانایە؛ وەک دیوار. دیوار ئەوانەی ناوەوە دەپارێزێت بەڵام لەهەمانکاتدا زیندانییان دەکات. ئەم دوالیزمە لەهەر دیاردەیەکی گەردووندا جێگای باسە. دیوار هەندێکجار ئامرازی پاراستنە، جارانێکیش دەبێت بەئامرازی بەندیخانە. بەشی ماددە بەردەوام تایبەتمەندێتیەکی بەمجۆرەی هەیە. کەڵەکەبوونێکی زۆر پێگەیشتووی مانا لەسروشتی کۆمەڵایەتی (گەردوون، ماددە)دا جێگای باسە. تۆڕ، ئۆرگان، بونیادو سیستەمە کۆمەڵایەتیەکان لەناوەڕۆکی خۆیدا لەلایەن ماناوە دەستنیشان دەکرێن. ئەو کۆمەڵگایانەی بەباشترین شێوە ماناکانیان دەردەبڕن، دەیکەن بەگووتەو بەبونیادێکی

دەگەیــەنن بەپێناســەی پێشــکەوتووترین کۆمــەڵگا دەگــەن. ئەمانــە کۆمەڵگایـەکن ئاسـتی ئازادییـان پێگەیشـتووە. کۆمـەڵگا ئازادەکـان ئـەو کۆمەڵگایانـەن کـە خۆیـان مانابـەخش دەکـەن، گوێیـان لـێ رادەگیرێـت، گوزارشت لەخۆیان دەکەنو بەگوێرەی پێویستیش بەشێوەیەکی هەمەلایـەن خۆیان بونیـاد دەنـێن. هـەرچی ئـەو کۆمەڵگایانـەن کـە لـەئازادی بێبەشـن بەپێچەوانەوە بێ زمانن، گوێیان لێ راناگیرێـتو نـاتوانن خۆیـان بونیـاد بنێن.

لـەچوارچێوەی ئـەو پێناسـەیەدا هەڵسـەنگاندنی مانـای کۆمەڵایـەتیو پەرەســەندنی حەقیقــەت بــەدرێژایی ســەردەمەکان نــاوەڕۆکی زانســتی کۆمەڵایەتییە. لەبنەڕەتدا حەقیقەت دۆخی مەعریفەی مرۆڤـە بـۆ ئـەو مانـا کۆمەڵایەتییـەی بـەدرێژایی چاخـەکان پەرەیسـەندووە. دەشـێت کـاری خـۆ گوزارشتکردن لەرێگای میتۆلۆژی، ئایینی، فەلسـەفی، هونـەریو زانسـتی بەکاری لێکۆڵینەوەو دەربڕینـی حەقیقـەت نـاو ببـەین. کۆمـەڵگاکان تـەنیا بونیادو تۆڕی حەقیقەت نین، لەهەمانکاتدا هێزی روونکردنەوەو لێدوانن. ئاشـکرانەکردنی حەقیقــەت گوزارشــت لەقورســترین دۆخــی کۆیلایــەتی، ئاسمیلاسیۆنو جینۆساید دەکـات، بـەجۆرێک لـەجۆرەکان ئەمـەش مانـای دابڕان لەژیانو خزانە بۆ رەوشـێکی نـاواقیعی. کۆمـەڵگای بـێ حەقیقـەت، تەنانەت تاکی بـێ حەقیقـەتیش مانـای هەبوونێکـە بـێ واتـاکراوە، لـەناو حەقیقەتی ئۆبژەکـانی دیکـەدا تواوەتـەوەو ناسـنامەی خـۆی لەدەسـتداوە. بەواتایەکی تر مانـای تووشبوونێتی بـەدۆخی بوونـەوەرێکی بێمانـاکراو. لەرەوشـێکی بـەمجۆرەدا پەیوەندییـەکی تونـد لـەنێوان مانـاو حەقیقەتـدا هەیە. بەجۆرێک لەجۆرەکان مانا پۆتـانسێل (وزەی شـاراوە)ی حەقیقەتـە. چەنـدە ئـەو پۆتـانسێلە دەربڕێـت، بەشـێوەیەکی ئازادانـە بـاس بکرێـتو بونیاد بنرێت ئەوا بەدۆخی حەقیقەت دەگات. کاتێک مرۆڤ بەردەوام باسی حەقیقەتەکەی ناواخنی و "منداڵە زمان نەگرتووەکـەی نـاخم" بکـات ؛ ئـەو دۆخە گوزارشت لەخراپترین رەوشی کۆمەڵایەتی دەکات، واتە گوزارشت لە ۆخــی لاتــەریکی و گۆشــەگیری دەکــات. تــاوەکو مانــا کۆمەڵایەتیــەکان لەمیانەی پەیڕەوە (میتۆلۆژی، ئایینی، فەلسەفی، هونەریو زانستیەکان)

نەبن بەحەقیقەت، بەو ئاستو کارابوونە نەگەن (لەپۆتانسیلەوە بۆ ئەنتەللەگیا) نابن بەواقیعێکی ماددی بەرجەستە. رزگارنەبوون لەدۆخی منداڵێتی مانای دەربازنەکردنی زمانی ئەزۆپە. ئەم رەوشەش مانای نەگەیشتنە بەدۆخی حەقیقەت. ئەو راستییە کۆمەڵایەتیانەی خراونەتە ژێر فشارو سەرکوتکردنەوە زۆر جار دووچاری ئەم چارەنووسە دێن. کاتێک لەروانگەی حەقیقەتەوە تەماشای واقیعی کۆمەڵایەتی بکەین دەبینین؛ تەنیا کاتێک ئەم راستیانە لەمیانەی هەر یەکێک لەپەیڕەوەکانی حەقیقەتەوە (میتۆلۆژی، ئاینی، هونەری، فەلسەفی‌و زانستی)ئاماژەی پێکرا، کاراکرا، سەرلەنوێ رێکخرایەوەو بوو بەبونیادێک لەکۆمەڵگای مانادارەوە بەکۆمەڵگایەکی خاوەن حەقیقەت دەگات. کاتێک سەبارەت بەحەقیقەت چاوێک بەچاخەکانی کۆمەڵگادا بخشێنین دەتوانین ئاماژە بەمانە بکەین:

١ ـ سەردەمی کلانە کۆمەڵایەتیەکان: لەبەرئەوەی لەسەردەمی جڤاتەکانی کلاندا حەقیقەت مانایەکی ئاڵۆزی بەدەست نەهێناوە هەربۆیە لەچوارچێوەی سنووردارو زمانێکی سەرەتایی، هەندێک جاریش لەمیانەی گێڕانەوەی زارەکی‌و زیاتریش بەزمانی جەستە (ئیشارەت)گوزارشت دەکرێت.

٢ ـ سەردەمی کۆمەڵگای کشتوکاڵ ـ گوند: بەهۆی هەبوونی بونیادێکی ئاڵۆزتر سەبارەت بەبابەتەکانی حەوانەو، خۆراک، پۆشاک، زۆربوون‌و پاراستن جۆرێک لەراستیگەلی کۆمەڵایەتی جێگای باسن کە توانیاو چوارچێوەی مانای زۆر زیادی کردووە. کۆک‌و هاوسەنگ لەگەڵ چوارچێوەی مانا پەرەسەندنی سەردەمێکی حەقیقەت دەست پێدەکات. بەتایبەتیش سەردەمی حەقیقەتی میتۆلۆژی، ئایینی‌و هونەری بەهەموو پیرۆزیەکەیەوە دێتە سەر شانۆ کە لەدەوروبەری دایک ـــ ژن پەرەی سەندووە. زمانەکان گەشە دەکەن. هێزی گوزارشتی میتۆلۆژی، ئایینی‌و هونەری سەردەمێک دەست پێدەکات کە بەها رەسەن‌و راستەقینەکەی بەرزە. شکۆدارترین چاخی بەر لەمێژووەوە. ئەو سەردەمەیە کە بۆ یەکەمین جار کۆمەڵگا خۆی وەک حەقیقەتە پیرۆزەکان پیشان داوە (لەمیانەی پەیڕەوە میتۆلۆژی، ئایینی‌و هونەریەکانەوە). تا ئێستاش

مرۆڤایەتی میراسی ئەو سەردەمە دەخوات. دوو شێوەکەی دیکەی حەقیقەت لەسەرووی هەمووشیانەوە دانایی فەلسەفی‌و زانستی پزیشکی لەو سەردەمەدا بناخەی دانراوە. پزیشکی‌و دانایی ژن وەک حەقیقەتە بەکاریگەریەکانی ئەو قۆناخە شوێنێکی گرنگی لەژیاندا گرتووە. هۆکاری زاڵبوونی مێخوداوەندی لەو قۆناخە بۆ ئەو هێزە دەگەڕێتەوە کە ژن لەپێنج بوارە گرنگەکەی حەقیقەتدا بەدەستی هێنابوو. بێگومان ڕۆڵە سەرەکیەکەی لەپەرەپێدانی ئابووری ماڵو کشتوکاڵ لەژێر بەدەستهێنانی ئەم هێزە شارەوەیە.

٣ ـ سەردەمی کۆمەڵگای شارستانی‌و شار: ئەو کۆمەڵگابوونەی لەگەڵ ئاواکردن‌و پەرەسەندنی شار لەزیادبووندابوو وەک پێویستیەکی دیالیکتیکی دژەکەی خۆشی ئافراند. لەو سەردەمەدا دژایەتی دیالیکتیکی دەوڵەت‌و کۆمەڵگای چینایەتی ئافراندووە. جیاوازی چینایەتی‌و دەوڵەتبوون کە وەک لادانێکی کۆمەڵایەتی هاتنە ئاراوە سەبارەت بەحەقیقەتی کۆمەڵایەتی ڕێگایان لەپێش پارچەبوون‌و کەلێنێکی مەزن کردەوە. لەبەر ئەوەی کەلێن‌و پارچەبوون لەسەر بنەمای ئەو دووبەرەکیانە هاتنە ئاراوە کە توندوتیژی لەخۆوەدەگرن، ئیتر قۆناخی سەرکوتکردنی حەقیقەت لەڕێگای توندوتیژیەوە دەستی پێکردووە. لەڕەوشی ماددی‌و بەرجەستە ئەو دۆخە بە شێوەی شەڕی حەقیقەتەکانیش خۆی دەنوێنێت.

بارکردن‌و بارگاویکردنی حەقیقەت بەمانای چینایەتی‌و دەوڵەت بۆ دۆخی خودی مێژوو بچووککراوەتەوە، کراوە بەخودی مێژوو. مێژوو چۆن‌و لەمیانەی کامە ڕێبازەوەش گوزارشت بکرێت، بەجۆرێک نووسراوە و بونیادنراوە کە مۆرکی چین‌و دەوڵەت هەڵبگرێت. پارچەبوونی واقیعی کۆمەڵایەتی، واتە لەتبوونی حەقیقەتی کۆمەڵایەتی بناخەی هەرجۆرە نامۆبوونێکە. گرێدراو بەشێواندنی مانای کۆمەڵایەتی، نامۆبوون بەربەستکردنی حەقیقەتە لەگوزارشتکردنی ڕاستیدا. تەنانەت گەیاندنی ڕاستیەکانە بەدۆخ‌و شێوەیەکی ئاوەژووکراو. نامۆکردنی ڕیشەیی تاکی کۆمەڵگا گەورەترین خراپەکارییە لەمێژوودا. دەشێت نامۆبوونی

کۆمەڵایەتی وەک خیانەتێکی مێژوویش شرۆڤە بکرێت. نامۆبوون لەهەر ئاستێکدایە. تەواوی بوارەکانی کلتووری ماددی‌و مەعنەوی کۆمەڵگا دەگرێتەوە. کاتێک نامۆبوونی رەنج لەگەڵ نامۆبوونی زهنیەت کران بەیەک، سیستەمی شارستانی هەژموونگەرایی دەتوانێت بەردەوامی بەهەبوونی خۆی بدات. لەم سۆنگەیەوە بەسیفەتی سیستەمی کۆمەڵگای دەوڵەتی‌و چینایەتی دەشێت سەردەمی شارستانی وەک ئەو کردارە پێناسە بکرێت کە لەسەربنەمای نامۆکردن‌و پارچەکردنێکی قووڵی بوارەکانی کۆمەڵگا بەدیهاتووە.

شارستانی کۆمەڵگابوونی پارچەکردووەو واقیعێکە کە بەردەوام دەرفەت بەشەڕوپێکدادان دەدات. وەک پێکدادان‌و لێکەڕینێکی قووڵی حەقیقەت خۆی دەخولقێنێت. هێزە باڵادەستەکانی پاوانی چەوسانەوەو توندوتیژیان لەدەست دایە بەوڕادەیەی حەقیقەتی کۆمەڵایەتی سەرکوت‌و چەواشە بکەن ئەو کۆمەڵگایانە ئاوا دەکەن کە لەگروپ، تاکو گەلە چەوساوەو داگیرکراوەکان پێکهاتوون. ئەو توێژانە وەک کۆمەڵ‌و مێگەلێک راپێچ دەکرێن کە مانــاو حەقیقەتیان لەدەست داوە. توێژە ئامـاژە پێکراوەکان تەنیا کاتی لەدەست دانی حەقیقەتەکەیان بۆ راپێچکردن لەبارو گونجاو دەبن. لەمانا بەرتەسکەکەیدا مێژووی شارستانی دیرۆکی بونیادنــان‌و بــەردەوامکردنی ئــەو راپێچینانەیــە بەســیفەتی مانـــاو حەقیقەتەوە.

## ر . حەقیقەتی کۆمەڵایەتی‌و شێوەکانی نامۆبوون

بەو رادەیەی راستی کۆمەڵایەتی لەناوەخۆیداو لەدەرەوە بوار بەسەرکوتکردن‌و چەوسانەوە نەدات، دەتوانین باس لەفەراهەم بوونی ئازادانەی مانــاو حەقیقەت بکەین. لەرەوشێکی وەهادا مانــاو حەقیقەت ئازادن. ئازادبوون لەمیانەی خاوەنداریێتی ماناو حەقیقەت بەدیدێت. ئەوەی ئازادی نەبێت ناسنامەی نییە، لەو سۆنگەوە مانــاو حەقیقەتیشی نابێت. شێوەکانی حەقیقەتی ژێر هەلومەرجی هەڕەشە سروشتیەکان (نەبوونی، ئاژەڵە دڕندەکان، زەحمەتیەکانی کەش، نەخۆشییە بۆماوەییەکان) هەلومەرجەکانی هەبوونی (خۆراک، میوە، ئاژەڵەکانی راوکردن، کەشی

لەبار، هەلومەرجی تەندروستو ئارام) لەگەڵ شێوەی حەقیقەتی ئەو کۆمەڵگایانەدا جیاوازە کە سەرکوتکردنو چەوسانەوەی کۆمەلایەتی تێدا بەڕێوە دەچێت.

بەهێڵە گشتیەکانیەوە دەتوانین بەمجۆرە ریزیان بکەین:

١ ـ لەو هەلومەرجانەدا کە هێشتا ستەمکاری کۆمەلایەتی (پلەداریو دەوڵەت) سەری هەڵنەداوە تاکە شێوەکانی گوزارشتی حەقیقەت میتۆلۆژی، ئایینو هونەرەکانن. پشکی فەلسەفەو زانست لەئاشکراکردنی حەقیقەتدا سنووردارە. شێوەی گوزارشتی لەپێشینەشی میتۆلۆژیایە. وەک دەزانرێت میتۆلۆژیا باسەکانی لەشێوەی چیرۆک، ئەفسانەو داستان لەخۆوە دەگرێت. مسۆگەر حەقیقەتێک لەمیتۆلۆژیاکاندا شاراوەیە. بەمانایەکی تر میتۆلۆژیا شێوەیەکی گێڕانەوەی حەقیقەتە. بەگوێرەی میتۆلۆژیا ئەو ئایینەی بەشارستانی بارگاوی نەبووە یان لەشارستانی نەگلاوە شێوەیەکە لایەنی باوەڕی لەپێشەو مسۆگەری بۆ بەهاداربوونی حەقیقەت هێناوە. ئایین میتۆلۆژیایەکە باوەڕی بەمسۆگەربوونیان دەکرێت. لەباوەڕیو داوەریەکانی ئاییندا یەکسان بوونو هاوتابوون لەگەڵ حەقیقەتدا جێی گای باسە. دانایی (فەلسەفە)و زانست کاریگەری قورسی میتۆلۆژیاو ئایینیان لەسەرە. هەروەها هونەریش بەو سیفەتەی شێوەیەکی حەقیقەتە پەیوەندی یان رایەڵەیەکی بەهێزی لەگەڵ ئایینو میتۆلۆژیادا هەیە؛ لەرێگای وێنەو مۆسیقاوە خوازیاری گوزارشتکردنی مانایە. لێکۆڵینەوەو توێژینەوە سەبارەت بەو مانایەی لەمۆسیقا، وێنەو پەیکەر بارکراوە کارو خەباتێکی گرنگی حەقیقەتە. ئەوەی گرنگە خودی مۆسیقا، وێنەو پەیکەرەکە نییە؛ ئەوماناو حەقیقەتە بەهادارە کە دەریدەبڕن.

زمانی شاعیرانەی میتۆلۆژیاو ئایین مەرجە. خودی زمان هەر لەسەردەمی لەدایکبوونیەوە ماوەیەکی درێژ باسێکی شاعیرانەیە. لەم سۆنگەیەوە پەیوەندیەکی بەهێز لەنێوان شیعرو حەقیقەتدا هەیە. شیعر زمانو حەقیقەتی کۆمەڵگای ئازادی کۆنە کەستەمو زۆرداری ناناسێت. شاعیرەکانی سەرەتا بەر لەداناو پێغەمبەران رۆشنکەرەوەی حەقیقەت

بوون. ئاستی شاعیریانەی زمانی کۆمەڵگایەکو هێزی گێڕانەوەی شاعیر پیشانی دەدات ئەو کۆمەڵگایە تا چ رادەیەک ئازادەو خاوەن واقیعێکی کۆمەڵایەتی مانادارە .

٢ ـ کۆمەڵگای شارستان بەو سیفەتەی سیستەمی کۆمەڵگای چینایەتیو دەوڵەتییە لەبەر ئەوەی هەم لەناوخۆو هەم لەدەرەوە دووچاری زۆرداریو زەبرووزەنگ هاتووەو لەت بووە، لەبواری ماناو حەقیقەتیشدا پارچە دەبێت. کاتێک زۆرداری تێکەڵ بەباسی میتۆلۆژیو ئایینی بێت حەقیقەت نامۆ دەبێت. نامۆبوون سەبارەت بەناوەرۆکو هەبوونی کۆمەڵگای شارستانە؛ تەنیا پشت بەئاخافتن نابەستێت. کاتێک رێکخراوەکانی زۆرداریو زەبرووزەنگ ماناکەی ناواخنیان وەک حەقیقەت پێشکەش دەکەن، پارادایمەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی گۆڕانکاری ریشەیی بەخۆیانەوە دەبینن. شێوەکانی ژیانی ناکۆکو ئەو پارادایمەی ئاراستەی دەکات لەناو کۆمەڵگادا پێک دێت. نامۆبوون لەمیانەی کرتاندن، داتاشینو توانەوەی حەقیقەت دەژیت. ئەوانەی لەئەنجامی هەوڵەکانی چەواشەکردن، سەرکوتکردنو ریسواکردن دووچاری نامۆبوون دێن بەردەوام وەک حەقیقەت بەهاکەی کەم دەبێتەوە. کاتێک حەقیقەتێک نامێنێت لەپێناویدا شەڕبکات، ئەو کۆمەڵگایانەی دووچاری نامۆ بوون هاتوون دەبن بەکۆمەڵێک بونیادی بێ مانا. ئەو بونیادانە تەنیا بارێکی سەر کۆمەڵگان، جۆرێک لە نەخۆشی کۆمەڵایەتییە. بەناوی پاتۆلۆژیکی لەشێوەی محافەزەکاری، کۆنەپەرستی و فاشیزم ناودەبرێت. ئیتر نامۆبوون بەسیفەتی دۆخی نەخۆشی واقیعی کۆمەڵایەتی بێ مانایە. لەدەستدانی مانا مەترسیدارترین دۆخی کۆمەڵگا دەخاتە روو.

دەشێت لەتەواوی شێوەکانی شارستانیدا ئەو پێکدادانو پارچە بوونە ببینرێت کە لەسروشتی کۆمەڵگادا حەقیقەت دووچاری هاتووە. چەندەی بەهای حەقیقەتی میتۆلۆژیو ئایین کەمدەبێتەوە ئەو مێخوداوەندو نێرخوداوەندانەی لەکەشو هەوای سرووتێکی مانادارو زیندوو دەپەرستران شوێنی خۆیان بۆ ئەو بتانە جێدەهێڵن کە بێبایەخ بوونەو مانایان نەماوە. گوزارشتکردن لەسەردەمی مێخوداوەندە شکۆدار، پیرۆزو

بەخشندەوە بۆ سەردەمی نێرخوداوەندی سزادەرو خاوەن بەندە جێگای باسە. لەراستیدا وەرچەرخانی کۆمەڵایەتی (لەکۆمەڵگای کۆمۆنەوە بۆ کۆمەڵگای چینایەتی) بەمجۆرە لەحەقیقەتدا گوزارشت لەخۆی دەکات. دەشێت بەشێوەیەکی زۆر زیندوو ئەم وەرچەرخانە لەکۆمەڵگای سۆمەردا چاودێری بکرێت. هەروەها شەڕ لەنێوان خوداوەندەکانیش دێتە ئاراوە. لەکاتێکدا نەریتی دیۆنیسیۆس وەک حەقیقەتی کۆمیناڵی کشتوکاڵ رەنگدەداتەوە، نەریتی زیۆس وەک حەقیقەتی تویژی زۆرداری ئەو کۆمەڵگایە رەنگدەداتەوە کە دووچاری یەکەمین پارچەبوونو وەرچەرخان هاتووە. تەنانەت پێکدادانی ئەو نەریتانەش مانا راستەقینەکەی خۆی لەکۆمەڵگای سۆمەردا دەدۆزێتەوە. بەشێوەیەکی سەرنج راکێش ئەم دوو نەریتە لەهونەرەکانی سەردەمدا رەنگدەدەنەوە. سەردەمی خوداوەندە ژن تا مەریەمی دایکی حەزرەتی عیسا رەنگدەداتەوە. لەکاتێکدا سەرمایەداری دەبێتە سیستەمێکی زاڵ جادووگەرە ژنەکانی دوا نوێنەری سەردەمی مێخوداوەند بەزیندوویی دەسووتێنن‌و مۆدێرنیتەی خۆیان ئاوا دەکەن، بوویەرێکی تا دوارادە فێرکەرو جێگای تێڕامانە.

لەسەردەمی شارستانیدا فەلسەفەو زانست وەک شێوەکانی گوزارشتکردنی حەقیقەت واتادار دەبن. لێگەڕین‌و تێکۆشانی حەقیقەت رۆڵی سەرەکی لەمەدا دەبینێت. سیستەمگەلێک جێگای پاشا ـ خوداوەندە داپۆشراوەکان دەگرێتەوە کە لەمیانەی باسە میتۆلۆژیو ئایینیەکان خۆی نەشاردۆتەوەو هەوڵدەدات لەرێگای میتافیزیاوە خۆی داپۆشێت. لەئاکامی ناتەواوی‌و کورتهێنانی ئایینە تاکخوداییەکان کە ئایدیالیزمی ئۆبژەکتیڤە، میتافیزیا وەک سۆبژەکتیڤێتی سیستەمە دەسەڵاتدارەکانی شارستانی پێشدەخرێت. لەجیاتی خوداوەند هەندێک "بانگەشە" بەسیفەتی حەقیقەت جێگیر دەکرێت. بەسیفەتی خوداوەندی بووە بەدەوڵەت ئایدیالیزم وەک حەقیقەت پیشان دەدرێت. هەربۆیە پەیوەندیەکی بەهێز لەنێوان ئایدیالیزمو نامۆبوون لەئارادایە. لەجیاتی خوداوەندەکان، لەرێگای بانگەشەکانەوە هەوڵی دەربڕینی حەقیقەتە کۆمەڵایەتیەکان دەدرێت.

لەگـەڵ ئایدیالیزمــەوە سـووان، توانــەوەو چەواشــەکردنی حەقیقــەتی کۆمەڵگاش قووڵتر دەبێتەوە.

ئـەو دەوڵەتانـەی نوێنەرایـەتی سیسـتەمی چەوسـانەوەو دەسـەڵاتی هەژموونگەرایی دەکـەن، لـەژمار نایـەن‌و خۆیـان بەشارسـتان دادەنـێن بـۆ شاردنەوەی ئەو مانا کۆمەڵایەتییەی چەندەی دەچێت بەرتەسک دەبێتـەوە قورسایی دەدەنە سەر شێوەگرتنە زێدەڕۆ، رازاوەو شکۆدارە هونەرییەکان. بۆ نموونە شارستانیەکانی گریک‌و رۆما گرنگیەکی زۆریـان بـەو خاڵـەداوە کـە بوارەکـانی، بیناسـازی، پەیکـەر، مۆسـیقاو مۆزایـک وەک حەقیقـەت پێشکەش بکەن. سیستەم چەندە بەزلکردن‌و زیادەڕۆییەوە خۆی پیشانبدات بەو رادەیە هەوڵی شـاردنەوەو چەواشـەکردنی مانـای کۆمەڵایـەتی (راستی چەوسـاوەو سـەرکوتکراوەکان) دەدات. هـەروەکو لەسـەردەمی میتۆلۆژیـاو ئاییندا روویداوە، زانست، فەلسەفەو هونەر بەدەسەڵاتەوە دەبەسترێتەوەو هەوڵی بەدەوڵەتکردنی دەدرێت، قۆنـاخێکی تێکۆشـانی زانست‌و فەلسـەفە بەرامبەر پارچەبوون‌و لـەتکردنی کۆمـەڵگا دەست پێدەکات. بـەو ڕادەیـەی بەرامبــەر ونبــوونی مانــا خــۆڕاگریی‌و بــەرخودان بکــەن هێـزی زانسـت‌و فەلسەفە بۆ گوزارشتکردنی حەقیقەت زیاد دەبێت. بەڵام چەنـدەی بکەوێتـە ژێر فەرمانی هێزەکانی دەوڵەت‌و دەسەڵاتیش دەبن بـەدۆگماو پەیوەنـدییان لەگـەڵ حەقیقەتـدا نامێنێـت. دەبـن بـەئامرازێکی بانگەشــەو راگەیانـدنی نـامۆبوون. زانسـت‌و فەلسـەفە کـە وەک گوزارشـتی حەقیقـەت لـەجیاتی دەربڕینی ئایینی‌و میتۆلۆژیی پەرەیسەند کە پەیوەندییان لەگەڵ حەقیقەت لەدەستدابوو، کاتێـک لـەجیاتی ئـەوەی کۆمـەڵگا بەبنـەما بگرێت، رۆڵـی خــۆی بــۆ بەرژەوەنــدی پاوانــەکانی چەوســانەوەو سـەرکوتکردن گـۆڕی، هەروەکو نامۆکردنە میتۆلۆژی‌و ئایینیـە کۆنـەکان ئـەویش بـوو بـەدۆگماو ئیتر ونکردن‌و لەدەستدانی پەیوەندیـەکانی بەحەقیقەتـەوە دەستی پێکرد. قۆنـاخێکی هاوشـێوە لـە بابـەتی هونەرەکانیشـدا دەست پێدەکات. ئـەو هونەرانــەی پەیوەنــدییان بەحەقیقەتــەوە نــەماوە دەکەونــە دۆخێکــی زیادەڕۆیی‌و لـەنزمترین ئاستیشـدا گوزارشت لـە واقیـع‌و راستی کۆمـەڵگا ناکەن. بەهۆی زۆرداری‌و زەبروزەنگەوە کێشە کۆمەڵایەتییەکان لەسەردەمی

شارستانیدا لەسەرجەم شێوازەکانی گوزارشتکردنی حەقیقەتدا لێپرسینەوە لەگەڵ خودو گەیشتن بەچارەسەری دەسەپێنێت. بەو ئەندازەیەی سەرچاوەی کێشەکانی حەقیقەت کۆمەلایەتییە، چارەسەرکردنیشیان لەچوارچێوەی زانستی کۆمەلایەتیدایە. ئەو زانستەی پەیوەندی بەکۆمەڵگابوونەوە نامێنێت نامۆ دەبێت، لەم سۆنگەیەوە لەدەستدانی پەیوەندییەکەی بەحەقیقەوە دەست لێبەرنەدراوە. ئەو کۆمەڵگایانەی خۆیان لەسەرجەم میتۆدو پەیرەوەکانی حەقیقەتدا پێگەیاندووە، لەدۆخی نامۆبوونو کێشە رزگاریان بووە، کۆمەڵگایەکی یەکسانیخواز، ئازادو دیموکراسیخوازن (ئەخلاقیو سیاسی).

## ز ـ حەقیقەتو نامۆبوون لە مۆدێرنیتەی سەرمایەداریدا

هەروەکو چۆن مۆدێرنیتەی سەرمایەداری کەڵەکەکردنی زۆرترین دەسەڵاتو قازانج ـ سەرمایەیە، گرێدراو بەو بابەتەش ئەو سیستەمەش پێناسە دەکات کە حەقیقەتی تێدا نامۆ دەبێت. لەدایکبوونی وەک سیستەم شەڕی خوێناوی حەقیقەتی پێویست بووە، بەردەوامکردنیشی گەورەترین شەڕەکانی مێژووی لەگەڵ خۆیدا هێناوە. چونکە شەڕەکانی سیستەم تەنیا شەڕی دەسەڵاتو چەوسانەوە نەبووە. لەهەمانکاتدا شەڕێکی دژواری حەقیقەتیشن. مۆدێرنیتەی سەرمایەداریش وەک بەردەوامی سیستەمی شارستانیی کە لەئاستی جیهانگیریدا پێشکەوتووە بەو رادەیەی حەقیقەتی مانای کۆمەلایەتی بپلیشێنێتەوە، چەواشەی بکاتو بیشێوێنێت ئەویش فەراهەم دەبێت. بەو رادەیەی قازانجو دەسەڵاتی ناو سیستەم بەبەرزترین ئاست بگات، بواری حەقیقەتی ژیانی کۆمەلایەتی بچووکتر دەبێتەوەو لەدەستدانی مانا تا بڵێی زیاد دەکات. ژیانی کۆمەلایەتی تەنیا نابێتە قوربانی تووڕەییو برسێتی قازانجو دەسەڵات؛ تەواوی شێوەکانی گوزارشتکردنی حەقیقەت دووچاری نامۆبوون دێت. هەم لەبواری حەقیقەت هەم مانا کۆمەڵگا رووبەرووی قۆناخێکی لەناوبردن دەبێتەوە. راستیەکانی دەسەڵاتو سەرمایە لەجێگای تەواوی راستیەکانی کۆمەڵگا جێگیردەکرێت.

یەکەمین کۆڵەکەی مۆدێرنیتە واتە سەرمایەداری کاتێک دەرفەتی بە سیستەمبوونی بۆ رەخسا بەلەناوبردنی کۆمەڵگابوونە سەرەکیەکانی بەر

لەمێژوو و دواتری دەستبەکار دەبێت. بەر لەهەموو شتێک لەژێر ناوی "راوە دوونانی ژنە جادووگەرەکان" هێزی خۆڕاگری کۆمەڵگابوونی ژنانی لەناو کلپەی ئاگردا سووتاند. ناشێت راوەدوونانی ژنە جادووگەرەکان لەدەرەوەی سەرمایە بیری لێبکرێتەوە. سەرمایەداری تا دواڕادە کەڵکی لەو شانۆیانەی گڕتێبەردان وەرگرتووە بۆ ئاواکردنی هەژموونگەرایییەکەی سەر ژن کە بەشێوەی قووڵترین کۆیلایەتییە. ئەگەر لەرۆژی ئەمڕۆماندا ژن بەسۆزانیکراوترین دۆخەوە لەخزمەتی سیستەمدایە، بەهۆی پەیوەندییە بەهێزەکەیەتی لەگەڵ ئەو سووتاندنانەی لەقۆناخی سەرهەڵدانی هەژموونگەرایی سەرمایەداری هاتە ئاراوە. ساتە مەترسیدارو شۆکەکانی سووتاندن لەئەوروپا ژنی خستۆتە ژێر خزمەتی بێ سنووری پیاوەوە.

دوای ژن بەشێوەیەکی زۆر بێ بەزەییانە سیستەم کۆمەڵگای کشتوکاڵ ـ گوندیشی رووخاندووە. لەبەرئەوەی لایەنی کۆمیناڵی دیموکراتییانەی کۆمەڵگای کشتوکاڵ ـ گوند لەسەرپێیان بمێنێت زۆرترین قازانجو دەسەڵات بەدەست نایەت، بەئامانجگرتنی دەست لێبەرنەدراوە. بەگوێرەی ئاستی لەناوبردنی ئەو کۆمەڵگابوونە کە زەمینەی ماناو حەقیقەتی بەرخودان، ئێشو خۆشی هەزاران ساڵەی مرۆڤە، ئەوا دەرفەتو چانسی رابوونو هەڵمەتی سیستەم زیادی دەکرد. تەواوی کردەوەکانی سەدەی شازدەهەمو دواتر لەئەوروپاو جیهان روویانداوە ئەو واقیعە دەسەلمێنن. پێویستە شەڕی سیستەم بەرامبەر بەکڵێسا ـ ئەگەر بەشێوەیەکی سنوورداریش بێت گوزارشتی لەحەقیقەتی کۆمەڵگا دەکرد ـــ لەم چوارچێوەیەدا هەڵسەنگێنرێت. گەردوونگەرایی (موتڵەگەرایی) کرستیانی کە گوزارشتی کۆمەڵگابوونێکە لەناوەخۆیدا تەفرەدراوەو لەپاوانی دەسەڵاتو چەوسانەوەدا پشکی هەبێت، بەڵام دیسان یەکێک لەسەنگەرە گرنگەکانی پاراستنی کۆمەڵگایە. بەبێ سەرکوتکردنو بێکاریگەرکردنی ئەو سەنگەرەش سەرمایەداری نەیدەتوانی هەنگاو بهاوێژێت. شەڕە ئایینیە گەورەکانیش گوزارشتی ئەو حەقیقەتەن.

لەرێگای رەواکردنی تەربیەکراوترین جۆری کۆیلایەتی کە بەپرۆلیتاریابوون ناو دەبرێت سەرمایەداری زەبرێکی کوشندەی

لەحەقیقەتی کۆمەڵگاداوە. یەکێک لەهەڵە گەورەکانی کارل مارکس ئەو غەفلەتەیە کە تێی کەوتووەو یەکێک لەفاکتەرەکانی حەقیقەتی ونبوو ــ پرۆلیتاریا بەسۆبژەی سەرەکی دادەنێت. چونکە پرۆلیتاریا کۆیلەیەکی پەرەپێدراوە. تا ئەو رەوشەی بەردەوام بێت هەرگیز نابێتە سۆبژەیەکی خاوەن حەقیقەت. سەرمایەداری تاکو تەواوی تایبەتمەندێتیە کۆمەڵایەتییە مرۆییەکانی پرۆلیتاریا نەکوژێت نایخاتە ناو کارەوە. گەوهەری کۆمەڵایەتی مرۆیی کۆیلەکەی چاخی کۆن لەهی کۆیلەی مۆدێرن ــ پرۆلیتاریا ـ زیاترە. بەڵام دیسان لەبەرئەوەی کۆیلەیە، تەنیا کاتێک ئازاد بێت دەتوانێت پشکی خۆی لەحەقیقەت بەدەست بێنێت. پێناسەکردنی پرۆلیتاریا وەک راستیەک کە هەم لەدۆخی کۆیلایەتیدایەو هەمیش هەڵگری پشکو کایەی حەقیقەتە گەورەترین شێواندنی مارکسیزمە. ئەو حەقیقەتە لەبناخەی سەرنەکەوتنی سۆسیالیزمی بونیادنراودا شاراوەیە.

بۆرژوازیش کە سەرمایەداری وەک چینێکی کۆمەڵایەتی بەرزی کردەوە، خودی ئەو کارەساتە کۆمەڵایەتیەیە کە لەسەر حەقیقەت پارچەو دابەش بووە. پاشا ــ خوداوەندێک لەهەزار بۆرژوازی زیاتر نزیک بەحەقیقەتە. بۆرژوازی بەشە نەخۆشەو پاتۆلۆژیەکەی ئەو سروشتە کۆمەڵایەتییە پێکدێنێت کە حەقیقەتو مانا کۆمەڵایەتیەکەی پاڵپشتی بۆ دوو پارچە دابەش بووە. هەروەکو چۆن لەکەسایەتی ئەو چینەدا مۆدێرنیتە تەواوی حەقیقەتی کۆمەڵایەتی ئیفلیج دەکات، هەروەها دەسەڵاتو سەرمایەش بەدۆخی جانەوەر (لویاتان) دەگەیەنێت کە نامۆکردن دەسەپێنێت.

دەوڵەت ـ نەتەوەش کە دووەمین کۆڵەکەی مۆدێرنیتەیە، دەشێت وەک هێزێکی داتاشینو هەڵکۆڵینی حەقیقەت پێناسە بکرێت کە هاوتاکەی لەمێژوودا نەبینراوە. هیچ نەخۆشیەکی سیاسی ــ کۆمەڵایەتی بەقەدەر دەوڵەت ــ نەتەوە لەژێر ناوی ئەندازیاریێتی (دیمورگ= خوداوەندی بیناساز) کۆمەڵگا کۆمەڵگای هۆمۆژەن نەکردووە و لەژیانی دانەبڕاندووە. کاتێک لەژێر کیسوەی پێشکەوتنخوازی (شێوەی مۆدێرنەکەی باوەڕی قیامەتی ئیلاهی)دا مۆدێرنیتە پیرۆزترین جیاوازیەکانی ژیان (سەرباری

ئـەوەی ژیـان = جیـاوازی) دا دەتاشـێو دوای بـێ نرخکردنـی بونیـادی یەکانەیی دەئافرێنێت؛ ئەمە خـودی فاشیزمە. فاشیزمیش ئـەو نەخۆشیە کۆمەلایەتیەیـە کـە لەشـوێنی لـەناوچوونی حەقیقـەتی کۆمـەلگا سـەرهەلدەدات؛ ئەگـەر دەسـەلاتی دەوڵـەت ـــ نەتـەوەو پاوانگـەرایی سەرمایەداری لـەئارادا نـەبێت هـەرگیز دروست نابێـت. دەستەواژەکانی سنوور، نیشتیمان، میللەت، ئالا، سروودو هاوولاتی کە دەوڵەت ـ نەتەوە هـەوڵی پیرۆزکردنیـان دەدات گرێـدراوی خیانەتکردنـە لەپیرۆزییـە راستەقینەکانی کۆمـەڵگا. یـەک ولات، یـەک میللـەتو جۆرێکی هـاوولاتی تەنیا ئەو کاتە بەدیدێت کە وەک قەساب مرۆڤایەتی لەت لەت ورد بکرێت. لـەدۆخێکی بەمجۆرەشـدا تـەنیا دوورکەوتنـەوەو نـامۆبوون لەحەقیقـەت روونـادات، بـەڵکو لـەناوچوونی خـودی کۆمـەڵگا جێگـای بـاس دەبێـت. بەرامبـەر بـەزیادبوونی دەسـەلاتی دەوڵـەت ـــ نەتـەوە کـە ئاینگـەرایی، میللیگـەرایی، رەگەزگـەراییو "زانسـتگەرایی" لـەخۆوە دەگرێـت حەقیقەتـە کۆمەلایەتیەکان تا دەگاتە بچـووکترین زەرەیـەوە دووچـاری دەستدرێژی، داگیرکەریو نکـۆڵی دێـن. کاتێـک هەنـدێک لـە فەیلەسوفەکان لەسـەرووی هەمووشیانەوە نیچە، فۆکـۆو ئـەدۆرنۆ بـەناوی حەقیقـەت دەکەنـە هـەراو هاوار دەکەن کـە تـاکی مۆدێرنیتـە مرۆڤێکـی خەسێنراوەو لەکۆمـەڵگابوون دابرێنراوە، باسی ئەو واقیعە دەکەن.

ئـەو حەقیقەتـە ئاشـکرا بـووە کـە سـێیەمین کۆڵەکـەی مۆدێرنیتـە ئیندوستریالیزم مانای لەناوبردنی ژیانی ئیکۆلۆژییە. تەنیا لەناوچوونی سیستەمی ئیکۆلـۆژی نییـە، لـەناوبردنی ئـەو راستیەیە کـە کۆمـەڵگاش بەبوونیـەوە هەیـە. کۆمەڵگایـەک کـە رۆژانـە ژینگەکـەی وێـران دەکرێـت کۆمەڵگایەکە پارچـە پارچـە بەشـەکانی ژیـانی لەدەستدەداتو دەرخـواردی جانـەوەری دەدات. ئیندوسـتریالیزم لەگـەڵ سـەرمایەداریو دەوڵـەت ـــ نەتـەوەدا هاوبەشـی ئـەو تاوانەیـە کـە لەماوەیـەکی زۆر کورتـدا کۆمەڵگابوونی مرۆڤ لـەناوبچێت کە لـەدەرەنجامی بـەرخودانی ملیۆنـان سـاڵ بونیـادنراوە. کاتێـک بـێ سـڵەمینەوە لـەژێر نـاوی کۆمـەڵگای پیشەسـازیەوە بەرهـەمێکی شـێرپەنجە وەک پێشـکەوتووترین کۆمـەڵگا

پیشاندەدرێت، بەشێوەیەکی ئاشکرا روونی دەکاتەوە کە ئیندوستریالیزم چ جۆرە رووداوێکی پاتۆلۆژییە. هیچ شەڕێک وەک ئەو تاوانانەی بەناوی کۆمەڵگای پیشەسازی ئەنجام دراون کوشتارو تاوانیان لێنەکەوتۆتەوە، کۆمەڵگایان پارچەنەکردووەو دووچاری نەخۆشییان نەکردووە.

پێخەمبەران کە مانایەکی زۆریان لەدەستەواژەکای قیامەتو مەحشەر بارکردووە، بەهەرحاڵ لەرێگای ئەو دەستەواژانەوە خواستوویانە باسی ئەو ئاخیری زەمانە بکەن کە جانەوەرە سێ پێیەکەی ــ کە بەمۆدێرنیتە ناو دەبرێت ـ لەمیانەی لەناوبردنی مانا و حەقیقەتی کۆمەڵگای مرۆڤ هاتۆتە ئاراوە.

هۆکاری سەرەکی هەوڵەکانم بۆ خستنەڕووی چوارچێوە گشتیەکەی دامەزراوەیی‌و دەستەواژەیی پێویست بۆ سەرلەنوێ پێناسەکردنەوەی ژیانی کۆمەڵگای خۆرهەلاتی ناوین وەلامدانەوەی پرسیاری "ژیانی کۆمەڵگایی چی یە؟"یە. هەڵویستێکی سەیری مرۆڤ دەرهەق بەژیانی خۆی جێگای باسە، لەو بڕوایە دایە کە لەئەزەلەوە تا ئەبەد لەسەر هێڵێک یاخود لەبازنەیەکی بەردەوامدا دەژیت. ئەمە بەهەڵەداچوونێکی بنەڕەتییە. سەرباری ئەوەی دەرفەتو چانسی خاوەنداریتیکردنی مانادارترین ژیانی هەیە، بەلام مرۆڤ بەهەڵەداچووترین جۆرە، ئەمەش تەنیا یارییەکی سروشت نییە، لەو بڕوایەدام یارییەکە زیاتر لەکۆمەڵگای ستەمکاردا خۆی دەنوێنێت. هیچ جۆرێکی بوونەوەر بەقەدرە مرۆڤ فریودەر نییە. بەو ئەندازەیەی زۆر سەرسوڕهێنەرە، لای من یارییەکی سەیرە.

پێناسەکردنێکی راست بۆ ژیانی کۆمەلایەتی کۆمەڵگاو ژیانکردن بەگوێرەی ئەو هوشیاریەوە، بەقەدەر خودی ژیان گرنگە. لەوانەیە ژیان لەپێناو پێناسەکردنێکی راست بێت. بەر لەهەموو شتێک پێویستە بڵێم ژیان بەگشتی، بەتایبەتیش ژیانی مرۆڤ ئەنجامو بەرهەمێکی بونیادو ئەندازیاریتیەکی تایبەت بەخۆیەتی. دەستنیشانکردنی ناوەڕۆکو چییەتی ئەو بونیادە ئەرکی سەرەکی زانستی کۆمەلایەتییە. بەئامانجی روونکردنەوەی زیاتری ئەو خاڵەی خوازیاری ئاماژەپێکردنیم دەتوانم پەپوولە وەک نموونە پیشان بدەم کە تەمەنێکی سێ مانگی هەیە.

پێکهاتەی ناوخۆیو ژینگەی دەوروبەری ئەو ژیانە سێ مانگییەی دەستنیشان کردووە. ئەگەر لەرووداوێکدا تێنەچێت، پەپوولە ئەو سێ مانگە دەژیت. هەربۆیەش لەپێشینەو دواییینە (کێشەی ئەزەل ـ ئەبەد) بەو سێ مانگە سنووردارە. هیچ بیر لەوە ناکاتەوە ئەو دۆخە بکات بەکێشە. ئارەزوویەکی بەمجۆرەشی نابێت. هەبێتیش هێندە نایکات بەمەسەلە. نموونەیەک لەناو ئەم نموونەیە بێنینەوە؛ گلگامێش، گلگامێش وەک نموونەیەکی نەرێنی پێشکەش دەکەم. روونیدەکەمەوە. لەناوەڕۆکدا تەواوی سروشتو گەردوون گرێدراو بە (ڕێسای پەپوولە) دەژیت. تەنیا ژیانی مرۆڤ پێچەوانەی ئەو ڕێسایە دەبێتەوەو دۆخی کێشەگەلێکی زەبەلاح وەردەگرێت.

بەئامانجی ئەبەدیکردنی تەمەنی خۆی جۆری مرۆڤ هەر لەئەزەلەوە لێگەڕینی جیاواز ئەنجامدەداتو ئەو هەوڵانەشی بەئاستێک گەیاندووە بیر لەبەهەشتی ئاسمانو دۆزەخی ژێر زەمین بکاتەوە. بەجۆرێک سەرشێتی دەکات کە خۆی وەک پاشا ـــ خوداوەندو تەنانەت بێنرخترین کۆیلەش بنوێنێت. ئەو هەڵوێستانەی هیچ ڕێسایەک ناناسنو ئامادەیە لەناو لادانێکی زایەندی (سێکسی) رۆژانەدا بژیتو خۆی بکات بەدۆخی رەگەزێکی نۆتر؛ ئەمەش تەنیا تایبەت بەمرۆڤە. ئەوجۆرە هەڵوێستانەی جینۆسایدی سیستەماتیکو راکردن بەدوای ژیانی جاویدانی بێ کۆتاش لەخۆوە دەگرێت بەشێوەی نەخۆشییەک بەردەوام دەبێت کە لەهیچ جۆرێکی بوونەوەردا جێگای باس نییە. لەپێناو تێگەیشتنو بەربەستکردنی ئەو سەرشێتییە سنوورنەناسانە، تەنانەت بۆ پێویستی بەپێناسەکردنی ژیان هەیە. دەشێت پێناسەیەکی راست ببێت بەیەکەم هەنگاوی ژیانێکی راست.

بەئامانجی زیاتر روونکردنەوەی بابەتەکە لەپێشەکییە درێژەکەی ئەم بەشەدا هەوڵی پێشخستنی چوارچێوەیەکی دەستەواژەییو دەمەزراوەیم دا. بێگومان ئەرکی زانستێکی کۆمەڵایەتی بەبانگەشە پەرەپێدانی ئەو چوارچێوەیەو بەژیانکردنێتی. لەبەر ئەم هۆکارانە کاتێک هەوڵی شیکارکردنی قەیرانی بونیادی مۆدێرنیتەی سەرمایەدارییو ئەگەرەکانی دەرکەوتن لەقەیران دەدەین. سەرلەنوێ پێناسەکردنو بونیادنانەوەی

(ڕێکخستنی) زانستی کۆمەڵایەتی ــ کە پێویستیەکی ژیانیو دەست لێبەرنەدراوە ــ لەسەرووی ئەرکە لەپێشینەکانەوە دێت.

مەرجی دەست لێبەرنەدراوی ژیانی مرۆڤ کۆمەڵگابوونەکەیەتی. بەسووربوونەوە داکۆکیکردنم لەسەر ئەو بابەتە هۆکاری یەکەمی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە؛ تا ئێستا لەلایەنی زانستیو کۆمەڵایەتییەوە پێناسەیەکی بۆ نەکراوە، تەنانەت ئەگەر هەندێک ئەزموونی دەستپێشخەریش لەئارادا بێت بەڵام زانستیبوونێک فەراهەم نەبووە کە بەهای ماناو حەقیقەتی هەبێتو بونیادی ڕێکخستنیو بەکۆمەڵگاکردنی جێگای باس نییە. دووەمین هۆکاری گرنگ، بونیادی زێدەڕۆیانەو بە جانەوەرکردنی تاکو تاکڕەوێتییە لەلایەن لیبرالیزمی مۆدێرنیتەی سەرمایەدارییەوە؛ بەئاستێک گەیشتووە لەئەرزو ئاسمان جێگای نەبێتەوە. بەو دۆخەی ئێستای تاکڕەوێتی تەنیا لەرەوشی بەردەوامبووندا نییە، بەڵکو ژیان لەگەڵیدا مەحاڵە. نە کۆمەڵگاکەمانو نە هەسارەکەشمان چیتر هێزی بەرگەگرتنی ئەو ژیانە تاکڕەوێتییەیان نەماوە کە بۆ هەر جۆرە گومڕاییو لادانێک کراوەیەو لەهیچ جۆرێکی دیکەی بوونەوەراندا نابینرێت. ئەو جۆرە تاکڕەوێتییە بەدۆخێکی گومڕاو لادەرانەی وەها گەیەنراوە، ڕۆژانە بیستوچوار کاتژمێر لەمرۆڤ کوشتن، ئەنجامدانی سێکس، وەرزشو هونەر، بەدەستهێنانی قازانجو ئەشکەنجەکردن بێزار نابێت. ئاشکرایە کە کۆتایی ئەو تاکڕەوێتییەش نەخۆشیەکانی لەجۆری شێرپەنجەو ئایدزە، ئەو نەخۆشیانەش بەخێرایی سەرهەڵدەدەن. ئەو ڕۆژانەی بەمەحشەر ناودەبرێنو زۆر لەمێژە پێغەمبەران هەواڵەکەیان ڕاگەیاندووە گوزارشت لەو قۆناخەی تاکڕەوێتی دەکات.

لەدۆخێکی بەمجۆرەدا وەک پێویستیەکی ڕێزو پێزانینی ژیان، ئەرکی یەکەم بونیادنانی زانستی کۆمەڵایەتییە کە ژیانی کۆمەڵگا پێناسە بکات، ئەرکی دووەمیش، پێویستە ژیانی تاکڕەویو سیستەمەکەی پشتی بوەستێنرێنو لەگەڵ ئەرکی یەکەم بکرێن بەیەک؛ ئەمەش مەرجی هەنگاونانو پێهەڵگرتنە.

بێگومان بەکۆمەڵگابوون یان کۆمەڵایەتیبوون پشت بەرێکخستنو بونیادنانی ژیانی تاکەکەس دەبەستێت. کۆمەڵگایەکی دابڕاو لەتاک جێگای باس نابێت. دەشێت بەراوردکردنی تاکو کۆمەڵگا بەبەراوردکردنی توخمەکانی هایدرۆجینو یۆرانیوم بچوێنین. کاتێک گەردیلەی هایدرۆجین بەتەنیا بێت پێکهاتەیەکی سادەیە. ئەگەر لەهەندێک جۆردا بڵاوبوونەوەی تەنۆلکەو وزەش رووبدات زۆر سنووردارە. هەرچی یۆرانیۆمە ئەو پێکهاتانەی سەنتێزیان لەهەمان گەردیلەوە دروست کردووە بەردەوام وزەو تەنۆلکە بڵاودەکەنەوە. بۆمبای ئەتۆمیش سەرچاوەی خۆی لەو تایبەتمەندێتییەی یۆرانیۆم وەردەگرێت. لەکۆمەڵگاشدا ژمارەیەکی زۆری تاکەکانی کراون بەسەنتێز، بەڵام ئەو وزەو تەنۆلکە (جڤاتە کۆنو نوێکان) ی بڵاوی دەکەنەوە لەئاستێکدایە کە لەگەڵ مرۆڤی تاکڕەو (ئەتۆمی جگە لە ژیاندنی خۆی هیچ رۆڵێکی دیکەی نییە) بەراورد ناکرێت.

کاتێک تاک کۆمەڵگابوون یان کۆمەڵایەتیبوونی خۆی لەدەست بدات، ئەگەر بەشێوەی جەستەیی لەژیانیشدا بمێنێت، یان خائینو نارەسەنە یان سەرسەرییو بەرەڵایە. لەهەردوو دۆخیشدا کوشندەیە.

مانادارکردنی کۆمەڵگابوونی خۆرهەڵاتی ناوین وەک بونیادێکی گەردوونی گرنگو بایەخدارە. راوچییە گەڕۆکو کۆکەرەوەکانی رووەکو دانەوێڵە لەمیانەی ئەو ئەزموونەی لەژیانی درێژخایەنی بنارەکانی زنجیرە شاخی تۆرۆس ــ زاگرۆس بەدەستیان هێنابوو هەنگاویان بۆ بەکۆمەڵگابوونی کشتوکاڵ ــ گوند هاوێشت، هەرچەندە بێ ئاگاش بن بەڵام بونیادی ژیانێکی گەردوونییان ئاوا دەکرد. لەبەشە پەیوەندیدارەکان هەوڵی شیکارکردنی خودی ئەو بونیادەو سەردەمی شارستانی ناوندیم دابوو کە لەسەری ئاواکراوە. لێرەدا راوەستەکردن لەسەر مانای بونیادنانو بەهای حەقیقەتەکەیو روونکردنەوەیان کۆمەک بەخش دەبێت.

ئەو کۆمەڵگا نوێییەی لەسەردەمی توانەوەی دواترین قۆناخی سەهۆڵبەندان بیست هەزار ساڵ بەر لەئێستا لەبنارەکانی زنجیرە شاخی تۆرۆس ــ زاگرۆس هەوڵی رێکخستنی دراوە، لەجۆرە دەوڵەمەندەکانی رووەکەوە هەنگاوی بۆ کشتوکاڵ هەڵناوە، لەئاژەڵە گونجاوەکانی

مالیکردنیشەوە هەنگاوی بۆ ئاژەلداری هاویشتووە. دەهەزار سال بەر لەئیستا ئەم قۆناخەی گوزەرکردن بەژیانی گوندی چیّنشین ئەنجامگیربوو. کردارەکانی چاندنو ئاژەلداری کۆمەلگای جووتیارو شوانکارەی دەرخستە پیش. ژیانیکی وەک خەیال بۆ مرۆڤایەتی هاتە ئاراوە. تەواوی جەژنو سرووتەکانی تا ئیستاش شوینپەنجەکەیان دیارە سەرچاوەی خۆی لەجۆشوخرۆشی ئەو ژیانە وەردەگریت کە بەخەیال دەچوو. لەکۆمەلگای نەبوونیو هەژاریەوە دەربازی کۆمەلگای هەبوونی ببوون. بەبی ئاشنابوونی بەشیوەیەکی دیکەی کۆمەلگا ئەم شیوەیە نزیکەی دە هەزار سال بەردەوام بوو. ئەو شیوە ژیانە لەتەواوی جیهان بلاوبوویەوە. هەرچەندە هەندیک بۆچوون باسی فرە ناوەندی بکەن، بەلام لەمیانەی بەلگەی بەهیزەوە جەخت لەسەر گرنگی رۆلی دیاریکەری ئەو یەکەمین ناوەندەی ژیانی نوی دەکریتەوەو دەسەلمینریت.

ئەو کۆمەلگایەی لەتەوەرەی دایک ـ ژن پەرەیسەند بەهۆی ئاواکردنی یەکەمین کۆمەلگای خزمایەتی جیگای گرنگیو بایەخ پیدانە. خزمایەتی لەسەر بنەمای نزیکبوون لەدایک ـ ژن دەستنیشان دەکریت. لەریگای ئەو خزمایەتیەوە لەکلانی سەرەتاییەوە بەیەکەمین کۆمەلگای قەبیلە دەگەن. قەبیلە بەو سیفەتەی شیوەی کۆمەلگایەکی بەهیزو خاوەن ناسنامەیەکی رەسەنە تا ئیستاش شوینپەنجەکەی بەردەوامە. ئەو زمان، ئایین، میتۆلۆژیا، هونەر ، داناییو دەزگا زانستییە رەسەنانەی کاریگەریەکەیان تا رۆژی ئەمرۆشمان هاتووە یەکەمین بریسکەو رۆشنایی خۆیان لەهەناوی ئەو کۆمەلگایەدا بلاوکردەوە. سەرهەلدانو دەرکەوتنی راستەقینەی ئامرازەکانی لەجۆری رستنو چنین، دەفرودییزە، کلان، دەستارو ئاواکردنی خانوو قەرزداری کۆمەلگای ئەو قۆناخەیە. وابەستەبوونیکی پیرۆز بەسروشتو ئاواکردنی ولاتی بچکۆلانە بەرهەمی ئەو کۆمەلگایەیە. دەشیت لەسەدا نەوەدی "یەکەمین"ەکانی دەرهەق بەژیانی کۆمەلگا داهینراون بۆ کۆمەلگای ئەو قۆناخە بگەرینریتەوە.

ئەو کۆمەڵگابوونەی دەیان هەزار ساڵ بەتەنیا بەردەوام بوو قاڵبە سەرەکیەکانی رۆح و زهنیەتی مرۆڤایەتی، بەها کلتووریی و مەعنەویەکانی پێکهێناوە. ئەو کۆمەڵگایە کە لەقالبەکانی رۆح وزهنیەتێکی پشتبەستوو بە دایک ـ ژن، قەبیلە، شوانکاری، جووتیاری، کشتوکاڵ و گوندو هەندێک ئامرازی بەرهەمهێنان پێکهاتووە. لەوانەیە کۆمەڵگایەکی سادەبێت، بەڵام بەشێوەیەکی سەرکەوتوانە بناخەی ژیانێکی ریشەیی بۆ مرۆڤایەتی داناوە. هەرشتێکی لەوە بەدواوە ئاواکراوە لەمیانەی پشتبەستن بەو کۆمەڵگایەوە پەرەی پێدراوە. بەبێ رەزامەندی ئەو کۆمەڵگایە هیچ پێشکەوتنێکی پەیوەندیدار بەمرۆڤەوە بەدینایەت. ناخوازم بڵێم پەرەسەندنێکی دیکە روونادات. ئەگەر هەبێتیش گرێدراو بەو کۆمەڵگایەو بەشێوەی باڵێکی دێتە ئاراوە. چونکە کۆمەڵگاکان هەبوونێکی دیرۆکین. لەدەرەوەی مێژووییبوونەکەشیان کۆمەڵگاکان جێگای باس نابن. میتۆدی زانست کە مێژووی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری بەلاوە دەنێت و تەنیا پشت بەئانالیز دەبەستێت بەرامبەر بەسەرجەم زانستەکان بەتایبەتیش بەرامبەر شێوەی پەرەسەندنی چەواشەکارانەو بێ بەهایی حەقیقەت و مانای زانستی کۆمەڵایەتی بەرپرسیارە. بەو سیفەتەی خراپترین میتافیزیایە ئەنالیزو ئۆبژەکتیڤیتی کەموکورییە سەرەکیەکانی زانستی تەوەرەی ئەوروپایە.

ئەگەر کۆمەڵگاکان هەبوونێکی مێژووین ئەوکاتە ماناکەشیان دیرۆکییە. چونکە مانا ناوەرۆکی ژیانی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگایە، دەشێت وەک ئامانج، رۆح و زهنی ژیانی کۆمەڵگاش پێناسە بکرێت. هەرچی حەقیقەتە دەربڕین، گوزارشت و شێوەپێدانی مانای هەبوونی ئەو کۆمەڵگایە لەرێگای میتۆلۆژیا، هونەر، دانایی و زانستەوە.

هەرچەندە کۆمەڵگای مرۆڤایەتی دووچاری چەواشەکاری و شێواندنێکی قورسیش هاتبێت ئێستاش لەسەر بنەمای هەمان پەیڕەوەکانی حەقیقەت ئەو ماناداربوونەی خۆی دەژێنێت. یەکێک لەبەڵگەکانی دیکەی دیرۆکیبوونی کۆمەڵگاش ئەو شێوەیەی ژیانە. بێگومان ئەو شێوەیەی ژیانی کۆمەڵگا وەک خۆی نەماوەتەوە. لەبواری دیالیکتیکی بەردەوام پەرەسەندنێکی دیاری لەناواخنی هەڵگرتووە. چەندە هیلاک بووبێت،

دووچـــاری تێکـــدانو لـــەناوبردنیش هاتبێـــت، تـــا رۆژی ئـــەمرۆماز توانیویەتی وەک فۆرمی سەرەکی خۆی بژێنێت.

یەکەمین گـەورە پارچـەبوونی فـۆرمی ژیـانی ئـەو کۆمـەڵگا مێژوویـیـە لـەرێگای پلەدارییـەوە چـەقۆی لێدراوە. هـەروەکو پێناسـەکراوە پلـەداری لەسـالانی ٥٠٠٠ پ. ز وەک فاکتـەرێکی بیسـتراو لەهـەناوی کۆمـەڵگادا جێگیربوو. خـودی پلـەداریش نوێنەرایـەتی یەکـەمین گروپـی دەستەبژێراز دەکـات. بەسـیفەتی سـێیانەی راهیـب + حـوکمڕان + سـەرباز هەوڵـدەدرێت لەشوێنی نفوزی دایک ـ ژن دابنرێت. یەکەمین گەورە نامۆبوونی نـاواخنی ژیـانی کۆمـەڵگا لـەرێگای نفـوزی ئـەو دەستەبژێرانەوە دەست پێدەکات. بونیادی بنەماڵەو خانەدانە دەستەبژێرەکانیش سەرچاوەکەی بۆ پلـەداری دەگەڕێتـەوە. لەکاتێکدا خانـەدانێتی بەسـیفەتی دەوڵـەت شـێوە دەگرێـت، لەلایەکی دیکەشەوە بەسیفەتی بنەماڵەگەرێتی ژیانی کۆمەڵایـەتی بـەماناو فۆرمێکی جیاوازتر دەگەیەنێت. وەرچەرخانی ریشەیی جێگای باسە.

لەسالانی ٣٥٠٠ پ. ز بەدواوە لەگەڵ دەستپێکردنـی شـار، جیـاوازی چینایەتیو دەوڵەتبوون؛ پارچـەبوون، وەرچـەرخانی مانـاو فـۆرم قـووڵتر دەبێتـەوە. کۆمـەڵگای شارسـتانی رۆڵـی سـەرەکی لـەوەدا دەبینێـت. چەرخەکانی شارستانی (دەوڵەت، کێڵگەی کۆیلان، بازرگانی، پاوانـەکانی ربـا) کـە لەسـەر زێـدە (بەرهـەم، بـەها) کۆمـەڵگا ئـاواکراون لەقووڵاییـد ژیانیان بریندار کردووە. کاتێک فاکتەرەکانی نامۆکردن لەهەناوی کۆمەڵگا جێگیربـوون کـە پێشـتر نەناسـرابوون، دواتـر هـەنگاو بەهـەنگاو مانـاو فۆرمەکـەی شـێواو یەکپارچییەکـەی نـەما، ژیـانی تایبـەت بەچینـەکانی سەروو و خواروو دێتە ئاراوە. ئـەو هـەبوون (ژیـان)ەی بەشێوازی ژیـانی شارستانانە ناودەبرێت گوزارشت لەو شێوازە دەکـات. ئـەو شارسـتانییەی لەهەمان شوێنی ناوەنـدی (هیلالـی بـەپیت) کۆمـەڵگای خۆرهـەلاتی نـاوین بـالای کـرد مانایـەکی ناوەنـدی هەیە؛گەردوونییـە. هەرچەنـدە نـامۆبوون لەهـەناوی ژیـانی کۆمەڵایەتیـدا قووڵبکاتـەوە بـەلام لـەبواری مێژوویـیو جوگرافیـەوە خۆرهـەلاتی ناوینییـە. ژیـانی شارسـتان کـە وەک تـوێژێکو

سەروو لەژیانی کۆمەڵگای خۆرهەڵاتی ناویندا جێگیربوو بەلانی کەم گوزارشت لەقۆناخێکی پێنج هەزار ساڵەی هەژموونگەرایی دەکات.

هەژموونگەرایی فاکتەرێکی سادە نییە. دزەی کردۆتە ناو سەرجەم مەمیلە، پێکهاتەو ئۆرگانەکانی ژیانی کۆمەڵگا. وەک ناسنامە ژن لەخوارووی خوارەوەی ئەو شێوازەی ژیاندا جێگیر کراوە. چینێک سەرووتریش کۆیلایەتی پیاو جێگیرکراوە. عەشیرەتو قەبیلە رەوەندە بەرخودانکارەکانیش لەگەڵ لادێییە زەحمەتکێشەکانو پیشەکاران خوازیارن وەک چینی سێیەم رێکبخرێنو بونیادبنرێن. بەڵام ئەو توێژانە کاریگەری لەسەر هەردوو چینی یەکەم دەکەنو بەدرێژایی مێژوو ژیانی بەرخودان بەزیندوویی دەهێڵنەوە. هەروەها پاوانەکانی شارستانی تەنیا لەرێگای ئامرازەکانی توندوتیژی رووتەوە خۆیان ناسەپێنن، بەڵکو لەبنەڕەتدا لەمیانەی بەکارهێنانی پەیڕەوەکانی گوزارشتی حەقیقەت (میتۆلۆژی، ئایینی، دانایی، هونەرو زانستەکان) خوازیارن رەوابوونی خۆیان وەک دۆخێکی ئاسایی ژیانی کۆمەڵگا پیشانبدەنو بیکەن بەئەبەدی. سەرجەم قاڵبە کۆنەکان، جەژنو سرووتەکان، عیبادەتو خۆشیەکانی ژیانی کۆمەڵگا دەخەنە ژێر پاوانەکانی خۆیان، سەرلەنوێ راڤەی دەکەنو دەیکەنە موڵکی خۆیان، مۆرکی خۆیان لێدەدات. بەڵام قاڵبەکانی کۆنترین ژیانی کۆمەڵایەتی هەبوونو ماناکەی لەریشەدا بەردەوام بێت. بەشێوەیەکی پارچەکراویش بێت گوزارشت لەحەقیقەتی خۆی دەکات. هەرچەندە لەسەردەمی شارستانیدا شارستانیەکانی هیندستان، چینو ئەمریکای باشوور لەشوێنی خۆیان پەرەبسەنن، بەئەندازەی مۆدێرنیتەی ئەوروپا رۆڵی سەرەکی بەدەست سیستەمی شارستانی ناوەندییەوەیە کە بنەچەکەی بۆ خۆرهەڵاتی ناوین دەگەڕێتەوە.

هەروەکو لێرەدائاماژەمان پێکرد سیستەمی شارستانی ناوەندی کە دوا قەڵەمبازی خۆی لەژێر ناوی ئیسلامیەت ئەنجامدا دوای جێگیربوونێکی پێنج سەد ساڵی هەژموونگەرایییەکەی کەوتە چنگی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری ئەوروپا. ئەو شتەی کۆمەڵگای خۆرهەڵاتی ناوین لەژێر ناوی ئیسلامیەت تێیدا ژیاوە لەناوەڕۆکدا مێژووی کۆنە. لەکاتێکدا

پلەداری، خانەدانو ئیمپراتۆرەکان لەسەردەمی ئیسلامیەتدا لەژێرناوی خەلیفە، میرنشینیو سەڵتەنەت درێژەیان بەهەبوونی خۆیاندەدا، فاکتەرە دیموکراسیخوازو بەرخودانکارەکان بەسیفەتی گروپو مەزهەبی هەمەجۆر (گەلو کلتووری عەلەوی، شیعە، خەواریج، ئێزیدی، موسەویو کرستیانی) هەوڵی درێژەپێدانی هەبوون، ماناو حەقیقەتی خۆیانداوە. سەرباری تەواوی پارچەبوونو جیابوونەوە چینایەتیەکان بەڵام راستیەکی حاشاهەڵنەگرە کە ژیانی کۆمەلایەتی کۆمەڵگای خۆرهەلاتی ناوین لایەنێکو یەکپارچەیی گەردوونیبوونە. کۆمەڵگای مێژوویی درێژە بەهەبوونی خۆی دەدات. بەڵام بەشێوەیەک کە ماناو حەقیقەتەکەی لاوازو پارچەبووە.

لێرەدا سەرەکیترین پرسیاری پێویستە بوروژێنریت؛ بۆچی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری دەرفەتی پێشکەوتنی لەناو کۆمەڵگای خۆرهەلاتی ناوین نەدۆزیەوە. وەلامی ئەو پرسیارە؛ نە رۆڵی رێگرانەی ئایین، نەدواکەوتوویی ئامرازەکانی بەرهەمهێنانو نە ناتەواوی سەرمایەدارییە، هیچ یەکێک لەمانە نییە. وەک دەزانرێت لەو بوارانە زۆر لەئەوروپا پێشکەوتووتربوو. قۆناخی جێگای باس قۆناخی سەدەکانی نێوان۱۲ ـ ۱۵ زایینی یە. ئەوروپا ئاشنای لەدایکبوونو سەرهەڵدانی شار دەبێت. لەبازاڕە تازەکراوەکاندا بازرگانیو دراو پەرەسەندنێکی بەرچاو بەخۆیەوە دەبینێت. هەرچی لەخۆرهەلاتی ناوینە چوار هەزار ساڵە ئەم پرۆسانە بەشێوەی بازنەی داخراو بەردەوامە. لەبواری پیشەسازیدا زۆر لەپێشەوەی پیشەسازی ئەوروپایە. هەروەها خاوەنی هەژموونگەرایی شارستانی ناوەندیشە. لەراستیدا تەواوی ئەو هۆکارانە روونی دەکاتەوە بۆچی هەنگاو بۆ سیستەمی سەرمایەداری نەهاوێشتراوە. خۆرهەلاتی ناوین باوەڕی بەسیستەمی خۆی هەیە. بەرهەمهێنانی زێدە ــ بەها بۆ هێزە هەژموونگەراکانی ناوچە بەسە. هێزی ستراتیژی گرنگو کوشندەی بەرهەڵستکار لەدەرەوەو ناوەوە جێگای باس نییە. زۆر بەئاسانی ئەو هێزانەش لەناو خۆیدا دەتوێنێتەوە کە وەک مەغۆلەکان لەدەرەوە هاتوون.

ئـەو بۆچوونـەی لەسـەرەتای ئـەو بەشـە سـەبارەت بـەو فاکتـەرە ستراتیژیانەی رۆڵـی سـەرەکی لەپێهەڵگرتنو هەستانی ئـەوروپا دەبینـین لەجێگای خۆیدایەو پەسەندە. سەرمایەداری رژێمێکـی بـەرگریو پـەلاماری ستراتیژییە؛ تەنیا ئەو پاوانانەی دەسەڵاتو سەرمایە پەنای بۆ دەبـەن کـە گـەمارۆدراونو رووبـەڕووی کێشـەی مـانو نـەمان بوونەتـەوە. کێشـەی ستراتیژی مـانو نـەمان کـە هۆڵەنـداو ئینگلتـەرا دووچـاری هـاتن ناچـاری هەنگاونان بۆ سەرمایەداری کردوون.

ئینگلتەرای وەک هێزێکی هەژموونگەرا لەهەڵکشاندابوو هەر لەسەدەی شازدەهەمەوە بزاوتەکانی کەشفکردنی خۆرهـەڵاتی نـاوینی دەست پێکرد. هەڵبەتە پێشتر شارەکانی ئیتاڵیـا ــ لەسـەرووی هەمووشـیانەوە ڤینسیا ـ و ناپلیۆن رێگاکەیان ئاواکردبوو. هەروەها سەرمایەداری یەهوودیش کـە زۆر بەباشی ئاشنای ناوچەبوو هەر لەسەرەتاوە بـەشێوەیەکی ستراتیژی سەرقاڵی ناوچەبوو، رێ نیشاندەری ئـەوروپا بـوو. سـەرمایەی یـەهوودی کە ئاگاداری مەیلی وڵاتانی ئەمریکاو ئەوروپا ـ لەسەرووی هەمووشیانەوە هۆلەنداو ئینگلتەرا ـ بوو بۆ ناوچەکـە سـەبارەت بەناسـینی خۆرهـەڵاتی ناوین ببوو بەپسپۆڕ. بەپێچەوانەوە پسپۆڕو رێنیشاندەری زانیاری بـەرەو ئـەوروپاش دیسـان هـەمان سـەرمایەیە. یەهوودیـەکان هـەر لەسـەردەمی یەکـەمین دەرکـەوتنیان لـە ئورفـاو میسـر (١٦٠٠ ـ ١٣٠٠ پ. ز) وەک قەبیلەیەکی بازگانی بەئەزموون دەجووڵێتەوە.

دووەمـین هۆکـاری نـەبوونی رۆڵـی سـتراتیژی سـەرمایەداری لەخۆرهـەڵاتی ناویندا کۆچبـەرکردنی یەهوودیـەکانو گـەلانی کرسـتیانی وەک، ئەرمـەن، ئاشـووریو هێلینیـەکانو بەربەسـتکردنی پێشـکەوتنیانە لەسەردەمی هەڵکشانی ئیسلامدا. ئەو گەلانـەی بەسیستەمی بـاجو سـەرانە بەسترابوونەوەو ناوە بەناوەش تـاڵان دەکران، لەبەرئـەوەی هاوشێوازی ئەوروپا بۆرژوابوونی شـاریان بەخۆیانـەوە نـەبینی، ئـەنجامی گرنگـی دژ بەناوچەکە لێکەوتۆتەوە. بەئەندازەی رێگرتن لەرێنسانسێکی پێشوەخت، لێـدانی ئـەو کلتـوورەی پـەرەیان پێـدابوو ناوچەکـەی وشـک کـردووە. ئیسـلامیەت لـەدۆخێکی بـەمجۆرە دوورە بەتـەنیا بتوانێـت نوێنەرایـەتی

کلتووری خۆرهەلاتی ناوین بکات. کرستیانو موسەویەکان بەو سیفەتەی بەکلتوورترین گەلی ناوچە بوون هێندەی یادگای ناوچە خاوەنی توانستە ماددیەکانیش بوون. تارادەیەک ئیسلامیەتیش لەسەر ئەو بەهایانە ئاوابوو. دەستی بەسەر بەهاکاندا گرت، بەلام بەرەو پێشەوەی نەبرد. هەرچی کلتووری یەهوودیو کرستیانی ئەوروپایە کە بەهێز ببوون لەسەرووی ئەو فاکتەرانەوە دێن کە بەردی بناخەی شارستانی ئەوروپایان داناوە. ئەگەر لەخۆرهەلاتی ناوین هێزی سەرەکی بوونایە، چانسی ئەوروپا بۆ سەرهەلدان وەک هێزێکی هەژموونگەرا یەکجار زۆر کەمدەبوویەوە. بەدواداچوونو بینیی ئەو واقیعە لەئیمپراتۆریەتی عوسمانیدا چەندەی بلێی فێرکەرو ئەزموونبەخشە. لەژێر رۆشنایی ئەو باسەدا باشتر روون دەبێتەوە کە بۆچی ئەوروپا لەسەدەکانی ۱۱ ـ ۱٤ لەمیانەی هێرشە خاچپەرستەکان ئەنجامی بەدەست نەهێنا. لەمیانەی هەمان هۆکارەوە مایەی تێگەیشتن دەبێت کە دوای گواستنەوەی بەهاکانو ئەزموون وەرگرتن لەو شالاوە کاتێک لەسەدەکانی ۱٦ ــ ۱۹ لەرێگای هەلمەتە ستراتیژییەکەیان هێرشیان کردە سەر خۆرهەلاتی ناوینو سەرکەوتنیان بەدەست هێنا. لەبەشە پەیوەندیدارەکان بابەتەکە شیکارکراوە. ئەوەی بۆ خۆرهەلاتی ناوین گرنگە ئەو پێشکەوتنانەیە کە مۆدێرنیتەی ئەوروپا رێگای لەپێش کردۆتەوە. لەوەش گرنگتر ئەو قەیرانەیە کە لەبونیادی کۆمەلایەتیدا قوولبۆتەوەو دواتر هەرەسهێنانەکەیەتی.

زۆرجار جەختم لەسەر کردۆتەوە کە شارستانی وەک هەبوون سەرچاوەی کێشەیە. لەبواری بونیادییەوە دەربازبوونی شارستانی لەدۆخی کێشەوە بۆ قەیران، بۆ شیکارکردنی گۆرانکاریەکان گرنگو بایەخدارە. کاتێک شارستانیەکان لەبواری بونیادییەوە بۆ ماوەیەکی درێژ بکەونە قەیرانەوە ناوچەو هەژموونگەرایی دەگۆرن. شارستانی خۆرهەلاتی ناوین کە هەنگاوی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری نەهاویشت (لەبەر هۆکاری هەمەلایەنی ناوخۆییو دەرەکی)و لەرێگای شارستانی ئیسلامیەوە کەوتبووە ناو دوا گێژاوی خۆیەوە، لەسەدەی سێزدەهەمین بەدواوە

دەتوانین باسی کەوتنە ناو قەیرانی بونیادیەوە بکەین. ئیمپراتۆریەتی عوسمانی جگە لەقووڵکردنەوەی قەیرانی بونیادی مانایەکی دیکە نابەخشێت. بەهۆی ئەو بونیادە قەیراناوییەی ئەو پەلهاویشتنەی سەرکەوتوو نەبوو کە لەسەدەکانی پێکهاتنی ستراتیژی سەرمایەداری هەنگاوی بۆ هاوێشت هەربۆیە هێرشی سەدەی نۆزدەهەمی سەرمایەداری بۆ ناوچە، بەپێی پێویست ئەو مانایەی ئاشکراکرد. سەدەکانی ١٩و ٢٠ بۆ کۆمەڵگای خۆرهەلاتی ناوین بریتییە لەفەتحکردنی لەلایەن ستراتیژی سەرمایەدارییەوە. ئەو قۆناحەی کە مۆدێرنیتەی سەرمایەداری لەرێگای سێ ئەسپسوارە (سەرمایە، دەوڵەت ــ نەتەوە، ئیندوستریالیزم) مەحشەریەکەی هێرشی کردە سەر ناوچە، قۆناحی قووڵبوونەوەی قەیران و هەرەسە. ژیانی کۆمەلایەتی و مێژوویی هەزاران ساڵە، لەئاکامی هەلوەشانەوەی بونیادی شارستانی پێنج هەزار ساڵەی زادەی خۆی دەخرێتە ناو گەمارۆیەکی تەواوەوە. رێککەوتنی پاشماوەکانی شارستانیەکەی لەگەڵ مۆدێرنیتەی سەرمایەداری بەردەوام تەنگەژەی ژیانی کۆمەڵگای خۆرهەلاتی ناوینی قووڵترکردۆتەوە. رابردووی ریشەدارو هێرشی بەردەوام و درێژ خایەنی ستراتیژی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری ئەو تەنگەژەیان هێناوەتە ئاراوە. لەکاتێکدا خودی کۆمەڵگاو هەبوونەکەی لەت لەت دەکرێت لەبواری ماناو حەقیقەتیش دۆخی کائۆس و گێژاو جێگای باسە.

## ب ـ هێرشی هەژموونگەرایی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری و قەیرانی خۆهەلاتی ناوین

ئەگەر دیسان سێ تایبەتمەندیەکەی سیستەمی شارستانی بەبیر خۆمان بێنینەوە ئەمانەن؛ یەکەمیان کێبڕکێ ـ هەژموونگەرایی، دووەمیان ناوەند ـ کەنارو سێیەمیشیان کارەکتەری گێژاوی هەڵکشان ــ داکشانە. ململانێی نێوان خودی پاوانەکان لەسەر دەسەلات و ئابووری بناخەی ئەمانە پێکدێنن. ئەو مەیلانە کە لەقۆناخەکانی سەرهەڵدان و پێگەیشتنی سەرمایەداریدا بەتامپۆو ئاراستەیەکی لەسەرخۆ خۆی دەنواند، لەسەردەمی مۆدێرنیتەی سەرمایەداریدا بەشێوەیەکی پرو خێرا، لەماوەی

کورتخایەنو بەشێوەیەکی زۆر خوێناویش جێگای باس دەبێت. لەدەرەنجامی ئەو مەیلو فاکتەرانەی سەر ژیانی سیاسیو ئابووریو خودی کۆمەڵگا هیچ کاتێک کێبڕکێ ــ هەژموونگەرایی، لەبەرامبەر مەترۆپۆلە ناوەندییە زۆر گەشەکردووەکان ناوچە کۆلۆنییە دواکەوتووەکان، قەیرانو هەرەسە ماوەکورت و درێژخایەنەکان هیچ کاتێک کەم نابنەوەو کۆتاییان نایەت. لەیەکەمین هەژموونگەرای تۆمارکراوی مێژوو سەرچۆنەوە تا دەگاتە دوا هەژموونگەرای ئەمڕۆمان جۆرج دەبلیو بۆش ئەو بازنە نەزۆکە هەر بەردەوام بووە.

مۆدێرنیتەی سەرمایەداری جارێکی دیکە بەشێوەیەکی کاریگەرو بەرچاو ئەو بازنە بەردەوامەی لەسەرهەڵدانو هەڵکشانی هەژموونگەرایی بریتانیا ـ ئینگلتەرادا سەلماندووە. تەنیا هەڵسەنگاندنی هەژموونگەرایی ئینگلتەرا وەک پێهەڵگرتنی دەستەبژێری پاوانگەراکانی ئەو دوورگە وڵاتە هەڵەو ناتەواوە. لەیەکەم هەنگاوی هەڵمەتەکەی خۆیدا هەژموونگەرایی ئینگلیز لەئاستی جیهانگیریدا جوولاوەتەوە، تا رۆژی ئەمڕۆشمان هەر بەجیهانگیری ماوەتەوە.

لەکاتی تاوتوێکردنو هەڵسەنگاندنی مۆدێرنیتەدا مسۆگەر دەربازکردنو راستکردنەوەی ئەو شێوازەی هەلوێست پیشاندان پێویستە کە بناخەی هەڵەو چەوتیەکان پێکدێنێت. ئەویش خوو هۆگری دیاریکردنی بۆچوونو داوەرییە بەگوێرەی بنەماگرتنی وڵات، دەوڵەت ــ نەتەوە، بوویەرو کەسە. بەتایبەتیش لەم لایەنەوە هەلوێستە پۆزیتیڤیستەکانی ئایدیۆلۆژیاکانی دەوڵەت ـ نەتەوە، رۆڵیکی دیاریکەر لەچەواشەکردنو شاردنەوەی راستی مێژووی کۆمەڵگادا دەبینێت. ئامانجیش پێشکەشکردنی ئایینگەراییو خوداوەندێتی دەوڵەت ــ نەتەوەیە وەک حەقیقەتێکی مسۆگەرو رەها. هەنگاوو هەلوێستی راستیش، شێوازێکی زانینە کە بەبێ هاوواتاکردنی ئۆبژەکتیڤێتی ــ سۆبژەکتیڤێتی سروشتی کۆمەڵگایە وەک یەکپارچەیی واقیع، ماناو حەقیقەتی بونیادنراو. ئەو هەلوێستەی دەشێت وەک دیدگاو روانگەیەکی ژیانی هەڵیسەنگێنین پێویستە وەک

پــەیڕەوێکی ســـەرەکی ســـەرجەم هەڵوێســـتە رەهاکـــان، تاکانـــەیی و سروشتیەکان پراکتیزە بکرێت.

پاوانگـەرایی ئینگلتـەراش (دەشـێت بەهـەژموون، سیستەمی جیهـان، داگیرکـاری سـەرمایەداری، ئیمپریالیسـت، ئیمپراتۆریـەت، مۆدێرنیتـەو شارسـتانی ناوببرێـت) کاتێـک لەمیانـەی کۆڵەکـە سـێکوچکەییەکەی ــ سەرمایەداری، دەوڵـەت ، نەتـەوە، ئیندوستریالیزم ـ پێهەڵگرتنی خۆی ئەنجامدەدات، لـەچوارچێوەی هـەمان مەیلدا دەجووڵێتـەوە. قەیرانـەکانی کێبڕکـێ ــ هـەژموون، ناوەنـد ــ کـەنارو هەڵکشـان ــ داکشـان بـەردەوام لەئارادابوون. توانیان رەقیبەکانیان کۆنترۆڵ بکەن، ناوەند بەسەر کەناردا زاڵ بکەن و لەدووبارەبوونەوەی تەنگەژەکان رزگارببن. بـەبێ جیـاوازیکردن لەنێوان هەلومەرجـە نـاوخۆیی و دەرەکیـەکان، ئـەو شـێوازە جووڵانـەوەی لەسەرجەم هەڵمەتە ستراتیژی و تەکنیکیەکاندا پەیڕەوکرد. جا ئەگەر ئەمـە بەسیاسەتی "پەرتکە ــ زاڵبـە"ی ئیمپریـالیزم یـان شـارەزایی سـتراتیژی و تەکتیکی ناوببەن، لەناوەڕۆکدا هەمان هەڵوێست دەردەبڕن. ئەوانـە وەک پێویستیەکی مانا، بونیـادو لـۆژیکی مۆدێرنیتـەی سـەرمایەداری بـەمجۆرە کاردەکات. لـەرێگای بـەکارهێنانی لـۆژیکی ئـاوابوونی سیستەم ئینگلتـەرا تـوانی ئـارەزووی رەقیبـە ئەوروپیـەکانی بێکاریگـەر بکـات، بەتایبـەتیش ئارەزووی فەرەنسا، ئەڵمانیاو ئیسپانیا بۆ هەژموونگـەرایی مایـە پـووچ بکـات. بێگومـان کـارابوونی لـۆژیکی هەرسـێ چەکەکـەی؛ سـەرمایەداری ،دەوڵەت ــ نەتـەوەو پیشەسـازی رۆڵێکـی دیاریکـەری لەمـەدا بینـی. هـیچ حەقیقـەتێک نـەماوە کـە ئینگلتـەرا لەسـەر بنـەمای ئـەو لۆژیکـە بـەکاری نـەهێنابێت. لـەرێگای خسـتنەگەڕی ئـەو لۆژیکـەوە هەوڵیـداوە پورتوگـال بەرامبــەر ئیسـپانیا، شۆڕشـی فەرەنسـاش بەرامبــەر پاشـایەتیەکەی بــەکاربێنێت کــە چــاوی لەهەژموونگــەرایی بــوو، تەنانــەت مــارکس و مارکسیستەکان ــ کە هوشیارترین رکابەرەکانی سیستەم بوون ــ بەرامبـەر ئیمپراتۆریـەتی ئـەڵمانیا ـ نەمسـا، سـەرجەم مەزهەبـە کرسـتیانەکانیش بەرامبــەر نفـوزی پاپایـەتی بـەکاربێنێت و لەزۆربـەی ئـەو هەوڵانەشـیدا سەرکەوتووە. هەروەها لەئاستی جیهانگیریشدا هەمان ستراتیژو تـەکتیکی

بەگوێرەی رۆحو لۆژیکی سیستەم بەکارهێناوەو توانیویەتی هەژموونگەرایی جیهانگیری ئاوا بکات.

کاتێک لەنیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەهەم ئیمپراتۆریەتی - خۆری لێ ئاوانابێت - خۆی لەتەواوی جیهان جێگیرکرد، ئەوەی رۆڵی دیاریکەری بینی گەورەیی ئەو وڵات، دەوڵەت - نەتەوەو چینە نەبوو کەپێهەڵگرتنی تێدا ئەنجامدرا، بەڵکو هێزی لۆژیک، بەهای ماناو حەقیقەت بوو کە لەبەرامبەر رەقیبەکانی پشتی پێبەستبوو. بەکارهێنانی سەرکەوتووانەی هێز لای ئەسکەندەری گەورەش دەبینرێت. ئەو سیستەمەی پاڵپشتی ئەسکەندەرە شارستانی گریکە. ئەوەی لەملمڵانێو کێبڕکێی سیستەمەکاندا ئەنجام دیاردەکات، بەهای ماناو حەقیقەتی ئەو لۆژیکەیە کە پشتی پێدەبەستن. لەوانەیە هەرمانایەکی لۆژیکیانە نەبێت بەحەقیقەت، چونکە حەقیقەت ئەو ژیانە ماناداره‌یە کە لەجووڵەدایە. ئەو مانایەی بەشێوەیەکی تۆکمە لەکەسێکدا جێگای باس بێت، کاتێک رێکخستە بێتو بخرێتە جووڵەوە دەشێت ببێت بەحەقیقەتێکی کۆمەڵایەتی. ئەوەی لەتێکۆشانە کۆمەڵایەتیەکان بەردەوام رووبەرووی یەکتردەبنەوە دۆخی حەقیقەتگەلێکە بەم جۆرە رێکخراون. زوو یان درەنگ ئەوانە ئەنجام دیاردەکەن کە بەهای ژیانێکی ماناداریان هەیە.

لەدۆخێکی بەمجۆرەدا ئەو لۆژیکەی لەئیمپراتۆریەتی ئینگلتەرا جێگای باسە هێزی چینو دەوڵەتێکی تایبەت بەدوورگەیەکی بچووک نییە؛ بەڵکو ماناداربوونی سیستەمی سەرمایەدارییە، هێزە مێژوویی و یەکپارچەییەکەیەتی، هەبوونەکەیەتی کە وەک سیستەم بونیاد نراوە. روونو ئاشکرایە کاتێک لەرێگای هێزێکی دە هەزار کەسیەوە هیندستان — کە بەقەدەر کیشوەرێکە — حوکم دەکرێت حەقیقەتی مۆدێرنیتە رۆڵی یەکلاکەرەوە لەوەدا دەبینێت.

أ - لەپەلهاوێشتنی بۆ خۆرهەڵاتی ناوین ئیمپراتۆریەتی ئینگلتەرا بەگوێرەی هەمان واقیعی ستراتیژی جووڵاوەتەوە. پێویستییە جیهانگیریەکانی سیستەم هەڵوێستەکانی ئینگلتەرای دەرهەق بەناوچە دەست نیشان کردووە. ئەو کایە ستراتیژییانەی لەسەر رێگای

هاتوچۆکردن بەرەو کۆلۆنیەکانی رۆژهەلاتی دوورو هیندستان دەچێت، بیانووی جێگیرکردنی فەرمانڕەوایی خۆیەتی بەسەر شوێنە پیرۆزەکان‌و سەرچاوە ئابووریە دەوڵەمەندەکانی ناوچەکە. هەنگاو بە هەنگاو پەرە بەنفوزی ئەو فەرمانڕەوایەتیە دراوە کە لەسەدەی نۆزدەهەمەوە چڕبۆتەوە. لەکاتێکدا ئینگلتەرا بەئامانجی زاڵبوون بەسەر ناوچە لەململانێدایە، لەگەڵ کۆنە رەقیبەکەی واتە فەرەنسا ـ هەرچەندە لاوازیش بووبێت بەڵام تا ئێستا لەپێناو هەژموونگەرایی دەبزوێ ـ هەوڵدەدەن هێزی ئەڵمانیاو رووسیا بەربەست‌و سنووردار بکەن کە پاڵێوراوی هەژموونگەراین‌و هەوڵی دزەکردن بۆ ناوچە دەدەن، بەمجۆرەش پێشەنگایەتی جێگیرکردنی بەهاکانی مۆدێرنیتەیان کردۆتە ئامانجی خۆیان. تا رۆژی ئەمڕۆشمان ئەو ئامانجە ستراتیژیانە نەگۆڕاون. بەمجۆرەیە:

١ ـ هەروەکو شوێنەکانی دیکەی جیهان سەرەتا هەوڵدەدات هێزە دەسەلاتدارەکانی ناوچە بەخۆیەوە ببەستێتەوە، لەمەشدا سەرنەکەوێت پارچەکردنیانی بەبنەماگرتووە؛ لەسەر ئەو بنەمایە هەڵوێستی بەرامبەر ئیمپراتۆیەتی عوسمانیو شاهنشاهی ئێران پیشانداوە کە دوو هێزی خۆڕاگری شارستانی کۆن بوون. بەرامبەر بەپاڵێوراوەکانی دیکەی هەژموونگەرایی ـ ئەڵمانیا، فەرەنسا ـ روسیا ـ ئەو دووهێزە هەرێمییەی خستوونیەتە ژێر پارێزگاری خۆی بەبەهاکانی مۆدێرنیتە بارگاوییان دەکات‌و گرنگی بەجێگیرکردنی وابەستەیی‌و پاشکۆیەتیەکی هەمیشەیی دەدات. پاڵێوراوەکانی دیکەی هەژموونگەراییش دەستبەتاڵ ناوەستن‌و بەدوای ئاواکردنی ناوچەی نفوزی خۆیانن. ئامانجی ستراتیژی هاوشێوە بۆ ئەوانیش جێگای باسە. هەردوو هێزی هەرێمیش سوودیان لەناکۆکیو ململانێی نفوز بینیوەو لەرێگای سیاسەتی هاوسەنگیەوە هەوڵی درێژکردنەوەی تەمەنی خۆیانیانداوە. ئینگلتەرا بەو سیفەتەی هێزێکی هەژموونگەرایی بەئەزموونتربوو تەنیا بەبەستنەوەی هەردوو هێزی هەرێمی رانەوەستا، بەڵکو لەرێگای سیاسەتی "دەوڵەت ـ نەتەوەی

بچووک" کە لەمێژبوو لەئەوروپا جێبەجێی کردبوو پلانی ئاییندەیەکی درێژخایەنیشی دارشتبوو.

وەک زۆر جار مەزەندە دەکرێت دەوڵەتۆکەی ـ نەتەوە داهێنانێکی هێزە نیشتیمانیو نەتەوەگەراکان نییە. بەپێچەوانەوە ئامرازێکی سەرسوڕهێنەرو ترسناکی سیاسەتی "پەرتکەو ـ زاڵبە"یە کە هەژموونگەرایی ئینگلتەرا لەسەرتاسەری جیهان جێبەجێی کردووە. لەرێگای ئەو چەکەوە بەتایبەتیش لەژێر ناوی شۆڕشگێڕیەوە (شۆڕشگێڕی میللی) ئینگلتەرا زەبری لەتەواوی ئیمپراتۆریەکانی ئەوروپا وەشاندووە. مسۆگەر پێویستە بزووتنەوەکانی رزگاری نیشتیمانی هەموار بکرێنەوە. بڕوایەکی بەمجۆرە باوە گوایە ئەو بزووتنەوانە پێویستیەکی سۆسیالیزم بوون، بەلام ئەوە بڕوایەکی هەڵەیە. ئافرێنەرو پراکتیزەکارە سەرەکیەکەی ئەو بزووتنەوانە ئینگلتەرایە. لەکاتێکدا خودی ئینگلتەرا وەک ئیمپراتۆریەتێک لەپەرەسەندندابوو، لەرێگای دەوڵەت ـ نەتەوەکانەوە ئیمپراتۆریەتە رکابەرەکانی پارچەکردووەو هێزی لەبەربڕیون. هەڵبەتە ستراتیژی دەسەلاتی مۆدێرنیتەی سەرمایەداریش لەبنەڕەتدا پێویستی بەمجۆرە دەوڵەتانە هەیە. دەوڵەت ـ نەتەوەو مۆدێرنیتە وەک گۆشتو نینۆک بەیەکەوە گرێدراون. لەمیانەی پشتبەستن بەئەزموونی ریشەداری دەسەلاتی خاوەن ئەمجۆرە بنەمایە، بەردەوام ئینگلتەرا گرنگی بەئامادەکردنی نوخبەی دەسەلاتی بچووکداوە. بەقەدەر نوخبە دەسەلاتدارەکان پێویستییەکی زۆری بەنوخبە رکابەرەکانیش هەیە. لەکاتی پێویستدا دوودڵی لەبەکارهێنانی ئەوانەشدا نەکردووە. لەکاتێکدا پەیوەندییەکانی لەگەڵ دەستەبژێرە فەرمیەکانی هەردوو ئیمپراتۆریەتی هەرێمی درێژە پێدەدات، لەبواری ئایدیۆلۆژیوکرداری پەیوەندی لەگەڵ بزاوتی دەوڵەت ـ نەتەوە بچووکەکانی کەمایەتی، خێڵو مەزهەبە جۆربەجۆرە بەرهەڵستکارەکانی ئیمپراتۆریەتەکان بەستووەو تەنیا پشتگیری نەکردوون، بەڵکو لەکاتی پێویستدا وەک هێزێکی دیاریکەر لەبونیادناندا رۆڵی بینیوە.

ئەگەر لەمیانەی ئەو روانگەیەی هەموارکراوەتەوە تەماشای بزووتنەوە نەتەوەییەکانی ئەرمەنی، روم، ئاشووری، عەرەب، کورد، تورک‌و فارس بکەین ئەوا تێگەیشتنێکی واقیعیانەتر بۆ ئەو دووسەد ساڵەی دوایی خۆرهەڵاتی ناوین جێگای باس دەبێت. بەبێ جیاوازیکردن نێوان راستڕەو ـ چەپڕەو و عەلمانی ـ ئایینی پێویستە ئایدیۆلۆژیاکان چاوێکیان پێدا بخشێنرێتەوە، چونکە روانگەی رۆژهەڵاتناسانە(ئۆریانتالیزم) بناخەی هەموویان پێکدێنێت، تەنانەت خودی رۆژهەڵاتناسین. لەو دووسەد ساڵەی دوایی تەنیا وابەستەبوونی دەسەڵات بەهەژموونگەرایی جێگای باس نییە بەڵکو لەئەنجامی دابەشکردنی ناوچە لەرێگای دەوڵەت ـ نەتەوەکانەوە قەیرانێکی قووڵ لەخۆرهەڵاتی ناوین لەئارادایە. لەو قەیرانەدا ئیمپراتۆریەتی عوسمانی هەڵوەشێنراوەتەوە، چەندین دەوڵەت ـ نەتەوەی بچووک لەجێگایدا ئاواکراون. لەکاتێکدا عەرەبەکان لەمیانەی بیست‌و دوو دەوڵەتەوە دابەش دەکرێن، پارچەکردنی گەلانیش لەرێگای هەزاران قەبیلەو مەزهەبەوە بەردەوام لەرۆژەڤدا دەمێنێتەوە. لەکاتێکدا تورکەکانی دەستەبژێری حکومڕانی ئیمپراتۆریەت لەئەنادۆڵ لەرێگای دەوڵەت ـ نەتەوەیەکی بچووک دەستخەرۆ دەکرێن، بەسەدان کەمینەی تورک‌و تورکمان لەبەلقان، قەفقاسیاو خۆرهەڵاتی ناوین رووبەڕووی چارەنووسی خۆیان دەمێننەوە. ئەرمەنیەکان، رۆمەکانی ئەنادۆڵ، سریبیەکان‌و پۆنتۆسەکان لەرێگای لەناوبردنی ئەتنیکیەوە لەشوێنی خۆیان هەڵکەنراون‌و راگوێزراون. ئیتر رووبەڕووی لەدەستدانی کلتووری هەزاران ساڵەی کات‌و شوێنی خۆیان بوونەتەوە. پێگەی یەهوودیەکانیش هەم وەک ئایین هەم وەک قەوم، وەک بڵێی دیسان مێژووەکەیان دووبارە دەبێتەوە، رۆڵی دینامیزمێکی دیکەی گرنگی کائۆسی دەسەڵاتی ناوچە دەبینن. بەو سیفەتەی هێزێکی لەپێشینەی بونیادنەری مۆدێرنیتەی سەرمایەدارین، گەڕانەوەی ئەو دوو سەد ساڵەی دواییان بۆ ناوچە دۆخی قەیرانی قووڵتر کردۆتەوە.

یەهوودییەت تەنیا دینامیزمی کائۆسێکی پەیوەست بە فەلەستین ـ عەرەبەکان نییە؛ بەڵکو خەسڵەتێکی هەمەلایەنەی هەیەو هێزێکە لەبواری

رۆشنبیریدا پێگەیشتووە. لەپاڵ ئەمانەشدا وەک یەکێک لەهێزە سەرەکیەکانی بونیادنانی دیموکراتییانەی ناوچە پێویستە بەبایەخەوە هەڵوەستەیان لەسەر بکرێت. لەهەمانکاتدا پێویستە ئەوەش لەبیر نەکەین لەسەرووی هێزە بونیادنەرەکان، هەڵگرانی نەریتی پێخەمبەرایەتیو ئاییینی تاکخودابیەوە دێت. کوردانیش کە کۆنترین گەلی ناوچەن بەردەوام لەسنووری جینۆسایدی جەستەییو کلتووریدا ماونەتەوە. رێگایان نەداوە گەلی کورد لەدۆخی دوومەڵی خوێناوی رزگاری بێت. وەک کارتێکی بەهێزی سیاسەتی پەرتکەو زاڵبە بەردەوام وەک یەدەگێک لەبەردەستیاندابووە. ئێرانیش بەردەوام لەناوەوە رووبەڕووی گرژی دەکرێتەوەو بەمجۆرە هەوڵی بەڕێوەبردنی دەدرێت. وەک بڵێی ئەوەشیان بەس نەبوو، لەدوا شیکاردا هەردووکیشیان لەرێگای شێوازی ژیانی ئاییینیو عەلمانیی ـ کە هەردووکیشیان بەکرێگیراوێتی پاشکۆن ـ کائۆسی سیاسییان قووڵتر کردۆتەوە.

ئەگەر سەرنج بدرێت دەبینرێت کە لەقەیرانی هێزو دەسەڵاتدا رۆڵی نوێنەرەکانی دیکەی مۆدێرنیتەمان نەخستۆتە بەر لێکۆڵینەوە لەسەرووی هەمووشیانەوە ئەمریکا، رووسیاو ئەڵمانیا. هۆکاری ئەمەش لەلایەکەوە زەقکردنەوەی رۆڵی دیاریکەری مۆدێرنیتەبوو، لەلایەکی دیکەشەوە لەو بڕوایەدام کە ناوی وڵاتان هێز بەبابەتەکەمان نابەخشێت. هەڵبەتە لەرۆژگاری ئەمڕۆماندا باشتر روون بۆتەوە کە دەستێوەردانی ئەمجۆرە هێزانە، بەتایبەتیش دەستێوەردانەکانی ئەمریکاو روسیا دوای دووەمین جەنگی جیهانی جگە لەقووڵکردنەوەی زیاتری قەیرانی دەسەڵات هیچ ئەنجامێکی دیکەی لێنەکەوتۆتەوە. ئەو ئاستەی تەنگەژەی سیاسی وڵاتانی ناوچە پێیگەیشتووە لەسەرووی هەمووشیانەوە ئەفغانستان، ئێراق، ئێران، سوریا، لوبنانو ئیسرائیل ــ فەلەستین هەڵوێستەکەمان دەسەلمێنێت.

ئاشکرایە سەرجەم دەوڵەتە وردو درشتەکانی لەناوچەدا دامەزراون، جا ئەمانە لەژێر رووخساری میللیگەرایی یان ئاییینی بن جگە لەسیخوڕە کۆنو ئامرازە یەدەگەکانی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری هیچ رۆڵیکی دیکە

نابینن. ئەگەر سەیرێکی مێژووی کورتیان بکرێت دەبینرێت کە دەوڵەتە میللیگەراو ئایینییەکان بەرهەمی ئیمپریالیزمی ئەو دووسەد ساڵەی دواییەن. لەبەر ئەوەی بەرهەمی هەژموونگەرایین‌و تیرۆر لەسەر قەوارەی "هاووڵاتی سەمەرە" پەیڕەو دەکەن، رووی راستەقینەی ئەو دەوڵەتانە مایەی تێگەیشتن نەبووە.

ناشێت ناوچەیەکی دیکە ببینرێت کە بەئەندازەی هێزەکانی دەسەڵات‌و دەوڵەت ـــ نەتەوەکانی خۆرهەڵاتی ناوین رۆڵی کارتۆنی ـ سیخوڕییان بەرجەستە کردبێت. هەڵبەتە ئەزموونی هەزاران ساڵەی یارییەکانی دەسەڵات‌و دەوڵەت، هەژموونگەرایی ئایدیۆلۆژی رۆڵێکی گرنگیان لەو رەوشەدا هەیە. چاودێرانی قووڵایی قەیرانەکانی دەوڵەت‌و دەسەڵات لە ئەفغانستان، ئێراق‌و ئیسرائیل ـ فەلەستین لەوانەیە ئاشنای دۆخەکە نەبن. بەڵام بەئەندازەی پیشاندانی قووڵایی بنەمای مێژوویی ئەو رەوشە قەیراناوی‌و کائۆسە ئەو واقیعە لایەنێکی گرنگی پەیوەست بەهەرەسهێنانی شارستانیش دەخاتە روو و تەنانەت دەیسەلمێنێت. تەنیا دەوڵەت ـــ نەتەوەکانی ئەو دووسەد ساڵەی دوایی هەڵناوەشێنەوە، بەڵکو لەهەمانکاتدا نەریتی دەسەڵاتی پێنج هەزار ساڵەی شارستانی دەسەڵاتگەراو دەوڵەتگەراش هەرەس دێنێت.

ئەگەر قەیرانی دەوڵەت‌و دەسەڵاتەکانی خۆرهەڵاتی ناوین تەنیا لەسەربنەمای شارستانی شیکاربکرێت دەشێت مایەی تێگەیشتن بێت. پێویستە جیلوەی ئەو دووسەد ساڵەی دوایی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری قەیرانی شارستانیشمان لەبەرچاو وون نەکات‌و نەیشارێتەوە. بەڵام لەراستیدا خودی مۆدێرنیتە لەمیانەی کردەوەو کردەوەکانی لەخۆرهەڵاتی ناویندا بەهەموو رووتیەکیەوە تایبەتمەندێتییە قەیراناویەکانی خۆی خستۆتە روو. هیچ ئەزموونێک بەقەدەر کردارەکانی لەخۆرهەڵاتی ناوین فێرکەر نییەو واقیعی سەرمایەداری روون ناکاتەوە کە چۆن رژێمی قەیرانە.

٢ ـ ئەو مۆدێرنیتەی بەپێشەنگایەتی هەژموونگەرایی ئینگلتەرا بڵاوبوویەوە رووخسارەکەی لەزەمینەی کۆمەڵگای خۆرهەڵاتی ناویندا زۆر

قەیراناویتر بوو. وەک دەزانین لەگەڵ ئاواکردنی سیستەمەکانی شارستانی دینامیزمەکانی کۆمەڵگا بۆ بونیادی بەکێشە گۆڕاون. سەردەمی سۆمەر، ئەکاد، بابلو ئاشوور تەنیا لەمیانەی قەیرانەکانی دەسەڵاتەوە جێگای باس نین بەڵکو بەقەیرانە کۆمەڵایەتییە دڵتەزێنەکانیشەوە دێنەوە یادمان. شێوەنی شارەکانی ئور، نیپوور، ئەکاد، بابلو نەینەوا هاواری قەیرانەکانی ئەو سەردەمەیان بۆ رۆژی ئەمڕۆشمان گواستۆتەوە. ئەی دۆخی هەڵەبجە، کەرکوکو بەغدادی رۆژی ئەمڕۆمان چ جیاوازیەکی لەگەڵ ئەو شیوەنانە هەیە؟

خودی سەرمایەداری دیاردەیەکی نەناسراوی بونیادی کۆمەڵگای ناوچە نییە. هەزاران ساڵ پێشتر سەرمایەداری بەسیفەتی بازرگانی ـ سووخۆر خۆی ناساندبوو. بەردەوام پەیوەندییە بەهێزەکەی لەگەڵ پاوانەکانی دەسەڵاتو کشتوکاڵ بەردەوام کردووە. توێژێکە هەرە زێدە قەیرانی قۆستۆتەوە. هەروەکو چۆن سەرجەم ئایینە پیرۆزەکان نەفرەتیان لێکردووە، دەزگایەکە لەلایەن سیستەمەکانی کۆمەڵگای کۆمینالەوە وەک بێ ئەخلاق دادگاییکراوەو لەخۆیانیان دوور خستۆتەوە. ئەوەی لەگەڵ مۆدێرنیتەی سەرمایەدارییەوە هاتۆتە ئاراوە ئاشکرابوونی ئەو چینو توێژەیە. کاتێک ئەو رەوابوونە چینایەتییەی ئەو توێژانە لەئەورووپا بەدەستیان هێنابوو، لەخۆرهەلاتی ناوینیش بەدەستیان هێنا هاوسەنگییە کۆمەڵایەتییەکانی شلەژاند. کاتێک لەسەر بنەمای مەشروعیەت بەسیفەتی چینی بۆرژوازی لەناوچە جێگیربوو و بەکرێگیراوەکانی خۆی ئاواکرد، واتە توێژێکی زۆر گرنگی بۆ دەسەڵاتی هەژموونگەرایی دەخولقاند. شانبەشانی بیروکراسی ئەو توێژە کۆمپرادۆرە هەڵگری مۆدێرنیتەی رۆژئاوا بوون. لەبنەڕەتدا لەرێگای ئەو دوو توێژە بەکرێگیراوەوە سیستەم لەناوچە هەوڵی خۆجێگیرکردنی داوە. ئەو توێژانە کە نامۆترین چینی ناو کۆمەڵگای خۆرهەلاتی ناوین بوون نوێنەرایەتی رەهەندی کۆمەڵایەتی تەنگەژە دەکەن. ئەو بەها نامۆیانەی بۆ کلتووری ناوچەیان گواستەوە جگە لەپەرەپێدانی تەنگەژەی کۆمەڵایەتیو کائۆس هیچ رۆڵێکی دیکەیان نەبینیوە.

ئەو بۆرژوازییەی لەو دوو سەد ساڵەی دوایی لەنەمامگەی دەوڵەت ـ نەتەوە پێگەیشت وەک موتوربەیەکی نامۆ بۆ بونیادی کۆمەڵگای مێژوویی ناوچەهاتووە، تەنانەت جێی خۆیشی ناگرێت. هەربۆیەش لەبەکارهێنانی فاشیستیانەی ئامێری دەوڵەتو پاوانەکانی سەر ئابووری دوودڵی ناکات. بەمانایەکی تر بەو سیفەتەی پاوانی سەرمایەیەکە لەرێگای دەسەڵاتەوە پاڵاوتەکراوە، لەپەنابردنە بەر فاشیزم بەولاوە هیچ چارەیەکی دیکەی نامێنێت. ئەو زۆرداریی‌ەی سەرمایەداری لەخۆرهەڵاتی ناوینو ناوچە هاوشێوەکانی لەبونیادنانی دەوڵەت ـ نەتەوە پیشانیدا ناوەرۆکو خودی فاشیزم پێکدێنێت. فاشیزمیش بەو سیفەتەی شێوەی دەسەڵاتی پێکهاتە تێکەڵەکەی دەوڵەت ـ نەتەوەو سەرمایەیە، وەک مامانی ئەو سەرمایەیە کە لەدەسەڵات دەتکێتەوە.

فاشیزم وەک پێویستیەکی پێناسەکەی رژێمی شەڕی بەردەوامە بەرامبەر بەکۆمەڵگا. دەشێت فاشیزم وەک رژێمی شەڕی ناوخۆش پێناسە بکرێت. بوویەرە رۆژانەییەکانی ئێراق تا بڵێی ئەوهەڵسەنگاندنەمان رۆشن دەکاتەوە. ئەو رژێمەی بەردەوام لەگەڵ کۆمەڵگا لەشەڕدابێت گوزارشت لەمەترسیدارترین دۆخی قەیرانو رەشی کائۆس دەکات. کاتێک رەهەندێکی قەیرانەکەی خۆرهەڵاتی ناوین بەمجۆرە پێناسەبکرێت، ئەوا قووڵاییو دژواری قەیرانەکە باشتر مایەی تێگەیشتن دەبێت. ئەگەر کۆمەڵگا لەناو بێدەنگی، ئارامیو هێمنیدا دیاربێت، یان رۆژانە بە تەقینەوەکانەوە بهەژێت، لەبنەرەتدا ئەو ژیانەی لەناو دۆخی قەیرانو رەوشی کائۆسدایە لەناوەرۆکدا بەرگری لەهەبوونەکەشی دەکات. لەکاتێکدا ئارامیەکەی کۆمەڵگا گوزارشت لەشەڕی سارد دەکات، زەمینەو هەلومەرجی پێکدادانیش شەڕی گەرمی ناو هەمان بونیادە.

بەکورتی هەناردەکردنی سەرمایەداری، سەرمایەو بۆرژوازی لەلایەن مۆدێرنیتەوە قەیرانی کۆمەڵگای نەریتیو بارودۆخی کائۆسی قووڵتر کردۆتەوە. بێگومان ژیانێکی کۆمەڵایەتی جێگای باسە. بەڵام ئەو شێوازەی ژیان لەدۆخی ئاژەڵە سەربڕاوەکان یاخود لەو ئاژەڵانە دەچێت کە هەندێک لەئۆرگانەکانی بڕاوەو پەلەقاژەیەتی. کاتێک جینۆسایدە کلتووریو

جەستەییەکان، پەشێوی‌و زامە رۆژانەییەکانی کۆمەڵگا پێناسە دەکەین، پێویستە ئەو نموونانە بەزێدەڕۆیی دانەنرێت. هاوسۆزی کردن تا بڵێی فێرکەر دەبێت!

٣ ـ لەهێرشەکەی مۆدێرنیتەدا پێویستە ئیندوستریالیزمیش لەهەمان چوارچێوەدا هەڵسەنگێنرێت. ئەو پشەسازییانەی لەقۆناخی دوایی مۆدێرنیتە بۆ ناوچەکە هەناردە کراون رۆڵی زیادکردنی قەیرانی ژینگەو کۆمەڵگایان بینیوە. ئیندوستریالیزم لەجیاتی ئابوورییەک کە گرنگی بەپێداویستییە سەرەکیەکان بدات لەپێشینەیی بەپاوانەکانی قازانج دەداتو لەژێر ناوی گەشەپێدانیش ئابووری خود بژێویشی وێران کردووە. لەپێناو قازانجی گروپێکی پاوانگەرایی ئیمپریالیستی‌و بەکرێگیراو ژیانێکی ئابووری خاوەن هاوسەنگیەکی ناوخۆیی هەزاران ساڵە لەماوەی تەمەنی مرۆڤێکدا دووچاری جینۆسایدێکی ئابووری هاتووە. لەپاڵ سوپا زەبەلاحەکەی بێکاران، گوندە چۆلکراوەکان، کۆچە ناوخۆییو دەرەکیەکان، هەلایسان، قەیرانی ئابووری، شارگەرایی ناشارەکان‌و داڕووخانی خێرای دەوروبەر چەند نیشانەیەکی ئەو جینۆسایدەن. ئەگەر تەنیا رۆڵی پاوانەکانی پەترۆڵو چەک لەو قڕکردنانەدا بهێنرێتەوە بەرچاوان، واقیعەکە زیاتر مایەی تێگەیشتن دەبێت. هەروەها گۆڕانکاری کەش‌وهەوا لەسەرتاسەری جیهان ئاستی چۆلەوانی ناوچەکە ـ کە بەشێکی زۆری بیابانە ـ ی گەیاندۆتە ئاستێکی ترسناک.

پەلهاوێشتنی ئەو دووسەد ساڵەی دوایی مۆدێرنیتەی سەرەتایی بۆ خۆرهەلاتی ناوین بەبەراورد لەگەڵ سەرجەم شەڕەکانی درێژایی تەمەنی مێژووی شارستانی رێگای لەپێش زیاترین شەڕو کوشتار کردۆتەوە، ئەمەش رەوشێکی کائۆس‌و قەیرانێکی بونیادی قووڵو هەمیشەیی لەگەڵ خۆیدا هێناوە.

ب ـ ئەگەر دووبارە کردنەوەش بێت بەلام لەنزیکەوە سەیرکردنی رەنگدانەوەی لۆژیکی هێرشی مۆدێرنیتە لەسەر پەرەسەندنە کۆنکرێتییە رۆژانەییەکان فێرکەرو ئەزموون بەخشتر دەبێت. هەربۆیە سەرلەنوێ تەماشاکردنی پەیوەندی نێوان مێژوو ئێستاکە ئاسانکاریمان بۆ دەکات.

بێگومان ئەگەر بڵێین مێژوو یەکسانە بەئێستا دەبێتە تۆتۆلۆژیەکی قەبا. بەڵام تێنەگەیشتنی ئەو خاڵەش کە ئێستا تاراده‌یەکی مەزن لەژێر کاریگەری رابردوو واتە لەژێرکاریگەری مێژوو پێکهاتووە، ریگا لەپێش کوێر بینین دەکاتەوە. هەروەکو چۆن بەشێوەیەکی بەرچاو ئەو رایەڵە لەپەیوەندی نێوان عەرەب ــ یەهوودیدا دەبینین، لەپەیوەندی تورک ــ کورد، تورک ـ ئەرمەنی، تورک ــ رۆمو تورک ــ یەهوودیشدا دەبینین. تەواوی پەرەسەندنە رۆژانەییەکانی ئەو دوالیزمانە ناشێت جیاوازو دابڕاو لەمێژوو تاوتوێ بکرێت. هەڵسەنگاندنی پەیوەندی کۆمەڵگا ـ مێژوو لەناو تایبەتبوونو رەسەنایەتی خۆیدا ژیانیترین کێشەی پەیڕەوە. لەناو سەرجەم پەیوەندیو ناکۆکیەکانیدا بینینی کۆمەڵگای مێژوو وەک فاکتەری بونیادنەرانە پێویستە وەک بابەتی سەرەکی لۆژیک مانادار بێت. بەکورتی ئێستاو رۆژانەیی بەبێ مێژوو مایەی تێگەیشتن نابێت. خاڵی گرنگتریش ئەوەیە بوویەرە نوێکانی ئێستا نەبینرێت، ناشێت رووداوی رۆژانەییو بەرجەستە بەشێوەیەکی راست هەڵسەنگێنرێتو شیکاربکرێت. لەوانەیە شتگەلێکی زۆر دەرهەقی ئەو بابەتە بگووترێت، بەڵام ئەوانەی گووتراون لەشتی پووچو بێ مانا بەولاوە هیچی تر نین.

دەشێت قورسایی هەنووکەیی مۆدێرنیتە لەخۆرهەلاتی ناوین مێژووەکەی بۆ دوا هێرشەکانی ئاکاکان بۆ سەر ترواد (١٢٠٠ پ.ز) بگەڕێتەوە. قۆناخی هێلینیزم (٣٣٠ پ.ز) کە بەئەسکەندەرەوە دەستی پێکرد پرۆسەیەکی گرنگی فەتحکارییە. هێرشی خاچپەرستەکانیش مێژوویێکی نزیکتر (١٠٩٦ ـ ١٣٩٨)ی پەلاماردانە. لەبەرامبەر ئەمەشدا کارتێکردنیان لەسەر یەکتر هەمەلایەن بووە. نەبینینی رۆڵی هەژموونگەرایی ئایدیۆلۆژی لەپەلامارەکانی مۆدێرنیتەی سەرمایەداریدا کەموکوڕیەکی گەورەیە. ئەگەر رۆژهەڵاتناسی رەچاو نەکرێت باڵادەستی فیزیک(ماددی) مۆدێرنیتە بەتەنیا مایەی تێگەیشتن نابێت. ململانێی هەژموونگەرایی ئەو دووسەد ساڵەی دوایی واقیعێکە لەنزیکەوە دۆخی هەنووکەیی دەستنیشان دەکات. هەرچی هەنووکەیی یە وەک بەرد یان چەرخی ئاشی بەردەوام بەدوای ئافراندن یان بونیادنانی شتێکی نوێیەوەیە.

کاتێک لەچوارچێوەی ئەو ڕێنومایییە سەرەکیەدا تەماشا بکەین یەکەمین شتی دەرهەق بەرۆژانەیی یان هەنووکەیی بگوترێت، نەهێزە نەریتیەکانو نەهێزە مۆدێرنە حوکمڕانەکانیش شتێکیان نییە کە وەک چارەسەری سەبارەت بەکێشەی کۆمەڵگا بەگشتی، بەتایبەتیش بۆ ڕزگاربوون لەقەیرانو کائۆس پێشکەشی بکەن. هەڵبەتە ئەو هێزانەی سەرچاوەی کێشەو قەیرانن ناتوانن ببن بەهێزی چارەسەری. ئەگەر بەناوی ئایینگەراییەوە بێت یان میلیگەرایی لەمیانەی پەنابردن بۆ مێژووی نەریتی باو ناتوانن ببن بەهێزی چارەسەری. چونکە مێژووی ئەو هێزانە دیرۆکی بێچارەییە. کامە شارستانی شکۆداری کۆن سەرلەنوێ دەتوانێت زیندوو بێتەوە؟ تەنانەت ئەگەر ئیسلامیەتو عوسمانیەکانیش زیندووبکرێنەوە، هەڵبەتە ئەو زیندووبوونەوە لەژێر فەرمانڕەوایەتیو سێبەری وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، واتە لەڕێگای هێزە پەرجوویەکەیەوە بەدیدێت، ئەمەش دەبێتە ئیسلامو عوسمانیەکی دیکە.

هێزە مۆدێرنەکانیش چارەسەریەکیان نییە پێشکەشی بکەن. لەکاتێکدا خۆیان بونیادنەرو ئافرێنەری بەکێشەترینو قەیراناویترین سیستەمن چۆن دەتوانن ببن بەچارەسەری؟ لەکاتێکدا ئەو هێزانە ڕێی ڕزگاربوونیان لەقەیرانی ڕۆژانەیی فینانسی جیهانگیریو بونیادییان بۆ نادۆزێتەوە، ئایا دەشێت کامە ڕێگا چارە پێشکەش بەو کێشەو قەیرانانەی خۆرهەلاتی ناوین بکەن کە بناخەکەی بۆ سەدان ساڵ دەگەڕێتەوەو مۆدێرنیتەش بەدۆخێکی ئاڵۆزتری گەیاندووە؟ سیستەمێک تەنیا لەڕێگای یاریکردن بەژمارەو کاخەزی گریمانەییو وەهمی دە ئەوندەی بەرهەمی جیهان(ساڵانە نزیکەی ٦٠٠ ترلیۆن دۆلار) تالانکاری دەکات، نەک چارەسەری بەڵکو تەنیا ڕێگای جەهەنەم دەکاتەوە!

باهەوڵی خستنەڕووی ڕۆژانەییکردنو رووخسارە بەرجەستەکانی دەسەڵاتی ئایدیۆلۆژیو پاوانگەرایی دەوڵەت بدەین.

١ - ناکۆکی عەرەب - یەهوودی: لەبەرئەوەی لەمێژوودا سیستەمی شارستانی، لەمێژووی نزیکو ئەمرۆشماندا خودی مۆدێرنیتە ئەو ناکۆکییەی ئافراندووە هەربۆیە چارەسەر ناکرێت. تاوەکو لەچوارچێوەی

دەوڵەت‌و دەسەڵات رزگاریان نەبێت هەرگیز ئیسلام و یەهوودیەت ئاشت ناکرێنەوە. تا وەکو داکۆکی لەسەر پێگەی هێزی دەوڵەت‌و دەسەڵات بۆ خۆیان بکەن، هەروەکو لەمێژوو روویداوە ئەوا لەرۆژی ئەمڕۆشماندا هەبوونی خۆیان لە لەناوبردنی یەکتردا دەبینین. چونکە مێژووی دەسەڵات بەمجۆرە دەخولقێنرێت. مۆدێرنیتەش ئەو پرۆسەیەی قووڵ‌و دژوارکردەوە و بەمجۆرە بەردەوامی پێداوە. پلیشانەوەی کەسانێک لەژێر کۆڵەکە سێیانیەکەی بەچارەسەری ناودەبرێت. واتە چارەسەری بەزمانی مۆدێرنیتە تەنیا لەمیانەی پلیشانەوەو سووتان لەژێر سێکوچکە (سەرمایەدار، دەوڵەت ـــ نەتەوەو ئندوستریالیزم)ی هاردا بەدیدێت. مێژووی پێنج سەد ساڵەی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری پڕە لەنموونەکانی ئەو شێوازە چارەسەرییە. ئەو کێشەیەی نزیکەی سەد ساڵە کاریگەریەکی زۆر نەرێنی کردۆتە سەر ناوچەو رێگای لەپێش زیان‌و ئێش‌و ئازاری گەورە کردۆتەوە، لەئاکامی ئەو هەڵوێستە زاڵانەی لە ئارادایە کاریگەری درندانەتری دەبێت‌و بەردەوامبوونیشی دەست لێبەرنەدراو دەبێت.

هیچ چارەسەرییەکی دەسەڵاتگەرایی ـــ دەوڵەتگەرایی شارستانی بەقەدەر کێشەی عەرەب ـ یەهوودی رووی راستەقینەی خوێناوی خۆی پیشاننادات. کارەساتبارتریش ئەوەیانە یەهوودییەکان دووچاری جینۆسایدی هێزەکانی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری هاتوون کە خۆیان بونیادیان ناوە. لەراستیدا نموونەگەلێکی زۆر کەم جێگای باسن کە بەقەدەر ئەو جینۆسایدە نەخشە بۆ کێشراوە چییەتی دوا چارەسەری یان بێچارەیی مۆدێرنیتە بەشێوەیەکی روون‌و ئاشکرا بخاتە ڕوو.

٢ ـ ناکۆکی تورک ـ کورد ـ ئەرمەنی ـ ئاشووری ـ روم ـ یەهوودی: پۆلێنبەندی ئەو ناکۆکیانە لەبنەڕەتدا مۆدێرنیتەی سەرمایەداری سەرچاوەکەی پێکدێنێت. لەگەڵ بڵاوبوونەوەی سێ ئەسپسوارە مەحشەریەکەی مۆدێرنیتە ـــ سەرمایەداری، دەوڵەت ـــ نەتەوە، ئیندوستریالیزم ـ هەرچەندە ریشەکەیان بۆ شارستانییە کۆنەکان درێژ دەبوویەوە بەڵام ئەنادۆڵ‌و میزۆپۆتامیا بوون بە شانۆی ئاستێکی قڕکردن (کە لەمێژووی خۆیاندا نەیانبینیوە)ی چەندین ئەتنیک‌و نەتەوە. ئەو گەل‌و

کلتوورانەی بەجۆرێک لەجۆرەکان هێزی سەرەکی بونیادنەری سیستەمی ناوەندی بوون، لەمیانەی مێژووی دووسەد سالّی دوایی مۆدێرنیتە کرانە بەدوژمنی یەکدیو قڕکردنیان دژ بەیەکتری ئەنجامداوە. لەکاتێکدا توانستە کلتوورییە هەزاران سالّییەکان لەناودەچوون، هەندێک گەل لەناوچە بەدەرنران، تەنانەت هەندێکیشیان لەبەین بران. ئەوانەی مانەوەش کران بەقەبیلەکانی بیابان یاخود شاخ. لەراستیدا ناکۆکیەکان لەنێوان تورکو گەلانی دیکە یاخود لەناو خودی گەلاندا نەبوو. ئاشکرایە کە هێزە هەژموونگەرا نەتەوەییەکانی مۆدێرنیتە هێزی ئافرێنەری ناکۆکیەکان بوون کە لەمیانەی سیاسەتی پێنج سەد سالّەی "پەرتکە ــ زالّبە"خۆی سەلماندبوو. ئەو هێزانە لەپێناو بەرژەوەندییە رۆژانەییەکان لەناوچەدا، لەبەکۆیەکترەوەنانی ئەو گەلانە دوودلّییان نەکرد کە رەگەکانیان بۆ قوولایی مێژوو شۆڕ دەبێتەوە. تەواوی ئەو گەلانەی لەرووالّەتدا شەڕیان لەگەلّ یەکتریدا دەکرد، لەناوەرۆکدا قوربانی چەوسانەوەو دەسەلاّتی سەرمایەداری پاوانگەرا بوون. چەندە جێگای داخە کاتێک ئەو گەلانە دەست دەخەنە بینەقاقای یەکدیو یەکتری لەناو دەبەن، لەقوولاییدا بێئاگان کە خزمەت بەچیو بەکێ دەکەن. تەنانەت ئەو قڕکردنانەی لەچوارچێوەی ئەو ناکۆکیەدا روویانداوە بەتەنیا ئەو راستییە دەسەلّمێنن کە مۆدێرنیتە خوێناویترین سیستەمی شارستانییە لە مێژوودا. ئەو شوێنانەی ماوەیەکی درێژ لەخۆرهەلاّتی ناوین "باخچەی گەلان" بوون ئەمڕۆ بووە بە (گۆڕستانی گەلان). ئەگەر بەناوی گەلانو کلتوورەکان ویژدان ببزوێتو شتێک بگوترێتو پێویستیەکانی بەرپرسیارێتی رۆشنبیری راستەقینە جێبەجێ بکرێت، بەر لەهەموو شتێک پێویستە بەرپرسیارە راستەقینەکانی گۆڕستانی گەلو کلتوورەکان ئاشکرا بکرێنو دادگایی بکرێن.

٣ ـ ناکۆکی شیعە ـ سوننە: هەرچەندە رەگەکەیان بۆ سەردەمی دەرکەوتنی شارستانی ئیسلامی درێژبێتەوە، بەلاّم پێکدادانەکانی ئەو دوو مەزهەبە لەرۆژگاری ئەمڕۆماندا پەیوەندی بەمۆدێرنیتەوە هەیە. بەتایبەتیش پێکدادانی قۆناخی دوایی نێوان ئێراق ـ ئێران تەنیا لەمیانەی

فۆرمی دەوڵەت ـ نەتەوەو گرێدانی بەئیمپریالیزمەوە دەشێت باسێکی راستی لەبارەوە پێشبخرێت. هەروەها ناکۆکی ئیسلامیەت ـ موسەوی، ئیسلامیەت ـ کرستیانی، تەنانەت ناکۆکیو پێکدادانەکانی کرستیانی ـ یەهوودیش بەدڵنیاییەوە دەشێت لەچوارچێوەی مۆدێرنیتەی بەراییدا شیکاربکرێت. فۆرمو هۆکاری پێکدادانی ئایینەکانی بەر لەمۆدێرنیتەی سەرمایەداری لەژێر رووخساری پۆزیتیڤیستیدا وەک خۆی لەمۆدێرنیتەدا رەنگیداوەتەوە. بەتایبەتیش پێویستە هەرسێ ئایینە تاکخوداییەکەی خۆرهەڵاتی ناوین وەک میللیگەرایی ـ بەرایی هەڵسەنگێنرێت. جیاوازی ئەو ئایینانە لەگەڵ میللیگەرایی مۆدێرنیتە لەوەدایە کە دەمامکی تیۆلۆژییان پۆشیوە.

تەواوی لێتوێژینەوە پەیوەندیدارەکان سەلماندوویانە کە فۆرمە ئایینیەکان بناخەی باسە پۆزیتیڤیستەکانی قۆناخی مۆدێرنیتە پێکدێنێت. بەپێچەوانەی بانگەشەکان لەناوەڕۆکدا هیچ جیاوازییەک لەنێوان (دونیاگەرایی)و (ئاخیرەتگەرایی ـ ئایینگەرایی)دا نییە؛ تەنیا هەندێک جیاوازی لەشێوەدا داهێنراوەو زێدەڕۆیی لێکراوە. لەئەنجامدا هەم ئایینی دەوڵەتو دەسەڵات هەم ئەو باسانەی کراون بەگوتەی دەوڵەت ـ نەتەوەی مۆدێرنیتە خزمەت بەبەرژەوەندی هەمان پاوان دەکەن. هەروەکو چۆن لەمێژوودا روویدا شەڕە مەزهەبیەکانی رۆژگاری ئەمڕۆمان لەخۆرهەڵاتی ناوین سەرچاوەی خۆی لەشارستانیو مۆدێرنیتە وەردەگرێت، بەبێ ئەوەی هیچ لەخێراییەکەی لەدەست بدات لەسەر بنەمای هەمان بەرژەوەندیدا درێژەی پێدەدرێت. لێشاوەکانی ئیسلامی رادیکاڵ، موسەویو کرستیانی لەگەڵ هەر جۆرە میللیگەراییەک لەخزمەتی هەرسێ ئەسپسوارە مەحشەرییەکەی مۆدێرنیتەدا یەکیان گرتووە.

بازرگانەکانی شارستانیو چارەخوێناویەکانی کە هەزاران ساڵە کلتووری دەوڵەمەندی گەلانی خۆرهەڵاتی ناوین دەکرتێنن، ئەمڕۆش لەخزمەتی مۆدێرنیتەی سەرمایەداریدان، بێ بەزەییانەو بێ حیساب، لەناو خوێنو فرمێسکدا دوا توانستەکانیش لەناو دەبەن، ناوچەیان

کردووە بەوێرانە، ژینگەیان کردووە بەبیابانو شاخەکانیش بێکەس دەکەن.

٤ ـ ناکۆکی دەوڵەت ـ نەتەوەکان لەگەڵ هەرشتێک: پەندێکی باو هەیە کە دەڵێت: گەورەترین زەبری سەرمایەدای لەمرۆڤایەتی داوە ئەو دەوڵەت ـــ نەتەوانەیە کە بونیادی ناون. بەهەموو رووتیەکەیەوە ئەو هەڵسەنگاندنە بۆ گەلانو نەتەوەکانی خۆرهەڵاتی ناوین راستە؛ لەمیانەی شەڕە سات بەساتەکانی هەرقوژبنێکی ناوچە سەلمێنراوە. دەوڵەت ـــ نەتەوەیەک جێگای باس نییە کە لەنێوان خۆیانداو لەناوەوەش لەگەڵ گەلەکانیان لەشەڕدا نەبن. ئەوەی کلتوورو نەتەوەی عەرەبی لەناو بردووە لەئیسرائیل زیاتر حیسابە دەسەڵاتگەراییەکانی بیستو دوو دەوڵەت ـــ نەتەوەیە؛ خەرجییە شێتانەو خەیاڵیەکانیانە. لەکاتێکدا گەلەکانیان لەرەوشێکی نالەباردا دەژین، ئەو دەسەڵاتانە لەپیشاندانی شکۆمەندییەک دوودڵی ناکەن کە فیرعەونو نەمردوودەکان بەسێبەرەکانیشیان ناگەن. ئەوەی ئەو هێزەشان پێدەبەخشێت خوداوەندە سیکۆلارە نوێیەکەیانە واتە دەوڵەت ـــ نەتەوەکانیان. وابەستەبوونیان بەخوداوەندی کۆن ساختەو زارەکییە. دەوڵەت ـــ نەتەوە عەرەبەکان لەسەربنەمای کۆنترۆڵکردنی رێگای هیندستان لەلایەن ئیمپراتۆریەتی ئینگلتەرا، دەستبەسەرداگرتنی سەرچاوەکانی نەوتو کۆنترۆڵکردنی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی ئاواکراون. سەرباری ئەوەی ئەمە راستیەکەیە بەڵام خۆناساندنی ئەو دەوڵەتانە بەمیللیگەرا، پێویستیەکی تەکنیکی دەسەڵاتی مۆدێرنیتەیە. دەوڵەت ـــ نەتەوە ئاماژە پێکراوەکان بەزگا سیخوڕییە سەرەکیەکانی هەژموونگەرایی سەرمایەداری جیهانن. ئەو واقیعە لەدەوڵەت ـــ نەتەوە عەرەبیەکاندا روونو ئاشکرایە.

لەپێکهاتنی دەوڵەت ـ نەتەوەی فارسدا بینینی هەمان یاری عیبرەت بەخشە. فارسەکان ئەو شارەزاییەی لەسەردەمی شارستانی پارسەوە لەبواری هونەری دەسەڵاتەوە بەدەستیان هێنابوو لەسەردەمی مۆدێرنیتە لەسەربنەمای بەکرێگیراوێتی زیاتر پەرەیان پێداوە. دەتوانرێت بگوترێت لەبەکارهێنانی تێکەڵەی دەستخەرۆکاری شارستانیو مۆدێرنیتە

(میللیگەرایی شیعە) لەگەڵ چینییەکان کێبڕکێ دەکات. لەکاتێکدا چینیەکان دڕندانەترین سەرمایەدارییان لەژێر ناوی "کۆمۆنیزم"جیلوە کردووە، مۆدێرنیستەکانی ئێرانیش هێندە بێ شەرمن کە لەژێر ناوی "کۆماری ئیسلامی"بتی دەوڵەت ـ نەتەوەی بەرهەمی سەرمایەدارییان بەسیفەتی روحگەرایی مەزن پێشکەش کردووە. دۆخی بەرجەستەی ئێستای ئێران خاڵی لاوازی سیستەمی جیهانگیرییەو ئەگەری بەئێراقبوونی بەهێزە. سەرباری ئەوەی وەک دەوڵەت ـ نەتەوەکانی دیکەی ناوچە نوێنەرایەتی فاشیزمی دەمەزراوەیی دەکات، بەڵام لاوازیەکانی هەژموونگەرایی ئەمریکا ـ یەکێتی ئەوروپا بەکار دێنێت‌و تەمەنی خۆی درێژ دەکاتەوە، بەڵام وەک ئەوانی دیکە ئەویش لەناو مەنگەنەی قەیراندایە، بەڕادەیەکی بەرز پۆتانسیلی کائۆسێکی وەک ئێراق لەخۆوە دەگرێت.

دەوڵەت ـ نەتەوە تورکەکانیش شانبەشانی سێبەری ئەمریکا ـ یەکێتی ئەوروپا لەناو هەژموونگەرایی روسیا بوونەتە خاوەن قەوارەی خۆیان. بابەتێکی کێشەمەکێش‌و ململانێن. سەرباری ئەوەی خۆیان بەمیللیگەرا دادەنێن، بەڵام بەبێ هەژموونگەرایی زەحمەتە لەسەر پێیان بمێنن. پشکێکی زۆریان لەقەیرانی هەرێمی وەرگرتووەو خاوەن پۆتانسیلی کائۆسن. ئەو رووداوانەی لەتەوەرەی ئەفغانستان ـ ئێراق لەئارادان چارەنووسی چاوەڕوانکراوی دەوڵەت ـ نەتەوەکانی ناوچە روون دەکاتەوە.

لەبەر ئەوەی واقیعی دەسەڵات‌و دەوڵەتی خۆرهەڵاتی ناوین لەجیاتی دۆزینەوەی چارەسەری بۆ کێشە کۆمەڵایەتییە قورسەکان، خۆی سەرچاوەی کێشەکان پێکدێنێت، هەربۆیە کە قەیرانە هەرێمیەکان بەشەڕ ئەنجامگیردەکات. شەڕیش قەیرانەکان گەورەتر دەکات‌و دۆخی کائۆس بەربڵاودەکاتەوە.

ج ـ لەهەلومەرجی ئێستادا کۆڵەکەی پیشەسازیگەرایی‌و سەرمایەداری مۆدێرنیتە وێرانکارییە بنەڕەتیەکانیان لەسەر هەلوەشانەوەو رووخاندنی کۆمەڵگای باوی گوندو کشتوکاڵ بووە. لەکاتێکدا دەوڵەت ـ نەتەوەی کۆڵەکەی مۆدێرنیتە ناوچە دەکاتە زیندانێکی سەرتاسەری‌و نوقمی خوێن‌و

فرمێسکی دەکات، هەردوو کۆڵەکەکەی دیکەشی ئیندوستریالیزمو سەرمایەداری لەسەرەوە پەنا دەبەنە بەر تالانکارترین پەیڕەوەکانی پاوانگەرایی بەکرێگیراو، بەبیانووی نەبوونی قازانج بەها کۆمەڵایەتییەکانی بەرهەمی توانستی هەزاران ساڵ لەچاونوقاندنێکدا بەلاوە دەنێن، بەمجۆرە بێبایەخو ستۆکی دەکەنو دەڕزێت. هەڵوەشاندنەوەی کۆمەڵگای گوند ـ کشتوکاڵ کێشەیەکی ئابووری سادە نییە. بەڵکو لەناوبردنی کلتوورێکی کۆمەڵایەتی دە هەزار ساڵەیە. کێشەکە بایەخداربوونی ئابووری پیشەسازی نییە لەجیاتی کشتوکاڵ؛ کێشەکە هەبوونی خودی کۆمەڵگایە. لەهەلومەرجی ئەمڕۆی قەیرانی بونیادیدا لەزۆر بواردا لەسەرووی هەمووشیانەوە بواری کشتوکاڵ لەمیانەی بەرنامەی داڕێژراوەوە کۆمەڵگا بێکاردەکرێت، رووەکی هۆرمۆنیانە گرنگی پێدەدرێتو زیان بەکشتوکاڵ دەگەیەنرێت. رووەکە هۆرمۆنیەکان (ئەوانەی یاری بە بۆهێلەکانیان کراوە)تەنیا رووەکە سروشتیەکان لەناو نابرێن، بەڵکو زەمینە بۆ نەخۆشیگەلێک ئامادە دەکات کە کۆتاییەکەی نەزانراوە.

سەرمایەداری پیشەسازیش پاوانێکە بەلانی کەم هێندەی پاوانگەرایی دەوڵەت ـ نەتەوە هێرش دەکاتە سەر کۆمەڵگا. پەیوەندییەکەی بەئابوورییەوە بەهەڵە دەرکی پێکراوەو بەئەنقەست چەواشە دەکرێت. لەهەژموونگەرایی ئەوروپادا ئیندوسترالیزم رۆڵێکی مێژوویی بینیوە. بەڵام رۆڵە سەرەکیەکەی لەناوچە کەنارییەکانی جیهان جێگیرکردنی ئەو هەژموونگەراییەیە. لەژێر ناوی ئامێری بەرهەمهێنانی بەپیتتر پیشەسازییە خۆجێییەکان لەبەین دەباتو ئەو رۆڵەی خۆی جێبەجێ دەکات. ئابووری نییە، دژە ـ ئابوورییە. کۆمەڵگاکانی خۆرهەلاتی ناوین کە بەدرێژایی مێژوو لەرەوشێکی دەوڵەمەندیدا بووە لەسایەی پەلامارەکانی ئەو دووسەد ساڵەی دوایی مۆدێرنیتە لەهەژارترین دۆخو سەردەمی خۆیاندا ژیاون. هەڵوەشانەوەی کشتوکاڵو کۆمەڵگای کشتوکاڵ پێویستیەکی ئابووری بەپیتو بەرهەمهێن نییە؛ بەڵکو لەپێناو بەدەستهێنانی فەرمانڕەوایی چینایەتی بۆرژوازی ئەنجامدەدرێت. بوویەرێکە پەیوەندی بەدەسەڵاتی سیاسییەوە هەیە.

لەوانەیە ئیندوستریالیزم زۆرترین قازانج بۆ مەترۆپۆلە هەژموونگەراکان فەراهەم بکات. بەڵام باجەکەی بیابانبوونی ناوچە لادێییەکان‌و چۆڵکردنی گوندەکانە. لەم سۆنگەیەوە قووڵکردنەوەی تەنگەژەی کۆمەڵایەتی‌و ئابوورییە. لەجوگرافیای خۆرهەڵاتی ناوین‌و ژیانی ئابووریدا ئیندوستریالیزم ئامرازێکی هێرشی ئایدیۆلۆژی ـــ سیاسییە کە ئەنجامەکانی زۆر لەئەنجامی شەڕەکانی دەسەڵات مەترسیدارترە. سەرەکیترین هێزی بەرپرسیارە بەرامبەر گۆڕانکاری کەش‌و هەوا، وشکبوونی گۆل، رووبارو ناوچە ئاوییەکان. وێرانکارییەکانی بەو خێراییەی ئێستا بەردەوام بێت جیهانێک نامێنێت ژیانی تێدا بەردەوام بێت. ئەو هەڕەشەیەی ئیندوستریالیزم دەیکاتە سەر ئەو ژیان‌و کۆمەڵگایەی لەمیانەی کەڵەکەبوونی کلتوورێکی پێنج هەزار ساڵە لەخۆرهەڵاتی ناوین ئافرێندراوە، بەقەدەر ئەو جینۆسایدانە مەترسیدارە کە لەرێگای شەڕەکانەوە دێنە ئاراوە. پێویستە دووبارەی بکەمەوە؛ بەپێچەوانەی مەزەندەکان ئیندوستریالیزم سەرەکیترین ئامرازە کە هێرش دەکاتە سەر ئابووری کۆمەڵگا. هێزی رووخێنەری پیشەسازی راستەقینەشە. ئەو وڵاتانەی گەشەکردنی پیشەسازی چلێسی زۆرترین قازانجی سەرمایەداری جێگای باسە بەرەو خۆشگوزەرانی‌و دەوڵەمەندی ناڕۆن، بەڵکو بەرەو داڕووخان‌و هەژارییان دەبات. لەپەلەقاژێکردن لەناو قەیرانیش زیاتر دەیکات بەوێرانە. تەنیا ئەو وێرانەیەی پیشەسازی تلیاک لە ئەفغانستان‌و پیشەسازی نەوت لە ئێراق ناوچەکەی تەنیوەتەوە راستی واقیعەکە ئاشکرا دەکات. تەنیا وڵاتەکان نەبوونەتە وێرانە؛ بەڵکو کۆمەڵگای مێژوویی‌و کلتوورەکەشی بۆتە وێرانە.

د - پێویستە بەبایەخەوە رۆڵی چینی ناوین، بیروکراسی‌و شار لەبێچارەیی کێشە کۆمەڵایەتیەکانی خۆرهەڵاتی ناویندا هەڵسەنگێنرێت کە لەدەزگاکانی مۆدێرنیتەدا چنراون. سێیانەی چینی ناوین، بیروکراسی‌و شار کە لەچوارچێوەی سەرمایەداری، دەوڵەت ـ نەتەوەو ئیندوستریالیزم سەرلەنوێ ئاواکراوەتەوە، لەخۆنواندن وەک ناوەندی چارەسەری‌و سەرنج راکێشان شارەزایە. سەرباری ئەوەی بەرهەمی هەلومەرجەکانی

پەلهاویشتنی مۆدێرنیتەی سەرمایەدارین، گرنگیەکی تایبەت بەوە دەدەن کە رەگی خۆیان وەک سەربەخۆو رەسەن پیشانبدەن. بەسیفەتی هێزی هەژموونگەرایی داسەپاندنی پێگەی خۆیان بەسەر کۆمەلگای نەریتی بەئەرکێکی لەپێشینە دادەنێن. لەحالەتێکدا پەیوەندییان لەگەل مۆدێرنیتە لەسەر بنەمای بەکرێگیراویتیو سیخورییە، بەئامانجی پەسەندکردنیان وەک هێزە دامەزرێنەرەکانی مۆدێرنیتە هەرجۆرە سەرشێتیەک دەکەن. دەشێت ئەمانە وەک بناخەی جوگرافی، دامەزراوەییو کۆمەلایەتی فاشیزمی دامەزراوەیی پێناسە بکرێن. لەبەر ئەوەی لەدەرەوە بەسەر کۆمەلگای نەریتیدا دەسەپێنرێن وەک ئەو موتوربەیەن کە جێگای خۆی ناگرێت. واقیعی نامۆبوونیان زۆر ریشەدارە. بەشێوەی مانو نەمان خۆپێچانیان لەمۆدێرنیتە هۆکارەکەی بۆ واقیعی نامۆبوونیان دەگەرێتەوە. لەبەر ئەوەی داگیرکاریو چەوسانەوەی راستەوخۆی هەژموونگەرایی سەرمایەداری جێگای باس نابێت، خۆیان لەدۆخی هێزە چەوسێنەرو داگیرکارە خۆجێییەکاندان؛ لەناوەوە داگیرکردنو چەوسانەوەی کۆمەلگا جێبەجێدەکەن. سەرباری ئەوەی وشکترین هێزی میللیگەراو دەولەتگەران بەلام خۆنواندنیان وەک کۆمەلگاگەرا وەک دووفاقییەک رووبەروومان دەبێتەوە. کاتێک لەقوولاییدا بیر دەکەمەوە ناچار دەبم ئەو توێژانە وەک هۆیەکانی ناوەندی سەرمایەداری هەلسەنگێنم (ڤێرسیۆنێکی هەنووکەیی میرنشینەکانی پاشاکانی چاخی ناوین).

بەکورتی چونکە پێگەکەیان لەشێوازی کۆپییەی مۆدێرنیتەیە چارەسەری نین، بەلکو یەکێک لەسەرچاوە سەرەکیەکانی کێشەن. بێچارەیی مۆدێرنیتە بەئاشکراترین شێوە لەنارەسەنی چینی ناوین، بنبەستبوونی بیروکراسیو دۆخی ناشاری شاردا رەنگدەداتەوە. سەرباری تەواوی هەولەکانی پەردەپۆشکردن، دەشێت بەشێوەیەکی رووتو روون قەیرانی بونیادی سیستەم لەو دیاردە سێیانیەدا بخوێندرێتەوە.

٥ ـ نیچەی فەیلەسوف یەکێک لەو کەسایەتیە دەگمەنانەیە کە لەقوولاییدا دەرکی بەمانای وێرانکاریەکانی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری لەسبەر مرۆڤایەتیو ژینگە کردووە. ئەو مرۆڤەی بەپالاوتەی مۆدێرنیتەدا

دەرباز بووە، وەک تاکو کۆمەڵگا بەخەسێنراو، بەژنکراو و خلّتە ناو دەبات. وەک بۆچوونی مەجازی منیش وەک بۆچوونێکی نزیک بەراستی دەبینم. سەری ئەسپێک لە باوەشدەگرێت‌و دەگریت، خوازیارە ستەمە گەورەکەی مۆدێرنیتە بۆ سەر ئاژەڵان بخاتە روو. دارستان وەک پەناگەو شوێنی پاراستنی ژیان دەبینێت. بەردەوام سەردانی دەکات. دەستەواژەی "مرۆڤی باڵا" کە راوەستەی لەبارەوە کردووە، بەهەڵە هەڵسەنگێنراوە. سەرجەم شێوەکانی کۆیلایەتی شارستانی بەسووکایەتی لەقەلەمدەدات، ئەمەش هەڵوێستێکی مرۆییانەیەو زۆر لەهی کارل مارکس لەپێشترە. بەشێوەیەکی زۆر واقیعیانە شیکاریکردووە کە بەکرێکاربوون مەسەلەیەکی جێگای شانازی‌و سیاسەتکردن نییە. مێژووش ئەو بۆچوونەی ئەوی سەلماندووە. بینین‌و هەڵسەنگاندنی مرۆڤی باڵای ئامانجی نیچە وەک هەواڵی بەرایی هەڵوێستێکی فاشیستانە، پروپاگەندەیەکی زۆر هەرزانە. بەپێچەوانەوە راڤەکردنی وەک دەستەواژەیەکی دژ بەهەمووجۆرێکی کۆیلایەتی، وێرانکاری ژینگەو بێ کەسایەتیکردنێک راستترە.

گۆڕانکارییە هەنووکەییەکان، پەیوەندییەکانی نێوان قەیرانی جیهانگیری، رەهەندی فینانس‌و سیستەمە گەورەکانی تاڵانکاری پەیڕەوی وەهمییان ئاشکراکردووە. لەکاتێکدا مۆدێرنیتەی تەوەرەی ئەوروپا لەبەرزترین ئاستی جیهانگیریدابوو، لەناو هەمان بازنەی داخراودا هەستی بەقەیرانی بونیادی‌و نابەردەوامیەکەی کردبوو. کۆبوونەوەکانی لوتکە دوای لوتکە دەبەستن. ئیتر کورت هێنان‌و ناتەواوی نەتەوە یەکگرتووەکان، سندوقی دراوی نێودەوڵەتی، ناتۆ، یەکێتی ئەوروپاو کۆپیەکانیان ئاشکرا بووە. پاکەتە یەک لەدوای یەکەکانی بانکە ناوەندییەکان، گروپی ٧، گروپی ٨و گروپی ٢٠ دەوڵەتەکە، ئامار، بێکاری، نمارەکانی قەرزاری، کەوتنی توانای بەرهەمهێنان، بەرۆژەڤبوونی بنەڕەتی کێشەی خۆراکو چەندین نیشانەی دیکە لەبواری ستەمکاری کۆمەڵایەتی پەیوەندی پاوانگەرایی ئابووری بەقەیرانەوە پیشاندەدات.

نموونـەکانی ئەفغانسـتان، پاکسـتان، ئێـران، ئێـراق‌و ئیسـرائیل - فەلەسـتین پیشـانی دەدات کـە دەوڵـەت - نەتـەوە نـەک تـەنیا لەئاسـتی خۆرهـەڵاتی نـاوین بـەڵکو لەئاسـتێکی جیهانگیریـدا بێچـارەیی، دۆخـی قەیران‌و کائۆسەکەی ڕێگای لـەپێش وێرانکـاری، خـوێن ڕشـتن‌و فرمێسکدا کردۆتـەوە. دەوڵـەت ـــ نەتـەوەکان سـەلماندوویانە کـە تـەنیا ئـامرازی سـتەمکاری حکـومڕانی کۆمـەڵگاکانی مـرۆڤ نـین، بـەڵکو سـەرچاوەی ناچارەسەریشـن. دەوڵـەت ـــ نەتـەوە سـیمبۆڵی گـەورەترین کارەسـاتی مێژووە کە پێکهاتەی کلتووری ناوچەکەی پارچە پارچە کردووە.

لەکاتێکدا ئیندوسـترالیزم‌و سـەرمایەداری کـە بـۆ خـودی ئـەورووپاش زەنگی مەترسی لێدەدات‌و تـەنیا لەمیانـەی ریفۆرمـەوە دەتـوانن بـەردەوام بن، ئەوا حاشا هەڵنەگرە کە کێشە مێژوویـیـەکانی کۆمـەڵگای خۆرهـەڵاتی نـاوین بەپێکـدادان‌و شـەڕێکی سـنوورنەناس دەگەیـەنێت. قووڵکردنـەوەی سـەرمایەداری‌و ئیندوسـتریالیزم لـەناو کۆمـەڵگای خۆرهـەڵاتی ناوینـدا، مانای چڕکردنەوەی شەڕە بەرامبەر بەخودی کۆمـەڵگاو ژینگەکـەی. لـەژێر کام لەدەمامکەکانیش بخرێتەڕوو، ئەوا بەشێوەی کۆڵەکە سێکوچکەییەکەی دۆخـی بەرجەسـتەو ڕۆژانـەیی مۆدێرنیتـە ـــ کـە ئـامرازێکی شـەڕە ـــ ئـەو داوەرییە دەسەلمێنرێت.

هەژموونگـەرایی ئایـدیۆلۆژی‌و ڕۆژهەڵاتناسـی ڕاسـتیەکان چەواشـە دەکـات. ئـەو دوو سـەد سـاڵەی دوایـی خۆرهـەڵاتی نـاوین بەفـەتحکاری مۆدێرنیتەی ڕۆژئاوا دەرباز بووە. دەوڵەتۆکـە ـــ نەتـەوەکان، پیشەسـازی مۆنتاژکردن‌و ساختەکاریەکانی ئـابووری گشـتی نـاتوانن ڕاسـتی بنـەڕەتی پەردەپۆش بکەن. ئەوەی سـەددام حوسێن دووچـاری هـات کـە بـۆ سـاتێک بەرەنگاری فەرمانی فەتح بوویەوە تـەنیا دەشێت لەگـەڵ ڕەوشـی لویسـی شـازدەهەمی پاشـای فەرەنسـا بـەراورد بکرێـت. هـەروەکو چـۆن دوای لەکەللـەدانی پاشـای فەرەنسـا ئـەورووپا کەوتۆتـە نـاو کڵپـەی ئـاگرەوە، لەسێدارەدانی سـەددامی پاشـای دەوڵـەت ـــ نەتـەوەش کڵپـەگرتنی ئـاگری شەڕی گەرمی خۆرهەڵاتی ناوینی لەگەڵ خۆیدا هێنـاوە، ئەمـەش بـەمانای بڵاوبوونەوەو هەمیشەییبوونی ئەو شەڕە لەناوچەدا دێت.

ئەگەر پارادایمی ڕۆژهەڵاتناسی پارچە بکەین دەبینین کە کۆتاییهاتنی "شەڕی سارد" دوای هەڵوەشانەوەی یەکێتی سۆڤیێت بۆ خۆرهەڵاتی ناوین مانای بەرزبوونەوەی شەڕی گەرمە بۆ ئاستێکی بڵندتر. ڕێکەوتی شەڕی کەنداوی ١٩٩١ کە یەکسەر ساڵێک دوای تەواوبوونی شەڕی سارد ڕوویدا ئەو بۆچوونە دەسەلمێنێت. کاتێک لەروانگەی "درێژماوە"وە تەماشای بکەین دەبینین کە ئەو شەڕەی مۆدێرنیتە لەپێناو خۆرهەڵاتی ناوین بەرپایکردووە لەسەرەتای ١٨٠٠ کان لەگەڵ هەنگاونانی ناپلیۆن بۆ میسر دەستی پێکردووە؛ لەرێگای ئاواکردنی دەوڵەت ــ نەتەوەکان ، پێکهێنانی ئەجندای سەرمایەداری‌و تالانکردنی سەرچاوە جیۆئیکۆنۆمیەکان لەسەرووی هەمووشیانەوە لەمیانەی تالانکردنی نەوت لەلایەن ئیندوستریالیزمەوە بەلوتکە گەیشتووە. ئەمە هێڵە گشتیەکەی باسی مۆدێرنیتەیە. ئەوەی دەمێنێتەوە وردەکاری‌و کورتە چیرۆکی دووبارەن.

لەبەرکارهێنانی بەردەوامی دەستەواژەکانی قەیران‌و کائۆس بۆ ناوچە دوودڵم. ئەگەر واقیعی بەرجەستە شەڕی گەرم بێت، ئەو کاتە دابەزاندنی بۆ قەیران‌و کائۆس لەوانەیە خەڵەتێنەربێت. بێگومان شەڕەکانی ڕۆژی ئەمڕۆمان نە بەشەڕەکانی چاخی کۆن‌و ناوین دەچێت، نە بەشێوەی شەڕەکانی مۆدێرنیتەی بەر لەهەردوو جەنگی جیهانی دەچێت. بەتایبەتیش لەگەڵ جەنگی یەکەم‌و دووەمی جیهانی شەڕەکان بوون بە شەڕی گەلەری، دوای دووەمین جەنگی جیهانیش بوون بە شەڕێکی کۆمەڵایەتی. هەروەها پێویستە دەرک بەو خاڵە بکرێت کە یەکێک لەزەرورەتەکانی مۆدێرنیتەی نوێ سەردەمی شەڕەکانی دەرەوەی کۆمەڵگا لەکاروانی جانەوەرە سێ پێییەکەی مۆدێرنیتە ـ بە جیاوازییە ناوخۆیی‌و دەرەکیەکانی ــ کۆتایی پێهات؛ واتە سەردەمی مۆدێرنیتەی نوێ مانای هەڵگیرسانی شەڕی یەکگرتووی ناوخۆیی‌و دەرەکییە لەناو کۆمەڵگادا. بەگشتی واقیعی ئەو شەڕەی لەکۆمەڵگای خۆرهەڵاتی ناوین لەئارادابووە، بەتایبەتیش واقیعی شەڕەکانی فەلەستین ـ ئیسرائیل، ئەفغانستان ـ پاکستان‌و ئێران ـ ئێراق کە ئاشکرابوون لەم چوارچێوەیەدا هەڵسەنگاندن‌و شیکارکردنیان گرنگ‌و

بایەخدارە. ئەو قۆناغو ڕووداوانەی لەهزرو خەیالدّاندا جێگایان نابێتەوە، لەڕێگای ئەو شیکارانەوە باشتر مایەی تێگەیشتن دەبێت.

شەڕە نوێکانی خۆرهەلاتی ناوین کە لەژێر هەژموونگەرایی ئەمریکا ـ یەکێتی ئەوروپا بەڕێوە دەچێت ئاخۆ چۆن ئەنجامگیر دەبێت؟ ئایا ئەو شەڕانە بەربلاو و خەستتر دەبنەوە؟ هێزە هەژموونگەراکان دەتوانن ناوچە بەجێبهێلّن؟ بەجێی بێلّن یاخود لەدۆخێکی پێچەوانەدا چاوەڕوانی چی دەکرێت؟ ئاشکرایە ناشێت وەلامی زەلالو یەکلاکەرەوەی ئەو پرسیارانە بدرێتەوە. بەلام مسۆگەرە کە ڕووبەڕووی قۆناخێکی مێژوویی جیاوازین. لەبەرگرینامەکەمدا گەلالەی شیکارێکی سەبارەت بەسروشتی کۆمەلگا، شارستانی، مۆدێرنیتەو خۆرهەلاتی ناوین خستەروو کە بەجیۆکلتووری ناودەبرێتو تا ئەو قۆناخەدێت. بەشی دواتری ئەو بەرگرینامەشم قالبوونەوەیە لەسەر مۆدێلی چارەسەری چاوەڕوانکراو بۆ دەربازبوون لەقەیرانو شەڕ.

## ج ـ چارەسەری تازەگەری دیموکراتیانە لە خۆرهەلاتی ناوین

گەورەترین کارەسات بۆ کۆمەلگایەک لەوەدایە هێزی ئافراندنی هزرو چالاکی دەرهەق بەخۆی لەدەستدابێت. هێزەکانی پلەداریو شارستانی کە زۆر پێشتر ئاگاداری ئەو بابەتە بوون، لەپێشینەییان داوەتە بالادەستی هزری کە دەشێت بەهەژموونگەرایی ئایدیۆلۆژی ناوی ببەین. لەبەردەوامکردنی هەژموونگەراییدا بەتەنیا توندوتیژی ڕۆلّی هەمیشەیی نابینێت. ئەگەر ئامانجی توندوتیژی بەدەستهێنانی بەرژەوەندی سەر کۆمەلگابێت، ئەوا پێویستی بەبەرهەمی زیادە هەیە. ئەگەر کۆمەلگاکان ڕازی نەکرێن ئەوا چاوەڕوانی کاری درێژخایەنو فەراهەمکردنی زێدە ـ بەرهەمیان لێناکرێت. لەکاتێکدا هەژموونگەرایی ئایدیۆلۆژی ئەو ڕەزامەندییە مسۆگەر دەکات، کۆمەلگا بۆ تواناو توانستێک دەکرێتەوە زۆر لەوە زیاترە کە لەهەژموونگەرایی توندوتیژی چاوەڕوان دەکران.

ڕۆژهەلاتناسی (ئۆریانتالیزم) گوزراشتی زانستیانەی ئەو هەژموونگەرا ئایدیۆلۆژیەیە کە مۆدێرنیتەی ئەوروپا سەبارەت بەرۆژهەلاتو خۆرهەلاتی

ناوین دایهێناوە. وەک هەژموونێکی هێزی زۆر کاریگەر رۆڵی خۆی دەبینێت. جیهانگیریبوونی مۆدێرنیتە لەگەڵ جیهانگیریبوونی ئایدیۆلۆژیدا تێکەڵە. لەوانەیە هەژموونگەرایی ئایدیۆلۆژی لەپێشتر بێت. هیچ فەتحێک هێندەی فەتحی هۆش‌و زهن بەکاریگەر نییە. لەکاتی نووسینی ئەو دێرانەشدا بەردەوام لەخۆمم دەپرسی؛ تا چەند رۆژهەڵاتناسیم دەربازکردووە. زۆر باش ئاگادارم کە بیرکردنەوەمم لەمیانەی ئەو زهنیەتەوە لەبازنە تێکچووەکەی کۆیلایەتی هزر رزگارم ناکات، بەپێچەوانەوە ئەشکەنجەم دەدات‌و لەناو هەمان بازنەدا دەمخولێنێتەوە. لەدژە مۆدێرنیستە نەریتییەکانەوە تا دەگاتە ئیسلامیەکانیان لەسەدەی نۆزدەهەمەوە داکۆکی لەسەر ئەوە دەکەنەوە کە ئیسلام شێوازێکی هزراندنی هەیەو بەشێوەیەکی سەربەخۆیانە بەرامبەر رۆژئاوا بیردەکەنەوە. ئیسلامگەرایی گووتەیەکە لایەنی دەستخەرۆکردنی لەپێشە. مسۆگەرە کە دژە ـ مۆدێرنیستەکەی لەسەر تیزی رۆژهەڵاتناسیەکان بەرێوە دەچێت. لە ئیخوان موسلمینەوە تا دەگاتە ئەلقاعیدە تەواوی هێزە ئیسلامگەراکانی گوایە خۆیان بە ئانتی ـ مۆدێرنیست دادەنێن رەوشیان بەمجۆرەیە. تەواوی رەوتەکانی بەدوای چەپرەوێکی وشکەوەن ئەنارشیستەکانیشیان لەناو، سەرباری سەرجەم بانگەشەکانی رکابەرایەتییان بەلام بەگشتی لەچوارچێوەی هزری مۆدێرنیستدان، بەتایبەتیش بەبێ رۆژهەڵاتناسی ناتوانن بیر لەخۆرهەلاتی ناوین بکەنەوە. سۆسیالیزمی بونیادنراو زێدەرۆییترین مۆدێرنیزم بوو. مۆدێرنیزمی چین سەرکەوتنی رۆژهەڵاتناسییە. سەبارەت بە نەریتخوازی هیندستانیش رەوش جیاوازتر نییە.

دژە ـ رۆژهەڵاتناسی لای من سەیرو سەرنجراکێشە. لەو دێرانەدا تاقیدەکەمەوە. بەتەنیا ئازادی فیکر گوزارشت لە دژە ـ رۆژهەڵاتناسی ناکات. وەک مەزەندە دەکرێت دەربازکردنی رۆژهەڵاتناسی هێندە ئاسان نییە. پەسەندنەکردنی باسی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری لەمیانەی کۆڵەکە سێکوچکەییەکەی لەوانەیە دژە ـ مۆدێرنیستی بێت. بەلام ئەوە بەتەنیا مانای دەربازکردنی مۆدێرنیزم‌و رۆژهەڵاتناسی نابەخشێت. لەوەش گرنگتر

چی لەجێگای پەسەند نەکراوەکە دادەنرێت. لەوانەیە ئیسلامیەت یان هەر نەریتێکی دیکە مۆدێرنیتە پەسەند نەکات. بەڵام کاتێک نۆرەی بژارو ئەلتەرناتیف دێت، جگە لەرادەستبوون بەهێزەکانی مۆدێرنیتە چارەیەکی دیکەیان نییە. لەبەر ئەوەی ئاگادارن کە رادەستبوونی ئاشکرا یان نهێنی بەگوێرەی بەرژەوەندیەکانیانە دەبن بەپاشکۆی مۆدێرنیتە. هەرەسهێنانی سۆسیالیزمی بونیادنراو بۆ مەسەلەی دەربازکردنی مۆدێرنیتە ناگەڕێتەوە، بەڵکو ئەنجامێکی وابەستەیی ئەوپەڕگەریەتی بەکۆڵەکە سێکوچکەییەکەی مۆدێرنیتەوە (پراکتیزەکردنی سەرمایەداری دەوڵەت لەجیاتی سەرمایەداری تایبەت مانای رەتکردنەوە نییە). نموونەیەکی دیکە جێگای باس نییە کە وەک چین بەشێوەیەکی سەرنجڕاکێش‌و بەرچاو ئەو داوەرییە بسەلمێنێت. هۆکاری پێشنەخستنی سیستەمێکی هەمیشەیی لەلایەن مارکسیزم‌و ئیسلامیگەراکانەوە بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە رۆژهەڵاتناسییان دەرباز نەکردووە، تەنانەت پەیڕەوکارە زێدەڕۆکانی رۆژهەڵاتناسی بوون.

نەک هەر تەنیا دەرباز نەکراون، بەڵکو دەسپێشخەری بۆ شیکارکردنی هەژموونگەرایی هزری مۆدێرنیست‌و رۆژهەڵاتناسی نەکراوە. گرامسی هەوڵی تاقیکردنەوەی شیکاری داوە، بەڵام لەتاقیکردنەوە زیاتر تێپەڕی نەکردووە. سەرباری هەبوونی رەخنەی بوێرانە لەلایەن قوتابخانەی هزری ئەنارشیستی، ئەوانەش سەبارەت بەئافراندنی ئەلتەرناتیف جیاوازیەکی ئەوتۆیان لەگەڵ سۆسیالیزمی بونیادنراودا نەبووە. هەرچەندە لەبواری تیۆریدا هەژموونگەرایی ئاماژەپێکراو دەربازیش بکەن بەڵام سەبارەت بە ژیانکردن لە چوارچێوەی بونیادەکەیدا کێشەیەکی جدییان نەبووە. رۆشنبیرە ئێرانییەکانی لەخۆرهەڵاتی ناوین لەهەموو کەسێک زیاتر سەرقاڵی هزری مۆدێرنیتە بوون، لەئاواکردنی شیعەگەراییەکی مۆدێرنیست زیاتر بڕیان نەکردووە. تەواوی ئیسلامگەراکانی دیکەش داکۆکی لەسەر ئەوە دەکەنەوە کە سەرجەم گووتەکانی مۆدێرنیتە زۆر پێشتر لەلایەن ئیسلامەوە گوتراوە. بزاوتەکانی دەسەڵات‌و سەرجەم رەوتە ئایدیۆلۆژیەکانی بە سووربوونەوە خۆیان بە دژە ـ ئیمپریالیست، دژە ـ

سەرمایەداری دادەنێن گەورەترین سەرکەوتنی بەدەستیان هێناوە لە لیبرالیزم‌و سەرمایەداری تایبەتەوە بۆ سۆسیال ـ دیموکرات، سۆسیالیزمی بونیادنراوو رزگاریخوازی نیشتیمانییەوە پلەیان بەرزبۆتەوە یاخود مەزهەبیان گۆڕیوە.

رەوتی مۆدێرنیست‌و رۆژهەلاتناسی لەمەزەندەکان زیاتر بەکاریگەرترە. تەنیا رەخنەیەک لەبواری کلتووریدا مانای دەربازکردنی ئەو رەوتانە نابەخشێت. سەرکەوتن بەسەر یەکێک لەهێزە هەژموونگەراکانی سیستەم، تەنانەت ئەنجامدانی شۆڕشێکی دژە ـ سەرمایەداریش بەڵگەی سەلماندنی رەخنەکردن‌و ئاواکردنی ئەلتەرناتیفەکەی نییە. شۆڕشی ئۆکتۆبەر دژە ـ سەرمایەداری بوو بەلام دژە ـ مۆدێرنیست نەبوو. بەپێچەوانەوە لەمیانەی رێخۆشکردن لەپێش زێدەرۆییترین پراکتیکی ئیندوستریالیزم‌و دەوڵەت ـ نەتەوەی مۆدێرنیتە کۆمەکی زۆری پێشکەش بەجیهانگیریبوونەکەی کرد. شۆڕشی چین لەو بارەیەوە نموونەیەکی رەسەنترە؛ لەمیانەی پەیڕەوکردنی شێوەکانی مۆدێرنیتەی سەدەی نۆزدەهەم لەو بڕوایەدایە کە بەردەوامی بە شۆڕش دەدات. بەهەڵەداچوونی هاوشێوەی فەرەنساش تاڕۆژی ئەمڕۆمان کاریگەرییەکانی بەردەوامە.

لەکاتی رەخنەکردنی هەژموونگەرایی ئایدیۆلۆژی مۆدێرنیست‌و رۆژهەڵاتناسی بەبنەماگرتنی پێوەرە سەرەکییەکان مەرجە. کاتێک کۆڵەکە سێکوچکەییەکەی وەک پێودانگی سەرەکی پەسەند بکەین، ئەوا گرنگی بابەتەکە باشتر مایەی تێگەیشتن دەبێت. سەبارەت بەجێگیرییەوە بەبایەخەوە پێویستە ئاماژە بەو خاڵە بکرێت کە لەسەر ئەو بنەمایە دەتوانرێت رادیکاڵترین رەخنەی ئاراستە بکرێت‌و بژارەکانیش لەسەر هەمان بنەما بئافرێنرێت. خودی رەخنەکردن ناچارە یەکپارچەیی‌و ماوە بونیادییەکان بەبنەما بگرێت. تەنیا رەخنەکردنی بوویەرە کورتخایەنەکان، پرۆسەسیاسی‌و رۆڵی کەسایەتییەکان بۆ ئاشکراکردنی حەقیقەت بەس نییە. ئەگەر لێرەدا یەکپارچەیی‌و دەستەواژەی ماوە بەیەکەوە بناخەی رەخنەکردن پێکنەهێنن، ئەو ئەنجامەی دێتە ئاراوە پارچەپارچەو بێ

کاتە، لەم سۆنگەیەوە بێ ماناده‌بێتو کەموکوڕیو هەڵەی قورسی وەک دەرنەبڕینی حەقیقەت لەخۆوە دەگرێت. هەرچیەک رەخنەبکەین، مسۆگەر پێویستە بەشێوەیەکی راست یەکپارچەیی (یەکگرتوویی)و ماوەکانیان دەست نیشان بکەین. کاتێک مۆدێرنیتە جێگای باس بێت، بەلانی کەم پێویستە زەمانێکی پێنج سەد ساڵەی سیستەماتیکو بونیادی بەبنەما بگرێت کە لەسەر بنچینەی کۆڵەکە سێیانیەکەی یەکپارچەییەک پێکدێنێت. سەرەکیترین هەڵەی رکابەرانی سیستەم ــ مارکسیستەکانیشی لەناودا ــ لەوەدایە کە سیستەمێکی درێژماوەو خاوەن کۆڵەکەی سێیانییان لەناو کورت ماوەدا رەخنە کردووە، تەنانەت هەندێک جار ماوەیان فەرامۆش کردووەو یەک رەهەندییان تاوتوێ کردووە. کەچی ئەو شیکارانەی بەکورتی لەو بەرگرینامەیەدا پێشکەش کراون روونیدەکاتەوە کە بۆ تێگەیشتنی سەرمایەداری مسۆگەر پێویستە پەیوەندییەکەی لەگەڵ سیستەمی شارستانی ناوەندی دیاربکرێت، بەیەکەوە لەگەڵ هێلکاری درێژماوەی هەڵکشانیو دیاردەی دەوڵەت ــ نەتەوەو ئیندوستریالیزم رەخنەبکرێت کە دوو رەهەندە سەرەکیەکەی دیکەن.

ئەگەر شارستانی خۆرهەڵاتی ناوین تەنانەت شارستانیەکانی چینو ئەمریکا رەچاو نەکرێن ئەوا دەرک بەو سەرمایەدارییە ناکرێت کە لەسەدەی شازدەهەم هەستانەوەی بەخۆوە دی. چونکە مسۆگەرە کە پۆتانسێلی ناوخۆی ئەوروپا بۆ پێکهێنانی سەرمایەداری ناتەواوە. هەروەها ئەگەر بونیادنانی دەوڵەت ـ نەتەوەش لەئارادانەبێت ئاواکردنی سیستەمی سەرمایەداریش مەحاڵ دەبێت. هیچ سیستەمێکی چەوسانەوە بەبێ دەسەڵاتو دەوڵەت بەدینایەت. نەک تەنیا دەسەڵاتو دەوڵەت، بەڵکو تازۆرترین دەسەڵاتو دەوڵەت ـ نەتەوەی دەوڵەت ئاوانەبن، کەڵەکەبوونی سەرمایەو قازانج بۆ سەرمایەداری فەراهەم نابێت. لەپێناو سەرکەوتنی هەژموونگەرایی سیستەمیش پێویستە شۆڕشی پیشەسازی بخاتە ژێر رکێفی پاوانگەرایی خۆیەوە: ئەمەش لەگەڵ بەئایدیۆلۆژیاکردنی بەشێوەی ئیندوستریالیزم بەیەکەوە لەناو یەکتردا ئەنجامیبدات. ئاشکرایە کە لەمیانەی یەکپارچەیی پتەوی نێوان ئەو دیاردانەو چوارچێوەی درێژماوەدا

مۆدێرنیتەیان زاڵ کردووە. کاتێک تەماشای سەرجەم ئەو قوتابخانە فیکریانە بکەین کە خۆیان بەرەخنەگر دادەنێن دەبینین کە مۆدێرنیتە لەناو درێژماوەو یەکپارچەییدا تاوتوێ نەکراوە، بەش بەشەو زیاتریش لەدەستەواژەی ماوە بێ ئاگابوون، لەرێگای ئەولەویەتدان بەچەند تایبەتمەندێتییەک (بۆ نموونە بوویەرەکان، قۆستنەوەی رەنج، کرێ، قازانج، سەرمایە، دەوڵەت، داگیرکەری، ئیمپریالیزم، کەسایەتیەکان) هەوڵی بەدەستهێنانی ئەنجامیان داوە. کاتێک ئەوە پەیڕەوەکە بێت، ئەو ئەنجامەی بێتە ئاراوەش لەوە دەچێت فیل بەتاڵە مووەکانیەوە پێناسەبکرێت.

بەتایبەتی ئەو سۆسیالیزمە بونیادنراوەی لەناویدا گەورە بووین، دەستەواژەی ماوەی بەشێوەیەکی راست بەکارنەهێناو تەنیا کۆڵەکەی سەرمایەداری مۆدێرنیتەی رەخنە کردو لەمیانەی نواندنی شۆڕشگێڕێتی رێگای لەپێش گەورەترین بێ ئومێدیو هیواشکێنی کردەوە. بێگومان ئەو هەڵوێستە بناخەی کۆمەڵایەتی خۆی هەیە. پێویستە باش بزانرێت کاتێک لە لیبرالیزم زیاتر کۆڵەکەکانی دەوڵەت ـ نەتەوەو ئیندوستریالیزمی مۆدێرنیتە بەکاربهێنرێت شۆڕشگێڕی نییە بەڵکو دیکتاتۆریەتو تەنانەت فاشیزمیش دەئافرێنێت. لەو لایەنەوە ئەزموونی وڵاتانی سۆسیالیزمی بونیادنراو (زیاتریش دەوڵەتەکانی رزگاری نیشتیمانی) زۆر فێرکەرن. هەروەکو لینینیش گوتوویەتی نیازپاکی چوون بەرەو جەهەنەم بەربەست ناکات، بەپێچەوانەوە هەندێک جار ئاسانی دەکات. شۆڕشی ئۆکتۆبەر بەهۆی کەموکوڕیو ناتەواوی لەبواری دژە ـ سەرمایەدارییەوە شکستی نەهێنا، بەپێچەوانەوە لەدژە ـ سەرمایەداری سەرکەوتووبوو، بەڵکو چونکە دژە ـ مۆدێرنیست نەبوو. لەم سۆنگەیەوە؛ چونکە دژە ـ دەوڵەت ـ نەتەوەو دژە ـ ئیندوستریالیزم نەبوو، هەروەها لەرێگای دژە ـ سەرمایەدارییەوە نەیتوانی دوو کۆڵەکەکەی مۆدێرنیتە دەرباز بکاتو ماوەی بونیادی بەلاوەناو تەنیا لەمیانەی کورت ماوەکانەوە جموجۆڵی کرد، هەربۆیە دۆڕا. کردارو پراکتیکی پەیڕەوکراو راستی ئەو رەخنەیە دەسەلمێنێت.

سەرەکیترین کەموکوڕی شۆڕش، ڕەوتە ئایدیۆلۆژیو بزووتنەوەکانی ئەو پێنج سەدەیەی دوایی کە هەڵگری ئامانجی دیموکراتیو یەکسانیخوازی بوونو بەسەرکەوتنێکی سیستەماتیک نەگەیشتن، بەسیستەمێکی جیهانی جیاواز نەگەیشتن کە دەشێت وەک شارستانێتی دیموکراتی ڕاڤەی بکەین؛ لەپراکتیکێکی ڕەخنەگرانە بێبەشبوون کە هەڵگری یەکپارچەیی بێتو دەستەواژەی ماوە لەخۆوە بگرێت. واتە بەردەوام لەلایەنێکەوە فیلیان پێناسە کردووە. لەدۆخێکی بەمجۆرەشدا نە سوود لە فیل دەبینن نە لێی ڕزگار دەبن. مارکسیستەکان لەکاتی ڕەخنەکردنی سەرمایەداریو هەوڵەکانی دەربازکردنی بێ ئاگابوون لەوەی کە ناوەندگەرایی دەوڵەت ـ نەتەوەو ئیندوستریالیزمیان بە ئاستی فاشیزمو وێرانکردنی ژینگە گەیاندووە. هەڵوێستی بزووتنەوەو ڕەوتەکانی ڕزگاری نیشتیمانیش بەرامبەر بەمۆدێرنیتە داخراوەو نادیارترە. کاتێک دەبن بە دەوڵەت ـ نەتەوە لەهەندێک بواری پیشەسازیدا گەشە دەکەن، دژە ـ ئیمپریالیستیو دژە ـ سەرمایەدارییەکەیان جێگای خۆی بۆ لایەنگری زێدەڕۆیانەی مۆدێرنیزم جێ دێڵێت، تەنانەت لەگەیاندنی ئایدیۆلۆژیەکانی مۆدێرنیتە (لیبرالیزم، میللیگەرایی، سۆسیالیزمی بونیادنراو) بەپێگەی ئایین سنوور ناناسن، بەمجۆرە دەوڵەت ـ نەتەوەو ئیندوستریالیزم وەک ئایینی سیکۆلار مانادارکراونو بوونەتە خاوەن بونیاد.

ئەنارشیستەکانیش کاتێک ڕەخنە ئاراستەی کۆڵەکە سێیانیەکەی مۆدێرنیتە دەکەن، تەنانەت نەیانویستووە وەک ئەلتەرناتیف بیر لەسیستەمێکی دیموکراتیک بکەنەوە، بەڵکو تاکی ئەنارشیستیان بەرامبەر بەکۆمەڵگای دیموکراتیک هەڵبژاردووە. دان پێدانانیانو گەڕاندنەوەی ژێرکەوتنیان بۆ ئەو واقیعە لەگەڵ پێگە چینایەتیەکەیان ناگونجێت. ناشێت بەجۆرێکی دیکە لایەنی دژە ـ کۆمەڵگایی وردەبۆرژوازی شار روون بکرێتەوە. سۆسیال دیموکراتەکانیش جگە لەو بڕوایەی کە خوازیارن لەمیانەی ریفۆرمەوە مۆدێرنیتە ڕاست بکەنەوە تاکە هەنگاوێکی دیکە ناهاوێژن. ئیکۆلیژیستەکانیش هێندە رووکەشین کە نازانن سەرجەم بەڵگەو کۆڵەکەکانی ژینگەیان لەمۆدێرنیتە وەرگرتووە. کاتێک فشار

دەخەنـە سـەر ئیندوسـتریالیزم سـەرمایەداری‌و دەوڵـەت ـ نەتـەوە لـەبیر دەکـەن. هـەروەها فێمێنیسـتەکانیش باوکسـالاری رەخنـە دەکـەن، بـەڵام بەهەمان زەلالی‌و راشکاوانە ئەو وێرانکارییانە رەخنە ناکەن کە مۆدێرنیتە ژنی دووچار کردووە. تەنانەت کاتێک رەخنەشی دەکەن بـەڵام لەئافراندنی رەوت، بزووتنەوەو سیستەمێکی ئەلتەرناتیفی ژن‌و کۆمەڵگا لەناو جۆرێک بێچارەییـدا دەژیـن. بزووتنـەوە کلتـووری‌و ئاییـنییـە رادیکاڵـەکانیش هێشـتا وەک بـزاوت‌و رەوتـی بەرهەڵسـتکاری مۆدێرنیتـە لاوازن. ئـەوەی لەپێناویدا هەوڵدەدەن سازشکارییەکی باڵایە.

خوازیـارم ئامـاژە بـەو خاڵـە بکـەم؛ لەکاتێکـدا سـەرمایەداری رۆژی ئـەمرۆمان لەقـەیرانی فینانسـدا سـاڵانە ٦٠٠ ترلیـۆن دۆلار تالانکـاری گریمانـەیی (وەهمی)ئەنجامـدەدات، بێگومـان پێشنەخسـتنی رەخنەیـەکی یەکپارچـەیی‌و بونیـادی سـەبارەت بەمۆدێرنیتـەی سـەرمایەداری‌و ئاوانەکردنی سیستەمێکی ئەلتـەرناتیف رۆڵێکـی دیاریکـەری لەمـەدا هەیـە. سـەرجەم ئـەو رەوت، بزووتنـەوەو شۆڕشـانەی نـەتوانن پەیوەنـدی سەرمایەداری لەگەڵ مۆدێرنیتەدا دیاربکـەن لەتوانـەوە لـەناو مۆدێرنیتـەدا رزگاریان نابێت. سەرجەم رەوتـە ئایدیۆلۆژیـەکان، بزووتنـەوە سیاسـی‌و هەرجۆرە شۆڕشێکی دژە ـ سەرمایەداری بـە دژە ـ مۆدێرنیتـە نەگەیـەنێت لەفەتحکردن لەلایەن مۆدێرنیتەوە رزگاریان نابێت.

وەک چۆن دژە ـ سەرمایەداری دژە ـ مۆدێرنیزم نییـە، ئەگـەر نـەبێت بە دژە ـ مۆدێرنیتە ئەوا نابێت بە دژە ـ سـەرمایەداری یـەکی جێگیـرو بـە پرەنسـیپ. سـەرەکیترین بەهەڵـەداچوونی رەوت‌و بزوتنـەوە ئیکۆلـۆژی، فێمینسـتی، کلتـووری‌و ئاییـنیـە رادیکاڵـەکان؛ لـەو بڕوایـەدابوون بـەبێ ئامانجگرتنی بونیادی یەکپارچەیی مۆدێرنیتە سەرکەوتن بەدەست دێنن.

بەو هەڵوێستەم نکوڵی لـە هـەموو شتێک ناکـەم. هەرچەنـدە پارچـە پارچەو بێ سیستەمیش بێت بەڵام رەخنە پێنج سەدەییەکەی سـەبارەت بـە مۆدێرنیتـە لـەو نیوسـەدەیەی دواییـدا لاوازیش بێت بـەڵام هـزری پۆسـت مــۆدێرنیزمی ئافرانــدووە. ســەرباری ئــەوەی پۆســت مــۆدێرنیزم لەوەلامدانــەوەی ئــەو رەخنانــەی مۆدێرنیتــە دوورە کــە هــەوڵی

شیکارکردنیانمدا، بەلام سەبارەت بە خستنەڕووی دۆخی کائۆسو ئەو قەیرانە گرنگە کە سیستەم تێی کەوتووە.

لەسەردەمی پۆست مۆدێرنیزمدا شیکارکردنی پەیوەندی مۆدێرنیتە لەگەڵ هەزاران بوویەری خراپی لەجۆری فاشیزم، جینۆساید، تۆتالیتاریزم، سەرەڕۆیی، ڕەگەزگەرایی کۆمەڵگا، میللیگەرایی، ئیندوستریالیزم، گۆڕانکاری کەشو هەواو جۆرەکانی تێکچوونی ژینگە، هەڵکشانی دەسەلاتگەریتی، بەژنکردنو بەکالاکردنی کۆمەڵگا، ئەنالیتیکبوونی ژیری، خاڵیکردنەوەی ڕۆح، بەخڵتەکردنی تاک، بەگژداچوونی هەرکەس لەگەڵ یەکتردا، پەرتەوازەکردنی کۆمەڵگا، وێرانکردنی کشتوکاڵ، جێگرتنەوەی پاشا ـــ خوداوەندە داپۆشراوەکان لەلایەن تاک ـ خوداوەندە رووتەکان، لەدەستدانی لایەنی سیحراوی ژیان، لەدەستدانی ڕەسەنایەتیو جوانی ژنو سۆزانیکردنی ئەوپەڕگەرانەی ژن، زاڵبوونی دەستدرێژی لەجیاتی ئەخلاق، جێگیربوونی هۆمۆژەنی ـ مانای مردن دەبەخشێت ـ لەجیاتی هەمەڕەنگی کە مانای ژیان دەبەخشێت، لەناوچوونی سیاسەتو جێگیرکردنی دەسەلات لەجێگایدا، ئاسانتر دەبێتو وەک ئەگەرێک دێتە پێشەوە. پۆست مۆدێرنیتە سەربەخۆ شۆڕش نییە. بەلام قالبە وشکەکانی مۆدێرنیتە دەهەژێنێت وهەلی شکاندنی دەرەخسێت، زەمینەو هەلومەرجەکەی نەرم دەکات. ئاشکرایە کە شۆڕشی دژە مۆدێرنیتە هەلوێستێک پەیڕەو دەکات کە پاژەکان لەناو یەکگرتوویی، ڕەهەندی خۆجێییش لەچوارچێوەی گەردوونیو ساتەکانیش لەمیانەی بڕێژماوەکاندا تاوتوێ دەکات؛ لەسەر بنەمای بەرەنگاربوونەوەی سەرمایەداری، دەوڵەت ـــ نەتەوەو ئیندوستریالیزمو لەتەوەرەی ئامانجەکانی سۆسیالیزم، دیموکراسی و ئیکۆلۆژیدا سەرجەم بونیادەکان بەرەو بەرگری خۆیی، مانادارکردنی هەبوونو بە حەقیقەتکردنی خۆیان ئاراستە دەکات.

پێویستە ڕۆژهەلاتناسی لەچوارچێوەیەکی تەسکی بۆچوونی بیرمەندە ئەورووپییەکان سەبارەت بەشارستانیو کۆمەڵگاکانی خۆرهەلاتی ناویندا هەڵنەسەنگێنرێت، چونکە لەجیاتی پێشخستنی هزری زانستی دەرهەق

بەسروشــــتە کۆمەڵایەتیــــەکانیان‌و فەراهــــەمکردنی رۆشــــنگەری خۆیــان، وابەســتەکردن بەهەژموونگــەرایی ئایــدیۆلۆژی مۆدێرنیتــەو بەبنەماگرتنی بونیادە زانستیەکەی مانــا بەرفراوانەکــەی رۆژهەڵاتناسییە. فــەتحکاری ئــەو دوو ســەدەیەی دوایــی مۆدێرنیتــەی ســەرمایەداری تــەنیا لــەبوارەکانی کلتــووری مــاددی رووینــەداوە. بــەڵکو لــەبواری کلتــووری مەعنەویدا زیاتر جێگای باس بووە. ئەو شۆڕش، بزاوتە سیاسی‌و رەوتــە ئایدیۆلۆژیانــەی ســـەریانهەڵداوە هەریەکــەو کۆپیــەکی بێکاریگــەری نموونەکــەی ئــەوروپان. هەربۆیــەش کاریگەریەکــەیان لەســەر کۆمــەڵگا رووکەشانە بووە. ئەو کۆمەڵگایەی لەنێوان بەرداشی نەریت‌و مۆدێرنیتــەدا ماوەتــەوە، بــەردەوام لــەناو گرژیدا بــووەو بــەهۆی خــۆ نوێنەکردنــەوەش بەردەوام لەدۆخی قەیراندا دەژیت.

دژە ـــ رۆژهەڵاتناســی لەمیانــەی دژە ـــ مۆدێرنیســتیەوە بەدیــدێت. دەشــێت ئیســلامگەرایی سیاســی رادیکــاڵ لــەچوارچێوەی رۆژهەڵاتناســی‌و شــێوەی رۆژهــەڵاتی مــۆدێرنیزم هەڵســەنگێنرێت. مســۆگەر هــیچ توانــاو بەهایەکی ئافراندنی ئەلتەرناتیفی نییــە. جگــە لەبــەکارهێنانی میللیگــەرای ئایینی وەک پەرچەکردارێک بەرامبــەر میللیگــەرایی عــەلمانی شــتێکی دیکــە نییــە. شۆڕشــی عــەرەب، تــورک‌و فارســـەکان شۆڕشــی نموونــەیی رۆژهەڵاتناســین. ئــەو شۆڕشــانە میللیگــەرایی ئــایینی‌و نــەژادییان بــەجیا یاخود تێکەڵ بەکارهێناوەو ئاواکردنی دەوڵەت ـ نەتەوەیان وەک ئامانجی یەکەم دەست نیشان کردووە. لەو بڕوایەدابوون ئەگەر لەگەڵ سەرمایەداری دەوڵەت‌و ئیندوستریالیزم بیکەن بەیەک ئەوا رۆڵی خۆیان پێکدێنن. چەنــد سەدەیەک دواتر گرتنە بەری رێگای ئــەوروپا لەچارەنووسیان نووسراوە. لەهەموو بوارێکەوە گەیشتن بەبــەها ئەوروپیــەکانیان بــۆ خۆیــان کــردووە بەکەللەڕەقی.

خوێندنەوەیــەکی راست بــۆ پەیوەنــدی کۆمــەڵگای خۆرهــەڵاتی نــاوین لــەگــەڵ مۆدێرنیتــەی ســـەرمایەداری، بــۆ پێهــەڵگرتنێکی ئەلتەرناتیڤانــە رۆڵێکی دیاریکەری دەبێت. بەر لەهەموو شتێک پێویستە مایەی تێگەیشتن بێت کە مۆدێرنیتە بووە بەدیاردەیەکی لۆکاڵی یان خــۆجێیی. دیاردەیــەکی

ناوخۆییە نەک دەرەکی. بەلام لەمۆدێرنیتەی ئەوروپا جیاوازترە. لاوازترین ئەلقەی سەرمایەداری جیهانگیرییە. لەدۆخی بەمجۆرەدا پێویستە لەدوو هەلە نەگلێی. یەکەمیان؛ بەجۆرێک مۆدێرنیتەی سەرمایەداری پەسەند بکرێتو تەنانەت بپەرسترێت وەک بلێی دەرفەتی جیهانو شارستانیەکی دیکە بوونی نییە؛ دووەمیشیان، بەشێوەیەکی بنەرەتیو سەرتاسەری بیکەیتە دوژمنو وەک سەلەفیەکان رەتی بکەیتەوە. لەدەرەنجامدا هەردوو هەلوێستیش خزمەت بەزیاتر جێگیربوونی مۆدێرنییتەی سەرمایەداری دەکەن.

لەپەرتووکی سۆسیۆلۆژیای ئازادی بەرگرینامەکەمدا هەولمدا تازەگەری دیموکراتی وەک ئەلتەرناتیفی دژە ـ مۆدێرنیزم بخەمەڕوو. لەجیاتی ئەوەی تێزەکانی ئەو بەشە وەک خۆی لەم بەشەدا باس بکەم، هەولدەدەم لەگەل هەلومەرجی ناوچەدا بیگونجێنم. رەخنەکردنی سیستەم ئامانجی ماناداركردنی ئەوانەیە کە پێویستە دەرباز بکرێن یان سەرلەنوێ بونیاد بنرێنەوە. لەو بڕوایەدام کە بۆ باشتر تێگەیشتنی ئەلتەرناتیفی مۆدێرنیزمی دیموکراتیک جارێکی دیکە پێناسەکردنی مۆدێرنیتەو هەلسەنگاندنی کۆلەکە سێیانیەکەی پەیرەوێکی راستە.

دەشێت مۆدێرنیتە وەک چاخی هەنووکە (ژیاندارکراو) هەلسەنگێنرێت. چونکە هەر شارستانیەکی بونیادنراو تا ئەو کاتەی دەربازدەکرێت مۆدێرنیتەی سەردەمی خۆیەتی. بۆ نموونە بونیادە سۆمەریەکانی زیاتر لەدووهەزار سالیان خایاند مۆدێرنیتەی سۆمەرە، واتە سەردەمی سۆمەرە. مۆدێرنیتەی گریکیش دەوروبەری سالانی ٥٠٠ پ.ز ـــ ٥٠٠ زایینی دەگرێتەوە. مۆدێرنیتەی عوسمانی ئیسلامیش (١٣٠٠ ـــ ١٩١٨) لەقۆناخی خۆیدا لەجوگرافیاکەیدا بەکاریگەربووە. ئەگەر سەردەمەکەیان بەسەر چووبێت، ناوبردنیان بەشارستانی گونجاوترە. شارستانی ئەو مۆدێرنیتانە وەسف دەکات کە پێشووتر ژیاون. شارستانیمان وەک سیستەمی سەرکوتکردنو زوتکردنی زێدە ـ بەرهەمو پاوانگەرایی پێناسەکردبوو کە لەسەر بەناویەکداچوونی دەولەت ـ چین ـ شار هەلکشاوە. لەو بڕوایەدام کە ئەو پێناسەیە تێرو

تەسەلە. جیاکردنەوەیان بەشێوەی کلتووری ماددی‌و مەعنەوی شارستانیەکان وەسف دەکات بەڵام پێناسەیان ناکات. دەشێت شارستانیەکان وەک کلتوورو بونیادی درێژخایەن‌و یەکپارچەش وەسف بکرێت. بە مانا بەرفراوانەکەیەوە ناوبردنی هەموویان بە پێناسە هێندە چەوتیش نابینرێت.

جیاوازی نێوان شارستانییە ناوەندی‌و نا ناوەندیەکانیش فێرکەرە. دەستەواژەی شارستانی ناوەندی شارستانی رووباری سەرەکی وەسف دەکات، ناوەندیش ئەو بونیادە یەکپارچانە وەسف دەکات کە بەردەوام لەئارادان. دەشێت بەسیستەمی جیهانیش ناوببرێت. دەشێت چەندین شارستانی لەدەرەوەی ناوەندیش جێگای باسبن. چین، ئەمریکاو هیندستان بوونەتە شارستانی، بەڵام نەبوونەتە ناوەند. شارستانیەکانی خۆرهەڵاتی ناوینیش زنجیرێکی ناوەندی پێکدێنن. لەماوەی نێوان ١٥٠٠ پ. ز ـ ١٥٠٠ زایینی زنجیرەی شارستانیەکی ناوەندی نزیکەی پێنج هەزار ساڵە جێگای باس بووە. ناوی جیاوازیان لێنراوە. زیاتریش ناوی خانەدان‌و ئایینە. سۆمەر، میسر، رۆما، بێزەنتی ـ کرستیانی، عەرەب ـ ئیسلام‌و تورک ـ ئیسلام ئەوانەن کە یەکسەر بەبیری مرۆڤدا دێن. هەرچەندە ناوو ناوەرۆکیان لەیەکتر جیاوازبێت، بەڵام خاوەن بونیادو یەکپارچەییەکی ناوەکی بەگوێرەی پێناسەکەیانن. هەژموونگەران‌و ناوچەی ناوەند ـ کەنار جێگای باسە. تەنگەژەی کاتی‌و دۆخی کائۆس بەخۆیانەوە دەبینن. بەڵام بەو سیفەتەی بونیادی زنجیرەی دەسەڵاتێکن بۆشایی پەسەند ناکات‌و هەمیشەییبوونیان جێگای باسە.

مۆدێرنیتەی سەرمایەداری سیستەمێکی جیهانە کە تا ئێستا لە ناویدا دەژین. وەک شارستانیەکی ناوەندی هەژموونگەرایی کە لەخۆرهەڵاتی ناوینەوە بۆ ئەوروپا خزاوە نزیکەی پێنج سەد ساڵە (لە سەدەی شازدەهەمەوە) درێژە بەهەبوونی خۆی دەدات.

دەستەواژەی شارستانێتی دیموکراتیمان بەئامانجی پێناسەکردنی ئەو دونیایە هەڵبژارد کە لەلایەن هێزە کۆمینالەکانی لادێ‌و رەنجدەرە ئازادیخوازەکانی ناو شار پێکهێنراوە؛ کە بەرامبەر شارستانی سیستەمی

شار ــ چین ــ دەوڵەت لەناوەوە دژی جیاوازی چینایەتی کۆیلەداری، لەدەرەوەش دژی سەرکوتکردن، تالان‌و کۆیلەکردنی ناسنامەی قەوم‌و قەبیلە بەردەوام لەناو بەرخوداندان. ئاشکرایە کە ئەو پێکهاتەو بونیادە دیموکراتییانەی لەچوارچێوەی ئەو پێناسەیەدا بەدرێژایی مێژووی شارستانی خاوەن یەکپارچەییەکن‌و بەردەوام میراسیان بۆ یەکتری جێهێشتووەو یەکسانیخواز، ئازادیخوازان ناوبردنیان بەشارستانێتی دیموکراتی ماف‌و ئەرکێکی مێژوویی دەست لێبەرنەدراوە.

کاتێک دەستەواژەی شارستانێتی دیموکراتیک لەسەر رەوشی بەرجەستەیی ئێستا پەیڕەو بکەین دەشێت وەک تازەگەری دیموکراتیک دیار بکرێت بەمەرجێک رکابەرایەتی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری لەخۆوە بگرێت. لەناوی دەستەواژەکە زیاتر پێویستە چوارچێوەکەی لەبەرچاوان بگیرێت. بەدرێژایی بەرگرینامە زیاتر باسی ئەو شارستانیانەمان کرد کە لەمیانەی گێرانەوە فەرمی‌و کلاسیکیەکان باسدەکرێن؛ کەمتر جێگامان بە دیاردەکانی شارستانێتی دیموکراتی دواوە. هۆکارەکەشی بۆ نوێبوونی تێروانینمان سەبارەت بە مێژوو و تازەبوونی کەرەستەو ماتریالەکانی بەردەستمان دەگەرێتەوە. لەو بەشەدا هەوڵی یەکلاییکردنەوەی شیکاری رەوشی هەنووکەیی کۆمەڵگای خۆرهەلاتی ناوین‌و هەڵوێستەکانی چارەسەرکردنی کێشەکان دەدەم. تازەگەری دیموکراتی لەسەر بنەمای سەرهەڵدان، پەرەسەندن، قەیرانی بونیادی‌و دەربازکردنی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری بەردەوام وەک دژە تێزی دیالیکتیکی بابەتی شیکاردەبێت. ناکەوێتە ناو هەڵە مێژووییەکانی مارکسیزمەوە. بەتایبەتیش ناکەوێتە ناو ئەو تەڵەزگەوە کە ناکۆکی سەرەکی بەدیاردەیەکی وەکو بورژوازی ــ کرێکار ببەستێتەوە کە بەردەوام ناوەڕۆکەکەی دەگۆڕێت. کاتێک لەسەردەمی هیگڵەوە بۆ یەکەمین جار هەوڵدەدرێت پەیڕەوێکی سەرکەوتووانەی دیالیکتیک بەگوێرەی سروشتی کۆمەڵگای خۆرهەلاتی ناوین بگونجێندرێت، لەو بڕوایەدام کە ئەو ئەزموونە ئەنجامی سەرکەوتووانە لەگەڵ خۆیدا دێنێت. هەڵوێستێکی مانادارتر بەرامبەر ئەو

گووتەیەی مارکس " دیالیکتیکم لەسەر پێی خۆی داناوە"پیشاندەدرێت کە ئاماژەی پێکرد بەڵام لەجێبەجێکردنیدا سەرنەکەوت.

أ ـ کۆمەڵگای ئیکۆنۆمیک بەرامبەر بە سەرمایەداری

ئەو کات و شوێنەی کارل مارکس تێیدا ژیاوە لەژێر فشاری هەلومەرجی ئەو رەوتە ئایدیۆلۆژی ـ سیاسی و گفتوگۆیانە دایە کە لەپێناو یەکێتی و دەوڵەت ـ نەتەوەی ئەڵمانیا ئەنجامدەدرێت. هەوڵدەدرێت لەچوارچێوەی ئایدیۆلۆژی، سیاسی و یاسایی دیاردەکان مانادار بکرێن. کارل مارکس لەمیانەی ئەولەویەتدان بەئابووری هەوڵی کارتێکردنە سەر ئەو هەلومەرجە دەدات. لەباسەکەیدا هەوڵدەدات ئابووری وەک پۆلێنێکی دیاریکەر جێگیر بکات. بەرپرسیاری سەرەکی گەیاندنی سەرمایەدارییە بەئاستی زانست. لەو چوارچێوەیەشدا پێشوازیکردنی خاوەن سەرمایەکان وەک بۆرژوازی، رەنجدەرە کرێدارەکانیش وەک پرۆلیتاریا، پێشوازیکردنی کۆمەڵگاش وەک پۆلێنی کۆمەڵگای سەرمایەداری کە کالای سەرمایەداری تێیدا زاڵە بە بەردی بناخەی ئەو زانستە دادەنێت. لەو بڕوایە دایە بەو کردارەی بە بەردێک لەسێ چۆلەکەیداوە. لەو بڕوایەدایە کاتێک ئابووری لەئابووری سیاسی ئینگلیز، پۆزیتیڤیزمی لەزانستی کۆمەڵایەتی فەرەنسی و دەستەواژەی دیالیکتیکی لەفەلسەفەی ئەلمانی وەرگرتووەو کردوونیەتی بەیەک و سەنتێزی "سۆسیالیزمی زانستی" پێکهێناوە سەرکەوتووە. لەو قۆناخەدا لەهەر زانستێکدا شۆڕش جێگای باسە. دڵنیایە کە خۆی و ئەنگلس یش شۆڕشی زانستی کۆمەڵگایان ئەنجامداوە. بە داروینی زانستی کۆمەڵگا دادەنرێن.

هزری مارکسیستی وەک گرنگترین باڵی زانستی کۆمەڵایەتی ئەوروپا سەرهەڵدەدات. کاتێک لەروانگەی سیستەمی هەژموونگەراییەوە سەیربکرێت دەبینرێت کە ئەو زانستە سەرچاوەی خۆی لەپێویستی پاوانگەرایی سەرمایە وەردەگرێت کە تازە هەڵکشاوەو مۆرکی خۆی لەسیستەم داوە، لەمیانەی بەزانستکردنی سەرمایەش لەوانەیە هێندەی توندوتیژی دەسەڵات، بەڵکو لەویش زیاتر کۆمەکی بەرەواکردنی کردووە.

هێندەی دەیانەویت با سەرمایە بە دزێو و خراپ پیشانبدەن، بەلام لەرێگای بەزانستکردنی سەرمایەداری مارکس و ئەنگلس هەنگاوی مێژوویی پێویستیان بۆ رەواکردنی هاویشتووە. چەندە بەئێش و ئازارە کە کارل مارکس و فریدریک ئەنجلس سەرباری ئەوەی سەرەتا دژایەتییان کرد، بەلام کاتێک سەرمایەیان وەک سەرمایەداری راگەیاند، پاوانگەراکانی سەرمایە ـ قازانجیشیان کرد بە بۆرژوازی، کۆمەڵگای ئابووریشیان وەک کۆمەڵگای سەرمایەداری راگەیاندبوون بە بەرپرسیارە سەرەکیەکانی ئەو هەنگاوە مێژووییە و نەیانتوانی خۆیان لەو رەوشە رزگار بکەن. پێویستە لەبیر نەکەین کە لەمێژوودا بەهۆی بەکارهێنانی نیازپاکی بەردەوام ئەنجامی پێچەوانەیان لێکەوتۆتەوە.

وەک دەزانرێت کاتێک مارکس و ئەنجلس دەستپێشخەری ئەو کارەیان دەستپێکرد زیاتر سوودیان لەفەلسەفەی دیالیکتیک بینی کە هیگل بەلوتکەی گەیاندبوو. لەو بروایەدام هەڵە سەرەکیەکەیان لەکاتی گونجاندنی فەلسەفەی دیالیکتیکی ئەنجامداوە. لەو کاتەدا ئەو هەڵەیان کرد کاتێک پەرەیان بەهەندێک سێکوچکەی لەجۆری تێز ـ دژە تێز ـ سەنتێز، سەرمایە ـ رەنجی کرێدار ـ قازانج، بۆرژوازی ـ چینی کرێکار ـ کۆمەڵگای سەرمایەداری داوە. لەو بروایەدام کە تێز ـ دژەتێزی دیالیکتیکی هیگل لەلایەن مارکسیستەکان (زۆربەی ئەوانەی ئەو پەیرەوەیان بەکارهێناوە) بەتەواوی دەرکی پێنەکراوە. تێز ـ ئەنتی تێز کە کێشەیەکی سەرەکی فەلسەفییەو تا ئێستاش گرنگی خۆی لەدەست نەداوەو چاوەروانی پەرەپێدان دەکات مانای بەناویەکدا چوونی گەردوونی ـ تاکەنەییەو گوزراشت لەحەقیقەتەکەی دەکات. لەناوەرۆکدا هیگل خوازیارە بڵێ: هەر هەبوونێک لەناوەرۆکەکەیدا دژەکەشی جێگای باسە. ناوەرۆکی هیچ هەبوونێک بێ دژ نییە. نەبوونی دژ مانای هیچێتییە. هیچێتیش مانای نەبوونە. بەگوێرەی ئەوەی نەبوونیش بوونی نییە کەواتە هیچێتی تەواو بوونی نابێت. لەدۆخێکی بەمجۆرەدا هەبوونەکان بێ دژ نابن؛ وەک چۆن هەڵکشان بێ داکشان نابێت. کێشەکە زیاتر سەرچاوەی خۆی لەتێگەیشتنێکی راست بۆ ماهیەتی دژایەتیدا شاراوەیە. تیۆریزانێکی

سەرکەوتووی دیالیکتیک ئەو کەسەیە کە بەشێوەیەکی راست دژایەتی دەست نیشان دەکات.

پێویستە بەبایەخەوە ئاماژە بەو خاڵە بکرێت؛ دەشێت بەهەزاران دژە تێز لەهەبوونێکدا دەربکەوێت. گرنگترین ئەرکی پێویستە لەلایەن پسپۆڕی دیالیکتیکەوە ئەنجامبدرێت، دەستنیشانکردنێکی راست و دروستی ئەو دژە تێزەیە کە لەناو ئەو هەموو دژە تێزانە لەڕیزی یەکەمدا کاریگەری لەسەر ئەوانی دیکە کردووەو ئاوایکردوون. کارل مارکس و فریدریک ئەنجلس هەردووکیان وەک شارەزای دیالیکتیک لەکاتێکدا خوازیارن هیگل لەسەر پێیەکانی دابنێنەوە، کەوتوونەتە ناو هەڵەیەکی هێندە قەبەوە بەبێ ئەوەی ئاگادار بن کەللەیان پەڕاندووە. سەرباری ئەوەی دوو سەدەیە بەردەوام شنگەلێکی زۆری لەدژ باس دەکرێت، بەڵام لەو بڕوایەدام کە تا ئێستاش دیالیکتیکی هیگل لوتکەیە. بێگومان سێکوچکەکانی مارکس و ئەنگلس لایەنی دیالیکتیکیان هەیە. بەڵام باسێکی بەهاداری سێکوچکەیی دیالیکتیکی راست لەخۆوە ناگرێت.

پەیوەست بە بابەتەکەمان گرنگترین هەڵەی دیاریکردنی خودو ناوەرۆک لەدژایەتی بۆرژوازی — پرۆلیتاریادا ئەنجامدراوە. بێگومان دژایەتی بۆرژوازی - پرۆلیتاریا بوونی هەیە. بەڵام ئەو دژایەتییە وەک مەزنەندەکانیان پێکنەهاتووەو کاری نەکردووە. بەڵام دژایەتی ئەو ناکۆکیەی سەرمایەداری لەبوون و کۆدەماری کۆمەڵگادا رێگای لەپێش کردۆتەوە ناکۆکی سەرمایەداری - پرۆلیتاریا نییە. تەنانەت ئەگەر ناکۆکیەکی بەمجۆرە لەنێوانیاندا جێگای باسیش بێت بەڵام ناکۆکیەکی سەرەکی نییە. لەوەش گرنگتر، سەرمایەداری ئەو پۆتانسێلەی نییە وەک مەزنەندە دەکرێت بەتەنیا سەربەخۆ کۆدەماری کۆمەڵگا بکات بە سەرمایەداری. تەنیا سەرمایەداری سەربەخۆ ئەو هێزی نییە. هەروەها کۆمەڵگا هەبوونێکی لەو جۆرە نییە کە لەمیانەی سیفەتی وەک سەرمایەدار، ئیسلام، کرستیان و...هتد. چۆنایەتیەکەی بگۆڕێت. بەکورتی بەو سیفەتەی سروشتی دووەمە کۆمەڵگا هەبوونی خۆی دەپارێزێت. ئەگەر هەندێک سیفەت لەقۆناخە جیاوازەکانی مێژوودا وەک تاکانە کاریگەریش

بووبن مانای ئەوە نییە کە ئەو کۆمەڵگایە بەتەواوی تاقانەیەکی پەتی گشت تاکەکانە، وەک چۆن لالەیەکی (خوزام) رەش نابێتە کۆی لالەکان.

وەک فاکتەرێک سەرمایەداری تەنیا پرۆلیتاریا لەپێکهاتەی کۆمەڵگادا نائافرێنێت؛ بەڵکو شێوەی پرۆلیتاریا لەهەبوونی کۆمەڵگادا کەمەندکێش دەکات. بەڵام لەو راکێشانەدا لەزۆربەی حاڵەتەکان بەرامبەر ئەو کۆمەڵگایە لەگەڵ پرۆلیتاریا لەرێککەوتندایە. ئەمە ئەو بوویەرو دیاردەیە کە مارکسیستەکان بەرێکەوتنی کاتی پرۆلیتاریا و بۆرژوازی بەرامبەر بەکۆمەڵگای دەرەبەگایەتی ناوی دەبەن. بەڵام ئەوە باسێکە بناخەی هەڵەکانیان پێکدێنێت. لەراستیدا لەژێر ناوی قەرەبوویێک کە بە کرێ ناو دەبرێت سەرمایەداری لەژێر ناوی پرۆلیتاریا لەناو کۆمەڵگادا سیخورِ کۆدەکانەوەو دروستیان دەکات. رێککەوتن بەرامبەر کۆمەڵگای کۆن لەئارادا نییە، بەڵکو خیانەتێک جێگای باسە. لەراستیدا لێرەدا قۆستنەوەی سەمەرەترین سروشتی گەردوون جێگای باسە کە کۆمەڵگایەو خاوەن ژیرییەکی نەرمە، وەک بەکارهێنانی ژنێک بەکارهێنانێکی سەردارانە لەئارادایە. لەمیانەی بەکارهێنانی میراسی هەزاران ساڵەی سەردارەکان (رەب، پاشا، زۆردارەکان) یش سەرمایەداری بەشێوەیەکی هەمیشەیی و سیستەماتیک لەژێر ناوی قازانجەوە بەها ژیانیەکانی تەواوی کۆمەڵگا دەسووێت. لەژێر ناوی قازانج تەنیا بەها ئیستغلال ناکرێت، بەڵکو سەرجەم بەهاکانی کلتووری ماددی و مەعنەوی کۆمەڵگا دەقۆزرێتەوە. لەو دۆخەدا سەرمایەداری خودی ئەو پێکهاتە پاوانگەرایەیە کە هەرە زێدە بەشێوەیەکی سیستەماتیک و هەمیشەیی کۆمەڵگا دەکاتە دژی خۆی و دەیچەوسێنێتەوە. لەم چوارچێوەیەدا سەرقاڵی کۆمەڵگایە و کاریگەری لەسەر هەیە. بەڵام لەمیانەی ئاواکردنی سیستەمی حوکمڕانی خۆی، خاوەنە کۆنەکانی دەسەڵات، فینانس و بازرگانی لەژێر رێبەرایەتی خۆیدا دەتوێنێتەوەو لەرێگای رۆشنبیرانەوە هەژموونگەرایی ئایدیۆلۆژی ئاوا دەکات و بەمجۆرە خۆی بەهێز دەکات و قۆستنەوە پەیرەو دەکات. ئەگەر دەمانەوێت هەبوونی کۆمەڵگا بە گوزارشتێکی زانستی بگەیەنین، ئەوا تێگەیشتنی ئەو ماهیەتەی شێوە و ناوەڕۆکی پەرەسەندنی پێکهاتەی

"کۆمەڵگای سەرمایەداری" پێویستیەکی دەستنیشانکردنی راستە. ئەگەر کارەکتەر و ماهیەتی بونیاد و رۆڵەکەی ئەو قۆناخە نەبینین ئەوا پەیڕەوکردنی (زانستگەرایی) بەناوی کۆمەڵگا لە (پۆزیتیڤیزم) زیاتر دەرباز نابێت. تاوەکو کردار و مامەڵەی سەرمایەداری لەسەر کۆمەڵگا بەشێوەیەکی راست دەستنیشان نەکرێت هەنگاونان بۆ ئۆبژەکتیڤیستی پۆزیتیڤیستی قەبا مانای هەڵەیەکی گەورەیە کە بەناوی زانستەوە لەبەرامبەر زانست، بەناوی زانستی کۆمەڵگاشەوە بەرامبەر کۆمەڵگا ئەنجامدەدرێت. کاتێک کۆمەڵگا بابەتی باس بێت، بەهۆی خەملاندنی ئەنجامە مەترسیدارەکانی پێویستی بەبیرکردنەوەیەکی زیاتر هەیە. کاتێک لەژێر رۆشنایی ئەو شیکارە کورتەی سەبارەت بابەتەکە سەیر بکرێت روون دەبێتەوە کە ناکۆکی دەرهەق بەسەرمایەداری ئەو ناکۆکییە لاوەکییە نییە کە لەنێوان سەرمایەداری - پرۆلیتار لەئارادایە، بەڵکو ئەو ناکۆکیەیە کە لەنێوان سەرمایەداری - کۆمەڵگا و سەرمایەداران — کۆمەڵگاگەراکان پێکهاتووە و ناکۆکی سەرمایەدار - پرۆلیتاریش لەخۆوە دەگرێت. کاتێک یەکێک لە مارکسیستە ژیرەکان (رۆزا لوکسمبورک) دەڵێت: "هەرگیز کۆمەڵگایەکی سەرمایەداری ساف ئاوا نابێت" و لەخاڵێکی سەرەکیدا مارکس رەخنە دەکات، لەبنەڕەتدا ئامانجی باسکردنی پرۆسە و قۆناخی ئەو پێکهاتەیە. ئەگەر مسۆگەر بمانەوێت باسی سۆسیالیزمی زانستی (ئەگەر بڵێین زانستی کۆمەلایەتی راستترە) بکەین، ریفۆرمێکی رادیکاڵی زانست و ئەنجامدانی شۆڕشەکەی سەرەکیترین ئەرکە.

دەشێت لەمانایەکی بەرتەسکدا باس لەناکۆکی سەرمایەداری — کۆمەڵگای ئیکۆنۆمیک بکرێت. ئەگەر تەگبیر وەربگیرێت، بەبێ رێخۆشکردن لەپێش هەڵەی جددی دەشێت بەرەو هەندێک ئەنجامی گرنگ و راستمان ببات. لەبەشەکانی پێشووتردا بەگرنگییەوە ئاماژەم بەو خاڵە کردبوو کە فرناند براودل ئابووری لەگەڵ بازاڕ هاوواتا دەکات، دەڵێت سەرمایە سوود لەجیاوازی نرخی بازرگانی مەودا درێژی ئەو بازاڕانە دەبینێت و قازانج بەدەست دێنێت، لەو سۆنگەیەوە باسی پێگەیەکی سەرمایەداری کردبوو ئەویش دژە بازاڕە. هەروەها جەختم لەسەر ئەوەش

کردبوویەوە کە ئەو باسە ناتەواوەو لەمیانەی هەڵسەنگاندنێکی لەجۆری؛ سەرمایەداری تەنیا دژە ـ بازاڕ نییە (ئەگەر بازاڕ لەگەڵ ئابووری هاوتا ببینرێت) بەڵکو دژە ـــ ئابووریشە، پێویستی تەواوکردنیم روون کردبوویەوە. دەشێت دژە ـــ کۆمەڵگاگەرایی هەژموونگەرایی سیستەمی سەرمایەداری لەمیانەی شەڕەکانی داگیرکاری و ئیمپریالیستیانەی ڕێخۆشکەری بوو، ئافراندنی فاشیزمی دەوڵەت ـــ نەتەوە، وێرانکردنی ژینگە لەسەر بنەمای ڕێخۆشکەری ئیندوستریالیزم، بونیادە قەیراناویەکەی و قووڵکردنەوەی ئەوپەڕگەری جەمسەرە کۆمەڵایەتیەکان بەشێوەیەکی راشکاوانە پێناسە بکرێت. ئاشکرایە کە ئەوەی دژە ـ کۆمەڵگا بێت بەزیادەوە دژە ـــ ئابووریش دەبێت. چونکە سەرمایەداری چەوسانەوەی گونجاوی "یاسای زۆرترین قازانج" لەمەیدانی کۆمەڵگای ئابووریدا جێبەجێدەکات. دژە ـ ئابووریگەرایی سیستەمی سەرمایەداری لەمیانەی ئەزموون و تاقیکردنەوەکانی بەدرێژایی مێژووەکەی لەهەر بوارێکدا سەلمێنراوە. بەو سیفەتەی پێکهاتەیەکی مێژوویە لەجیاتی ئەوەی بەشێوەی ناکۆکیەکی لاوەکی لەگەڵ پرۆلیتاریا مانادار بکرێت کە کۆیلەی خۆیەتی، ئەگەر سەرمایەداری لەسەر کۆمەڵگا و کۆمەڵگای ئابووری مانادار بکرێت کە بریتییە لەتوانستی کلتووری ماددی و مەعنەوی لەراستیدا نەک تەنیا مێژووی "سەرمایە" بەڵکو دەشێت "مێژووی سەرمایەداری"ش بەڕاستی بنووسرێت.

ئەو بزووتنەوە سیاسی و ئایدیۆلۆژیانەی قوماشی ئازادییان لە کۆیلەکان ـــ پرۆلیتاریاشی لەناودا ـــ ەوە چنیوە ئەو خاڵەی لێی تێنەگەیشتبوون؛ پاوانەکانی هێزو چەوسانەوە کۆیلە دەکەن بەبوونەوەرێکی پاشکۆ و سێبەری خۆیان. ئەو پاوانانە کاتێک کۆیلە دەئافرێنن لەرێگایەوە پێکهاتە کۆمەڵایەتیەکانی خۆیان ئاوا دەکەن؛ وەک فاکتەرێک نایانخەنە سەر پێکهاتەی خۆیان کە بیان کڕیننەوە. چینێکی کۆیلە لەمێژوودا جێگای باس نییە کە بەو مانایە سەرکەوتنی بەدەست هێنابێت. سپارتاکۆسیش سەرکەوتنی بەدەست هێنابوایە لەئاواکردنی خانەدانێکی کۆیلەداری نوێ بۆ رۆما بەولاوە تێپەڕی نەدەکرد. تەنانەت

دژە ــ سەرمایەدارییەکی خاوەن بانگەشەی وەک لینین یش لەمیانەی NEP (سیاسەتی ئابووری نوێ) ناچاربوو سەرمایەداری پراکتیزە بکات. راستیەکی دیکەی لەقەیرانی رۆژی ئەمڕۆماندا ئاشکرا بووە و سەلمێنراوە؛ ئەو گروپانەی بەچینی کرێکار ناودەبرێن لەپێناو بەردەوامبوونی سەرمایەداری پیشەسازی (جۆرەکانی دیکەی سەرمایەداریش) لەپیشاندانی هەوڵ و کۆششی خۆبەخشانە دوودڵیان نەکردووە. ئەوەی زیانیشی بەرکەوتووە بەشێوەیەکی گشتی شانبەشانی کۆمەڵگای ئابووری سەرجەم بەهاکانی کۆمەڵگابووە. کارەکتەری تاکخوازی سەرمایەداری زیاتر ئەو راستییە دەسەلمێنێت. لەسەرجەم ئەو بوارە کۆمەڵایەتیانەی لەسەر بنەمای دژە ـ کۆمەڵگا بۆ کۆمەڵەی تاکە کەڵەکە بووەکان گۆڕاوە لەدەرەوەی گروپێکی پاوانگەرایی ئۆلیگارشی جەمسەری سەروو، دۆخێک جێگای باسە کە ناوەڕۆکی کۆمەڵگا نەماوە. هەرچی زۆربەی خەڵکەکەیە، تەنانەت لەوەش بێبەشکراون کە وەک کۆمەڵی بێکاران بەشێوەی کۆیلەی کرێ خۆیان بفرۆشن. ئەوانەی کۆیلەی بەکرێشن لەکەمبوونەوەی رێژەی کرێکەیان رزگاریان نابێت. ئاشکرایە ئەمە تابلۆیە راستیەکەیە.

ناشێت رۆڵی بزووتنەوە چینایەتییە بەرتەسکەکان لەو پەرەسەندنانەدا نکۆڵی لێبکرێت. لەو بارەیەوە بزووتنەوەکانی سۆسیالیزمی بونیادنراو و سەندیکاگەرایی خاوەن پراکتیکێکی سەلمێنراون. بەکورتی ئەگەر هەڵسەنگاندنەکەمان سەبارەت بەکۆیلە چاوێکی پێدا بخشێنرێتەوە و لەجیاتی فاکتەری ناکۆکی سەرەکی، وەک فاکتەری لاوەکی ناکۆکیەکانی کۆمەڵگا ببینرێت بەرەو ئەنجامێکی راسترمان دەبات. دیالیکتیکی کۆیلە سەرەکیترین ئەرکی زاناکانی کۆمەڵگا کە چاوەڕوانی سەرلەنوێ هەڵسەنگاندن و شیکارە. دیالیکتیکی کۆمەڵگا زانستێکی سەرەکی حەقیقەتی کۆمەڵگایە. وەک چۆن جێبەجێکردنێکی راست و تەندروست گرنگ و بایەخدارە، بەرلەهەموو شتێک پێویستی بەشیکاری تۆکمە و بەرکەماڵ هەیە.

هەروەکو لەگشتیدا (گەردوونی) لەناو تایبەتبوون (تاقانەیی) ی خۆشیدا وێرانکاری سەرمایەداری لەسەر کۆمەڵگای خۆرهەلاتی ناوین

لەئاستێکی زۆر بەرزدایە. وەک سیستەم هاتنی فەتحکارانەی بۆ لەسەر بنەمای دژە ـ کۆمەڵگاو دژە ـ ئابووری ناوچە لەشێوەی ناوەندی ـ سەرەکی، داگیرکردنی مەترەپۆل و وڵاتانە. لەبەرئەوەی لەسەردەمی خاچپەرستەکانەوە شارستانی هەژموونگەرایی لەخۆرهەڵاتی ناوینەوە خزاندووە یان گواستۆتەوە ناچارە زۆر بەبەرنامە بەڕێوە بچێت و خۆی بونیاد بنێت. لەپای زۆرترین قازانجی پاوانەکانە. لەجیاتی چارەسەرکردنی پێداویستییە سەرەکیەکانی کۆمەڵگا گرنگی بەو سەرچاوە، ڕێساو پەیڕەوانە دەدات کە قازانج بە بەرزترین ئاست دەگەیەنن. بێگومان لەجیاتی سەرمایەداری میللی یان نامیللی، باسکردنی میللیگەراییەکەی فێرکەر و ئەزموون بەخشترە. پێویستە لەقووڵاییدا تێبگەین کە ئەو دیاردەیەی بەسەرمایەداری میللی ناو دەبرێت لەناوەرۆکدا خەسترین نامۆبوونی دەستەجەمعییە. خودی سەرمایەداری وەک پێکهاتە نامۆبوونە. لەرێگای ئایدیۆلۆژیای نەتەوەگەرایی و میللیگەرایی ئامرازگەلێکی ئایدیۆلۆژین کە بەگشتی بۆ پەردەپۆشکردنی پاوانگەرایی بەتایبەتیش بۆ پەردەپۆشکردنی پاوانی سەرمایەداری و هەژموونگەراکردنیان داهێنراون.

لەبەرئەوەی خۆرهەڵاتی ناوین شوێنگەی شارستانی ناوەندی پێنج هەزار ساڵە بووە لەسەرجەم هێزە پاوانگەراو پاوانەکانی چەوسانەوە نامۆ نییە: پاوانەکانی سەرمایەشی لەناودا. بەڵام ئەو زەمینەیان بۆ نەڕەخساوە رۆڵی سەرەکی ببینن، ئەو دەرفەتەیان نەبینیوە. هەڵسەنگاندنی سەرمایەداری ئەوروپا وەک نوێبوونەوەیەک بۆ خۆرهەڵاتی ناوین شتێکی بێ مانایە. ئەو شتەی نوێیە وەک سیستەمێکی سەرەکی و فەتحکار هاتۆتە ناوچەوە. لەکاتێکدا سەدوپەنجا ساڵی یەکەمی ئەو هاتنەی کە نزیکەی دووسەدەیە بەردەوامە لەسەر بنەمای سەرمایەداری بازرگانی و دراوی بووە، لەدوا قۆناخی خۆیدا پیشەسازی خێرابووە. بە بەراورد لەگەڵ کۆمەڵگاکانی خۆرئاوا فەرمانڕەوایەتیەکی رووکەشانە جێگای باسە. سەرمایەداری لەمیانەی رێککەوتنی لەگەڵ هێزە نەریتی و پاوانەکانی چەوسانەوە درێژە بەهەژموونگەرایی خۆی دەدات. ئەوەی لەخۆرهەڵاتی ناویندا زاڵە سیستەمی هەژموونگەرایی سەرمایەداری

تەوەرەی ئەوروپا - ئەمریکایە. مێژووی درێژخایەنی شارستانی خۆرهەلاتی ناوین و هەبوونە بەهێزەکەی کۆمەڵگای کۆن (جڤاتەکانی قەبیلە، عەشیرەت و مەزهەب) وایکردووە هەژموونگەرایی تەوەرەی رۆژئاوا پشت بەبناخەی لاواز ببەستێت. لەبەر ئەو واقیعە ناوچە ئەڵقەی لاوازی سیستەمە.

کاتێک کۆمەڵگای ئابووری وەک دژە سەرمایەداری دەستنیشان دەکەین ئەنجامی گرنگ و بایەخداری هەیە.

١ - پێویستە ناکۆکی وەک ناکۆکی نێوان کۆمەڵگای ئابووری - سەرمایەداری مایەی تێگەیشتن بێت نەک نێوان سۆسیالیزم ـــ سەرمایەداری. کۆمەڵگای ئابووری سەرجەم ئەو هێزە ئابوورییە کۆمەڵایەتیانە بەبنەما دەگرێت کە کاریگەری نەرێنی ڕێککەوتنی پاوانگەراییان لەسەرە. لەکاتێکدا ئابووری سۆسیالیستی هێزە ئابووریەکانی هەلومەرجی مۆدێرن بەبنەما دەگرێت، کۆمەڵگای ئابووری هێزە نەریتیەکانی ئابووریش لەخۆوە دەگرێت. لەوەش گرنگتر ئەو ئابوورییەی سروشتییە و نەبۆتە بازاڕو کاڵا و بەهای بەکارهێنانی هەیە دەکەوێتە چوارچێوەی کۆمەڵگای ئابوورییەوە. بەتایبەتیش ڕەنجی ژنان و منداڵان لەکۆمەڵگای ئیکۆنۆمیکدا زۆر بەربڵاوەو بەهای بەکارهێنان بەرهەمدێنێت. دابەزاندن و بچووککردنەوەی ئابووری بۆ بەرهەمهێنانی کاڵا لەپێناو سەرمایەداری، هەڵوێستێکی زۆر بەرتەسکی ریال سۆسیالیستەکانە. هەڵسەنگاندنی ئابووری وەک چالاکیەکی سەرەکی سەرمایەداری گەورەترین هەڵەیانە. خزمەتێکی لەوە باشتر بۆ سەرمایەداری جێگای باس نابێت. لەبواری تێکدانی ئابووریدا لەوانەیە سەرمایەداری ئەکتەری سەرەکی بێت، بەڵام نابێتە فاکتەرێکی سەرەکی بونیادنان.

٢ - پێشترئاماژەمان بەو خاڵە کردبوو وەک هەبوونی کۆمەڵایەتی ناکۆکی بۆرژوازی ـ پرۆلیتاریا سەرەکی نییە بەڵکو ناکۆکییەکی لاوەکییە. ناکۆکی کۆمەڵایەتی لەنێوان پاوانگەراکان و تەواوی کۆمەڵگای دەرەوەی ئەواندایە. ئەو جیاوازییە سەبارەت بەتێگەیشتنی سروشتی تێکۆشانێکی

دیموكراسیخوازی، یەكسانی و ئازادیخوازی كۆمەڵگا گرنگە. لەمیانەی ئەزموونی سەدوپەنجا ساڵەی سۆسیالیزمی بونیادنراو ساختەكاری و دروستكراوی ململانێی بۆرژوازی ـ پرۆلیتاریا ئاشكرا بووە. هیچ كاتێك خزمەتكاران (چینە بەكۆیلەكراوەكان) هێزێكی ئایدیۆلۆژی - سیاسی ئەوتۆیان بەدەست نەهێناوە كە سەردارەكانیان دەرباز بكات. وەک پێكهاتەش ئەو بەهرەو توانایەیان نییە. تەنیا كاتێك دۆخی خزمەتكاری رەت بكەنەوە دەبن بەخاوەن بەهرەو توانا، لەو حاڵەتەشدا خزمەتكارنین. بەئامانجی تێگەیشتنێكی راستی تێكۆشانی كۆمەڵایەتی لەسەردەمی مۆدێرنیتەدا جیاكردنەوەیەكی راست لەنێوان پێكهاتە پاوانگەرایی و ناپاوانگەراكان و لەسەر ئەو بنەمایەش سەنگەرگرتن، بەرخودان و ئامادەكردنی بونیادە كۆمەڵایەتیەكان گرنگەو ژیانییە.

٣ ـ لەسەر بنەمای ئەو دوو جیاوازییەی سەرەوە دەشێت ناوی جیاواز لەو كۆمەڵگایە بنرێت كە بەرامبەر "كۆمەڵگای سەرمایەداری" بونیاد دەنرێت. ئەوەی لێرەدا گرنگە ناو نییە ناوەڕۆكە. وەک چۆن دەشێت ئەو كۆمەڵگا نوێیە بەكۆمەڵگای سۆسیالیستی دیموكراتیک ناو ببرێت، لەوانەیە كۆمەڵگای دیموكراتیش ناوێكی باش بێت. تەنانەت لەچوارچێوەی دژە ـ سەرمایەداریدا دەشێت بەكۆمەڵگای ئیكۆنۆمیک یش ناو ببرێت. ئەوەی گرنگە بونیادێكی ئابووریو كۆمەڵایەتییە كە لەژێر حوكمرانی پاوانگەراییدا نییە. پێناسەكردنی چالاكیی ئابووری وەک ئابووری كاڵای گرێدراوی بازاڕ دەشێت تارادەیەک راست بێت. ئابوورییەكی زەبەلاحیش جێگای باسە كە ناكەوێتە چوارچێوەی پۆلێنی كاڵاو بەهای بەكارهێنانی هەیە. ئەمە ئەو بەشەیە كە پێویستە لەئابووری كۆمەڵگا دەركی پێبكرێت. بچووككردنەوەی ئابووری بۆ چالاكیگەلێک كە تەنیا قازانج بەدەست دێنێت درۆیەكی میتۆلۆژی ئابووری سیاسی سەرمایەدارییە كە ناوەڕۆكە راستەقینەكەی ئابووری دەشێوێنێت. جیاوازیەكانی لەجۆری ئابووری سەرمایەداری، ئابووری میللی، ئابووری دەوڵەت، ئابووری بازرگانی، ئابووری فینانس یاخود پیشەسازی، ئابووری گوند و كشتوكاڵ یاخود ئابووری شار و جیهانگیری هێندە راستی

پیشانئادەن. جیاوازیەکانی ئابووری تایبەت و هاوبەشیش دروستکراون. کاتێک دەڵێین ئابووری بازاڕ و بەهای بەکارهێنانە لەپێناسەیەکی واقیعی نزیکترە. لەکاتێکدا بەر لەمێژوو ئابووری تاکە پێوانەی پەسەند کراوی بەهای بەکارهێنان بوو، ئابووری ئالوگۆڕی بازاڕیش زیاتر لەسەردەمی مێژوودا بەربڵاودەبێت. هەرچی بەکاڵاکردنی زۆربەی زۆری بەهاکانی کۆمەڵگایە لەلایەن مۆدێرنیتەی سەرمایەدارییەوە ئامانجی قازانج و قۆستنەوەیە: دیاردەیەکی نوێیە بەڵام شێرپەنجەییە. پەرتەوازبوونی کۆمەڵگا و دۆخی کائۆس و قەیرانی بەردەوامی سەرچاوەی خۆی لەو واقیعە وەردەگرێت. سەدان هەزار ساڵ جۆری مرۆڤ تەنیا لەتەوەرەی بەهای بەکارهێنان ئاشنای ئابووری بووە.

پێش مێژوو و دوای مێژووش کۆمەڵگای خۆهەلاتی ناوین چانسی پێشەنگایەتیکردنی هەردوو بەهای ئابووری هەبووە. دەزانێت ئابووری چییە. ئەو شتەی لەتێگەیشتنیدا زەحمەتی دەبینێت جینۆسایدکردنی ئابووری راستەقینەو ئەو کارەساتانەیە کە شەمشەمە کوێری بەناوی سەرمایەداری لەژێر ناوی ئابووری بەسەریدا باراندوە؛ جینۆسایدە راستەقینەکانی ئابوورییە. هەبوونی سەرمایەداری مەرجێکی دەست لێبەرنەدراوی ژیانی ئابووری نییە بەڵکو بەلایەکە، تەنانەت شێرپەنجەکەیەتی. تەنیا ئەو بزاوت و رەفتارانەی شیکاربکرێت کە لەبوارەکانی پەترۆڵ، گازی سروشتی، ئاو و ئۆتۆمبێل بەرهەمهێنان ئەنجامبدرێت کە ژینگە وێران دەکات، کۆمەڵگا نقوومی شەڕەکات و ئامانجیان بەدەستهێنانی قازانجی زیاترە ئەو واقیعە باشتر مایەی تێگەیشتن دەبێت. هەروەها دۆخی بێکاری، بێ پیشەیی، کۆچبەری و کۆمەڵە بێ خێزانەکان کە نیوەی زیاتری کۆمەڵگا دووچاری هاتوون گەورەیی کارەساتەکە روونتر دەکاتەوە.

لەدۆخێکی بەمجۆرەدا دژە ـ سەرمایەدارێتی بەر لەهەموو شتێک پێویستی بە دژە ـ پاوانگەرایی هەیە. ئەمەش کۆمەڵگایەکی دیموکرات، سۆسیالیست (پێویستە ئەو زاراوە وەک جڤاتگەرایی دەرکی پێبکرێت) و یەکسان ـ ئازاد لەگەڵ خۆیدا دێنێت. سەرلەنوێ دۆزینەوەی کۆمەڵگا

لەژێر ئەو سیفەتانەدا جێگای باس نییە. هەزاران ساڵ بەر لەئێستا کۆمەڵگاکان بەشێوەی جڤات (خێزان، قەبیلە، مەزهەب، عەشیرەت، نەتەوە) لەئارادا بوون. ئەوەی پێویستە بکرێت، لەهەلومەرجەکانی مۆدێرنیتەی سەرمایەداریدا پاراستنی ئەو جڤاتانە بەگوێرەی هەلومەرجەکانی تازەگەری دیموکراتی بگونجێنرێت، تەنانەت سەرلەنوێ بونیاد بنرێتەوە. ئەلتەرناتیفی تازەگەری دیموکراتی کۆمەڵگای جڤاتە دیموکراتییە دژە ـ پاوانگەراو دژە ـ سەرمایەداری، کۆمەڵگای ئیکۆنۆمی و کۆمەڵگای سۆسیالیستی دیموکراتیک لەخۆوە دەگرێت. دووبارەی دەکەمەوە ئەوەی گرنگە زیادبوونی ناو نییە، بەڵکو ناوەڕۆک و خودی پێکهاتەکەیە. یەکلاکردنەوە و زەلالکردنی ئەرکی لەپێشینەیی بەرنامەی تازەگەری دیموکراتییە. کۆمەڵگاکانی خۆرهەڵاتی ناوین لەو هەڵوێستە نامۆ و بێ ئاگا نین. ئەوەی لێرەدا جێگای باسە؛ ئەو سروشتە کۆمەڵایەتییەی هەزاران ساڵە تێیدا دەژین بەگوزارشتێکی زانستی گەیەنراوەو پێشکەشیان دەکرێت. خۆی لەئاوێنەی زانستدا ببینێت و لەمیانەی ئیرادەی ژیانی ئازاد خۆی بەڕێوە ببات.

پێویستە جڤاتەکانی قەبیلە و عەشیرەت بچووک نەبینرێن. تاوەکو کۆمەڵگا لەئارادا بێت ئەمجۆرە فۆرمە کۆمەڵایەتیانە هەر جێگای باس دەبن. دەشێت ڕێکخراوەکانی کۆمەڵی مەدەنی ڕۆژگاری ئەمڕۆشمان وەک عەشیرەت و قەبیلەی مۆدێرن هەڵسەنگێنرێن. دەشێت پەیمانگا و ئەکادیمیا زانستیەکانیش وەک مەزهەبە نەریتیەکانی ڕۆژی ئەمڕۆ ببینین و ماناداریشە. نەتەوەکان تەنیا بەشێوەی دەوڵەت ـ نەتەوە نین، بەڵکو پێویستە بەشێوەی کۆمەڵگا فرەزمان، فرە ئەتنیکی، فرەئایینی و وڵاتی ببینرێت و بونیاد بنرێن. بەگشتی پاوانگەرایی، بەتایبەتیش پاوانگەرایی سەرمایەداری و مۆدێرنیتەی سەرمایەدارییە کە لەهەناوی خۆرهەڵاتی ناوین ئەو شێوە جڤاتانەی دووچاری بێچارەیی و شەڕێکی خوێناوی کردووە. تازەگەری دیموکراتی ئەو جڤاتانە وەک شێوەو فۆرمی کۆن و بەسەرچوو لەخۆوە ناگرێت بەڵکو بەپێچەوانەوە دیموکراتیزەیان

دەکات و وەک بەهایەکی کۆمەڵایەتی سەرەکی لەخۆیانەوە دەگرێت کە پێویستە سوود لەهەبوونەکەیان ببینرێت.

خەڵکی بەدەوی نەتەوەی عەرەب، خەڵکی تورکمانی نەتەوەی تورک، خەڵکی کرمانجی نەتەوەی کورد بەهۆی بەرتەسکبوونەوەی بەردەوامی بونیادی عەشیرەت لەکۆمەڵگاکانی خۆرهەڵاتی ناوین و نەمانی ناوەڕۆکی قەبیلە هەویری سەرەکی دیموکراتیزەبوون و کۆمەڵگای دیموکراتیکن. بەر لەهەموو شتێک پێویستە بزووتنەوە ئایدیۆلۆژی و سیاسیە دیموکراتیەکان ئەو توێژانە ڕێکخستە بکەن. چونکە ئەو توێژانە یەکێکن لەهێزە سەرەکیەکانی تازەگەری دیموکراتیک. هەروەها بەو سیفەتەی شوێنگەی سەرەکی ئایینە تاکخوداییەکانە هەڵسەنگاندنی سەرجەم مەزهەبەکان وەک گەنجینەی کولتووری ناوچەکە بەتایبەتیش ئێزیدی، عەلەوی، سوریانی، ئەرمەنی، هێلینی و یەهوودیەکان و بونیادنانەوەیان بەشێوەی پەیمانگا و ئەکادیمیا، هەروەها لەژێر هەر هەلومەرجێکدا دانانیان بەدەرفەتی یەکسان و ئازادانەی ژیانی دیموکراتیانەی ئەندامەکانیان و هەڵسەنگاندنیان لەچوارچێوەی تازەگەری دیموکراتیدا ئەرکێکی مێژوویی - کۆمەڵایەتی دەست لێبەرنەدراوە.

لەمیانەی دوورخستنەوەی کۆمەڵگا گەورەکانی نەتەوەکانی عەرەب، تورک، کورد و فارسی ناوچە لەنەخۆشیەکانی میللیگەرایی و نەتەوەپەرستی و ڕزگارکردنیان لەتەڵەزگەی دەوڵەت ـــ نەتەوە و ئاواکردنی نەتەوەی نەتەوەکان (نوژەنبوونەوەی دیموکراتیانە و مۆدێرنی ئوممەت) لەچوارچێوەی تازەگەری دیموکراتیدا کە شانبەشانی تایبەتبوونەکانیان گەردوونیبوونیشیان لەخۆوە دەگرێت ئەرکێکی کۆمەڵایەتی ـ مێژوویی بنەڕەتییە. لەچوارچێوەی تازەگەری دیموکراتیدا ئەنجامدانی ریفۆرمێکی ڕاستەقینە سەبارەت بەئیسلام و ئوممەتەکەی و دابڕاندنی لەقۆستنەوە خوێناوییە فەتحکار و دەسەڵاتگەرا (ئیسلامی سەڵتەنەت) یەکەی و نوێکردنەوەی بەشێوەی ئوممەتێکی ئازادیخواز، یەکسان و دیموکراسیخوازی ئەودیو دەوڵەت ـ نەتەوە یەکێکە لەئەرکە هەرە پیرۆزە کۆمەڵایەتی ـ مێژووییەکان.

لەدۆخێکی بەمجۆرەدا تەنیا دەرفەتی تازەگەری دیموکراتی ــ کە بەهاکانی دیموکراتی، ئازادی، یەکسانی بەبنەما دەگرێت ــ و کۆڵەکە مێژووییەکەی شارستانێتی دیموکراتی جێگای باس نییە، بەڵکو حەقیقەتی ژیانی ئازادی هەبوونی کۆمەڵگایە. چونکە حەقیقەت مانای گوزارشتی ئازادی هەبوونی کۆمەڵگایە. ئەوەی بۆ بەرجەستەکردنی پێویستە، هەنگاونانی بونیادی زانستیانەی حەقیقەتی زانستی کۆمەڵایەتییە. هەروەکو بەدرێژایی مێژوو روویداوە لەرۆژی ئەمرۆشمان هەر بزووتنەوە و ئایدیۆلۆژیایەک لەچوارچێوەی حەقیقەتەکەیدا خۆی رێکخستە نەکردبێت و بەئاراستەی مەرجی زەرورەتی ژیانی ئازاد بەرێوە نەچێت سەرکەوتوو نابێت. لەمیانەی بەیەکگەیاندنی مێژووی کۆمەڵگای خۆرهەلاتی ناوین ــ کە بەقەدەر مرۆڤایەتی کۆنە و پڕ لەمۆزائیکی کۆمەڵایەتییە ــ و بەها کۆمەڵایەتییەکانی تازەگەری دیموکراتیک، بەتایبەتیش وەک قەڵایەک رووبەڕووبوونەوەی هەژموونگەرایی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری کە مەمیلە و خانەیەکی کۆمەڵگا نەماوە زهنیەت و ئیرادەی خۆی تێدا بڵاونەکردبێتەوە، جێبەجێکردنی بەرگری خۆیی و هەنگاونان بۆ سەرلەنوێ بونیادنان پیرۆزترین ئەرکە.

ب ـ کۆمەڵگای ئیکۆلۆژی ـ ئیکۆنۆمیک بەرامبەر بە ئیندوستریالیزم

ئەو زاڵبوونە پیشەسازییەی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری لەمیانەی شۆرشی پیشەسازیەوە لەسەر ئابووری ئاوایکرد تەنیا بەشێوەی هەژموونگەرایی ئابووری بەدینایەت، بەڵکو کاریگەریەکی زۆری لەسەر پاوانگەرایی ئایدیۆلۆژی و پاوانگەرایی دەسەلاتیش دەبێت. بەگوتەیەکی دیکە تەنیا لەچوارچێوەیەکی بەرتەسکدا سنووردار بوون بەشیکارکردنی ئیندوستریالیزم وەک لۆژیکی تەکنۆلۆژی، رێخۆشکەرە بۆ هەڵەی سەرەکی لەمەڕ بچووککردنەوەی سەرمایەداری بۆ ئابووری. ئەو رۆڵەی سەرمایەداری بە ئیندوستریالیزمی داوە بەگشتی داڕووخاندنی کۆمەڵگای ئیکۆنۆمیک، بەتایبەتیش پووچەڵکردنەوەی کۆمەڵگای گوند ـ کشتوکاڵە. لەم بارەیەوە ئیندوستریالیزم بەشێوەی پاوانی ئایدیۆلۆژیو پاوانی دەسەلاتەوە دەکەوێتە گەڕو دەبێت بەکردار. کاتێک کۆمەڵگای ئیکۆنۆمیک

هەڵوەشایەوە یاسای زۆرترین قازانجی تایبەت بەسەرمایەداری دەکەوێتە گەڕ. ئەمەش بەشێوەیەکی تێکەڵ لەگەڵ پاوانگەرایی دەوڵەت ــ نەتەوە دەست پێدەکات. تا شیکارکردنی سەرمایەداری لەسەر کۆڵەکە سێکوچکەییەکەی مۆدێرنیتە ئەنجامنەدرێت، ئەوا هەڵەکردن بەناوی زانستی کۆمەڵایەتی و کەموکوڕیەکانی سیاسەتی کرداری دەست لێبەرنەدراون.

ئەو هەرەس و وێرانکارییەی هەژموونگەرایی ئیندوستریالیزم ــ بەگوێرەی یاسای زۆرترین قازانج ــ لەسەر کۆمەڵگای مرۆڤایەتی و ئابوورییەکەی ئافراندوویەتی لەمیانەی کردەوەکانی ئەو دوو سەد ساڵەی دوایی بەپێی پێویست روون بۆتەوە. تەنانەت لەلای خودی زانستیشەوە دەستنیشان کراوە کە ئەو وێرانکارییەی تەنیا بەرزبوونەوەی پلەی گەرمای جیهان رێگای لەپێش کردۆتەوە ساڵ بە ساڵ مەحشەر نزیکتر دەکاتەوە. ئەو زهنیەتانەی بەهۆی شۆڤینیزمی ئیندوستریالیزم چاویان کوێربووە بونیادو پێکهاتەی ئیکۆلۆژییە ژیانییەکەی پێکهاتەی کۆمەڵگا و ئابوورییەکەی نابینێت؛هەر بۆیە زهنە ئیفلیجەکان لەمانای ئەو بونیادە تێناگەن. پەیڕەوکردنی یان جێبەجێکردنی ئیندوستریالیزم لەسەرجەم پێکهاتەکانی کۆمەڵگا و ژیانی ئابووری لەپای هەمیشەییکردنی یاسای زۆرترین قازانج لەتوندوتیژی دەسەڵات مەترسیدارترە.

لەناوەڕۆکدا ئیندوستریالیزم مانای پەیڕەوکردنی پرەنسیپ و رێسای تیۆری ــ کرداریەکانی فیزیا، کیمیا و زیندەوەرزانییە لەسەر کۆمەڵگا بەتایبەتیش لەسەر بونیادە ئابوورییەکەی. ئەمەش نکوڵیکردنی سروشتی کۆمەڵگا لەگەڵ خۆیدا دێنێت کە راستیەکی زۆر جیاوازترە. سروشتی کۆمەڵگا بۆ ماوەیەکی درێژخایەن سیستەمێک هەڵناگرێت کە بەردەوام لەپای بەدەستهێنانی قازانجەوەیە. بەتایبەتیش پەیڕەوکردنی درێژخایەنی رێساکانی سروشتی ئۆبژەکتیف مانای بێناوەڕۆکبوونی کۆمەڵگایە. تاکخوازی سەرمایەداریش ئەو واقیعە دەسەلمێنێت. رێساکانی کاری سروشتی کۆمەڵگا تایبەت بەخۆیەتی. بەشێوەی ئەخلاقی‌و سیاسی کار دەکات. زوو یان درەنگ هەڵوێستی ئیندوستریالیستی میکانیزمی

ئەخلاقی و سیاسی لەناو دەبات. بەرامبەر بە بێکاری، قەیران و جیاوازی رادەبەدەری داهاتی ئابووری بەرپرسیارە. ئەو فاکتەرە سەرەکیانەی ئیکۆلۆژییان ئافراندووە سەرچاوەی خۆی لەو واقیعەی ئیندوستریالیزم وەردەگرێت کە بەکورتی پێناسەکراوە. کۆمەڵگای سەردەمی پیشەسازی ئەگەر ئیکۆلۆژییەکەی خۆی لەهەموو بوار و مەیدانەکانەوە پەرە پێنەدات ناتوانێت بەردەوامی بەژیانی خۆی بدات. هەروەکو چۆن دەستوور بەئامانجی سنووردارکردنی لویاتان (جانەوەری دەوڵەت ـــ نەتەوە) دەکانە، ئیکۆلۆژیاش جانەوەری ئیندوستریالیزم سنووردار دەکات. پێویستە زۆر بەباشی بزانرێت لە قۆناخی بەر لەسەردەمی پیشەسازی لەمیانەی مەعریفەی خۆڕسکەوە ژیانی سەرجەم بوونەوەران - جۆری مرۆڤیشی لەناودا ـــ ئیکۆلۆژیکە. هەرزیندەوەرێکی ئیکۆلۆژیک نەبێت لە لەناوچوون رزگاری نابێت. بێگومان هەر زیندەوەر یان بوونەوەرێک ژیریەکی ئیکۆلۆژی تایبەت بەخۆی هەیە. دەشێت ئەو سەردەمەی پیشەسازیگەرایی تێیدا زاڵە وەک چاخی سەرهەڵدان دژی ژیانی ئیکۆلۆژیش شیکاربکرێت. سەرهەڵدان بەرامبەر بە ئیکۆلۆژیا هەنگاونانە بەرەو قیامەت. ئەو مەحشەرەی هەر لەزووەوە ئایینەکان باسیان کردووە، لەناوەرۆکدا پەیوەندی بە پچڕانی پەیوەندی کۆمەڵگاکان بە ئیکۆلۆژیەوە هەیە.

کۆمەڵگای خۆرهەلاتی ناوین لەبواری خۆگونجاندنی لەگەڵ ژیانی ئیکۆلۆژی رۆڵی پێشەنگایەتی بینیوە. داستانەکانی ئادەم ـــ حەوا و نوح باسی کارەساتە ئیکۆلۆژیەکان دەکەن. لەکلتووری پێخەمبەرایەتیدا ژیانی ئیکۆلۆژی رۆڵی سەرەکی دەبینێت. کاتێک پێخەمبەران ژیانێکی نائیکۆلۆژیانە بەسیفەتەکانی مەحشەر، فیرعەون، نەمرود و نەفرین هەڵدەسەنگێنن رێسایەکی سەرەکی کۆمەڵگایە کە پێویستە ئێستاش پەسەندو پەیڕەوبکرێت. ئەو رێسایانە نەبن بەردەوامبوونی کۆمەڵگاکان دەکەوێتە ژێر هەڕەشە و مەترسیەوە. سەرباری ئەوەی هەزاران ساڵ بەر لەئێستاوە لەکۆمەڵگای ئابووری خۆرهەلاتی ناوین بەکارهێنراوە بەلام نەگەیشتنی ئامرازی تەکنیکی (تەکنۆلۆژی) بەئاستی ئیندوستریالیزم،

گرێدراوی کلتووری مەعنەوی و بونیادە ئەخلاقیەکەی ناوچەیە. سەرهەڵدان بەرامبەر سروشت لەگەڵ سەرهەڵدان بەرامبەر خوداوەند وەک یەک دەبینرێت. کەچی لەکلتووری رۆژئاوادا سەرهەڵدان بەرامبەر سروشت سەرەکیترین پرەنسیپی سەرهەڵدانی فەلسەفەی زاڵبوونە (فەلسەفەی دیکارت) بەسەریدا. بەڵام لەکۆمەڵگای خۆرهەڵاتدا تەبایی و گونجان لەگەڵ سروشت پرەنسیپی سەرەکییە. سەرهەڵدان بەرامبەر بەسروشت و سووربوون لەسەر حوکمکردن و زاڵبوون بەسەریدا گەوهەری هەڵکشانی مۆدێرنیتەی سەرمایەدارییە. ئەو قۆناخەی تێیدا ژیانی کۆمەڵگا لەهەموو بوارەکان بەئاستی بەردەوام نەبوون گەیشتووە.

لەم سۆنگەیەوە نەریتی کۆمەڵگای خۆرهەڵاتی ناوین بەرامبەر بە ئیکۆلۆژیا هەستیارە و لەگەڵیدا تەبایە. ئەو ئەرکەی پێویستە جێبەجێ بکرێت؛ سەرلەنوێ ئاواکردنەوەی کۆمەڵگای ئیکۆلۆژییە بەرامبەر بەهەڵوێستە فەتحکار، لەناوبەرو داگیرکاریەکانی سەرمایەداری و ئیندوستریالیزم. چەکی سەرەکی تازەگەری دیموکراتی: کۆمەڵگایەک و ئابوورییەک بەبنەمادەگرێت کە ناوەڕۆکێکی ئیکۆلۆژییان هەیە. ڕۆڵی مێژوویی ئیندوستریالیزم لەخۆرهەڵاتی ناوین هەڵوەشانەوە و لەناوبردنی کۆمەڵگای کشتوکاڵی نەریتی دەهەزار ساڵەیە. ئابووری و کۆمەڵگای گوند ـ کشتوکاڵ کە تا پەنجا ساڵ بەر لەئێستاش بەشی سەرەکی کۆمەڵگا و ئابووری پێکدەهێنا لەرۆژگاری ئەمڕۆمان بەخێرایی هەڵدەوەشێنرێتەوە، ڕاکێشی ناو ئیفلاس و بێکاری دەکرێت، دووچاری قەرزداری و کۆچبەری دەکرێت. هەڵوەشانەوە، وێرانکردن و لەناوبردن بۆ ئەو دوژمنایەتییە دەگەڕێتەوە کە بەرامبەر ئەو کۆمەڵگایە جێگای باسە. هەروەکو چۆن ئەگەر کۆمەڵگای گوند ـ کشتوکاڵ پەرتەوازە نەکرێت ئەوا ئەو سەرکەوتنانەی سەرمایەداری لەناوچەکانی دیکەی جیهان بەدەستی هێناوە دووبارە نابێتەوە، هەروەکو لەئێستاوە ڕوویداوە دەکەوێتە ژێر هەڕەشەوە (ئەو ترسەی بەرامبەر کۆمەڵگای ئیسلامی لەئارادایە، ئیسلامۆفۆبی).

لەشەڕەکانی هەژموونگەرایی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری و ئیمپریالیزم لەخۆرهەڵاتی ناویندا ئیندوستریالیزم ڕۆڵی سەرەکی دەبینێت. شەڕەکانی

ئاو و نەوتیش نموونەیین. لەداهاتوودا شەڕی ئاو پەرەی پێدەدرێت و چڕدەکرێتەوە. وەرچەرخانێکی سەرمایەداریانە لەبەکارهێنانی زەوییە کشتوکاڵیەکاندا، بوارو مەیدانێکی دیکەی سەرەکی شەڕی داهاتووە. پێویستە دابڕاندنی لادێیی (جووتیار) لە خاک وەک شەڕێک ببینرێت. ئامانجی فەتحی ئەو دوو سەدەیەی دوایی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری بۆ خۆرهەڵاتی ناوین لەناوبردنی کلتووری ئەو ژیانەیە کە کۆمەڵگای کشتوکاڵی پازدە هەزار ساڵی ئافراندوویەتی و رووباری بنەڕەتی مرۆڤایەتی پێکدێنێت. پێویستە لەو واقیعەدا بەدوای جینۆسایدی کلتووریدا بگەڕێین. بەرگریکردن یان پاراستنی کۆمەڵگا مانای ئازادکردن، دیموکراتیزەکردنی و پاراستنی ئەو کلتووره شکۆدارەی ژیانە بەرامبەر جینۆسایدی مۆدێرنیتە. کاتێک مێژووی شارستانی وەک شەڕەکانی پاوانگەرایی شرۆڤە بکرێت، ئەوا بەرگریکردن لەهەبوونی گروپە ئایینی و قەبیلەکان وەک شێوە سەرەکیەکانی هێزی شارستانێتی دیموکراتی باشتر دەرک بەگرنگی و بایەخەکەیان دەکرێت. ئاشکرایە ئەگەر مێژووی شارستانی لەمیانەی دیالیکتیکێکی بەمجۆرە پێناسە و مانابەخش بکرێت، ئەوا شیکارێکی راستتر سەبارەت بەشەڕەکانی ئێستا ئەنجامدەدرێت. ئەو کاتە دەبینرێت کە ئەو شتگەلانەی بەشەڕی مەزهەب و عەشیرەت ناودەبرێن، هەرچەندە چەواشەش کراین، بەڵام مانای بەرگریکردنی کۆمەڵگایە لەهەبوون و ناسنامەی خۆی. ئەو ئەنجامەی لەو باسە تێکەڵەدا هەڵبهێنجرێت؛ ئیندوستریالیزم کە وەک بەرچاوترین ئامرازی رزگاری پیشاندەدرێت لێویاتانی راستەقینەیە.

کاتێک باسی شارستانی و کۆمەڵگاکانی خۆرهەڵاتی ناوین دەکرێت دوو فاکتەری سەرەکی ئیکۆلۆژی بەبیری مرۆڤدا دێت؛ زنجیرە شاخی زاگرۆس ــ تۆرۆس و رووبارەکانی نیل ــ فورات ــ پەنجاب. ئەو کۆمەڵگایەی ئەو دوو سیستەمە بەخێوی کردوون ئێستا بەتراژیدیترین قۆناخەکانی ژیانیاندا دەربازدەبن. میللیگەرایی، ئایینگەرایی، رەوتەکانی کۆمۆنیزم و ریال سۆسیالیزم بەردەوام خۆیان وەک فریادڕەس پێشکەش کردووە. ئەو ئەنجامەی هاتۆتە ئاراوە، دۆخی ئێستا چەندین جار

لەپێشووخراپترە. هەڵبەتە ئەگەر شیکار هەڵەبێت، دەست لێبەرنەدراوە ئەنجامەکەشی بەمجۆرە دەبێت. ئەو ئایدیۆلۆژیا پاوانگەرایانەی دوورو نزیک هەوڵی تێکەیشتنی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری و (ماوەی بونیادی) یان نەداوە کاتێک نۆرە گەیشتە ئیندوستریالیزم وەک بڵێی لەخوداوەندی هاوبەش بەیەکگەیشتوون لەپێشیدا کڕنوش دەبەن. ئایدیۆلۆژیا ئاماژە پێکراوەکان بەجۆرێک ئیندوستریالیزم دەپەرستن کە دڵنیان دەرگای بەهەشتیان بۆ دەکاتەوە(دوای دەوڵەت ـ نەتەوە ئیندوستریالیزم دووەمین سیفەتی خوداوەندی سیکولارە). بەتایبەتی لەرەوشی کائۆسی ئوممەتی ئەو خوداوەندە سیکۆلارەوە دەتوانین تێبگەین کە ئەو ژیانەی بەهەڵە تیۆرییەکەی دانراوە ناشێت راست بژێنرێت. بێ دوودڵی‌و بەدڵنیاییەوە دەتوانرێت بگووترێت کە ئەو خوداوەندە زۆر لەخوداوەندی سەردەمەکانی پێشوو بێ رەحمترە. لەناوچوونی کلتووری ژیانێک کە نزیکەی پازدە هەزار ساڵ پێشەنگایەتی مرۆڤایەتی کردووە دەشێت وەک جۆرێک لە مەحشەر راڤە بکرێت. تازەگەری دیموکراتیش کاتێک وەک دژە تێزی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری پەرە دەسەنێت ناچارە لەمیانەی ئەو دیدگاو رێنومایە مێژووییەوە سەیری بکات. ناچارە لەسەر بنەمای ئازادی — یەکسانی‌و دیموکراتی خۆی وەک دۆخی ئێستای ئەو مێژووە بونیاد بنێت و سەرجەم گوزارشتە زانستی و بونیادە رێکخستنیەکەی بەدەست بێنێت.

یەکێتی ئەورووپا دوای ئەنجام و وانە وەرگرتن لەئاماری وێرانکاری و شەڕەکانی سیستەمی ویستفالیا (یەکەمین چەکەرەی هاوسەنگی دەوڵەت ـ نەتەوە) کە لەساڵی ١٦٤٨ وەک رێگە چارەیەک بۆ ئەو رەوشەی کائۆس رێکخرا کە دوای شەڕە مەزهەبییە مەترسیدارەکان هاتە ئاراوەو لەقۆناخێکی دژواری سێسەد ساڵیدا روویداو لەشەڕەکانی مێژووی تەواوی مرۆڤایەتی زیاتر بوو. وەک چۆن سیستەمی ویستفالیا وەک دژە تێزی شەڕە مەزهەبییەکان هاتە ئاراوە، یەکێتی ئەورووپاش وەک دژە تێزی سیستەمی دەوڵەت ـ نەتەوەی ویستفالیا پەرەی پێدەدرێت کە لەجیاتی شۆڕش لەرێگای ریفۆرمەوە هەوڵی گۆڕینی دەدات. یەکێتی ئەورووپا ناوی کۆی ئەو دەوڵەت ـ نەتەوە دیموکراتیانەیە کە لەمیانەی ریفۆرمەوە لە

فاشیزمی دەوڵەت ـ نەتەوە رزگاربوون ـ کە لەدووەمین جەنگی جیهانیدا بەلوتکە گەیشت و بە جینۆساید ئەنجامگیر بوو ـ هەروەها لەسەر بنەمای مافی مرۆڤ سەرلەنوێ خۆیان بونیاد ناوەتەوە. بەڵام چونکە هەنگاوەکەی لەسەر بناخەی چەوت دەستی پێکردووە لەئامانجەکەی خۆیدا قووڵنابێتەوە، تەنانەت کۆنفیدراسیۆنێکی نەرمیش پێکناهێنێت. هەروەکو "یەکێتی پۆلاو خەڵووز[1]" هۆکارەکەشی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە لەزهنیەتێکی ئیندوستریالیستانەوە هەنگاوی هاوێشتووە. لەچوارچێوەی یەکێتیەکی بەمجۆرە ناشێت کۆمەڵگایەکی ئازاد و یەکسان لەچوارچێوەی ئامانجەکانی مافەکانی مرۆڤ و دەوڵەت ـ نەتەوەی دیموکراتی بونیاد بنرێت. ئەوەی لێرەدا گرنگە مۆدێرنیتەی سەرمایەداری لەوڵاتی بنەڕەتی خۆیدا پێویستی بەریفۆرمیزەکردنی خۆی دەبینێت. یەکێتی ئەوروپا کاتێک لەمیانەی ئەزموونەکانیەوە ئەو راستییەی بۆ روون بوویەوە کە لەرێگای بونیادە وشکە هەژموونگەراییەکەی جاران ناتوانێت رێبەرایەتی سیستەمی جیهانی بکات، دواتر پرۆسەی ریفۆرمی دەستپێکرد؛ دیسان پەرەسەندنێکە کاریگەریەکی دیاریکەری لەسەر سیستەم دەبێت. بەهۆی شێوەگرتنە وشکەکەی هەژموونگەراییە کە جگە لە یەکێتی ئەوروپا هیچ هێزێکی مۆدێرنیتە پێویستی بە خۆ ریفۆرمیزەکردن نابینێت و لەخۆیەوە ئەو توانایە پیشاننادات. تاوەکو هێزەکانی دیکەی مۆدێرنیتە گرێدراوی کۆڵەکە سەرەکیەکانی سیستەم بمێننەوە جگە لەدواکەوتنی یەکێتی ئەوروپا رێگە چارەیەکی دیکەیان نییە.

---

[1] رێکخراوی خەڵووزو ئاسن یان گروپی ئەوروپی بۆ خەڵووزو ئاسن (ECSC) :لە شەش دەوڵەت پێکدێت کە لەسەردەمی شەڕی سارد ئامانجیان یەکێتی ئەوروپای رۆژئاوابوو. بە یەکەمین رێکخراو دادەنرێت کە پرەنسیپی بان نەتەوەیی بە بنەما دەگرێت. وەزیری دەرەوەی فەرەنسا رۆبەرت شومان یەکەم کەس بوو کە لە ساڵی ١٩٥٠ پێشنیاری کرد. بە گوێرەی پەیماننامەی پاریسە ١٩٥١ دامەزرا. فەرەنسا، ئەڵمانیای رۆژئاوا، ئیتالیا، بەلژیکا، لوکسمبورگو هۆلەندا ئیمزایان کرد. لە ساڵی ٢٠٠٢ ئەو پەیماننامەیە کۆتایی پێهات.

لەم سۆنگەیەوە چاوەڕوانیکردنی وەرچەرخانێکی ریفۆرمیستانە لەخودی مۆدێرنیتەی سەرمایەدارییەوە کە دووسەد ساڵە لەخۆرهەڵاتی ناوین هەوڵی بونیادنانی خۆی دەدات ـ واقیعی نابینرێت. تەنیا لەمیانەی رێککەوتن لەگەڵ یەکێتی ئەورووپاوە دەرفەتی ریفۆرمی بۆ دەرەخسێت. لەدۆخێکی وەهاشدا رەوشی کائۆس و قەیراناوی ناوچە بەردەوام قووڵدەبێتەوە. واقیعی رۆژی ئەمرۆشمان ئەو داوەرییە دەسەلمێنێت. لەبەر ئەم هۆکارە بۆ ئەنجامدانی ریفۆرم دەربازکردنی سیستەمی یەکێتی ئەورووپا مەرجە. نەلێشاوی مێژوویی خۆرهەڵاتی ناوین و نە هەلومەرجە کۆمەڵایەتییە رۆژانەییەکان بۆ ریفۆرمی لەشێوەی یەکێتی ئەورووپا لەبارنین. بەهۆی ئەو واقیعە گەڕان بەدوای رێگەی نوێدا پێویستە. چەندین جار دووبارەمان کردەوە: ئیسلامی رادیکاڵ، کۆماری ئیسلامیو لێگەڕینی جەماعەتەکان لەبواری تیۆری و کردارییەوە نیازی دەربازکردنی مۆدێرنیتەی سەرمایەدارییان نییە. پێشکەوتووترین بەرنامەیان مۆدێرنیتەیەکی سەرمایەدارییە بەجیلوەی ئیسلامییەوە. واتە نیازیان وایە لەسەربنەمای سەلەفییە نوێکان یان پرۆتستانەکانی ئیسلام کۆمەڵگاو دەوڵەت بخەنە ژێر رکێفی خۆیانەوە. ئەو هەنگاوانەی لەمیانەی میللیگەرایی ئایینی سیکۆلاری عەلمانیەوە هەوڵی جێبەجێکردنیان دابوو بەڵام تەواو سەرکەوتوو نەبوون، لەرێگای دەمامکی ئیسلامەوە هەوڵی تەواوکردنی دەدەن. هەمان ناوەڕۆکیان هەیە کە ئەویش مۆدێرنیتەی سەرمایەدارییە.

سۆسیالیزمی بونیادنراو بەو سیفەتەی باڵی چەپی عەلمانیەتە کێشەیەکی نییە ناوی رکابەرایەتی مۆدێرنیتە بێت. تەواوی داواکاریەکانی ئاواکردنی سەرمایەداری دەوڵەتە لەجیاتی سەرمایەداری لیبراڵ. ئەنجامەکەشی ئاواکردنی مۆدێرنیتەیەک بووە زۆر لەسەرمایەداری لیبراڵ بێ رەحم و وێرانکەرتر بێت.

لەو دۆخەدا پەرەپێدانی دژە تێزی تازەگەری دیموکراتی لەخۆرهەڵاتی ناوین بەرامبەر بە مۆدێرنیتەی سەرمایەداری، لەسەرووی ئەو ئەگەرانەوە دێت کە بۆ دەربازکردنی رەوشی کائۆس و قەیران لەئارادان کە

بەشێوەیەکی رۆژانە قوولتر دەبنەوە. هەلومەرجە کۆمەلایەتی و مێژووییەکان چانس و دەرفەتی بەدیهاتنی ئەو ئەگەرە زیاتر دەکەن. "یان کائۆسی بەردەوام یان تازەگەری دیموکراتی" ئەو دروشمە سەرەکیەیە سەبارەت بەهەلومەرجی بەرجەستە دەستنیشان بکرێت. وانەیەکی گرنگی لەئەزموونی یەکێتی ئەوروپا وەربگیرێت؛ دەستەبەرکردنی ئەلقەی پێهەلگرتنێکی ریفۆرمە لەسەر بنەمای کۆمەلگای ئابووری. لەمیانەی ئەو مەودایەی لەرێگای ئەو هەنگاوەوە دەیبرێت دەشێت بونیادە سیاسی و کۆمەلایەتیەکانی دیکە فەراهەم بکرێت. کاتێک ئەو خالە رەچاوبکەین کە ئاسن و خەلووز کەرەستەی سەرەکی ئیندوستریالیزمن باشتر دەرک بەناکۆکیەکەی لەگەل کۆمەلگای ئیکۆلۆژی دەکەین. ئەمە ئەو هۆکارە بونیادیەشە کە گەیشتنی یەکێتی ئەوروپا بەکۆمەلگای ئیکۆلۆژی بەربەست دەکات. ئەو جڤاتانەی لەسەر ئاسن و خەلووز ئاواکراون دژە ـ ئیکۆلۆژین. هەلبەتە ئەگەر ئامانج کۆمەلگای ئیکۆلۆژی بێت، تەنیا ئەنجامدانی ریفۆرم لەسیستەمدا بەس نییە.

ئەگەر هەنگاوێکی رۆژانەیی بەرجەستەی تازەگەری دیموکراتی لەخۆرهەلاتی ناوین لەسەر بنەمای هەلومەرجە کۆمەلایەتی و مێژووییەکانی ناوچە بهاوێژرێت چانسی پێشکەوتنی دەبێت. بێگومان کۆپیەکردنی دەرەوە جێی خۆی ناگرێت. جێگیر نەبوونی کۆپیەکانی ئەو دوو سەدەیەی دوایی مۆدێرنیتە لەناوچەدا ئەو داوەرییەمان دەسەلمێنێت. ئەو زەمینە ئیکۆلۆژییەی کۆمەلگای نیولیتیک و دژە تێزەکەی واتە شارستانی تێیدا بالایان کرد شوێنگەی شارستانێتی دیموکراتی و تازەگەریەکەیشین. ناوچەی دۆلەکانی رووباری نیل، دیجلە، فورات و پەنجاب کە شارستانی ناوەندی پێنج هەزار سالی تێدا پەرەیسەندووە لەرۆژی ئەمرۆماندا ناوەندی قەیرانە هەرێمیەکانن. دەولەت ـ نەتەوەکان هۆکاری سەرەکی ئەو قەیرانەن کە لەو دوو سەدەی دوایی وەک محافەزەکارترن کۆلەکەکانی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری ئاواکراون. چونکە ئەو دەولەتانە توانای بەدواداچوونی رێبازی یەکێتی ئەوروپا و دەستپێکردنی ریفۆرمیان نییە لەمیانەی شکاندنەوەی دژواردا قەیران و

ماوەی کائۆس گەورەتر دەبێت. سەرباری ئەوەی هاوپەیمانە هەژموونگەراکانی سیستەم ئەمریکا - یەکێتی ئەوروپا راوەستەی لەسەر دەکەن زەحمەتی لەدۆزینەوەی دەرەتانێک بۆ کائۆس دەبینن. هەربۆیەش سەرلەنوێ بونیادنانەوەی دەوڵەت - نەتەوە پێکنایەت. ئەو رەوشەش هەم قەیرانی جیهانگیری قووڵترو هەمیشەیی دەکات، هەم بە پێچەوانەوە کاریگەر دەبێت و ئاڵۆزی و کائۆس زیاتر دەکات. لەم سۆنگەیەوە قەیرانی بونیادی سیستەم زیاتر لەولاتی بنەڕەتی شارستانی ناوەندی هەمیشەیی دەبێت. وەک بڵێی تۆڵەی خۆی دەکاتەوە.

راستیەکی حاشا هەڵنەگرە کە لەرۆژی ئەمڕۆماندا سێیەمین شەڕی جیهانی تایبەت بەخۆی لەئارادایە. لەبواری ماوەو چوارچێوەدا ئەو شەڕە لە هەردووکی یەکەم قووڵتر و درێژخایەنترە. پۆتانسیلی خۆنوێکردنەوەی سیستەم لەناوچەدا لەئارادانییە و پێکنەهاتووە. ئەوشتەی پەرەدەسەنێت دارزان و پەرتەوازەبوونە. ئەو تازەگەرییە دیموکراتییەی سەرجەم ئەو توانستە کلتووریانە بەبنەما دەگرێت کە لەسەردەمی سەرهەڵدانی شارستانی سۆمەر وەک دژەتێزی سەردەمی نیولیتیک تا مۆدێرنیتەی سەرمایەداری رۆژی ئەمڕۆمان سەرکوت کراون بەرلە هەموو شتێک خۆی دەکات بە تێزێک و دواتر وەک دژە تێز فشار بخاتە سەر سیستەم بەهێزترین ئەگەری پێهەڵگرتن پێکدێنێت.

پێویستە جارێکی دیکە هاوکێشەی تێز - دژەتێز - سەنتێز لە لێشاوی ناوەندی مێژوودا بکەوێتە گەڕ. بەشێوەیەکی بەرجەستەتر روونی بکەینەوە؛ بەر لەهەموو شتێک دیسان پێویستی بە پێهەڵگرتنێکی یەکگرتووی سەرتاسەری ئەو میراسە کلتوورییە هەیە کە لەدۆڵەکانی دیجلە - فورات سەریانهەڵداوە و بەدرێژایی مێژوو بەشێوەی یەکپارچەیی ژیاوە. راستیەکی حاشاهەڵنەگرە کە ئەو هێڵە دروستکراوانەی ئەمڕۆ بەسنوورەکانی سوریا، ئێراق و کۆماری تورکیا ناو دەبرێت میراسێکی هەژموونگەرایی ئینگلیز و فەرەنسای هێزە سەرکەوتووەکانی یەکەمین جەنگی جیهانییەو لەسەر ئەو بنەمایەش پێویستیەکی سیاسەتی جیۆستراتیژی پەرتکە - زاڵبەی کلتووری کۆمەڵگای مێژووییە. تا

بەقووڵایی و هەموو دەرەنجامەکانیەوە دەرک بەواقیعی دروستکراوی ئەو سنوورانە نەکرێت، یەکێتی کلتووری مانادار لە هیلالی بەپیتی مێژوودا بونیاد نانرێت. گەورەترین جەهالەت و گەمژەیی باوەڕکردنە بەپیرۆزی ئەو سنوورانە و بیر نەکردنەوەیە لەهەنگاوێکی کلتووری یەکپارچەو گشتگیر. مەبەست لەیەکپارچەیی کلتووری ئەو کلتوورە مادی و مەعنەویەیە کە لەچواردەوری بەها دیموکراتی، یەکسان و ئازادەکان چنراوە. کلتوورێکی بەمجۆرە پێویستە لەمیانەی زهنیەتێکەوە راڤەو بونیاد بنرێت کە نەتەوەییبوونەکەی میلیگەرایی نەبێت، ئایینەکەی ئایینگەرا نەبێت، کۆمەڵایەتیبوونەکەی رەگەزگەرایی و زانستیبوونەکەشی پۆزیتیڤیست نەبێت.

یەکەمین هەنگاوی سەبارەت بەو بابەتە بهاوێژرێت ئاواکردنی کۆمینی کشتوکاڵ ـ ئاو ـ وزەی دیجلە ـ فورات دەشێت وەڵامێکی شیاو بێت بۆ پەرەسەندنی یەکپارچەیی مێژوویی و کۆمەڵگابوون. لەخودی مێژووەکەیەوە تێدەگەین لەکاتی بەدیهاتنی ئەو یەکێتیەدا ناوچەی لانکەی سەرجەم پیرۆزیەکان دەتوانێت پەرچوو بخولقێنێت. ئاشکرایە کە کۆمینێکی بەمجۆرە بناخەیەکی پێویست بۆ پەرەسەندنی کۆمەڵگای ئیکۆلۆژیک ـ ئیکۆنۆمیک دابین دەکات و پۆتانسێلێکی بەهێز دەئافرێنێت. لەگەڵ ئەو مۆدێلە ئیکۆنۆمیک و کۆمینالە دەشێت کۆمینی هاوشێوە لەسەرجەم بوارەکانی ژیانی کۆمەڵگادا ئاوابکرێت. مۆدێلی کیبوتز[٢] کە لە ئیسرائیل جێبەجێ دەکرێت هێزی خۆی لەو تایبەتمەندێتییەی کۆمۆن وەردەگرێت. ژیانی ئابووری بەدرێژایی مێژوو بەقورسایی

---

[٢] نموونەی کیبوتز :(Kibbutz) بە زمانی عیبری مانای جەماعەت یان گروپ دەبەخشێت. ئاماژەیە بۆ توێژگەلێک کە لە کێلگەیەکی هەرەوەزی دەژین. ژمارەی دانیشتوانی کیبوتز لە نێوان ٣٠ ـ ١٥٠٠ کەسدایە. کارکردن تێیدا بە زۆرەملێییە، رێکخستنی ژیانیش لە بواری زەبتو رەبتەوە لە رێکخستنی سەربازی دەچێت. بەشداریکردن لە بوارە جیاوازەکانی ژیان دەستەجەمعیو هەرەوەزییە. بەرهەمهێنانو بەکاربردن بەگوێرەی پرەنسیپی "هەرکەس بەگوێرەی توانای، هەرکەسیش بە گوێرەی پێویستیەکانی."

بەشـێوازی کۆمۆنـە. هەرچەنـدە سـەرمایەداری لیبـراڵ لـەژێر نـاوی "دەستپێشـخەری تایبـەت" مـۆرکی تاکگـەرایی لێبـدات، بـەڵام دیسـان بەرهـەمهێنان لەسـەرووی هەمووشـیانەوە لەکارگـەکان لەسـەر بنـەمای یەکینـە کۆمینالـەکان فەراهـەم دەبێـت. جیـاوازی لەسیسـتەمی تاکگـەراو قازانجخوازدایـە، کاتێـک قازانجگـەرایی بـەلاوە بنرێـت یـاخود بهێنرێتـە نزمتـرین ئاسـتەوە ئـەوەی دەمێنێتـەوە سیسـتەمی کۆمینالـە. سیسـتەمی کۆمینـاڵ تـەنیا لـەبواری ئـابووری نییـە، لەسـەرجەم بـوارو گۆڕەپانـە کۆمەڵایەتیەکانـدا هـەڵگری تایبەتمەنـدێتی بونیـادی گەردوونییـە. کێشـەی سـەرەکی کۆمۆنـەکان بتـوانن ئـەخلاقی و سیاسـی بن. پێویسـتە لـەرێگای تازەگـەری دیموکراتییـەوە مـرۆڤ خـۆی بگەیەنێتـە ئـەو بەهایانـەی کـە شارسـتانی و مۆدێرنیتـەی سـەرمایەداری لێـی دامـاڵیبوون و بێبەشـی کردبوون.

حەوزەکانی دیجلە - فورات بەزیادیشەوە ئاو، وزەو زەوی پێشکەش بە بەرهەمە کشتیارییەکان دەکەن کە پێویستی سەرەکی ئەو بوارەن. تـا ئـەو ماتریالانە بە پێـی پێویست فەراهـەم نـەبن بەکۆمـەڵگابوونی ئیکۆنـۆمی و ئیکۆلـۆژی خۆرهـەڵاتی نـاوین پـەرە ناسـەنێت. بـەڵام تـاکو توانسـت و کەڵەکەبوونێکی مانـای زهنی پێویست فەراهەم نەبێت ماتریالە بونیادیەکان بەتـەنیا نـاتوانن کۆمـەڵگای بونیـادی ئـاوا بکـەن. لـەو سۆنگەیەوە وەک کۆمــەڵگاکانی سۆسـیالیزمی بونیــادنراو کۆمــەڵگاکانی ئــەو ناوچــەش لەخزمەتکردن بە مۆدێرنیتەی سەرمایەداری و توانەوە لەناویاندا رزگاریان نابێت. رێکخستەکردنی ئەکادیمیانەی ئەو کەڵەکەبوونە زانستییەی مانا کە هەم لەمێژوو هەم لە فەلسەفەی دیمـوکراتی مۆدێرنیتـەدا پێکهـاتوون دەشـێت سـەرەتایەکی سـاغلەم و تەندروست بێـت. پێویسـتە لـەبیری نەکـەین کـە یەکەمین ئەکادیمیەکانی مێژوو زەقورەکانی بابـل، خانـەی دانـایی نیپـور، بابـل، نوسـەیبین، ئورفـا و بەغـداد گوزارشـت لـەو واقیعـە دەکـەن کـە شارستانی بەبێ ئەوان هەڵناکات. تازەگـەری دیمـوکراتی بـەبێ ئـەکادیمیا پـەرە ناسـەنێت. جیهـانی مانـا و زانسـتی نـوێ کـە پێویسـتە وەک ئەلتـەرناتیفی جیهـانی ئـەکایمیای مۆدێرنیتـەی سـەرمایەداری رێکخسـتە

بکرێت کە لەناو قەیراندایە، مەرجێکی ژیانی و دەست لێبەرنەدراوی کۆمەڵگای ئیکۆنۆمیک‌و ئیکۆلۆژییە. واتە تەنیا لەمیانەی ئاواکردنی کۆمەڵگایەکی دیمکرات، ئازاد و یەکسان (لەگەڵ جیاوازییەکان)و بەیەکەوە ژیانی ئەو فاکتەرانە دەشێت زانست لەدۆخی پاوانی ئایدیۆلۆژی رزگار بکرێت و وەک ئامرازی دەسەلات بەکار نەهێنرێت. هەر جڤاتێکی ئیکۆلۆژیک کاتێک بەشێوەی رێکخستن و مەعریفەیەک بونیاد بنرێت کە مۆدێرنیتەی سەرمایەداری دەرباز کردبێت مانادار دەبێت. تا مەعریفە، رێکخستن و ئیرادەیەکی کردەیی پێکنەیەت کە سەرمایەداری، ئیندوستریالیزم و دەوڵەت ـ نەتەوەی دەرباز کردبێت جڤاتە ئیکۆلۆژی و کۆمەڵگا ئیکۆنۆمیەکان ئاوا نابن. ئەو بۆچوونانەی دەڵێن چەمکەکانی زانست و مەعریفە شتێکن، کۆمەڵگاش شتێکی تری جیاوازە؛ شێواندن و چەواشەکاریەکی شارستانییە. ئەمەش وابەستەی بەکۆیلەکردنی کۆمەڵگایە.

کۆمەڵگای ئازادو دیموکراتیک تەنیا لەمیانەی ئەو مەعریفەیەی ماناوە دەتوانێت بژیت کە بۆخۆی پێویستە. هەر یەکینەیەکی ئابووری لەمیانەی مەعریفە ئیکۆلۆژیەکەیەوە دەتوانێت بژیت. ئەو یەکینە ئابووریانەی پشت بە مەعریفەی ئیکۆلۆژی نابەستن لەتوانەوە لەناو مۆدێرنیتەی سەرمایەداری رزگاریان نابێت. پێویستە یەکینە ئیکۆنۆمیک ــ ئیکۆلۆژییەکان وەک یەکینەی سادە و بێبەش لە تەکنۆلۆژیا نەبینرێت. لەکاتی پێویستدا دەشێت ئاڵۆزترین و پێشکەوتووترین تەکنۆلۆژیاش لە یەکێتی و یەکینە ئیکۆنۆمیک ـ ئیکۆلۆژیەکاندا بەکار بهێنرێت. تەنانەت یەکینە ئیکۆنۆمیک ـ ئیکۆلۆژیەکان یەکینەی تەکنۆلۆژیای نموونەیین. سوودمەندترین بواری کۆمەلایەتی بەکارهێنانی تەکنۆلۆژیایە. شۆڕشی تەکنۆلۆژی لەخۆرهەلاتی ناوین زیاتر بۆ کۆمەڵگای ئیکۆنۆمیک ــ ئیکۆلۆژیک پێویستە. لەو چوارچێوەیەدا بێت ئەوا شۆڕشی تەکنۆلۆژی دژە ــ ئیندوستریالیزمە. لەکاتێکدا ئەو تەکنۆلۆژیایەی لەخزمەتی ئیندوستریالیزمە کۆمەڵگا بەرەو وێرانکاری‌و کۆیلایەتیەوە دەبات، بەلام ئەو تەکنۆلۆژیایەی لەخزمەت کۆمەڵگای ئیکۆنۆمیک و ئیکۆلۆژیدایە

زیاتر بەرەو ژیانێکی ئازادو دیموکراتیانەی دەبات. بەکورتی هەلومەرجەکانی تازەگەری دیموکراتی مانادارترین هاوسەنگی لەنێوان تەکنۆلۆژیا و ئیکۆلۆژیا فەراهەم دەکات. هەربۆیەش شەڕی ئایدیۆلۆژی شەڕێکی دەست لێبەرنەدراوی نێوان مۆدێرنیتە و تازەگەریەکانە. ئەگەر ئەو شەڕو ململانێیە بەشێوەیەکی سەرکەوتوو ئەنجامنەدرێت ئەوا دەرفەتی ژیان و هەمیشەییبوونی تازەگەری دیموکراتی بەرامبەر مۆدێرنیتەی سەرمایەداری ئەگەرێکی لاواز دەبێت و وەک هیواو خەیاڵێک دەمێنێتەوە.

ئەوەی لەسەردەمی نیولیتیکەوە بەدرێژایی چاخەکانی شارستانی لە جوگرافیای خۆرهەلاتی ناوین کۆمەڵگا و کلتووری ماددی و مەعنەوی تێرخۆراک کردووە ژیانی کۆمەڵگای ئیکۆنۆمیک و ئیکۆلۆژییە. سێ ئەسپسوارە مەحشەرییەکەی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری سەرمایەگەرایی، ئیندوستریالیزم و دەوڵەت - نەتەوە ئەو کلتوورەی کۆمەڵگای پێشێل کردووەو خەنجەری لێداوە. ئەو ئەرکە سەرەکییەی پێویستە لەبەرامبەر ئەو رەوشەدا جێبەجێ بکرێت؛ تێکۆشانی بونیادنانی تازەگەری دیموکراتییە لەسەر کۆڵەکەی سێیانی سۆسیالیست - دیموکراتیک، ئیکۆنۆمیک - ئیکۆلۆژیک‌و ئەخلاقی - سیاسی.

## ج - کۆمەڵگای ئەخلاقی‌و سیاسی بەرامبەر بە دەوڵەت - نەتەوە

مۆدێرنیتەی سەرمایەداری لەرێگای دەوڵەت - نەتەوەوە کۆمەڵگاکانی خۆرهەلاتی ناوینی تەنیا بە سینگێکی قایمەوە نەبەستەوە، بەڵکو لەمیانەی دەوڵەت - نەتەوەکانەوە بەجۆرێک بۆمباردومانی کردن کە بەدەیان جار هێندەی ئەو بۆمبا ناوەکیەیە کە هاوێشترایە هیرۆشیما. دەتوانین بڵێین ئەو بەها کلتوورییە هاوبەشانەی هەزاران ساڵە پێکهاتوون لەئاکامی بۆمبابارانی دەوڵەت - نەتەوەی ئەو دوو سەدەیەی دوایی لەتوپەت کرا. پەرتەوازەبوون و پارچەبوونێکی ئەوتۆی لەگەڵ خۆیدا هێنا کە هیچ جۆرە چەکێکی فیزیکی ئەو جۆرە کاریگەرییەی نابێت. کۆمەڵگاکانی خۆرهەلاتی ناوین بەسیفەتی سیستەمەکانی شارستانی دەوڵەتی و سیستەمە کۆمیناڵە رکابەرەکانیان لەهیچ قۆناخێکی مێژوویان

بە قەدەر قۆناخی ژێر هەژموونگەرایی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری لە یەکپارچەیی و ناسنامەکەیان دانەماڵراون، لەرێگای دابەشکردنەوە لەیەکتر و هەبوونی خۆیان نامۆ نەکراون. ئیمپراتۆریەتی بریتانیا ئەو سیستەمە بەکاریگەرە (بۆمبای ئەتۆمی راستەقینە)ی تەنیا لەخۆرهەلاتی ناوین پەیڕەو نەکرد، بەڵکو هەژموونگەرایی شارستانی لەهەر لایەکی جیهان جێگیرو هەمیشەیی کرد.

یەکێک لە تراژیدترین کردەوەکان بەرامبەر شازدەهەمین لویسی پاشای فەرەنسا جێبەجێکرا. بەهەڵە تێنەگەن، شۆڕشی فەرەنسا وەک پیلانگێڕیەکی ئیمپراتۆریەتی بریتانیا هەڵناسەنگێنم. بەڵام هیچ گومانێکی تێدا نییە کە بۆ شکاندنی هیواکانی هەژموونگەرایی پاشایەتی فەرەنسا ئیمپراتۆریەتی بریتانیا هەرجۆرە یارییەکی تاقیکردۆتەوەو ئەمانەش رۆڵێکی گرنگیان لەپەڕاندنی سەری پاشادا هەبووە. جگە لەهەبوونی چەندین پێدراو، دەستپێکردنی مێژووی فەرمی دەوڵەت ـ نەتەوە لەگەڵ پەڕاندنی سەری پاشا لەرێگای تیرۆری جاکوب[٢]ەکان ١٧٩٢ گرنگترین بەڵگەی ئەو رۆڵەیانە. لە ئاکامی ئەو دەوڵەت ـ نەتەوەی لە ساڵی ١٧٩٢ بەشێوەیەکی فەرمی راگەیەنرا سەرجەم هیواکانی هەژموونگەرایی فەرەنسا پووچەڵ بوویەوە. تیرۆر سوودی بۆ بریتانیا هەبوو. سەرهەڵدانی ناپلیۆن و شەڕە بەردەوامەکانی تەنیا ئەورووپای تەخت نەکرد، بەڵکو سەرجەم ئەو هێزانەشی بێکاریگەر کرد کە دەیانتوانی رووبەڕووی

---

[٢] جاکوبی یان یاقوبی (jacobite): ئەندامانی گەورەترین کۆمەڵەی شۆڕشگێڕی سیاسین کە سەردەمی شۆڕشی فەرەنسا حکومڕانیان کرد. تاکە کۆمەڵەی نیشتمانی بوو کە ماوەیەکی کورت دوای شۆڕش دامەزرا. زۆربەی ئەندامانی لە چینی ناوین بوون. سەرەتا دژی شەڕە دەرەکیەکان بوون، بەڵام لە ساڵی ١٧٩٢ پشتگیری شەڕی بروسیاو نەمسایان کرد؛ بەو هیوایەی بگەنە دەسەڵات. لە ساڵە ١٧٩٣ یاقوبیەکان دەسەڵاتیان گرتە دەست، سەردەمی تیرۆریان دەست پێکردو بە سەدان فەرەنسییان بردە بەر گیۆتین. روبسبێر بە دەسەڵاتدارترین رێبەری یاقوبیەکان بوو، بەڵام لە ساڵی ١٧٩٤ شوێنکەوتوانی لێی هەڵگەڕانەوەو لە سێدارەیاندا، دوای مردنی روبسبێر دەسەڵاتیان لە دەستدا.

هەژموونگەرایی بریتانیا ببنەوە. خودی ناپلیۆن یش بوو بەقوربانی شەڕەکانی ئەو دەوڵەت - نەتەوەیە. تا رۆژی ئەمڕۆمان فەرەنسا لەقۆناخی کۆماری پێنجەمیندا دەژیت. بەڵام ئەگەر لەتەواوی ئەمانەشدا هێزی وونکردبێت و بەردەوام لەپاش بەریتانیا مابێتەوە رۆڵی یەکلاکەرەوە بۆ دەوڵەت - نەتەوەی بیروکراسی و چینی ناوین دەگەڕێتەوە کە مۆرکی هۆڵەندا و بریتانیایان پێوەیە. هەمان واقیع بۆ ئیمپراتۆریەتەکانی ئیسپانیا، نەمسا - هەنگاریا، روسیا، عوسمانی و تەنانەت ئیمپراتۆریەتی ژاپۆن، هیندستان و چینیش لەجێگای خۆیدایە. سەیر و سەمەرەیی ئەو کارە لەوەدایە کاتێک لەدوا چارەکی سەدەی بیستەم و سەرەتاکانی سەدەی بیست و یەکەمین ئیتر دەوڵەت - نەتەوەکان بەرامبەر بە هەژموونگەرایی جیهانگیری مۆدێرنیتەی سەرمایەداری (بەرێبەرایەتی ئەمریکا ــ ئینگلتەرا) لەسەرتاسەری جیهان بەتایبەتیش لەخۆرهەڵاتی ناوین بووە بە کۆسپ، ئەو جارە بەشێوەی جەرگبڕو تراژیدیانە بەرامبەر بە دەوڵەت ـ نەتەوە کەوتە گەڕ. کۆتاییە تراژیدییەکەی سەددام حوسێن کە رەمزی دەوڵەت ـ نەتەوەی ئێراق بوو، بوو بە ڤەرسیۆنێکی بەرکەماڵی دۆخی رۆژانەیی لویسی شازدەهەم لەخۆرهەڵاتی ناویندا.

تاوەکو قووڵایی رۆڵی کۆمەڵایەتی - مێژوویی دەوڵەت - نەتەوە لەکلتووری خۆرهەڵاتی ناویندا شیکار نەکرێت و پەی پێنەبرێت، ناشێت چارەسەری بۆ هیچ کێشەیەکی کۆمەڵگا بدۆزرێتەوە. تەنیا هەڵسەنگاندنی کردەوەکانی ئەو دوو سەدەی دوایی دەوڵەت ـ نەتەوە وەک پیلانگێڕیەکانی پەرتکە ــ زاڵبەی ئیمپراتۆریەتی بریتانیای هێزی هەژموونگەرایی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری سادەکردنێکی زێدەڕۆیانەی رووداو و دیاردەکانە. پێویستە بەهەستیاریەوە بایەخ بە نەخزان بۆ ناو ئەو هەڵەیە بدرێت. بێگومان دەوڵەت ــ نەتەوە شێوەیەکی دەوڵەتە کە زۆر بۆ پیلانگێڕی گونجاوو لەبارە. بەڵام لەوەش گرنگتر ئەوەیە وەک حەقیقەت بەشێوەیەکی بەرفراوان بەهاکەی دەست نیشان بکرێت. سەرباری تەواوی پڕوپاگەندەکانی پۆزیتیڤیزم، بەڵام ناوەڕۆکی دەوڵەت ــ نەتەوە پڕ لە توخم و فاکتەری نهێنی و میتافیزیکانەیە. رۆڵەکەی لەمێژوودا رۆشن

نەکراوەتــەوە. کاریگەریەکــەی لەســەر کۆمــەڵگا نهێنــی و شــاراوەترە. ســەرباری ســەرجەم بانگەشــە دژە ـــ تیۆلۆژیــەکانی، بــەڵام شــێوەیەکی دەوڵەتە کە هەڵگری زۆرترین خەسڵەتە تیۆکراتی[٤]ەکانە.

لــەزۆر لایەنــەوە رۆشــنکردنەوەی رووخســاری دەوڵــەت - نەتــەوە لەخۆرهــەڵاتی ناویــنــدا گرنگــی و بایــەخێکی زۆری هەیــە. چەنــدە رۆشنبکرێتەوە ئەرکە ئەخلاقیو سیاسیەکانیش زیاتر ئاشکرادەبن.

١ - سەرباری تەواوی بانگەشە زانستیەکانی بەڵام بەسیفەتی حەقیقەتی کۆمەڵایەتی دەوڵەت ـ نەتەوە لاوازترین و خراپترین هەبوونە. لەژێر ناوی هۆمۆژەنکردنــدا رۆڵــە ســەرەکیەکەی یــەکرەنگکردنی کــۆدە زهنییــە هەمەرەنگەکانی سروشتی کۆمەڵگایە. یەک زمان، یەک ئاڵا، یەک میللەت، یەک جۆرە سیاسەت، یەک شێوازی ژیان و یەک جۆر ئایدیۆلۆژی لەگەڵ هۆمۆژەنکردنی سروشتی کۆمەڵگا بەیەکەوە لەناویەکتردا بەرێوە دەچن. کاتێک پێکهاتە ئاڵۆزو جیاوازەکانی کۆمەڵگا سادە دەکرێن و دەبن بە یەک شێوە، ئیتر حەقیقەت جێگای خۆی بۆ دوالیزمێکی لەجۆری رەش - سپی بەجێدێڵێت کە بەهاکەی کەمو لاواز بووەو نەرێنی یە. ئەو روانگە جیهانییەی بە فاشیست، دەمارگیر، شۆڤێنستو محافەزەکارترین بۆچوون ناو دەبرێت لەرێگای ئەو پێکهاتە دوالیزمییە سادەوە پەرە دەسەنێت. ئەو کردەوەو رەفتارە یەکرەنگییانەی دەسەڵاتی دەوڵەت ـ نەتەوە بەهۆی مەیلی زۆرترین قازانجی سەرمایەدارییە. چونکە تاوەکو گروپە فرە رەنگەکانی کۆمەڵگا بەرگری لە ئازادی و سەرفرازی خۆیان بکەن مەیلی زۆرترین قازانج جێبەجێ نابێت و لەکار دەکەوێت. بەڵام کاتێک تەواوی بوارەکانی ژیان لەسەر بنەمای بەرژەوەندی جیاواز لەژێر حکومڕانی یەک شێوەی نەتەوەدا توێنرایەوە، لەکۆمەڵگادا هەنگاو بۆ جەمسەرگەرایی

---

[٤] تیۆکراتی :(Theokratia) یەکێکە لە زاراوە سیاسییە یۆنانیەکان، لە تیۆ (ئایین)و کرات(حوکم) پێکهاتووە. واتە حوکمی خودا(ئایین). بە شێوەیەکی باو بە مانای دەسەڵاتو حوکمڕانی پیاوانی ئایینی بەکار دەهێنرێت. رژێمی فەرمانڕەوایی تیۆکراتی خوداوەند بە دەسەڵاتی سیاسی باڵا دادەنێت. یاسا ئیلاهیەکانیش بە یاسای شارستانی دادەنێت. پیاوانی ئایینیش بە نوێنەری دەسەڵاتی خوداوەند دادەنێن.

دووچین (بۆرژوازی - پرۆلیتاریا) دەهاویشتریت. لەمیانەی ئەو جۆرە جیاوازییە چینایەتیەوە قۆناخی قازانجی سەرمایەداری بەرفراوان دەبیتو پەرە دەسەنیت. توانستەکانی کلتووری ماددی و مەعنەوی کە بەدرێژایی مێژوو کەڵەکە بووە دەکرێتە قوربانی هۆمۆژەنکردنی دوو چینی. ئەو واقیعە قوربانیکردنە. چەند زمان، فیکر، باوەڕی، زهنیەتو بونیادی ئەخلاقی و سیاسی جیاواز هەیە هەمووی دەکەوێتە ناو چوارچێوەی ئەو قوربانیکردنەوە. دوو پەیڕەو یان ڕێباز جێبەجێدەکرێت؛ جینۆسایدی جەستەیی و کلتووری لەگەڵ ئاسیمیلاسیۆن. ئەگەر ئاسیمیلاسیۆن ئەنجامی خوازراو بەدەست نەهێنێت، جینۆسایدە جەستەیی و کلتووریەکان دەکەونە گەڕ. بەگشتی پەیڕەوەکان لەناو یەکتر و بەشێوەیەکی تێکەڵ جێبەجێ دەکرێن. ئەو قۆناخو پرۆسەی بەحەقیقەتی لاوازو یەک شێوە ناو دەبرێت سوورەکەی بەمجۆرەیە.

ئەوەیە راستی حەقیقەتی کۆمەڵگای دووچین کە مارکسیزم هەوڵیداوە بە ئەرێنی پیشانیبدات. ئەو چینەی بە پرۆلیتاریا ناو دەبرێت بەهای حەقیقەتی زۆر لاوازو نەرێنی یە. بە شێوەیەکی گشتی حەقیقەتی تاکی کۆیلە یان بەکۆیلەکراو هێندە لاوازکراوە کە بڵێی بوونی نییە. چونکە بەخۆی لەناو چینی سەرداردا توێنراوەتەوە و بۆ پاشکۆیەکی بچووککراوەتەوە، ئەو حەقیقەتەی لەکاتی ئازادیدا هەڵگریبوو بۆ توێژە سەردارەکان دەگوازرێتەوە. پەینەبردن و تێنەگەیشتنی ئەو دۆخە لەلایەن مارکسیزمەوە کەموکوڕیەکی گەورەیە. ئەو خاڵەی کە دەڵێن مارکس شاگردێکی خراپی هیگل بووە زیاتر سەبارەت بەو حەقیقەتە ڕووبەڕوومان دەبێتەوە. بە بەراورد لەگەڵ مارکس هیگل بەهرەیەکی باڵای دەستنیشانکردنی حەقیقەتی هەیە. لەبنەڕەتدا بەرهەمەکانی سەبارەت بەڕوونکردنەوەی حەقیقەتە. چەسپاندنی کۆیلە وەک فاکتەرێکی هەڵگری حەقیقەت لەلایەن کارل مارکسەوە بەشەکەی دیکەی باوەڕیەکەشی بێ سوودکردووە کە هەڵگری راستی گرنگ بوو. سەرمایەداری لەسەر بنەمای قازانج تەنیا هێزی ماددی کەڵەکە ناکات، لەگەڵ ئەویشدا حەقیقەتی کۆمەڵگا (هێزی زهنیەتی کۆمەڵگا)ش زەوت دەکات. لە چوارچێوەی

بەرژەوەندیەکانی خۆی لە بێژەنگی دەدات و دەیکات بە موڵکی چینی سەردار(دەسەڵاتدار). لەبواری حەقیقەتیشدا بەشێوەیەکی سەرسوورهێنەر خۆی بەهێز دەکات. ئەو دیاردەو رووداوەی بە دەوڵەت ـ نەتەوە ناودەبرێت لەناوەرۆکدا پرۆسەی وەرچەرخاندنو گواستنەوەی ئەو حەقیقەتەیە.

لەو دۆخەدا لەبواری حەقیقەتدا یەک چین جێگای باسە نەک دوو. ئەگەر هەبوونی ماددی چینی کرێکار، تەنانەت رێکخستنە بەرتەسکەکانی لەجۆری پارتیو سەندیکاش وەک بەشێکی یەکپارچەیی رێکخستنی دیموکراتییانەی کۆمەڵگا هەڵنەسەنگێنرێت، جگە لە تەڵەزمەکانی کرێ بەهای حەقیقەتێکی بەهێزی کۆمەڵگا دەستەبەر ناکات. مێژووی سۆسیالیزمی بونیادنراویش سەبارەت بە دەستەبەرکردن و لەدەستدانی حەقیقەتیش تا دوارادە فێرکەر و ئەزموونبەخشە. بەکورتی چەندە دەوڵەت ـ نەتەوە هۆمۆژەن بکرێت، بەو رادەیەش حەقیقەتی یەک شێوە بەناوی چینی ئۆلیگارشی پاوانگەرا سەرهەڵدەدات. ناوەرۆکی قەپلاندن و گریمانەیی ئەو دەستنیشانکردنانە مانای ئەوە نابەخشێت کە حەقیقەت نین. پێویستە باش بزانرێت کە میتافیزیاش یەکێک لەجۆرەکانی دەستنیشانکردنی حەقیقەتە. تەنانەت میتۆلۆژیاکانیش هەڵگری بەهای حەقیقەتن. واتە نەدۆزینەوەی بەرامبەرە بەرجەستەکانیان لەسروشتدا بەڵگەی هەڵنەگرتنی بەهای حەقیقەت نییە. پێویستە لەبیر نەکەین کە بەردەوام حەقیقەت پەیوەندییەکی لەگەڵ پێکهاتنی زهنیەتی مرۆڤەوە هەیە. تاوەکو زهنیەتی مرۆڤ وەک پێگەیشتووترین شێوەی ناسراوی حەقیقەت پەی پێنەبرێت کارو خەباتی زانستی، هونەریو فەلسەفی جددی ئەنجامنادرێت. بێگومان ئەو حەقیقەتەی بەگوێرەی هەلومەرجی کۆمەڵایەتی زهنیەتی مرۆڤە لەهەمانکاتدا پەیوەندییەکەی لەگەڵ کۆمەڵگا دەکات بەناچارییەک. لەهیچ فۆرمێکی کۆمەڵگاو دەوڵەتدا وەک دەوڵەت ـ نەتەوە حەقیقەت پەیوەست بە زۆرداریيەوە نییە، لاوازو نەرێنی نییە.

٢ ـ فاکتەرە تیۆلۆژی و تیۆکراتیکەکانی دەوڵەت ـ نەتەوە پێویستی بەراوەستەیەکی گرنگ و بەرفراوانتر هەیە. کاتێک هیگل دەوڵەت ـ نەتەوە وەک ئەو خوداوەندە پێناسە دەکات کە دابەزیوەتە سەر زەوی،

تەنیا ھەڵسەنگاندێکی سیمبۆلی ناکات. بەڵکو دەوڵەت ــ نەتەوەی وەک فەراھەمبوونی ئەو فیکرانە شرۆڤە کردووە کە بەدرێژایی چاخ و سەردەمەکان بەناوی خوداوەند کەڵەکەکرابوون. بۆ تێگەیشتنی ئەو راستییە تەنیا لێتوێژینەوەی کۆی ئەو فیکرانە بەسە کە رێی بۆ شۆڕشی فەرەنسا خۆشکرد. پۆزیتیڤیستەکان کاتێک دەڵێن لەرێگای دەوڵەت ـ نەتەوەوە سەروەری لە خوداوەند دەسەنرێت و بە نەتەوە دەدرێت بێ ئاگان لەوەی تا چ رادەیەک خوداوەندگەرێتی دەکەن. چونکە بێئاگان لە چییەتی خودی سەروەری یاخود روونکردنەوەی راستیەکەی لەگەڵ بەرژەوەندیەکانیان نایەتەوە. خودی سەروەری بەو سیفەتەی کۆی ئەو پلەداری و دەسەڵاتەی دەوڵەتانە کە بەدرێژایی مێژوو پەرەیسەندووە ئەو پاوانگەرایی‌و زۆرداریەیە کە بەناوی خوداوەند (سەردار) لەسەر کۆمەڵگا پەیڕەو دەکرێت، چەوساندنەوەو داگیرکردنی بەھاکان و زێدە ـ بەرھەمە. راستی سەروەری ئیلاھی ئاشکرایە کە سەرچاوەی خۆی لەو مرۆڤانەوە وەردەگرێت کە خۆیان کردووە بە سەردار ــ ئەفەندی (مانای رەب دەبەخشێت) ھەربۆیەش پێویستی بە شیکار نییە. ھەربۆیەش کاتێک دەڵێن"لەگەڵ شۆڕشی فەرەنسا سەروەری لە سەرچاوە ئیلاھیەکەی دەرکەوت و ئیتر نەتەوە سەرچاوەکەیەتی" گەورەترین ساختەکارییە بەناوی زانستی کۆمەڵایەتییەوە دەکرێت. پۆزیتیڤیزمیش داھێنەری ئەو جۆرە ساختەکاریەیە.

تا چ رادەیەک سەروەری و زۆرداری چاخەکانی یەکەم و ناوین خوداوەند سەرچاوەکەی بێت، فەرمانڕەوایەتی دەوڵەت ــ نەتەوەش بە زیادەوە لەلایەن ھەمان سەرچاوەوە خۆراک دەدرێت. ئەو شتەی پێویستە لێرەدا راوەستەی لەسەربکرێت پەیوەندی دەستەواژەکانی میللەت و میلیگەرایییە (نەتەوە ــ نەتەوەگەرایی) بە خوداوەندێتییەوە. وەک دەزانرێت لەئیسلامدا میللەت مانای ئایین دەبەخشێت. خوداوەند و میللەت یەکسانن. بەنەتەوەبوونی میللەت یش ھیچ لەئەنجامەکە ناگۆڕێت، یارییەکی زمانە و ھیچی تریش. ئەگەر لە پەرتووکە پیرۆزەکان یان لە باوەڕیەکانی لیبرالیزمی سەرمایەداری باسکرابێت میللەت یان نەتەوە

گوزارشت لەو جەماعەت يان كۆمەلگايە دەكات كە فەرمانى خوداوەند (ئەفەندى، رەب، فەرمانرەوا) جێبەجێ دەكات. لەميانەى دەستەواژەى سيكۆلارو عەلمانييەوە سەرمايەدارەكان لە خوداوەند، فەرمانرەوايەتيەكەى و ئايين دەرناكەون، نكوڵيیان لێناكەن. بەڵكو لەژێرناوى ميلليگەرايى، نەتەوەگەريێتى ياخود لەژێر ناوى مەزھەبێكى نوێ ئايينێكى گونجاو لەگەڵ بەرژەوەنديەكانيان دادەھێنن. تەنانەت ئەو ميلليگەراييەى بە سنوورەكانى فاشيزميش دەگات پێگەى دەمارگيرترين ئايينە بينراوەكانى درێژايى مێژوو بەدەست دێنێت. گرنگ نييە كە ئايين لەشێوەى فۆرمە كۆنەكانى كرستيانى، ئيسلاميەت، بوديزم و موسەويدايە يان نا، بەڵكو ھەر باوەرى و ھزرێك لەئاستى پەرستندا كۆمەڵگا بپێچێتەوە، بەدڵنياييەوە دەشێت وەك ئايين گوزارشت بكرێت. لەو بارەيەوە ھەبوونى خوداوەند و نەبوونى ديارىكەر نييە. ئەوەى بنەرەتييە ئەندامانى كۆمەلگايە لەئاستى پيرۆزى و ھاوبەشى بەجيھانى ھزر، باوەرى و ھەستێكى چر، بەو سرووت و مەراسيمانە ببەستێتەوە كە بەعيبادەت ناو دەبرێت. ئاشكرايە كە نەتەوەو نەتەوەگەريێتى لەچوارچێوەى دەوڵەت - نەتەوەدا بەشێوەيەكى زێدەرۆيانە وەك پێويستيەكى ئەو خوداوەندانە ئافرێنراون. لەم سۆنگەيەوە باوەرى و دەستەواژەيەكى ھێندە روونو ئاشكران كە پێويستيان بە گفتوگۆكردنى كارەكتەرى ئايينى نييە.

ئەو خاڵەى لە تيۆلۆژياى نەتەوەو نەتەوەگەريێتيدا پێويستە بەبايەخەوە رەچاو بكرێت؛ پۆزيتيفيزم دەمامكى زانستى پۆشيوەو خۆى بەجۆرێك دەنوێنێت گوايە ئايين و ميتافيزيك نييە. تەنانەت دژايەتيكردنى ئايين و ميتافيزيا وەك ياساى سەرەكى دەستنيشان دەكەن و بەناوى "زانستگەرايى"يەوە دوودڵى لەپەرەپێدانى ئەبستراكت (دەرھەست) يكى ئايينى ناكەن. حەقيقەتگەرايى و ئايينگەرايى دەوڵەت — نەتەوە بەشێوەيەكى توند بەيەكەوە گرێدراون. ئامانجى ھاوبەشيان توانەوە، لەناوبردن، چەواشەكردن و بێ مێژوو ھێشتنەوەى شێوە جياوازو ھەمەرەنگەكانى حەقيقەت يان راستى كۆمەڵگايە. لەسەر ئەو بنەمايە

گوزارشته دەوڵەمەندەکانی حەقیقەت لاواز دەکات و سیستەمی هەژموونگەرایی خۆی وەک تاکە حەقیقەتێک دەنوێنن.

٣ ـ ئەنجامەکانی داسەپاندنی بونیاد و زهنیەتی دەوڵەت ـ نەتەوە بەسەر ژیانی کلتووری خۆرهەڵاتی ناوین بابەتێکە تا ئێستا لەمیانەی دیدگایەکی یەکپارچەییو ماوەی مێژوویی نەخراوەتە ژێر لێتوێژینەوەوە. تەنانەت خاوەنی خودی ئەو زهنیەت و بونیادانەش زۆر کەم ئاگاداری چییەتی ئەو شتگەلەن کە جێبەجێیان کردووە. ئەویش بەرژەوەندی ماددی و دەسەڵاتێکی سنووردارە بەکورت ماوەو شوێنێکی بەرتەسک. ئەوانەی دەوڵەت ـ نەتەوە وەک ئایدیۆلۆژیا و بونیاد جێبەجێدەکەن لەبنەڕەتدا بەگوێرەی لۆژیکی "هەرچییەک لە هەژموونگەرایی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری دەستەبەر بکەین قازانجە" دەجووڵێنەوە. سەرجەم هەڵوێستە ستراتیژی و تەکتیکییەکانی بەو تێڕوانینەوە سنووردارە. سیستەمی هەژموونگەرایی بەجۆرێکی دیکە دەرفەتی پەرەسەندنی پێنادات. چونکە لەو حەقیقەت و تیۆلۆژیایەی بۆ ئاگایە کە هەوڵی روونکردنەوەی ناوەڕۆکەکەیماندا، لەلایەکەوە وەک دۆگماتیکە نەتەوەییە وشکەکان، لەلایەکی دیکەشەوە وەک گومانکەران دەژین. ئەگەر مەسەلەکە بەرجەستەتر بکەین، نزیکەی ئەو بیست دەوڵەت ــ نەتەوەی بەسەر سیستەمی ئایینیو قەبیلەیی عەرەبەکانی یەکێک لەکۆنترین راستی کۆمەڵایەتی خۆرهەڵاتی ناوین سەپێنراوە تەنیا بە پارچەکردنی ژیانی کلتووری هاوبەشیان ناوەستن، بەڵکو نامۆبوونێک لەناو خودی هەبوونەکەیان موتوربە دەکەن کە ئاست و رەهەندەکانی نەبینراوە. ناسنامە نوێیەکەی عەرەبی لەناسنامەکەی چاخەکانی یەکەم و ناوین پێگەیشتووتر نییە کە زۆر رەخنەی دەکەن. ئەو عەرەبەی لەسەر بنەمای دەوڵەت ـ نەتەوە پارچەو دابەشکراوە عەرەبێکی لاواز، چەواشەکراوەو لەحەقیقەتی کۆمەڵگای مێژوویی دابڕاوە. چەندە دەوڵەت ـ نەتەوەگەرێتی وشکیش پەیڕەوبکەن، وەک مەزەندە دەکەن بەهێز نابن بەڵکو لاوازتر دەبن. چونکە عەرەبچێتی فاکتەری بەهێزبوون نییە، بەڵکو هۆکاری لاوازبوون و دوورکەوتنەوەیە لە حەقیقەت.

هیچ میللیگەراییەک لەمیانەی حەقیقەتەوە تێر خۆراک ناکرێت، هەربۆیە فاکتەری بەهێزبوون نییە. بەشێوەیەکی هەرە بەرچاویش ئەو دۆخە لە پراکتیکی هیتلەردا جێگای باس بووە. ئەو سنوورانەی لەروانگەی دەوڵەت - نەتەوەوە پیرۆزکراون ساختەکاریەکی تەواوەو لەلایەن بەرژەوەندیەکانی هەژموونگەرایی جیهانگیریەوە دەستنیشانکراون. دەستەواژەی میللەت و وڵاتی ناواخنی بەو سیفەتەی سیمبۆلی تیۆلۆژی نوێن لەچوارچێوەی هەمان بەرژەوەندی دەرناکەون. لەکاتی دەرکەوتنیان رزگاربوونیان لە غەزەبی خوداوەندی هەژموونگەرا زەحمەتە. لەراستیدا تەواوی سنوور، وڵات، میللەت، چینی ناوین و بیروکراسیەکانی لەدوو سەدەی دوایی لەناوچەکە هەوڵی بونیادنانی نراوە لەمیانەی خوداوەندێتی دەوڵەت - نەتەوە یەکیکەوتووەو بێ نرخ بووە. راستیەکانی ئێستایان بەراستیەکی ئەزەلی و ئەبەدی دادەنێن. کەچی کەسێک تۆزێک زهنی بۆ حەقیقەت کراوەبێت دەزانێت کە تەواوی ئەو راستیانە داهێنانێکی خەیاڵین بۆ رەواکردنی بەرژەوەندییە هەژموونگەراییەکانی ئەو دوو سەدەیەی دوایی. بونیادنانی دەوڵەت - نەتەوەی تورکی و ئێرانی بەرهەمی هەمان بەرژەوەندی هەژموونگەرایین. سەرباری ئەوەی ئەو دەوڵەت - نەتەوانە هەڵگری مۆرکی فەتحی مۆدێرنیتەی سەرمایەدارین، خوازیارن لەرێگای ئایدیۆلۆژیا میللیگەرا توندرەوەکان قەیرانی رەوابوون دەرباز بکەن. لەهەمووشیاندا میللیگەرایی عەلمانی و ئایینی تێکەڵ بەیەکتری دەکرێتو لەمیانەی قەڵغانێکی ئایدیۆلۆژی قایمەوە هەوڵی داپۆشینی دەوڵەت - نەتەوە دەدەن. مەزهەب، ئایین، ئەتنیک و کلتوورە مێژووییەکانی خراونەتە دۆخی کەمینە بەرامبەر بە دەوڵەت - نەتەوە رووبەرووی کێشەی مان و نەمان بوونەتەوە.

یەکپارچەیی کلتووری خۆرهەڵاتی ناوین لەگەڵ پارچەگەرایی دەوڵەت - نەتەوەی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری پڕ لەناکۆکییە. مۆدێرنیتە رۆڵی ئەو قەفەسە پۆڵایینە دەبینێت کە بەسەر واقیعی ژیانی هاوبەشدا سەپێنراوە. بەرۆژەڤبوونی بەردەوامی توندوتیژی ئەو راستییە دەسەلمێنێت.

بەرامبەر بە دەوڵەت ـ نەتەوە هێزی چارەسەری و شیکاری تازەگەری دیموکراتی رۆشنترە. ئەو راستییە کۆمەڵایەتیانەی هێزە هەژموونگەرا کۆن و نوێیەکان بەردەوام هەوڵی لەبیر بردنەوەی دەدەن و رووبەڕووی سووانیان کردبوونەوە لەمیانی هەڵوێستی تازەگەری دیموکراتییەوە لەچوارچێوەی مێژووەکەیان دەتوانن گوزارشت لەحەقیقەتی ژیان و هەبوونەکەیان بکەن. شیکارەکانی دەرهەق بەهێزە هەژموونگەراکان وەک حەقیقەت و مێژووی سەبارەت بە رکابەرەکانی وەلامدەدرێتەوە. هەروەکو چۆن راستییەکانی کۆمەڵگا لەهیچ قۆناخێکدا بێ مێژوو نەبوون بێ حەقیقەتیش نین. دژە ـ تیزی تازەگەری دیموکراتی بەرامبەر بە هەژموونگەرایی دەوڵەت ـ نەتەوە کە بەسەر کلتووری یەکگرتووی مێژوویی کۆمەڵگای خۆرهەلاتی ناویندا سەپێنراوە کۆمەڵگای سیاسیو ئەخلاقییە.

أ ـ دەوڵەت ـ نەتەوە وەک نکوڵیکردن لەکۆمەڵگای سیاسی و ئەخلاقی ئاوا دەکرێت. رێساکانی هێز لەجێگای ئەخلاق جێگیردەکرێت و بەیاسای نەتەوەیی ناو دەبرێت. یاساش کە گوزارشت لەرێکخستنی هێز دەکات لەچوارچێوەی دەوڵەت ـ نەتەوە بەبەرزترین ئاستی پەرەسەندنی خۆی دەگات. بەڕێوەبەرایەتیەکی بیروکراسی وشکیش لەجێگای کۆمەڵگای سیاسی زاڵ دەکات. نکوڵیکردن لەکۆمەڵگای ئەخلاقی بەشێوەیەکی بەرجەستە لەکارنەکردنی سیستەمی دیموکراتی ئاشکرا دەبێت. هەرچەندە باس لە پەرلەمان و هەڵبژاردن بکرێت، بەڵام دەستوورە نەنووسراوەکەی بونیادی بەڕێوەبەرایەتی ئۆلیگارشی بیروکراسی جێبەجێدەکرێت. دەسەڵاتی دەوڵەت ـ نەتەوە کە تا ناوباریکترین دەمارەکانی کۆمەڵگا تەشەنەی کردووە لەژێر پەردەی یاسایی خۆی وەک بەڕێوەبەرایەتی گشتی دەنوێنێت. جگە لەجیلوەی رەواکردنی ئەو حوکمڕانییە هەڵبژاردن و پەرلەمان رۆڵێکی دیکە نابینن. کۆمەڵگا، نەتەوەو گەل لەگەڵ دەوڵەت ـ نەتەوە یەکسان دەکرێت. بەرامبەر بەو واقیعەی هەژموونگەرایی کە مۆدێرنیتەی سەرمایەداری کردوویەتی بە گەردوونی جگە لەپاراستن و

بەرگریکردن لەکۆمەڵگای سیاسی و ئەخلاقی ریگە چارەیەکی دیکە لەئارادا نییە.

سروشتی کۆمەڵگاکان خۆیان لەناوەرۆکدا ئەخلاقی و سیاسین. ناشێت بیر لەکۆمەڵگا و تاکێکی بێ سیاسەت و بێ ئەخلاق بکرێتەوە. دەشێت کۆمەڵگا ناچاری بێ سیاسەتی و بێ ئەخلاقی بوون بکرێت، واتە لەئەخلاق و سیاسەت دابڕێنرێت. لەوانەیە توانای سیاسی و ئەخلاقی یەکی بخرێت و هێندە لاوازبکرێت توانای رۆڵ بینینی نەمێنێت، بەڵام هەرگیز لەناو نابرێت. لەناوبردنی تەنیا لەرێگای پەرتەوازەکردنی کۆمەڵگا و نەهێشتنی دۆخی کۆمەڵگا بەدیدێت. ئەخلاق و سیاسەت ئامرازە بەهێزەکانی حەقیقەتی کۆمەڵگان. هەروەکو چۆن دابڕان یان بێبەشبوون لەسیاسەت و ئەخلاق ریگا لەپێش بێ حەقیقەتی یان بێبەشبوون لەحەقیقەت دەکاتەوە، لەو بوارو گۆڕپانانەی چالاکی ئەخلاقی و سیاسی بەهێز جێگای باس بێت شێوازەکانی خۆگوزارشتکردنی حەقیقەت بەهێزترو بێگەردتر دەبێت. پێشکەشکردنی ئەخلاق و سیاسەت وەک سەرخان، یەکێک لە بەهەڵەداچوونە گرنگەکانی مارکسیستەکانە. هیچ تاک و یەکینەیەکی کۆمەڵگا جێگای باس نییە کە ئەخلاقی و سیاسی نەبن. هەرتاک و یەکینەیەکی کۆمەڵگا هەم ئەخلاقی و هەم سیاسییە. دیموکراسیش بەگوێرەی ئاست و رێژەی کۆمەڵگای ئەخلاقی و سیاسییە. دیموکراسی دۆخی کارای کۆمەڵگای ئەخلاقی و سیاسییە. حەقیقەتی کۆمەڵگا زیاتر لەدۆخی کۆمەڵگای دیموکراتی خۆی ئاشکرا دەکات. لەمیانەی کۆمەڵگای دیموکراتییەوە گوزارشتی حەقیقەت لەشێوەی زانست، فەلسەفە و هونەر بەباشترین دۆخی خۆیان دەگەن. ئەو دەستنیشانکردنانە روونی دەکاتەوە کە بۆچی لەکۆمەڵگای ئەخلاقی و سیاسی حەقیقەت بەزۆرترین گوزارشتی خۆی دەگات.

تا ئێستاش بەهێزی فاکتەرەکانی بەرخودان لەکۆمەڵگای خۆرهەڵاتی ناویندا دەیسەلمێنێت کە وەک مەزەندە دەکرێت فاکتەری سیاسی و ئەخلاقی هێندە لاواز نین. تاک و یەکینە بێ سیاسەت و بێ ئەخلاقەکان بەرخودان ناکەن، یان ناتوانن بەرخودان بکەن. تەنیا فێری دەستەمۆیی و

ملکەچکردن کراون. بەو رادەیەی بەرخودانەکانی خاوەن رەهەندی خێزان، قەبیلە، عەشیرەت، مەزهەب و رەوەندەکان رەتکردنەوەی دەوڵەت ــ نەتەوەیە لەهەمانکاتدا بانگەوازییە بۆ کۆمەڵگای دیموکراتیش. ئەو پەرەسەندنانەی کلتووری خۆرهەڵاتی ناوین لەو رەهەندانە بەدیدێنێت، وەک چۆن رۆژهەڵاتناسی هەوڵی سەپاندنی دەدات پاشڤەرۆیی، چاخی ناوین و ئەنارشیزم نییە، بەڵکو دەوڵەمەندێتی پۆتانسێلی تازەگەری دیموکراتییە. فەرامۆشکردنی دەوڵەمەندێتی دیاردەکانی کۆمەڵگا، لاوازکردنی هێزی حەقیقەتو مانا لەگەڵ خۆیدا دێنێت. مۆزایک یان دەوڵەمەندێتی کلتووری تاچەند هۆمۆژەن بکرێت، بەو رادەیە بێبەشبوون لەمانا و گوزارشتکردنی حەقیقەت جێگای باس دەبێت. بەڵام حوکمی دەوڵەت ـ نەتەوە بۆ ئافراندنی یەک شێوەیەکی هاووڵاتی تاکگەرا لەبواری ماناوە پۆتانسێلی خۆی لەدەستداوە، جگە لەچەند دۆگمایەکی دەرخکراو مێشکی کار ناکات، رێ و رەسمە فەرمیەکان وەک شێوەی عیبادەت دەبینێتو لەبواری حەقیقەتیشەوە خاڵیکراوە. بەها سیاسی و ئەخلاقیەکانی لەرێگای کۆمەڵگای دیموکراتیەوە بە میکانیزمی خۆی گەیشتووە بەپێچەوانەوە حەقیقەت لە پۆتانسێلێکەوە دەئافرێنرێنێت کە هەڵگری دەوڵەمەندێتی مانایە. هەرچی ئەو کۆمەڵگایەیە کە بەردەوام لەمیانەی حەقیقەتەوە خۆراک دەدرێت لە هاوسەنگی نموونەیی تاک ـ جڤاتدا دەژیت.

ب ـ بەرامبەر بە تیۆلۆژیای پۆزیتیڤیستی دەوڵەت ـ نەتەوە کۆمەڵگای سیاسی و ئەخلاقی ئەو فەلسەفە بەبنەما دەگرێت کەمانای زانست ـ دانایی دەبەخشێت. وەک پرەنسیپ عەلمانیەت و سیکۆلاری هیچ جیاوازیەکەیان لەگەڵ دۆگما ئایینیەکان نییە. لەرێگای پۆشینی دەمامکی دەوڵەت ـ نەتەوەوە لە ئایینگەرایی رزگاریان نابێت؛ بەڵکو تەنیا شێوە دەگۆڕن. دۆگماکانی دەوڵەت ـ نەتەوە کە زانستگەرایی پۆزیتیڤیست بەخێرایی دایهێناون لە دۆگما ئایینیەکانی چاخی ناوین وشکترە. واقیعی شەڕو داگیرکارییەکەی کە دەوڵەت ـ نەتەوە رێگای لەپێش کردەوە ئەو خاڵە دەسەلمێنێت. پێویستە زۆر باش بزانرێت کە تیۆلۆژیا لەبنەڕەتدا وەک

رەواکردنی ئایدیۆلۆژی شارستانی دەوڵـەتی و چینایـەتی ــ مۆدێرنیتـەی سـەرمایەداریش لـەناودا ـــ بونیـادنراوە. وەک دژێکـی (دژە ـــ تێـز) فاکتەرەکانی زانست ـ دانایی کۆمەڵگای سیاسی و ئەخلاقی پەرەدەسەنێت. لەکاتێکدا کایە و بـەها ئـەخلاقی و سیاسیەکان رێگـا لـەپێش زانست ـــ دانـایی دەکەنـەوە، زانسـت و دانـاییش بـەردەوام کۆمـەڵگـای سیاسـی و ئەخلاقی بـەخێو دەکـەن. دەوڵـەتی پاشـا ــ خوداوەنـدیش ئـەو گوزارشـتە کۆمەڵایەتیەیە کە بەسیفەتی تیۆ (خوداوەنـد) و لۆژیـک (ئـەقڵ) لـەدەرەوە خۆی دەسـەپێنێت. لەبەرئـەوەی سۆسـیۆلۆژیای رۆژئـاوا لـەرێگای هـەمان ناوەڕۆکی دەوڵەتی ـ چینایەتییەوە تێرخۆراک دەبێت بەشێوەیەکی روون و ئاشکرا باسی ئەو خاڵـە ناکـات. لـەرێگای هـەنگاوە پۆزیتیڤیستەکەشیەوە تیۆلۆژیـا بەمەترسـیدارترین قۆنـاخ دەگەیـەنێت. بەتایبـەتیش کاتێـک ئەزموونـە سـەیرەکەی ئـەو دوو سـەدەیەی دوایـی خوداوەنـدی دەوڵـەت ـ نەتـەوە لەبەرچاوانـە کـێ دەتوانێـت نکـوڵی لـەو راستییە بکـات کـە بـە دونیـاییبوونی خوداوەنـد دە هـەزار ئەوەنـدەی ئاسـمانیبوونەکەی چەوسانەوە، فرمێسک و خوێنی لێنەکەوتۆتەوە! بەتایبەتیش لەرەوشێکدا ئەزموونی ئـەو دوو سـەدە نایابـەی دوایـی خوداوەنـدی دەوڵـەت ـ نەتـەوە لەبەرچاوان بێت. سیفەتەکانی ئەو خوداوەندە چی بوون؟ سنوور، میللەت، ئاڵا، سروود، چینی ناوین، بیروکراسی و هاووڵاتی لێکچوو. خوداوەنـدی دەوڵـەت ـــ نەتـەوە لـەژێر سـێبەری ئـەو سیفەتانە چیکـرد؟ داگیرکـاریو شـەڕێکی ئەنجامـداوە کـە نموونـەیان لـەمێژوودا نـەبینراوە. بەسـیفەتی دیمورگ (خوداوەندە ئەندازیارەکە) سیستەمی دەوڵەت ـ نەتەوەی لەجیهان دامەزراند. بەمجۆرەش سەلماندی کە خوداوەندێکە تایبەتمەندێتی بتگەرایی لەبەرزترین ئاستدایە.

کۆمـەڵگای سیاسـی و ئـەخلاقی لـەپێناو ژیـان پێوسـتی بـەمجۆرە خوداوەندانە نابینێت. دانایی لەتیۆلۆژیا بـەهادارتر دەبینێت. حیکمـەت و دانایی سەرچاوەی خۆی لە زانست وەردەگرێت نەک تیۆلۆژیا. جۆرێک لـە سۆسـیۆلۆژیایە. سـەرباری سـەرجەم داسـەپاندنە تیۆلۆژییـەکان بـەڵام دەمارەکانی دانایی هەر لەکۆمەڵگای خۆرهەڵاتی ناویندا هەبووە. پێویستە

دانایی وەک یەکپارچەیی فەلسەفە و سۆسیۆلۆژیا و دۆخی تێکەڵ بەژیان هەڵسەنگێنرێت. لەکاتێکدا تا سەردەمی سوقرات دانایی فۆرمی سەرەکی بوو، بەڵام ئەو قوتابخانانەی دواتر ئاواکران ئەو نەریتەیان تێکدا. دیدگا و ژیان لەیەکتر دابڕان. ئەمەش زیان و زەبرێک بوو بەر کۆمەڵگای سیاسی و ئەخلاقی کەوت. دانایی بەشێوەی فەلسەفە خرایە خزمەتی دەوڵەتەوە. لەگەڵ ئەوەی بەردەوام لایەنی دانایی لەنەریتی پێغەمبەرایەتیدا زاڵە، بەڵام هەنگاو بە هەنگاو کرانەوەیان بەرووی تیۆلۆژیا خراپبوونی لەگەڵ خۆیدا هێناوە. پەیامبەر، واعیزو راهیبەکان چەندە بەلای تیۆلۆژیادا بڕۆن، بەو رادەیە لە دانایی دادەبڕێن و لەکۆمەڵگای سیاسی ـ ئەخلاقی دوور دەکەونەوە. ململانێیەکی بەردەوام لەنێوان فاکتەرەکانی ئەو دوالیزمەی کلتووری خۆرهەلاتی ناوین لەئارادایە. لەبنەڕەتدا ئەو ململانێیە رەنگدانەوەی گرژی نێوان دونیای شارستانی دەوڵەتی و جیهانی شارستانێتی دیموکراتیکە.

لەبەرامبەر داسەپاندنەکانی سەرەڕۆیی و پاشا کە دەرخواردی دەستەواژەی خوداوەند دراوە پێشکەشکردنی ناسنامەیەکی کۆمەڵگا کە لەرێگای تەسەوفەوە بە کاریگەرتر دەبێت ئەرکی سەرەکی داناییە. بەمجۆرەش بەرگری لەکۆمەڵگای ئەخلاقی و سیاسی دەکرێت. لەناو کۆمەڵگا بەدوای عاریفی و داناییدا دەگەڕێن. ئەو جۆرە راڤەیەی مێژووی خۆرهەلاتی ناوین گرنگە. رۆژانەییکردنی ئەو مێژووەش تازەگەری دیموکراتی روونتر دەکاتەوەو زیاتر مایەی تێگەیشتن دەبێت.

ج ـ کۆمەڵگای ئەخلاقی و سیاسی نکوڵیکردن لەکۆمەڵگای نەتەوەیی نییە. گۆڕانکاری بەردەوامی شێوەی کۆمەڵگاکان پێویستییەکی سروشتەکەیانە. هەمەڕەنگی شێوەو فۆرم دەوڵەمەندی ژیانە. ئەوەی پەسەند ناکرێت، وشکی یان داخراوبوونی فۆرمەکانی کۆمەڵگایە. محافەزەکاریش لەبنەڕەتدا سووربوونە لەسەر وشکی و داخراوبوونی فۆرم. ناسنامە کۆمەڵایەتیەکان چەندە نەرم و کراوەبن، بەو رادەیە جیاواز و هەمەڕەنگ دەبن، لەو سۆنگەیەوە بە ئازادی دەژین. چەمکی ناسنامەی دەوڵەت ـ نەتەوە ئاکانەیە، جەمسەری داخراو و وشکن.

فاشیزمیش سەرچاوەی خۆی لەو چەمکەی ناسنامەوە وەردەگریت. تێگەیشتنێکی بەمجۆرەی ناسنامە کۆمەڵایەتیەکان، بەردەوام لەناوەوە و دەرەوەی کۆمەڵگای نەتەوەیی بەدۆخی شەڕەوە لەئارادا دەبێت. کاتێک سروشتی نەرمو کراوەی ناسنامە کۆمەڵایەتیەکان لەگەڵ داسەپاندنی ناسنامە ساختە، داخراوو وشکەکان رووبەڕووی یەکتری بوونەوە ئەو جۆرە شەڕانە دەست لێبەرنەدراون. ئەگەر شەڕە ئایینیەکان یان نەتەوەییەکان (لە هەردووکیشیاندا وشکی و داخراوبوون تایبەتمەندێتی سەرەکی ناسنامەکانن) بێت هەردووکیان گوزارشت لەو شەڕەی ناسنامە دەکەن. زۆربوونی شەڕەکانی ناسنامەی ئایینی و نەتەوەیی خۆرهەلاتی ناوین لەو دوو سەدەیەی دواییدا گرێدراوی چەمکی ناسنامەیە کە مۆدێرنیتەی سەرمایەداری خوازیاری سەپاندنێتی. ناسنامەکانی دەوڵەت ـ نەتەوە کە لە بێژەنگی هەژموونگەرایی خۆیداوە لەناوەرۆکدا پاشکۆو سیخوڕی ناسنامەی ناوەندین. ناسنامەی ناوەندی بەردەوام وەک بڕیارگای سەرەکی دەستبەکارە. لەنزیکەوە سەرقاڵی کۆلۆنیو وەکالەتە وابەستەکانی دەبێت. لەکاتی پێویستیشدا سەرلەنوێ ڕێکیاندەخاتەوە.

هەروەکو تەواوی جیهان لەخۆرهەلاتی ناوینی رۆژی ئەمڕۆشمان ناسنامەکانی ئەو دوو سەدەیەی دوایی دەوڵەت ـ نەتەوە کۆن بوون و بوونەتە کۆسپێک لەپێش ئەو سەرمایەدارییەی خوازیارە جیهانگیری چڕتر بکاتەوە. خۆڕاگری محافەزەکارانەی دەوڵەت ـ نەتەوە بناخەی قەیرانی بونیادی پێکدێنێت. ئەمە ئەو ناکۆکییە سەرەکیەیە کە خودی سیستەم تێیدا دەژیت. بەڵام چارەسەری نادۆزێتەوە. لەکاتێکدا ناکۆکیەکانی نێوان دەوڵەت ـ نەتەوەکانی ئەفغانستان تا مەغریب، لە قەفقاسیاوە تا دەگاتە زەریای هیندی و سەرمایەداری جیهانگیری لەلایەکەوە زیاد دەکات، لەلایەکی دیکەشەوە ڕێگا بۆ ئەو شەڕانە دەکاتەوە کە بەردەوام روودەدەن. سەرمایەداری زۆر جار ئاگادارە کە ناتوانێت دەوڵەت ـ نەتەوە لەناو ببات. کاتێک دەیەوێت ریفۆرمی تێدا بکات بەردەوام رووبەڕووی بەرخودانی ئەو دەوڵەتانە دەبێتەوە. ئەو توێژانەی لەرێگای دەوڵەت ـ

نەتەوەوە گەورە و دەوڵەمەند بوون بەرامبەر سەرمایەدارییەکی راسیۆنالتر بەرخودان دەکەن؛ ئەنجامی ئەوەش شەڕ و قەیرانی زیاترە. هەروەکو چۆن دوا پڕۆژەی خۆرهەڵاتی ناوینی مەزنی ئەمریکا لەو راستیەوە سەرچاوە دەگرێت، دیسان لەمیانەی ئەو راستییەوە دەتوانین هۆکاری سەرنەکەوتنەکەشی تێبگەین. بنبەستبوونەکەی ناوچە زۆر لەتەنگەژەکانی یەکەمین و دووەمین جەنگی جیهانی سیستەم قووڵترە. لەبەر ئەم هۆکارەشە بەهیچ جۆرێک شیکارناکرێت. دەستەواژەی قەیرانی بونیادیش مانای خۆی لەو ماهیەتەی راستی وەردەگرێت.

لەدۆخێکی بەمجۆرەدا تاوەکو ناسنامەی وشک و داخراوی دەوڵەت ـ نەتەوە دەرباز نەکرێت خۆرهەڵاتی ناوین خاوەن ئەگەری دۆزینەوەی چارەسەریەکی مانادار نییە بۆ هیچ یەکێک لەکێشەکانی ـ ئیتر ئەمە سەرچاوەی خۆی لەپەرەسەندنی یەکپارچەیی کلتووری کۆمەڵگای مێژوویی وەربگرێت، یان رەنگدانەوەی ناکۆکی ناوخۆی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری بێت ـ سەرجەم ئەو هەوڵ و کۆششانەی لە ئەفغانستان و ئێراق بۆ سەرلەنوێ بونیادنانەوەی دەوڵەت ـ نەتەوە دەخرێتە گەڕ بەفیڕۆ دەچن. لەکاتێکدا یارمەتیەکی سنووردار (پڕۆژەی مارشال*)ی ئەمریکا بۆ ئەوروپای رووخاوی دوای دووەمین جەنگی جیهانی بۆ سەرلەنوێ بونیادنانەوەیان بەس بوو، بەڵام هەرچەندە دوو هێندە زیاتر هاوکاری پێشکەش بەشوێنێکی بچووکی وەک ئێراق کراوە بەڵام سەرلەنوێ بونیادنانەوەی ئەو وڵاتە سەرکەوتوو نییە. رووداوەکانی ئێراق لەبنەڕەتدا سەرجەم راستیەکانی ناوچە روون دەکاتەوە. ئەویش هەواڵی ئیفلاسو قەیرانی مۆدێرنیتەی سەرمایەدارییە لەسەر هەرسێ کۆڵەکەکەیەوە. لەدەرەنجامدا خۆرهەڵاتی ناوین بەو هەموو دەوڵەت ـ نەتەوە،

---

* پڕۆژەی مارشال: پڕۆژەیەکی ئابوورییە جۆرج مارشاڵی سەرۆک ئەرکانی سوپای ئەمریکا لە کاتی دووەمین جەنگی جیهانیو وەزیری دەرەوەی دوای شەڕ گەڵاڵەی کرد. مەبەستی سەرلەنوێ ئاواکردنەوەی ئەورووپاو سەرمایەکەی بوو بەو ئامانجەی هەڵکشانی شۆڕشگێڕی بەربەست بکاتو سەرمایەی فەرەنساو ئیتالیاش کۆنترۆڵ بکات.

ئیندوستریالیزم و سەرمایەدارییەی خاوەنداریتی دەکات تەنیا قەیران و شەڕ بەرهەم دێنێت.

بەلام پێویستە دیسان دووبارە بکرێتەوە کە ئەو شەڕو قەیرانانەی لەئاراداان تەنیا هی دوو سەدەی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری نییە، بەڵکو لەهەمانکاتدا شەڕو قەیرانی بونیادی شارستانی چینایەتی ـ دەوڵەتی پێنج هەزار ساڵەشن. رێگە چارەی شیمانەکراو ناچارە ئەو واقیعە بە بنەمابگرێت.

## لەخۆرهەلاتی ناوین تازەگەری دیموکراتی بەرامبەر مۆدێرنیتەی سەرمایەداری

لەدونیای زهنیەتی خۆرهەلاتی ناوین گفتوگۆی تێروتەسەل سەبارەت بە مۆدێرنیتە ئەنجامدراوە. ئەو گفتوگۆیانەی بناخە زانستی و تەکنۆلۆژییەکەی پەسەند دەکات و فاکتەرەکانی دیکەی لە دەرەوە دەهێڵێتەوە یاخود ئەوانەی هەموو شتێکی پەسەند دەکەن لەتێگەیشتنێکی زانستیانەی ماهیەتی ئەو شتگەلە دوورن کە رووبەرووی بوونەتەوە. چونکە بژارەکە گرێدراوی ئەوان نەبوو. کاتێک مۆدێرنیتەی سەرمایەداری بەسیفەتی هەژموونگەرایی گەمارۆی دان جگە لە سازشکاریکردن لەگەڵیدا رێگە چارەیەکی دیکەیان نەدۆزیەوە. بەبێ جیاوازی نێوان بۆچوونی راسترەو ــ چەپڕەو، تا ئێستاش بە دونیای زهنیەت و بۆچوونێک نەگەیشتووە کە رۆژهەلاتناسی دەرباز کردبێت. بۆ چوونی وەها زۆر کەمن لەناو مۆدێرنیتەی سەرمایەداریدا نەتوێنرابنەوە یان دووچاری سازشکاری نەکرابن. هەڵبەتە ئەوەی لەبیروبۆچووندا سەرکەوتنی بەدەست نەهێنابێت لەژیانیشدا سەرکەوتوو نابێت. چونکە لەبەشەکانی پێشوو هەڵسەنگاندن سەبارەت بە بەرهەڵستکاری سیستەم ئەنجامدرابوون، تەنیا لەکاتی پێویستدا دووبارەی دەکەینەوە.

دەشێت لەرێگای پارادایمی تازەگەری دیموکراتیەوە قەیرانی بونیادی و پێکداداانەکانی شیکار بکرێت و ئەگەرەکانی چارەسەری بخرێتە روو. قووڵبوونەوەی بنبەستبوونی دەوڵەت ــ نەتەوەو یەکپارچەیی مێژوویی چەندەی دەچێت دەرفەتی بەدیهاتنی ئەو جۆرە ئەگەرانە زیاتر دەکات.

١ ـ ناکۆکی قووڵی جیۆکلتووری خۆرهەڵاتی ناوین لەگەڵ پارچەگەرایی دەوڵــەت ـــ نەتــەوە هێــز بــە مەیلــەکانی هــەمووێتی و ئەنتگراسـیۆن دەبەخشێت. لـەهیچ قۆنـاخێکی مێـژووی خۆیـدا ناوچـە هێنـدەی قۆنـاخی دەوڵەت ـ نەتەوە پارچەبوونی بەخۆیـەوە نـەدیوە. ئەو پارچەبوونانـەش زیاتر لە ڕەهەندی دەسەڵاتدا ماونەتەوەو، کاریگەریەکی ئەوتۆی نەکردۆتە سەر ژیانی کلتووری. توانای ژیـانی هاوبـەش و تێکـەڵی هـەزاران سـاڵەی جیاوازییە ئاینی و ئەتنیکیەکان پەیوەندی بە یەکپارچەیی جیۆکلتوورەوە هەیە. تەنانەت هەڵکشانە هەژموونگەراییەکانی پەیوەست بـە دەسـەڵاتیش بـەردەوام لەئاسـتی ناوچـەدا پەرەیسـەندووە. لەیەکـەمین هەژموونگـەرای مێـژوو تۆمـاری کـردووە ـــ پاشـای ئەکـەد سـەرجۆن ـــ تـا دەگاتـە دوا هەژموونگــەرایی عوســمانی یەکپارچــەیی لایــەنی قــورس و لەپێشــی دەسەڵاتیش بووە. هەر هێزێکی نوێی هەڵکشا و بەخێرایی بووە بە هێزێکی هــەرێمی. ئەگــەر شارســتانییە چینایــەتی ـــ دەوڵەتیــەکان بێــت، یــان شارستانێتییە دیموکراتیـەکان کـە ڕەهەنـدی ئـەتنیک، ئـایین و مەزهـەبی دەربــاز نــەکردووە، هــەموویان بەشـێوەی کلتــووری هــەرێمی ژیــاون و شوێنپەنجەیان دیارە. ناسنامەیەکی شارستانی داخراوی لـەجۆری ژاپۆن، چین، هیندستان و تەنانەت بریتانیا لـە جیۆکلتـووری خۆرهـەڵاتی نـاوین جێگای باس نەبووە. بێگومـان لەگـەڵ ئـەوەی جیۆکلتـووری هاوشـێوە لـە ئەفریقیا و ئەمریکای باشوور جێگای باسە، بەڵام وەک ئەوەی خۆرهەڵاتی نــاوین لەئاسـتی شارسـتانی ناوەنـدی نییـە. فاکتـەرەکانی مۆدێرنیتـەی سەرمایەداری لەگەڵ هەردوو مەیلی جیۆکلتووری مێژوویی ناوچە ناکۆکە و لەشــەڕدایە. گفتوگـۆکردنی بــەردەوام لــەبارەی خۆرهــەڵاتی نــاوین و کێشەکانی و چارەسەرنەکردنی گرێدراوی ئەو ناکۆکییە قووڵانەیە.

کۆمەڵگای ئەخلاقی ـ سیاسی، ئیکۆلـۆژی و ئیکۆنۆمیک کـە فاکتـەرە ســەرەکیەکانی مۆدێرنیتــەی دیمــوکراتین جیۆکلتــووری ناوچــە بەبنــەما دەگرێــت. هــیچ فاکتــەرێکی پارچەگــەرایی ناســەپێنێت. بەپێچەوانــەوە ئەلتەرناتیفی ئەو فاکتەرە پارچەگەرایانە دەئافرێنێت کە لەئارادان.

تازەگەری دیموکراتی سەبارەت بەچەمکی نەتەوە نەرمە. دیدگای بونیادی نەتەوەیی کە زمان، ئەتنیک، ئایین و دەوڵەت بەبنەما ناگرێت بەڵکو فاکتەرەکانی فرەزمانی، فرەئەتنیکی، فرە ئایینی، فرە مەزهەبی و فرەلایەنی سیاسی لەبونیادی خۆیدا کۆدەکاتەوە و رۆڵێکی گەورەی چارەسەری دەبینێت. ئەم چەمکەی تازەگەری دیموکراتی سەبارەت بەنەتەوەی فرە فاکتەری یەکگرتوو بەرامبەر چەمکی نەتەوەی پشتبەستوو بە دەوڵەت، زمان، ئایین، مەزهەبو ئەتنیک زەمینەیەکی بەهێزو تۆکمە بۆئارامی، ئاشتی و برایەتی فەراهەم دەکات کە بۆ جیۆکلتووری خۆرهەلاتی ناوین پێویستە. دەشێت بگوترێت میللەتە گەورەکەی ناوچە واتە نەتەوەی (أمە) خۆرهەلاتی ناوین لە هەرسێ ئایینە تاکخوداییەکەو هەر جۆرە زمان، ئەتنیک و قەوارەی سیاسی پێکبهێنرێت. وەک چۆن نەتەوەی ئەمریکا (وڵاتە یەکگرتووەکان) یان نەتەوەی ئەوروپا (یەکێتی ئەوروپا) جێگای باسە دەشێت نەتەوەی خۆرهەلاتی ناوینیش بئافرێنرێت. بناخەی کلتووری ئەوەیان لە هەردوو جەمسەریش لەبارتر و بەهێزترە. دەشێت دۆخی پارچە پارچەیی نەتەوە گەورەکانی (عەرەب، تورک، کورد، فارس)، گۆشەگیری نەتەوە بچووکەکان ـــ بە ژمارە ـــ (ئەرمەنی، یەهوودی، سریانی، گەلانی قەفقاس)و کێشەی کەمینە ـــ زۆرینە لەچوارچێوەی چەمکی نەتەوەیەکی گەورە، کراوە و نەرمی بەمجۆرە بەرێگە چارەی نموونەیی بگەیەنیرێت.

روونو ئاشکرایە کە پارادایمی نەتەوەی دیموکراتیک خاوەن ئەو ماهیەت و توانستەیە کە کۆتایی بەو بنبەستبوون و پێکدادانە قووڵانە بێنێت کە زهنیەتی هۆمۆژەنکاری، شەڕانگێزی، میللیگەرایی، رەگەزگەرایی، ئایینگەرا و پۆزیتیڤیست و پاوانەکانی داگیرکاری و دەسەڵاتگەرایی رێگایان لەپێش کردۆتەوە.

فاکتەری ئیکۆنۆمیک و ئیکۆلۆژی تازەگەری دیموکراتی تەنیا بە بەلاوەنانی ئەو خراپەکاریانە ناوەستێت کە سەرمایەداری و ئیندوستریالیزم وەک قەیران بەسەر ژینگەو ئابووریان داسەپاندووە، تەنانەت کۆمەڵگاکانی ناوچەشیان لەسەر بنەمای دەوڵەت ـــ نەتەوە

پارچـــە کـــردووە و ئەمـــەش هۆکـــاریکی ســـەرەکی دابـــەزینی ئاســـتی بەرهەمهێنانـــە، لەهەمانکاتـــدا ئـــەو فاکتەرانـــە پێویســـتیەکانی کۆمـــەڵگای ئیکۆلـــۆژی فەراهـــەم دەکـــات و زۆرتـــرین بەرهـــەم بەدەســـت دێنێـــت و چوارچێوەیەک پێشکەش دەکات کە زیان بـە ژینگـە ناگەیـەنێت. هـەرجۆرە یەکینەیـەکی ئیکۆنۆمیـک و ئیکۆلـۆژی کۆمینـال (هاوبـەش) کـە لـەدەوری کۆمۆنەکانی کشتوکاڵ ــ ئـاو ــ وزە ئاوابکرێت دەرفـەت بـۆ سیستەمێک دەرەخسێنێت کـە رێگـا بـەو هاوکارییـە دەدات کـە کۆمـەڵگای ئیکۆلـۆژی و ئیکۆنۆمیک پێویستی پێی هەیە و کلتووری مێژوویش دەیسەپێنێت، بێکاری بەربەست دەکات و کارکردن بەئازادی دادەنێت و رێی بە پیتی بەرهەمهێنان دەکاتەوە.

فاکتەرەکانی کۆمەڵگای سیاسی و ئەخلاقی تازەگـەری هەژموونگـەرایی دەوڵـەت ـــ نەتـەوەی ئافرێنـەری فەتیشـیزمی دەسـەڵات و یاسـا دەربـاز دەکات و رێگا خۆشکەرە بۆ پەرەسەندنی کۆمەڵگای دیموکراتیک. لـەجیاتی پاوانگەرایی دەسەڵات کە خاوەن ناسنامەیەکی وشک و داخـراوەو جیـۆ ـــ پۆلیتیکـای ناوچـەی پارچـە پارچـەو نـەزۆک کـردووە، لەمیانـەی چـەمکی سیاسەتی دیموکراتییەوە کە نەرمە و لەئاستی ناوچە و تەنانـەت جیهانـدا کراوەیە ئەو برایەتی و یەکپارچەییە دێنێتە ئاراوە کە هەمەڕەنگی لـەخۆوە دەگرێـت و زۆریـش پێویسـتە. لەسـەر یەکپارچـەیی کلتـووری کۆمـەڵگای مێژوویی کۆمەڵگای دیموکراتی دەئافرێنێت.

٢ ـ لەسەر بنەمای ئەو شیکارە سەرەکیانە دەشێت پێشنیاری کۆنکرێتی ســـەبارەت بەیەکپارچـــەیی نەتـــەوە دیموکراتـــەکان بخرێتـــە ڕوو. وەک دەزانرێت یەکێتیەکانی دەوڵەت ــ نەتـەوەکان لـەجۆری پـەیمانی بەغـداد، سەنتۆ و رێکخراوی هاوکاری هەرێمی بۆ گەشەپێدان کە لەرابردووی نزیـک بـەئامانجی چارەسـەرکردنی کێشـەکانی زادەی مۆدێرنیتـەی سـەرمایەداری ئـاواکران لەبـەر هۆکـارە بونیادییـەکانیان درێژخایـەن و هێزی چارەسـەر نەبوون. هەروەها رێکخراوەکانی لەجۆری کۆمکـاری عـەرەبی و رێکخـراوی کۆنگرەی ئیسلامی کە تا ئێستاش هەوڵی لەسەر پێ راگرتنیان دەدرێت هیچ کێشەیەکی گرنگی نـاوچـەیان چارەسـەر نـەکردووەو بێکاریگـەرن، بـەهۆی

ماهیەتی دەوڵەت ـ نەتەوەکانیان خاڵیکی مایەی تێگەیشتنە. چونکە هەر دەوڵەت ـ نەتەوەیەکی ناوچە گرێدراوی ناوەندێکی هەژموونگەرایی سەرمایەداری تایبەت بەخۆیەتی. ناتوانن لەژێر کۆنترۆڵی ئەو ناوەندە دەرکەون کە پێیانەوە گرێدراون؛ ئەو توانستەیان نییە. سەرباری کۆبوونەوەو لوتکە یەک لە دوای یەکەکانیان، بەڵام هەربێکاریگەرو بێچارەن: ئەمەش گرێدراوی ئەو واقیعەیانە.

هێزی چارەسەری تازەگەری دیموکراتی سەبارەت بە یەکپارچەیی سیاسی ناوچە، گرێدراوی توانستی چارەسەری ئەو فاکتەرانەیە کە بەبنەمای گرتوون. هیچ فاکتەرێکی ناوخۆ جێگای باس نییە کە وەک کۆسپێک لەپێش یەکپارچەیی سیاسی بوەستێتەوە. بەپێچەوانەوە تەواوی فاکتەرە ئیکۆلۆژی، ئەخلاقی و سیاسیەکان لەچوارچێوەی یەکپارچەیی سیاسیدا دەتوانن کۆمەڵگای دیموکراتی بونیاد بنێن کە زۆر بەحەسرەتی بوون. سەرجەم هێزە کۆمەڵایەتیەکانی لەناوچە لەناو یەکگرتنێکی سیاسیدان بەشێوەیەکی ئاسان و سەرکەوتووانە دەتوانن رووبەرووی دەستوەردانە هەژموونگەراییەکانی زادەی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری ببنەوەو کێشەکانیان چارەسەر بکەن.

لەو سۆنگەیەوە دەشێت کۆمۆنەی دیموکراتی خۆرهەڵاتی ناوین وەک پێکهاتەی سیاسی کۆمینەی کۆمۆنەکانی سەرجەم بوارەکان پێشنیار بکرێت. هەڵبەتە کێشەکانی ئێراق، ئیسرائیل ـ فەلەستین و ئەفغانستان کە لەژێر گەمارۆی زهنیەتی دەوڵەت ـ نەتەوەدایە لەمیانەی زهنیەتێک چارەسەر ناکرێت کە خۆی سەرچاوەی کێشەکانە. ئەو زیان و خراپەکاریانەی تاوتوێکردنی کێشە سیاسی ـ کۆمەڵایەتیەکانی ناوچە لەو دووسەدەیەی دوایی لەمیانەی ئەو زهنیەتەوە لەگەڵ خۆیدا هێناون فێرکەر و ئەزموون بەخشن. بەشێوەیەکی بەرچاو روون بۆتەوە کە هەم هەڵوێستی عەلمانی هەم ئایینگەرا لەجیاتی دۆزینەوەو پەرەپێدانی چارەسەری، جگە لەقووڵکردنەوەی بێچارەیی هیچ رۆڵێکی دیکەیان نەبینیوە.

پێویستە جیۆکلتووری خۆرهەلاتی ناوین لە جیۆپۆلیتیکاکەیدا رەنگبداتەوە. ئاشکرایە کە گونجاوترین چوارچێوەش بونیادێکی کۆمینالّی دیموکراتیک و کۆنفیدراڵە (باسی فیدراسیۆن و کۆنفدراسیۆنی دەوڵەت ناکەم). چونکە چەندە کۆمۆن یاخود یەکینەی جیاواز جێگای باس بێت لەچوارچێوەی کۆنفیدراسیۆن یاخود کۆمۆنی سەرەکی جێگای هەموویان دەبێتەوە. لەچوارچێوەی ئەو هەلویستە زۆر بەئاسانییەوە دەرکی پێدەکرێت کە دەوڵەت ـ نەتەوە چەندە ناتەواوەو گۆشەگیرە. بەرێوەچوون بەبێ گیرۆدەبوون بەکۆسپەکانی دەوڵەت ـ نەتەوە کە بەزارەکی خۆی بە "سەربەخۆخواز" دادەنێت و لەناوەرۆکیشدا بەهەزارو یەک داوەوە گرێدراوی ناوەندەکانی هەژموونگەرایی سەرمایەدارییە؛ جێگای گرنگی و بایەخە. لەهەموو بوار و شوێنەکانی ناوچە دەرفەت و پێویستی بەتۆڕی بەرفراوان و بونیادی پێکهاتەی سیاسی، کۆمۆنەی ئیکۆلۆژیک، ئیکۆنۆمیک و جڤاتە دیموکرات ـ سڤیلەکان هەیە کە لەسادەکانەوە بەرەو ئالۆزەکان دەچێت و هەرگیز گیرۆدەی ناسنامەی وشک و داخراو نابن، خۆیان بە سەربەخۆخوازی نانوێنن و پرەنسیپی سەرەکی فەلسەفەی گەردوونی ـ یەکانەیی بە بنەما دەگرن.

گرێدراو بە کۆمۆنی کشتوکاڵ ـ ئاو ـ وزەی تایبەت بە دیجلە ـ فورات یەکێک لەو ناوەندە سیاسییە یەکگرتووانەی ئاوابکرێت دەشێت یەکێتیەک بێت کە لەمیانەی وەرچەرخان و ریفۆرمەوە کۆماری تورکیا، کۆماری عەرەبی سوری (سوریای گەورە: لوبنان، ئوردن، فەلەستین ـ ئیسرائیل یش لەناودا) و کۆماری ئێراقی فیدراڵ جێگای خۆیان تێدا بگرن نەک بە رووخاندنیان. هەرچەندە ئەو کۆمارانەی ئێستا لەسەرەتا کارەکتەری دەوڵەت ـ نەتەوە بپارێزن، بەلام دەشێت بەپێی پرۆسە و قۆناخ بەناسنامەی دەوڵەت ـ نەتەوەی کراوە بگەن و بەرەو یەکێتی دیموکراتییانە هەنگاو بهاوێژن. ئەو قەوارە سیاسییەی دێتە ئاراوە ناچارە بۆ دیموکراسییەک کراوە بێت کە زۆر لەدیموکراسی ئەمریکا و یەکێتی ئەوروپا پێشکەوتووتر بێت. بەهۆی قورسایی و لەپێشینەیی فاکتەرەکانی دیموکراتی کۆمینال بەمجۆرە دەبێت. تەواوی ناسنامەکانی مۆزاییکی

ناوچە دەتوانن جێگای خۆیان تێدا بگرن. بەر لەهەموو شتێکیش دەشێت ئەو ناسنامانە بەشێوەی یەکینەکانی نەتەوەی دیموکراتیک سەرلەنوێ بونیاد بنرێنەوە. بونیادنانێکی بەمجۆرە دەتوانێت هەرەشەو نیگەرانی ئەو شەرو پێکدادانانە بهێنێتە نزمترین ئاستەوە کە سەرچاوەی خۆی لە میللیگەرایی یەک ئەتنیک، یەک زمان و داخراویی و وشکی نەتەوە ـ دەوڵەت وەردەگرێت. دەتوانێت راستی بەیەکەوە ژیان نوێ بکاتەوە کە بەهەزاران ساڵ لەمێژوودا بەردەوامە و بەرۆژی ئەمرۆشمان گەیشتووە.

کاتێک گەلە خاوەن کلتوورەکانی ناوچە عەرەب، کورد، ئەرمەنی، یەهوودی، ئاشووری (سریانی ـ کلدان)، تورک، تورکمان، بەرەچەڵەک قەفقاسیەکان و هەندێک ئەتنیک (عەشیرەتو قەبیلە) ی بەرەچەڵەک فارس وەک ناسنامەی نەتەوەی دیموکراتیک بونیاد بنرێن هەم وەڵامێکی کۆک و گونجاو دەدرێتەوە لێکچوونی کلتووری مێژوویی، هەم لەشەڕ و پێکدادانەکان و بنبەستبوونی پەرتکە ـ زاڵبە رزگاریان دەبێت کە مۆدێرنیتەی سەرمایەداری لەرێگای دەوڵەت ـ نەتەوەوە دەیوروژێنێت. بەهۆی بایەخدانیان بە ناسنامەی نەرمو کراوە دەتوانن یەکگرتنێکی (یەکێتی) دەوڵەمەند و بەپیت لەنێوان خۆیان ئاوابکەن، لەو سۆنگەیەوە دەتوانن پەرە بەبرایەتی بدەن. هەروەک زۆرجار نموونەکانیان لەمێژوودا بینراوە، هەمان هەڵوێست بۆ ناسنامە ئایینیەکانیش لەجێگای خۆیدایە. چونکە زۆربەی زۆرینە پشت بە باوەڕییەکی تیۆلۆژی هاوبەش دەبەستن، یەکێتی ئاسانتریش پەرە دەسەنێت. هەروەکو زۆر جار لەمێژوودا روویداوە ئایینە ئیبراهیمیەکان موسەویێتی، کرستیانی و موسلمانێتی و سەرجەم مەزهەب و تەریقەتەکانیان دەتوانن لەمیانەی هەمان چەمکی ناسنامەی ئایینی نەرمو کراوە لەیەکتری نزیک ببنەوەو رێگا لەپێش سەنتێزی بەرهەمدار بکەنەوە. لەناو یەکگرتنی سیاسی ئاواکراودا فرە زمانی و گەڕان بەدوای ناسنامە یاخود سیمبۆلەکانی لەچوارچێوەی نیشتیمان و نەتەوەی هاوبەشدا نابن بەکێشە. چونکە شار، خۆجێیی و ناوچەکان وەک ناسنامەی کۆک و گونجاو لەگەڵ تایبەتمەندێتیەکانی کلتووری مێژوویی و یەکینەی دیموکراتیک بونیاد دەنرێن دەبن بەشوێنی هاوکاری نموونەیی

نێوان جیاوازییەکان. کارەکتەری ئەخلاقی و سیاسی سەرجەم ئەو ناسنامانە مەرجە. یاسا جێگای ئەخلاق و سیاسەت ناگرێتەوە، بەڵکو لەخزمەتی ئەخلاق و سیاسەتدا دەبێت.

کۆنفیدرالیزمی دیموکراتی کە وەک ناوەندی کەمەندکێشی ناوچە پەرەی پێدەدرێت، لەبەرئەوەی کۆمۆنە ئیکۆنۆمیک و ئیکۆلۆژیەکان بەبنەمادەگرێت (چونکە بەشێوەیەکی دیکە خاک ــ ئاو ــ زەوی ــ بەپیت نابێت) نموونەییترین و مێژوویترین وەلام دەبێت بەرامبەر دۆخی شەڕوپێکدادان، رەوشی کائۆس و قەیرانی بونیادی کە سێ ئەسپسوارە مەحشەرییەکەی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری (قازانجگەرایی سەرمایەداری، ئیندوستریالیزمو دەوڵەت ـ نەتەوە) رێگایان لەپێش کردۆتەوە.

وەک بڵێی جیۆکلتوور و جیۆپۆلیتیکای (شوێنگەکەی لەناوەڕاستی عەرەب، تورک و فارسەکان، خاڵی بەیەکگەیشتنی کلتوورەکانە) کوردستان ناچاری یەکێتیەکی سیاسی بەمجۆرە دەکرێت. ئەو سیاسەتە هەژموونگەراییەی لەسەردەمی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری بریتانیا لەسەر هیندستان و خۆرهەڵاتی ناوینی بەڕێوەبردووە، بەردەوام کوردستان لەدۆخی وڵاتێکی بێچارەییدا هەڵاوێردراوە و خواستوویانە بیکەن بەئامرازی کۆنترۆڵکردنی ناوچەکە. بەمجۆرەش کراوە بەئامرازی زۆر گونجاوی کۆنترۆڵکردنی کاریگەری دەسەڵاتی عەرەب، تورک و فارسەکان. لەرۆژی ئەمڕۆماندا لەمیانەی ئاواکردنی دەوڵەت ــ نەتەوەیەکی بچووکی درەنگ وەخت لەسەر بەشێکی بچووکی باشووری کوردستان کە باکووری ئێراقی پێدەڵێن لەگەڵ ئەمریکا نیازی بەردەوامکردنی هەمان رۆڵی (ئەرمەنستان ، یۆنانستان) یان هەیە. وەک بڵێی مێژوو کوردستان و کێشەی کوردی کردووە بەدووەمین کێشەی یەهوودی. بەلانی کەم کوردان ئەمڕۆ لەقۆناخێکی بەمجۆرەدا دەژین. بێگومان سیاسەتی نایەکسانانەی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری بۆ ئاواکردنی دەوڵەت ـ نەتەوە لەخۆرهەڵاتی ناویندا رۆڵێکی دیاریکەر لەو رەوشەدا دەبینێت. دەوڵەت ـ نەتەوەکانی تورک، عەرەب و فارس سڕینەوەی کوردستان و لەناوبردنی کوردان دەسەپێنن. لەرێگای وردە دەوڵەت ــ نەتەوەیەکی کوردەوە

بەرەنگاربوونەوەی گەمارۆیەکی سێیانەی قڕکردنی بەمجۆرە جێگای باس نابێت. تەنانەت ئەگەر بەرپەرچیش بدرێتەوە وەک چۆن ئێستاش بەردەوامە ئەنجامەکەی کۆمەڵکوژی و جینۆساید دەبێت. ئەو وانەو ئەزموونە مێژووییەی پێویستە لەو پارادۆکسە دیرۆکییە وەربگیرێت؛ لەرێگای پێکهاتە سیاسییە دیموکراتیەکان ـ کە دەوڵەت ـ نەتەوەنین ـ و کۆمۆنە ئیکۆنۆمی و ئیکۆلۆژیەکان هاوبەشێتی و پشکداربوونی سەرجەم گەلانی ناوچەیە لەسەرووی هەمووشیانەوە بەشداربوونی نەتەوە دراوسێکانە لەچارەسەری تازەگەری دیموکراتیدا.

ئەگەرئاورێک لەمێژوو بدرێتەوە دەبینرێت کە ئەو شتکەلەی کلتووری چاخی نیولیتیکی پانزدە هەزارساڵەی هیلالی بەپیت و دۆڵەکانی دیجلە ـ فورات و کلتووری شارستانی ناوەندی پێنج هەزار ساڵەو دووسەد ساڵی دوایی مۆدێرنیتەش بەردەوام بانگهێشتیان بۆ پێکهاتە سیاسییە یەکپارچەکان کردووە. دەسەڵاتە سیاسییە ناوەندیەکانی لەژێر ناوی سۆمەر، ئەکاد، بابل، گۆتی، ئاشوور، هۆری، میتانی، ئورارتوو، هیتیت، ماد، پارس، هێلین، ساسانی، بێزەنتی، ئەمەوی، عەباسی، سەلجۆقی، مەغۆلی و عوسمانی و هەروەها دەسەڵات یان کاریگەرییە دیموکراتییەکانی لەژێر هەمان ناو یاخود ناوی جیاواز وەک رکابەرەکانیان بەردەوام لەئامادابوون پێکهاتەی سیاسی یەکپارچە و یەککگرتوون. هەڵبەتە کاریگەری دایکسالاری چاخی نیولیتیک ئاشنای جیاوازی و کۆیلایەتی نەبوو، پوختەی پێکهاتەی یەکسان، ئەخلاقی و سیاسی سروشتی بوو. گێرە شێوێنیەکانی پێکدادان و پارچەگەرایی دەوڵەت ـ نەتەوەی ئەو دووسەدەیەی دوایی تەوەرەی ئەورووپا وردەکاریەکی بچووکی ناو ئەو مێژووە درێژەیە. جارێکی دیکە ئاراستەگرتنی مێژوو بەگوێرەی لێشاوی راستی و جیۆکلتووری و جیۆپۆلیتیک لەمیانەی تازەگەری دیموکراتیەوە بەدیدێت کە لەسەر میراسی شارستانێتی دیموکراتی ئاوا دەکرێت.

دەشێت بیرۆکەی یان پرۆژەی کۆنفیدراسیۆنی دیموکراتییانەی دیجلە ـ فورات یەکەمین هەنگاوی هاوبەشی چارەسەرکردنی ئەو جینۆساید،

کۆمەڵکوژی، پێکدادانو قەیرانە هەنووکەیی و ئەو کێشانە بێت کە میراسی دەوڵەمەندی مێژوویی شارستانی لەخۆرهەڵاتی ناوین کەڵەکەی کردوون. پرۆژەیەکی بەمجۆرە دۆخی ئاسمیلاسیۆن و پێکدادانی نێوان نەتەوە زۆرینەکانی عەرەب، تورک، کورد و فارس لەگەڵ کلتوور و نەتەوە کەمینەکان پێچەوانە دەکاتەوەو لەمیانەی پێکهاتە سیاسییە دیموکراتییە کۆمینالەکانی هاوکاری بەبنەما دەگرن رێگا لەپێش هاوبەشییەکی ئەودیو دەوڵەت ـ نەتەوە بکاتەوە. پرۆژەی کۆنفیدراسیۆنی دیموکراتییانەی دیجلە ــ فورات دەبێتە مانادارترین یەکەمین هەنگاوی بەرەو ئاراستەی ئەو مێژووە دەهاوێژرێت. هیچ گومانێکم نییە کە لەرێگای ئەو پرۆژەوە هەنگاو بەهەنگاو دەستپێکی چاخی خۆرهەڵاتی ناوینی دیموکراتیک مەیسەر دەبێت کە زۆر بەهادارە و شایستەی مێژوو و کلتووری کۆمۆنەکانی کۆمەڵگای دیموکراتی، ئیکۆنۆمیک و ئیکۆلۆژیکەو بەشێوەیەکی هەمەلایەنە هەڵدەکشێت. سەردەمی خۆرهەڵاتی ناوینی دیموکراتی هەم ژیانەوەی مێژووی کۆن، هەم دەبێتە هاوار و خۆشی ژیانی ئازادی مێژووی نوێ.

کاتێک لەچوارچێوەی ئەو پرۆژە سەرەکیەوە تەماشای واقیعی خۆرهەڵاتی ناوین بکرێت، دەشێت باس لەهەندێک پرۆژەی پلە دوو بکرێت. هەروەکو چۆن لەچاخی نیولیتیک و سەردەمی شارستانی لەئارادابووە، دەشێت پرۆژەی کۆنفیدراسیۆنی دیموکراتییانەی باکووری ئەفریقیا لەتەوەرەی میسر و لیبیا (دۆڵی نیل ناوەند بێت) لەجەمسەری رۆژئاوای هیلالی بەپیتدا ئاوابکرێت کە بەرەو میسر و باکووری ئەفریقیا درێژ دەبێتەوە. پرۆژەی کۆنفیدراسیۆنی دیموکراتییانەی رۆژهەڵاتی ئێران، ئەفغانستان و پاکستان (ناوی ئەم دەوڵەت ــ نەتەوانە لەگەڵ جیۆپۆلیتیک و جیۆکلتووری مێژوویی گونجاونین) کە پەنجابی جەمسەری رۆژهەڵاتی هیلالی بەپیت ناوەندی بێت پێویستیەکی بە پەلەترە. پرۆژەیەکی دیکەی گرنگ کە لەچوارچێوەی تازەگەری دیموکراتییانەی خۆرهەڵاتی ناوین لەجەمسەری رۆژهەڵات بیری لێدەکرێتەوە کۆنفیدراسیۆنی دیموکراتییانەی ئاسیای ناوینە کە ناوەندەکەی ئۆزبەکستانی ئێستا بێتو لە دۆڵەکانی سەیهون و جەیهون ئاوابکرێت.

هەروەها بەهۆی گروپە مەزهەبی و قەبیلەکانی تا ئێستاش بەشێوەیەکی زۆر بەهێز و ئاکتیف لە عەرەبستانی باشوور دەژین دەشێت کۆنفیدراسیۆنی دیموکراتیانەی باشووری عەرەبستانیش وەک پرۆژەیەکی دیکەی مانادار بیری لێبکرێتەوە.

تازەگەری دیموکراتیانەی خۆرهەڵاتی ناوینی مەزن کە لەتەواوی ئەو پرۆژانەوە پێکدێت لەوانەیە وەک یۆتۆپیایەک ببینرێت. بێگومان ئەو پرۆژەیە زۆر لەپرۆژەی خۆرهەڵاتی ناوینی گەورەی ئەمریکا واقیعیترە. ئەوەی واقیعیبوونی پرۆژەیەک دەستنیشان دەکات، باگراوەندە مێژوویی و بناخە کلتووریەکەیەتی. ئەگەر تەماشای ئاراستەی بنەڕەتی سەردەمی نیولیتیک و شارستانی بکەین ئەوا دەبینرێت کە بناخەیەکی کلتووری و مێژوویی هاوبەش پێکهاتووە. یەکێتیەکانی لەجۆری یەکێتی ئەورووپا لەکلتووری خۆرهەڵاتی ناوین لە یۆتۆپیا و پرۆژە بەولاوەترن: راستی ژیانی تاکانەیی ـــ گەردوونییە کە قەیران، پێکدادان، دۆخی پارچەپارچەیی و نامۆبوون ناچاری بەدواداگەڕان کردووەو پێویستە هەنگاو بە هەنگاو لەهەر بوارێکدا ئاوا بکرێت.

بێگومان ئەو پرۆژانە ئێستا هەریەکەو خەیاڵێکن. بەڵام یۆتۆپیایەکن بناخەی کۆمەڵایەتی و مێژووییان زۆر بەهێزە. پێویستە لەبیرنەکەین ئەگەر یۆتۆپیای مەزن نەبێت پراکتیکی ژیانی مەزنیش بەدینایەت. کلتووری خۆرهەڵاتی ناوین کلتوورێکە یۆتۆپیای بەهەشت و دۆزەخی دیاری مرۆڤایەتی کردووە، لەمیانەی یەکەمین داستانی نووسراو داستانی گلگامێشەوە هەزاران ساڵ بەر لەئێستا بەدوای رووەکی نەمریدا گەڕاوە. ئێستا تێگەیشتووم: لەبەر ئەوەی ئەوەی گلگامێش بەهۆی نەخۆشی دەسەڵات دەرفەتی ژیانی لەگەڵ ژنی ئازاد لەدەستداوە، نەک تەنیا بەشێوەی نەمری بەڵکو لەناو پرۆسەی ژیانی واقیعیشدا ئەو ژیانە نادۆزێتەوە کە بەردەوام بەدوایدا دەگەڕێت. شتێکی ونکراو تەنیا لەو شوێنە دەدۆزرێتەوە کە تێیدا بزر بووە. گرکانە گەورەکەی ژیانی جۆری مرۆڤ لە بنارەکانی زاگرۆس ـ تۆرۆس و دۆڵەکانی دیجلە ـ فورات تەقییەوە. ژیانی ئەفسوونی لێرە لەدایکبوو؛ لە کوردستانیش بەشێوەی

ژن و ژیـان (Jın ، Jıyan) فەراهـەم بـوو. لەگـەڵ سـەرهەڵدانی دەسـەڵاتی پلەداری و دەوڵـەت ئـەو ژیانـەی لەمیانـەی هـەزاران ساڵەوە پێکهاتبوو، دیسان لەهەمان شوێن لەدۆخی بەرجەستەی ژن و ژیان لەدەستدرا.

بەبەڵگـەوە سـەلمێنراوە کـە گشـت ئەفسـانەکان کۆپیـەی داسـتانی گلگامێشن. وێنەی بەهەشت و دۆزەخیش پەیوەندی بەو ژیانـەوە هەیـە کـە لەئارادابوون و دواتر لەدەستدراون. بەڕاستیش نەخۆشـی دەسـەڵات ژیـان دەکوژێـت. پـڕۆژەی سـەردەمی خۆرهـەڵاتی نـاوینی دیمـوکراتی پـڕۆژەی حەقیقـەتی سـەرلەنوێ دۆزینـەوەی ژیـانی ژنـی ئـازادە لەکۆمـەڵگای ئیکۆنۆمیک و ئیکۆلۆژی لەو شوێنەی بـەهۆی نەخۆشـی دەسـەڵات ژیـانی تێـدا لەدەسـتداوە. هـەر پڕۆژەیـەک لەهەمانکاتـدا یۆتۆپیـای ئایندەیـە. کۆمـەڵگای دیموکراتیـک و تازەگـەری دیموکراتیـک یۆتۆپیـای یەکسـانی و ئازادی داهاتووە کە لەناو جیاوازیەکاندا بەدیدێت.

ئەوانەی خاوەن یۆتۆپیای ژیانێکی ئازادی شکۆدارن، کاتێک بەدوایـدا دەگـەڕێن دەبیـنن کـە مـەرجێکی شـێوازی ژیـان لەناوچـەدا جێگـای باسـەو نموونەکەشـی زۆرە، ئـەویش؛ لـەپێناو ئـەو ژیانـەدا دەژیـت کـە کۆمـەڵگا یـاخود کۆمـەڵگابوون فەراهـەمی کـردووە. کاتێـک حەقیقـەت بدۆزرێتـەوە دەژیت. چەندە ئەو حەقیقەتە بلاوبکەیتـەوە کۆمـەڵگای سیاسـیو ئـەخلاقی ئاوادەکـەیت. لـەم پێناوەشـدا تێکۆشـانێکی دروست بەرامبـەر ئـەو کۆسـپە ناوەکی و دەرەکیانە دەکەیت کە رووبەڕووت دەبنەوە. "ئەکادیمیای دانایی" خۆرهـەڵاتی نـاوین بـەردەوام وەهـا دەڵێـت: ئەمـە کـردەوەی ئیـرادەی ئـەو ژیانەیە کە بەو گوتەیە ئازاد دەبێت!

## هەندێک کێشەی هەنووکەیی کۆمەڵگای خۆرهەڵاتی ناوین و ئەگەرەکانی چارەسەری

بـەردەوام پێویسـتی بـە باسـکردنی پـەیوەنـدی نێـوان ئێسـتا یـاخود هەنووکەو مێژوو هەیە. وەک چۆن شیکاری دۆخی بەرجەستەی هەنووکەیی دابڕاو لەمێژوو بۆ هەڵـە کراوەبێـت، شـیکارکردنی مێژوویێکـی بەرۆژانـەیی نەبووبێت، واتە نەبووبێت بە ئێستا بەو رادەیـە بـۆ هەڵەکراوەیـە. ئەگـەر

مێژوو نەبێت دۆخی ئێستای راستی زۆر بە ناتەواوی دەرکی پێدەکرێت. هەموو کاتێک زەمان رەهەندی بونیادنانی راستییە. ئەگەر راستیەکی بێ زەمانیش هەبێت، بیری لێناکرێتەوە. لەوانەیە ئەمە ئەو نهێنییە بێت کە بە رەها ناو دەبرێت. هێزی بونیادنەرانەی زەمان و تواناکەی پرەنسیپێکی سەرەکی راستی کۆمەلگایە. تێگەیشتنی دۆخی ماوەیی ژیانی کۆمەلایەتی سنووردارکراو بە زەمانەوە، سەرەکیترین کێشەیە کە سۆسیۆلۆژیا ناچارە چارەسەری بکات. گەورەترین کێشەی فەلسەفەی ئەنالیتیک لەوەدایە؛ وەک بڵێی لەشیکارەکەیدا باسی هەبوونی زانستێکی کۆمەلایەتی بێ مێژوو دەکات. لەبەرامبەر ئەمەشدا بۆچوونی حەتمیەتگەرایی زێدەڕۆیی ئەو میتۆدەی بە "بێ مێژوویی" ناو دەبرێت و بەبێ تێگەیشتنی ئێستا سەرجەم پەرەسەندنەکان بە پاژە مێژوو دادەنێت، لەدەرفەتی نوێبوونەوەو پەرەسەندنی ئازادانە تێناگات کە ئێستا دەیڕەخسێنێت. ئیرادەی مرۆڤ تەنیا دەتوانێت دەستێوەردانی ئێستا بکات. لەم سۆنگەیەوە مێژوو تاچ رادەیەک ئێستا بێت بەو ئەندازە دەتوانێت دەستێوەردان بۆ خۆی بکات. تاوەکو دەرک بە بەهای نائاسایی ساتی ئافرێنەرانەی ئێستا نەکرێت، هیچ بونیادنانێکی کۆمەلایەتی تایبەت ئاوا ناکرێت. نە بێ ئیرادەیی ژێر فەرمانی مێژوو، نە بێ بەرپرسیارێتی دابڕاندنی ئێستا لەمێژوو، هیچ یەکێکیان گوزارشتی پرەنسیپیانەی ژیانی حەقیقەتی کۆمەلایەتی نین. گووتەی "گوێ بە رابردوو مەدە" چەندە هەڵەو بێ بەرپرسیارێتییە، گوتەی "تەنیا تەماشای داهاتوو بکە"ش بەهەمان شێوە هەڵەو بێ بەرپرسیارێتی یە.

سروشتی کۆمەلگای خۆرهەلاتی ناوین ناکۆکیەکی بەمجۆرەی جێگای باسە؛ ئێستای لاوازە و مێژووەکەشی مەزن. ئێستای ناوچە وەک تەلەزگەیەک لەپێش مێژووە گەورەکەی دانراوەتەوە. تەواوی بەها مێژووییەکان دەخرێنە ناو ئەو تەلەزگەیەو بێکاریگەر دەکرێن. بۆرێخۆشکردن لەپێش مێژووە گەورەکەی ناوچە پێویستی بەدەرباز کردنی دۆخی تەلەزگەیی ئێستا هەیە. مانایەکی دیکەی ئێستاش توانای چارەسەرکردنی کێشەیە. مێژوو چەندی کێشە کەلەک کردبێت، هەموویان

لەپێش ئێستادا کۆدەکاتەوە. هەرچی ئێستاشە ئەو کێشانەیان لەناو دەبژێرێت کەتوانای چارەسەرکردنیان هەیەو بەمجۆرە دەبێت بەژیانێکی بێ کێشە، ئەو کێشانەی توانای چارەسەرکردنیشیانی نییە حەواڵەی ئێستاکانی دواتری دەکات.

چارەسەکردنی کێشەکان لەنزیکەوە پەیوەندی بە پێناسەکردنێکی راستی ئەو کێشانەوە هەیە. جیاوازی نێوان ئەو شتەی بۆتە بابەتی کێشە لەگەڵ ئەو شتگەلەی چارەسەکراوە، ئەو شتەیە کە ئێستا بە ئەرێنی بونیادی ناوە؛ ئەو شتەی لەدۆخی کێشەدا دەژیت بۆ شتگەلێکی شیکارو چارەسەرکراو دەگۆڕێت. بەشی هەرە زۆری بەرگرینامەکەم بۆ پێناسەکردنێکی راستی ئەو سروشتەی کۆمەڵگا تەرخان کرابوو کە لەخۆرهەڵاتی ناوین پێکهاتووە. لەو بڕوایەدام کە هەڵسەنگاندنی تیۆری و شیکارکردنی ئەزموونەکانی رابردوو لەو بەرگرینامانەدا سەبارەت بە خستنەڕووی کێشەکانی کۆمەڵگا و ئەگەرەکانی چارەسەری تا دوارادە رۆشنکەرەوەیە. پێشکەشکردنی هەندێک کێشەی رۆشنکراوەو رێگە چاوەڕوانکراوەکانی چارەسەری لەدۆخی ئێستایانداو تەواوکردنی بەرگرینامەکەم سەبارەت بەخۆرهەڵاتی ناوین لەمیانەی ئەنجامێکی کورتەوە ئەزموونبەخش دەبێت و کۆمەک بە هەوڵ و کۆششە پەیوەستدارەکان دەکات.

## ١- کێشەی نەتەوە زۆرینەو کەمینەکان، ئەگەرەکانی چارەسەری

دەشێت باسی چوار نەتەوەی خۆرهەڵاتی ناوین بکرێت کە زۆرینەن، ئەمانەش نەتەوەکانی، عەرەب، تورک، کورد و فارسن. لەجیاتی گەورە ناوبردنیان بەزۆرینە پەیوەندی بە دیموگرافیاوە هەیە، چونکە جیاکردنەوەی نەتەوەکان بەشێوەی گەورە ــ بچووک ڕاست و ئەخلاقی نییە. دەستەواژەی نەتەوەی کەمینەش پەیوەندی بە دیمۆگرافیاوە هەیە. وەک پێویستیەکی ئاکار و حەقیقەتی کۆمەڵگاش کەمینەیی کەموکورتی نییە و بەهۆکاری بچووکێتی دانانرێت.

لەکاتی تاوتوێکردنی کێشە نەتەوەییەکان بەگرنگیەوە ئاماژە بەجیاوازی پەیڕەوو میتۆدی خۆم دەکەم، دەرکەوتنە پێش و ئەولەویەتدان

بەدیاردەی نەتەوە لەنزیکەوە گرێدراوی پەرەسەندنی مۆدێرنیتەی سەرمایەدارییە. زەقکردنەوەی دیاردەی نەتەوە لەپێکهاتنی پاوانەکانی ئایدیۆلۆژیا، دەسەڵات و سەرمایەدا دیاردەیەکی ستراتیژییە. وەک پێویستیەکی ئەو ستراتیژیەش بەزلکراوییەوە دەخرێتە ڕوو. لەشیکارکردنی دیاردەی نەتەوەییدا دەشێت باس لەدوو هەڵوێستی سەرەکی هەڵە و ناتەواو بکرێت، یەکەمیان؛ هەڵوێستی پۆزیتیڤیستانەیە کە لەسەر بنەمای جیاوازی تیژی ئۆبژە ـ سۆبژەی فەلسەفەی دیکارت هاتۆتە ئاراوە. تایبەتمەندێتی دیاردەیی پۆزیتیڤیزیم دەزانرێت. هەڵەی سەرەکی لەوەدایە هەروەکو دیاردەی فیزیایی، کیمیایی و زیندەوەرزانی دیاردەی نەتەوەش بە ئۆبژەکتیڤیتی دادەنێت. ئەم هەڵوێستەشی مسۆگەر نەرمایی و سۆبژێتی سروشتی کۆمەڵگا فەرامۆش دەکات، گەیشتنی کێشە نەتەوەییەکان بەئاستی جینۆساید لەنزیکەوە پەیوەست بەچەمکی ئەو ناسنامە نەتەوەییە داخراوە، وشک و تیژەیە. بە ئۆبژەکردنی سروشت و کۆمەڵگا گرنگترین قۆناخی ئایدۆلۆژییە لە پەرەسەندنی سەرمایەدارییدا.

وەک دەرکی پێدەکرێت یەکەمین شۆڕشی تازەگەریی دیموکراتی شۆڕشێکی فەلسەفە ـ ئایدیۆلۆژی پشتبەستووە بەجیاوازی ئۆبژە ـ سۆبژە لەبواری زهنیەتدا. دەستەواژەی نەتەوەیی لەسەرووی ئەو دەستەواژانەوە دێت کە شۆڕشی ئایدیۆلۆژی مۆدێرنیتە زەقیکردونەتەوە و لەخۆڕا هەڵنەبژێردراوە. ئەو دەستەواژەیە پرەنسیپی سەرەکی تیۆلۆژیای سەرمایەدارییە. نەتەوایەتی و دەوڵەت ــ نەتەوەش کەدواتر دادەهێنرێت گرنگترین دەستەواژەی ئیلاهییە، تەنانەت دەبێتە خودی خودانەوەندەکەی سەر ڕووی زەوی، گەورەترین خوداوەندی تیۆلۆژیای پۆزیتیڤیست لە ئیکرۆپۆلدا بەشێوەی نەتەوایەتی و دەوڵەت ـ نەتەوە جێی خۆی دەگرێت. خوداوەندەکانی دیکەی مۆدێرنیتەش بەگوێرەی پلەی گرنگیەکەیان و ئەو کۆمەکەی پێشکەش بەسیستەمی دەکەن شوێنی خۆیان دەگرن، کاتێک تیۆلۆژیای پۆزیتیڤیست لەرێگای زانستگەراییەوە دیاردەی نەتەوە و دەوڵەت ـ نەتەوە زل دەکات و لەجێگای دیاردەی ئومەتی ئایینی دادەنێت، کێشەی نەتەوەیی و شەڕەکانی جێگای کێشە ئایینی و مەزهەبیەکان و

پێکدادانەکانیان دەگرێتەوە. بەتایبەتیش ڕێگا لەپێش قۆناخێکی پڕ لە جینۆساید و شەڕی خوێناویتر دەکاتەوە، لێرەدا پێویستە زۆر بەباشی تێبگەین کە پۆزیتیڤیزم ئایدیۆلۆژیای پیرۆزی سەرمایەدارییە.

دووەمین هەڵوێستی هەڵەشی لەژێرناوی "سۆبژێکتیڤی، ماناداركردنی زێدەڕۆییانە"وە پیشاندەدرێت. ئەو چەمکەش هەوڵدەدات زۆرێک لەو دیاردانەی لەسەردەمی مۆدێرنیتەدا سەریانهەڵداوە ـــ لەسەرووی هەمووشیانەوە دیاردە نەتەوەییەکان ــ وەک داهێنان و خەیاڵی فانتازی بخاتە ڕوو. چەمکێکی ڕاڤەکاری لەشێوەی دۆزینەوەی نەریت دادەهێنرێت. هەڵبەتە چونکە کارەکتەری دووەمین سروشتیان هەیە، دیاردە کۆمەڵایەتیەکان لەبارن بۆ ئەوەی ببن بەدیاردە گەلێکی بونیادنراو و داهێنراو. بەڵام لەمیانەی قۆستنەوەی ئەو لەبارییەوە بەهای هەبوونی دیاردە کۆمەڵاتییەکان دەخرێتە ژێر گۆمانەوەو بۆ یارییەکانی زهنیەت بچووک دەکرێتەوە. بەلانی کەم بەقەدەر هەڵوێستی ئۆبژەکتیڤی ئەنجامی هەڵەو مەترسیدار لەگەڵ خۆیدا دێنێت.

لەڕەوشێکی بەمجۆرەدا لەجیاتی بەهای ئۆبژەیی، وشک و مسۆگەر، بەدەستەواژەگەلێک دادەنرێت کە خەیاڵین، بەرجەستە نین و نامێنن. لەمیانەی ئەو دووەمین لادانە گرنگەی لەنێوان واقیع و حەقیقەتدا پێشخراوە ناشێت ئەنجامی زانستی بەدەست بهێنرێت. سۆبژێتی شێوەی نوێی ئایدیۆلۆژیای مۆدێرنیتە کەمتمانەی بەخۆی نەماوە لەقۆناخی پۆست مۆدێرنیتەی درەنگ وەختدا، گوزراشتی ئۆبژەگەرایەتییە لەسەردەمی پۆست مۆدێرنیتەدا. لەئەنجامدا هەڵسەنگاندنی کێشەکانی کۆمەڵگا وەک کێشەی خەیاڵی و چارەسەرکردنی لەمیانەی میتۆدە سایکۆلۆژییە ڕۆژانییەکان ئەو قۆناخە پیشاندەدات کە ئەو هەڵوێستە پێی گەیشتووە، خودی ژیانیش بەشێوەیەکی ڕۆژانەیی مایەپوچبوونی ئەو پەیڕەوەی سەلماندووە.

تا لەقوڵاییدا دەرک بەسیستەمی بونیادی و دیاردەیی قۆناخی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری نەکرێت تێگەیشتن و چارەسەکردنی ئەو کێشە کۆمەڵایەتیانە زەحمەتە کە لەگەڵ خۆیدا هێناوە. کێشەی هەستیاری

سیستەمەکە پەیوەندی نێوان دیاردەو هەستە. هەڵوێستەکانی سەبارەت بە لێکچوونی یان جیاوازی نێوانیان پێشخراون زۆر بەگرفتن. ئەویش ڕەوشێکە پەیوەندی بەناوەڕۆکی سیستەمەوە هەیە. سیستەمی تەواوی فەلسەفەی خۆی لەسەر لێکچوون و جیاوازی نێوان دیاردە و هەست ئاوا دەکات، ئەویش دۆخێکە لەژێر بارەکەی هەلناستێتەوە، هەر بۆیە فەلسەفەی سیستەم بەسەرجەم قۆتابخانەکانیەوە نەزۆکەو بێچارەیە.

شرۆڤەی خۆم دۆزینەوەی چارەسەرییە لەدەرەوەی لێکچوون و جیاوازیدا. چونکە دیاردە و هەست پەیوەندیدارە دوالیزمەکانی بنچینەی گەردوونە. دوالیزمە گەردوونییەکان لەجۆری مادە ـ وزە، بونیاد، ڕۆڵو تەنۆلکە ـ شەپۆل لەنێوان دیاردە و هەستیشدا جێگای باسە. بەبڕوای من ئەو دوالیزمە گوزارشت لەو شێوە دەکات کە لەنێوان ڕۆح و جەستەی مرۆڤ، گەردوون و زهنەکەی وەریگرتووە. تێگەیشتنی تەواوی زهنی گەردوون لەوانەیە بەرەو زانیاریو مەعریفەی رەهات ببات، باوەڕیەکانی مەعریفەی ڕەها (هیگل)، توانەوە لەخوداوەند (الفناو فی اللە) نیروانـاو ئەنا ئەلهەق هەڵگری ئەو بانگەشەیەن. ئەمەش وەک ئەنجامێکی نزیک بە مەحاڵ دەبینرێت. بەڵام پیشاندانی دیاردە و هەستیش وەک دوو شتی جیاواز، مانای دابڕانی ڕایەڵەی نێوان زهنو واقیعە و لەحەقیقەت بەدەرکەوتنە، ئەمەش ئەو کەسانە دەگرێتەوە کە پەرەسەندنێکی زهنی زۆر کەمیان هەیە، زهنیەتێکە پشکی لەحەقیقەتدا زۆر لاوازە، ئاستی بەهاو پێکهاتەی بونیادنەرانەی زۆر نزمە.

لەڕەوشی مەعریفەی ڕەهادا دوالیزمی دیاردە ـ هەست لەئارادا نامێنێت، ئەمەش لەبەین چوونی بوویەرە، هەرچی دابڕانی تەواوی هەست و دیاردەیە گوزارشت لە نامۆبوونی تەواو دەکات. مەعریفەی فەلسەفیش پوختە و لۆژیکی مەعریفەی هەبوونی نێوان ئەو دوو جەمسەرە پێکدێنێت. نەکەوتنە ناو شپرزەیی نێوان هەردوو جەمسەر، لەوەش گرنگتر بەبێ خزان بۆ ناو ئەو جەمسەر و ئەو جەمسەر گەڕان بەدوای حەقیقەت؛ گوزارشت لەڕاوەستەی فەلسەفی دەکات، ئەمەش هەڵوێستی هەرە ڕاستە.

با دیسان بگەڕێینەوە سەر کێشەی نەتـەوەیی: لەمیانـەی ئـەو کورتـە شیکارەی فەلسـەفەوە باشـتر لەپەیوەنـدی ئـەو کێشـەیە بەکارەکتـەری هەژموونگەرایی زهنیەتی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری ئەو دوو سەدەی دوایی تێدەگـەین. چونکـە نەتـەوە لەنەبوونـەوە و بەشـێوەیەکی خـەیاڵی نەخولقێنراوە. بەڵام نکوڵی لەو ڕاستیەش ناکرێت بەو سیفەتەی بەرهـەمی زێدەڕۆیی و زلکردنێکی گەورەیە نەتـەوە قوماشێکی دروستکراوە و لەبـەر سروشتی کۆمەڵگا کراوە. کۆمەڵگای نەتەوەیی کە لەجێگای ئومەتی ئایینی ئاواکراوە دەشێت بکرێت بەبابەتی زانستی کۆمەڵایەتی، بەمـەرجێک بـەلای هـەردوو جەمسـەردا نـەچێت. بـۆ دەرخسـتنی دەسـتەواژەی کۆمـەڵگای نەتەوەیی لـەچوارچێوەی زانسـتی کۆمەڵایەتیـدا پێویسـتی بـەدەربازکردنی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری هەیە. ئەگەر مۆدێرنیتـەی سـەرمایەداری دەربـاز نەکات جگە لەچەتری پاوانـەکانی چەوسـانەوە و سـەرکوتکردن کۆمـەڵگای نەتـەوەیی هـیچ مانایـەکی دیکـەی نابێت. ئـەو دەستەواژەی لـەپارادایمی تازەگـەری دیمـوکراتی بـەئامانجی دەربـازکردنی بونیـادی بـەگرفتی دەسـتەواژەی ئامـاژەپێکراو پێشـخراوە نەتـەوەی دیموکراتییـە. تـەنیا لەمیانەی نەتەوەی دیموکراتیەوە کۆمەڵگایەکی نەتەوەیی دێتـە ئـاراوە کـە لەهەردوو چەمکی ئەو پەرگەری و قۆستنەوەی مۆدێرنیتـەی سـەرمایەداری ڕزگاری بووە. بونیادە کۆمەڵایەتیەکانی دەکەونە چوارچێوەی فاکتەرەکانی تازەگەری دیموکراتیکدا ڕۆڵی سەرەکی بە بەرژەوەندی نەتەوەیی نادرێت، بـەڵکو زیـاتر جـەخت لەسـەر کارەکتـەرەی سیاسـی و ئـەخلاقی کۆمـەڵگا دەکرێتەوە، گونجاوترین دەستەواژەی دووانەیی سەرلەنوێ بونیادنانەوەی کۆمۆنالیتەی دیموکراتییە لەجێگای دەوڵەت ـ نەتەوەدا.

سەبارەت بەمەسـەلەی نەتـەوە لەخۆرهـەڵاتی نـاوین جەختکردنـەوەی زێدەڕۆیانـە لەسـەر نەتەوایـەتی چەنـدە نـەرێت بێت، پشتگوێ خستنی لایـەنی نەتـەوەیش لەلایـەنی کۆمـەڵگاوە هێنـدەی دیکـە کێشـەکە قـورس دەکات. کێشەی هـەرکام نەتـەوە تـاوتوێ بکرێت، بـەڵام کاتێک لـەبواری پـەیڕەو و تـەگبیر بەرامبـەر ئـەو دوو هەڵەیـە وەردەگیرێت زەقکردنـەوەی هـەردوو لایـەنی ئـەرێنیش لایەنـە گرنگەکـەی دیکـەی پـەیڕەوە. ئەمانـە

هەڵوێستی زانستین نەک ئایدیۆلۆژی، ئامانجیان دەسەڵاتی دەوڵەت - نەتەوە نییە بەڵکو هەڵوێستی نەتەوەی دیموکراتیک و کۆمۆنالیتەی دیموکراتین. ناوەڕۆکی هەردوو هەڵوێستیش لەفاکتەرە سەرەکیەکانی تازەگەری دیموکراتی پێکدێت.

مەیلی میللیگەرایی و دەوڵەت - نەتەوە کە لەو دوو سەدەیەی دوایی لەکۆمەڵگاکانی خۆرهەلاتی ناویندا بێدارکرایەوە وەک مەزەندە دەکرێت کێشە نەتەوایەتیەکانی چارەسەر نەکردووە، بەپێچەوانەوە کێشەکانی گەورەتر کردووەو تەواوی پێکهاتە و خانەکانی کۆمەڵگای گرتۆتەوە. لەجیاتی کێبڕکێی پۆزێتیفانەی سەرمایە شەڕی وێرانکارانەی دەوڵەت - نەتەوە دەسەپێنێت. ڕەوشی شەڕ لەناو بونیادی کۆمەڵگاکان و پەیوەندییە دەرەکییەکانیان هۆکاری سەرەکی کێشەو قەیران و دۆخی کائۆسە، کاتێک تەماشای ئەزموونی سەرجەم کێشە نەتەوەییەکانی ناوچە بکرێت دەست نیشانکردنی ئەو ڕاستییە زەحمەت نییە.

لەمیانەی دەستەواژەی نەتەوەی دیموکراتیک ــ کە ئامانجی پاوانی دەسەڵات دەوڵەت - نەتەوە نییە ــو تیۆری کۆمینالیتەی کۆمەڵگاگەرایی و ئەلتەرناتیفی سەرمایەداری مۆدێلێکی نموونەیی پیشاندەدات کە ناوچە لەمەیدانی شەڕی خوێناوی، کۆمەڵکوژی، جینۆساید، کائۆس و قەیرانی بەردەوام ڕزگار دەکات.

ا- ئەو هۆکارە سەرەکیانەی کێشەی نەتەوەیی عەرەبەکانی قورسترکردووە، بەردەوام کۆمەڵگابوونیانی پارچەکردووە، لەکایە و بەهاکانی خۆیان نامۆی کردوون، لەڕێگای شەڕەوە هیلاکی کردووەو بەها مادییەکانی قووتداوە زیاتر لەبیست دەوڵەت - نەتەوەیە. ئەو دەوڵەت ــ نەتەوانەی تەنانەت کۆنفیدرالیزمێکیان لەنێوان خۆیاندا ئاوا نەکردووە، خۆیان ئافرێنەری کێشەی نەتەوەیی عەرەبن، گرێدراو بەمانەوە میللیگەرایی ئایینگەرایی و نەژادپەرستی - قەبیلە گەراو ڕەگەزپەرستی پیاوسالاری سەر کۆمەڵگا بەتەواوی بواری کۆمەڵگای شێواندووەو خنکاندوویەتی. لەناوخۆیدا کۆمەڵگای مەحکومی کۆیلایەتی و

محافەزەکاریـەکی مەترسـیدار کـردووە، نـە لـەناوەوە نـە دەرەوە چانسـی چارەسەرکردنی کێشەکانیان پێنادات.

پێویسـتە لەسـەر بنـەمای نەتـەوەی دیموکراتیـک و کۆمۆنالیتـەی کۆمەڵگا مۆدێلێکی چارەسەری بەرفراوانی کێشـەی عەرەبـەکان بدۆزێتـەوە. هێـزی ڕەقیبەکـەیان ئیسـرائیل سـەرچاوەکەی تـەنیا بـۆ هەژموونگـەرایی جیهـان ناگەڕێتـەوە، بـەڵکو دامودەزگـا دیموکراسـی و کۆمۆنالیتـەکانی ناوخۆشی ڕۆڵێکـی گرنگیـان لـەو بەهێزبوونـەدا هەیـە. لێرەدا کۆمـەڵگای نەتـەوەیی عـەرەبی کـە لـەئاکامی ئیسـلامگەرایی ڕادیکـاڵ و میللیگـەرایی توندڕەو سەدەی دوایی بەفیڕۆدا، لەمیانەی ئاوێتەکردنی چەمکی نەتەوەیی دیموکراتیک لەگەڵ کۆمەڵگای کۆمیناڵ کـە لەسیسـتەمی قەبیلـە و مێژوودا لێی نـامۆ نـین دەتوانێت چارەسـەرییەکی مسـۆگەر و درێژخایـەن بۆخـۆی بدۆزێتەوەو ڕێگای ڕزگاری نەخش بکات.

ب ـ تورک و تورکمانـەکانیش پێکهێنـەری نەتەوەیـەکی دیکـەی گرنگـی زۆرینەن لەخۆرهەڵاتی ناویندا، بە بەراورد لـەگەڵ عەرەبەکان بەشێوەیەکی بڵاوتـر دەژیـن، بـەڵام خـاوەنی هـەمان چـەمکی ئایـدۆلۆژی و دەسـەڵاتن. دەوڵەت ـ نەتەوەگەراییەکی توندڕەون و لەقووڵاییدا لەناو میللیگەراییەکی نـەژادی و ئایینیـدا دەژیـن. جیـاوازی سۆسـیۆلۆژی گرنـگ لـەنێوان پۆلینـەکانی تـورک و تورکمـانێتی جێگـای باسـە. هاوشـێوەی پێگـەی بەدەوییەکان بەرامبەر بە عەرەبە ئەرستۆکراتەکان تورکمانەکانیش بەرامبەر ئەرستۆکراتی تورک و خاوەنەکانی دەوڵەت ـ نەتەوە دۆخێکی هاوتەریبیان هەیـە، واتـا تورکمانـەکان تـوێژێکن بەرژەوەندییـەکانیان لەگـەڵ دیموکراسی و کۆمۆنالیتەدا یەکدەگرێتەوە.

کێشە نەتەوەییەکانی تورکەکانیش زەبەلاحە، لەتورکە ئویگورەکان[٦]ی چینـەوە تـا ئـەو تورکانـەی بەشـێوەی دەوڵـەت و ئۆتۆنـۆمی لـەژێر هەژموونگەرایی ڕوسیادا دەژین، لە تورکەکانی کۆماری تورکیـای ئـەنادۆڵ

[٦] ئویگورەکان: جڤاتێکی گەلی تورکە، بە شێوەیەکی گشتی لە ناوچەی تورکستانی ڕۆژهەڵات نیشتەجێیە. لە هەندێک ناوچەی باشووری ناوەڕاستی چین یش نیشتەجێن، مانای وشەی ئویگور واتە یەکێتی.

تا دەگاتە تورکەکانی بەلقان، قەفقاسیا، خۆرهەڵاتی ناوین و تەنانەت تورکەکانی ئەورووپاش هەرهەموویان کێشەی نەتەوەییان هەیە. پێشتر گوتبوومان سەرچاوەی کێشەکان هاوشێوەیە. نەخۆشی دەسەڵاتی دەوڵەت ـ نەتەوە، میللیگەرایی نەژادی ـ ئایینی توندڕەوو ڕەگەزپەرستی کۆمەڵگای پیاوسالاری جڤاتە تورکەکانیشی شێواندووەو دووچاری محافەزەکاری کردوون، مەیلەکانی دیموکراسی و کۆمیناڵی کۆمەڵگا وەک بڵێی لەناو پاوانەکانی هەژموونگەرایی ئایدیۆلۆژی و دەوڵەتگەرایی و توندڕەودا تواونەتەوە. تەنانەت خێزانیش هی کۆمەڵگا نییە، بەڵکو بۆ خانەیەکی دەوڵەت بچوککراوەتەوە. هەر دامەزراوەو تاکێک لاسایی دەوڵەت دەکاتەوە. ئەو مەیلە مێژووییانەش ڕێگا بۆ شەڕێکی دژواری دەسەلاتی نێوان تورکو تورکمانەکان دەکاتەوە. لەرێگای سیاسەتی فەتحکارییەوە پێکدادانێکی دەسەڵاتی هاوشێوە لەگەڵ کۆمەڵگاکانی دیکەش دێتە ئاراوە.

بەهۆی بونیادە ناوەندیگەرا وشکەکان و توندڕەوی ئایدۆلۆژیای فەرمی دەرفەت بە پەرەسەندنی مەیلە کۆمینال و دیموکراتەکانی کێشەی نەتەوەی تورک نەدراوەتەوە، ئەو پەیامەی دراوەتە کۆمەڵگا؛ مەحاڵە بەبێ دەوڵەت بژین. تاک و کۆمەڵگاش هاوسەنگییان لەگەڵ دەوڵەتدا دەستەبەر نەکردووە، بەڵکو بەردەوام ڕۆڵی کۆیلە و ڕۆڵە دڵسۆزەکانی دەوڵەتیان بینیوە.

لەڕۆژی ئەمڕۆماندا تیۆری تازەگەری دیموکراتی گونجاوترین چوارچێوەی جڤاتە نەتەوەییەکانی تورک پێکدێنێت. پرۆژەی کۆنفیدراسیۆنی دیموکراتیانەی تورکەکان کە لەسەر بنەمای کۆمەڵگا بێت فیکرێکی نموونەییە کە لەناوخۆیدا یەکگرتووەو بەیەکەوە ژیانێکی هاوبەش و ئاشتیانەی جڤاتی تورک لەگەڵ ئەو دراوسێیانەیدا مسۆگەر دەکات کە لەگەڵیاندا دەژین. سەبارەت بە یەکێتی کۆمەڵگا سنوورەکان گرنگی جارانیان نەماوە. سەرباری سنووری جوگرافی جیاواز بەڵام دەرفەتەکانی پەیوەندی و گەیاندن یەکێتی و ئاوێتەبوونی نێوان تاک و جڤاتی گشت ناوچەکانی جیهانی فەراهەمکردووە. پرۆژەی کۆنفیدراسیۆنی

دیموکراتی جڤاتی نەتەوەیی تورک دەشێت کۆمەکێکی مەزن پێشکەش بە ئاشتی جیهان و سیستەمی تازەگەری دیموکراتیک بکات.

ج ـ کۆمەڵگای نەتەوەیی کورد سەرچاوەکەی خۆی لە پۆتانسێلێکی دیموکراتیزەبوون وەردەگرێت کە دەوڵەمەندە و تازە گەشە دەکات. کوردان گەورەترین گەلی دونیان کە بێ دەوڵەت ـ نەتەوەن. بەدرێژایی مێژوو لەسەردەمەکانی نیولیتیک و شارستانیدا لەناوچەیەکی ستراتیژیدا کۆبوونەتەوە. کوردان لەسایەی چەمکێکی بەرگری پشت ئەستوور بەشاخەکان و کلتووری گوزەران لەمیانەی کشتوکاڵ و ئاژەڵدارییەوە وەک گەلێکی خۆجێیی تاڕۆژی ئەمڕۆمان پارێزگارییان لەهەبوونی خۆیان کردووە، وەک چۆن یەهوودیەکانی پەرتەوازەی جیهان لەهەر قوژبنێکی جیهان دزەی خاڵی لوتکەی کۆمەڵگاکانیان کردووەو هەبوونی خۆیانیان بۆ ڕۆژی ئەمڕۆمان هێناوە، کوردانیش بەبێ ئەوەی لەجێگای خۆیان بجوولێن و چاویان لەخاڵی لوتکەی کۆمەڵگایەک بێت لەمیانەی خۆڕاگریو ئارامی دۆخی خواروو (پلە دوو) بەڕۆژی ئەمڕۆ گەیشتوون. واتا پارادۆکسێکی تەواو لەنێوانیاندا جێگای باسە.

کێشەی نەتەوەی کورد سەرچاوەی خۆی لەهۆکارێکی زۆر دەگمەن وەردەگرێت، ئەویش بەربەستکردنی نەتەوە بوونە. چونکە ئەو هێزانەی بەدرێژایی مێژووو ڕۆژگاری ئەمڕۆمان لەگەڵ پاشکۆکانیان حوکمڕانی کوردانیان کردووە، هیچ پەیڕەو و میتۆدێک نەماوە بەکاریان نەهێنابێت بۆ ئەوەی کوردان لەدۆخی سۆبژە دەربخەن و بیانکەن بە ئۆبژە. ئەرێنی بێت یاخود نەرێنی بەڵام لەوانەیە دەوڵەتبوون کۆمەکێکی بەپەرەسەندنی نەتەوەییەوە کردووە. بەڵام دەرفەتێکی بەمجۆرە زۆر بەدەگمەنی بۆ کوردان ڕەخساوە. لەم سۆنگەیەوە گەلێکی خاوەن جیاکارییە؛ گەلێکە ماوەیەکی زۆرکەم لەناو شارستانی چینایەتی ـ دەوڵەتیدا ژیاوەوەو پەسەندی کردووە. سەبارەت بەدەرفەتی تازەگەری دیموکراتی ئەوە جیاکارییەکی زۆر گرنگە. هەروەها نیشتەجێبوونیان لەناوەندی جوگرافیای خۆرهەڵاتی ناوین گرنگیەکەیان زیاتر دەکات، فەرمانڕەوایانی دەوڵەت ـــ نەتەوە کە لەسەردەمی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری لەدەرەوە سەپێنرابوون، چەندەی

هێزەکەیان بڕیکردووە لەرێگای جینۆسایدی کلتووری ناوە ناوەش لەمیانەی کۆمەڵکوژی جەستەییەوە هەوڵیانداوە کوردان لەناو خۆیاندا بتوێننەوە. هەروەها لەسەردەمی شارستانی ئیسلامیشەوە لەرێگای ئایینەوە هەوڵی ڕەواکردنی هەمان سیاسەت دراوە. کوردان هێندە ئەو دەرفەتەیان نییە لەمیانەی هێزی دەوڵەت ـ نەتەوەوە بوون بە کۆمەڵگای نەتەوەیی مسۆگەر بکەن. ئەو شتگەلانەی فاکتەرەکانی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری لەملایەنەوە پێشکەشی بکەن زۆر سنووردارە. ئەو پێکهاتە سیاسییەی لەڕۆژی ئەمڕۆمان لەکوردستانی ئێراق جێگای باسە ناشێت بەتەواوی بەدەوڵەت ـ نەتەوە ناوببرێت، ناوبردنی بە نیمچە دەوڵەت ـ نەتەوە گونجاوترە.

هەرچەندە کەمینەش بن بەلام بەتایبەتیش لەڕابردووی نزیکدا جوگرافیای کوردستان ولاتی گەلانی دیکەش لەسەرووی هەمووشیانەوە ئەرمەنی و سوورپانیەکان، بەردەوامی و پاشکۆیەکی زۆری عەرەب، فارس و تورکەکان لەو جوگرافیایەدا دەژین. تا ئێستا شوێنپەنجەی بەهێزی کلتووری عەشیرەت و قەبیلە لەکۆمەڵگای کوردەواریدا دەبینرێت، بەلام کلتووری شار زۆر پەرەی نەسەندووە، سەرجەم ئەو تایبەتمەندێتیانە لەجوگرافیای کوردستان دەرفەتێکی مەزن بۆ پێکهاتە سیاسییە دیموکراتییەکان دەرەخسێنێت. ئاواکردنی یەکینەی کۆمینال لەبوارەکانی کشتوکال ــ ئاو ــ وزە هەم نموونەییە هەم ناچارییە. هەلومەرجەکانی پەرەسەندنی کۆمەڵگای سیاسی و ئەخلاقیش تادوایی لەبارە، هەروەها جوگرافیایەکە بۆ یەکەمین جار و بەشێوەیەکی بەهێز کلتووری مێخوداوەندی تێدا ژیاوە. زمینەی سەرەکی کلتووری مێخوداوەندی ـ دایک کە بەناوەکانی ستار، عەشتار و ئینانا لەخۆرهەلاتی ناوین و جیهان بلاوبۆتەوە. سەرباری سەرجەم هەوڵەکانی لەپێناو لەناوبردنی بەرێوەبراو، بەلام تائێستاش ژن خاوەن ئەو پۆتانسێلەیە کە نموونەی ژیانی بوێری، بەرخودان و سەرفرازی پیشانبدات. سەرەڕای هەوڵ و کۆششێکی زۆر، بەلام ئایدیۆلۆژیای کۆمەڵگای ڕەگەزگەرایی وەک کۆمەڵگا دراوسێکان بەدامەزراوە نەبووە. ئەو تایبەتمەندێتییە کلتوورییە

دەوڵەمەندانەی لەناو یەکتر و بەیەکەوە دەژین لەبونیادنانی کۆمەڵگای دیموکراتیکدا پۆتانسیێلیکی شکۆدار و مەزن لەخۆوە دەگرێت کە ئازادی و یەکسانی (لەناوجیاوازیەکەیدا) ژن پێوانەی سەرەکیەتی. لەم سۆنگەیەوە لەژێر پارادایمی تازەگەری دیموکراتیی‌ەوە ئەو جوگرافیایە گونجاوترین هەلومەرج بۆ نەتەوەی دیموکراتیک و کۆمەڵگای ئیکۆلۆژی ــ ئیکۆنۆمیک دەرەخسێنێت. هەر لەئێستاوە پرۆژەی کۆنفیدراسیۆنی دیموکراتیانەی کوردستان دەرفەتی جێبەجێکردنی هەیە. بەهۆی ئەو خراپەکارییانەی دەوڵەت ــ نەتەوەکانی وابەستەی هەژموونگەرایی سەرمایەداری بۆ کۆمەڵگای دێنن، هەروەکو دوێنێ ئەمڕۆو سبەینێش دەرفەتی گەشەکردنیان نییە. تەنیا لەرێگای وەرچەرخانی دیموکراتیانەوە دەشێت دەرفەتێکی سنوورداری مان و ژیان بەدەست بێنن.

لەمیانەی پێکهاتەگەلێکی سیاسی و دیموکراتیانەی سەرجەم ئەو تایبەتمەندێتیە ریزکراوانە بەبنەما بگرێت ئاواکردنی کۆنفیدراسیۆنێکی دیموکراتیانەی کوردستان گرنگیەکی مێژوویی هەیە کە لە کۆمینە ئیکۆنۆمیک و ئیکۆلۆژیەکان پێکهاتبێت. بونیادنانی نەتەوەیەکی دیموکراتی پشتبەستوو بەناسنامەی نەتەوەیی هەمەڕەنگ رێگەچارەیەکی نموونەییە بەرامبەر بەچەقبەستی و بنبەستبوونی دەوڵەت ــ نەتەوە؛ دەشێت ببێتە مۆدێلی چارەسەری سەرجەم کێشە نەتەوەیی‌و کەمینەکانی خۆرهەلاتی ناوین. کەمەندکێشکردنی نەتەوە دراوسێکان بۆئەم مۆدێلە چارەنووسی خۆرهەلاتی ناوین دەگۆڕێت و دەرفەتی تازەگەری دیموکراتی بۆ ئافراندنی ئەلتەرناتیف زیاتر دەکات.

مێژوو کوردستان و کوردانی بەپێگەیەک گەیاندووە؛ گەلی کوردی لەپێناو یەکسانی، دیموکراتیزەبوون و ئازادی خۆی تێکۆشان دەکات لەگەڵ گەلانی ناوچەکە ناچاری یەکێتی چارەنووس کردووە کە لەپێناوی ئازادی، یەکسانی و دیموکراتیزەبوونی خۆیان لەتێکۆشاندان.

و- کێشەکانی کۆمەڵگای نەتەوەیی فارس یاخود ئێرانی سەرچاوەی خۆی لە شارستانییە مێژووییەکان و کردەوەکانی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری ئەو دووسەدەیەی دوایی وەردەگرێت. نەریتی شارستانیەک

لە ئێراندا جێگای باسە کە لە هەرسێ بەرهەمە ئایدیۆلۆژییەکەی راهیبی سۆمەر کاریگەر بووە. سەرەرای ئەوەی ناسنامەی رەسەنی نەریتی زەدەشتی و میترابیان پێکهێناوە، بەلام لەرێگای بەرهەمی هەلهێنجراوی ئیسلامییەوە بێکاریگەرکراوان. مانیزمیش کە وەک سەنتێزێکی موسەوی، زەردەشتی، مەسیحیەت و قوتابخانەی فەلسەفەی گریک سەریهەلداوە بەرامبەر ئایدیۆلۆژیای فەرمی شارستانی سەرکەوتوو نەبووە، بەمانایەکی تر جگە لەخۆراک پێدانی نەریتی یاخیبوون ئەولاتر نەچووە.

ئێران نەریتی ئیسلامی بۆ مەزهەبی شیعە گۆریوە و بەشێوەی ئایدیۆلۆژیای دوا قۆناخی شارستانی گونجاندوویەتی. لەرۆژی ئەمرۆشماندا فاکتەرەکانی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری لە بێژەنگی شیعەگەرایی دەدات (شێوەی مۆدێرنی کۆنفۆشیوسگەرایی چین) و هەولی مۆدێرنبوون دەدات. بەهۆی ماهیەتە فرە ناسنامەییەکەی لەبواری ئەتنیکی و ئایینیەوە کۆمەلگای ئێران خاوەن کلتوورێکی دەولەمەندە. مالخۆیی بۆ گشت ناسنامە نەتەوەیی و ئایینیەکانی خۆرهەلاتی ناوین دەکات. تەنیا لەمیانەی هەژموونگەرایی ئایدیۆلۆژیای نەژاد یاخود ئایینی زەحمەتی لە بەیەکەوە هێشتنەوەی ناسنامە هەمەرەنگەکاندا دەبینێت. بەشێوازێکی زۆر ورد و فێلبازانە شێوەیەکی میللیگەرایی نەژادی و ئایینی جێبەجێدەکات. لەلایەکی دیکەشەوە سەرباری جێبەجێکردنی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری، بەلام کاتێک بەرژەوندیەکانی پێویستی ببینێت و کەلکی هەبێت لەپەنابردن بۆ پروپاگەندەکانی دژە ـ مۆدێرنیستیش دوو دلی ناکات. لەتواندنەوەی پەرەسەندنە شۆرشگێری و دیموکراتیەکان لەناو کلتووری شارستانی نەریتیدا پسپۆرە. جێبەجێکردنێکی شارەزایانەی رژێمێکی سەرەرۆیانە جێگای باسە، لەسەرووی دەولەت و کۆمەلگا گرژ و بونیادە ناکۆکەکانی خۆرهەلاتی ناوین دێت. هەرچەندە سەرچاوەکانی نەوت ئارادەیەک رێخۆشکەری کەمکردنەوەی گرژیەکان بێت بەلام دەولەت ـ نەتەوەی ئێران لەهەمووان زیاتر لەدۆخی پەرتەوازەبووندایە. بێگومان ئەو ناتەباییەی ئێران لەگەل ئەکتەرە سەرەکیەکانی مۆدێرنیتەی

سـەرمایەداری ـــ هەژموونگـەرایی ئـەمریکا و یـەکێتی ئـەوروپا ـــ کاریگەرییەکی زۆری هەیە.

ئەگـەر بەشـێوەیەکی لێهاتوانـە تیـۆری تازەگـەری دیمـوکراتی لەکێشـەکانی کۆمـەڵگای ئێرانـدا جێبـەجێ بکرێـت لەوانەیـە رێگـا لـەپێش ئەنجامی گرنگ و چارەسەر ئامێزانـە بکاتـەوە. سـەرباری تـەواوی هەوڵـە ناوەندیگەراییـەکانی دەوڵـەت، لـەژێرەوە وەک بڵێـی ئێرانێکـی فیـدارڵ لەئارادایە. کاتێک فاکتـەرەکانی شارسـتانێتی دیموکراتی لەگەڵ فاکتـەرە فیدرالییـەکان (ئازەرییـەکان، کوردەکـان، عەرەبـەکان، بلوجـەکان، تورکمانـەکان) بەیـەکتری بگـەن پـرۆژەی کۆنفیدراسیۆنی دیموکراتیانـەی ئێران مانابەخش دەبێت و بەدڵنیاییەوە دەبێتە ناوەندێکی سەرنجڕاکێشان. بزووتنـەوەی ئـازادیخوازی ژن و نـەریتی کۆمینـالیش لـەچوارچێوەی ئـەو پرۆژەیەدا ڕۆڵی گرنگیان دەبێت. تەنیا لەژێر سایەی ئاوێتـەبوونی لەگـەڵ فاکتەرەکانی تازەگەری دیموکراتیک (کۆمەڵگای دیموکراتیک، ئیکۆنۆمیکـو ئیکۆلـۆژی) و هەنگاونانیـەوە ئاینـدەی گەشـی ئێـران و سـەرلەنوێ بەدەستهێنانەوەی ڕۆڵە مێژووییەکەی لەخۆرهەلاتی ناوین فەراهـەم دەبـێ. وەک چۆن پۆتانسێلی کۆمەڵگای نەتەوەیی ئێران ئەو هێزەی هەیە، ڕاستی نەتەوەیی دیموکراتی‌ئێرانش ئەمە دەکات بە پێویستییەک.

٥ ـ کێشەی نەتەوەیی ئەرمەنی لەسەرووی ئەو تراژیدیانـەوە دێـت کـە هـاتنی مۆدێرنیـەی سـەرمایەداری بـۆ خۆرهـەلاتی نـاوین رێگـای لـەپێش کردۆتـەوە. ئەرمەنییـەکان یـەکێک لـە گەلـە دێرینـەکانی ناوچـەن. زیـاتر لەگـەڵ کـوردان بەشـێوەیەکی تێکـەڵ لەسـەر جوگرافیایـەک دەژیـن. چـۆن کـوردان گـەلێکن لـەرێگای کشـتوکاڵ و ئاژەڵدارییـەوە گـوزەرانی خۆیـان بەسەردەبەن، ئەرمەنیەکانیش لەو ئاستەدا گەلێکن لەشـارەکان لەمیانـەی پیشەوەرێتیەوە گوزەران دەکەن. نوێنەرایـەتی کلتوورێـک دەکـەن کەلایـەنی پیشـەکاری پێگەیشـتووە، سـەرباری ئـەوەی بـەرخودانێکی هاوشـێوەی کوردانیـان نوانـدووە، جگـە لەسـەنگەری کـاتی و نموونـەیی، نەبوونەتـە خاوەنی دامەزراوی هەمیشەیی دەوڵەت. ئەرمەنییەکان لە گەلە مەسیحییە یەکەمینەکانن. ناسنامە و بـاوەڕی ڕزگـاری ڕۆڵێکـی گرنگـی لەهـەڵبژاردنی

ئایینی مەسیحیدا بینیوە، ئەوانیش وەک یەهوودیەکان بەتایبەتیش بە ناسنامەی پیشەکارییەوە لەدەوروبەری کۆشکەکان بەکاریگەر بوون.

لەهاتنی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری بۆ خۆرهەڵاتی ناوین بەکارهێنانی ئەرمەنییەکان وەک ئامرازێک هەڵەیەکی ستراتیژی بوو، ئەو تەنگەتاوییەی بەهۆی مەسیحیبوونیان لەژێر گەمارۆی موسڵمانەکان دووچاری هاتبوون، لەئەنجامی کڵپەگرتنی دوولایەنەی میللیگەرایی دەوڵەت - نەتەوە هەنگاو بەهەنگاو گۆڕاوەو بووە بە تراژیدیایەک. ڕۆڵێکی گرنگی پایەدارانی ئەرمەنی لەوەدا هەبوو کە پێشوەخت بوون بە بۆرژوازی. میللیگەرایی جۆری ئەوروپا و بەکرێگیراوێتی هەژموونگەرایی هۆکاری ناوخۆیی کارەساتەکە بوون. ئەرمەنیەکانی لەمیانەی کلتووری پێنج هەزار ساڵەیان کۆمەکێکی مەزنیان پێشکەش بەکلتووری خۆرهەڵاتی ناوین کرد، لەئاکامی پیلانەکانی مۆدێرنیتە لەسەدەی نۆزدەهەمەوە تا یەکەمین چارەگی سەدەی بیستەم بوونە قوربانی کارەسات و جینۆسایدێکی مەزن. دوای یەهوودیەکان دووەمین گەلی ڕەوەندە کە لەجیهاندا پەرتەوازە بووە. ئاواکردنی ئەرمەنستانێکی بچووک لەڕۆژئاوای ئازەربایجان مانای چارەسەرکردنی کێشەی نەتەوەیی ئەرمەنی نابەخشێت. ئەو قەوارەیە کاریگەری ئەو تراژیدیایە قەرەبوو ناکاتەوە کە ئەرمەنییەکان دووچاری هاتوون.

ئەرمەنیەکان بەردەوام بەدوای ئەو وڵاتەدا دەگەڕێن کەونیان کردووە. لەم سۆنگەیەوە کێشەی ئەرمەنی لەڕۆژی ئەمڕۆماندا بەشێوەی دۆزینەوەی وڵاتی ونکراو مانادار دەبێت. بەڵام لەو شوێنەی بەدوای وڵاتەکەیاندا دەگەڕێن گەلانی دیکەشی تێدا دەژیت. زەوتکردنی وڵاتی گەلێک و بەخشینی بەگەلێکی دیکە چەندە هەڵەیەو تاوانێکە لێی نابووردێت. پێچەوانەکەشی بەهەمان ڕادە تاوانە. جارێکی دیکە لەڕێگای کێشەی ئەرمەنییەوە ڕووی مەترسیداری دەوڵەت - نەتەوەی ڕووبەڕوومان دەبێتەوە. چەمکی سنووری دەوڵەت — نەتەوەو هەڵپەی بەدوای نەتەوەی هۆمۆژەندا هۆکاری راستەقینەی ئەو سامناکیەیە. سیستەمەکەی پشتیشی مۆدێرنیتەی سەرمایەدارییە، زهنیەت و شێوازێکی ژیانی تێکەڵەی کرستیانی و

مۆدێرنیتە تەنیاو تەنیا ئەرمەنیەکان لەناو دەبات. دوژمنەکانیان چەندە نارەسەن و خاوەن زهنیەتێکی فاشیستانەبن، پێویستە تەنیا بەئاشکراکردنی هۆکارەکانی جینۆسایدکرنیان سنووردارنەبن و گەڕان بەدوای دەرەتانی نوێشدا ئەرکێکی ژیانییە. لەوانەیە پێکهاتە کۆنفیدراڵیەکان لەسەربنەمای فرە نەتەوەیی، دیموکراتیک و کۆمیناڵدا دەرفەتی زیاتری چارەسەری بۆ ئەرمەنیەکان و ئەو گەلانە بڕەخسێنێت کە لەدۆخ و پێگەیەکی هاوشێوەدان. ئەگەر لەسەربنەمای فاکتەرەکانی تازەگەری دیموکراتی قاڵببنەوەو بەشێوەی نەتەوەی دیموکراتی ئەرمەنی خۆیان نوژەن بکەنەوە، ئەوا ئەرمەنییەکان لەکلتووری خۆهەڵاتی ناویندا هەم بەڕۆڵی مێژوویی خۆیان دەگەن ، هەم رێگای ڕاستی ڕزگاری دەدۆزێتەوە.

و- کێشەی نەتەوەیی ئاشووری باسی چیرۆکی خەمناکی شارستانیەکی زەبەلاحی خۆرهەڵاتی ناوین دەگێرێتەوە. وەک گەلێک کە خۆیان لەگەڵ خوداوەندی بەناو ئاشووری میزۆپۆتامیا یەکسان و هاوتا کردووە، ئەوانیش دووچاری ئەنجامێکی تراژیدی وەک ئەرمەنیەکان بوونەتەوە، پێویستە گەیشتنیان بەدۆخی مان و نەمان وەک زیانێکی گەورەی کلتووری خۆرهەڵاتی ناوین هەڵسەنگێنریت. هەروەکو چۆن شارستانیەکانی سۆمەر، ئەکاد و بابل خۆیان دوژمنی سۆمەر بوون، دەتوانین بڵێین گەورەترین دوژمنی ئاشوورییەکانیش خودی شارستانی ئاشووری بووە. بۆچی؟ چونکە کلتوورێک یان گەلی کلتوورێک لەدەرەنجامی زەوتکاری پاوانگەرایی شارستانی گەورە بووبێت، لەگەڵ لەبەین چوونی پاوانی ئەو شارستانییە خۆی بەرامبەر بەچەندین هەڕەشە و مەترسی دەبینێتەوە. ئەگەر ئەو گەلانە خۆیان ئەم بۆشاییە پڕنەکەنەوە، هەر هێزێکی دیکەی ئەو بۆشاییە پڕ دەکاتەوە، تۆڵەی خۆی لەو گەلە یان کلتوورە دەکاتەوە. ئاشوورییەکانیش بوونەتە قوربانی گۆڕانکارییەکی بەمجۆرە. ئاشوورییەکان هەم یادەوەری کلتووری خۆرهەڵاتی ناوینن بەتایبەتیش کلتووری سۆمەر، ئەکاد، بابل، هیتیت، فینیقی، میتانی، ئورارتوو، ماد، پارس، هێلینی، ساسانی، بێزەنتی و ئیسلامی، هەم خۆراکیان پێداون و

خۆراکیان لێ وەرگرتوون، هەروەها لەریزی پێشەوەی گەلە ئافرێنەرەکانی کرستیانی و فاکتەری خولقێنەری پاوانی بازرگانی بوون لەخۆرهەلاتی ناویندا، هەڵبەتە بەو ڕادەیە تێکەڵبوونیان لەگەڵ شارستانی خۆرهەلاتی ناوین چارەنووسەکەشیانی بەو شارستانیە دەبەستەوە. لەگەڵ هەڵکشانی ئەو شارستانییە ئەوانیش بالآیان دەکرد، بەکەوتنیشی دەکەوتن.

هاوکاری ئاشوورییەکان لەگەڵ مۆدێرنیتەی سەرمایەدارییدا هەروەکو لەنموونەی ئەرمەنیەکانیشدا بینیمان ڕێگای لەپێش کاریگەرییەکی پێچەوانە کردەوە، ئەو گۆشەگیرییەی بەهۆی کرستیانبوون دووچاری هاتبوون کاتێک لەگەڵ مۆدێرنیتەدا قووڵتربوویەوە: کۆتاییە خەمناکەکەیانی ئامادەکرد. بە ڕۆژەڤبوونی پێشوەختی هزرو کردەی دەوڵەت ـ نەتەوە لەمیانەی کرستیانی و لێکدانەوە تەکتیکییە بچووکەکانی هەژموونگەرایی سەرمایەداری، گرنگترین هۆکاری ناوخۆیی ئەو کارەساتە گەورەیە بوو کە دووچاری هاتن. ئاشوورییەکانیش وەک ئەرمەنییەکان گەلێکی کۆنی جوگرافیای کوردستانن. تەنیا ڕەفتارو کردەوە فاشیست و جینۆسایدەکانی میللیگەرایی ئیتیحادوتەرەقی دەوڵەت لەکارەساتی هەردوو گەل جێگای باس نییە بەڵکو کوردە بەکرێگیراوەکانیش ڕۆڵێکی گرنگیان هەبوو. بەو ئەندازەیەی کێشەی کۆمەڵگای نەتەوەیی ئاشووری سەرچاوەکەی بۆ شارستانی دەگەڕێتەوە. بەلآم لەگەڵ ئایدیۆلۆژیای کرستیانی و مۆدێرنیتە پەرەیسەندووە. هەروەکو نموونەی ئەرمەنیەکان بۆ چارەسەری پێویستی بە وەرچەرخان و گۆڕانکارییەکی ڕادیکالآنە هەیە. ئەگەر حەسرەت و ئارەزووەکانیان بۆ شارستانی کلاسیک و زهنیەتی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری و توانستە مادییەکانیان بشکێنن؛ سەبارەت بە فاکتەرەکانی شارستانێتی و تازەگەری دیموکراتیانە قالّببنەوە؛ سەرلەنوێ خۆیان بەشێوەی نەتەوەی ئاشووری دیموکراتیک بونیاد بنێنەوە، دەشێت بەرامبەر بە لەناوچوون ببێتە ڕێگایەکی رزگارکردنی هەبوون و ژیانی ئازاد. ئەگەر کەڵەکەبوونی یادەوەری کلتووری خۆرهەلاتی ناوین بەشێوەی کلتووری تازەگەری دیموکراتیانە نوێ بکەنەوە. هەم ڕێگا لەپێش ڕزگاری

راستەقینەیان دەکاتەوە هەم سەرلەنوێ بەرۆڵە مێژووییەکەی خۆیانیان دەگەیەنێت.

ر- کێشەی یەهوودیش بەو رادەیەی کێشەیەکی کۆمەڵگای خۆرهەڵاتی ناوینە لەهەمانکاتدا کێشەیەکی جیهانیشە. بەسەرکردنەوەی یەهوودییەکانیش بەدرێژایی مێژوودا بەمانایەک لەماناکان وەک بەسەرکردنەوەی سەرگوزەشتەی دۆخی بەکێشەبووی کلتووری خۆرهەڵاتی ناوینە. بۆچی یەهوودییەکان بوون بەکێشە، چۆن بەراتەوازە بوون، لەکوێ بڵاوبوونەوە، چیان ئاواکرد، رووبەرووی کامە ئەنجام بوونەوە؟ سەرچاوەی ئەو پرسیارانە بۆ شارستانی دەگەرێتەوەو وەڵامدانەوەشیان لەگەڵ دادگایکردنی شارستانیدا یەکسانە. لەبەشەکانی پێشووتری بەرگرینامەکەمدا باسێکی بەرفراوانی یەهوودییەکان و کێشەی یەهوودیم پێویست بینبوو. لێرەشدا ئاماژە بەچەند داوەرییەکی تەواوکارانە دەدەم.

دامەزراوەی پێخەمبەرایەتی کە کۆمەکێکی زۆری بۆ کلتووری خۆرهەڵاتی ناوین هەبووە. تارادەیەکی مەزن بونیاد و پێکهاتەیەکی زادەی یەهوودیەکانە. بێگومان لەو بەرهەمەیاندا سوودیان لەکلتووری کۆنی سۆمەر و میسرو کلتووری قەبیلەکانی ناوچە بینیوە، چاکسازیکردن لەسەرچاوەی ئەو کلتوورانە و گۆرینیان و کردنیان بەکلتووری قەبیلەی یەهوودی و نوێنەرایەتیکردنیان پێویستی بە بەهرە و توانایەکی زۆر هەیە. لەبنەرەتدا یەهوودیەت گوزارشت لەو بەهرەیە دەکات. هەندێک جار ئەو توانایەیان بۆ پارە گۆریوە، جارانێکیش بۆ بۆمبی ئەتۆمی و بەمجۆرەش لەئاستی جیهاندا بەکاریگەر بوون.

ئەو توانا و بەهرەیان رۆڵێکی گرنگ لەسەرچاوەی کێشەی یەهوودیدا دەبینێت. لەکاتێکدا خوداوەندێتی قەبیلە لەمێژوو و رۆژی ئەمرۆمان لەسەردەمی مۆدێرنیتەی سەرمایەداریدا بەشێوەی خوداوەندێتی میلیگەرایی، دەوڵەت - نەتەوەو سیکۆلار خۆیان دەنوێنن؛ لەنزیکەوە گرێدراوی یەهوودیگەراییە، یەهوودیەکانیش هاوشێوەی ئاشوورییەکان بوونەتە قوربانی دەستی نەریتی ئەو شارستانی و مۆدێرنیتەیەی خۆیان ئافراندوویانن. فۆرمی دەوڵەتی (لویاتان) جانەوەر کە لەپەرتووکی

پیـرۆزدا باسـی دەکرێـت داهێنـانی خۆیانـە. شـێوەگرتنی لویاتـان وەک دەوڵـەت ــ نەتـەوەی مۆدێرنیتـە؛ سـەرەتا نوێنەرایـەتی کردنـی لەلایـەن ناپلیۆن و دواتریش لەلایەن کەسایەتی هیتلەرەوە، لەنزیکـەوە پەیوەنـدی بەکلتووری خوداوەندێتی (تیۆلۆژیا) یەهوودییەوە هەیە. وەک دەزانرێت کە جینۆسـایدی یـەهوودی لەلایـەن یـەکێک لەشـێوەکانی ئـەو جانـەوەرەی مۆدێرنیتەوە ئەنجامدراوە. کەچی لەچاخەکانی کۆن و ناوینیش دووچـاری ڕووداوی هاوشـێوە هـاتبوون. ئامـاژەکردن بـەو ڕاسـتیەی یەهوودیـەکان بەدەستی ئەو جانەوەرانەی زادەی خۆیانبوون دووچاری کارەسـاتی گـەورە هاتن؛ دیسان پێویستیەکی دڵسۆزبوونە بۆ ئەو حەقیقەتەی ئەو کلتوورەی فێری کردووین.

ڕزگاربوون یەکەمین بەشی پەرتووکی پیرۆزە. بۆ یەهوودیەکان گرنگەو تا ئێستاش بایەخەکەی بەردەوامە. بەلانی کەم پێویستیان بەدەرکـەوتنێکی گرنگی وەک ئەوەی میسر و کۆچەکەی ئور (ئورفا)ی پێشتووتریش هەیـە. پێویستە ڕێگایـەک بدۆزنـەوە بـۆ دەرکـەوتن لـەو نـاکۆکی و پێکدادانانـەی نزیکـەی سـێ هـەزار سـاڵە لەکۆنــە وڵاتـی گەنعانیـیـەکان لەگـەڵ فەلەسـتینیەکان و دونیـای عـەرەب لـەئارادا بـووەو تـا ڕۆژی ئەمڕۆشـمان بەردەوامە. وەک کەسێکی خەڵکی ئورفا بۆچـوونی نائاسیم لەبارەیانـەوە؛ لەفاکتەرەکانی تازەگەری دیموکراتی بەدوای ڕزگاریدا بگەڕێن کە بەدرێژایی بەرگرینامەکەم هەوڵی گەلاڵە کرنیمداوە. بێگومان ڕۆشنبیرە یەهوودییەکان لەولایەنـەوە خـاوەن بۆچـوونی پێگەیشـتوون. بـەڵام مەسـەلەکە تـەنیا لەمیانـەی گەلاڵـەکردنی ڕاو بۆچـوون چارەسـەر نابێت. بـەڵکو پێویسـتە یەهوودییەکان سەرلەنوێ بەیەکگەشتنێکی بەپرەنسیپانە لەگـەڵ کلتووری دیموکراتیانەی خۆرهەڵاتی ناوین مەیسەر بکەن و لەخۆرهەڵاتی ناوینێکدا کـە هەلومـەرج و جیۆپـۆلیتکی دەوڵـەت ــ نەتـەوە تێیـدا زاڵ بێت، وەک دەوڵەت ـ نەتەوە ئیسرائیل ناچـارە بـەردەوام لـەناو شـەڕدا بێت. چونکـە ناشـێت ئـاگر بـە ئـاگر بکوژێندرێتـەوە. هەرچەنـدە پشـتگیری هێـزی هەژموونگـەرایی مۆدێرنیتـەی سـەرمایەداری متمانـەی پێببەخشێت، بـەڵام

تیرای چارەسەرییەکی بنەڕەتی ناکات، هەرسیستەمێکی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری دەرباز ناکات ئاسایشی هەمیشەیی فەراهەم ناکات.

بەگشتی یەهوودی بەتایبەتیش کێشەی ئیسرائیل چارەسەرنەکرێت، کۆمەڵگاکانی خۆرهەلاتی ناوین و جیهان ناتوانن کێشەکانیان چارەسەربکەن. هیچ نموونەیەک بەقەدەر نموونەی ئیسرائیل ـ فەلەستین فێرکەرنییە کەسەرجەم ئەو هەڵوێستانەی دیدگا و ڕێنومایی دەوڵەت ـ نەتەوە لەخۆوە دەگرن کێشە چارەسەر ناکەن، بەڵکو قورستری دەکەن. پارەیەکی زۆر لەشەڕی ئیسرائیل ـ فەلەستین خەرجکراو خوێنێکی زۆر ڕژاوە، تەواوی ئەو دۆخ و بوویەرانەش گلۆلەی کێشەگەلێکی زۆر قورسی وەک میراس لەدوای خۆی جێهێشتووە. ئەوەی لەنموونەی ئیسرائیل ـ فەلەستیندا ئیفلاسی کردووە مۆدێرنیتەی سەرمایەداریو پارادایمەکەی دەوڵەت ـ نەتەوەیەتی.

یەهودییەکان یەکێک لەپێکهاتە سەرەکیەکانی کلتووری خۆرهەلاتی ناوینن، نکولیکردن و جینۆسایدکردنیان بەزیانی هەموو لایەنێکە. ئیتر بەشێوەیەکی بەرچاو ئاشکرابووە کە خۆشیان ناتوانن لەگەڵ ئەو لویاتانە لەناو ئاشتی و ئارامیدا بژین کە ئەوانی جینۆساید کردووە. وەک ئەرمەنی و ئاشوورییەکان یەهوودییەکانیش لەڕێگای سەرلەنوێ خۆبونیادنانەوەیان وەک نەتەوەی دیموکراتیک بەئاسانی دەتوانن جێگای خۆیان لەکۆنفیدراسیۆنی دیموکراتییانەی خۆرهەلاتی ناویندا بگرن، لەم بارەیەوە پرۆژەی کۆنفیدراسیۆنی دیموکراتیانەی ڕۆژهەلاتی دەریای سپی ناوەڕاست دەشێت سەرەتایەکی باش بێت. لەوانەیە ناسنامە ئایینیو نەتەوەییە وشک و داخراوەکان لەچوارچێوەی ئەو پرۆژەیەدا بۆ ناسنامەی نەرم و کراوە بگۆڕێن. بگرە دەشێت ئیسرائیل یش بۆ نەتەوەیەکی دیموکراتیکی کراوەو پەسەندکراو بگۆڕێت. بێگومان پێویستە دراوسێکانی ئیسرائیل یش وەرچەرخانێکی هاوشێوە بەخۆیانەوە ببینن.

ئەو گرژی، پێکدادان و شەڕە خەست و بەردەوامانەی خۆرهەلاتی ناوین بەخۆیەوە دەبینێت وەرچەرخانی مۆدێرنیتە دەکات بەناچارییەک. تا وەرچەرخانی مۆدێرنیتە ئەنجامگیر نەبێت کێشە کۆمەلایەتی و

نەتەوەییە قورسەکان دەرباز ناکرێن، تەنانەت ناکۆکی عەرەب ـ ئیسرائیل بەتەنیا جەخت لەسەر پێویستی وەرچەرخانی مۆدێرنیتە دەکاتەوە، ئەگەر سیستەمی حکومڕانی ناتوانێت کێشە سەرەکیەکان چارەسەر بکات. ئەو کاتە پێویستە سیستەم هەڵوەشێنرێتەوە. تازەگەری دیموکراتیش ئەلتەرناتیفی ئەو هەڵوەشانەوەیە دەخاتە ڕوو.

ز ـ تەسفیەکردن یان سڕینەوەی کلتووری هێلینی لەخۆرهەڵاتی ناوین بەتایبەتیش لە ئەنادۆڵ زیانێکی گەورەیە. ئەو تەسفیە کێشەی دراماتیکی لەدوای خۆی جێهشتووە. ئەو تەسفیەکارییەی دەوڵەت ـ نەتەوەکانی تورک و یۆنان لە چارەگی یەکەمی سەدەی بیستەم لەسەر بنەمای کۆچبەری دژی یەکتریان ئەنجامداوە، بەقەدەر جینۆسایدەکان شوێنبەنجەیەکی بەئازاریان جێهشتووە. بەمجۆرە دابڕاندنی گەلان لەشوێنگەی کلتووری هەزاران ساڵەیان لەچوارچێوەی دەسەڵاتی هیچ دەوڵەتێکدا نییە. نموونەی بەم جۆرەش لەمێژوودا کەمن، نموونەیەکی دیکەی بەمجۆرە دەگمەنە کە بەشێوەیەکی ڕەق و کاریگەرتر ڕووی نامرۆڤانەی دەوڵەت ـ نەتەوە ڕوون بکاتەوە. کەچی لەڕاستیدا لەقۆناخی نێوان ٣٠٠ پ ز ، ٣٠٠ زایینی هێلینیزم شکۆدارترین سەنتێزی کلتووری خۆرهەڵاتی ناوین بوون.

خێزابوونی قۆناخی لەناوبردنی کلتووری هێلینی، یەهوودی، ئاشووری و ئەرمەنی لەگەڵ ئیسلامیەتدا ڕۆڵێکی گەورەی لەهەرەسهێنانی شارستانی خۆرهەڵاتی ناویندا بینیوە. هیچ کاتێک کلتووری ئیسلام هێزی پڕکردنەوەی ئەو بۆشاییەی نەبووە کە ئەم کلتوورانە جێیان هێشتووە. کاتێک مۆدێرنیتەی سەرمایەداری لەسەرەتاکانی سەدەی نۆزدەهەمەوە هاتە ناوچە ڕووبەڕووی دیمەنی بیابانێکی وشکهەڵاتوو بوویەوە. ئەمە بیابانێک بوو داخورانی کلتووری خولقاندبووی. لەبەرئەوەی کلتوور مانای بەرخودانە، کلتوور بەهێز نەبێت، بەرخودانیش بەهێز نابێت، هەربۆیەش فەتحکردنی ناوچە زەحمەت نەبوو. سڕینەوەو لەناوبردنی کلتووری ڕۆڵی لە هەرەسهێنان و دۆخی ئەمرۆی خۆرهەڵاتی ناویندا بچووک ناکرێتەوە، پرۆژەکانی نەتەوەی هۆمۆژەنی دەوڵەت ـ نەتەوەش

بەرپرسیاری سەرەکی کۆمەڵکوژی کلتوورییە. تەنانەت لەسەردەمی ئومەتە ئایینیەکانیشدا هەرگیز بەو ڕادەیە لەپای هۆمۆژەنێتی نەبوون.

ک ـ ئەو کێشانەش گرنگن کە گروپە ئەتنیکیە قەفقاسیەکانیش دووچاری هاتوون. ئەو گروپانە بەدرێژایی مێژوو ڕوویان لەخۆرهەڵاتی ناوین کردووەو کۆمەکیان بە دەوڵەمەندێتی کلتووری ناوچەکە کردووە. هەربۆیە هەرگیز ناشێت کۆمەکیان بۆ یەکپارچەیی و دەوڵەمەندێتی کلتووری بچووک بکرێتەوە. مۆدێرنیتەی کلتووری ئەو کەمینانەشی خنکاندووە.

ئەنجام کێشە کۆمەڵایەتیە سەرەکیەکانی خۆرهەڵاتی ناوین کە سەرچاوەکەیان بۆ شارستانی چینایەتی ـ دەوڵەت دەگەڕێتەوە و لەمیانەی مۆدێرنیتەی سەرمایەدارییەوە بەئاستی جینۆسایدگەیشتووە لەگەڵ قەیرانی بونیادی جیهانگیرییشەوە بەقۆناخێکی سەخت و قورس گەیشتووە. ئەجندای هەرێمی مۆدێرنیتەی حوکمڕانی نەک هەر تەنیا کێشەکانی پێناسەو چارەسەر نەکردووە. تەنانەت لەجیاتی ئەو شتگەلەی نوێنەرایەتیان دەکرد بێ ئاگابوون. هەروەها میللیگەرایی ئەتنیکی نەژادیو ئایینی کە زیاتر پەنایان بۆ بردووە لەجیاتی چارەسەری کێشەکانیان قووڵو گڕدارتر کردووە.

کلتووری خۆرهەڵاتی ناوین لەهەمانکاتدا شێوازێکی ژیانە کە شۆڕشە مێژووییە شکۆدارەکان ئافراندوویانە. بەو ڕادەیەی دەوڵەت ـ نەتەوەکان واتە ئامرازەکانی کۆمەڵکوژی کلتووری حەقیقەتی کۆمەڵگا بکوژن؛ ژیانیش دەکوژن. فاکتەرەکانی تازەگەری دیموکراتی کە هەوڵی پێناسەکردنیانماندا هێزی کرداری ـ تیۆری وەستاندنی جینۆساید و پاراستنی ژیانن. کاتێک لەسەر بنەمای کۆمەڵگای دیموکراتیک ـ ئیکۆنۆمیک ـ ئیکۆلۆژیک هەنگاو بەرەو سەردەمی نەتەوە دیموکراتەکان بهاوێژرێت، ئەوکاتە لەکلتوورە نوژەنبووەکەی خۆرهەڵاتی ناویندا سەرلەنوێ ژیان بەکارەکتەرە ئەفسوونیەکەی خۆی دەکات.

## ٢. کێشەی بیروکراسی و چینە کۆمەلایەتیەکان

چینو بیروکراسی شوێنێکی گرنگییان لەناو ئەو راستییە کۆمەلایەتیانەدا هەیە کە ئایدیۆلۆژیای پۆزیتیڤیست شاردوویەتیەوەو زلیکردوون. دیاردەی چینایەتی کە پۆزیتیڤیستە چەپرەوەکان لەرادەبەدەر زلیان کردووە، وەک حەقیقەتێکی کۆمەلایەتی بەپێی پێویست مانادار نەکراوە. لەکۆمەلگا زیاتر رۆل بە چین دراوە. وەک بلێی کۆمەلگا بریتی بێت لە چینەکان. چەمکێکی کۆمەلگا پێشخراوە کە بریتییە لەکۆی چینەکان. بەلام بەپێچەوانەکەی راستە. بەگوێرەی جەستەی کۆمەلگا دیاردە چینایەتیەکان دۆخێکی قەلەوبوونی نائاساییە. ناوە بەناوە لاواز و قەلەو دەبنەوە. بچووکردنەوەی کۆمەلگاکان بۆ دۆخی چینایەتی دۆخێکی نابینایی تەواو دەخولقێنێت؛ حەقیقەتی کۆمەلگا لەبەین دەبات. ئایدیۆلۆژیا چینایەتیەکان لەسەردەمی شارستانیدا بوونەتەوە خاوەن ماهیەتێکی پاوانگەرایی؛ گوزارشتکردنی حەقیقەتی کۆمەلگا بەلاڕێکردن و چەواشەکراوی دەکەن بەرێساو لۆژیکێک. پیشەی دانایی و فەلسەفە لەناوەرۆکی خۆیدا هونەری گەرانە بەدوای حەقیقەتی ونکراوی کۆمەلگادا.

ئەو جیابوونەوە چینایەتییەی بەدرێژایی مێژوو پەرەیسەندووە لەجیاتی ئەوەی وەک دیاردەیەکی ئاسایی کۆمەلایەتی تاوتوێ بکرێت هەلسەنگاندنی وەک لادانێک گرنگو بایەخدارە. ئایدیۆلۆژیا و زانستی کۆمەلایەتی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری لەبنەڕەتدا پشت بەدیاردەی چین دەبەستێت. خۆی بەشێوەی چینی دەسەلاتدار و چینی دەستەمۆ تیۆریزە دەکات. بەهۆی ئەو ماهیەتەی گوزارشت لەحەقیقەت ناکات و بەردەوام لەدۆخێکی رەخنەگر و دۆگماتیکانەدا دەمێنێتەوە. هەروەها دەکرێت هەمان تایبەتمەندێتی لەتەواوی سەردەمەکانی شارستانی چینایەتیدا ببینرێت. لەهەردوو حالەتیشدا ئەو ئایدیۆلۆژیا و باوەڕییە زانستیانەی لەسەر چینایەتی (چینی دەستەلاتدار و ژێردەست) تیۆریزەکراون تارادەیەکی زۆر حەقیقەت چەواشە دەکەن. بەهۆی ئەو ژیان و زهنیەتانەی لەسەر جیاوازی چینایەتیەوە تیۆریزە کراون لێگەڕین بەدوای راستی و حەقیقەت هیچ کەم

نابێتەوە. گفتوگۆو کێشمە کێشەکان سەبارەت بە حەقیقەتیش سەرچاوەی خۆی لەهەمان واقیعەوە وەردەگرێت. لەم سۆنگەیەوە کێشەی کۆمەڵگا بەشێوەیەکی سەرەکی وەک دیاردەیەکی چینایەتی دیاردەبێت. کاتێک لەسەر ژیانی ئابووری ئاوابکرێت وەک پاوانێکی سەرووی ئابووری بەرجەستە دەبێت. چونکە ئابووری پەرە نەسێنێت جیاوازی چینایەتیش پەرە ناسێنێت. چەندە زێدە ـــ بەرهەم و زێدە ـــ بەهایەکی زیاتر دەستەبەربێت، بەو ڕادەیەش بناخەی ماددی جیاوازی چینایەتی پێکدێت. ناکۆکی و پێکدادانی چینایەتی دژوار لەسەر ئەو زیادەیە ڕوو دەدات، ئەو واقیعە بناخەی ئەو دیاردەیەش پێکدێنێت کە بەگرژی و پێکدادنی کۆمەڵایەتی ناو دەبرێت.

هەروەها هەموو کاتێک شانبەشانی دیاردەی چینایەتی توێژگەلێکی لۆمپان و بەڕەڵای لەبەرهەم دابڕاو پێکدێت کە بەفاکتەرە پەراوێزخراوەکان ناو دەبرێن. ئەو توێژانەی لەرێگای مۆدێرنیتەی سەرمایەدارییەوە بەدۆخی "سوپای بێکاران" گەیەنراون نەفرینی سیستەمن. بەمجۆرە بەدەستی مرۆڤەوە دیاردەیەک دیاری کۆمەڵگای مرۆڤایەتی دەکرێت کە لەجیهانی ئاژەڵانیش بوونی نییە، مسۆگەر بۆ کارکردنی سیستەم پێویستی بە سوپای بێکاران هەیە، چونکە لەدۆخێکی پێچەوانەدا یاسای زۆرترین قازانج کار ناکات. بەبێ گەورەبوونی سوپای بێکاران گەورەبوونی سەرمایەش فەراهەم نابێت. ئەنجامێکی دیکەی ئەو دیاردەیەش زیادبوونی ژمارەی دانیشتوان و بزاوتەکانیانە. زیادبوونی بەردەوامی ژمارەی دانیشتوان تەنیا بێکاری لەسەر پێیان ناهێڵێتەوە، بەڵکو دەرگای کارەساتی ئیکۆلۆژی ئەوتۆ دەکاتەوە کە هەسارەکەمان توانای خۆراکپێدانی نییە و ژینگەکەشمان بەرگەی ناگرێت.

یەکێک لەهەڵە گەورەکانی مارکسیزم (سەرجەم ئایدیۆلۆژیاکانی مۆدێرنیتەی سەرمایەداریش) جیابوونەوەی چینایەتی بۆ پێشکەوتن بە ناچارییەک داناوە. هەڵە یاخود لاوازیی سەرەکی سیستەمەکەی لەو داوەرییەدا شاراوەیە. حاشاهەڵنەگرە کە ئەمەش رێگا لەپێش ڕەواکردنی زۆرداری و چەوسانەوە دەکاتەوە. ئەو داوەرییە ڕۆڵێکی سەرەکی لەنەمانی

بەهای حەقیقەتیشدا دەبینێت. بێگومان هەر دیاردەیەک بە زەروری و ژیانی دابنرێت ڕەواکردنیشی دەست لێبەرنەدراوە.

دیاردەی بیروکراتی گوزارشتی دامەزراوەیی - دەوڵەتی دیاردەی چینایەتییە. ئامرازی کۆنترۆڵ و سەرکوتکردنی تەواوی کۆمەڵگا و چینی ژێردەستە لەلایەن چینی فەرمانڕەواوە. بەڵام بەپێی بەسەرچوونی قۆناخ هێزێکی گەورە بەدەست دێنێت و بەپێگەیەکی تایبەت دەگات. خۆشی دەبێت بە چینێک، دەبێتە سەرچاوەیەکی زادەی چینایەتی. لەمیانەی جیابوونەوەی بەردەوامدا جیاوازی چینایەتی سەرووو خواروو بەخێو دەکات. ئەو دۆخەش بەردەوام دوالیزمێک لەژێر بونیادی خۆیدا دەئافرێنێت. لەلایەکی دیکەشەوە وەک جیاکارییەک بەردەوام خۆی لەسەرووی کۆمەڵگاوە دەبینێت. پاوانگەرایی چین زیاتر لەرێگای بیروکراسیەوە ئاوا دەکرێت. لەگەڵ ئەوەی بەدرێژایی مێژوو لەپەرەسەندندا بووە، بەڵام لەسەردەمی مۆدێرنیتەی سەرمایەداریدا بیروکراسی بووە بە دێوێک کە کۆمەڵگا قووت بدات. چەواشەکاری چینایەتی لەو کاتەی بیروکراسی لەزیادبووندایە بەیەکەوە دیاردەی کۆمەڵگا دووچاری لاوازترین دۆخی خۆی دەکەن. کۆمەڵگا بەدۆخێک دەگەیەنن کە بڵێن تەنیا بریتیە لە چین و بیروکراسی. لەو قۆناخەدا سەرکوتکردن و چەوسانەوە دەگاتە بەرزترین ئاستی خۆی. ناکۆکیو پێکدادانەکانیشی بەشێوەیەکی خەست ڕوودەدەن. کاتێک زیادبوونی ناکۆکی و پێکدادانەکان ڕێگا لەپێش بیروکراسیەکی زیاتر دەکاتەوە، کێشەی کۆمەڵایەتی بۆ پەرەسەندنی سروشتی دەگۆڕێت، لەهەندێک شوێنیش بۆ تەقینەوەی شۆڕشگێڕی وەردەچەرخێنن.

چینی ژێردەست لەبواری حەقیقەتەوە بێ بەهایە، کۆیلایەتی گوزراشت لەتاکی ئەو مرۆڤە دەکات کە شوێنپەنجەی حەقیقەتی سڕاوەتەوە. لەم سۆنگەیەوە بزاوتە ئایدیۆلۆژیی و سیاسیەکانی پشت بەکۆیلە دەبەستن بەرهەمدارنابن. بەڵام کاتێک ببن بە بەشێکی بزافی گەڕان و بەدەستهێنانی حەقیقەتی ڕێکخراو بەرامبەر بەو چەوسانەوەو سەرکوتکردنەی لەسەر تەواوی کۆمەڵگا جێگای باسە مانا بەخش دەبن.

وەک چۆن لەبواری حەقیقەتدا چینی بەرتەسک بێ بەهایە، وەک بزووتنەوەش دەرفەتێکی ئەوتۆی سەرکەوتن ناڕەخسێنێت. واقیع‌و بوویەرە مێژووییەکان لەو بارەوە پڕ لەنموونەن.

ئەو هەڵسەنگاندنانەی سەبارەت بە چین و بیروکراسی ئەنجامدراون بۆ مێژووی کۆمەڵگای خۆرهەڵاتی ناوینیش لەجێگای خۆیدایە. جیاوازی چینایەتی و بیروکراسی لەسەر چوار شێوەی ئایدیۆلۆژی سەرەکی خۆیان ڕەوا دەکەن. ئەمانەش، ئایینگەرایی، میللیگەرایی، ڕەگەزگەرایی و زانستگەرایی پۆزیتیڤن، شێوەگرتنی ئایدیۆلۆژی و جیابوونەوەی چینایەتی پەیوەندییەکی بەهێزیان لەنێواندا هەیە؛ لەبەرئەم هۆکارەیە ناتوانن حەقیقەت بخەنە ڕوو. پەرەسەندنی کۆمەڵگای دیموکراتیک گونجاوترین ئەلتەرناتیفە بەرامبەر بەجیاوازی چینایەتی. لەکاتێکدا هەڵوێستی چینایەتی بەرامبەر بەچین بەردەوام چین دەئافرێنێت، بەڵام تێکۆشانی دیموکراتیانە بەرامبەر بەجیاوازی چینایەتی لەناو کۆمەڵگادا چین کەمدەکاتەوە، دەیتوێنێتەوە و بەکۆمەڵگایەکی ئازاد و یەکسانی دەگەیەنێت. لەم سۆنگەیەوە لەرێگای کۆمەڵگای ئیکۆلۆژی و ئیکۆنۆمیک زیادە (بەرهەم‌و بەها) کان لەپاوانەکانی سەرمایە دادەخات کەزەمینەی ماددی جیاوازی چینایەتیە و بەمجۆرەش سەرلەنوێ کۆمەڵگا بەهێز دەکاتەوە. کەڵەکەبوونی زێدە ـ بەها کە فاکتەری شاراوەی کێشەکانی کۆمەڵگایە لەسەردەمی شارستانی و مۆدێرنیتەدا لەلایەن فاکتەرەکانی تازەگەری دیموکراتیەوە دەتوێنرێتەوە و چارەسەری کۆمەڵگای دیموکراتیک دەست پێدەکات. بەمجۆرەش ڕوون دەبێتەوە کە تێکۆشانی دیموکراتییانە تێکۆشانێکی بە پرەنسیپی چینایەتیشە.

## ٣ . شۆڕش‌و کێشەی پلەداری، دەسەڵات و دەوڵەت

زۆربەی شۆڕشەکان لەگەڵ ئامانجەکانیان پێچەوانە دەبنەوە چونکە شیکارێکی راست سەبارەت بەکێشەکانی پلەداری، دەسەڵاتداری و دەوڵەت ئەنجامنادەن. لەم بارەشەوە مێژوو پڕ لەپاشماوەی ئەو شۆڕشانەیە کە پێچەوانەی ئامانجەکانیان بوونەتەوە. لەشۆڕشی ئیسلامیەوە کە

بانگەشەیەکی زۆری ئیلاهیبوونی دەکرد، تا دەگاتە شۆڕشی فەرەنسا کە خۆی بەشۆڕشی ڕۆشنگەری سەدەی هەژدەهەم دادەناو تەنانەت شۆڕشی سۆسیالیزمی زانستی ڕوسیای بەلشەفیکیش بەدەیان نموونەی هاوشێوە لەماوەیەکی کورتدا لەناکۆکبوون لەگەڵ ئەمانجەکانیان ڕزگاریان نەبووە. هۆکاری سەرەکی ئەو دیاردەیە؛ تێکشکاندنی دەوڵەتێک یاخود هێزێکی دەسەلاتی پلەداری چوارچێوەی "کورت ماوە"مانای تێکشکانی شارستانی و مۆدێرنیتە نییە کە دامەزراو و کلتووری "درێژماوە" یە. تەنانەت ئەگەر دەوڵەتی ژێر کەوتوو لەناو خودی شارستانی یاخود مۆدێرنیتەدا بووبێت بەکۆسپێک، ئەوەی لەئاکامی ڕووخانی ئەو دەوڵەتە لەرێگای شۆڕشەوە بەهێزتر دەبێت شارستانی مۆدێرنیتەیە کە کارەکتەرەی تەواوی دەوڵەتەکانی ئەو قۆناخە دیار دەکات. تێکشکانی دەوڵەت مانای تێکشکانی دەسەلات و مۆدێرنیتە نییە؛ بەڵکو ئەمە ئەو واقیعەیە کە لەژێر زیاتر بەهێزبوونی دەسەلاتدا شاراوەیە.

پلەداریو دەسەلات وەک دوو دیاردەی تێکەڵ بەیەکتری بەدرێژایی هەزاران ساڵ بەردەوام دەبن، بەلام دەوڵەت بەرهەمی ماوەی کورتترە. هەرچی شۆڕشە ڕووداوی ساتە ماوەن. ئەمەش مانای ئەوە نییە کە شۆڕش ڕۆڵی گرنگ نابینێت. بەلام هەڕەشە و هەرسکردن و توانەوەی شۆڕشەکان لەناو بونیادەکانی دەوڵەتو شارستانیدا بەردەوام وەک ئەگەرێک لەئارادایە. بۆ نموونە شۆڕشی ١٧ی ئۆکتۆبەر بەرامبەر هیچ دەوڵەتێک تێکنەشکا؛ بەلام بەرامبەر مۆدێرنیتەی سەرمایەداری تێکشکا کە سیستەمی بونیادی درێژماوەیەتی. بێگومان تەنیا شەڕکردنی بەرامبەر فاکتەری سەرمایەداری مۆدێرنیتە ڕۆڵی دیاریکەری لەمەدا هەیە؛ بەتایبەتیش لەژێر ناوی سەرمایەداری دەوڵەت بەکۆنەپەرستترین و محافەزەکارترین شێوەیەوە ململانێی لەگەڵدا کردووە. هەروەها هەوڵیداوە لەبەرزترین ئاستدا پەرە بەفاکتەرەکانی ئیندوستریالیزم و دەوڵەت ـ نەتەوە بدات. هەڵبەتە کاتێک بەبێ شیکاکردنی مۆدێرنیتە کەوتنە ناو لادانێکی بەمجۆرە، لەدەرەنجامدا شۆڕشی پێچەوانەی ئامانجەکانی دەکردەوە، سەدەی بیستەمیش پڕە لەپاشماوە و وێرانەی ئەمجۆرە شۆڕشانە.

تێکۆشـان بەرامبـەر کلتـووری پلـەدار، دەسـەڵات و دەوڵـەت پێویسـتی بەراڤەیـەکی راسـتی مێژوویـی (مێـژووی فاکتـەرەکانی دیمـوکراتی)و بەکارهێنانی فاکتەرە بەرهەڵستکارەکان هەیە کە بەراست پێناسەکراون. شۆڕش ئەو کاتە سەرکەوتوو دەبێت کە لەگەڵ سیستەمی درێژخایەنی تازەگەری دیموکراتی ئاوێتەبێت و لەگەڵ ئامانجەکانی ناکۆک نەبێت.

کاتێـک لـەم چوارچێوەیـەدا ڕاڤـەی شۆڕشـگێڕانەی هەرسـێ ئایینـە تاکخوادابیەکەی خۆرهەڵاتی ناوین بکەین، ئەوا باشتر تێدەگەین کە بۆچی پێچەوانـەی بانگەشـە شکۆدارەکەیان کەوتوونەتـەوە. لاسـایی کردنـەوەی بونیادەکانی"درێژ ماوە" دەسەڵات و پلەداری و یەکسەر بە دەوڵەتبوونیان، هۆکاری سەرەکی سەرنەکەوتنی ئەو شۆڕشە ئایینیانەیە. دەشێت لەم چوارچێوەیـەدا دەرک بـە لادانـی بـەردەوامی ئایینـە تاکخوداییـەکان لەئامانجەکانیان بکرێت کە لەوبڕوایەدان لەپێناویدا دەجەنگن و تەنانەت وەک یاسای شۆڕشی چەواشەی لێهاتووە. لەسەردەمی مۆدێرنیتەدا ئەو پارییە بەشێوەیەکی زۆر ئاشکراتر ئەنجامدەدرێت. سەرجەم شۆڕشە نیشتیمانیەکانی لەمیانەی دەوڵەت ـ نەتەوەوە بەدامەزراوەیی دەبن و تەواو لەگەڵ ئامانجەکانیان ناکۆک دەبن، ئیتر بەدۆخێک دەگەن تەنیا لەمیانەی ئازار و نەفرینەوە باسیان دەکرێت.

لەکۆمـەڵگای خۆرهـەڵاتی نـاوین ئـەو شارسـتانییانەی لـەبواری چڕبوونەوە لەبەهێزترین دۆخ و درێژخایەنترین ماوەدا ژیاون گوزراشت لەلوتکەی کلتووری پلەداری، دەسەڵات و دەوڵەت دەکەن. لەسەردەمی گلگامێشەوە زانراوە کە دەسەڵات نەخۆشییە. داناکان بەردەوام باسی نەخۆشی دەسەڵاتیان کردووە؛ وەک سەرنجراکێشترین سۆزانی پێناسەیان کردووە. خۆرهەڵاتی ناوینیش بەو سیفەتەی لانکەی درێژخایەنترین کلتوور و سەرچاوە و شوێنی سەرجەم بونیادەکانی دەوڵەت و دەسەڵاتی زادەی پلەداری بووە؛ لەو سۆنگەیەوە باشتر تێدەگەین کە بۆچی بەردەوام کلتووری دیموکراتی لەژێرەوە بووە. لەهەر کۆمەڵگایەکدا سەرۆکی خێزان خۆی بە ئیمپراتۆرێکی بچووک دابنێت ڕوون دەبێتەوە کەبۆچی ڕۆڵی شۆڕشەکان سنوردار بووە. هەرچی لەقەڵەمدانی تەواوی مۆدێرنیتەیە وەک

شۆڕشێک دەرفەتی زیاتر تێگەیشتنی ڕەهەندەکانی کێشە کۆمەلایەتیەکانی ڕۆژی ئەمرۆمان بۆ دەرەخسێنێت. کاتێک سیستەمێکی فەتحکاری و داگیرکاری ئافرێنەری کێشەکان وەک سیستەمێکی چارەسەرکردنی کێشەکان پەیرەو بکەین، هەڵبەتە ئەنجامەکەی کێشەی کۆمەلایەتی قورستر دەبێت. لەسەدەی دواییدا بوون بەخاوەن دەوڵەت - نەتەوەیەک وەک بەیەکگەیشتنی هەرە گەورە لەگەڵ خوداوەند هەڵسەنگێنراوە. تەنانەت خوداوەندە کۆنەکانیش خرانە خزمەتی خوداوەندی نوێوە. نەتەوەکانی خۆرهەلاتی ناوین لەو ڕاستییە بێ ئاگان کەبەرامبەر بەیەکتری و بگرە بەرامبەر هاوڵاتییەکانی خۆشیان وەک ئامرازێکی شەڕ کاراو دەست بەکارن و هەژموونگەرایی سیستەم ئەو ڕۆڵەی پێ بەخشیوون. تەنانەت بەناوەندیکردنی دەسەلات و بەنەتەوەکردنی زێدەڕۆیانەی دەوڵەت وەک ڕۆڵێکی شۆڕشی نەتەوەیی - نیشتیمانی دەبینرێت. شۆڕشێک هەڵگری ئەو هەموو ناکۆکیانە بێت، نەک هەر تەنیا دەرفەتی سەرکەوتنی نابێت، بەڵکو زەبر لەو ئازادی و یەکسانییەش دەدات کە بانگەشەی بۆ دەکات. شۆڕشەکان تەنیا کاتێک دژە - ناوەندگەرایی‌و دژە - دەسەلاتگەرایی بن دەتوانن خزمەت بە دیموکراسی، یەکسانی و ئازادی بکەن؛ بەو ڕادەیەی کلتووری دیموکراسی کلتووری زلکراوی دەوڵەت - نەتەوە دەرباز بکات لەخۆرهەلاتی ناوین دەرفەتی گەشەکردنی بۆ دەرەخسێنێت. بەو ڕادەیەی بۆ بونیادەکانی دەوڵەت و دەسەلات — گوزراشتی چڕکراوەی پاوانەکانی سەرمایە و چەوسانەوە — لەلایەن کۆمەڵگای دیموکراتییەوە دەربازبکرێن کە گوزارشتی چڕکراوی کۆمەڵگای ئیکۆنۆمێک و ئیکۆلۆژییە، کێشە کۆمەلاتیەکان دەکەونە سەر ڕاستەڕێی چارەسەری ڕاستەقینەوە. نەتەوە دیموکراتییەکان و گوزارشتە سیستەماتیکەکەیان (تازەگەری دیموکراتی) نوێنەرایەتی چاخێک دەکەن کە کێشەکانی زادەی پلەداری، دەسەلات و دەوڵەتی تێدا دەرباز کراوە.

بۆ واتاداربوونی شۆڕشەکان و ناکۆکبوونیان لەگەڵ ئامانجەکانیان، پێویستە لەکۆتاییدا شۆڕشەکان تووشی نەخۆشی دەسەلات و پارییەکانی دەوڵەتگەرایی نەبن، ئەو شۆڕشانەی یەکسەر دەبن بەدەسەلات و دەوڵەت

تەنیا لەناو ناچن و کۆتاییان پێنایەت، بەڵکو خیانەت لەبانگەشەکانی دیموکراسی، یەکسانی و ئازادیش دەکەن. لەم چوارچێوەیەدا مێژووی شۆڕشەکان تراژیدیای دیرۆکی خیانەتیش بەخۆیانەوە دەبینن. لەم لایەنەوە شۆڕشەکانی ئیسلام، فەرەنسا و ڕووسیا پڕ لەوانەو ئەزموونی مەزنن. لەم سۆنگەیەوە لەجیاتی بەستنەوەی خێرای شۆڕشەکان بەهەلومەرجەکانی دەوڵەتو دەسەڵاتەوە گرێدانیان بە بەها درێژخایەنەکانی کۆمەڵگای سیاسی و ئەخلاقییەوە گرنگی و بایەخێکی زۆری هەیە. چونکە تەنیا لەرێگای سیاسەتی دیموکراتییەوە دەتوانرێت بناخەکانی کۆمەڵگای سیاسیو ئەخلاقی دابنرێت. لەم چوارچێوەیەشدا تا کۆمەڵگاکان لەرێگای سیاسەتی دیموکراتیبیانەوە نەخرێنە سەر پێیان، رێکخستنی دیموکراتیانە لەناو هەر جڤاتێکدا ئاوا نەکرێت و رێبەرایەتی دیموکراتیک پێنەگەیەنرێن، هەروەها بۆ ماوەیەکی درێژ شێوازی ژیانی دیموکراتیانە ناقینەکرێتەوەو جێگیر نەکرێت کۆمەڵگا سیاسی و ئەخلاقییەکان ئاوا ناکرێن؛ گوزارشتی بەرجەستەی کۆمەڵگای دیموکراتی کۆمەڵگا دیموکراتییەکان ئاوا ناکرێت، لەم سۆنگەیەوە نەتەوە دیموکراتیەکانیش ئاوا ناکرێن. بەمجۆرە پێویستە وەک چاخێکی نوێ بیر لەتازەگەری دیموکراتی بکرێتەوە کە لەیەکپارچەیی نەتەوەیی درێژخایەنی کۆمەڵگا دیموکراتییەکان پێکدێت، هەروەها وەک شێوەیەکی ژیانی ڕۆژانە هەڵسەنگێنرێت کە بەقەدەر نان، ئاوو هەوا ژیانییە.

کێشەیەکی دیکەی گرنگ و پەیوەندیدار بە پلەداری، دەسەڵات و دەوڵەتەوە، پەیوەندی بەماهیەتی خودی ئەو دامەزراوانەوە هەیە. لێکەڕینەکانی دیموکراسی، یەکسانیو ئازادی پشتبەستوو بەو دامەزراوانە گەورەترین پارادۆکسی ئەو ئایدیۆلۆژیانەیە کە بەمجۆرە ئەمانجەکانی خۆیان ڕادەگەیەنن لەسەرووی هەمووشیانەوە مارکسیزم. لەمیانەی پشتبەستن بەو دیاردانەی لەسەر بنەمای نکۆڵیکردن لەناسنامەی دیموکرات، ئازادو یەکسان دێنە ئاراوە هەوڵدان بۆ بەدەستهێنانی ئامانجەکان گەورەترین پارادۆکسە مێژوو بەخۆیەوە دیوە. لاوازکردنی پاوانەکانی سەرمایەی سەر کۆمەڵگای ئیکۆنۆمیک ـ ئیکۆلۆژیو کاریگەری

دەسەلاتو پلەداری لەسەر کۆمەلگای دیموکراتی و سنووودارکردنی دەولەت لەریگای یاساوە پانزەهیری ئەو دیاردانەیە کە ئامرازەکانی دامەزراوەیی جیاوازی چینایەتین. لەم لایەنەشەوە سیاسەتی دیموکراتییانە رۆلێکی ژیانی دەبینن، جگە لەسیاسەتی دیموکراتیانە لەریگای هیچ ئامرازیکی دیکەوە کۆمەلگایەکی ئازادو یەکسان (لەناو جیاوازییەکانیدا) بەدینایەت. چەندە ببیت بەدەسەلات بەو رادەیەش دەبیت بەچین. بە پێچەوانەوە چەندە دیموکراتیزەبیت بەو رادەیەش بەرەو دۆخی بێ چینایەتی دەرۆیت: تاوەکو ئامرازێکی بەرفراوانی سیاسەتی دیموکراتیانە بەسەر کلتووری خۆرهەلاتی ناویندا نەسەپێنریت، بەردەوام کۆمەلگا لەمیانەی ئەو ئامرازەوە وشیارنەکریتەوەو هەلنەستێتەوە سەرپێیان و نەخرێتە ناو چالاکییەوە بەکۆمەلگای دیموکراتیک ناگات. تا بەکۆمەلگای دیموکراتیش نەگات هیچ ئامانجێکی ئازادی و یەکسانی بەدینایەت، چاخی تازەگەری دیموکراتی جێگای باس نابێت.

## ٤ ـ کێشەکانی شار، چینی ناوین و هەرەسهێنانی کۆمەلگای گوند ـ کشتوکال لەخۆرهەلاتی ناوین و رێگەکانی چارەسەری

وێرانکاری بنەرەتی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری لەهەرەسهێنانی شار، گەورەبوونی شێرپەنجەیی چینی ناوین و لەناوبردنی کۆمەلگای گوند ـ کشتوکالدا ئاشکرا دەبێت. یەکبوونی ئاوسانی نائاساییانەی چینی ناوین لەگەل تەقینەوەی ژمارەی دانیشتوان کە شۆرشی پیشەسازی سەدەی نۆزدەهەم خێرای کرد لەژێر ناوی شارەوە رێگای لەپێش کاولکردنی شار کردەوە، بەشێوەیەکی تێکەل لەگەل هەلوەشانەوەی کۆمەلگای گوند ـ کشتوکالی هەزاران سالە بەرێوەچووە. کۆمەلگای گوند ـ کشتوکال لەبنەرەتدا خاوەن هەلومەرجێکی لەبارە بۆ ژمارەیەکی سنووورداری دانیشتوانی شار و بونیادێک کە هەرەشەی کوشندە ناکاتە سەر ژینگە. سەرجەم شارەکانی چاخەکانی کۆن و ناوین لەگەل کۆمەلگای کشتوکال هاوسەنگ و کارابوون. بەلێ تێکدانی ژینگە و تێکچوونێکی ئەوتۆ هاوسەنگی هەزاران سالەی نێوان شار ـ گوند بەردوام بوو. ئەو کێشانەی

هاتنــە ئــاراوەش بەئاســتی هەرەشــەکردن لەشــار و کۆمــەڵگای کشــتوکاڵ نەگەیشت. شارەکانی بەر لەسەردەمی ئیندوستریالیزم ڕۆڵێکی گەورەیان لەکۆمەڵگابوونـدا بینیـوە. لەشــاری ئوروکــەوە (٣٥٠٠ پ. ز) تــا دەگاتــە ڤێنسیا (١٠٠٠ـ١٨٠٠) ئاشنای چەندین شاری خاوەن ڕابـردووی شکۆداربووە. هــەروەها ڕۆڵــی شــارەکان لەپەرەســەندنی زانســت، هونــەر، فەلسـەفە و پیشەسازی حاشاهەڵنەگرە. تەنانەت دەوڵەتی شار (دەوڵەتشار)یش تەواو بەدەوڵەت دانانرێت، مانای نیمچە دیموکراسیەکە. بەمانایەک لە ماناکـان مێـژووی چیرۆکـی ئـەو شارسـتانییە باسـدەکرێت کـە لەتـەوەرەی شـاردا ئــاوابووە. بــەردەوام هاوســەنگبوونی ژیــانی شــار بــەر لــەقۆناخی ئیندوستریالیزم لەگەڵ ژیانی گوند ـ کشتوکاڵ رەچاوکراوە. ئەگەر ناکۆکی لـەنێوان شـار و گونـد دروسـتیش بێـت، بـەو دژوارییـە ناگـات هەرەشـە لەیــەکێتی و یەکپارچــەیی کۆمــەڵگا بکــات، هــیچ کاتێــک بەئاســتی پووچەڵکردنـەوەی کۆمـەڵگای گونـد ـــ کشـتوکاڵ نەگەیشـتووە. گرێـدان و یەکتری تەواوکردن مەرج بووە. ئـەو تەقینـە بونیادییـەی ئیندوسـتریالیزم بـەئامانجی زۆرتـرین قازانجـەوە بەخۆیـەوە بینـی تـەنیا بەتێکـدانی ئـەو هاوسەنگییە نەوەستا؛ ئەو چڕبوونەوە نائاسـاییەی ژمـارەی دانیشـتوان و بونیادەکانی لەو دوو سەدەیەی دوایی بەناوی شار هاتنە ئاراوە لەراستیدا ناشارگەراییو شارگەراییەکی بێ‌مانای لەگەڵ خۆیدا ئافراندووە. لـەئاکامی ڕووخانــدنی کۆمــەڵگای گونــد ـــ کشــتوکاڵ لــەژێر نــاوی "کۆمــەڵگای پیشەسازی" ڕێگای لـەپێش پەتایـەکی شـێرپەنجەیی کـردەوە. هـیچ ڕۆڵ و کارابوونێکی ئەو دیاردەیە جێگای باس نییە کە بەتەقینەوەی چینی نـاوین ناودەبرێت. تەنیا چەندایەتی بوونی هەیە.

دەسـتەواژەیەکی سـەیری لـەجۆری بێکـاری چینـی نـاوین داهێنـراوە. بـەئامانجی ڕەواکردنـی ئـەو سـەمەرە چینایەتیـەش هەنـدێک ئایـدیۆلۆگ هەوڵیانــداوە وەک ڕاچێتــەی بناخەیــەکی تۆکمــەی مــاددی کۆمــەڵگای دیموکراتیک بیخەنە ڕوو. نەک تەنیا ملیۆنی، بـەڵکو شـاری دە ملیـۆنی و چینێکـی نـاوینی زەبـەلاح هاتـە ئـاراوە. نـاوبردنی بـە "گوایـە" بـەهۆی نـەبوونی بـەدیاردەی مـاددی نییـە، چونکـە هـەبوون و مانایـەکی تایبـەت

بەخۆی نییە. ئەو واقیعەی لەژێر ناوی دیاردەی چینی ناوین هەوڵی بۆ دەدرێت بەیەکگەیاندنی جیابوونەوەی کۆمەڵگایە بەشێوەی چینی سەروو خواروو. دیالیکتیکی کۆیلە ـــ کۆیلەداری چینەکانی سەرووو خوارووو بەتایبەتی لە فەلسەفەی هیگل دا بەشێوەیەکی زۆر کامل شیکارکراوە و ماناکەشی خراوەتە ڕوو. بەڵام کاتێک هەمان هیگل لەشێوەی دەوڵەت ـــ نەتەوە چینی ناوین وەک بەدیهاتنی ئازادی پێشکەش دەکات؛ دەبێتە پووچترین ئەنجامی فەلسەفە گەورەکەی. کارل مارکس یش هەمان هەڵەی بەناوی چینی "پرۆلیتاریا"وە ئەنجامداوە. گەورەترین ساختەکاری کۆمەڵایەتی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری لەوە دایە کە دیاردەی دووچینی ـــ کە هەبوونێکی تایبەت بەخۆی نییەو وەک لادانێک لەناو کۆمەڵگا ئافرێنراوە ـ دەکات بەشتگەلێکی سەیرترو وەک هەبوونێکی کۆمەڵایەتی دەیانخاتە ڕوو. سەرجەم زانستە کۆمەڵایەتی و ئایدیۆلۆژیاکانی سەرمایەداری ئەرکیان ڕەواکردنی ئەو ساختەکاریە یە. هەوڵدەدەن حەقیقەت لەدیاردەیەک بئافرێنن کە خۆی خاوەن حەقیقەت نییە. هەروەها لەمیانەی میتافیزیای پۆزیتیڤیستەوە پیشاندانی وونبوونی حەقیقەتی مەزن وەک "حەقیقەتی ئۆبژەکتیڤیتی"بە مەبەستی سەرەکی پیشەکەیان دادەنێن.

سیستەمی ئیمپراتۆریەت ئەلتەرناتیف یاخود بەردەوامی دەوڵەتشاری بەر لە پیشەسازیگەرایی بوو. ئیمپراتۆریەتەکان کە لەبنەڕەتدا پشت بەکۆمەڵگای گوند - کشتوکاڵ دەبەستن بەرامبەر بەو ئاسایشەی دەستەبەریان کردبوو خۆیان بەخاوەنی زێدە (زێدە، بەرەمو بەهاکان)ی کۆمەڵگا دانابوو. دەوڵەتی شاربێت یان سیستەمی ئیمپراتۆریەت وەک بەربەستێک بەرامبەر کەڵەکەبوونی سەرمایە قووت بوونەتەوە کەلەمیانەی شۆڕشی پیشەسازییەوە هەمیشەیی بووە. لەگەوهەردا دەوڵەت - نەتەوە سەرچاوەی خۆی لەپێویستی دەربازکردنی ئەو نەریتە بەسەرچووەی دەوڵەت وەردەگرێت. بەو ڕادەیەی دەوڵەت - نەتەوە توانیویەتی ئەو هەڕەشەو کۆسپانەی پێش کەڵەکەکردنی سەرمایەی سەرمایەداری بەلاوە بنێت بووە بەشێوەیەکی زاڵی دەوڵەت. لەم سۆنگەیەوە سەرمایەداری،

ئیندوستریالیزم و دەوڵەت - نەتەوە دیاردەگەلێکن لەگەڵ شارگەرایی ناشار، تەقینەوەی چینی ناوین و بیروکراسی و لەناوبردنی کۆمەڵگای گوند - کشتوکاڵ تێکەڵ بەیەکتری بوون. دیاردەگەلێکی وەک شاری سەد هەزاری (نەک تەنیا ملیۆنی) و گەورەبوونی چینی ناوین تەنیا وەک گەورەترین نەخۆشی، قەیران و ئەنجامێکی گێژاوی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری نامێنێتەوە. بەڵکو دەرفەتی ژیان لەهەساره و ژینگەکەشماندا ناهێڵێت. هەرچەندە بەشێوازێکی شەرمنانە و تێگەیشتنێکی سنووورداری ئەو واقیعەش بێت، بەڵام پۆست مۆدێرنیتە توانیویەتی مەودا ببڕێت. کاریگەرییەکی قورسی مۆدێرنیتەی لەسەرە؛ بەڵام دیسان لەمیانەی ئاماژەکردن بەسێ ئەسپسوارەکەی مەحشەر رۆڵێکی ئەرێنی دەبینێت.

شارو چینی ناوین کە لەناوەندی مۆدێرنیتەدا بوونەتە دیاردەگەلێکی بەمجۆرە ڕەنگدانەوەیان لەخۆرهەلاتی ناوین زۆر ڕزێنەرترە. دیاردەگەلێکی بێ مانان. کاتێک دەڵێین مانای نییە مەبەستمان نەبوونی لایەنی ئەرێنییەتی. چونکە هەڵگری کۆمەڵێک مانای نەرێنێن. شار و چینی ناوین تەنیا خۆیان بێکار ناکەن، بەڵکو بەخێرایی کۆمەڵگای گوند ـ کشتوکاڵ هەڵدەوەشێننەوە و خراپییەکەیان دەسەلمێنن! شارەکان و چینی ناوینی خۆرهەلاتی ناوین کە لەئافراندنی ئیندوستریالیزم و بیروکراسیەتێکی هاوشێوەی ئەوروپا زۆر دوورن لەدیاردەگەرایی خۆیاندا سەرجەم کۆمەڵگا بۆ دۆخێکی پەراوێزکراو، لۆمپان و بەرەڵا راپێچ دەکات؛ دابڕانی ئەو چینە لەڕاستی مێژوویی و پێگەی بچووکراوەی بۆ ئەجێندا گەرایی هەژموونگەرایی سەرمایەداری، لاوازترین دۆخی حەقیقەتی کۆمەڵایەتی دێنێتە ئاراوە. پێشنەخستنی حەقیقەتەکەی دیاردەکە خراپ و نەرێنیتر دەکات، چونکە نەدەتوانێت شارستانی ئەوروپا پەسەند بکات، نەدەتوانێت شارستانییە ناوەندییەکەی جارانی زیندوو بکاتەوە. هەرەس و رزین و دۆخی دیاردەگەرایی نێوانیان وەسف دەکات. شارو چینی ناوینی خۆرهەلاتی ناوین کە لەمیانەی سەرچاوەیەکی کاتی وەک نەوت ڕۆژانە خۆیان رزگار دەکەن دۆخی بەشی زۆرینەیان زۆر مەترسیدارە. وەک دیار

دەبێت دوای تەواوبوونی سەرچاوەی نەوت هەرەسهێنانیان زۆر دژوار و جەرگبڕ دەبێت.

ئەوەی مانای راستەقینەی بە کۆمەڵگا بەخشیوە ژیانی پازدە هەزار ساڵەی کۆمەڵگای گوند ـ کشتوکاڵە. ئەو ژیانە کۆمەڵایەتییەی دەرفەتی بۆ شارستانی ناوەندی پێنج هەزار ساڵەش ڕەخساند، لەناوبردنی لەمەزەندەکان زیاتر ئەنجامی زۆر جەرگبڕتری لێ دەکەوێتەوە. هەرچەندە ئێستا دەرفەتی ئیدارەکردنێکی کاتی فاکتەرە درەنگ کەوتووەکانی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری جێگای باس بێت، بەڵام دۆخی شار و چینی ناوین کە چیتر بارەکەی هەڵناگیرێت ڕۆژ بە ڕۆژ و بە بەردەوامی گرژی و پێکدادان و شەڕ لەخۆوە دەگرێت و خۆراکی پێدەدات. ئەو قۆناخەی لەدۆخی ئێستاماندا جێگای باسە ڕۆژ بەڕۆژ خێرایی و خەستییەکەی لەزیادبووندایە و بەردەوام دەبێت.

لەم سۆنگەیەوە شارگەرایی ناشار، شێرپەنجەبوونی چینی ناوین و هەڵوەشانەوەی کۆمەڵگا گوند ـ کشتوکاڵ تەنیا وەک قورسترین کێشەی کۆمەڵایەتی سەرهەڵنادەن، بەڵکو گوزارشت لەسنووری بەردەوامنەبوون و خۆڕانەگری کۆمەڵگاش دەکەن. بەرامبەر بەکێشەکانو دۆخی مەحاڵبوونی بەردەوامبوون فاکتەرەکانی تازەگەری دیموکراتی تەنیا ڕۆڵی چارەسەرکردنی کێشە نابینن، بەڵکو هەنگاونانی ئەو کۆمەڵگایەش دەرەخسێنن کە بنبەست بووە و لەدۆخی کائۆسدایە. بەر لەهەموو شتێک خاوەنداریتی لەکۆمەڵگای ئیکۆنۆمیک ـــ ئیکۆلۆژیک دەکات، لەسەربنەمایی کۆمیناڵ هەنگاو بۆ سەرلەنوێ بونیادنانەوەی کۆمەڵگای گوند ـ کشتوکاڵ دەهاوێژێت کە سەرمایەداری و ئیندوستریالیزم پووکاندویانەتەوە. کۆمەڵگای گوند ـــ کشتوکاڵ ئیکۆلۆژیانە ئاسایشی خۆراک دابین دەکاتو ڕەهەندێکی زۆر گرنگی کێشەکان چارەسەر دەکات. ناوبردنی ئەمەش بە "دووەمین شۆڕشی گوند ـ کشتوکاڵ" گونجاوەبێت. لەڕاستیدا لەسەدەی بیست و یەکەم پێویستی بەدووەمین شۆڕشی گوند ـــ کشتوکاڵ هەیە. ئەو شۆڕشە تەنیا شار ڕزگار ناکات، بەڵکو کۆمەڵگاش لەشێرپەنجەی چینی ناوین دەپارێزێت: فاشیزمی دەوڵەت ـــ نەتەوە کە

لەسەر شاروچێنی ناوین بونیادنراوە کاتێک لەسەر ئەو بنەمایە لاواز بکرێت دەرفەتی پەرەسەندنی کۆمەڵگای دیموکراتیک زیاد دەبێت. ئەگەر دووەمین شۆڕشی گوند ــ کشتوکاڵ ڕوونەدات لەڕاستیدا بەردەوامبوونی کۆمەڵگا زۆر ئاستەمە. ئەو شۆڕشە جێگای شایستە بە تەکنۆلۆژیاش دەدات و دەتوانێت کۆمەڵگای گوند ــ کشتوکاڵ لە کاولکاریەکانی ئیندوستریالیزم بپارێزێت. شارەکانیش لەمیانەی هەلومەرجی تەکنۆلۆژیای پێشکەوتووترەوە سەرلەنوێ دەتوانن بە ژیانە شکۆدارەکەی جارانیان بگەن. تەنیا لە گەورەبوونە زێدەڕۆییەکەی ژمارەی دانیشتوان ڕزگاری نابێت. سەرلەنوێ دەتوانن هاوسەنگی لەگەڵ کۆمەڵگای گوند ــ کشتوکاڵ دابنێنەوە کە بۆتە خاوەن ڕۆڵێکی مانادار. شارو گوندی سەرلەنوێ بونیادنراوەی تازەگەری دیموکراتی دەبن بە دوو کۆڵەکەی هاوسەنگ و تەندروستی کۆمەڵگای دیموکراتیک، هەروەها دەبن بەمێشکی. بەو سیفەتەی دەوڵەمەندێتی و هەمەڕەنگین یەکتری تەواو دەکەن و زەمینەی بنەڕەتی دەربازکردنی فاشیزمی کۆمەڵگای هۆمۆژەنی دەوڵەت ـ نەتەوە ئامادە دەکەن.

هەم چانس هەم چارەنووسی خۆرهەلاتی ناوین گرێدراوی جێبەجێکردنی دووەمین شۆڕشی گوند ــ کشتوکاڵە. کاولکاری و خراپەکاریەکانی ئەو دوو سەدەیەی دوایی قەیرانی تێپەڕکردووە و لەئاستی کارەساتدایە. مۆدێرنیتە لەڕێگەی هەرسێ پێچکەکەیەوە تەنیا زۆرداری و چەوسانەوە بەرێوە نابات، بەڵکو کۆمەڵگابوونیش دەرووخێنێت. وەستاندنی ئەو کاولکارییە لەرێگای هەمان مۆدێرنیتەوە مەحاڵە. چونکە ئاگر بە ئاگر ناکوژێتەوە. لەم سۆنگەوە پەرەسەندنی تازەگەری دیموکراتی بەشێوەی دووەمین شۆڕشی گوند ـ کشتوکاڵ دەست لێبەرنەدراوە. هەر لەئێستاوە شەڕەکانی ئاو ــ وزە ــ خاک بەئاستێک گەیشتووە ڕێگری لێناکرێت. کۆمەڵگای سۆمەر لەسەر هەرەوەزی ئاو ــ خاک توانای پەرەسەندنی بەدەستهێنا و مێژوویی مرۆڤایەتی دەست پێکرد. کۆمەڵگای میسر و هەراپاش بەمجۆرەن. تەنانەت ئیسرائیلی ڕۆژی

ئەمڕۆشمان بەشێکی گرنگی هێزی خۆی لە کۆمۆنەکانی کیبوتوز وەردەگرێت کە لەسەر تەکنۆلۆژیای مۆدێرن ئاواکراوە.

یەکینەکانی کۆمەڵگای ئیکۆنۆمیک ـ ئیکۆلۆژیک کەلەسەر حەوزەکانی ئاو ـ خاک ـ وزە پەرەی پێدەدرێت لەسەرووی هەمووشیانەوە حەوزەکانی دیجلە ـ فورات دەبنە بناخەی دووەمین شۆڕش. بەمجۆرەش بونیادەکانی گوند ـ شار کە بەشێوەیەکی هاوسەنگ و تەواوکەری یەکتری ئاوا دەکرێن بونیادی بیناسازی نوێی تازەگەری دیموکراتی پێکدێنن. یەکینەکانی کۆمەڵگای دیموکراتیک، ئیکۆلۆیک، ئیکۆنۆمیک چەندە لەسەر ئەو بیناسازییە نوێیە پەرەیسەند شارستانی شاری دەوڵەت - نەتەوە و ئیندوستریالیزم بەشێوەی بونیادی ئۆتۆنۆم و دیموکرات سەرلەنوێ هەڵدەکشێت، لەبەرامبەر ئەمەشدا گوندەکان بەشێوەیەکی تەباوگونجاو لەگەڵ هەلومەرجی تەکنۆلۆژی نوێ وەک گوندی ـ ئیکۆلۆژی دووەمین شۆڕشی خۆیان ئەنجامدەدەن. ئەوجارە دووەمین شۆڕشی شارو گوند ـ کشتوکاڵ لەکلتووری خۆرهەلاتی ناویندا ڕۆڵی مێژوویی خۆی لەدەربازکردنی شارستانی دەوڵەت ـ چینایەتی و گوزەرکردن بۆ چاخی تازەگەری دیموکراتیدا دەبینێت. هەرجۆرە ناسنامەیەکی کلتووری لەناو کۆنفیدراسیۆنی نەتەوە دیموکراتییەکانی خاوەن چەمکی ناسنامەیەکی نەرم و چەمسەرکراوەن وەک ئەندامێکی کۆمەڵگای دیموکراتیک، یەکسان و ئازادیخواز دەژین. ئەو تاکەش کە کلتووری تاکگەرایی (تاکخوازی) مۆدێرنیتەی سەرمایەداری کوشتوویەتی، وەک تاکێکی ئەخلاقیو سیاسی تازەگەری دیموکراتی سەرلەنوێ زیندوو دەبێتەوەو بەشێوەیەکی ئازادانە دەژیت.

## ٥ . کێشە خۆجێیی و هەرێمیەکان و چارەسەری نەتەوەی دیموکراتیک

لەهیچ قۆناخێکی مێژوودا ڕژێمێکی دەوڵەت لەئارادا نەبووە کە بەقەدەر دەوڵەت ـ نەتەوە کلتووری خۆجێیی و ناوچەکان وێران بکات. دەوڵەت - نەتەوە تەنیا وەک دژێکی سیستەمی ئیمپراتۆریەت، دیموکراسی و دەوڵەتشار پێشنەخراوە. بەڵکو زیاتر لەوەی بەرامبەر ئەو دوو دیاردەیەی ئەنجامداوە، سەرجەم تایبەتمەندیەکانی ناسنامەی

خۆجێیی و هەرێمی قەدەخەکرد، لەناویبردن و هەوڵیداوە لەکۆمەڵگای مێژوویی بسڕێتەوە. بەڵام ناوەندیگەراترین ئیمپراتۆریەتەکانیش بەردەوام ڕەچاوی یاسا خۆجێیی و هەرێمیەکانیان کردووە. شتگەلی خۆجێیی و هەرێمییان بەدەوڵەمەندێتی دانـاوەو، بایەخێکی تایبەتیان بە بێبەشنەکردنی کۆمەڵگاکان لەو دەوڵەمەندێتییەداوە. هەروەها ناوەندگەراترین حکومڕانیەکانیش کاتێک دەسەڵاتەکەیان ڕەت نەکراوەتەوە دژایەتی ئۆتۆنۆمی بەرفراوانی بەڕێوەبەرایەتی و هەرێمیەکانیان نەکردووە. تا سەردەمی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری مێژووی شارستانی بەجۆرێک لەجۆرەکان دیرۆکێکە ناسنامە خۆجێیی و هەرێمیەکانی تێدا بەبنەما گیراوە. هەر شارستانی و ئیمپراتۆریەتێک لەمیانەی هێزی خۆجێیی و هەرێمەکانی دەستنیشانکراوە.

سەرەڕای ئەوەی مێژوو بریتییە لەکۆی ئەو ناسنامانە، بەڵام دەوڵەت ـ نەتەوە نکوڵییان لێدەکات و هەوڵدەدات خۆی وەک تاکە دەسەڵات و هۆمۆژەن بونیاد بنێت؛ هەڵبەتە ئەمەش گرێدراوی سیستەمی چەوسانەوەیە کەخزمەتی دەکات. ئەو هێزانەی بەدوای زۆرترین قازانج کەوتوونە و بەردەوام بەگوێرەی مەیلی کەڵەکەکردنی سەرمایە ڕەفتار دەکەن ئاگادارن کەچەندە ناسنامەی خۆجێیی و هەرێمی لەناوببەن بەو ڕادەیە بەمتمانەو ئاسایش دەگەن. دەوڵەت ـــ نەتەوەی هۆمۆژەن لەو بڕوایەدایە چەندە هێزی خۆجێیی و هەرێمی تێکشکێنێت و کلتوورەکەی لەناوببات نەتەوە بەهێز دەکات و یەکێتی کلتووری نەتەوەیی ئاوا دەکات. بەڵام ئەوەی دێتە ئاراوە پاوانی چەوسانەوەو هێزی دەستەیەکی ئۆلیگارشییە. سەرباری ئەوەی یەکێتی کلتووری و یاسا وەک ئامرازی ڕەواکردنی ئەو پاوانەی هێزو چەوسانەوە ڕۆڵ دەبینێت، بە یەکێک لەکارەکتەرە سەرەکیەکانی دەوڵەت و نەتەوە دادەنرێت. لەوەش مەترسیدارتر ئەو بانگەشەیە کە هۆمۆژەنی بەمجۆرە بە مەرجێکی نموونەیی دیموکراسی دادەنێت. دەشێت وەک هەلومەرجی گشتی کۆیلایەتی مانادار ببینرێت. ئەگەر دیموکراسی خۆگوزارشتکردنی تایبەتمەندێتی یە خۆجێیی و هەرێمیەکان و خۆبەڕێوەبردنیان نەبێت، ئەی چۆن پێناسە

دەکرێت؟ ڕوون و ئاشکرایە لەمیانەی بەبنەماگرتنی هەلومەرجەکانی نەتەوەی هۆمۆژەن دیموکراسی ئاوا ناکرێت. چونکە ئەگەر تایبەتمەندێتی تاک و خۆجێیەتی و هەرێمی گوزارشت لەخۆی نەکات و بەرگری لەبەرژەوەندییە کلتووریەکانی نەکات دیموکراسی فەراهەم نابێت. نەتەوەپەرستی دەستی دەوڵەت چەندە نکولیکردنی دیموکراتیزەکردنی خۆجێیی، هەرێم و تاک بێت، نەتەوەی دیموکراتیش بەپێچەوانەوە بەو ڕادەیە دیموکراتیزەبوونی خۆجێیی، هەرێمی و تاکە.

ناسنامە خۆجێیی و هەرێمیەکانی کلتووری خۆرهەلاتی ناوین لەهەر قۆناخێکی مێژوویی‌دا بەشێوەیەکی بەهێز ناسنامە و ڕێسای خۆیان پاراستووە. لەسەرجەم سیستەمەکانی شارستانیدا ڕێز لەناسنامە خۆجێیی و هەرێمیەکان گیراوە و جێگا بە یاساکانیان دراوە. لەناوبردنی کلتووری ناسنامەکان و نکولی لێکردنیان تەنانەت لەلایەن سەرەڕۆترین حوکمڕانیەکانیشەوە تا دوایی وەک سیاسەتێک بەرێوە نەبراوە. کردە و پراکتیکی لەمجۆرە هێندە ئاستی لەناوبردنی تاکەکەس و بنەماڵەی بەرباز نەکردووە. لەمیانەی لەناوبردنی سیستەماتیکانەی ناسنامەو کلتووری خۆجێیی و هەرێمی جارێکی دیکە ماهیەتی فاشیستیانەی دەوڵەت ـ نەتەوە خۆی بەدەستەوە دەدات. بەشێوەیەکی تێکەڵ بەهێزبوونی دەوڵەت ـ نەتەوە و لەناوبردنی ناسنامەی خۆجێیی و هەرێمی لەمێژووی ئەو دوو سەدەیەی دوایی خۆرهەلاتی ناویندا ئەو واقیعە ئاماژە پێکراوە ئاشکرا دەکات. تەنیا ئەو شەڕو پێکدادانانەی لەپێناو ئاواکردنی دەوڵەت ـ نەتەوەی ئێراق ئەنجامدراون بەڵگەی سەلمێنەری بێ ڕەحمی و قڕکارانەی سیستەمن. بەڵام ئەگەر دەرفەت بەخۆجێیی و هەرێمەکان درابوایە بەشێوەیەکی دیموکراتییانە گوزارشت لەخۆیان بکەن، لەوانەیە دەوڵەمەندێتیەکی کلتووری ماددی و مەعنەوی فەراهەم بوایە کە سویسراش دەرباز بکات. ئەو شەڕەی تا ئێستاکەش ئێراق بەدەستیەوە دەناڵێنێت لەبواری کاولکاری، خراپەکاری و بێچارەیی مۆدێرنیتەی سەرمایەدارییەوە تا دوا ڕادە وانەبەخش و فێرکەرە.

فاکتەرەکانی تازەگەری دیموکراتی سیستەمێک بەبنەما دەگرن کە بایەخێکی زۆر بەتایبەتمەندێتییە خۆجێیی و هەرێمییەکان دەدات. فاکتەری کۆمەڵگای سیاسی‌و ئەخلاقی دیاردەیەکە لەخۆجێیدا دەژیت. فاکتەری کۆمەڵگای دیموکراتیش زیاتر خۆجێیی و هەرێمییە. هەرچەندە پێگەیەکی نەتەوەیی و نێونەتەوەیشی هەبێت، لەسەربنەمای خۆبەهێزکردنە. کۆمەڵگای ئیکۆلۆژیش فاکتەرێکە کە بەردەوام لەهەرکات و شوێنێکدا لەشوێنە خۆجێییەکاندا مانابەخش دەبێت. کۆمەڵگای دیموکراتیک لەسەرووی ئەو فاکتەرانەوە دێت کە لەسەر یەکینە خۆجێییەکان ئاوا دەبێت. تاکێکی دابڕاو لەخۆجێیی و هەرێمیش بەو ڕادەیەی لەبواری ناسنامەوە لاوازبێت لەحەقیقەتیش بێبەشە. بەپێچەوانەوە چەندە نوێنەرایەتی کلتووری خۆجێیی‌وهەرێمی بکات، بەو ڕادەیە ئاستی بەهای حەقیقەتەکەی بەرزە. نەتەوەی دیموکراتیک تەنیا لەمیانەی گوزارشتکردنی ئازادانەی ناسنامە خۆجێیی، هەرێمی و تاکە کەسیەکان پێکدێت.

ئەو نەتەوانەی خاوەن ناسنامەی کلتووری جیاواز و فرە ڕەنگن بەڕادەی گونجاو بوونیان بۆ دیموکراسی بۆ دەوڵەمەندی و ئاشتیخوازیش لەبارترن. ئەگەر لەکۆمەڵگای خۆرهەلاتی ناوین دەرفەتی کوزارشتی دیموکراتیانە بەناسنامەو کلتووره خۆجێی هەرێمییەیکان بدرێت، زۆر روون و ئاشکرایە کە بەشێکی زۆری کێشەکانی زۆر بەئاسانی دەرباز دەکرێن. سەرەڕای ئەوەی نەریتی مێژوویی بەردەوام جەخت لەسەر ئەم ڕاستییە دەکاتەوە، بەلام نەهامەتی دەوڵەت ـ نەتەوە کەڕەو نابیسێت. تاوەکو بەقەمترە هۆمۆژەنەکەیان تەماشای مێژوو بکەن ئەو دەوڵەمەندێتییە وەک یەک ڕەنگ دەبینێت یاخود وەها پیشاندەدات، ئەنجامەکەشی نکوڵیکردنی ڕاستی کۆمەڵگا و گەیشتنە بە فاشیزم.

تازەگەری دیموکراتی وەک دامەزراوەو کردار چارەسەری هەمیشەیی بۆ ئەو کێشانەی کۆمەڵگای خۆرهەلاتی ناوین پێشکەش دەکات کە بەشێوەیەکی خەست‌و تێکەڵ فاکتەرەکانی کلتووری خۆجێیی و هەرێمی تێدا دەژیت. بەو ڕادەیەی لەمیانەی ئازادی رادەربڕینەوە واقیعەکەی خۆیان

بکەن بەحەقیقەت وەک تاک و کۆمەڵگا لەناو ئاشتیدا چانسی گەیشتن بەژیانێکی ئازاد و یەکسانیان زیاتر دەبێت.

## ٦. کێشەی ژن، خانەدان، خێزان و دانیشتوان و شۆڕشی ژن لەخۆرهەڵاتی ناوین

ئەو ژنەی لەکاتی بەرە بەیانی مێژوودا بەناسنامە کۆمەڵایەتییە شکۆدارەکەی شایستەی ڕۆڵی مێخوداوەندی دایک بوو بەداخەوە لەخۆرهەڵاتی ناوینی ڕۆژی ئەمڕۆمان بۆ دۆخی بێ بەهاترین کاڵا بچووککراوەتەوە. دەرفەتو توانای ڕوونکردنەوەی ئەو مێژووەمان لەبەرەستدا نییە کە پێویستە چیرۆکێکی زۆر تراژیدییانەی هەبێت. بەڵام دەتوانین ئەنجامەکانی ڕەخنەبکەین، بەلاوەنانی ئەو تەمومژەی بەدەستی مرۆڤ لەدەوروبەری ڕاستی ژن دروستکراوەو ئاشکراکردنی حەقیقەتی ژن لەسەرووی ئەرکە کۆمەڵایەتییە ژیانیەکانەوە دێت.

پێویستە بەشێوەیەکی ڕوون و ئاشکرا ئاماژەی پێ بکەم، بەبڕوای من شیکارەکانی سەبارەت بە ڕەگەزگەرایی کۆمەڵگا پۆزیتیفیستن، باوەڕناکەم لەڕێگای هەڵوێستە ئۆبژەکتیفیتە قەبەکانەوە بتوانین ژن شیکار بکەین. بەتایبەتیش لەکۆدەکانی ئەو کۆیلایەتییە بێ ئاگاین کە دەرخواردی ژن دراوە. لەو بڕوایەدام لەڕادەبەدەر لە زهنیەتی فالوس ـ ڤاجینا گلێنراوە، ئەو زهنیەتەش تواناو بەهرەکانی دیکەی مرۆڤی سەقەت کردووە. لەم بارەیەوە خاڵی سەرنجراکێشی لێرەدایە؛ دیاردەی جووتبوونی زایەندی کە لەدونیای سەرجەم ڕووەک و ئاژەڵاندا ڕۆڵێکی مانادار، شێوەو ماوەیەکی دیاریکراوی هەیە، بەڵام لەجۆری مرۆڤدا بۆ ماوەیەکی بێ سنوور بڵاوبۆتەوە، لەبواری شێوە و ڕۆڵیشەوە بەدۆخێکی زۆر خراپ و ناڕەسەن گەیشتووە. مسۆگەرە کە ئەو ناڕەسەنییە سەرچاوەی خۆی لەدۆخی کۆمەڵگا وەردەگرێت. بەمانایەکی تر دەتوانین بڵێین لەگەڵ سەرهەڵدان و بەگشتیبوونی کێشەی کۆمەڵگا (سەرکوتکردن و چەوسانەوە) پەریسەندووە. دەستنیشانکردنی ئەو ڕاستییەی کە؛ کێشەی ژن کێشەیەکی

سەرەکی کۆمەڵگایە و سەرچاوەی خۆی لەهەڵوەشاندنەوەی هەمەلایەنەی کۆمەڵگای دایکانە وەردەگرێت بۆ ئەنجامدانی پێناسەیەکی ڕاست پێویستە.

چاوسووری و خۆپەرستی پیاو سەبارەت بە بابەتی ژن وەک دیاردەی هەنووکەیی هەر سات و کاتژمێرێک دەشێت تێبینی بکرێت. هەر کەسێکی خاوەن ویژدان ناتوانێت ئەو واقیعە ڕەچاو نەکات کە پیاو لەهەرچینێکی کۆمەڵایەتیدابێت بەبێ ئەوەی ڕێز لەهیچ یاسایەکی ئەخلاقی و یاسایی بگرێت، بەبێ چاوترووکاندن سەبارەت بەو بابەتە تاوان دەکات. زۆربەی زۆری ئەو هەڵوێستە وەحشیگەریانە لەژێر ناوی "ئەشق"وە ئەنجامدەدرێن. لەڕاستیدا ئەگەر کەم زۆر پەیوەندی ئەشق بەحەقیقەتەوە راڤە بکرێت، یەکسەر ئاشکرا دەبێت کە ئەو گوتەیە چرووکترین درۆیە. هیچ سۆبژەیەکی لەجیهانی ڕووەک و ئاژەڵان، تەنانەت لەدونیای فیزیای بە (بێ گیان) شرۆڤەی دەکەین بووبێتە بابەتی ئەشق هەرگیز پەنا نابات بەر کردەوەیەکی بەمجۆرە. هەرچەندە هەندێک لادان لەدونیا ئاماژە پێکراوەکان جێگای باس بێت کە تائێستا ماناکەیان شیکار نەکراوە، ئاشکرایە کە هۆکارو مانای ئەو تاوانانەی لەم لایەنەوە لەجۆری مرۆڤدا دەبینرێت زۆر جیاوازترە. پەیوەندی ئەو تاوانانە بە زۆرداری و چەوسانەوە لەسەرووی ئەو فاکتەرانەوە دێت کە پێویستە ئاماژەیان پێوەبکرێت.

سەرەکیترین پرسیاری لەم بارەیەوە بوروژێنرێت؛ بۆچی سەبارەت بە مەسەلەی ژن پیاو هێندە ئیرەیی و زۆردارە، بەپێی ئارەزووەکانی ڕۆژانە بیست و چوارکاتژمێر لەدۆخی دەستدرێژی کردندا دەژیت و دەستبەرداری ئەو پێگەیەی خۆی نابێت. بێگومان دەستدرێژیو زۆرداری دەستەواژەیەکی گرێدراوی قۆستنەوەی کۆمەڵگایە، ماهیەتی کۆمەڵایەتی ڕووداوەکان دەخاتە ڕوو، زیاتریش پلەداری، باوکسالاری و دەسەڵات دێنێتەوە بیری مرۆڤ. مانایەکی دیکەی لەقوولاییەکاندا شاراوەیە؛ خیانەتکردنە لە ژیان. پەیوەستبوونی هەمەلایەنەی ژن بەژیانەوە دەشێت هەڵوێستی ڕەگەزگەرایی کۆمەڵایەتی پیاو ئاشکرا بکات. لەژێر کاریگەری لەکارخستن و لەناوبەرانەی ڕەگەزگەرایی، ڕەگەزپەرستی کۆمەڵگا

گوزراشت لە ڕق، هەلویستی دەستدریژی و زۆردارانە دەکات کە لەدەستدانی دەولەمەندیتی ژیان لەژیر کاریگەری ڕۆلی پەکخستن و لەناوبەرانەی ڕەگەزگەرایی لەگەل خۆیدا دینیت. پەیوەندی غەریزەی زایەند لەگەل بەردەوامی ژیان ئاشکرایە. بەلام هیچ بوونەوەریک تێبینی نەکراوە کە ڕۆژانە بیست و چوار کاتژمیر لەناو زهنیەتی پرسیتی زایەندیدا بێت. ئاشکرایە کە ژیان تەنیا بریتی نییە لەزایەند. بەپێچەوانەوە جووتبوونی زایەندی بریتی یە لەساتیکی جۆریک لەمردن، بەمانایەکی دیکە هەلمەتیکی تەواوکەری ژیانە بەرامبەر بەمردن. لەم سۆنگەیەوە چەندە کردەی زایەندی زیادبێت، بەو ڕادەیە مانای لەدەستدانی ژیانە.

تەواوی کردەی زایەندی بەکوشندە دانانێم. بەلکو خەیالی ئەبەدیەتیش لەخۆوە دەگریت. بەلام ئەو خەیالە خودی ژیان نییە، بەپێچەوانەوە تەگبیریکە بەرامبەر ترسی مردن، هێندە هەلگری بەهای حەقیقەتیش نییە. دەشێت گوتەکە بەم جۆرە ڕوون بکرێتەوە؛ دووبارە بوونەوەی بازنەی ژیان گرنگە یان خودی بازنەکە وەک تاقانەیەک؟ دوای گوزارشتکردنی تەواوەتی حەقیقەتی تاقانەکە، تا ناکۆتا دووبارەبوونەوەی بازنەکە مانایەکی ئەو تۆ نابەخشێت. ئەو مانایەی لەخۆشیەوە دەگریت پێویستی گەیشتنە بە "مەعریفەی ڕەها". لەدۆخێکی بەمجۆرەدا بازنەکە چەندە بەباشی خۆی بناسێت بەو ڕادەیە پێویستی مەعریفەی ڕەهای دەستەبەر دەکرێت، ئەو کاتە بازنەکان و لەم سۆنگەوە زێدە بوونی زایەندیش بەهاو مانایەکی ئەوتۆی نامێنێت.

ئەو ئەنجامەی لەو هەلسەنگاندنە کورتە هەلبهێنجرێت؛ لەسەردەمی سەرهەلدانی پیاو سالارییەوە ژن دووچاری سەرکوتکردن و چەوسانەوەیەکی سیستەماتیک و دامەزراوەیی هاتووە. کۆیلایەتی ژن بەجۆریک ئالۆز و بونیادییە کە ناتوانرێ لەگەل هیچ شێوەیەکی دیکەی کۆیلایەتیدا بەراورد بکرێت، دامەزراوەکانی بازاڕی ژن، کۆیلەکان، کەنیزەکی و حەرەمسەراکانی مێژووی شارستانی تاڕادەیەک دیاردەکە ڕوون دەکەنەوە. بەلام ڕەفتار و کردەوەکانی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری بۆ

زیاتر بەکۆیلەکردنی ژنان بەبێ حیساب زیادی کردووە. هیچ شارستانیەک بەقەدەر سەرمایەداری یاری بەژن نەکردووە. بەو ڕادەیەش قۆستنەوەی ژنانی بە دامەزراوەیی نەکردووە. دیاردەکە قۆستنەوەیەکی وەهای بەخۆوە دیوە، زۆربەی زۆرینەی ژنان کردەگەلێکی ژنیان خستۆتە دۆخێکی سووک و بچووکەوە، وەک تایبەتمەندێتیە سەرەکییەکانی ناسنامەی ژن پیشانیدەدەن؛ تەنانەت بەجۆرێک داگیرکراون کە دەبن بە بەشێکی ئەو یارییانەی لەسەریان بەرێوەدەبرێت و بەبێ نیگەرانی جێگای خۆیان لەو یاریانەدا دەگرن. تەنیا باسی چەوسانەوە و سەرکوتکردنی دیاردەیی ناکەین. ژن لە پێشکەشکردنی خۆبەختانەی شێوەکانی زهنیەت، جەستە، ڕەنگ و دەنگی کۆیلایەتییەک کە لەلایەن سەرجەم خانە و پێکهاتەکانی ژیانی ژن پەسەندکراوە دوولَی ناکات. تەنانەت بێ ئاگایە لەوەی پەیوەندی خۆی لەگەڵ حەقیقەتی کۆمەڵگا لەدەستداوەو کراوە بە ژیانێک کە لەسەر شانۆ پێشکەش دەکرێت. بەمانەیەکی دیکە دەرفەتی هەستکردن و پەیبردن بەو ڕاستییەی نییە. لەپێناو دەستەبەرکردنی کەرامەت و حەقیقەت و ژیان نەهێشتنی ئەمومژەکەی دەوروبەری ژن زۆر گرنگ و بایەخدارە.

لەگەڵ ئەوەی ژیان بەبێ ژن نابێت، بەڵام ژیانێکی سەرفراز و ماناداریش لەگەڵ ژنێک جێگای باس نابێت کە تا ئەو ڕادەیە بچووک و سووککراوە. لەمیانەی تێگەیشتن‌و هەستکردن بەو ڕاستییەی کە ژیان لەگەڵ ئەو ژنە ئاماژەپێکراوەدا شێوازێکە کە هەمووان تا بینەقاقا نقوومی سووکترین کۆیلایەتی دەکات؛ لەم چوارچێوەیەشدا شیکارکردن و نانەوەی هەنگاوی کرداری لەپێناویدا ڕێگای ڕاستی ڕزگارکردنی ژیانە. پێویستە هیچ کاتێک لەبیرنەکرێت کە ژیانێکی مانادار و شەرەفمەندانە لەگەڵ ژندا پێویستی بە شکۆداری و دانایییەکی مەزن هەیە. ئەوانەی بانگەشەی ئەشقیش دەکەن پێویستە بەردەوام لە یادیان بێت کە ڕێگاکەی بەشکۆمەندی و داناییدا تێپەڕدەبێت. چونکە پێچەوانەکەی خیانەتکردنە لە ئەشق‌و خزمەتکردن بەکۆیلایەتییە. تا بەحەقیقەتی کۆمەڵگا نەگەیت گەیشتن بەئەشق جێگای باس نابێت.

سیستەمی باوکسالاری (لەسالانی ٥٠٠٠ پ.ز دەستی بەهەلکشان کردووە) گوزارشت لەو سیستەمە دەکات کە یەکەمین سەرکوتکردن و چەوسانەوەی کۆمەلگای تێدا تاقیکراوەتەوەو دوای سیستەمی دایکسالاری هاتۆتە ئاراوە کە بە بەلگەی هەمەجۆرەوە هێزەکەی لەکلتووری کۆمەلگای خۆرهەلاتی ناویندا سەلمێنراوە. شۆڕشێکی ڕیشەیی دژی ژنە کە منداڵان و موڵک کەوتۆتە ژێر فەرمانڕەوایەتی پیاو و دامەزراوەی باوکایەتیەوە. بەهۆی ڕێخۆشکردنی بۆ سیستەمێکی محافەزەکار، چەوسانەوە و سەرکوتکردن زیاتریش شۆڕشی چەواشەشە. لەوانەیە بوون بەخاوەنی مندڵێکی زۆر یەکەمین سیستەمی مۆڵکایەتی بێت. ژمارەی منداڵان چەند زیاد بێت، هێز و موڵکیش بەو ڕادەیە زیاد دەبێت. پەیوەندی باوکسالاری و خانەدانێتی لەگەڵ موڵکایەتیدا ڕوون و ئاشکرایە. خانەدانێتی یەکەمین دامەزراوەی بەرفراوانی خێزانە کە لەکلان گەورەترە، پەی پێبراوەو ئاشنای موڵکایەتی بووە. یەکەمین شێوەی باوکسالارییە. دوای لاوازبوونی خاوەنداریێتی ژن بەسەر منداڵان و موڵکەوە، پەیتا پەیتا دەستگۆڕکێ دەکات. کلتووری مێخوداوەندی ـ دایک جێگای خۆی بۆ کلتووری پاشا ـ خوداوەندەکان بەجێدێڵێت. ئەو گۆڕانکاریانە بەشێوەیەکی زۆر کاریگەرو سەرنجڕاکێش لەکلتووری سۆمەردا تێبینی دەکرێت. بەدرێژایی مێژووی شارستانی هاوسەرگیری و دامەزراوەی خێزان لەژێر کاریگەری مۆدێلی خانەدانێتی پەرە دەسەنێت. هاوسەرگیری پشتبەستوو بە هاوسەنگی هێزی نێوان ژن ـ پیاو زۆر سنووردار دەبێت. لەبەرئەوەی خانەدانێتی وەک ئایدیۆلۆژیای بالادەستی پیاو و پاوانی دەسەلات پەسەندکراوە یاخود سەپێنراوە، لەهاوسەرێتیدا داننان بەدەسەلاتی پیاو ناچارییە. بەکورتی خانەدانێتی و دامەزراوی خێزانی پشتبەستوو بە پیاو سروشتی نین، بەلکو وردە سیستەمێکی قۆستنەوە و دەسەلاتگەرای بونیادنراون.

مۆدێرنیتەی سەرمایەداریش ئەو سیستەمەی زیاتر بەرەو پێشەوە بردووە. ئەو گۆڕانکارییانەی لەبواری یاسا لەبەرژوەندی ژن ڕێکخراون لە بەدەستهێنانی یەکسانی کردەییدا دوورە. دەشێت هاوسەرگیری وەک

دامەزراوێک پێناسە بکرێت کە لەژێر مۆرکی شارستانی ئاواکراوە. باڵادەستی پیاو و ڕەگەزپەرستی کۆمەڵگا ڕەوا دەکات. دۆخی ڕەنگدانەوەی پاوانی پلەداری، دەسەڵات و دەوڵەتە لەسەر ئەو یەکینەیەی بەربڵاوە و خانەی کۆمەڵگا پێکدێنێت. ناکۆکیەکی پەردە پۆشکراو لەنێوان ناوەڕۆک و ڕوواڵەتەکەی لەگەڵ ڕەواکردنەکەی جێگای باسە. دەزگایەکە بەباشترین شێوە ئەو کۆیلایەتییە دەشارێتەوە کە لەکەسایەتی ژندا بەسەر تەواوی کۆمەڵگادا پەیڕەو دەکرێت. لەرێگای بەبنەماگرتنی ئەو قۆناخەی بەژنکردن (سووکایەتی پێکردن، بچووکردنەوە، کردنی بە پاشکۆی پیاو)ی مێ دەستپێکرد هەنگاو بەهەنگاو کۆمەڵگاش دەکرێت بە ژن. دوای بەژنکردنی مێ کۆیلایەتی پیاویش بەشێوەیەکی تێکەڵ لەگەڵیدا جێبەجێکراوە. ئەو کۆیلایەتی و ژنێتییەی لەسەر مێ پەیڕەوکراوە و ئەنجامگیر بووە، دواتر بەسەر پیاوان و چینە چەوساوەکانیشدا دەسەپێنرێت. ئەو قۆناخ و پرۆسەی بە شارستانیەوە دەستی پێکرد لەگەڵ مۆدێرنیتەی سەرمایەداری بە لوتکە گەیشت. لەپرۆسەی بەژنکردنی کۆمەڵگا فاشیزم پێگە و مانایەکی تایبەتی هەیە. گوزارشت لەکۆمەڵگایەکی دەستەمۆکراو دەکات. مۆدێرنیتە گوزارشت لەکۆمەڵگای ژنێتی گشتی دەکات کە خەسێنراوە، توانای بەرگریکردنی لەدەستداوە و هەرکەس کراوە بە ژن و مێردی یەکتری. کەڵەکە بوونی هەمیشەیی سەرمایە پێویستی بە شەڕانگێزی و هۆڤێتییەک هەیە تا بەجۆرێکی دیکە دەرفەت بەکۆمەڵگا نەدات. هاوسەرگیری بوارێکە لەژێر ناوی نامووسدا هەم کۆیلایەتی و دەستدرێژی تێدا ڕەواکراوە هەم بەقووڵایی تێیدا جێبەجێ کراوە.

ئەو دەزگایەی دەمامکی مۆدێرنیتەی داماڵیوە دیسان ڕەوشی ئیفلاسکردنی خێزانە. ئیفلاسکردنی خێزان لەشارستانی ئەوروپا تەنیا لاوازبوونی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان جێگای باس نابێت؛ ناکۆکیەکانی لەگەڵ کۆمەڵگا قووڵایی قەیرانو کائۆسەکەش دەخاتە ڕوو. وەک چۆن کۆیلایەتی ژن ئاستی کۆیلایەتی کۆمەڵگا دیار دەکات، ڕەوشی کائۆسی پەیوەندی نێوان ژن - پیاویش ڕەوشی کائۆس و ناکۆکی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری ڕۆژی ئەمڕۆمان پیشان دەدات.

ڕەگەزگەرایی (ڕەگەزپەرستی) کۆمەڵگا دەستەواژەیەک نییە تەنیا بەو دەسەڵاتە سنوورداربێت کە لەپەیوەندی نێوان ژن ـ پیاو جێگای باسە. گوزارشت لەدەسەڵاتگەرێتییەک دەکات کە لەهەموو قوژبن و ئاستێکی کۆمەڵگادا بڵاوبۆتەوە. دەسەڵاتی دەوڵەت پیشاندەدات کە لەرێگای مۆدێرنیتەوە بە بەرزترین ئاستی خۆی گەیشتووە. هیچ شتێک بەقەدەر ژنی ئۆبژەکراو ورژێنەر نییە و نابێتە بابەتی دەسەڵات. وەک هەبوونێکی بە ئۆبژەکراو ژن خاوەن خەسڵەتی زیادکردنی دەسەڵاتە. بەردەوام لەپێگەیەکدا ڕادەگیرێت کە دەسەڵات زیاد بکات و وروژێنەربێت. لەم چوارچێوەیەدا شیکارکردنی پەیوەندی ژن بەدەسەڵاتەوە سەبارەت بەئاشکراکردنی حەقیقەتەکەی گرنگ و بایەخدارە. هەر پیاوێک بە زیادەوە خاوەن زهنیەتێکی بەمجۆرەیە کە برسێتی دەسەڵات لەسەر ژن دابڕێژێت. هەمان زهنیەت بەشێوەی تووڕەیی و چڵێسی دەسەڵاتی تاکەکانی ڕەگەزگەرایی ژن لەسەر یەکتر و منداڵان زیاد دەبێت و جێ بەجێدەکرێت. ئەو جارە ژن دەبێت بە گورگی ژن. ئەمە ئەو ڕووداوەیە کە بە پەرچەکرداری یەک بەدوای یەک ناودەبرێت. ڕۆڵی ژن لەسیستەمی چەوسانەوەی سەرمایەداریدا ڕوونتر و لەبارترە. تەنیا بەبێ کرێ بە وەچەخستنەوەو گەورەکردنی بۆ سیستەم سنووردارنابێت، بەڵکو بەکەمترین کرێ دەخرێتە ناو هەر ئیش و کارێکیشەوە. لەرێگای سوپای بێکارانەوە بەردەوام لەپێگەی کەمکردنەوەی کرێ و سەرکوتکردندا ڕادەگیرێت. چەندە بەئێش و ئازارە سەرباری ئەوەی خاوەنی بە پەژارەترین ڕەنجە بەڵام هیچ باوەڕییەک ـ مارکسیستەکانیش لەناودا ـ پێویستی ئاماژەکردن بەڕەنج و مافەکانی ژن نابینێت. هەر بۆیەش شیکار و هەڵوێستی سیاسی پێویست پیشاننادەن. یەکێک لەو نیشانانەی بەربڵاوی ڕەگەزگەرایی کۆمەڵایەتی باڵادەستی پیاو دەسەلمێنێت پەیوەست بەڕەنجی ژنە.

کێشەی زیادبوونی زێدەڕۆیانەی ژمارەی دانیشتوان لەکێشەی چینایەتی زیاتر هەڕەشە لە کۆمەڵگا و جیهان دەکات. زیادبوونی ڕادەبەدەری ژمارەی دانیشتوان لەنزیکەوە گرێدراوی کۆمەڵگای ڕەگەزگەرا

و مۆدێرنیتەی سەرمایەدارییە. ئارەزووی زایەندی کە ڕۆژانە بیست و چوار کاتژمێر هێورنابێتەوە، کلتووری خێزان و خانەدانێتی لەگەڵ سیاسەتی زیادکردنی دانیشتوانی سەرمایەداری و دەوڵەت - نەتەوە لەپێناو بەدەستهێنانی هێز و قازانج تەقینەوەی ژمارەی دانیشتوان لەگەڵ خۆیان دێنن. کاتێک ڕۆڵ و کۆمەکی پزیشکی و تەکنۆلۆژیاشی بێتە سەر، ئەو واقیعەی دێتە ئاراوە، مەترسیدارترین دۆخ سەبارەت بەبەردەوامبوون و بەردەوامنەبوونی کۆمەڵگا و ژینگە جێگای باسە. کائۆسی دیموگرافی گرێدراوی ئەو واقیعەیە. لەمێژە هەسارە و ژینگەکەمان بەسنوورێک گەیشتووە چیتر بەرگەی ئەو قەبارە (٦/٦ ملیار دانیشتوانی جیهان و زیادبوونیشی بەردەوام بێت) ناگرێت. لەم لایەنەشەوە هەڵسەنگاندنی ئیفلاسکردنی سیستەم گرنگە.

پێویستە زۆر بەباشی بزانرێت کە ئەو ژنەی وەک ئامرازێکی وەچەخستنەوەی زۆر بەکاردەهێنرێت خراوەتە ژێر بارێکی ترسناک و بەرگەگرتنی ئاستەمە. کێشەکە زۆر لەولاتری بوون بەخاوەنی منداڵە، سەرچاوەی خۆی لەسیستەمێکی زۆر قورسی بێکارییەوە وەردەگرێت. هەروەها پێویستە زۆر بەباشی بزانرێت کە وەچەخستنەوە دیاردەیەکی سیستەماتیک‌و کلتوورییە نەک بایۆلۆژی. سەبارەت بەو کلتوورەی لەئارادایە؛ هەر منداڵێکی لەدایک دەبێت چەندین جار مانای مردنی ژنە نەک تەنیا جارێک. کلتوورێکی وەچەخستنەوە پێویستە؛ ژمارەکەی زۆر کەم بێت، گشت تەگبیرە تەندروستیەکانی وەرگیرابێت‌و پێش هەموو شتێکیش لەبواری زهنەوە ئامادە کرابێت. لەجیاتی ئەوەی فیکری هێز و ئەبەدییەت لەسەربنەمای منداڵ و وەچەخستنەوە بونیاد بنرێت، دەستەبەرکردنی لەمیانەی پەرەپێدانی کۆمەڵگای ئەخلاقی و سیاسی، جوانی‌و مەعریفەی ڕەها مانادارترە؛ شیکارکردنی بەخێوکردنی منداڵان بەگوێرەی ئەو ئەولەویاتانە باشتر دەبێت. بەکورتی پێویستە کێشەی بەخێوکردن و پێگەیاندنی منداڵان لەسەر بنەمای فەلسەفەی ئازادی و پێویستیەکانی کۆمەڵگای ئیکۆنۆمی و ئیکۆلۆژی چارەسەر بکرێت.

لەمێژە سیستەم ئەو چانسەی لەدەستداوە لەمیانەی ریفۆرمەوە خۆی راست بکاتەوە. ئەوەی پێویستە "شۆڕشی ژن"ە کە گشت بوارەکانی کۆمەڵگا بگرێتەوە. وەک چۆن کۆیلایەتی ژن قووڵترین جۆری کۆیلایەتییە، پێویستە شۆڕشی ژنیش قووڵترین شۆڕشی ئازادی و یەکسانی بێت. هەم لەبواری تیۆری هەم کرداری شۆڕشی ژن پێویستی بە پێهەڵگرتنی ڕیشەیی هەیە. بەر لەهەموو شتێک شەڕێکی بەردەوام بەرامبەر بە ئایدیۆلۆژیای ڕەگەزگەرایی پێویستە. هەروەها شۆڕشی ژن پێویستی بە قووڵکردنەوەی شەڕی سیاسی و ئەخلاقی هەیە بەرامبەر بە زهنیەتی دەستدرێژی کە ڕۆژانە بیستوچوار کاتژمێر دەست بەکارە. هەروەها پێویستی بە قەبوڵنەکردن و ریسواکردنی ئەو دیاردەی وەچەخستنەوە هەیە کە بەئامانجی دەسەڵات و چەوسانەوەیە. پێویستە ئیرادەی منداڵبوونیش بۆ ژنی ئازاد جێ بهێڵدرێت. لەبواری ئایدیۆلۆژیای خێزان و خانەدانێتیدا پێویستی بە شۆڕشە. بەهەرحاڵ گرنگترینیشیان پێویستی بە بەلاوەنانی ئەو فەلسەفەیەی ژیان هەیە کە لەگەڵ ژن جێگای باسە، بەمانایەکی تر بەلاوەنانی ئەو بێ فەلسەفەییەی لەئارادایە. پێویستە هێزی بەیەکەوە ژیان لەگەڵ ژندا گرێدراو بەچەمکی خاوەندارێتیکردنی منداڵ و تێرکردنی ئارەزووی زایەندی نەبینرێت، بەڵکو وەک قووڵترین پەیوەندی دۆستایەتی، هەڤاڵێتی و کۆمەڵگابوون ببینرێت کە جوانی، دڵسۆزی و رەسەنایەتی لێدەکەوێتەوە و هاوبەشێتی یەکسان و ئازاد بەبنەما دەگرێت.

بێگومان هاوبەشێتییەکی ئازاد و یەکسانانەی ژیان لەگەڵ ژندا مسۆگەر سەبارەت بەحەقیقەتی کۆمەڵگا پێویستی بەدانایی هەردووکیان هەیە. ئەشقی ڕاستەقینە تەنیا لەدۆخی هاوسەنگی هێزی حەقیقەتی کۆمەڵگادا جێگای باس دەبێت. ئەو کەسایەتیانەی لە کۆیلایەتی، دەستدرێژی و دەسەڵاتەوە گلاون هەرگیز ئەشق لای ئەوان جێگای باس نابێت. ئەزموونە فاشیلەکانی بەردەوام دووبارە دەبنەوە و ئیفلاسکردنی خێزانیش ئەو ڕاستییە دەسەلمێنن. لەدۆخێکدا ژنیش بەلانی کەم بەقەدەر پیاو ببێتە خاوەن دانایی و هێزی کۆمەڵایەتی؛ ئەو کاتە دەشێت خۆشەویستی و جوانی لەچوارچێوەی ئاشتی و بێ دەسەڵاتیدا بەشێوەیەکی

ئازاد و یەکسان پەرەی پێبدرێت و هاوبەشێتی تێدا بکرێت. هەلومەرجی ڕۆژی ئەمڕۆمان ئەولەویەتدان بەشۆڕشی ژنی سەدەی بیستو یەکەم وەک مەرجێک بەسەرماندا دەسەپێنێت. دروشمی "یان ژیان یان هۆڤێتی" ئەو شۆڕشە دەسەپێنێت.

هەروەک چۆن کۆمەڵگای خۆرهەڵاتی ناوین پێویستی بە دووەمین شۆڕشی گوند ـ کشتوکاڵ هەیە، هەروەها پێویستی بە دووەمین شۆڕشی ژنیش هەیە. دایکسالاری شۆڕشی ژنە لەچاخی نیولیتیکدا. بەمانایەکی تر شۆڕشە شکۆدارەکەی نیولیتیک شۆڕشێکی ژن بوو. شۆڕشی نیولیتیک شۆڕشێکە تا ئێستاش مرۆڤایەتی لەسەرمیراسەکەی دەژیت. ئەو گەورە دژە شۆڕشەی پیاوسالاری کە لەسەر بنەمای شۆڕشی چەواشەی شارستانی و مۆدێرنیتە کۆمەڵگای سروشتی دواخستو قووڵترین چەوسانەوە و کۆیلایەتی ژنانی لەگەڵ خۆیدا هێناوەو لەناو تەواوی کۆمەڵگادا بڵاوی کردۆتەوە، لەڕۆژی ئەمڕۆماندا لەسەرجەم بوارەکانی کۆمەڵگا دووچاری قەیرانی سیستەماتیک و ڕەوشی کائۆس بۆتەوە و لەهەڵوەشانەوەدایە. ئیتر ڕوون بۆتەوە ئەوەی بەسەر ژندا سەپێنراوە ناپاکیو خیانەتکردنە لە ژیان. ئەگەر داخوازی ژیانێکی مانادار جێگای باس بێت؛ بەرلە هەموو شتێک پێویستە لەچوارچێوەی هاوسەنگی هێزی دانایی لەگەڵ ژندا هەستەکانی جوانی و شکۆداری بئافرێنێت و هاوبەشێتی تێدا بکرێت. بونیادنانی ئەو ڕاستییەو گەیشتن بە حەقیقەتەکەی پێویستە. لەم بارەیەوە پێویستە تاکێتی و گەردوونی بەیەکەوە لە ئارادابن، واتا پێویستە ژن و پیاوی بەرجەستە و پیاو و ژنێتی نموونەیی دەرهەست بەشێوەیەکی تێکەڵ بژین. لەپێناو بەدیهاتنی ئەو دۆخەش پێویستی بە پێکهاتنی مەعریفە و ئیرادەکەی هەیە. پێویستە بەشێوەیەکی بنەڕەتی وەک مۆڵک و خاوەنی یەکتری دەستبەرداری یەکتربن. لەجیاتی چەمکی ناموسی نەریتی باو پێویستە سەرنجڕاکێشی کەسایەتی ڕەسەن و جوانییەکەی پەسەند بکرێت.

لەم چوارچێوەیەدا ئەگەر شۆڕشێکی ریشەیی ژن ئەنجامنەدرێت، واتا گۆڕانکاری لە زهنیەت و ژیانی پیاودا ڕوونەدات ڕزگاری ژیان جێگای باس

نابێت. چونکە تا ژن ڕزگاری نەبێت کەخودی ژیانە ئەوا بەردەوام ژیان وەک سەرابێک بەسەر دەبرێت. تا ئاشتەوایی پیاو لەگەڵ ژیان و ژن بەدینەیەت ئەوا بەختەوەریش خەیاڵێکی پووچە، لەپێناو ژن و ژیانی ئازاددا ڕاستییە کۆمەڵایەتیەکان بێ سنوورن. کۆمەڵگا و ژنانی خۆرهەڵاتی ناوین لەئاکامی ئەو شارستانیو فەتحکارییەی لەلایەن مۆدێرنیتەوە دووچاری هاتووە هێندەی توانیویانە خستوویانە و لەناوەڕۆکی خۆی خاڵییانکردووە و بەدۆخی ئۆبژە گەیشتووە. شیکارکردنی کێشەی کۆمەڵگا لەرێگای ژنەوەو لەمیانەی هەمان دیاردەشەوە هەنگاونان بۆ چارەسەرکردنی پەیڕەو و میتۆدێکی ڕاستە. تەنیا کاتێک شۆڕشی ژن ـــ دایکی ڕێگە چارەکان ـــ بەسەردایکی کێشەکاندا بسەپێنرێت ئەوکاتە لەمیانەی هەنگاوی ڕاستەوە دەتوانین بەحەقیقەت بگەین.

سەبارەت بەکێشەی ژن و شۆڕشەکەی تازەگەری دیموکراتی خاوەن بانگەشە و کردارە. ئەو پرۆژانەی دەکەونە چوارچێوەی فاکتەرەکانی تازەگەری دیموکراتییەوە بەبێ بەشداری ژن ئامادە و جێبەجێ ناکرێت. بەپێچەوانەوە ئەوانە پرۆژەگەلێکن کەهەنگاو بەهەنگاو لەمیانەی هاوبەشێتیکردنی دانایی و چالاکی لەگەڵ ژندا ئەنجامدەدرێن و ماهیەتی شۆڕشیان هەیە. هەروەک چۆن ئاواکردنی کۆمەڵگای ئابووری بەپێشەنگایەتی ژن بووە، سەرلەنوێ ئاواکردنەوەشی پێویستی بەهێزی کۆمینالی ژن هەیە. ئابووری پیشەو چالاکی کۆمەڵایەتی خودی ژنە. ئیکۆلۆژیش یەکینەیەکە کە تەنیا لەمیانەی هەستیاری ژنەوە لەگەڵ کۆمەڵگادا ئاوێتە دەبێت. وەک ناسنامە ژن ژینگەپارێزە. کۆمەڵگای دیموکراتیک کۆمەڵگایەکە پێویستی بە زهنی ژن و ئیرادە ئازادەکەی هەیە. بەشێوەیەکی ڕوون و ئاشکرا تازەگەری دیموکراتی چاخی شۆڕش و شارستانێتی ژنە.

## ٧. چۆن بژین، چی بکەین و لەکوێ دەست پێبکەین؟

حەقیقەتو مردنو ژیان لەپێناو حەقیقەتدا دەستەواژەگەلێکی گرنگن. دەستەواژەی حەقیقەت کە لەکلتووری ئەورووپا وەک دوالیزمی تیۆرـ کردار

پیشاندەدرێت ناوەڕۆکەکەی خاڵیکراوە، پارچە بووە و یەکێتی خۆی لەدەستداوە. لە مۆدێرنیتەی درەنگ وەختدا ئەو بابەتە زەق و دیارترە. حەقیقەت بووە بەدیلی ئیکۆنۆمیزم.

لەکاتی سەرهەڵدانی کێشە کۆمەڵاتیەکاندا گەڕان بەدوای حەقیقەت بووە بە ڕۆژەڤ. مسۆگەر لەو قۆناغ و سەردەمانەدا گوتە و کردارێک هەوڵیداوە خۆی وەک حەقیقەت بنوێنێت. شیکاری سۆسیۆلۆژیانەی حەقیقەت بەشێوەیەکی ڕوون و ئاشکرا پەیوەندییەکەی بەناعەدالەتیەکانەوە ئاشکرا دەکات. لەکاتێکدا زەوتکردنی بەهاو ڕەنجی کۆمەڵگا وەک ناهەقی و ناعەدالەتی پێناسە دەکرێت، لێکۆڵینەوە و جێبەجێکردنی پێویستیەکانیشی بە کاروخەباتی حەقیقەت ناوبراوەو بەردەوام شکۆدارکراوە. پیشاندانی ناهەقی وەک هەق و هەروەها یەکسانکردنی هەق لەگەڵ خوداوەند پەیوەندی هەردوو دەستەواژە بەکۆمەڵگابوونەوە دەخاتە ڕوو. بەمجۆرە جارێکی دیکە لەدەرەوەی دەرهەستی میتافیزیکدا پەیوەندی دەستەواژەی خوداوەند لەگەڵ ویژدانی کۆمەڵگادا دەسەلمێنێت.

گەڕان بەدوای حەقیقەتدا حیساب پرسینی ناهەقی و ناعەدالەتی لەگەڵ خۆیدا دێنێت. ناسنامەی کۆمەڵگا کە لەژێر ناوی خوداوەند خۆی وەک گەورەترین هەبوون دەخاتە ڕوو بەمجۆرە وەڵامی ناهەقیەکانی بەرامبەری دەداتەوەو بەشێوەی سزای ئیلاهی مەحکومیان دەکات. چەندە لەناوەوەی کۆمەڵگا و سروشتی دەرەوە هەڕەشەو ناهەقیەکان بەرامبەر ناسنامەی کۆمەڵگا زیادی کردووە زیاتر داکۆکی لەسەر ناسنامە کراوە، تیۆری (هزری ئیلاهی=تیۆری)و چالاکی (کاری ئیلاهی) مەزن لە پێناویدا پێشخراون و ئەنجامدراون. لەبەر ئەو هۆکارەش تێگەیشتنی ئەو خاڵە گرنگە کە ناسنامەی کۆمەڵگا لەسەرچاوەی ئایین و فەلسەفەدا شاراوەیە. ئەم دۆخەش پیشانیدەدات کە لەشوێنێکی دیکەدا گەڕان بەدوای سەرچاوەی ئایین و فەلسەفە هەوڵێکی پووچ و بێ ئەنجامە.

چەواشەکردن و سەرکوتکردنی دەستەواژە و چالاکی حەقیقەت لەسەرووی ئەو ئامانجانەوە دێت کە هەژموونگەرایی ئایدیۆلۆژی

مۆدێرنیتەی سەرمایەداری هەوڵی ئەنجامدانی دەدات. ئایین و فەلسەفە بۆ میللیگەرایی و ئیلاهیبوونی دەوڵەت ـــ نەتـەوە وەرچـەرخێنراوە. تیـۆری و پراکتیک بۆ شکۆدرای و نەمرکردنی تیۆری و کردارەکانی دەوڵەت ـ نەتەوە قەتیسکراوە. لەژێر کاریگەری و کۆنترۆڵی فەلسەفەی پۆزیتیڤیستدا زانست بۆ شیکارکردن و چارەسەرکردنی ئەو کێشانە بچووککراوەتـەوە کـە زادەی سێ کۆڵـەکەکـەی مۆدێرنیتـەن. جـەنگاوەریێتی حەقیقـەت کـە بـە قـەدەر مێـژووی مرۆڤایـەتی کۆنـە بـۆ دابینکردنـی بەرژوەندییـە بچـووک و هەرزانەکان ئاراستەکراوە. لەکاتێکدا هەڕەشەکانی سەر ناسنامەی کۆمەڵگا لە ڕۆژەڤی حەقیقەت بەدەردەنرا کە کێشـەی هـەرە سـەرەکییە، هەوڵـدراوە ئاکگەرایی یـان ئـاکخوازی لەجێگایـدا جێگیـر بکرێت. لـەم چوارچێوەیـەدا مافەکانی مرۆڤیش قۆستراوەتەوە. تەنانەت ئەو بۆچوونانەی خۆیان وەک "ئایـدیۆلۆژیای راسـتگۆ"ش خسـتۆتە ڕوو بـوێری تێپەڕانـدنی پـارادایمی مۆدێرنیتەیان پیشان نەداوە.

بـەو سیفەی ئایـدیۆلۆژیای فـەرمی سیسـتەمە تـا ڕۆژی ئـەمڕۆمان لیبڕالیزم توانیویەتی پاوانی خۆی بەسەر راستڕەو و چـەپڕەوەکان درێـژە پێبدات. لیبرالیزمی پاوانی ئایدیۆلۆی مۆدێرنیتـە لەلایەکـەوە هەڵایسـانی بۆچـوون دەئافرێنێـت، لەلایـەکی دیکەشـەوە هـەروەکو چـۆن گـەورەترین تالانکاری لەو دۆخـەی هەڵایسـاندا دەکـات لەهەمانکاتـدا سوودبەخشـترین ئامرازەکانی میدیای خـۆی بـەکاردێنێت و بۆمباردوومـانێکی زهنـی پـەیڕەو دەکـات و هـەوڵی بەدەسـتهێنانی زۆرتـرین ئـەنجام دەدات. گـەرەنتیکردنی پـاوانی هـزرو بۆچـوون دوا ئامـانجی شـەڕی ئایدۆلۆژییـە. چەکـە سەرەکیەشیان ئایینگەرایی، میللیگەرایی، ڕەگەزگەرایی و زانستگەراییە کە ڕۆڵـی ئـایینی پۆزیتیڤیست دەبینێـت. بـەبێ هەژموونگـەرایی ئایـدیۆلۆژی مەحاڵە تەنیا لەرێگای فشاری سیاسی و سەربازییەوە درێژە بە مۆدێرنیتە بدرێت. لەرێگای ئایینگەراییەوە لیبرالیزم هەوڵی کۆنترۆڵکردنی کۆمەڵگای بەر لە سەرمایەداری دەدات، لەمیانەی میللیگەرایشەوە هاوڵاتیانی دەوڵەت ـ نەتەوەو چینەکانی تەوەرەی سەرمایەداری کۆنترۆڵ دەکـات و دەیانخاتـە ژێر چاودێریـەوە. ئامـانجی رەگەزگـەراییش هەناسـەبڕکردنی ژنـە. ئـەرکی

کــاراو بــە کاریگــەری ئایــدیۆلۆژیای ڕەگەزگــەرایی؛ تێــوەگلانی پیــاو بەنەخۆشــی دەســەڵات و ســەپاندنی هەســتی دەســتدرێژییە بەســەر ژنــدا. لەکاتێکدا لەمیانەی زانستگەرایی پۆزیتیڤیستەوە دونیای ئەکادیمی و لاوان بێکاریگەر دەکات و جگە لەئاوێتەبوون لەگەڵ سیستەمدا بژارێکی دیکـەیان بـۆ ناهێڵێتـەوە، لەبەرامبـەر هەنـدێک سازشـدا ئاوێتـە بوونەکـە گـەرەنتی دەکات.

لەبەرامبەر شالاوی ئایدیۆلۆژی لیبرالیزمدا پرسیارەکانی چۆن بژین، چــی بکــەین و لــەکوێ دەســت پــێ بکــەین زەق دەبنــەوە. وەڵامــی بەرهەڵستکارانی سیسـتەم سـەبارەت بـەو پرسیارانە تـا ڕۆژی ئـەوڕۆمان بێکاریگـەرکراوە. وەڵامـەکانی مۆدێرنیتـە دەرهـەق بەهـەر سـێ پرسـیارە گرنگەکەش بەکاریگەر بووە. ئەو شێوازە ژیانەی ئەو پێنج سـەدەی دوایـی مۆدێرنیتە پەرەی پێداوە تا ڕادەیەکی زۆر مۆرکی خۆی لە پرسیاری "چـۆن بـژین؟"داوە. لەسـەردەمی مۆدێرنیتـەی سـەرمایەداریدا لەمیانـەی هێزێکـی قبوڵانــدن و هەرســپێکردندا شــێوازی ژیــان هۆمــۆژەنکراوە کــە لــەهیچ ســەردەمێکی مێــژوودا نــەبینراوە. لــەژێر ڕێســای جیهانیــدا قــاڵبی ژیــانی هەرکەسێک کراوە بە یەک جۆر. بەرامبەر بە یەکشێوەکردندا جیاوازییەکان لاوازن. ڕابوون بەرامبەر ئەو شێوازە ژیانەی بە ژیانی مۆدێرن ناو دەبرێت مۆرکی "شێتایەتی"لێدەدرێت و مەحکومی لەسیستەم بەدەرنانە. کەسـانێکی سنووردار بەرامبەر بە هەڕەشەی نەفیکردن بوێری بەردەوامکردنی ڕابوون و سەرهەڵدان پیشاندەدەن.

زۆر پێشـتر تەنانـەت پێـنج سـەدەیە بەشـێوەیەکی داتـاو وردەکارانـە پرسـیاری چـی بکـەین وەڵامدراوەتـەوە؛ "تاکخوازانـە دەژیـت، تـەنیا بیـر لەخۆت دەکەیتەوە، مۆدێرنیتە بە تاکە ڕێگا دادەنێیت و ئـەوەی دەکەوێتـە سەرشانت جێبەجێی دەکەیت. ڕێگاو ڕێساکانیش دیارن؛ خەڵکانی دیکە چی دەکەین تۆش هاوشێوەی ئـەوان. خـاوەنکـاری کارەکانـت جێبەجێدەکـەیت، ڕەنجدەریت بەدوای کرێ و هەقدەست دەکەویت. جگە لەوە گـەڕانت بـەدوای وەڵامــی چــی بکــەین گەمژەییــە"؛ داکـۆکی لەسـەر پێچەوانەکـەی بکرێـت ئەنجامەکەی فڕێدانە دەرەوەی سیستەم، بێکاری، بێچارەیی و ڕزینە. ژیان

بەتەواوی کراوە بە پێشبڕکێی ئەسپسواری. بەر لەوەی بزانێت چی بکات، سەبارەت بە پرسیاری لەکوێ دەست پێبکەین بەمجۆرە لەلایەن سیستەمەوە وەڵام دەدرێتەوە؛"لەو شوێنە دەست پێبکە کە خۆتت تێدا پەروەردە کردووە". بۆ سەرکەوتن لەناو سیستەمدا قوتابخانە و زانکۆکان شوێنە دەست لێبەرنەدراوەکانی دەستپێکردنن.

لێگەڕینی حەقیقەت، ڕاوەستەی ئایدیۆلۆژی و ئەو وەڵامانەی تازەگەری دیموکراتی سەبارەت بەهەر سێ پرسیاری سەرەکی بەرامبەر بە سیستەم پێشیدەخات ئاشکرایە کە سیستەمی ئەلتەرناتیف پێکدێنێت. بەهەموو لایەنێکیەوە گەڕان بەدوای ناسنامەی کۆمەڵگا، شیکارکردن و خستنەڕووی ڕێگاکانی چارەسەری ناوەڕۆک و خودی شەڕی حەقیقەتە. ئەگەر بەشێوەی هێڵە گشتیەکانیش بێت بەرگرینامەکانم ئەنجامەکانی ئەو لێگەڕین و شەڕانەی خستۆتە ڕوو. دووبارە کردنەوەی نابەجێیە. ڕاوەستەی ئایدیۆلۆژی لەمیانەی ڕەخنەگەلێکی بەرفراوانەوە گوزراشت لە دەربازکردنی هەژموونگەرایی ئایدیۆلۆژی مۆدێرنیتەی زاڵ دەکات. بەرگریکردن لەو حەقیقەتە کۆمەڵایەتیانەی بە دەستەوەن ڕاوەستەی ئایدیۆلۆژییە. ئاشکراکردنی بێبەشبوونی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری لە حەقیقەت (بژاردنی تاکخوازی لەجیاتی کۆمەڵگا، هێرشکردنە سەر ناسنامەی کۆمەڵگا)، هەروەها پیشاندانی حەقیقەتی نەتەوە و کۆمەڵگای دیموکراتیک. ئیکۆنۆمیک و ئیکۆلۆژیک پەیوەندی بەو ڕاوەستەیەوە هەیە.

بەکەمین وەڵامی دەرهەق بە پرسیارەکانی "چۆن بژین، چی بکەین و لەکوێ دەست پێبکەین؟" پێویستە لەناوەوەی سیستەم و لەسەربنەمای بەرهەڵستکاری سیستەم دەست پێبکات. بەڵام ڕکابەرایەتیکردنی سیستەم لەناو خودی سیستەمدا پێویستی بە جەنگاوەرێتیەکی حەقیقەتە کە لەوانەیە هەر ئانو ساتێک باجەکەی مەرگ بێت. پێویستە لەناو یەکتردا وەڵامی پرسیارەکانی "چۆن بژین و لەکوێ دەست پێ بکەین؟" بدەینەوەو وەک بلێی کراسی شێتایەتی فڕێدەدەیت نەفرەت لەو ژیانە بکەیت و دەستبەرداری بیت کە وەک قەڵغانێک مۆدێرنیتە بە بەریدا کردوویت. هەرکاتێک پێویست بکات دەڕشێیتەوە؛ گەدە، مێشک، جەستەت لەو ژیانە

پاکدەکەیتەوە کە تێیدا بڵاوبۆتەوە. تەنانەت ئەگەر خۆی وەک شۆخی جیهانیش پێشکەشت بکات، دیسان ئەوەی هەناوت دێنێتەوەو وەڵامی دەدەیتەوە. بەشێوەیەکی تێکەڵ لەگەڵ هەردوو پرسیارەکەی دیکە بەردەوام لەرێگای چالاکییەوە بەرامبەر بە سیستەم وەڵامی پرسیاری چی بکەین دەدەیتەوە. وەڵامی "چی بکەین؟" پراکتیکێکی هۆشیار و رێکخستووە.

وەڵامدانەوەی هەرسێ پرسیار سەبارەت بەسیستەمی تازەگەری دیموکراتی گوزارشت لە بەیەکگەیشتنی فاکتەرەکانی سیستەم لەگەڵ ئایدیۆلۆژیا و چالاکی دەکات. ئەو رۆڵ و پێگەیەی پێشتر بە پارتی پێشەنگ ناودەبرا پێویستە بەشێوەی پێشەنگایەتی کردەیی و دامەزراوەیی تازەگەری دیموکراتی تۆکمە بکرێت. جێبەجێکردنی پێویستی زهنی و ئیرادەیی کۆمەڵگای دیموکراتیک، ئیکۆنۆمیک و ئیکۆلۆژیک کەسێ کۆڵەکەی سەرەکی سیستەمن (بەرێوەبەرایەتی کۆنفیدراسیۆنی دیموکراتییانەی شار، خۆجێیی، هەرێمی، نەتەوەیی و بان نەتەوەیی) رۆڵ و پێگەی سەرەکی پێشەنگایەتی نوێیە. لەم پێناوەشدا پێویستی بەئاواکردنی چەندایەتی و چۆنایەتیەکی باشی بونیادی ئەکادیمی هەیە. دەشێت ئەو یەکینە ئەکادیمییە نوێیانە بەگوێرەی ماهیەتەکەیان ناو بنرێن کە تەنیا بەرەخنەکردنی دونیای ئەکادیمی مۆدێرنیتە ناوەستن بەڵکو ئەلتەرناتیفەکەشی ئاوا دەکەن. بەگوێرەی پێویستی و گرنگییەکەی ئاواکردنی ئەکادیمیا لەسەرجەم بوارەکانی کۆمەڵگا ئەرکە؛ لەسەرووی هەمووشیانەوە بوارەکانی ئابووری ـ تەکنۆلۆژی، ئیکۆلۆژی ـ کشتوکاڵ، سیاسەتی دیموکراتیک، ئاسایش ـ بەرگری، ژن ـ ئازادی، کلتوور ـ ناسنامە، مێژوو ـ زمان، زانست ـ فەلسەفە و ئایین ـ هونەر. ئەگەر کادیرێکی ئەکادیمی بەهێز لەئارادا نەبێت فاکتەرەکانی تازەگەری دیموکراتیک ئاوا ناکرێت. وەک چۆن فاکتەرەکانی تازەگەری دیموکراتی نەبن کادیرانی ئەکادیمیک بێ واتان، ئەگەر کادیرانی ئەکادیمیکیش نەبن فاکتەرەکانی تازەگەری دیموکراتیش بێ واتان و سەرکەوتوو نابن. یەکگرتنێکی بەناویەکداچوو لەپێناو ماناو سەرکەوتندا مەرجە.

مسـوگەر پێویسـتە ئـەو چەمکـەی مۆدێرنیتـەی سـەرمایەداری دەستبەرداری لێبکرێت کە وەک بەرگێکی نەفرین وەستاوە و فیکر، گوتـە و چالاکییەکانی لەیەکتری جیاوازن. فیکر ـ گوتـە ـ کردار ئـەو هێمایانـەی شـکۆمەندین کـە هـەرگیز لـەیـەکتری جیانابنـەوە، حەقیقـەتێکن پێویستە لەکۆڵ بکرێن، بەشێوەی یەکپارچەیی لەبەربکرێن و بژێنرێن. هەرکەسێک بەیەکەوە نوێنەرایـەتی هەرسێ چۆن بـژین، چـی بکـەین، لـەکوێ دەست پێبکـەین نـەکات پێویستـە نەچێتـە مەیـدانی شـەڕی حەقیقەتـەوە. شـەڕی حەقیقەت چەواشەکاریەکانی مۆدێرنیتـەی سـەرمایەداری پەسـەند ناکـات و لەگەڵیـدا ناژیـت. بـەکورتی کـادیری ئـەکادیمیک مێشـکە، ڕێکخسـتنە و لـەرێگای دەمـارە ریشـاڵەییەکانەوە لەجەستە (کۆمـەڵگا)دا بڵاودەبێتـەوە. یەکێتیـەکی ڕاسـتەقینەیە. حەقیقـەت، ئـەو ڕاسـتییە یەکپارچەیەیـە کـە گوزارشـتی لێدەکرێت. کـادیریش ئـەو حەقیقەتەیـە کـە ڕێکخـراوە و بـووە بەکردار و چالاکی.

لەکاتێکدا کلتووری خۆرهەڵاتی ناوین نوژەن دەبێتەوە پێویستە بزانێت کە ڕێگاکەی بـە شۆڕشـی حەقیقەتـدا تێپـەڕ دەبێت. شۆڕشـی حەقیقـەتیش شۆڕشی زهنیەت و شێوازی ژیانە؛ شۆڕشـی رزگاربوونـە لەهەژموونگـەرایی ئایـدیۆلۆژی مۆدێرنیتـەی سـەرمایەداری و شـێوازی ژیانەکـەی. پێویستـە فریو بەو شۆڤینستە نەژادگەرا و ئایینگەرا ساختەکارانە نەخۆن کە خۆیان لەنەریت پێچاوە. ئـەوان شـەڕ لـەدژی مۆدێرنیتـەی سـەرمایەداری ناکـەن. بەرامبەر بە بینینی ڕۆڵی سەگی زێرەڤانی تۆزێک پشک دەخـوازن. هـەرگیز ئەوان بیر لەئەنجامدانی شەڕی حەقیقـەت ناکەنـەوە. چونکـە بەرامبـەر بـە مۆدێرنیتـە تـەنیا ژێرنەکـەوتوون بـەڵکو ماسـتاو ساردکەرەوەشـن. ئەگـەر بزووتنـەوەکانی چـەپرەوی کـۆن، فێمنیسـت، ئیکۆلۆژێـک و کلتووریـەکان خوازیارن ببن بە دژە ـ مۆدێرنستێکی بەپرەنسیپ، پێویستە بـزانن شـەڕی حەقیقـەت لـەچوارچێوەی یەکپارچەییەکـەی و شـێوازی ژیـانی خۆیانـدا بەڕێوەببەن.

شەڕی حەقیقەت ئەو کاتـە مانـادار دەبێت کـە لەهـەر سـاتێکی ژیـان، سـەرجەم بوارەکـانی کۆمـەڵگا، یەکینـە ئیکۆنۆمیـک و ئیکۆلۆژییـە

کۆمینالیستەکان، لەشارە دیموکراتیەکان، شوێنە خۆجێیی، هەرێمی، نەتەوەیی و بان نەتەوەییەکان بەڕێوەببرێت؛ بەمجۆرەش سەرکەتوو دەبێت. ئەگەر وەک پەیامبەر و حەوارییەکانی سەردەمی دەرکەوتنی ئایینەکان نەژیت و بەدوای حەقیقەتدا نەگەڕێیت ناشێت شەڕی حەقیقەت بەڕێوەببرێت، تەنانەت ئەگەر شەڕێکی لەمجۆرە جێگای باسیش بێت بەڵام سەرناکەوێت. پێویستی بە دانایی مێخوداوەندە نوژەنەکان، زەردەشت، موسا، عیسا و محەمەد، ساینت پاول، مانی، فەیسەل قەرەنی، مەنسووری حەلاج، سەهرەوەردی، یونیس ئیمرە و برنۆکانی خۆرهەلاتی ناوین هەیە.

شۆڕشی حەقیقەت سەرناکەوێت تا نەبێتە خاوەنی میراسە بەسەرنەچووو نوژنبوونبووەکەی جاران. چونکە شۆڕش و شۆڕشگێران نەمرن و لەمیانەی خاەنداریێتیکردن لەمیراسەکانیان دەژێنرێن. کلتووری خۆرهەلاتی ناوین کلتووری ئاوێتەکردنی فیکر ــ گوتە ــ کردارە و لەولایەنەوە زۆر دەوڵەمەندە. تازەگەری دیموکراتی ڕەخنەکانی خۆی سەبارەت بەشارستانی و مۆدێرنیتەی سەرمایەداری دەخاتە سەر ئەو کلتوورە و کۆمەکی خۆی پێشکەش دەکات و بەمجۆرەش ڕۆڵی مێژوویی خۆی دەبینێت.

بەو ڕادەیەی پێویستە تازەگەری دیموکراتی لەبەرامبەر سێ ئەسپسوارە مەحشەریەکەی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری (سەرمایەداری، ئیندوستریالیزم و دەوڵەت ـ نەتەوە) تاک لەناو یەکپارچەیی تێکۆشانی فیکری ـ گوتە ـ کرداری بژێنێت، ئەگەر بەیەکەوە لەگەڵ سێ فریشتە فریادڕەسەکەی تازەگەری دیموکراتی (کۆمەڵگای ئیکۆلۆژیک و کۆمەڵگای دیموکراتیک) تێکۆشانێکی بەردەوامی فیکری ــ زارەکی ــ کردەیی ژیان بەڕێوە نەبات ناتوانێت خۆی بونیاد بنێت؛ ناتوانێت خۆی لەدۆخی ڕێبەری حەقیقەتدا بونیادبنێت؛ بەقەدەر ئاواکردنی یەکینەی ئەکادیمیا ئەگەر لەیەکینەی کۆمینەی کۆمەڵایەتیدا درێژە بەیەکێتی تێکۆشان و ژیان نەدات، ئەوا نابێت بە ڕێبەر و ڕێزانی ئافرێنەری دونیای عەدالەت، ئازادی و دیموکراسی. کاتێک ڕەخنەکانی پەرتووکی پیرۆز و دانایی

مێخوداوەندەکان سەبارەت بە ئامرازەکردنیان بێت لەلایەن مۆدێرنیتە و شارستانی زۆردارەوە؛ رەخنەگەلێکی بەنرخ و بەهادارە. ئەوەی دەمێنێتەوە ناسنامەی کۆمەڵایەتی و میراسی ژیانمانە کە کۆن نابێت. ملیتان یان شۆڕشگێڕی چاخی دیموکراتیک ئەو کەسەیە کە ئەو ناسنامەیەی لەکەسایەتی خۆیدا هەڵقوڵاوە، بەشێوەیەکی ئازادانە میراسی ژیان دەژیت و دەژێنێت.

## ئەنجام

کلتووری خۆرهەڵاتی ناوین لەمیانەی ئایدیۆلۆژیا و زانستە پۆزیتیڤیستەکانی مۆدێرنیتەی ئەوروپا شیکار ناکرێت. کاتێک بانگەشەی شیکارکردنیشی دەکات ئەو ئەنجامەی دێتە ئاراوە تۆریانتالیزم (ڕۆژهەڵاتناسییە)ە. ئەو ئەنجامەی لەپراکتیک و کردەوەکانی ئەو دوو سەدەی دوایی ئەو پاردایمە هاتۆتە ئاراوەو خستۆیەتییە ڕوو، نە لەگەڵ ڕاستی مێژوویی کۆمەڵگای خۆرهەڵاتی ناوین نە لەگەڵ دۆخی بەرجەستەیی ئێستادا کۆک نییە و ناگونجێت. جیاوازی نێوانیان بەقەدەر هەڵدێرێکە. ئەو هەڵوێستە نەرێتیانەی لەژێر کاریگەری قووڵی ڕۆژهەڵاتناسییەوە سەرلەنوێ پێشخراون پەیبردنیان بەحەقیقەت ناواقیعییەو جگە لە ئەدەبیاتێکی وشک هیچی تر نییە.

ئەو ڕووخسارەی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری لەمیانەی خۆبونیادنانەوەی بەشێوەیەکی تێکەڵ لەگەڵ ئەو پارادایمەدا وەریگرتووە هەم لەگەڵ مێژوو هەم لەگەڵ ڕەوشی ڕۆژانەیی ناکۆکە. ئەو جیاوازی و ناکۆکییانەی لەئاراشدان لەمیانەی جۆرێکی شەڕ گوزارە لەخۆیان دەکەن کە لەکارەسات خراپترە و نموونەکەی نەبینراوە. نە غەریزە شاراوەکان نە دواکەوتوویی کلتووری هیچ یەکێکیان لەو دۆخەدا بەرپرسیارنین. کێشەکە پەیوەندی بەشێوازی پراکتیزەکردنی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری و شێوەگرتنیەوە هەیە. بەراستەهێڵ پارچەکردنی کلتوورێک کە هەزران ساڵە لەناو یەکتردا دەژێت و لەپێناو ژیانکردندا خولقێنراوە (بەشێوەی کلتووری ماددی و مەعنەوی) و دواتر جێگیرکردنی ئەجێنداکانی خۆی لەهەر پارچەیەکیدا (ئیندوستریالیزم و سەرمایەداری دەوڵەت - نەتەوە)؛ ئەنجامەکانی هۆکاری ڕاستەقینەی ئەو کارەساتەیە کە ڕوویداوە و لەداهاتووشدا ڕوودەدات. چونکە لەڕاستیدا پراکتیک و کردەوەی ڕابردووی نزیک جیاوازییەکی ئەوتۆی لەگەڵ کارەسات و جینۆساید نییە.

کاتێک ئایینە تاکخودایییەکان (موسەوی، کریستیانی و موسڵمانێتی) لەنێوان خۆیان و ئایینە کۆن و بتپەرستەکان شەڕیان دەکرد هەرگیز ڕێگایان لەپێش ئەو شێوانەی مەترسی نەکردەوە کە مۆدێرنیتەی سەرمایەداری لەگەڵ خۆیدا هێناویێتی. چەمکی ئومەتی هەریەکەیان لەناو ئاشتەواییدا دەرفەتی ژیانی بەو گەل و کلتوورانە دەدات کە لەدەرەوەی دەستە و تاقمە بتپەرستە لەناوچووەکان مابوونەوە. تەنانەت وەک ئەهلی کیتاب (خاوەنی کتێبە پیرۆزەکان) ئەگەر بەشێوەیەکی سەرەتاییش بێت دەرفەتیان بەیەکێتیەکی سەرووی ئوممەت داوە. جینۆساید دەستەواژە و کردەوەیەکی ناسراو نەبوو. هەرچەندە بانگەشەی دژیش پێش بخرێت، بەڵام ئەو بانگەشەیەی بە بەراورد لەگەڵ چاخی نوێی پۆزیتیڤیست چاخی ناوین بەچاخی ناوین دادەنێت تەنیا و تەنیا داهێنانێکی میتۆلۆژییە؛ میتۆلۆژیایە کە لەڕێگایەوە چاخی نوێ خۆی وەک سەردەمی ڕۆشنگەری پیشان دەدات.

چەندە راوەستە لەسەر دەوڵەت ـ نەتەوە بکرێت هەر کەمە؛ کە بە نووکی شمشێر وەک پارە کلتووری خۆرهەڵاتی ناوینی درەوشاندۆتەوە. چونکە شیاو و نابەجێترین هەڵوێست لەمیانەی ئەو چەقۆیەوە ڕێگای لەپێش کرایەوە کە بە دەوڵەت ـ نەتەوە ناودەبرێت. دەست بۆ کام لەو تراژیدیایانە بەرین و تاوتوێی بکەین هیچ لەئەنجامەکە ناگۆڕێت. سەرجەم کلتوورە جێنشین و ڕەوەندەکانی ناوەوەی هیندستان تا سیبریا، بیابانەکانی مەغرییەوە تا دەگاتە بیابانەکانی عەرەبستانی سعودی پشکی خۆیان لەزەبری ئەو چەقۆیە وەرگرتووە. برینەکە تا ئێستاکەش خوێنی لێدەچۆڕێت. ئایا دەشێت نکوڵی لەو ڕاستییە بکرێت کە سەرجەم شەڕو پێکدادانە ڕۆژانەییەکانی هیندۆس ـ موسڵمانەکانی هیندستان، کشمیر، ناوچەی ئۆیگوری چین، ململانێی نێوان ئەفغانستان و پاکستان، زۆرانبازی خوێناوییەکانی چاچان و گەلانی دیکە لە ڕووسیا، شەڕی نێوان ئیسرائیل ـ فەلەستین و لوبنان و وڵاتانی دیکەی عەرەبی، پێکدادانی کوردان لەگەڵ تورک و عەرەب و فارسەکان، شەڕی مەزهەبی ئێران و جینوسایدکردنی ئەرمەنی، ڕۆم و سریانییەکان لەئەنادۆڵ کە تا ئێستا

بەردەوامن و هیچ رێسایەک ناناسن بەرهەمێکی هەژموونگەرایی سەرمایەدارین؟.

ئەگەر دەستێوەردانەکانی نەتەوە یەکگرتووەکانی یەکێتی دەوڵەت ـ نەتەوەکان ئەنجامی لێنەکەوتۆتەوە، هەروەها کۆنگرەی دەوڵەتانی ئیسلامی هیچ کاریگەرییەکیان نابێت و خولە دیبلۆماسییە ڕۆژانەیی و بەردەوامەکانی دەوڵەت ـ نەتەوە لەبێزاری زیاتر هیچ ئەنجامێکی دیکەی لێنەکەوتۆتەوە دیسان هۆکارەکەی وابەستەی زهنیەت و بونیادی دەوڵەت ـ نەتەوەیە. ئەگەر ئەو واقیعە سەیر و سەمەرەیە هەزاران قات لە ئایینگەرایی چاخەکانی کۆن و ناوین داخراوو دۆگماتیکتر بونیادنراوە لەهەرشوێنێک وەک فاشیزم و کردەوەکانی ڕووبەڕوومان بێتەوە پێویستە واقی ورنەمێنین. چونکە خودی دەوڵەت ـ نەتەوە لەرێگای شەڕەوە ئاواکراوە. تاکە دەوڵەت ـ نەتەوەیەک نابینرێت لەمیانەی شەڕەوە ئاوا نەکرێت. لەوەش مەترسیدارتر ئایا دەشێت باسی دەوڵەت ـ نەتەوەیەک بکرێت کەلەگەڵ کۆمەڵگا خۆیو دەوڵەت ـ نەتەوەکانی دیکە بەردەوام لەناو شەڕ، پێکدادان و گرژیدا نەبێت؟

پیشاندانی چەند نموونەیەک سەبارەت بەچۆنیەتی ئاواکردنی دەوڵەت ـ نەتەوە لەخۆرهەلاتی ناوین دەرهەق بە تێگەیشتنی ناوەڕۆکەکەیان فێرکەر و ڕۆشنکەرەوە دەبێت. ئێراقی ئەمڕۆمان وڵاتێکە لەساڵی ١٩٢٠ لەنەخشەدا نەبووە. تەنانەت دەوڵەتی ئێراق وەک خەیاڵێکیش لەئارادا نەبووە. بە لەبەرچاوگرتنی بەرژەوەندی نەوت و پێداویستیەکانی ئیمپراتۆریەتی بریتانیا دەوڵەت ـ نەتەوەی ئێراق ئاواکراوە. بەهیچ جۆرێک ڕەوشی یەکینە کلتورییەکانی ناوی ڕەچاو نەکراوە. پرەنسیپێکی دادوەرانە لەپێناو بەیەکەوە ژیانێکی کۆک و تەبا دانەنراوە. پادشایەک کرایە فەرمانڕەوا کەهیچ پەیوەندیەکی بە حەقیقەتی کۆمەڵگاکەیانەوە نەبوو. پاشا لەلایەن نوخبەی سەربازی نەتەوە پەرستتر ڕووخێنرا. کۆماری ڕاگەیەنراو لەناو هەلومەرجێکی دیکتاتۆریەتەوە ژیاو هیچ پەیوەندیەکی بەجەماوەرەوە نەبوو. کاتێک دەوڵەت ـ نەتەوە بە لەسێدارەدانی خودی سەددام حوسێن هەڵوەشایەوە کە ڕژێمە

دیکتاتۆرییەکەی لەسروشتەکەی بێ ئاگابوو؛ ئەو کاتە سەرجەم چەپەڵی و قڕێژیەکانی ئاشکرابوو. هیچ تیۆریەکی سۆسیۆلۆژی لەئارادا نییە ئێراقی ڕۆژی ئەمڕۆمان پێناسە بکات. وەک دەبینرێت درێژە بە پێگەی کائۆس و گێژاوی خۆی دەدات.

شێوەی ئاواکردنی نزیکەی بیست دەوڵەت ـ نەتەوەکەی دیکەی بەعەرەب ناوبراویش جیاوازتر نییە. هیچ پەیوەندییەکی بەو ڕاستییە مێژوویی و کۆمەلایەتیانەوە نییە کە مانا بەخشیان بکات. سروود، ئالا، ڕژێم و کۆمەڵگاکانی بە نەتەوە ناویدەبەن وەک سنوورەکانیان گشتی وەک شتگەلێکی خەیاڵی لەسەربنەمای بەرژوەندی هێزە هەژموونگەراکان دەستنیشان کراون. خاڵی هەرە گرنگ لێرەدا؛ ئەو شتگەلە خەیاڵیانەی ڕۆژانە بیست و چوار کاتژمێر پیرۆزی دەکەن و دەیپەرستن خاوەنی کۆمەڵگا و مێژوویێکی ڕاستی و بەرجەستەنین کە ڕێزی لێبگیرێت و جیگای پێزانین بێت. شتێک کەحەقیقەت نییە وەک گەورەترین حەقیقەت پیشاندەدرێت؛ بێگومان تەنیا وەک پڕوپاگەندەیەکە. هەڵبەتە چاوەڕوانی ئەوەیان لێناکرێت کە کێشەیەک چارەسەر بکەن یان ژیانێکی بەختەوەرانە بۆ کۆمەڵگا فەراهەم بکەن. ئەوەی حەقیقەتی نەبێت چارەسەری و بەختەوەریەکەشی خەیاڵی دەبێت.

ئاواکردنی ئیسرائیل زۆر سەیرترە. هەرچەندە وەک ئەنجامی یۆتۆپیایەکی سێ هەزار ساڵە بانگەشەی بۆ بکرێت بەڵام ئەویش یەکێک لەکیانە دروستکراوەکانی ئەو دوو سەدەیەی دواییە. هەنگاوەکانی ئاواکردنی لەسەرەتاوە تا کۆتایی خوێناوییە. بەهەرحاڵ بیرکردنەوە لەڕێگایەکی دیکە زەحمەتە کە بەقەدەر ئەوەیان بۆ گەل و کلتووری یەهوودی پڕ لە ئێش و ناسووری بێت. ئاواکردنی لوبنانی تەنیشتیشی سەیرترە. نازانرێت کە هەلومەرج و زەمینەی پێکدادانی ناوچەکە چۆن دەوەستێنرێت. تەنانەت کەس نازانێت کە ناوی سوریاش چۆن هەڵبژێرداراوە. سەدەیەک بەر لەئێستا لەجیاتی تەواوی ئەو وڵاتانە دەستەواژەی "ویلایەتەکانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی" جێگای باس بوو کەنەریتی بوو، تەنانەت لەوانەیە مانایەکیشی هەبووبێت. چەندە

لەمێژوودا بۆ داوە بگەرێینەوە ناوی ولات و ویلایەت نامێنێت. لەگەڵ پەرەسەندنی ئیسلامدا لەسەر بنەمای دیاردەی ئاراستە شێوەیەکی ناولێنان پەسەند کراوە. "بلد الاسلام" (ولاتی موسلمانان) وەک ناوێکی گشتی پەسەند دەکرێت کە واقیعیترە و مانایەکی دیاریش دەبەخشێت و ناکرێت بەکێشەش. واتە پەرستنی ولات جێگای باس نییە. ئەڵلا تاکە هەبوونێکە کە دەپەرسترێت. ئەویش ویژدانی هاوبەشی کۆمەلگا بوو. لەمیانەی سیفەت و ناوەکانیەوە دەستەواژەیەکی دیاری پێکهێنابوو. لەوانەیە هەڵوێستی ڕاستیش ئەوە بووبێت.

ئەگەر بیر لەو قۆناخە بکەینەوە کە هێشتا گۆی زەوی بەشێوەی کیشومەرەکان جیانەبوویەوە، ئەوا دەبینین کە ناوی شوێن و ولاتان گوزارشت لە حەقیقەتێکی قووڵ ناکەن. ئەمەش مانای ئەوە نییە کە ئەو شوێن، ناوچە، ولاتی نەتەوە و خاکی ئوممەت هیچ مانایەکی نییە. مانای هەیە بەلام بەو ڕادەیە نییە کە بکرێت بە ئیلاهی. ئەو شتگەلەی لێرەدا نەرێنییە؛ گەورەکردنی زێدەڕۆیانە هێندە دەرکەوتۆتە پێش کە حەقیقەتی کیانە ئەرێنیەکە بسڕێتەوە. دەشێت هەمان ڕاڤە سەبارەت بە ناسنامەکانی دیکە (ئالا، سروود، نەتەوە، مێژوو) ی دەوڵەت ـ نەتەوە بکەین. هەڵبەتە هێما و ڕەمزەکان پێگەیەکی گرنگییان لەپەیوەندی و پێناسەکردندا هەیە. بەلام پیشاندانیان وەک ڕاستیگەلێکی پیرۆز دەرفەت بەمەعریفەیەکی سۆسیۆلۆژی ڕاست نادات. پێشکەشکردنێکی لەو جۆرە کۆمەلگای شێوەپێدراو ڕووبەڕووی کێشەگەلێکی گەورە دەکاتەوە؛ وەک دەبینرێت ڕووبەڕووی کێشەگەلێکی زۆری کردۆتەوە. لەڕاستیدا لۆژیکی بونیادنان لەم بارەیەوە بەرپرسیارە و بەکێشەیە. دەوڵەت - نەتەوەکانی ناوچە و جیهان کەئەو لۆژیکەکەیانەوە بەگوێرەی بەرژەوەندی هەژموونگەرایی مۆدێرنیتەی سەرمەیاداری دەستنیشانکراوە لەگەڵ حەقیقەتی خۆجێیی، ناوچە، نەتەوە، شارو گوند (ئەمانە گشتیان حەقیقەتی هەمیشەیی و جیهانین) ناگونجێن و کۆک نین. لەم سۆنگەیەوە پێکدادان و ناکۆکی جدی نێوانیان حاشا هەڵنەگرە. چونکە لەسەر دادوەری، ئازادی و دیموکراسی

ئاوانەکراون بەردوام لەگەڵ ناوەڕۆکی راستەقینەی ئەو دەستەواژانە ناکۆک دەبن و لەناو پێکداداندا دەبن.

ئەو ئەنجامەی دەردەکەوێت؛ ئەدەبیاتی ئەو دوو سەدەیەی دوایی دەرهەق بە دەوڵەت ـ نەتەوە گوزارشتێکی زۆر کەم لەبەهای حەقیقەت دەکات. لەوانەیە ڕووبەڕووی باسگەلێکی میتۆلۆژین کە زۆر لە میتۆلۆیاکانی چاخی کۆن بێ ماناترە. بەبڕوای من ئەو مەرەکەبەی بۆ ناکە دەوڵەت ـ نەتەوەیەک رژاوە بەهاکەی زۆر لە بەهای سەرجەم دەوڵەت ـ نەتەوەکان زیاترە. پێویستە ئەنجامێکی بەمجۆرە لە هەڵسەنگاندنەکانم هەڵنەهێنجرێت کە بەتەواوی نکوڵی لە دەوڵەت و نەتەوە دەکەم و کیانەکەیانم لەلای بێ مانایە. دەوڵەت و نەتەوە هەریەکە وەک واقیعێک مانای گرنگی خۆیان هەیە. ئەنجامدانی شیکارێکی راست لەبارەیانەوە گرنگە. ئەمانە پێکهاتەگەلێک نین کە یەکسەر برووخێنرێن یان یەکسەر ڕووخاندنیان پێویست بێت. لۆژیکی ئاواکردنی دەوڵەت ـ نەتەوەو شێوازی بەردەوامکردنی ترسناکە نەک ئەمانە. چونکە بەردەوام شەڕ، جینۆساید، بێ هیوایی، بڕینی حەقیقەتی کۆمەڵایەتی و شکۆدارکردنی زێدەڕۆیانەی بێ بەهاکانی لێدەکەوێتەوە.

وەک سیستەم سەرمایەداری بەخۆی خاوەنی بەهایەک نییە کە بەشێوەیەکی ئەرێنی پێشکەشی کلتووری خۆرهەڵاتی ناوینی بکات. بەهەزاران ساڵ ئاشنای هاوشێوەکەی بووە. سەرمایەداری کشتوکاڵ، بازرگانی، دراو و پیشەسازی لەناوچەکە لەئارادا بووە و خاوەن مێژوویەکی درێژخایەنە. شیکاری کۆمەڵگای ئەخلاقیو سیاسی کلتووری ناوچەکە کراوە. لەوانەیە شۆڕشی پیشەسازی کۆمەکێکی بۆ ئەو کلتوورە ببوایە. بەڵام لەقۆناخی دەرکەوتنیدا بەشێوەی ئیندوستریالیزم خەسڵەتێکی ئایدیۆلۆژی و وێرانکارانەی بەدەستهێنا. ئەو ئەنجامەی ئیندوستریالیزم لەکلتووری خۆرهەڵاتی ناوین رێگای لەپێش دەکاتەوە، خراپترکردنی دۆخی ژینگەیە کە بەئاستەم لەسەر پێیان ماوەتەوە. بێگومان لەو ڕۆژەوە کە لەناوچەدا پەرەیسەندووەو جێگیر بووە بەزیادبوونی

خێراییەکەیەوە بەردەوام بەشێوەی بیابانبوون، بێکاری و پیسبوون (هەوا، ئاوا، زەوی) سەرجەم خراپەکاریەکانی دێنێتەوە.

هەڵسەنگاندنی "ئیسلامی نوێ" لەچوارچێوەی دەوڵەت - نەتەوەدا ماناداترە کە لە نەریتێک زیاتر دیاردەیەکی مۆدێرنیستی ئەو دوو سەدەیەی دواییە. ئەو ئیسلامە وەک میلیگەرایی ئاواکراوە نەک نەریت؛ تێگەیشتنی ئەو خاڵە گرنگ و بایەخدارە. نموونەی میلیگەرایی هەرێمییە و مۆرکی ڕۆژهەڵاتناسی پێوەیە. داهێنانێکی ڕۆژهەڵاتناسەکانە کە هیچ پەیوەندییەکیان بەژیانی ئیسلامەوە نییە. لەنزیکەوە وابەستەی پەلهاویشتن و بڵاوبوونەوەی هەژموونگەرایی ئەوروپایە لەناوچەدا بەتایبەتیش هەژموونگەرایی ئەڵمانیا. لەدوا قۆناخیشدا پەیوەندی بە هەژموونگەرایی ئەمریکای دژ بە ڕوسیای سۆڤێتەوە هەیە. دەرککردن بەو ڕاستییە بایەخدارە کە ئیسلامی سیاسی ئافرێنراو پەیوەندی بەکلتووری ئیسلامی مێژووییەوە نییە. بەڵکو ئەمجۆرە ئیسلامە میلیگەراییە و ئامانجیشی پارچەکردن و شکاندنی بەرخودانی کلتووری و لاوازکردنی ناوچەیە.

ئیسلامی سیاسی ئایدیۆلۆژیایەکی میلیگەراییە کە ئۆلیگارشی دەوڵەت ـ نەتەوەی ئەو دوو سەدەیە دوایی پەردەپۆش دەکات. کۆماری ئیسلامی ئێران بەشێوەیەکی زەق و کاریگەرتر ئەو واقیعە دەخاتە ڕوو. ئیسلامی شیعەگەرا سەرتاسەری میلیگەرایی ئێرانە؛ ئایدیۆلۆژیای هەژموونگەرایی نەریتی ئیمپراتۆریەتی ئێرانە. بەڵام ئیسلام وەک دیرۆک و کلتووری ڕاستەقینە هەم جیاوازە هەم گرنگ و بایەخدارە. تا لەو چوارچێوەیەدا ئیسلام شیکار نەکرێت ناشێت کلتووری خۆرهەڵاتی ناوین شیکار بکرێت، جیابکرێتەوە و زادەی پەرەپێدانی هەندێک چارەسەری بێت. دەریایەکی شکۆداری کلتوورییە کە لەچاوەڕوانی شیکارکردندایە. بەتایبەتیش جێگای ئاماژە پێکردنە: ئەو مێژووەی جیاوازی دەخاتە نێوان ئەو ئیسلامەی فاکتەرێکی دیموکراتییە ـــ بەتایبەتیش لەسەردەمی لەدایکبوونی حەزرەتی محەمەدەوە تا ڕۆژی ئەمڕۆمان ـــ لەگەڵ ئەو ئیسلامەی فاکتەرێکی دەسەڵاتگەریتییە؛ چاوەڕوانی سەرلەنوێ

نووسینەوەیە. پێشخستنی مێژووی کۆمەڵگا لەمیانەی ئەو پارادایمەوە ڕۆڵی لەڕۆشنکردنەوەی ڕۆژی ئەورۆمان بەرز و مسۆگەرە. کاتێک هەمان ڕاڤە سەبارەت بە یەهوودییەت، کرستیانی و زەردەشتی پێشبخرێت ئەوا دەشێت شیکارێکی نزیک لەڕاستییەوە ئەنجامبدرێت و ڕێگا لەپێش ڕەنگینی مانا دەکاتەوە.

لەشیکارکردنی کلتووردا نموونە ڕەسەنەکانی سۆمەر و میسر گرنگن و ڕۆڵی کلیل دەبینن. ڕاستیەکی سەلمێنراوە کە ئایینە تاکخودایی و پەرتووکە پیرۆزەکان سەرچاوەی خۆیان لەو نموونە ڕەسەنانە وەدەگرن. تا کاریگەری مێژوویی کلتووری چاخی نیولیتیک شیکار نەکرێت کە دایکایەتی بۆ هەمووان کردووە؛ هیچ کلتوورێک بەپێی پێویست ڕۆشن ناکرێتەوە. لەسەردەمی خۆیدا بەشێوەکی سنووردار هیگل شیکاری کلتووری تەنیا بۆ چاخی کۆن واتە بۆ کلتووری میسر گەڕاندۆتەوە. کاتێک بەها کلتوورییەکان کۆبکرێنەوە و مێژووی کلتوور ڕاڤە بکرێت ئەو ئەنجامەی دێتە ئاراوە ڕێنسانسی کلتوورە. تا ئێستا بەشێوەیەکی سەرکەوتووانە ئەم ئەرکە لەڕاستینەی کلتووری خۆرهەڵاتی ناویندا جێبەجێنەکراوە. بۆچوونی ئایینگەرایی و میللیگەرایی دەرهەق بەمێژوو جگە لەدۆگماکان باسێکی دیکە ناخەنە ڕوو. پەرەپێدانی سۆسیۆلۆیای کلتووری خۆرهەڵاتی ناوین چەندە گرنگ بێت، ئەو ئەنجامانەی بەدەستی دێنێت کۆمەکەکەی بۆ زانستی سۆسیۆلۆژی بەو ڕادەیە مەزن و بەکاریگەر دەبێت.

وەک ئایدیۆلۆژیا و بونیاد ڕەخنەکردنی دەوڵەت ـ نەتەوە چەندە گرنگە، پێشخستنی ئەلتەرناتیفەکەی ئەرکێکی گرنگترە. لەکاتی پێشخستنی ئەلتەرناتیفدا یەکەمین پرەنسیپی ڕەچاو بکرێت یەکپارچەیی کلتوورییە. وەک تێبینی دەکرێت لەسەرجەم سەردەمەکانی مێژووی پازدە هەزار ساڵیدا کلتووری کۆمەڵایەتی بەشێوەیەکی تێکەڵ و یەکپارچە بەردەوام بووەو تارۆژی ئەمڕۆمان هاتووە. دۆخی پەرەسەندنی یەکپارچەیی بۆ سەرجەم بوارەکانی کۆمەڵگا لەجێگای خۆیدایە. دووەمین پرەنسیپی گرێدراو بەم خاڵەوە، مۆدێلەکانی چارەسەری سەرکراوەن و لەمیانەی چەمکی ناسنامەی کلتووری نەرمەوە پەرە دەسەنن.

ئایدیۆلۆژیای دەوڵەت ــ نەتەوە کە تێکەڵەیەکی ئەسیمیلاسیۆن و ئەننگراسیۆنە و لەخوارەوەو سەرەوە ناتوانێت خاوەنداریێتی لەچەمکی ناسنامەی یەکپارچە (یەکگرتوو) بکات؛ تەنیا لەمیانەی چەمکی ناسنامەی کلتووری نەرم و کراوە دەرباز دەکرێت. ئەو مۆدێلانەی دەوڵەت ـ نەتەوە ـ کە لەبواری راستی کلتوورییەوە هیچ حەقیقەتێکیان نییە ــ دەرباز دەکەن گرنگ و بایەخدارن. لەبواری زهنیەت و بونیادەوە چەندە دەوڵەت ــ نەتەوە دەرباز بکرێت بەو ڕادەیەش مۆدێلەکانی چارەسەری لەسەر بنەمای یەکپارچەیی کلتوورییەوە کاریگەر دەبن. هەروەکو واقیع لەحەقیقەتیشدا پێویستە جەختکردن لەسەر کاریگەریەکانی پاوانگەرایی و نامۆکاری مۆدێرنیتە بکرێتەوە کە لەسەر بنەمای دژایەتیکردنی کلتووری ناوچە سەپێنراوە. لەدۆخێکی بەمجۆرەدا سێیەمین پرەنسیپ پەرەپێدانی شێوازی دەربڕین ـ حەقیقەتە ـ لەسەر بنەمای ئامانجگرتنی سیمبۆلەکانی دەوڵەت ــ نەتەوە و دەربازکردنیان کە لەدەرەوەی حەقیقەتن. بەرامبەر بەو پاوانگەراییەی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری لەسەر هەرسی پێچکەکەی ئاوایکردووە پێویستە لەسەر هەرسی فاکتەرە سەرەکیەکەی تازەگەری دیموکراتییەوە یەکپارچەیی و ئەننگراسیۆن بەبنەما بگیرێت. ئەو نامۆبوون، پارچە بوون و پەرتەوازەییەی بەدرێژیی مێژوویی شارستانی بەتایبەتش لەو دوو سەدەیەی دوایی مۆدێرنیتە بەسەر کلتووری ناوچەدا سەپێنراوە تەنیا لەرێگای بونیاد و گوتە یەکپارچەکانی حەقیقەتەوە دەرباز دەکرێن.

با هەوڵبدەین لەمیانەی پێشنیارەکانی بەرنامەی سیاسی دیموکراتییەوە نرخاندن و شیکارەکانمان سەبارەت بەکلتووری خۆرهەڵاتی ناوین ئەنجامگیر بکەین.

١- پێویستە کۆنفیدراسیۆنی نەتەوە دیموکراتەکانی خۆرهەڵاتی ناوین وەک رێکخستنی چەتر ئاسای یەکپارچەیی کلتووری ئاوابکرێت. ناشێت ئاواکردنی نەتەوە دیموکراتەکان لەسەر بنەمای سنوورەکانی ئێستای دەوڵەت ــ نەتەوە بێت. لەوە گرنگتر نەتەوە دیموکراتەکان سنوورێکی کێشراویان نییە. دەشێت ناوچە، خۆجێیی، شار و گوندێک

جێگای باس بێت کە نەتەوەی تێداچڕبووبێتەوە. بەڵام شار، خۆجێیی و ناوچەیەکیش جێگای باس دەبێت کە خاوەن تێکەڵەیەکی فرە نەتەوەیی بێت. ئەمەشیان دۆخێکی سروشتییە. بەردەوام مێژوو شاهێدی ناوچە و شارگەلێک بووە کەپڕ لە قەبیلە، قەوم، ئایین و مەزهەبی تێکەڵ بەیەکتری ژیاون. لەخۆڕا لەمێژوودا باس بابلی حەفتا و دوو میللەت ناکرێت. دەشێت نەتەوەکان وڵاتی هاوبەشیشیان هەبێت. مێژوو پڕ لەنموونەی ئەو ڕاستییەیە. هەروەها چەمکەکانی کۆمەڵگاو نەتەوەی ساف هەرگیز زانستی نییە. بێگومان وەک چۆن نەتەوەیەک لەئارادایە کە تاکە زمان بەکاردێنێت، دەشێت نەتەوەی فرە زمانیش جێگای باس بێت. نموونەی ئەو نەتەوانەش زۆرن کە فرە سیمبۆلیان هەیە. ئەوەی لەمێژوودا نموونەی نییە تاکخوازیو هۆمۆژەنی دەوڵەت ـ نەتەوەیە. بەهۆی کارەکتەری نامرۆڤانە و هۆڤێتی ئەو مۆدێلە بەیەکەوە شیکارمان کرد. لەو سۆنگەیەوە کۆنفیدراسیۆنی نەتەوە دیموکراتیەکان کەلەسەر بنەمای ناسنامەی نەتەوەی نەرم و کراوەن تەنیا لەگەڵ ڕاستییە مێژووییی و کۆمەڵایەتییەکان کۆک و گونجاو نین، لەهەمانکاتدا گوزارشتە نموونەییەکەشیەتی. پێویستە کۆنفیدراسیۆنەکە وەک یەکێتی دەوڵەتەکان نەبینرێت بەڵکو وەک یەکینەی کۆمینە دیموکراتییەکان هەڵسەنگێنرێت. پێویستە وەک بەڕێوەبەرایەتی یەکینەی کۆمەڵگا نەتەوەییەکان ببینرێت کە جێگای خۆیان لەناو کۆمینە دیموکراتییەکاندا گرتووە. پێکهاتەکەیان جێبەجێکردنی پرەنسیپە دیموکراتیەکان بەباشترین دۆخی خۆی دەگەیەنێت، نموونەی بەرکەماڵی بەڕێوەبەرایەتی دیموکراتییانەی کۆمەڵگان.

نەتەوەکانی کۆنفیدراسیۆن لەمیانەی پرەنسیپ و کردە دیموکراتییەکان ئاوا دەکرێت نەک لەڕێگای هێزی دەوڵەت و دەسەڵاتەوە. ئەو ئاواکردنانەی لەسەر بنەمای هێزن بەتایبەتیش ئاواکردنی نەتەوە لەسەر بنەمای هێزی دەسەڵات و دەوڵەت، هەرچەندە بانگەشەشی بۆ بکرێت بەڵام پێویستیەکی سەرجەم بەرژەوەندییە نەتەوەییەکان نییە، بەڵکو لەپێناو بەرژەوەندی خۆویستانەی گرووپێکی ئۆلیگارشییە. هەرچی ئاواکردنی

نەتەوەیە لەسەر بنەمای دیموکراسی؛ چونکە لەمیانەی بانگەشەکانی ئازادی و عەدالەت جێبەجێدەکرێت وەلامی بەرژەوەندیەکانی تەواوی نەتەوە دەداتەوە.

بەرامبەر سەرشێتی دەولەت - نەتەوە دەستەواژەی نەتەوەی دیموکراتیک گوزراشت لەماناداترین کۆمەلگای ناو ئاشتی، عەدالەت و ئازادی دەکات.

کۆنفیدراسیۆنی دیموکراتیک بۆ ئەو یەکێتییە کۆنفیدرالیانە کراوەیە کە لەخۆی گەورەتر یان بچووکترن. لەئاستی کیشوەرەکان و جیهاندا کۆنفیدرالیزمی دیموکراتیک هاندەدات. تەنیا بانگەشەی هەبوونی دونیایەکی دیکە نەکات، بەلکو خۆی وەک واقیعیترین، عادیل و ئازادترین دونیا رادەگەیەنێت.

٢- کۆمەلگای ئیکۆنۆمێک و ئیکۆلۆژیک ئەو کۆمەلگایەیە کە کۆنفیدراسیۆنی دیموکراتیک بەبنەمای دەگرێت. ئیکۆنۆمیکبوون مانای دانان بەبازاڕ و پەسەندنەکردنی پاوانگەرایی دەبەخشێت. چونکە پاوانگەرایی پابەندی هەموو جۆرێکی چەوسانەوە و سەرکوتکردنە، بۆیە ڕەت دەکرێتەوە. بەرامبەر بەم دۆخەش دەشێت بازاڕێکی کۆمەلگا جێگای باس بێت. بازاڕێک کە کەوتۆتە ژێر چەپۆکی زۆرداری پاوانەکان تەنیا خزمەت بەچەوسانەوە دەکات نەک کۆمەلگا. ئیکۆلۆژیبوونیش مانای پابەندبوونی ژیانی ئابوورییە بە ژینگەوە. چونکە ئابووریەک ژینگەپارێز نەبێت کۆمەلاتیش نابێت. کردە و چالاکیەک بەردوام بەدوای کەلەکەکردن و قازانجەوە هەلپەی بێت هەم دژی ئابوورییە هەم دژە دەوروبەرو ژینگەیە.

کۆمینەکان یەکینەی پێودانگی ئابوورین. نەمولکایەتی خاک کە تا ئاستی بنەمالەکان پارچەکراوە و ئامرازەکانی دیکەی بەرهەمهێنان، نەپێچەوانەکەشی مولکایەتی خاک و ئامراز بۆ پاوانەکان هیچ یەکێکیان ئابووری نین. ئەمانە ئامرازگەلێکی مۆدێرنیتە و شارستانین کە هەڕەشە و مەترسی سەر ئابووین. لەهەر بوارێکی چالاکی ئابووریدا بەرامبەر بەزۆرترین بەرهەم و سوودبەخشیدا مامەلەکردنی کۆمینال لەسەر خاک و ئامرازدا نموونەییترین هەلوێستە. ژن کە لەئابووریدا بەدەرنراوە،

لەناوەڕۆکــــدا ئافرێنـــەری ڕاســـتەقینەی ئابوورییـــە. لەبەرئـــەوەی ئافراندنەکانی ژن لەپێناو پێداویستییە ئابوورییە سەرەکییەکانە هەربۆیـە نـە دووچـاری تـەنگژە دێـت؛ نـە دەوروبـەر پـیس دەکـات و نـە هەڕەشـە لەکەش و هەوا دەکات. کاتێک کۆتایی بەو بەرهەمهێنانە بهێنرێت کە تاکە ئامانجی بە دەستهێنانی قازانجە، بەراستی ئەو کاتە ڕزگاری جیهان دەست پێدەکات. ئەمەش دەبێتە ئازادی مرۆڤ و ژیان.

٣- پەیوەندی کۆنفیدراسیۆنی دیموکراتی لەگەڵ دەوڵەت ـ نەتەوەکان نە تاکۆتایی شەڕە، نە ئاسیمیلەبوونە لەناویاندا. بـەڵکو پەیوەندییـەکی بەپرەنســیپانەیە کــە ڕەوابــوونی یــەکتری پەســەند دەکــەن و لــەناو هەلومەرجێکی ئاشتیدا بەیەکەوە ژیان و تەبایی بە بنەمادەگرن. هەرچەندە لەرێگای شۆڕشەوە دەوڵەت بڕووخێنرێت و دەوڵەتێکی نوێ لەجێگای ئـاوا بکرێـت، بـەڵام لـەبواری خزمـەتکردن بـەئازادی و دادوەری گۆڕانکارییـەک جێگای باس نابێت. بەڵام بەرامبەر بەو ڕەوشە ئەو گۆڕانکارییانەی لەسەر بنەمای کۆنفیدرالیزمی دیموکراتی کۆڵەکەی سیاسی تازەگـەری دیمـوکراتی لــەماوەی کـورت، نــاوین‌و درێژخایەنـدا بـەهرەو توانـای بەدەسـتهێنانی عەدالەت و ئازادی هەیە.

ڕەدکرنەوە یان پەسەندکردنی گشتی دەوڵەت خزمەت بـە ئامانجـەکانی ئازادی، یەکسانی و دیموکراتی ناکات. دەربازکردنی دەوڵەت بەتایبـەتیش تێپـەڕکردنی دەوڵــەت ـــ نەتــەوە مەسـەلەی پرۆسـە و قۆناخێکـە. چەنـدە کۆنفیدراسـیۆنی دیمـوکراتی بـاڵابوون و توانـای چارەسـەرکردنی کێشـە کۆمەڵایەتیـەکان بسەلمێنێت ئـەوا دەوڵـەت ــ نەتـەوە لەخۆیـەوە دەربـاز دەکرێـت. ئەمــەش مانــای دەستەوەســتان نییــە بەرامبــەر هێرشــەکانی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری لەسەروو هەمووشیانەوەی هێرشەکانی دەوڵـەت ـ نەتەوە. کۆنفیدراسیۆنی دیموکراتی هەرکاتێک هێزی پاراستنی کۆمەڵگای دەبێت.

کۆنفیدراســیۆنە دیموکراتییــەکان تــەنیا بەرێکخســتەبوون لــەناو دەوڵەتێکدا سنووردار نابێت. هێندەی خوازیارن دەتوانن لەدەرەوەی سنوور

خۆیان ڕێکخستە بکەن، یەکینەی کۆنفیدراڵی سەروو ئاوا بکەن و خاوەن دیپلۆماسی خۆیان بن.

٤- کۆنفیدرالیزمی دیموکراتی دەرفەتێکی چارەسەکردنی ئەو شەڕ، پێکدادان و گرژیانەیە کە بەهۆی ناهەقی کۆمەڵگای - مێژوویی تا ئێستا لەخۆرهەڵاتی ناویندا بەردەوامن. بەرامبەر بەکۆسپی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری و دەوڵەت ـــ نەتەوە کە بەرپرسیاری سەرەکی شەڕ و پێکدادانن، ڕێگەچارەی کۆنفیدرالیزمی دیموکراتی ڕێبازی ئاشتی، عەدالەت و ئازادییە. لەم چوارچێوەیەدا هەوڵ و کۆشش لەپێناو وەستاندنی شەڕ و پێکدادانەکان و بەلاوەنانی گرژییەکانو نەهێشتنی ناعەدالەتی مێژوویی زۆر گرنگ و بایەخدارە. بەر لەهەموو شتێک پێویستە ئەو ڕێگەچارە دیموکراتیانە ببنە ڕۆژەڤ کە پرەنسیپ و کردەکانی دەوڵەت ـــ نەتەوە بەبنەما ناگرن. بۆ چارەسەرکردنی کێشەی ئەرمەنییەکان تەنیا ئاوالاکردنی سنوورەکان بەس نییە، بەڵکو پێویستە ئەرمەنیەکان ببن بەخاوەنی پێگەی کۆمیناڵی دیموکراتیک. لەم پێناوەشدا ڕەخساندنی دەرفەت و ئاسانکاری پێویستە. پێویستە هەمان پرەنسیپ و ڕەفتار بۆ ئاشووری، ڕووم، تورک، کورد، عەرەب، جفاتە کرستیانەکانی دیکە، یەهوودی و عەلەوییەکان بەبنەما بگیرێت. ئەگەر داکۆکی لەسەر هەڵوێستەکانی دەوڵەت - نەتەوە بکرێت ئەوا پێکدادانی نێوان فەلەستین ـــ ئیسرائیل، پێکدادانی نێوان کوردان، شیعە و سوننەکانی ئێراق، هەروەها بەبەردەوامبوونی پێکدادانی گەرم لە میسر، پاکستان، ئەفغانیستان، بلوجستان، کوردستان، لوبنان، باکووری ئەفریقیای شوێنی نیشەجێبوونی بەربەرەکان و چەندین ناوچەی دیکە دەست لێبەرنەدراو دەبێت. لەم چوارچێوەیەدا بەپەلە پێویستی بە بونیادەکانی کۆنفیدرالیزمی دیموکراتیک هەیە. بەدیهاتنی چارەسەری دیموکراتییانە لەهەر شوێنێکی ململانێی گەرمی ناوچەکەدا بەشێوەی زنجیرە کاریگەری لەسەر سەرجەم جێگە بەکێشەکان دەبێت. هەربۆیە ئایندەی خۆرهەڵاتی ناوین کۆنفیدرالیزمی دیموکراتییە.

٥- بزووتنەوەی بەرهەڵستکارەکانی سیستەم سەرلەنوێ پێویستییان بە تاوتوێکردنی ڕەوش و ڕەچاوکردنەوەی خۆیان هەیە. لەشوێنێکدا کێشەکان بەلوتکە گەیشتبن و بزاوتەکانیش توانای چارەسەرکردنیان نەبێت، ئەگەر سیستەمیش هەڵوەشێتەوە کێشەکان چارەسەر نابن.

ئەگەر بزووتنەوە پەیوەندیدارەکان بەکێشەکانی ژن و ژینگە مۆدێرنیتە دەرباز نەکەن مەحاڵە بتوانن بەشێوەیەکی سەقامگیرانە بەئاراستەی ئامانجەکانیان بڕۆن. پەیوەستبوونی ئەو بزاوتانە بە بزووتنەوەی کۆمەڵگای دیموکراتی بۆ جێگیری و سەرکەوتنیان پێویستە.

هەرچی بزاڤە چەپڕەوەکانن کە بەرهەمی پراکتیک و کرداری سۆسیالیزمی بونیادنراوە کاتێک لەتەوەرەی دەسەڵات دەربکەون و بۆ بزاوتێک بگۆڕێن کە لەتەوەرەی دیموکراسیدابن؛ دەبێتە ڕێگای ڕاستی ڕزگاربوون. هەروەها پێویستە چالاکە حزبایەتی و سەندیکایی خۆیان لە ئیکۆنیزمی بەرتەسک ڕزگار بکەن و بەگشتگیری بزاوتە کۆمەڵایەتیەکانی بگەیەنن؛ چونکە ئەمە پێویستیەکی دەست لێبەرنەدراوی پێهەڵگرتن و گەیشتنە بە سەرکەوتن.

ڕێگەچارەی ئەو کێشانەی بزووتنەوە نەریتی، کلتووری، خۆجێیی، ناوچەیی و نەتەوەییەکان بەدەستیەوە دەناڵێنن گۆڕینی دەستەواژە، ڕێسای دامەزراوە جیاوازەکانی، بونیاد و گوزارشتی حەقیقەتی مۆدێرنیتە و ئاوێتەبوونیان لەگەڵ فاکتەرە بونیادی و دامەزراویەکانی تازەگەری دیموکراتیک بۆ هەنگاونان و سەرکەوتنیان مەرجە. ئەو کاتەش ئەنتەرناسیۆنالیزمی نوێ دێتە ئاراوە کە ئەم بزووتنەوانە مۆدێرنیتەی سەرمایەداری بەتایبەتیش دەوڵەت ـ نەتەوە دەرباز بکەن.

٦- ڕەوتە ئایدیۆلۆژی و سیاسیەکانی دژە مۆدێرنیتەی سەرمایەداری ناچارن پشت بەخەباتی زانستێکی کۆمەڵایەتی ببەستن کە سۆسیۆلۆژیای پۆزیتیڤیستی دەرباز کردبێت. چونکە سۆسیۆلۆژیای پۆزیتیڤیست یەکێک لەهاوبەشە پاوانگەراکانی هەڵکشانی هەژموونگەرایی مۆدێرنیتەی سەرمایەدارییە. ئەو سۆسیۆلۆژیایە بەرهەمی هەوڵە زانستییە ئەرێنی و

بەهادارەکانی بەشێوەی سەرمایەی بەکرێگیراو پێشکەشی بەپاوانەکانی سەرمایەو دەسەلات کردووە، خۆشیان کردووە بە شەریک. لەم سۆنگەیەوە شکاندنی پاوانی ئەو زانستەی خزمەت بەسیستەم دەکات، وەرگرتنی میراسە ئەرێنیەکەی و بەسەنتێزکردنی لەمیانەی رەخنە کۆنکرێتی و بەرجەستەکانەوە و پێشکەشکردنی وەک حەقیقەت ناوەڕۆکی خەباتی زانستی کۆمەلایەتی نوێیە. هەر کارو چالاکیەکی ئایدیۆلۆژی، سیاسی و ئابووری دژە سیستەم ئەو خەباتانە بەبنەما بگرێت بە سەرکەوتوویی درێژە بە پێشکەوتن و پەرەسەندنی خۆی دەدات. دەشێت دامەزراوەکانی پەیمانگا و ئەکادیمیاکان وەک یەکینەی سەرەکی خەباتی زانستی کۆمەلایەتی بونیاد بنرێت. بەگوێرەی پێویستیەکان دەشێت رەوتی ئایدیۆلۆژی وەک چالاکی تێپەڕبوونی زانیاری بەپرۆسەی دامەزراوەبوون و گونجاندنیان بەگوێرەی بوارەکانی کۆمەڵگا پێناسە بکرێت. لەکلتووری خۆرهەلاتی ناویندا خاوەن میراسێکی ئەزموونی دەوڵەمەندە. یەکەمین قۆناخەکانی بلاوبوونەوەی ئایین، بونیادنانی تەریقەت و مەزهەبەکان ئەو کار و خەباتە دەخەنە روو.

هەرچەندە ناتەواویش بن بەلام دەشێت کار و خەباتەکانی کۆمەڵی مەدەنی ڕۆژی ئەمڕۆمان وەک نموونەیەکی ئەو خەباتانە پیشانبدەین. فێمینیزم کە بزاوتێکی گرنگی کۆمەڵی مەدەنییە لەبنەڕەتدا ڕەوتێکی ئایدیۆلۆژییە، هەربۆیە ناچارە پشت بە بنچینەیەکی ئایدیۆلۆژی ببەستێت. بەلام رەوتە فێمینیستەکان لەشیکارکردنی کۆمەڵگای ڕەگەزگەرایی پیاو سالاری ــ حکومڕانی ژن دەکات و هێزی پلەداری، دەسەلات و دەوڵەتی خستۆتە پشت خۆیەوە ــو پێشکەشکردنی مۆدێلەکانی چارەسەری و بەرجەستەکردنی ئەو هەوڵانەیان لەژیاندا دووچاری لاوازی و شکانی بەردەوام هاتوون. ئەگەر کەسایەتی نائاسایی لەئارادا نەبێت ئاستەمە ملیتانانی ژنی ئازاد سەرکەوتن بەدەست بێنن. هێرشە ڕۆژانەیی و بەرفراوانەکانی کۆمەڵگای ڕەگەزپەرست ئەو سەرکەوتنە سنووردارەش ئاسیمیلە دەکات کە بەدەست هاتووە. لەم سۆنگەیەوە

ئـاواكردنی كۆمۆنــە ئایـدیۆلۆژی، سیاسـی و ئابوورییـەكانی تـەوەرەی ئازادی ژن و كردارەكەی ژیانی و دەست لێبەرنەدراوە.

لەكاتێكدا كلتووری خۆرهەڵاتی نـاوین دیمـوكراتیزە دەكرێت پێویست كۆمەڵی مەدەنی وەک قەبیلە و كڵانەكانی سـەردەمی نـوێ هەڵسـەنگێنرێت. هەمان هەڵوێست سەبارەت بە نەریتە ئایینیەكانیش پیشانبدرێت؛ بەكورتی لـەپێناو بەدەسـتهێنانی سـەركەوتن پێویسـتە زانسـتی كۆمەڵایـەتی بەشـێوەیەک لەگـەڵ میراسـی ئـەو نەریتانـە ئاوێتـە بێـت كـە ژیـانی دامەزراوەكانی كڵان، قەبیلە، مەزهەب، تەریقەت و ئایینەكان بێتەوە بیری مرۆڤ و تەنانەت پێویست بكات وەک ئەوان خۆی رێكبخات.

هەرچەندە بزووتنەوەو رەوتە سیاسیەكان جیاوازییـان لەگـەڵ رەوت و بزوتنــەوە ئایدیۆلۆژیــەكان هــەبێت، بــەڵام پەیوەندییــەكی بــەهێزیان لەنێواندا هەیە. بوونی ئەو جۆرە پەیوەندیەش دەست لێبەرنـەدراوە. وەک چـۆن ئـەو رەوتـە سیاسـیانەی بـەهای ئایـدیۆلۆژییان نییـە مانایـەكی ئەوتۆیان نابێت، رەوتـە ئایدیۆلۆژیـەكانی واقیعـی سیاسـی ناخەنـە روو بەئاسـت و پێگەیـەكی بـەهادار ناگـەن. ئامـانجی سـەرەكی تێكۆشـانی ئایـدیۆلۆژی پەرەپێـدانی كۆمـەڵگای ئـەخلاقیو سیاسـییە. پەرەپێـدانی كۆمەڵگای ئەخلاقی و سیاسیش تـەنیا لەمیانـەی چالاكیـەكی ئایـدیۆلۆژی پشتبەستوو بەزانستی كۆمەڵایەتیـەوە بەدیدێت. بەمانەیـەكی تـر ناشـێت چـالاكی و كردارێكـی ئـەخلاقی و سیاسـی بـێ زانسـتی كۆمەڵایـەتی پـەرەی پێبـدرێت. بەرامبـەر پاوانــەكانی سـەرمایە و دەسـەڵات تـەنیا لەمیانــەی چالاكیـەكی سیاسـی و ئایـدیۆلۆژی پشتبەسـتوو بەزانسـتی كۆمەڵایـەتی دەشـێت بــەرگری لەكۆمــەڵگا بكرێــت و بــرەوی پێبــدرێت. ئەگــەر بــەر لەراپــەڕینی میراسـی پلــەداری، دەســەڵاتگەراو دەوڵەتگــەرایی كلتــووره سیاسیەكەی چالاكیـەكی سیاسـی و ئایـدیۆلۆژیی شێوازی ژیـانی رۆژانـە بەرامبــەر واقیعــی هەنووكــەیی دەوڵــەت و دەســەڵات بــەرێوە نــەبرێت دیموكراتیزەكردنی خۆرهەڵاتی ناوین بەدینایەت.

٧- هێــزە پاوانگــەرەكانی ئــەوروپا كــە ناوەنــدی هەژموونگــەرایی مۆدێرنیتــەی ســەرمایەدارییە لەســەر بنــەمای ئــەو پەنــدو ئەزموونانــەی

لەشەڕ، پێکدادان و گرژییەکانی پێنج سەدە وەریانگرتن لەدوای سالانی ١٩٥٠ کان ریفۆرمی بنەڕەتییان لەبونیادی خۆیاندا ئەنجامداوە. یەکێتی ئەوروپا ئەنجامێکی ئەو پەند و ئەزموونانەیە. ئامانجیان دەربازکردنی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری نییە، بەلکو بەدۆخێکی بگەیەنن کە بەردوام بێت و دەرفەتی ژیانی تێدا هەبێت. لەمیانەی کاریگەری ئەو ریفۆرمانەوە دیموکراتیزەکردنی کلتووری خۆرهەلاتی ناوین زەحمەتە. بەلکو لەرێگای نەرێنیترین ئەنجامەکانی پاوانگەرایی مۆدێرنیتەوە کلتووری ناوچە بۆ ناو هەلومەرجەکانی ناکۆکی، پێکدادان و شەڕ کەمەندکێش دەکات. تەنیا لەمیانەی دابڕانێکی ڕیشەیی لەچەمک و بونیادەکانی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری و تازەگەری دیموکراتیک ڕزگاربوون جێگای باس دەبێت. تازەگەری دیموکراتی سەرچاوەی خۆی لەپێویستی مێژوویی و ڕیشەیی وەردەگرێت. تازەگەری دیموکراتی کە بە ئەلتەرناتیفەکانی کۆمەلگای ئیکۆنۆمیک، کۆمەلگای ئیکۆلۆژیک و کۆنفیدرالیزمی دیموکراتی وەلامی سەرمایەداری، ئیندوستریالیزم و دەولەت ـ نەتەوە دەداتەوە، ڕۆلی سەرەکیترین فاکتەری دیموکراتیزەکردنی کلتووری خۆرهەلاتی ناوین دەبینێت. هێزەکانی تازەگەری دیموکراتی کە بەرهەلستکارانی مۆدێرنیتە، رکابەرانی کۆیلەداری، پیشەوەران، تیرە رەوەندەکان و کۆمەلگای گوند ـ کشتوکال کە بەدرێژایی مێژوو دژی شارستانی بووە دەکات بە سەنتێزێک و لەدەرەنجامی هەولەکانی شۆڕش و ڕیفۆرمەوە لەسەر بنەمای کۆمەلگای ئیکۆنۆمیک، ئیکۆلۆژیک و نەتەوەی دیموکراتیک لەرێگای تێکۆشانی درێژخایەنەوە دەتوانن بالابوونی خۆیان بەرامبەر هەرسێ فاکتەری مۆدێرنیتەی سەرمایەداری بسەلمێنن.

ئەگەر بلێین بەردەوام شەڕ یاخود ئاشتی لەنێوان تازەگەری و مۆدێرنیتەی لەگەل یەکتر ناکۆک و جیاواز لەئارادا دەبێت هەلوێستێکی ڕاست نییە. هەروەک چۆن شانبەشانی هەلمەتی بەرامبەر دەشێت شۆڕش و ریفۆرم بەشەڕ و پێکدادان ڕووبدات، لەناو هەلومەرجی ئاشتیشدا دەتوانێت بەشێوەی سازشکاریو تەبایی درێژە بە پەرەسەندنەکانی بدات. مۆدێرنیتە و تازەگەری بونیاد گەلێکی ناکۆک و خاوەن پەیوەندی ئالۆزن کە هەندێک

جار بۆ پەیڕەوی شەڕی خەست جارانێکش بۆ پەیڕەوەکانی ئاشتی و تەبایی دەگۆڕێت. بوونیان بە ئەلتەرناتیفی یەکتری لەمیانەی گۆڕانکاریەکانی قۆناخەکانی پێگەیشتنی سیستەمەکان و ئەو سیاسەت و ڕووداوە ڕۆژانەییانە بەدینایەت کە بەدەستەواژەکانی "کورت ماوە"و"ماوەی ناوین"گوزراشت دەکرێن. لەدەرەنجامی قەیرانی سیستەماتیک و درێژخایەنی بونیادیەوە دەشێت ئەمجۆرە گۆڕانکاری و وەرچەرخانە بنەڕەتیانە بەدیبێت. هەوڵەکانی پێنج هەزار یان پێنج سەد ساڵەی نێوان شارستانی و ژیار، مۆدێرنیتە و تازەگەری لەپێناو بوون بە ئەلتەرناتیف کاری پرۆسەیەکە تائێستا بەهەموو خێراییەکەوە بەردەوامە. وەک هەر ناوچەیەکی جیهان، لەبواری کلتووری خۆرهەڵاتی ناوینیش لەمیانەی شێوازی ژیان، ڕێکخستن، چەمکی چالاکی (ستراتیژی) و کردارەکانی (تەکتیک) کورت ماوە، ماوەی ناوین و درێژماوە مۆدێرنیتەی سەرمایەداری ناو قەیرانی بونیادی دەرباز دەکرێت، لەمیانەی بەهاکانیەوە تازەگەری دیموکراتی دەبێتە چاخێکی بنەڕەتی و مانادار دەبێت.

ناچارم بەمجۆرە کۆتایی بە بەشی خۆرهەڵاتی ناوینی بەرگرینامەکەم بێنم. ئەم بەشە بریتییە لەبەرگی چوارەم. کێشەکانی شارستانی و تازەگەری لە کوردستان و مۆدێلەکانی چارەسەری بەیەکەوە لەخۆوە دەگرێت. لەو بڕوایەدام کە ئەو باسە بۆ ڕوونکردنەوەی چییەتی ئەو ڕاستییە بەسە کە لە کەسێتی مندا کراوەتە ئامانج و خوازیارن دادگایی بکەن. ئەگەر وەک سات تاک خاڵی یەکتربڕینی مێژووو کۆمەڵگا بێت، ئەوا دەربڕینێکی ڕاست و بەرگریکردنی تاک لەخۆی دەبێتە هەنگاوی ئازادی مێژووی کۆمەڵگا.

**عەبدوڵڵا ئۆج ئالان**
**زیندانی تاکەکەسی ئیمرالی**
**٢٠٠٩/٨/٤**

## فەرهەنگۆک

| | |
|---|---|
| ئاکتیف | کارا، چالاک |
| ئانترۆپۆلۆژی | مرۆڤناسی |
| ئانستروومان | ئامێری مۆسیقی |
| ئانیمیزم | رۆحگەرایی |
| ئەوەنتاژ | شیاوی، خاڵی بەهێز |
| ئایدیالیزم | نموونەگەرایی، (مثالیە) |
| ئەبستراکت | نابەرجەستە، دەرهەست (مجرد) |
| ئەبستمۆلۆژی | زانینناسی، سیستەمی پەیڕەو و گەیشتن بە زانیاری |
| ئەتیمۆلۆژی | وشەناسی |
| ئەتنۆلۆژی | نەژادناسی |
| ئەدرەس | ناونیشان |
| ئەزبەرە | دەرخکراو، لەبەرکراو |
| ئەرستۆکراسی | خانەدانی، بەڕێوەبەرایەتی کەسانی دەوڵەمەند و زووورین |
| ئەسترۆنۆمی | ئەستێرە ناسی، گەردوون ناسی |
| ئەڵتەرناتیف | ( بدیل) |
| ئەماتۆر | نا شارەزا، نا وەستا |
| ئەنالیز | لێکدانەوە، شیکردنەوە |
| ئیندوستریالیزم | پیشەسازیبوون، پیشەسازیخوازی، پیشەسازی پەرستی |
| ئەیالەت | هەرێم |
| ئۆتانتیک | لۆکاڵ، خۆجێیی |
| ئۆپۆرتۆنیزم | هەلپەرستی |
| ئۆپۆزسیۆن | (معارضە)، رکابەر، بەرهەڵستکار |
| ئۆرجین | رەسەن |
| ئۆرگانی | سروشتی |
| ئۆرگانیزاسیۆن | رێکخراو، رێکخستن |
| ئۆنتۆلۆژی | بوونخوازی |
| ئیکۆنۆمی | ئابووری |

| | |
|---|---|
| ئیکۆنۆمیزم | ئابووریخوازی، ئابووری پەرستی |
| ئیکۆلۆژی | سروشت پارێزی، ژینگە پارێزی |
| بایۆلۆژی | زیندەوەرزانی |
| بەرخودان | (مقاومة) |
| جڤات | کۆمەڵ، مۆڵبوون |
| تابلێت | تاتە قوڕینەکان کە نووسینیان لەسەر کراوە |
| تاکخودایی | یەکتاپەرستی |
| تەرز | شێواز، (اسلوب) |
| تراژیدیا | مەرگەسات |
| تیۆلۆژی | خوداناسی، (إلاهیات) |
| پارادیگما | پارادایم، جیهانبینی، دونیابینی |
| پارۆمەترە | پێوەر، پێوان |
| پاسیف | نا کارا، نا چالاک |
| پانتەییزم | یەکگرتنی سروشت و خودا |
| پەرجوو | (معجیزة) |
| پەسن | ستایش، مەتح، وەسف |
| پراکتیزە کردن | پێکهێنان، جێبەجێ کردن |
| پرەنسیپ | (مبدأ) |
| پرۆتۆکۆڵ | رێکەوتن‌نامە |
| پرۆفیشناڵ | وەستا، شارەزا |
| پۆتانسێل | ماتە ووزە، وزەی شاراوە |
| پۆزەتیف | ئەرێنی |
| پۆزیسیۆن | دۆخ، پێگە |
| چالاکوان | هەڵسوڕاو |
| جیۆلۆجی | زەویناسی |
| دەستاوێز | سەنەد، بەڵگە |
| دەسپۆت | سەرەڕۆ، ستەمکار |
| دەستپێک | سەرەتا |
| دۆگماتیک | قاڵبگیری، بیروشکی |
| دووالیزم | دوانەیی، دووانەگەرایی |
| دیماگۆجیەت | قسەی بێ کردار، چەنەبازی |

| | |
|---|---|
| دیمۆگرافی | باری نیشەجێیی، جوگرافیای کلتووری |
| ژەرەنتۆکراسی | پیرسالاری، دەسەڵاتداریتی بە ساڵاچوان بەسەر لاوانەوە |
| راچەتە | ئەو پسوڵەیەی پزیشک دەیدا بە نەخۆش و لەسەری دەرمانی بۆ دەنووس |
| رادیکاڵ | توندڕەو |
| راسیۆنال | عەقلانی |
| رەستۆرە | پینەکردن، سواقدان (تعمیر) |
| رەمەک | (غریزە) |
| رەنوو | هەرەس |
| رەوان ناسی | دەروون ناسی |
| ریسک | مەترسی |
| ریفلێکس | کاردانەوە، پەرچەکردار |
| زایەند | سێکس |
| زێرەڤان | پاسەوان، (حارس) |
| زراڤ | ورد، باریک |
| سەنترالیزم | ناوەندگەرایی، (مرکزیة) |
| ستادیۆم | یاریگای گەورە |
| سۆزانی | لەشفرۆش |
| سۆسیۆبایۆلۆژی | زیندەوەرزانی کۆمەڵناسانە |
| سۆسیۆسایکۆلۆژی | دەروون ناسی کۆمەڵایەتی |
| سۆسیۆلۆژی | کۆمەڵناسی |
| سیمولاسیۆن | بەیەک چواندن، چۆنیەکسازی |
| فۆرماسیۆن | پێکهاتن، شێوەگرتن |
| فیزیۆلۆژی | جەستەیی، لایەنە فیزیابیەکانی جەستەی مرۆڤ |
| فیلۆلۆژی | زمانناسی (بەشێک لە زمانناسی براوردکاری زمانەکان دەکات) |
| فینانس | پارەدارکردن، (تمویل) |
| قەبلاندن | سپێکلاسیۆن |
| کائۆس | کائیوس، گێژاو، (دوامة) |
| کاتاگۆری | پۆلی ئەو شتانەی پۆلێن کراون (کاتاگۆریزەکراو: پۆلێن کراو) |
| کاست | چینی جێگیر و دیار |
| کارەکتەر | تایبەتمەندی، خەسڵەت، کەسایەتی |

| | |
|---|---|
| کرستیان | مەسیحیەت |
| کۆلۆنی | داگیرکاری |
| کۆمیدی | بەزمەسات |
| کۆمپلێکس | گرێی دەروونی |
| کوالیتی | چۆنێتی، (نوعیة) |
| گرگن | بستەبالا، (قزم) |
| گلۆبال | جیهانگیری |
| ماجەرا | سەرکێشی، (مغامره) |
| مارژێنال | سنووردارکراو و دوورخراوە لە ئامانج |
| ماکرۆ | گەورە، درشت |
| مەترەپۆل | شارە گەورەکان |
| مەتن | دەق، نووسراو |
| مەنگەنە | پێچ، گیرە |
| مۆنۆپۆل | پاوان |
| مۆدێرنیتە | (ألحداثە) |
| میتۆلۆژیا | ئەفسانەناسی، ئەفسانە |
| میکرۆ | بچووک، ورد |
| میللیگەرایی | نەتەوە پەرستی |
| نێچیرڤانی | راوچێتی |
| نێگەتیف | نەرێنی |
| نهێلیست | نکۆلیکار، پوچگەرا، هیچگەرا |
| هەژموون | هەیمەنە |
| هۆمۆژەن | چونیەک، لێکچوو |
| هۆڤ | دڕندە، کێوی |
| وەعزدان | ئامۆژگاریکردن، فتوادان |
| یادگا | یادەوەری، (ذاکرة) |
| یۆتۆپیا یونیتار | خەیاڵ ناوەندی |

پێویسته ڕۆژهەڵاتناسی لەچوارچێوەیەکی تەسکی بۆچوونی بیرمەندە ئەوروپییەکان سەبارەت بەشارستانیو کۆمەڵگاکانی خۆرهەڵاتی ناویندا هەڵنەسەنگێنرێت، چونکە لەجیاتی پێشخستنی هزری زانستی دەرهەق بەسروشتە کۆمەڵایەتیەکانیانو فەراهەمکردنی ڕۆشنگەری خۆیان، وابەستە کردن بەهەژموونگەرایی ئایدیۆلۆژی مۆدێرنیتەو بەبنەما گرتنی بونیادە زانستیەکەی مانا بەرفراوانەکەی ڕۆژهەڵاتناسییە. فەتحکاری ئەو دوو سەدەیەی دوایی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری تەنیا لەبوارەکانی کلتووری ماددی ڕوویندداوە. بەڵکو لەبواری کلتووری مەعنەویدا زیاتر جێگای باس بووە. ئەو شۆڕش، بزاوتە سیاسیو ڕەوتە ئایدیۆلۆژیانەی سەریانهەڵداوە هەریەکەو کۆپیەکی بێکاریگەری نموونەکەی ئەوروپان. هەربۆیەش کاریگەریەکەیان لەسەر کۆمەڵگا رووکەشانە بووە. ئەو کۆمەڵگایەی لەنێوان بەرداشی نەریتو مۆدێرنیتەدا ماوەتەوە، بەردەوام لەناو گرژیدا بووەو بەهۆی خۆ نوێنەکردنەوەش لەدۆخی قەیراندا دەژیت.

کلتووری خۆرهەڵاتی ناوین کە هەنگاو بەهەنگاو کەوتۆتە ژێر هەژموونگەرایی ئەم دوو سەد ساڵەی دوایی شارستانی ئەوروپا ئیفلاسکردنیشی تێپەڕ کردووە و بەئاراستەی ڕێبازی خۆکوژیدا دەڕوات. ئەمە زێدەڕۆیی نییە. ڕاستییەکی حاشاهەڵنەگرە کە لەهیندستان، چین و ئەفغانستانەوە تا دەگاتە کەنارەکانی زەریای ئەتڵەسی لە گۆڕەپان و مەیدانەکانی ژێر کاریگەری ئەم کلتوورە ڕۆژانە چالاکی و کردەوەکانی خۆکوژی ئەنجامدەدرێت. لەجیاتی تاوتوێکردنی کەمی یان زۆری چالاکییەکان تەنیا شیکارکردنی ئەو کلتوورەی بناخەکەیان پێکدێنێت، دەشێت ڕووداوەکان ڕوون بکاتەوە. ڕوونکردنەوەکانی کلتووری نەریتی باو و ڕوونکردنەوەی ڕۆژهەڵاتناسانی شارستانی ڕۆژئاوا هێز و توانای ڕوونکردنەوەی ئەم دیاردەی خۆکوژی و قەیرانی نییە، چونکە خۆیان هەم هۆکار هەم ئەنجامێکی ئەم قەیران و خۆکوژییانەن...

دیزاین: یاسر کولی